# پوختەی

# شەریعەتی ئیسلام

## لەڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە





ئامادەکردنی

مەلا محمد مەلا صاڵح بامۆکی

# پوختەی شەریعەتی ئیسلام

# لە ڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە

نوسینی: ملا محمد ملا صالح بامۆکی

شوێنی چاپ: چاپخانەی ڕێ نوێ

دیزانینی بەرگ و ناوەوە: سیف و سرمد

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم

تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردنی (١٠٠٨) ی ساڵی (٢٠١٠) ی زاینی پێدراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەکەم کە یارمەتی دام بۆ نوسینی ئەم کتێبە ، بێگومان مرۆڤەکان هێنراونەتە سەر ئەم زەوییە ، تا بەندایەتی خوای گەورە بکەن و زەوی ئاوەدان بکەنەوە، بۆ ئەو مەبەستەش خوای گەورە پەیام و پێغەمبەری ناردووە تا ئایینی خوا بۆ خەڵك ڕوونکەنەوە و پێیان ڕاگەیەنن چۆن لە ژیانی دونیادا هەڵس و کەوت بکەن و بە چی شتێکیش سەرفەرازی ڕۆژی دوایی دەبن، ئایینی ئیسلامیش کە دوایین پەیام و بە کۆتا پێغەمبەردا (ﷺ) نێردراوە بە ڕوونی و زۆر بە جوانی ئەوەی مایەی سەرفەرازی و نەسەرکەوتنی هەردوو جیهانی مرۆڤەکانە لە پەیامی پێغەمبەری ئیسلامدا باسی لێوە کردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی بە زمانی عەرەبی یە زۆریەك لە باوەڕداران کە شارەزای زمانی عەرەبی نین ناتوانن لێ ی تێبگەن ، بۆیە زۆر بە پێویستم زانی ئەم کتێبە بنوسم دەربارەی شەریعەتی ئیسلام بە ناوی پوختەی فیقهی شەریعەت لە ڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە .

تا ئەو هاوزمانانەم لە میللەتەکەم کە شارەزای زمانی عەرەبی نین بەرچاو ڕوون بن دەربارەی شەریعەتەکەیان و بزانن چۆن پەیڕەوی ئایینەکەیان بکەن.

ئەم کتێبە هەموو بابەتەکانی شەریعەتی ئیسلامی لەخۆ گرتووە ، پوختەی شەریعەتی باس کردووە لە ڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە ، واتە لەسەر بەڵگەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەڕوات ، هەموو ئەو فەرموودانەی لەم کتێبەدا هاتوون (صحیح) یان (حسن)ن زۆر ووردەکاریمان کردووە لەو بارەیەوە ، بەڵام کاری مرۆڤ هەر هەڵەی تێدا دەبێت و بێ هەڵە نابێت.

بابەتەکان بە کورتی باس دەکەم ناچمە ووردەکاری و درێژ پێدان ، سوود لە کۆمەڵێ سەرچاوەی بڕوا پێکراو و بەهێز وەرگیراوە کە ئاماژەمان بە هەندێکی کردووە لە پەراوێزەکاندا لە کۆتایشدا ناوی سەرچاوەکان نوسراوە، دەگونجێ هەندێ لە مامۆستایان لە هەندێ بابەت دا رای جیاوازیان هەبێت لەگەڵ ئەوەی من نووسیومە ، ئەوە ئاساییە ، بەڵام گرنگ ئەوەیە ڕاکەیان بەڵگەی هەبێت و پشت ئەستور بێت بە قورئان و سوننەت و ڕای زانایانی باوەڕ پێکراوی ئیسلام .

لە کۆتایی دا هیوادارم ئەم کتێبە سوود بە خوێنەرانی کوردی موسڵمان بگەیەنێت، و داواکارم خوای گەورە ئەم کارەمان لێ وەربگرێت و لە نامەی کردەوە چاکەکاندا بۆم بنوسێت ، وە داوا لە خوێنەرانی بەڕێز دەکەم بێبەشمان نەکەن لە دوعای خێریان.

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

مەلا محەمەد مەلا صالح

هەڵەبجە/ گەڕەکی شێخ ئیسماعیل

شەوی ٦ /١/ ٢٠١٠

# پاککردنەوە ( الطهارة )

**یەکەم: پاککردنەوە چییە؟** بریتییە لە لابردنی پیسی و بێ دەست نوێژی گەورە و بچووك. یان بریتییە لە لابردنی هەرشتێك رێگربێت لە نوێژکردن، پیسی بێت یا بێ دەست نوێژی، بەئاو بێت یا بە خۆڵ.

**دووەم: حوکمی پاککردنەوە:** پاککردنەوە لە پیسی واجبە بەمەرجی لە بیربوون و توانا بوونی لابردن و نەهێلانی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴾ المدثر: ٤ واتە: پۆشاکەکەت پاککەرەوە. وە خودای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّىۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴾ البقرة: ١٢٥ واتە: ئیبراهیم و ئیسماعیلمان راسپارد کە ماڵەکەم بۆ ئەوانەی بەدەوریدا دەسورێنەوە و بۆ ئەوانەی هەرلەوێ دەبن و بۆ ئەوانەی کڕنوش و سوژدەم بۆ دەبەن پاك بکەنەوە.

وە خوا پاککردنەوەی لە بێ دەست نوێژی گەورە و بچووك پێویستە بۆ بەجێ هێنانی نوێژ وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لا صلاة بغير طهور).[1] (نوێژ وەرناگیرێ بەبێ دەست نوێژ).

**سێ یەم: جۆرەکانی پاککردنەوە: پاککردنەوە دوو جۆرە:**

**أ- پاککردنەوەی پیسی:** بریتییە لە خۆپاککردنەوە لە شتێکی پیس بە لاشەی نوێژکەر یا پۆشاکی یا شوێنی نوێژەکەیەوە بێت نوێژکردنەکەی دروست نییە وەك پیسایی و میز و خوێن.

**ب - پاککردنەوەی بێ دەست نوێژی:** واتە خۆ پاککردنەوە لە بێ دەست نوێژی گەورە و بچووك بەدەست نوێژگرتن و خۆشۆردن بۆ ئەوەی نوێژکردن دروست بێت.

---

١) رواه البخاري ١٣٥. ومسلم ٢٢٤.

**چوارەم : جۆرەکانی ئاو:**

**١- ئاوی ڕووت (ماء مطلق)** ئەو ئاوەیە ناوی ئاوی بۆ بەکاربهێنرێت بەبێ ناتۆرە(قید) ی پێویست. حوکمەکەشی: پاکە و **پاککەرەوەشە، واتە لەخۆیدا پاکە** و شتی پیسیش پاك دەکاتەوە. وە ئەم ئاوانە دەگرێتەوە:

**أ- ئاوی بەفر و باران و تەرزە:** خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم﴾ **الأنفال: ١١ واتە: خوا لە ئاسمانەوە بارانتان بۆ دەبارێنێت پاکتان بکاتەوە بەو ئاوە** وەدەفەرموێت: (وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طهورا) (الفرقان: ٤٨) **واتە: لە ئاسمانەوە ئاوێکی پاککەرەوەمان باراندووە بۆتان. وە پێغەمبەری خوا(ﷺ)** دەفەرموێت: (عن أبي هُرَيْرَةَ قال كان رسول اللَّهِ ﷺ إذا كَبَّرَ في الصَّلَاةِ سَكَتَ هُنَيَّةً قبل أنْ يَقْرَأَ فقلت يا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِي أنت وَأُمِّي أَرَأَيْتَ سُكُوتَكَ بين التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ ما تَقُولُ قال أَقُولُ اللهم بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كما بَاعَدْتَ بين الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ اللهم نَقِّنِي من خَطَايَايَ كما يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ من الدَّنَسِ اللهم اغْسِلْنِي من خَطَايَايَ بِالثَّلْجِ وَالْمَاءِ وَالْبَرَدِ).[١] **(ئەی خوایە نێوان من تاواناکەم دووربخەرەوە وەك چۆن ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوات دوورخستۆتەوە، خوایە لەتواناکەم پاکم بکەرەوە وەك چۆن جل و بەرگی سپی لە چڵك و پیسی پاك دەکرێتەوە، خوایە لە تاوانەکانم بمشۆرە بە ئاو و بەفر و تەرزە).**

**ب ـ ئاوی دەریا:** ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (سَأَلَ رَجُلٌ النبي ﷺ فقال يا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَرْكَبُ الْبَحْرَ وَنَحْمِلُ مَعَنَا الْقَلِيلَ من الْمَاءِ فَإِنْ تَوَضَّأْنَا بِهِ عَطِشْنَا أَفَنَتَوَضَّأُ بِمَاءِ الْبَحْرِ فقال رسول اللَّهِ ﷺ: (هو الطَّهُورُ مَاؤُهُ الْحِلُّ مَيْتَتُهُ).[٢] **پیاوێك پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد و وتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە لە دەریادا سواری بەلەم دەبین ، ئاوی کەم لەگەڵ خۆماندا هەڵدەگرین، ئەگەر دەست نوێژی پێ بگرین، ئاومان پێ نامێنێت و تینومان**

---

١) رواه البخاري، ٧٤٤. ومسلم، ٥٩٨.

٢) رواه أبوداود، ١/٦٤. (٨٣) والترمذي، ١/١٠٠.(٦٩) وقال: حديث حسن صحيح. والنسائي ١/ ٥٠ (٥٩،١٧٦). وابن ماجه ١/١٣٦. (٣٨٦) حديث صحيح والدارقطني ١/٣٦. وانظر نصب الراية ١/ ٩٥ـ ٩٦. وتلخيص الحبير ١/ ٢١ـ ٢٤. والإرواء ٤٨.

دەبێت، بەئاوی دەریا دەست نوێژ بگرین؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (دەریا ئاوەکەی پاك و پاککەرەوەیە و مرداردەبووەکەشی حەڵاڵە (دەخورێت).

**ج ـ ئاوی بیر:** ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمویێت: (قِيلَ يا رَسُولَ اللَّهِ أَنَتَوَضَّأُ من بِئْرِ بُضَاعَةَ وَهِيَ بِئْرٌ يُلْقَى فيها الْحِيَضُ وَلُحُومُ الْكِلَابِ وَالنَّتْنُ فقال رسول اللَّهِ ﷺ إن الْمَاءُ طَهُورٌ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ).[1] ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ئاوی بیری بوضاعە دەست نوێژ بگرین؟ (بیرێك بوو پەڕۆی حەیز و گۆشتی سەگ و شتی بۆگەنی تێدابوو) پیغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان ئاو پاکە و پاککەرەوەیە هیچ شتێك پیسی ناکات).

**د ـ ئەو ئاوەی بەزۆر مانەوە دەگۆڕێت** یا بەهۆی ڕەنگی ئەو شوێنەی تێیدایە ڕەنگی دەگۆڕێت، یا شتێکی تێکەڵ دەبێت بە زۆریش لێی جیانابێتەوە و ڕەنگی ئاوەکەش دەگۆڕێت وەك قەوزە و گەڵای درەخت. ئەم جۆرە ئاوانەش ناوی ئاوی رووت (مطلق) دەیانگرێتەوە بەیەك دەنگی زانایان.

بەڵگەی ئەمەش بریتییە لەوە: هەرچی پێی بوترێت ئاو بە رووتی هیچ ناتۆرەی پێوە نەبێت ئەوە ئەو ئاوە پاککەرەوەیە وەك خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ المائدة: ٦ واتە: ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت ئەوە تەیەموم بکەن. خوای گەورە بەردەهای ئاوی بە پاکۆکەر ناوبردووە و لەکاتی نەبوونیدا تەیەموم دەکرێت.

**٢ـ ئاوی بەکارهاتوو:**

ئەو ئاوەیە لە ئەندامەکانی دەست نوێژگر و یا خۆشۆر جیانەبێتەوە.

أـ ئاوی بەکارهاتووی پاکە و پیس نابێت بەبەکارهێنانی بەبەڵگەی ئەم فەرموودە:

(عن جابر قال: جاء رسول اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي وأنا مَرِيضٌ لَا أَعْقِلُ فَتَوَضَّأَ وَصَبَّ عَلَيَّ من وَضُوئِهِ فَعَقَلْتُ..).[2]

---

١) رواه أبـوداود، ١/٥٥. والترمـذي ١/ ٩٥. وقـال حـديث حـسن. والنـسائي ١/ ١٧٤. وأحمـد ٣/ ١٥، ٣١، ٨٦. والشافعي ١/ ٢١. والطيالسي ص٢٩٢، رقم ٢١٩٩. وابن الجارود في المنتقى ٤٧. والطحاوي في شرح معاني الآثار ١١/١. والدارقطني ٢٩/١. والبيهقي ١/ ٤، ٢٥٧. والبغوي في شرح السنة ٢/ ٦٢. وقال: حديث حسن صحيح. وصححه أحمد ـ في التلخيص ٣١/١. والنووي في المجموع ١/ ٨٢. والألباني في الإرواء رقم ١٤.

٢) رواه البخاري، ١٨٧.

جابیر (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: جاریٚك نەخۆش بووم پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی کردم لەو کاتەدا لە هۆش خۆم چووبووم ئەنجا پیٚغەمبەر (ﷺ) دەست نویٚژی گرت و ئاوی دەست نویٚژەکەی پرژاند بەسەرمدا و هۆشم هاتەوە بەخۆمدا).

هەروەها ئەبو جوحەیفە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: (خَرَجَ عَلَيْنَا رسول اللّهِ ﷺ بالْهَاجِرَةِ فَأُتِيَ بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ فَجَعَلَ الناس يَأْخُذُونَ من فَضْلِ وَضُوئِهِ فَيَتَمَسَّحُونَ بِهِ).[1] (پیٚغەمبەری خودا (ﷺ) لەگەرمای نیوەڕۆدا هات بۆ لامان جا ئاوی دەست نویٚژیان بۆ هیٚنا و دەست نویٚژی گرت ئەنجا هاوەڵان لەو ئاوەی لیٚی مابوویەوە دەیان برد و دەیان هیٚنا بەدەست و دەم و چاویاندا).

ب ـ ئاوی بەکارهاتوو پاککەرەوەیە:

بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە: ڕوبەییعی کچی موعەویز دەڵیٚ: (أَنَّ النبي ﷺ مَسَحَ بِرَأْسِهِ من فضْلِ مَاءٍ كان فِي يَدِهِ).[2] (پیٚغەمبەر (ﷺ) مەسحی سەری کرد بەئاویٚ کە بەدەستییەوە بوو پاش شۆردنی دەستەکانی لەدەست نویٚژدا).

**٣ـ ئەو ئاوەی شتی پاکی تیٚکەڵ بووە:** وەك زەعفەران و سابون و ئارد و شتانیٚکی تری پاك کە بە زۆری لە ئاوەکە جیائەکریٚنەوە. پاککەرەوەیە بەمەرجیٚ ناوی ئاوی ڕووت (مطلق)ی پیٚوەما بیٚت ئەگەر ئەو ناوەی نەما ئەو ئاوە پاکە بەڵام پاککەرەوە نییە. بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە: (عن أُمِّ عَطِيَّةَ قالت لَمَّا مَاتَتْ زَيْنَبُ بِنْتُ رسول اللّهِ صلى الله عليه وسلم قال لنا رسول اللّهِ ﷺ اغْسِلْنَهَا وِتْراً ثَلاَثاً أو خَمْساً وَاجْعَلْنَ فِي الْخَامِسَةِ كَافُوراً أو شَيْئاً من كَافُورٍ فإذا غسلتنها فأعلمنني قالت فَأَعْلَمْنَاهُ فَأَعْطَانَا حَقْوَهُ وقال أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ).[3] (ئومو عەطییە- ڕەزای خوای لیٚ بیٚت- دەڵیٚ: کاتیٚك زەینەبی کچی پیٚغەمبەر (ﷺ) مرد پیٚغەمبەر (ﷺ) پیٚی وتین: چەند جاریٚك بیشۆن باتاك بیٚت سیٚ جار یان پیٚنج جار لە شۆردنی پیٚنجەمدا کافوری تیٚ بکەن یا هەندی لە کافوری تیٚ بکەن. وە کاتیٚ لەشۆردنەکەی بوونەوە ئاگادارم بکەن ، ئومو عەطییە

---

١) رواه البخاري، رقم ١٨٧.

٢) رواه أبوداود ٩٢/١ (١٣٠) ٠حديث حسن.

٣) رواه البخاري، ١٢٥٣. ومسلم ٩٣٩.

دەڵێ : كەلێ بووینەوە ئاگادارمان كرد. هات ئینزارەكەی خۆی داینێ و فەرمووی: وەك كراس بیكەنەبەری یەكەم جار - پێش كفنەكەی-).

وەبەبەڵگەی ئەم فەرمودەیە (عن أُمِّ هَانِئٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اغْتَسَلَ هو وَمَيْمُونَةُ من إِنَاءٍ وَاحِدٍ فِي قَصْعَةٍ فيها أَثَرُ الْعَجِينِ)[١] ئومو هانئ (رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) و مەیمونەی خێزانی بەئاوی تەشتێكی هەویراوی خۆیان شۆردووە).

لەم دوو فەرمووده‌یەدا ئاو تێكەڵ بەكافوور و بەئارد بووە. بەڵام ئەوەندە زۆر نەبوون ئاوەكە پێی نەووترێت ئاو لەبەر ئەوە پاككردنەوە بەو ئاوە دروست بوو.

**٤ـ ئەو ئاوەی پیسی تێكەوتبێت:**

أـ ئاو زۆربێت یان كەم ئەگەر پیسی تێكەوتبێت تام و ڕەنگ و بۆنی ئاوەكەی گۆڕی ئەوە پیسەو دروست نیە شتی پێ پاكبكرێتەوە بەبەڵگەی یەك دەنگی زانایان. ئیبنو لمونزیر و ئیبنو ڕوشد ئەم یەك دەنگی (إجماع) زانایانەیان گێراوەتەوە و باس كردووە[٢].

ب ـ ئاو زۆربێت یان كەم ئەگەر پیسی تێكەوتبێت تام و ڕەنگ و بۆنی ئاوەكەی نەگۆڕێ ئەوە پاك و پاككەرەوەشە بەم بەڵگانە:

١ـ فەرموودەی ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەربارەی بیری (بوضاعە) كە پێشتر باسمان كرد.

٢ـ عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێت: (عن عبد اللَّهِ بن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ قال رسول اللَّهِ ﷺ: إذا كان الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ لم يَحْمِلْ الْخَبَثَ).[٣] (ئەگەر ئاو بەئەندازەی قولەتەین بوو پیسی هەڵناگرێت یا هیچ شتێك پیسی ناكات).

---

١) رواه النسائي ١/ ١٣١ (٢٤٠). وابن ماجة ١٣٤/١ (٣٧٨) حديث حسن.

٢) بروانە كتێبی (الإجماع ص٣ و بداية المجتهد ٧٢/١)

٣) رواه أبوداود ٥١/١ (٦٣). والترمذي ٩٧/١ (٦٧). والنسائي ١٧٥/١. وابن ماجة ١٧٢/١ (٥١٧) حدرث صحيح.

# پیسی

**یەکەم: پیسی چی یە:** ئەو شتەیە کە پێویستە موسڵمانان خۆی لێ بپارێزێت وە ئەگەر بەر شوێنێکی بکەوێت دەبێ بیشوات و شوێنەکەی پاکی بکاتەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴾المدثر:٤ عن أبي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ (الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ)[١] واتە: جل و بەرگەکەت خاوێن ڕابگرە. پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: (پاك و خاوێنی نیوەی ئیمانە).

**دووەم: ئەو شتانەی کە پیسن:**

**١. میزی نادەمیزاد:** ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (جاء أَعْرَابِيٌّ فَبَالَ فِي طَائِفَةِ الْمَسْجِدِ فَزَجَرَهُ الناس فَنَهَاهُمْ النبي ﷺ فلما قَضَى بَوْلَهُ أَمَرَ النبي ﷺ بِذَنُوبٍ من مَاءٍ فَأُهْرِيقَ عليه).[٢] (عەرەبێکی دەشتەکی هات و لەبەشێکی مزگەوتدا میزی کرد، خەڵکیش تێیان خوڕی کەمیزنەکات لەمزگەوتدا بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری کرد لە خەڵکەکە و فەرموی: وازی لێ بێنن ئەنجا کە میزکردنەکەی تەواوکرد. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا دۆڵچەیەك ئاو بهێنن و کردیان بە جێگای میزەکەدا).

**٢. پیسایی نادەمیزاد:** ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پیغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (قَالَ إِذَا وَطِئَ أَحَدُكُمْ بِنَعْلِهِ فِي الْأَذَى فَإِنَّ التُّرَابَ لَهَا طَهُورٌ).[٣] (ئەگەر هەرکام لەئێوە پیلاوەکەی (نەعلەکەی) نا بە پیسایی دا ئەوە خۆڵ پاککرەوەیە بۆی).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پیغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إذا وطیء الأذَى بخُفَّيْهِ فَطَهُورُهُمَا التُّرَابُ).[٤] (ئەگەر هەرکام لە ئێوە خوفەکانی نا بەپیسایی دا ئەوە خۆڵ پاکی دەکاتەوە).

---

١) رواه مسلم (٢٢٣) و النسائي في عمل اليوم و الليلة ص ١٦٩.

٢) رواه البخاري، ٢٢١. ومسلم ٢٨٥.

٣) رواه أبوداود ٣٨٥. والحاكم ١/ ١٦٦. حديث حسن.

٤) رواه أبوداود ٣٨٦. وابن خزيمة ٢٩٢، والحاكم ١/ ١٦٦.

**٣. مەزی:** ئاوێکی سپی لینجە کاتی دەست بازی لەگەڵ خێزاندا یا ماچکردنی دێتەدەرەوە. لە پیاو و ژندا هەیە و پیسە. عەلی کوڕی ئەبوتالیب (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ( قال كنت رَجُلًا مَذَّاءً وَكُنْتُ أَسْتَحْيِي أَنْ أَسْأَلَ النبي ﷺ لِمَكَانِ ابْنَتِهِ، فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بن الآسْوَدِ فَسَأَلَهُ فقال يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ).[١] من پیاوێکی مەزی زۆر بووم. وە شەرمم کرد پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) بکەم لەبەر ئەوەی فاتیمەی کچی خێزانم بوو.بۆیە میقدادم ووت ئەو پرسیاری کرد پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (باعورەتی بشوا و دەست نوێژ بگرێت).

**٤. وەدی:** ئاوێکە پاش میزکردن دێتەدەرەوە و پیسە. بەڵگەی پیسیەتی یەك دەنگی زانایانە.
ئیمامی نەوەوی دەڵێ: (زانایان یەك دەنگن لەسەر پیسی مەزی و وەدی) [٢].
عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەڵێ: (عن ابن عباس قالَ: المني والمذي والودي فَالمني مِنهُ الغسل ومن هذين الوضوء يغسل ذكره ويتوضأ).[٣] (مەنی و مەزی و وەدی هاتنەدەرەوەی مەنی خۆشۆردنی دەوێ، بەڵام مەزی و وەدی عەورەت بشوات و دەست نوێژبگرێت).

**٥ - لیکی سەگ:** ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پیغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (إذا شَرِبَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعًا).[٤] وفي رواية: (أُولَاهُنَّ بِالتُّرَابِ).[٥] (ئەگەر سەگ ئاوی خواردەوە لەدەفر و قاپی هەرکامتاندا باحەوت جار بیشوات یەکەمجاریان بەخۆڵ بێت).
عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پیغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إذا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي الْإِنَاءِ فَاغْسِلُوهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ وَعَفِّرُوهُ الثَّامِنَةَ بِالتُّرَابِ).[٦] (ئەگەر سەگ دەمی خستە دەفر و قاپی هەرکەسێکتانەوە ئەوە حەوت جار بیشۆن هەشتەم جار بەقوڕاو بێت).

---

١) رواه البخاري، ١٧٨. ومسلم ١٧/ ٣٠٣.
٢) المجموع، ١/ ٥٥٢.
٣) السنن الكبرى ١/ ١١٥.
٤) رواه البخاري، ١٧٢. ومسلم ٩٠/ ٢٧٩.
٥) رواه مسلم ٩١/ ٢٧٩.
٦) رواه مسلم ٢٨٠.

**٦ـ مردارەوە بوو:** هەر ئاژەڵێکە گیانی دەرچووبێ بەبێ سەربڕینی شەرعی. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ ﴾ **المائدة:** ٣ واتە: خواردنی گۆشتی مرداردەوبوونتان لەسەر حەرام کراوە. حەرامییەکەشی لەبەر پیسییەتی. بەڵام ئەمانەی باسیان دەکرێن حوکمی مرداردەوە بوویان نیە و بە مرداردەوە بوو دانانرێن:

**أ- مردووی ئادەمیزاد:** خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴾ **الإسراء:**٧٠ واتە: بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لەنەوەی ئادەم ناوە. جا ڕێزگرتنەکەی وا دەخوازێت کە بەزیندووی و مردووی پاك بێت، وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: (سبحان الله إِنَّ الْمُسْلِمَ لَا يَنْجُسُ).[1] **واتە:** (پاك و بێگەردی بۆ خوا موسڵمان پیس نابێت).

وە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا تنجسوا موتاكم فإن المسلم ليس بنجس حيا ولا ميتا).[2] (مردوودکانتان پیس مەکەن، چونکە موسڵمان پیس نابێت نەبەمردووی نەبەزیندووی).

**ب - ج - ماسی و کوللەی مردوو:** (عَنِ بن عُمَرَ قال قال رسول اللهِ ﷺ أُحِلَّتْ لنا مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ فَالْحُوتُ وَالْجَرَادُ وَأَمَّا الدَّمَانِ فَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ).[3] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەبەر (ﷺ) فەرمووی : (دوو مرداربوو و دوو جۆر خوێنمان بۆ حەڵاڵ کراوە. دوومردارەوە بووە کەماسی و کوللەن. دوو خوێنەکەش جگەر و سپڵن).

**د - مردارەوە بووی ئەو جانەوەرانەی خوێنیان نییە:** وەك مێروله و هەنگ و مێش. ئەمانە پاکن ئەگەر کەوتنە شلەیەکەوە و تێیدا مردار بوونەوە.

(عن أبي هُرَيْرَةَ ان النبي ﷺ قال إذا وَقَعَ الذُّبَابُ في شَرَابِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ كُلَّهُ ثُمَّ لِيَطْرَحْهُ فإن في أَحَدِ جَنَاحَيْهِ شِفَاءً وفي الآخَرِ دَاءً).[1] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ:

---

١) رواه البخاري ٢٨٣.ومسلم٣٧١.

٢) أخرجه الحاكم ١/ ٣٨٥. والدارقطني ٢/ ٧٠. وصححه الحاكم على شرطهما.

٣) رواه أحمد ٢/ ٩٧. وابن ماجة ٣٢١٨. والدارقطني ٤/ ٢٧١، ٢٧٢.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر مێش کەوتە خواردنی کەسێکتانەوە با بیکات بەناو خواردنەوەکەدا و ئینجا فڕێی دا. چونکە باڵێکیان شیفای تێدایە و لەباڵەکەی تریدا نەخۆشی تێدایە).[1]

**٧. خوێنی حەیز:** (عن أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ أَنها قالت سَأَلَتْ امْرَأَةٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فقالت يا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِحْدَانَا إذا أَصَابَ ثَوْبَهَا الدَّمُ من الْحَيْضَةِ كَيْفَ تَصْنَعُ فقال رسول اللَّهِ ﷺ إذا أَصَابَ ثَوْبَ إِحْدَاكُنَّ الدَّمُ من الْحَيْضَةِ فَلْتَقْرُصْهُ ثُمَّ لِتَنْضَحْهُ بِمَاءٍ ثُمَّ لِتُصَلِّي فيه).[2] ئەسمای کچی ئەبوبەکر (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: (ئافرەتێك پرسیاری لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد و ووتی: هەواڵم بدەرێ ئەگەر کەسێکمان خوێنی حەیز بەر کراسەکەی بکەوێت چی لێ بکات؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر خوێنی حەیز بەر کراسی کەسێکتان کەوت با بیپروێنێت پاشان ئاوی پێدابکات ئەنجا نوێژی پێوە بکات).

**٨ ـ میز و تەرسی ئەو حەیوانانەی کە گۆشتیان ناخورێت:** وەك ئێستر و ئەسپ و کەر.

(عن عَبْدَ اللَّهِ يقول أتى النبي ﷺ الْغَائِطَ فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَهُ بِثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ فَوَجَدْتُ حَجَرَيْنِ وَالْتَمَسْتُ الثَّالِثَ فلم أَجِدْهُ فَأَخَذْتُ رَوْثَةً فَأَتَيْتُهُ بها فَأَخَذَ الْحَجَرَيْنِ وَأَلْقَى الرَّوْثَةَ وقال هذا رِكْسٌ).[3] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵی: پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆشت دەست بەئاو بگەیەنێت داوای لێ کردم سێ بەردی بۆ بەرم - خوی پێ پاك بکاتەوە- منیش دوو بەردم دۆزییەوە و گەڕام بۆ بەردی سێیەم دەستم نەکەوت تەرسێکم دۆزیەوە بۆم برد. ئەویش دوو بەردەکەی لێ وەرگرتم و تەرسەکەی فڕێ دا و فەرمووی: ئەم پیسە).

**٩-١٠. خوێن و گۆشتی بەراز:** خوای گەورە دەفەرموێت﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ ﴾ الأنعام:١٤٥ واتە: لەو شتانەی حەرام کراون یا خوێنی ڕژاو بێت یان گۆشتی بەراز بێت ئەوە بێگومان پیسن.

---

١) رواه البخاري ٣٣٢٠. وابوداود ٣٨٤٤. وابن ماجه ٣٥٠٥.

٢) رواه البخاري ٣٠٧. ومسلم ٢٩١.

٣) رواه البخاري ١٥٦. والترمذي ١٧ والنسائي ١/ ٣٩. وابن خزيمة ٧٠.

**١١- ئەو ئاژەڵەی پیسی دەخوات ( الجلالة ):**

(عن ابن عباس قال نهى رسول اللَّهِ ﷺ عن أَكْلِ الْجَلَّالَةِ وَأَلْبَانِهَا).[١] عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە لەخواردنی گۆشتی پیسایی خۆر و خواردنەوەی شیرەکەی).

**١٢- عارەق بە لای جەماوەری زانایانە پیسە** بەبەڵگەی ئەم ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ **المائدة**: ٩٠ واتە: عارەق و قومار و بت و ئەزلام -جۆرێکە لەبەخت تاقی کردنەوە- پیسن و لەکرداری شەیتانن.

---

١) رواه ابوداود ٣٧٨٥. والترمذي ١٨٢٤. وابن ماجه ١٣٨٩.

# پاککردنەوەی پیسبووەکان

**یەکەم: پاککردنەوەی جل و بەرگ لە میزی منداڵ.**

(عن أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ أنها أَتَتْ بِابْنٍ لها صَغِيرٍ لم يَأْكُلْ الطَّعَامَ إلى رسول اللَّهِ ﷺ فَأَجْلَسَهُ رسول اللَّهِ ﷺ في حَجْرِهِ فَبَالَ على ثَوْبِهِ فَدَعَا بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ و لم يَغْسِلْهُ).[1] ئومو قەیس کچی محصەنی (ڕەزای خوای لێ بێت) منداڵێکی ساوای خۆی کە شیرەخۆربوو خواردنی نەدەخوارد هێنای بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیغەمبەریش (ﷺ) لەکۆشیا داینا و میزی کرد بە جلەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) جا داوای ئاوی کردو بۆیان هێنا و پرژاندی بە جلەکانی و نەیشۆرد.

ئاو لێ پرژاندن بۆ کوڕی شیرەخۆرە و شۆردنیش بۆکچ فەرموودەکەی صەحیحە بەروونی ئەمە دەگەیەنێت.

(قال أبو السَّمْحِ فَأُتِيَ بِحَسَنٍ أو حُسَيْنٍ رضي الله عنهما فَبَالَ على صَدْرِهِ فَجِئْتُ أَغْسِلُهُ فقال يُغْسَلُ من بَوْلِ الْجَارِيَةِ وَيُرَشُّ من بَوْلِ الْغُلَامِ).[2] ئەبو سەمح (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (حەسەن یا حوسەینیان هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گرتی بە باوەشیەوە میزی کرد بەسنگی دا منیش ڕۆشتم بیشۆرم فەرمووی: (میزی کچی شیرە خۆرە بەرجل و بەرگ کەوت دەشۆردرێ و میزی کوڕی شیرەخۆرە ئاوی لێ دەپژێنرێ).

**دووەم: پاککردنەوەی جل و بەرگ لە مەزی:**

(عن عَلِيٍّ بن أبي طالب رضي الله عنه قال: كنت رَجُلًا مَذَّاءً وَكُنْتُ أَسْتَحْيِي أَنْ أَسْأَلَ النبي ﷺ لِمَكَانِ ابْنَتِهِ فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بن الآسْوَدِ فَسَأَلَهُ فقال يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ).[3] عەلی کوڕی ئەبوتالیب (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: من پیاوێکی مەزی زۆر بووم. وە شەرمم کرد پرسیار

١) رواه البخاري، ٢٢٣. ومسلم ١٠٤/ ٢٨٧.

٢) رواه ابوداود ٣٧٦. والنسائي ١/ ١٥٨. وابن ماجه ٥٢٦. والحاكم ١/ ١٦٦. حديث صحيح.

٣) رواه البخاري، ٢٦٩. ومسلم ٣٠٣.

لە پێغەمبەر (ﷺ) بکەم لەبەر ئەوەی فاتیمەی کچی خێزانم بوو. بۆیە بە میقدادم ووت ئەو پرسیاری کرد پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (باعورەتی بشوا و دەست نوێژ بگرێت).

**سێیەم: پاککردنەوەی پێستەی مردارۆبوو:**

پێستەی ئاژەڵی مردارۆبوو بە خۆشکردن دەر و ناوی پێستەکە پاك دەبێتەوە، (عن ابن عَبَّاسٍ قال سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول إذا دُبِغَ الْإِهَابُ فَقَدْ طَهُرَ).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست فەرمووی: (ئەگەر پێستە خۆشەکرا بێگومان پاك دەبێتەوە).

**چوارەم: پاککردنەوەی پۆشاك لە خوێنی حەیز:**

(عن أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ أنها قالت سَأَلَتْ امْرَأَةٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فقالت يا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِحْدَانَا إذا أَصَابَ ثَوْبَهَا الدَّمُ من الْحَيْضَةِ كَيْفَ تَصْنَعُ فقال رسول اللَّهِ ﷺ إذا أَصَابَ ثَوْبَ إِحْدَاكُنَّ الدَّمُ من الْحَيْضَةِ فَلْتَقْرُصْهُ ثُمَّ لِتَنْضَحْهُ بِمَاءٍ ثُمَّ لِتُصَلِّي فيه).[2] ئەسمای کچی ئەبوبەکر (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: (ئافرەتێك پرسیاری لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد و ووتی: پێم بڵێ ئەگەر کەسێکمان خوێنی حەیز بەر کراسەکەی بکەوێت چی لێ بکات؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر خوێنی حەیز بەر کراسی کەسێکتان کەوت با بیپروێنێت پاشان ئاوی پێدابکات ئەنجا نوێژی پێوە بکات). ئەگەر خوێنی حەیزەکە دوای پرواندن و شۆرینی هەر ڕەنگ بە جلەکانەوە مایەوە قەیناکات.

**پێنجەم: پاککردنەوەی زەوی:**

ئەگەر زەوی پیسی کەوتە سەر بەدوو شێوە پاك دەبیتەوە:

أ- بە ئاو کردن بەسەریدا وەك لەفەرموودەکەی ئەنەسدا رابورد لەباسی پیسی میزی ئادەمیزاد.

ب - بە ووشك بوونەوە بەخۆر یا هەوا کەهیچ ئاسەوارێکی پیسیەکە نەمێنێت بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە (قال ابن عُمَرَ كنت أَبِيتُ في الْمَسْجِدِ في عَهْدِ رسول اللَّهِ ﷺ وَكُنْتُ فَتًى شَابًّا

---

١) رواه مسلم ٣٦٦. واحمد ١/ ٢١٩.

٢) رواه البخاري، ٣٠٧. ومسلم ٢٩١..

عَزَبًا وَكَانَتْ الْكِلَابُ تَبُولُ وَتُقْبِلُ وَتُدْبِرُ فِي الْمَسْجِدِ فلم يَكُونُوا يَرُشُّونَ شيئا من ذلك).[١]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (من کوڕێکی گەنج بووم لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) شەو لە مزگەوتدا دەمامەوە و دەخەوتم، سەگ دەهاتن لەمزگەوتەکەدا میزیان دەکرد و دەڕۆشتن بەڵام موسوڵمانان ئاویان نەدەکرد بەشوێنی میزەکەدا).

کەواتە زەوییەکە بەووشك بوونەوە پاك دەبێتەوە[٢].

**شەشەم: پاككردنەوەی ژێری پێڵاو و نەعل:**

پێڵاو و نەعل ئەگەر ژێریان پیس بوو بەخشاندنیان بە زەویدا پاك دەبنەوە بەمەرجێ شوێنەواری پیسییەکەیان پێوە نەمێنێ بە بەڵگەی (عن أبي سَعِيدٍ الخدري ان رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال: إذا جاء أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَقْلِبْ نعله فَلْيَنْظُرْ فيها فان رَأَى بها خَبَثاً فليمسه بالآرْضِ ثُمَّ لِيُصَلِّ فِيهِمَا).[٣]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان هات بۆ مزگەوت با نەعلەکەی هەڵبگێڕێتەوە سەیریان بکات ئەگەر پیسی بینی پێیانەوە با بیسڕێ بە زەویدا پاشان نوێژیان پێوە بکات بێ ئەوەی دایان بکەنێت).

**حەوتەم: پاككردنەوەی دامێنی كراسی ئافرەت:**

(لحديث حميدة أنها سَأَلَتْ أُمَّ سَلَمَةَ زَوْجَ النبي ﷺ فقالت إني امْرَأَةٌ أُطِيلُ ذَيْلِي وَأَمْشِي في الْمَكَانِ الْقَذِرِ فقالت أُمُّ سَلَمَةَ قال رسول اللَّهِ ﷺ يُطَهِّرُهُ ما بَعْدَهُ).[٤] حومەیدە دەڵێ پرسیارم لە ئومو سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) کرد و ووتم: من ئافرەتێکم دامێنی کراسەکەم درێژ دەکەم و بەناو شوێنی پیسدا دەڕۆم ئەوە حوکمەکەی چییە؟ ئومو سەلەمە ووتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (خشاندنی بەزەویدا پاش پیس بوونی پاکی دەکاتەوە).

---

١) رواه ابوداود ٣٨٢. والبغوي ٣٨٢ حديث صحيح.

٢) بڕوانە (فتح الباري شرح صحيح البخاري ١/٢٧٩).

٣) رواه احمد ٣/ ٢٠. وابوداود ٦٥٠. والحاكم ١/ ٢٦٠ حديث حسن.

٤) رواه ابو داود (٣٨٣) و الترمذي (١٤٣) و ابن ماجه (٥٣١) حديث حسن بشواهده.

**هەشتەم: سوننەتە ئەگەر مەنی بەر جل و بەرگ کەوت بشۆرێت:**

ئەگەر مەنیەکە تەڕ بوو سوننەتە بشۆرێت ئەگەر ووشك بوو سوننەتە بیروێنرێت بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە (عن عَائِشَةَ قالت كنت أَغْسِلُ الْجَنَابَةَ من ثَوْبِ النبي ﷺ فَيَخْرُجُ إلى الصَّلَاةِ وَإِنَّ بُقَعَ الْمَاءِ في ثَوْبِهِ).[1] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (من مەنیم بەجلەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەشۆرد ئەنجا دەڕۆشتە دەرەوە بۆ نوێژ پەڵەی ئاوەکە بەجلەکانیەوە بوو) بوخاری گێڕاویەتەوە. (وفي لفظ مسلم: لقد كنت أفركه من ثوب رسول الله ﷺ فركاً فيصلي فيه).[2] لە ریوایەتەکەی موسلم دا دەڵێ: (من مەنیم ئەپرواند بە جلەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەوسا نوێژی پێوە دەکرد).

هەندێك لە زانایان مەنی بەپیس دادەنێن و هەندێکی تریان بەپاکی دادەنێن ئەو رایەیان بەهێز کە پاکە لە ڕووی بەڵگەوە کە لەرای ئیمامی شافیعی و ئیمام ئەحمەدە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت).

---

١) رواه البخاري، ٢٢٩.

٢) رواه مسلم ٢٨٨.

# باسی قاپ و دەفر و جام (الأواني)

مەبەست لەم باسە ئەو دەفر و قاپانەیە كە شلەمەنی و شتانی تری تێدەكرێ

**یەكەم: حوكمی بەكارهێنانی قاپ و قاپاغی ئاڵتون و زیو:**

حەرامە دەفر و قاپ و قاپاغی زیو بەكاربهێنرێ بۆ دەست نوێژ گرتن و ئاو خواردنەوە و خواردن مەگەر بۆ زەرورەت كە هیچ نەبێت بەكاربهێنرێ ئاڵتون یا زیو نەبێت. بە بەڵگەی فەرموودەی حوزەیفە (رەزای خوای لێ بێت) كە دەڵێ: (سمعت النبي ﷺ يقول: لَا تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ ولا الدِّيبَاجَ ولا تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ ولا تَأْكُلُوا فِي صِحَافِهَا فَإِنَّهَا لهم فِي الدُّنْيَا وَلَنَا فِي الْآخِرَةِ).[1] لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست دەیفەرموو (ئاوریشم و دیباج[2] لەبەر مەكەن وە لە قاپ و دەفری ئاڵتون و زیوودا مەخۆن و مەخۆنەوە. بێ گومان ئەو لە دنیادا بۆ بێ باوەڕانە و لە دوارۆژدا بۆ ئێمەیە).

لە فەرموودەكەدا باسی حەرامی خواردن و خواردنەوەی قاپ و قاپاغی ئاڵتون و زیوو كراوە بەكارهێنانیان بۆ هەر شتێكی تر حەرامە وەك بەكارهێنانیان بۆ خواردن و خواردنەوە، وە پیاوان و ئافرەتان یەكسانن لەم حوكمەدا. وە دروست نیە هەڵگرتن و دانیان بۆ جوانی لە پیشەنگا و وشتی وادا.

**دووەم: حوكمی چاك كرنەوەی قاپ و قاپاغ بەئاڵتون و زیو:**

حەرامە چاككردنەوەو پینە كردنی قاپ و قاپاغ بەئاڵتوون جیاوازی نیە پینەكە گەورە بێت یان بچووك بەڵام پینە كردن بەزیوو ئەگەر پینەكە بچووك بوو وە بۆ جوانیش نەبوو ئەوە دروستە. بەڵام ئەگەر پینەكە گەورە بوو بۆ جوانیش بوو ئەوە حەرامە خۆ ئەگەر گەورە بوو بۆ پێویستی بوو یان بچووك بوو بۆ جوانی بوو ئەوە كەراهەتی هەیە.

---

١) رواه البخاري، ٥١١٠. ومسلم ٢٠٦٧.

٢) دیباج: جۆرێكی نایابی ئاوریشمە.

بەڵگەی دروستی پینەی گەورەی پێویست بەزیوو فەرموودەی عاصیمی ئەحوەلە کە دەڵێ: (رأيت قَدَحَ النبي ﷺ عِنْدَ أَنسِ بن مَالِكٍ وكان قد انْصَدَعَ فَسَلْسَلَهُ بِفِضَّةٍ قال أَنسٌ لقد سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي هذا الْقَدَحِ أَكْثَرَ من كَذَا وَكَذَا).[1] قاپەکەی پێغەمبەرم (ﷺ) دی لای ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لی بێت) کە درزی تێ بوو بوو بە تەلێکی زیوو بەستبووی، ئەنەس ووتی سوێند بەخوا لەم قاپەدا زیاتر لەئەوەندە و ئەوەندە جار ئاوم داوە بە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خواردنەوە).

**سێ هەم: حوکمی بەکارهێنانی قاپ و قاچاغی دروست کراو لە کانزا بەنرخ و گران بەهاکان:**

دروستە بەکارهێنانی قاپ و جام و دەفری دروست کراو لەکانزا گران بەهاکان وەك ئەڵماس و مرواری و مەرجان. چونکە دەقێك نەهاتووە بەکارهێنانیانی قەدەغە کرد بێت.

**چوارەم: حوکمی بەکارهێنانی قاپ و قاچاغی کافران:**

دروستە بەکارهێنانی ئەو دەفرو قاپ و قاچاغانە. (عن أبي ثعلبة رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال: فاغسلوها وكلوا فيها).[2] بەڵگەی فەرموودەی ئەبو سەعلەبە (ڕەزای خوای لێ بێت) کەدەڵێ: (ﷺ) دەربارەی قاپ و قاچاغی کافران: (بیانشۆرن و خواردنیان تێدا بخۆن).

فرمان کردنیش بەشۆردنیان سوننەتە چونکە دەگونجێ پیس بوو بێت بەهۆی بەکارهێنانیانەوە لەلایەن کافرانەوە بۆ عارەق خواردنەوە یان گۆشتی بەراز یان تێدا خورا بێت.

بەکارهێنانی جل و بەرگیشیان دروستە وەك بەکارهێنانی قاپ و قاچاغیان.

---

١) رواه البخاري، ٥٣١٥.

٢) رواه البخاري، ٥١٦١.

# خۆ پاککردنەوە و ئادابەکانی

**یەکەم: مەبەست لە خۆ پاککردنەوە:** تارەت گرتن و خۆپاککردنەوەی پاش و پێش ئادەمیزادە لە میزو پیسایی بەئاو یان بەبەرد.

**دووەم: حوکمی خۆپاککردنەوە و تارەت گرتن:** واجبە خۆپاککردنەوە لەپیسی میزو پیسایی بە بەڵگەی ئەو فەرموودانەی دواتر باسیان دەکەین.

**سێ هەم: خۆ پاککردنەوە بەچی دەبێت:** دروستە خۆ پاککردنەوە بەئاوی رووت (مطلق) هەروەها دروستە بەهەر شتێکی رەقی زبر کەپیسیەکە لاببات وەك بەرد و دارو کاغەز.

(يقول أنس بن مالك: كان رسول الله ﷺ يدخل الخلاء. فأحمل أنا، وغلام نحوي، إداوة من ماء. وعنزة. فيستنجي بالماء).[١] ئەنەسی کوری مالیك دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) رۆشت بۆ دەست گەیاندن بەئاو من و منداڵێکی وەك من مەسینەیەك ئاو و حەربەیەکی بچووکمان هەڵدەگرت -کە هی پێغەمبەر بوو (ﷺ)- ئەنجا بە ئاوەکە تارەتی دەگرت).

(يقول عَبْد اللَّهِ أتى النبي ﷺ الْغَائِطَ فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَهُ بِثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ).[٢] عەبدوڵڵای کوری مەسعوود (رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) چوویە سەر ئاو و فەرمانی پێ کردم کەسێ بەردی بۆ ببەم ـ تا خۆی پێ پاك بکاتەوە ـ ).

(عن عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال إذا ذَهَب أحدكم إلى الْغَائِطِ فَلْيَذْهَبْ معه بِثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ يَسْتَطِيبُ بِهِنَّ فَإِنَّهَا تُجْزِئُ عنه).[٣] عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان رۆشتە سەر ئاو باسێ بەرد لەگەڵ خۆی ببات و خۆی پێیان پاك بکاتەوە، چونکە بەو شێوە بری پاك کردنەوە دەکەوێت).

---

١) رواه البخاري ١٥٢. ومسلم ٢٧١.

٢) رواه البخاري ١٥٦.

٣) رواه ابوداود ٤٠. والنسائي ٤٤. واحمد ٦/ ١٠٨. حديث حسن بشواهده.

**چوارەم: ئەو شتانەی خۆ پاککردنەوە پێیان دروست نیە:**

خۆ پاککردنەوە دروست نیە بەشتێ کە پیس بێت یان پیس بوو بێ، چونکە لەبەری پاککردنەوە پیستری دەکات (يقول عَبْدَ اللَّهِ أتى النبي ﷺ الْغَائِطَ فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَهُ بِثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ فَوَجَدْتُ حَجَرَيْنِ وَالْتَمَسْتُ الثَّالِثَ فلم أَجِدْهُ فَأَخَذْتُ رَوْثَةً فَأَتَيْتُهُ بها فَأَخَذَ الْحَجَرَيْنِ وَأَلْقَى الرَّوْثَةَ وقال هذا رِكْسٌ).[1] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ( پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆشتە سەر ئاو فەرمانی پێدام سێ بەردی بۆ بەرم منیش دوو بەردم دۆزییەوە و گەرام بۆ سێ یەم بەڵام نەم دۆزییەوە، بۆیە تەرسێکم هەڵگرت لەگەڵ دووبەردکەدا بۆم برد دوو بەردەکەم هەڵگرت و تەرسەکەی فڕێ دا فەرمووی ئەمە پیسە).

هەروەها دروست نیە خۆپاککردنەوە بەشتێ خواردنی مرۆڤ یان جنۆکە بێت وەك نان و ئێسقان. (عن ابن مسعود رضي الله عنه عن رسول الله ﷺ فقال آتاني دَاعِي الْجِنِّ فَذَهَبْتُ معه فَقَرَأْتُ عليهم الْقُرْآنَ، قال وسَأَلُوهُ الزَّادَ فقال لَكُمْ كُلُّ عَظْمٍ ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عليه يَقَعُ في أَيْدِيكُمْ أَوْفَرَ ما يَكُونُ لَحْمًا وَكُلُّ بَعْرَةٍ عَلَفٌ لِدَوَابِّكُمْ. فقال رسول اللَّهِ ﷺ فلا تَسْتَنْجُوا بهمَا فَإِنَّهُمَا طَعَامُ إِخْوَانِكُمْ).[2] وبرواية: (لَا تَسْتَنْجُوا بِالرَّوْثِ ولا بِالْعِظَامِ فإنه زَادُ إِخْوَانِكُمْ من الْجِنِّ).[3] عەبدوڵڵای کوڕی مسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (نوێنەرێکی جنۆکە هات بۆ لام منیش لەگەڵی ڕۆشتم و قورئانم بۆ خوێندن) عەبدوڵڵا دەڵێ جنۆکەکان پرسیاری خواردن و زەخیرەیان لێ کرد پێغەمبەریش فەرمووی: (هەر ئیسقانێکتان بەدەست کەوت کەناوی خوای لێ برابێ - لەکاتی سەربڕینی دا- گۆشتی چاکی پێوە دەبێت -ئەو ئیسقانە بۆ خۆیان- وە هەموو تەرس پاشەڕۆی ئاژەڵیش ئالف و ئالیکە بۆ ئاژەلەکانتان). بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (بەئێسقان و تەرس خۆتان پاك مەکەنەوە چونکە خۆراکی برا جنۆکەکانتانن). لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: (بەتەرس و ئیسقان خۆتان پاك مەکەنەوە، چونکە خواردنی برا جنۆکەکانتانن).

---

١) رواه البخاري ١٥٦.

٢) رواه مسلم ٤٥٠.

٣) رواه الترمذي ١٨.

جابە قیاس لەسەر ئەم فەرموودانە خواردنی ئادەمیزاد پێشترە لە خواردنی جنۆکە کە نابێ بۆ خۆ پاککردنەوە بەکاربێت.

**پێنجەم: ئادابەکانی خۆ پاککردنەوەو ڕۆشتنە سەر ئاو:**

ئەمانەی خوارەوە ئەو ئاداب و سوننەتانەن کە داواکراوە لەموسوڵمانان لەکاتی چوونە سەر ئاوو خۆ پاککردنەوەدا ڕەچاویان بکات:

**١ـ حەرامە پیسایی کردن لەڕێگای هاتووچۆی خەڵك** یا جێگاو سێبەرێك تێدا دادەنیشن. چونکە ئەو کارە زیانیان پێ دەگەیەنێ.

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال اتَّقُوا اللَّعَّانَيْنِ قالوا وما اللَّعَّانَانِ يا رَسُولَ اللَّهِ قال الذي يَتَخَلَّى في طَرِيقِ الناس أو في ظِلِّهِمْ).[١] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: **پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (خۆتان بپارێزن لەو دوو نەفەرەت لێکراوە) ووتیان ئەو دوو نەفرەت لێکراوە چین ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: (ئەوەی لە سەرە ڕێگای خەڵکی دا پیسی دەکات، یان لەسێبەرەکانیاندا) (کە تێیدا دادەنیشن).**

**٢ـ حەرامە میز کردنە ئاوی ڕاوەستاو:**

(عن أبي هريرة رضي الله عنه ان رسول الله ﷺ قال لَا يَبُولَنَّ أحدكم في الْمَاءِ الدَّائِمِ الذي لَا يَجْرِي ثُمَّ يَغْتَسِلُ فيه).[٢] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: **پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (با کەستان میز نەکاتە ئاوی وەستاوو پاشان خۆیشی تێدا بشوات).** وفي رواية: (لَا يَغْتَسِلْ أحدكم في الْمَاءِ الدَّائِمِ وهو جُنُبٌ).[٣] وە لە گێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: **(با کەستان لەئاوی ڕاوەستاودا خۆی نەشوات لەکاتێکدا لەشی پیسە).**

---

١) رواه مسلم ٢٦٩. وابوداود ٢٥. واحمد ٢/ ٣٧٢.

٢) رواه البخاري ٢٣٩. ومسلم ٢٨٢.

٣) رواه مسلم ٢٨٣.

**٣ـ حەرامە ڕووکردن و پشت کردنە قیبلە لەدەرو دەشت دا بەلاّم لەناو خانوو ماڵدا دروستە:**
(عن أبي أيوب الأنصاريّ أنّ النبي ﷺ قال إذا أتيتُمْ الْغَائط فلا تستقبلوا الْقبْلَةَ ولا تَسْتَدْبِرُوها ولَكِنْ شرّقوا أو غرّبوا.)[١] ئەبو ئەیوبی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر ڕۆشتنە سەرئاو بۆ میز و پیسی ڕوو مەکەنە قیبلە و پشتیشی تێ مەکەن بەڵکو ڕوو بکەنە خۆرهەلاّت و خۆرئاوا)
عن عبد الله بن عُمَرَ قال (رَقِيتُ يَوْماً فَوْقَ بَيْتِ حَفْصَةَ فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللّهِ ﷺ على حَاجَتِهِ مُسْتَقْبِلَ الشَّامِ مُسْتَدْبِرَ الْقِبْلَةِ) وە عبداللە ی کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (ڕۆژێکیان ڕۆشتمە سەربانی ماڵی حەفصە -خێزانی پێغەمبەر- پێغەمبەرم (ﷺ) بینی ڕووی لە شام بوو پشتی لە قیبلە بوو دەستی بەئاو دەگەیاند).

**٤ـ سوننەتە دوور کەوتنەوە و خۆ وون کردن لەکاتی دەس بەئاو گەیاندندا:**
ئەگەر لەدەرو دەشت دا سەر ئاو کرا پەسەند دوورکەوتنەو لەچاو وون بوون.
(عن المغيرة بن شعبة قال: قال لي النبي ﷺ (خذ الاداوة)، فانطلق حتى توارى عني فقضى حاجته).[٢] موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی ووتم (مەسینەکە هەڵگرە) ئەنجا ڕۆشت تا لە مە وون بوو و دەستی بەئاو گەیاند....).

**٥ـ کاتی چوونە سەر ئاو پەسەندە ئەم دووعایە بخوێنی:** (اللهم إني اعوذ بك من الخبث والخبائث)
(عن أنس بن مالك رضي الله عنه أن النبي ﷺ كان إذا دخل الخلاء قال: اللهم إني أعوذ بك من الخبث والخبائث).[٣] ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ بڕۆشتایەتە سەر ئاو دەیفەرموو: (اللهم إني اعوذ بك من الخبث والخبائث).[٤]

---

١) رواه البخاري ٣٩٤. ومسلم ٢٦٤.
٢) رواه البخاري ١٤٨. ومسلم ٢٢٦.
٣) رواه البخاري٣٦٣. ومسلم ٢٧٤.
٤) رواه البخاري ١٤٢. ومسلم ٣٧٥.

**٦ـ نابێ بەدەستی ڕاست خۆ پاك بکەیتەوە:**

عن أبي قَتَادَةَ عن أبيه قال قال رسول اللّهِ ﷺ لَا يُمْسِكَنَّ أحدكم ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ وهو يَبُولُ ولا يَتَمَسَّحْ من الْخَلَاءِ بِيَمِينِهِ).[1] عەبدوڵڵای کوری ئەبو قەتادە لەباوکیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (با کەستان زەکەری بەدەستی راستی نەگرێت لەکاتی میز کردندا، لەسەر ئاویشدا بەدەستی راست خۆی پاك نەکاتەوە).

**٧ـ پێویستە خۆ پاراستن لەمیز:**

(عن ابن عَبَّاسٍ قال مَرَّ النبي ﷺ بِقَبْرَيْنِ فقال إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ وما يُعَذَّبَانِ في كَبِيرٍ أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لَا يَسْتَتِرُ من الْبَوْلِ وَأَمَّا الْآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ).[2] عەبدوڵڵای کوری عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی فەرمووی: (ئەم دووانە سزا دەدرێن، بەڵام لەسەر شتی گەورەش سزا نادرێن- چونکە ئەکرا خۆیانی لێ بپارێزن- یەکێکیان خۆی نەدەپاراست لە میزەکەی ، ئەوی تریان قسەی دەهێناو دەبرد).

**٨. کاتی لەسەر ئاو هاتنە دەرەوە سوننەتە بڵێ ی: (غفرانك)**

(عن عائِشَةُ رضي الله عنها أنّ النبي ﷺ كان إذا خرجَ من الْغَائِطِ قال غُفْرَانَكَ ).[3] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ لەسەر ئاو بهاتایەتە دەرەوە دەیفەرموو: (غفرانك).

---

١) رواه البخاري ١٥٤. ومسلم ٢٦٧.

٢) رواه البخاري ٢١٦. ومسلم ٢٩٢.

٣) رواه ابوداود ٣٠. والترمذي ٧ وابن ماجة ٣٠٠.

# سروشتە پاکەکان

(عن عَائِشَةَ قالت قال رسول اللَّهِ ﷺ عَشْرٌ من الْفِطْرَةِ قَصُّ الشَّارِبِ وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ وَالسِّوَاكُ وَاسْتِنْشَاقُ الْمَاءِ وَقَصُّ الْأَظْفَارِ وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ وَنَتْفُ الْإِبطِ وَحَلْقُ الْعَانَةِ وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ قال زكريا قال مُصْعَبٌ وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ إلا أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ).[1] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (دە شت لە سروشتی پاکن: کورت کردنەوەی سمێڵ، هێشتنەوەی ڕیش، سیواك کردن، ئاو لە لووت ڕادان، نینۆك کردن، شۆرینی جومگەی پەنجەکان مووی بن باڵ هەڵکەندن، بەر تاشین، تارەت گرتن) موصعەب -کە راویەکی فەرموودەکەیە- دەڵێ دەیەمم بیر چووە ئەگەر ئاو لەدەم ڕادان نەبێت).

(عن أبي هريرة ان النبي ﷺ قال الفطرة خمس الإختتان والاستحداد وقص الشارب وتقليم الأظافر ونتف الأبط).[2] وە ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (سروشتی پاك پێنج شتە: خەتەنە کردن، بەرتاشین، سمێڵ کورت کردنەوە، نینۆك کردن، توکی بن باڵ هەڵکەندن).

ئیبن حەجەر دەڵێ: ئەم سروشتانە چەندین سوودی ئایینی و دنیای پێیانەوە پەیوەستە لەوانە: جوانی شکڵ و شێوەی مرۆڤ، پاك و خاوێنی لەش، بەتەنگەوە بوونی تارەت گرتن، پێچەوانەی عاداتی کافران، بەجێ هێنانی فەرمانی خواو پێغەمبەر (ﷺ)[3].

زانایان کۆن لەسەر پەسەندو سوننەتی ئەوەی لەو دوو فەرموودەدا هاتووە جگەلە خەتەنە کردن کە تێیدا ڕاجیان.

١) رواه مسلم ٢٦١. وابوداود ٥٣. والترمذي ٢٧٥٧. والنسائي ٥٠٥٥ ـ ٥٠٥٧. وابن ماجة ٢٩٣.

٢) رواه البخاري ٥٨٨٩. ومسلم ٢٥٧.

٣) بڕوانە: فتح الباری ١/ ٣٥١.

# دەست نوێژ

**یەكەم: پێناسەی دەست نوێژ:** بریتی یە لە بەكارهێنانی ئاو بۆ شۆرین و مەسح كردنی ئەندامەكانی دەست نوێژ لەگەڵ نیەتی دەست نوێژگرتن دا.

**دووەم: فەرزەكانی دەست نوێژ:**

فەرزەكانی دەست نوێژ شەشن كە ئەمانەن: نیەت، شۆردنی دەم و چاو، شۆردنی هەردوو دەست لەگەڵ ئەنیشك، مەسحی هەندێك لەسەر، شۆردنی هەر دوو قاچ لەگەڵ قولەپێ، شۆردنی ئەندامەكانی بەتەرتیب.

بەڵگەی دەست نوێژ گرتن و فەرزەكانی ئەم ئایەتەیە كە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ ﴾ (المائدة: ٦) واتە: ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە كاتێ ویستتان نوێژ بكەن، دەم و چاوو دەستتان لەگەڵ ئەنیشكدا بشۆرن، وە دەستی تەڕ بهێنن بەسەرتاندا، هەروەها پێكانتان لەگەڵ قولە پێ بشۆرن.

ئەنجا ئێستاش باسی هەر یەك لە فەرزەكانی دەكەین بەم شێوەی خوارەوە:

**١ـ نیەت هێنان:** واتە لەكاتی دەست كردن بە دەست نوێژ گرتن نیەتی دەست نوێژ گرتنت هەبێ مەرج نیە بەدەم بیڵێی بەڵكو تەنها لەدڵتا نیەت بێنی بەسە.

(عن عُمَرَ بن الْخَطَّابِ رضي الله عنه قال سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول: إنما الآعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ).[١]

عومەری كوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام بیست(ﷺ) فەرمووی (دروستی كردەوەكانی تەنها بەنیەتەكانە).

---

١) رواه البخاري ١ ومسلم ١٩٠٧.

**٢ـ شۆردنی هەموو دەم و چاو:** بەڵگەی ئەم ئایەتەیەکە دەفەرموێ: ﴿فَٱغْسِلُوا۟ وُجُوهَكُمْ﴾ (المائدة/٦) واتە: دەم وچاو تان بشۆرن دەم و چاویش یانی: لەسەرووی نێو چاوانەوە تا ژێر چەناکە بەدرێژای بەپانیش لەنەرمەی گوێکەوە تا نەرمەی گوێچکە.

**٣ـ شۆردنی هەر دوو دەست لەگەڵ ئانیشکەکاندا:** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ﴾ (المائدة/٦) واتە: دەستەکانتان بشۆرن لەگەڵ ئانیشکەکاندا. وە پێویستە پێست و موی هەردوو دەستی بشۆرێ.

**٤ـ دەستی تەڕ هێنان بەسەر هەندێك لەسەردا:** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱمْسَحُوا۟ بِرُءُوسِكُمْ﴾ (المائدة/٦)

واتە: دەستە تەڕ بهێنن بەسەرتاندا لەدەست نوێژ گرتندا.

(عن الْمُغِيرَةِ بن شُعْبَةَ رضي الله عنه أن رسول اللَّهِ ﷺ توضأ وَمَسَحَ بناصيَتِهِ وَعَلَى الْعِمَامَةِ).[١] موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەست نوێژ گرت، دەستی تەڕی هێنا بەسەر پێشی سەریداو بەسەر مێزەرەکەیدا). بەپێ ی ئەم فەرموودەیە دەستی تەڕ هێنان بەسەر هەندێکی سەردا فەرزە نەك هەمووی.

**٥ـ شۆردنی هەردوو پێ لەگەڵ قولە پێ کاندا:** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ﴾ (المائده/٦) واتە: پێکانتان بشۆن لەگەڵ قولە پێکان. دەبێ هەردوو پێیەکان تا قولە پێکان بشۆرن هیچی بە نەشۆراوی نەمێنێ.

(عن عبد اللَّهِ بن عَمْرٍو بن العاص وابي هريرة، وعائيشة رضي الله عنهم قال: قال رسول الله ﷺ وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ من النَّارِ).[٢] عەبدوڵلای کوڕی عەمر و ئەبو هورەیرە و عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی (ئاگری دۆزخ بۆ پاژنە پێکان).

---

١) رواه مسلم ٢٤٧.

٢) رواه البخاري ٦٠، ٩٦. ومسلم ٢٤١.

ئەمە لەكاتێكدا بوو لەسەفەرێكدا هەندێ لەهاوەڵان بەپەلە دەست نوێژیان گرت دەست تەڕیان هێنا بەپێكاندا چونكە نوێژ عەسە زۆر نەمابوو كاتەكەی نەمێنێ.

**٦ـ پەنجە خستنە نێوان پەنجەكانی دەست و پێ:** بە بەڵگەی فەرمودەی (لَقِيطِ بن صَبِرَةَ .... فقلت يا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي عن الْوُضُوءِ قال أَسْبِغْ الْوُضُوءَ وَخَلِّلْ بين الآصَابع....).[1] لەقیتی كوڕی صەبرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمەبری خوا پێم بڵێ دەست نوێژ گرتن چۆن دەبێ؟ فەرمووی: (بەجوانی دەست نوێژ بگرەو پەنجەبخەرە نێوان پەنجەكانی دەست و پێتەوە.....).

(عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ قَالَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِذَا تَوَضَّأَ يَدْلُكُ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ بِخِنْصَرِهِ).[2] موستەوریدی كوڕی شەدداد (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ پێغەمبەری خوام بینی كاتێ دەست نوێژی دەگرت بەپەنجەتوتەی پەنجەی خستە نێوان پەنجەكانی پێ ی).

ئیمامی شەوكانی (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ فەرموودەكان بەڕاشكاوی واجب یەتی پەنجە خستنە نێوان پەنجەكانی دەست و پێ دەگەیەنن وە پێغەمبەری (ﷺ) بەگوفتارو كردار ئەم ڕوكنەی كردووە فەرموودەكان صەحیحن لەو بارەیەوە.

**سێ هەم: سوننەتەكانی دەست نوێژ:**

**١ـ (بسم الله الرحمن الرحيم) كردن لەسەرەتای دەست نوێژەوە:**

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا وُضُوءَ له ولا وُضُوءَ لِمَنْ لم يذكر اسْمَ اللَّهِ تَعَالَى عليه)[3] ئەبو هویرەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (كەسێك دەست نوێژی نەبێت بۆی نیە نوێژ بكات، كەسێكیش ناوی خوای بەرز و بڵند نەهێنێ دەست نوێژی بۆ نیە).

١) رواه ابوداود ١٤٢. حديث حسن.

٢) رواه ابوداود ١٤٨ والترمذي ٤٠. وابن ماجة ٤٤٦ حديث صحيح.

٣) رواه ابوداود ١٠١. وابن ماجة ٣٩٩. الحديث صحيح بجميع طرقه يصح للإحتجاج.

**٢ـ شۆردنی هەردوو دەست تا مەچەك سێ جار لەسەرەتای دەست نوێژ گرتنەوە.**

(عن أَوْسِ بن أَبِي أَوْسٍ قال( رأيت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اسْتَوْكَفَ ثَلَاثًا).[١] ئەوسی کوڕی ئەبی ئەوسی ثەقەفی (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەرم (ﷺ) دی دەست نوێژی گرت سێ جار دەستی شۆری).

(سَئِلَ عَبْدَ اللَّهِ بن زَيْدٍ عن وُضُوءِ النبي ﷺ فَدَعَا بِتَوْرٍ من مَاءٍ فَتَوَضَّأَ لهم وُضُوءَ النبي ﷺ فَأَكْفَأَ على يَدِهِ من التَّوْرِ فَغَسَلَ يَدَيْهِ ثَلَاثًا ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ في التَّوْرِ).[٢] عەبدوڵڵای کوڕی زەید (ڕەزای خوای لێ بێت) پرسیاری لێ کرا دەربارەی دەست نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش داوای کاسەیەکی پڕ لە ئاوی کرد. ئەنجا دەست نوێژێکی بۆ گرتن وەك دەست نوێژگرتنی پێغەمبەر (ﷺ) لاری کردەوە بەسەر دەستیدا و سێ جار دەستەکانی شۆرد ئینجا دەست کرد بەئاوەکەدا...).

**٣ـ سیواك کردن لەکاتی دەست نوێژ گرتندا:**

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال: قال رسول اللَّهِ ﷺ لَوْلاَ ان أَشُقَّ على أمتي لآمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كل صَلاَةٍ).[٣] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر قورس و ناڕەحەت نەبوایە لەسەر ئوممەتەکەم فەرمانم پێ ئەکردن بۆ هەموو دەست نوێژێك سیواك بکەن).

**٤ـ ئاو لەدەم و لووت ڕادان سێ جار بە مشتێك ئاو:**

(قال عَبْدَ اللَّهِ بن زَيْدٍ عن وُضُوءِ النبي ﷺ ... ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ في التَّوْرِ فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلَاثَ غَرَفَاتٍ...).[٤] عەبدوڵڵای کوڕی زەید (ڕەزای خوای لێ بێت) لە باسی دەست نوێژگرتنی پێغەمبەردا (ﷺ) دەڵێ (..... پاشان دەستی کرد بەئاوەکەداو دەری هێناو سێ جار ئاوی لەدەم و لووتی ڕادا...).

---

١) رواه النسائي ١/ ٦٤ حديث صحيح.

٢) رواه البخاري ١٨٦. ومسلم ٢٣٥.

٣) راه البخاري ٨٤٧. ومسلم ٢٥٢.

٤) رواه البخاري ١٨٥. ومسلم ٢٣٥.

**٥- دەست پێ كردن لەلای ڕاستەوە:** واتە شۆردنی لای ڕاست پێش لای چەپ لەدەست و قاچەكاندا.

(عن عَائِشَةَ قالت كان النبي ﷺ يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ في تَنَعُّلِهِ وَتَرَجُّلِهِ وَطُهُورِهِ وفي شَأْنِهِ كُلِّهِ).[١] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) حەز ئەكرد لەنەعل لەپێ كردنداو لە قژ داهێنانداو لە دەست نوێژدا و لە هەموو كارەكانیدا لەلای ڕاستەوە دەست پێ بكات).

**٦- دەست خستنە ئەندامەكانی دەست نوێژ:** واتە لەگەڵ ئاوەكەدا دەست خستنە ئەندامەكانی دەست نوێژ. یا دوای ئاوەكە. (عن عبد اللَّهِ بن زَيْدٍ أَنَّ النبي ﷺ تَوَضَّأَ فَجَعَلَ يقول هَكَذَا يَدْلُكُ).[٢] عەبدوڵلای كوڕی زەید (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) دەست نوێژی گرت ئاوەها دەستی لە ئەندامەكانی ئەخست).

**٧- دەست خستنە ڕیشی پڕەوە:**

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كان إذا تَوَضَّأَ أَخَذَ كَفًّا من مَاءٍ فَأَدْخَلَهُ تَحْتَ حَنَكِهِ فَخَلَّلَ بِهِ لِحْيَتَهُ وقال هَكَذَا أَمَرَنِي رَبِّي عز وجل).[٣] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) كاتێ دەست نوێژی بگرتایە لەپێك ئاوی دەهێنا و دەیدا بەژێر چەناكەیەوە، نێوان مووەكانی ڕیشی پێ تەڕ ئەكرد بە پەنجەكانی و دەیفەرموو: (پەروەردگارم بەو شێوە فەرمانی پێ كردووم).

**٨- دەستی تەڕ هێنان بەهەموو سەردا:**

پەسەندە لەكاتی دەست نوێژ گرتندا هەموو سەری مەسح بكات

(ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَمَسَحَ رَأْسَهُ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ مَرَّةً وَاحِدَةً).[٤] عەبدوڵلای كوڕی زەید لەباسی شێوەی دەست نوێژ گرتنی پێغەمبەردا (ﷺ) دەست نوێژ دەگرێت ... سەری مەسح دەكات. یەك جار هەر دوو دەستی بەسەر سەریدا هێنا تا پشتەوە ئینجا هێنانیەوە سەر پێشە سەری).

١) رواه البخاري ١٦٨. ومسلم ٢٦٨.

٢) رواه احمد ٤/ ٣٩.

٣) رواه ابوداود ١٤٥.

٤) رواه البخاري ١٨٥. ومسلم ٢٣٥.

**٩ـ سێ جار شۆردنی ئەندامەکان:** ئەمە هەموو فەرزو سوننەتەکانی دەست نوێژدا وایە.
(قال حمران أنَّ عُثْمَانَ تَوَضَّأَ بِالْمَقَاعِدِ فقال ألا أُرِيكُمْ وُضُوءَ رسول اللَّهِ ﷺ ثُمَّ تَوضَّأَ ثَلَاثًا ثَلَاثًا).[١] حومران دەڵێ: عوسمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: شێوەی دەست نوێژ گرتنی پێغەمبەرتان (ﷺ) نیشان بدەم؟ حومران دەڵێ: ئەنجا عوسمان دەست نوێژی گرت سێ جار ئەندامەکانی دەشۆرد).

**١٠ـ ڕیز بەندی لەشۆردنی ئەندامەکانی دەست نوێژدا:** بەو جۆرەی لەئایەتەکەدا هاتوو[٢] وە پێغەمبەریش (ﷺ) هەمیشە ڕەچاوی ڕیز بەندی کردووە لە دەست نوێژ گرتندا و تەنها یەك فەرموودەش لێیەوە نەگێڕدراوەتەوە پێچەوانەی تەرتیب دەست نوێژی گرت بێت.[٣]

**١١ـ پاڕانەوە لەدوای دەست نوێژ:** سوننەتە دوای تەواو بوونی دەست نوێژ ئەم پاڕانەوە بڵێ:
(أشهد لا اله الآ الله وحدة لاشريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله)[٤] (اللهم اجعلني من التوابين واجعلني من المتطهرين).[٥] (سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا اله الآ أنت استغفرك واتوب إليك).[٦]

**١٢ـ شۆردنی ئەندامەکانی دەست نوێژ زیاتر لەرادەی خۆیان:**

سوننەتە دەم و چاوو دەست و پێ کان زیاد لەئەندازەکانی پێویست (واجب) یان بشۆردرێ.
(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عن النبي ﷺ يقول إنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يوم الْقِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ من آثَارِ الْوُضُوءِ فَمَنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ).[٧] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووتی: (بێگومان ئوممەتی من لەڕۆژی دوایی دا بانگ دەکرێن -

---

١) رواه مسلم ٢٠٣.

٢) لە سورەتی (المائدة) ئایەتی (٦) (يا أيها الذين آمنوا إذا قمتم الى الصلاة...).

٣) بڕوانە کتێبی (المجموع للنووى ١/ ٤٨٤).

٤) رواه مسلم ٢٣٤.

٥) رواه الترمذي ٥٥.

٦) رواه الحاكم ١/ ٥٦٤ حديث صحيح.

٧) رواه البخاري ١٣٦. ومسلم ٢٥٠.

کە دێن- ڕوخسار و دەست و پێ سپین لە ئەنجامی دەست نوێژ گرتن) ئەبو هورەیرە ووتی جا هەر کەسێکتان توانی شوێنی شۆردنی دەم و دەست و پێ ی زیاتر بشوات با بیکات).

**١٣ـ دوو ڕکات نوێژ کردن پاش دەست نوێژ گرتن:**

عن عقبة بن عامر قال رسول الله ﷺ: « مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لاَ يُحَدِّثُ نَفْسَهُ فِيهِمَا غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ ».[1] عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هیچ کەس نیە چاك دەست نوێژ بگرێت و دوو ڕکات نوێژ بکات بەدڵ و بەگیان لای نوێژەکەی بێت ئیللا -چوونە- بەهەشتی بۆی مسۆگەر دەبێت).

**چوارەم: ئەوانەی دەست نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە:**

**١ـ هەرچی لەپاش و پێشەوە بێتە دەرەوە:** چ میز بێت یا پیسای یا خوێن یا ترِوتس مەزی ووەدی. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ ﴾ **المائدة: ٦**. واتە: یا کەسێکتان هاتەوە لەشوێنی پێویستی سەرئاو وە (قال أبو هُرَيْرَةَ قال رسول اللَّهِ ﷺ لَا تُقْبَلُ صَلَاةُ أَحَدِكُمْ إذا أَحْدَثَ حتى يَتَوَضَّأَ. فقال رَجُلٌ من أهل حَضْرَمَوْتَ وما الْحَدَثُ يأبا هُرَيْرَةَ قال فُسَاءٌ أو ضُرَاطٌ).[2] پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ: خوا نوێژی کەستان وەرناگرێ ئەگەر دەست نوێژی شکا تا دەست نوێژ نەگرێتەوە) پیاوێکی حەضرە مەوتیش ووتی: ئەی ئەبو هورەیرە: دەست نوێژ بەچی دەشکێ؟ وتی: بە تس و تڕ). (عن عَلِيٍّ قال: كنت رَجُلًا مَذَّاءً فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ أَنْ يَسْأَلَ النبي ﷺ فَسَأَلَهُ فقال فيه الْوُضُوءُ).[3] عەلی ڕەوای خوای لێ بێت دەڵێ من مەزیم زۆر بوو بە میقدادم ووت پرسیارم بۆ بکات لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش پرسیاری لێ کرد پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامی پرسیاری مقدادا دەربارەی مەزی فەرمووی: (بازەکەری بشۆرێ و دەست نوێژ بگرێت).

---

١) رواه مسلم ٢٣٤. وابوداود ١٦٩ والنسائي ١٥١.

٢) رواه البخاري ١٣٥. ومسلم ٢٢٥.

٣) رواه البخاري ٢٦٩ ومسلم ٣٠٣.

**٢ـ خەوتن:** کەسێك خەوی لێ بکەوێ بەمەرجێ پاش لەزەوی توند نەکردبێ و نەنوسابێ بەزەویەوە دەست نوێژەکەی دەشکێ: قال رسول الله ﷺ (فَمَنْ نَامَ فَلْيَتَوَضَّأْ).[١] پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (هەرکەس خەوت با دەست نوێژ بگرێتەوە).

بەلاّم گەر خۆی قایم کرد بوو لەزەوی ئەوە دەست نوێژەکەی ناشکێ بەبەلگەی فەرموودەیە (عن أَنَسَ بن مَالِكٍ قال أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ وَالنَّبِيُّ ﷺ يُنَاجِي رَجُلًا فلم يَزَلْ يُنَاجِيهِ حتى نَامَ أَصْحَابُهُ ثُمَّ جاء فَصَلَّى بِهِمْ).[٢] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەلّێ: قامەت کرا بۆ نوێژ و پێغەمبەر (ﷺ) لەگەلّ پیاوێکدا بەچپە قسەی کرد ئەوەندەی پێچوو لەقسە کردن لەگەلّیدا تا هاوەلاّنی خەوتن، پاشان هات و پێش نوێژی بۆ کردن). واتە هاوەلاّن نوێژیان کردبێ دەست نوێژ گرتنەوە.

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ قال كان أَصْحَابُ رسول اللَّهِ ﷺ يَنَامُونَ ثُمَّ يَقُومُونَ فَيُصَلُّونَ ولا يتوضؤون).[٣] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەلّێ: هاوەلاّنی پێغەمبەر (ﷺ) دەخەوتن پاشان نوێژیان دەکرد دەست نوێژیان نەدەگرتەوە). ئەم فەرموودە و فەرموودەکەی ئەنەس دەبردرێن بەسەر شێوە خەوتنێکدا کەخۆیان لەزەوی قایم کرد بێ تامانای ئەم دوو فەرموودە لەگەلّ فەرموودەی پێشوودا پێچەوانە نەبن.

**٣ـ نەمانی عەقلّ:**

ئیبن ڕوشد دەلّێ: (پێویستە بزانیت جەماوەری زانایان دەست نوێژ گرتنەوە یان بە واجب داناوە بەنەمانی عەقلّ: چ بە لەهۆش چوون یان شێت بوون یا سەرخۆش بوون بێت، وئەو زانایانە قیاسی نەمانی عەقلّیان کردۆتە سەر خەوتن بۆ دەست نوێژ شکاندن) [٤].

**٤ـ دەست دان لە عەورەت بەڕووتی بەئارەزووەوە:** پیاو و ئافرەت دەستی بەر پێشی بکەوێت بەئارەزووەوە بەبێ بوونی پەردەیە لە نێوانیاندا ئەوە دەست نوێژەکەی دەشکێت.

(عن بُسْرَةَ بِنْتُ صَفْوَانَ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول من مَسَّ ذَكَرَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ).[٥]

---

١) رواه ابوداود ٢٠٣ حديث حسن.

٢) رواه مسلم ٣٧٦.

٣) رواه مسلم ٣٧٦/ ٨٣٣.

٤) بڕوانە: (بداية المجتهد ونهاية المقتصد، ١/١١٢).

٥) رواه ابوداود ١٨١. والترمذي ٨٢. وابن ماجة ٤٧٩ حيث صحيح.

بوسروی كچی صەفوان (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: لە پیٚغەمبەری خوام بیست(ﷺ) فەرمووی:

(ئەگەر كەسیٚكتان دەستی دا لەزەكەری ئەو - دەست نویٚژی ئەشكیٚ و- بادەست نویٚژ بگریٚتەوە).

(عن قَيْسِ بن طَلْقٍ عن أبيه قال قَدِمْنا على نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ فَجاءَ رَجُلٌ كَأَنَّهُ بَدَوِيٌّ فقال يا نَبِيَّ اللَّهِ ما تَرَى فِي مَسِّ الرَّجُلِ ذَكَرَهُ بَعْدَ ما يَتَوَضَّأُ فقال هل هو إلا مُضْغَةٌ منه أو قال بَضْعَةٌ منه).[١]

تەڵقی كوڕی عەلی (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: ڕۆشتین بۆ خزمەت پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) پیاویٚك لەخزمەتیدا بوو وەك عەرەبیٚكی دەشتەكی وا بوو، ووتی: ئەی پیٚغەمبەری خوا (ﷺ): ڕات چی یە دەربارەی دەست دانی پیاو لەزەكەری دوای ئەوەی دەست نویٚژ بگریٚت؟ فەرمووی: (ئایا زەكەرت بەشیٚك نیە لەخۆت).

ئەم دوو فەرموودە بەڕواڵەت پیٚچەوانەی یەكترن بەڵام زانایان ووتوویانە ماناكانیان دژ بەیەكتری نیە مەبەستی لە فەرموودەكەی بوسرە دەست لە عەورەت دەست نویٚژ ئەشكیٚنیٚ ئەگەر بەئارەزووە بوو وە مەبەستیش لە فەرموودەكەی تەڵق ئەوەیە ئەگەر دەست لیٚ دانەكە بە ئارەزووەوە نەبوو دەست نویٚژ ناشكیٚنیٚ.

**٥- لەیەك كەوتنی پیٚستی پیاو و ئافرەت بەئارەزووەوە:**

ئیبن تەیمییە دەڵیٚ: خوای گەورە لە هەر شویٚنیٚكی قورئاندا (مس و مباشرە)ی بەكار هیٚنا بیٚ ئەوە تەنها مەبەست پیٚ ی دەست لیٚدانیٚكە كە بەئارەزووە بیٚت ، بەڵام ئەگەر بە ئارەزووە نەبوو ئەوە خوا هیچ حوكمیٚكی لەسەر دانە مەرزاندووە[٢].

(عن عَائِشَةَ زَوْجِ النبي ﷺ أنها قالت كنت أَنَامُ بين يَدَيْ رسول اللّٰهِ ﷺ وَرِجْلَايَ فِي قِبْلَتِهِ فإذا سَجَدَ غَمَزَنِي فَقَبَضْتُ رِجْلَيَّ).[٣] عائیشە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: (لەبەردەم

---

١) رواه ابوداود ١٨٢. والترمذي ٨٥. وابن ماجه ٤٨٣ حديث صحيح.

٢) بروانە : مجموع الفتاوى لابن تيمية ٢١/ ١٣٤ ـ ١٣٩.

٣) رواه البخاري ٣٨٢. ومسلم ٢٧٢ و ٥١٢.

پێغەمبەردا (ﷺ) ئەنوستم قاچەکانم لای قیبلەکەیەوە بوو، کاتێ سوژدەی ئەبرد دەستی ئەکوتایە قاچم، منیش قاچم کۆ کردەوە).

## مەسح کردن بەسەر خوفدا

**یەکەم: خوفە چی یە:** بریتی یە لە جووتێك گۆرەوی کە قولەپێ دادە پۆشێ و لەچەرم دروست کراوە.

**دووەم: حوکمی مەسح کردن بەسەر خوفدا:** ڕێگە پێدراوە بۆ پیاوان و ئافرەتان لەهەموو حاڵەتێکدا زستان و هاوین چ لەسەفەردا بێت یا لە ماڵەوە. ساغ بێت یان نەخۆش. لەجیاتی شۆردنی پێیەکان مەسحی خوفەکان دەکرێت.

**سێ یەم: بەڵگەی مەسح کردن بەسەر خۆفدا:**

(قال جَرِيرَ بن عبد اللَّهِ رأيت النبي ﷺ بَالَ ثُمَّ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ على خُفَّيْهِ).[١] جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەرم (ﷺ) بینی میزی کرد، پاشان دەست نوێژی گرتو- لەجیاتی شۆردنی پێیەکانی ـ مەسحی هەردوو خۆفەکەی کرد).

**چوارەم: مەرجەکانی مەسح کردن بەسەر خۆفدا:** بۆ مەسح کردن بەسەر خوفدا چوار مەرج پێویستە کە ئەمانەن:

**١ـ دوای دەست نوێژ گرتن خوفەکان لەپێ بکرێن.**

(عن عُرْوَةَ بن الْمُغِيرَةِ عن أبيه قال: كنت مع النبي ﷺ في سَفَرٍ فَأَهْوَيْتُ لأَنْزِعَ خُفَّيْهِ فقال دَعْهُمَا فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا).[٢] موعیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: من لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا بووم (ﷺ) دانەویمەوە بۆ ئەوەی خوفەکانی داکەنم فەرمووی: (وازی لێ بێنە بەدەست نوێژەوە لەپێم کردوون) ئەنجا مەسحی کرد بەسەریاندا.

---

١) رواه البخاري ١٤٧٨. ومسلم ٢٧٢.

٢) رواه البخاري ٢٠٣. ومسلم ٢٧٤.

**٢ـ دەبێت خوفەکان ئەوەندەی پێیەکان داپۆشن کە لە کاتی شۆردنیاندا دەشۆردرێن،** چونکە ئەگەر خوفەکان وانە بن پێیان ناوترێت خوف.

**٣ـ دەبێت خوفەکان بەرگری ئاو بکەن لە پێیەکان جگە لە شوێنە دوراوەکان.**

**٤ـ دەبێت خوفەکان پاك بن.** با لە پێستێکی مردارۆبووی خۆشە کراویش بێت دروستە.

**پێنجەم: ماوەی مەسح کردن بەسەر خوفدا:**

ماوەی مەسح کردن بەسەر خوفدا شەو و ڕۆژێکە بۆ ئەو کەسە لەماڵ و شاری خۆی دا بێت، وە سێ شەو و ڕۆژیشە بۆ ئەو کەسەی لەسەفەردا بێت.

(عن شُرَيْحِ بن هَانِئٍ قال أَتَيْتُ عَائِشَةَ أَسْأَلُهَا عن الْمَسْحِ على الْخُفَّيْنِ فقالت عَلَيْكَ بِابْنِ أبي طَالِبٍ فَسَلْهُ فإنه كان يُسَافِرُ مع رسول اللَّهِ ﷺ فَسَأَلْنَاهُ فقال جَعَلَ رسول اللَّهِ ﷺ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ لِلْمُسَافِرِ وَيَوْمًا وَلَيْلَةً لِلْمُقِيمِ).[١] شۆرەیحی کوڕی هانیء دەڵێ چوومە خزمەت عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) تا پرسیاری مەسحی خوفی لێ بکەم عائیشە ووتی بڕۆ بۆ لای عەلی کوڕی ئەبوتالیب بەڕاستی ئەو لەمن شارەزا ترە لەو بارەیەوە، چونکە ئەو لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ).

سەفەری دەکرد ـ منیش ڕۆشتم و- پرسیارم لێ کرد، عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) ووتی پێغەمبەر (ﷺ) سێ شەوە ڕۆژی دانا بۆ موسافیر و شەو و ڕۆژێکیش بۆ نیشتەجێ).

ماوەکەشی دوا لە پێ کردنی خوفەکان چ کاتێ دەست نوێژی شکا لەوێوە دەست پێ دەکات نەك لەکاتی لەپێ کردنیەوە.

**شەشەم: ئەو شتانەی مەسحی خوف بەتاڵ دەکەنەوە:** مەسحی خوف بەسێ شت بەتاڵ دەبێتەوە:

١ـ داکەندنی هەردوو خۆفەکەیان یەکێکیان. یا خۆیان داکەنرێن بەبێ وویستی خاوەنەکەی.

٢ـ کۆتایی هاتنی ماوەی مەسح کردنەکە، ئەگەر دەست نوێژە هەبوو تەنها پێیەکانی بشۆرێ و لە پێیان کات بەڵام ئەگەر دەست نوێژی نەبوو دەبێت دەست نوێژ بگرێ ئەنجا لەپێیان بکات.

٣ـ غوسل و شۆردنی لەسەر پێویست بێ.

---

١) رواه مسلم ٢٧٦.

(عن صَفْوَانَ بن عَسَّالٍ رضي الله عنه قال: كان رسول اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُنَا إذا كنا مُسَافِرِينَ أَنْ نَمْسَحَ على خِفَافِنَا ولا نَنْزِعَهَا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ من غَائِطٍ وَبَوْلٍ وَنَوْمٍ إلا من جَنَابَةٍ).[1] صەفوانی کوڕی عەسسال (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پی ئەکردین کەسێ شەوو ڕۆژ مەسح بکەین بەسەر خوفەکانماندا ئەگەر سەفری بووین دایان نەکەنین لەبەر پیسایی و میزو خەو بەلاّم بۆ لەش پیسی دایان کەنین.

**حەوتەم: مەسح کردن لەسەر گۆرەوی و نەعل:**

(عن الْمُغِيرَةِ بن شُعْبَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ على الْجَوْرَبَيْنِ وَالنَّعْلَيْنِ).[2] موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەست نوێژی گرت و مەسحی کرد بەسەر گۆرەی و نەعلەکانیدا).

وە تەنها سەرەوەی خوفەکان مەسح دەکرێت. (عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: وَمَسَحَ عَلَى ظهر الْخُفَّيْنِ).[3] موغیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەرم (ﷺ) دی سەرەوەی خوفەکانی مەسح کرد.

١) رواه الترمذي ٩٦. والنسائي ١/ ٨٣.

٢) رواه ابوداود ١٥٩. والترمذي ٩٩. وابن ماجه ٥٥٩ حديث صحيح.

٣) رواه ابوداود ١٦١. والترمذي ٩٨ حديث حسن.

# خۆشۆردن ( الغسل )

**یەكەم: خۆشۆردن چی یە:** واتە ئاو كردن بە هەموو لەشدا بەنیەتێكی تایبەتی.

**دووەم: بەڵگەی خۆشۆردن:**

١ـ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ﴾ المائدة: ٦ **واتە:** ئەگەر لەشتان پیس بوو خۆتان پاك بكەنەوە -بەخۆشۆردن-.

**٢ـ سونەتی پێغەمبەر (ﷺ)**

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال قال رسول اللَّهِ ﷺ حَقٌّ على كل مُسْلِمٍ أَنْ يَغْتَسِلَ في كل سَبْعَةِ أَيَّامٍ يَوْمًا يَغْسِلُ فيه رَأْسَهُ وَجَسَدَهُ).[١] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (مافی هەموو موسڵمانێكە هەموو هەفتەیەك -جارێ- سەرو لاشەی بشوات).

**سێ هەم: خۆشۆردن دوو جۆرە:**

أـ خۆشۆردنی فەرز ب ـ خۆشۆردنی سوننەت

**أـ خۆشۆردنی فەرز:** ئەو خۆشۆردنەیە كە هەر عەیبادەتێك پێویستی بەپاكێتی هەبێت بەبێ ئەو خۆشۆردنە دروست نی یە ئەگەر هۆكارەكانی هاتە دی.

هۆكارەكانی خۆشۆردنی فەرز ئەمانەن: موسوڵمان بوون و لەش پیسی و تەواو بوونی خوێنی حەیزو زەیستانی و مردن.

موسوڵمان بوون: یەكێك لەو شتانەی خۆشۆردن پێویست دەكات موسوڵمان بوونی بێ باوەڕە. (عَنْ خَلِيفَةَ بْنِ حُصَيْنٍ عَنْ جَدِّهِ قَيْسِ بْنِ عَاصِمٍ قَالَ أَتَيْتُ النَّبِىَّ ﷺ أُرِيدُ الإِسْلاَمَ فَأَمَرَنِى أَنْ أَغْتَسِلَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ).[٢] خەلیفەی كوڕی حوصەین لە باپیرەیەوە قەیسی كوڕی عاصیم (ڕەزای

---

١) رواه البخاري ٨٥. ومسلم ٨٤٩.

٢) رواه الترمذي ٦٠٥. والنسائي ١/ ١٠٩. وابوداود ٣٥٥. حديث حسن.

خوای لێ بێت) دەڵێ: کاتێ وویستم موسوڵمان بم ڕۆشتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردم بەئاو و سیدر خۆم بشۆم).

## لەش پیسی:

١ـ لەش پیسی واتە پیس بوونی مرۆڤ و دوورکەوتنەوەی لە پەرستش هەرکات هۆکارەکانی هاتە دی.

٢ـ هۆکارەکانی لەش پیسی: دوو هۆکار هەیە بۆ لەش پیسی:

أـ دەرچوونی ئاوی پیاو و ئافرەت بەهەر هۆیەك بێت: سەیر کردن بێت یا بیرکردنەوە یا خەوبینین بێت.

(عن أُمِّ سَلمَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّها قالت جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ امْرَأَةُ أَبِي طَلْحَةَ إلى رسول اللَّهِ ﷺ فقالت يا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي من الْحَقِّ هل على الْمَرْأَةِ من غُسْلٍ إذا هِيَ احْتَلَمَتْ فقال رسول اللَّهِ ﷺ نعم إذا رَأَتْ الْمَاءَ).[1] ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: ئوموسولەیمی خێزانی ئەبو تەڵحە، هات بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەر خوا بێگومان خوا شەرم لە هەق ناکات ئایا ئافرەت خۆشۆردنی لەسەرە ئەگەر شەیتانی بوو؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر ئاوی بینی بە جلەکانییەوە).

(عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَجِدُ الْبَلَلَ وَلاَ يَذْكُرُ احْتِلاَمًا قَالَ «يَغْتَسِلُ». وَعَنِ الرَّجُلِ يَرَى أَنَّهُ قَدِ احْتَلَمَ وَلاَ يَجِدُ الْبَلَلَ قَالَ « لاَ غُسْلَ عَلَيْهِ ». فَقَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ الْمَرْأَةُ تَرَى ذَلِكَ أَعَلَيْهَا غُسْلٌ قَالَ « نَعَمْ إِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ»).[2] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی پیاو ـ کاتێ خەبەری دەبێتەوە ـ تەڕی بە جلەکانییەوە دەبینێ و بیریشی نییە شەیتانی بووبێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خۆی بشۆرێ)، وە پرسیاری لێ کرا دەربارەی پیاو خەوی بینوە شەیتانی بووە -بەڵام خەبەری دەبێتەوە- تەڕی نابینێ؟ فەرمووی (خۆشۆردنی لەسەر نییە) ئوموسولەیم ووتی: ئەگەر ئافرەتیش ئەوەی دی خۆشۆردنی لەسەرە؟ فەرمووی: (بەڵێ ئافرەتیش هاوشێوەی پیاوانن).

---

١) رواه البخاري ١٣٠. ٢٨٢. ومسلم ٣١٣.

٢) رواه ابوداود ٢٣٦.

ب ـ دروستبوونی ژنو پیاو با ئاوهاتنەوەش روو نەدا، هەر لەش پیس دەبێت:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ « إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الأَرْبَعِ ثُمَّ جَهَدَهَا فَقَدْ وَجَبَ عَلَيْهِ الْغُسْلُ». وَفِي رواية مسلم: « وَإِنْ لَمْ يُنْزِلْ »).[1] ئەبوهورەیرە رەزای خوای لێ بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر پیاو لەناو چوار پەلی ئافرەتدا دانیشت لەگەڵیدا دروست بوو ئەو خۆشۆردنی لەسەر پێویستە با ئاویشی نەیەتەوە.

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت: قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا جَلَسَ بين شُعَبِهَا الآرْبَعِ وَمَسَّ الْخِتَانُ الْخِتَانَ فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ).[2] عائیشە رەزای خوای لێ بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەگەر پیاو لەنێوان هەر دوو قاچی و هەر دوو ڕانیا دانیشت، خەتەنە کراوی ئەم بەر خەتەنە کراوی ئەو کەوت ئەوە بێگومان خۆشۆردن واجب دەبێت).

ج- تەواو بوونی خوێنی حەیز و زەیستانی (منداڵ بوون)

کاتێ ئافرەت خوێنی حەیزی تەواو بوو پێویستە خۆی بشوات.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴾ البقرة: ٢٢٢

واتە: نزیکی خێزانەکانتان مەبنەوە - سەرجێ پیان لەگەڵدا مەکەن- هەتا پاك ئەبنەوە - لە بێ نوێژی- کاتێ پاك بوونەوە و خۆیان شۆری بچنە لایان لەو جێگایەوە خوا فەرمانی پێ کردوون، بەڕاستی خوا تەوبەکاران و خۆ پاك ڕاگرانی خۆش ئەوێت.

(عن عَائِشَةَ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ كانت تُسْتَحَاضُ فَسَأَلَتْ النبي ﷺ فقال ذَلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَتْ بِالْحَيْضَةِ فإذا أَقْبَلَتْ الْحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلَاةَ وإذا أَدْبَرَتْ فَاغْتَسِلِي وَصَلِّي).[3] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەفاتیمەی کچی ئەبی حوبەیشی فەرموو:

---

١) رواه البخاري ٢٩١ .ومسلم ٣٤٨.

٢) رواه مسلم ٣٤٩.

٣) رواه البخاري ٣٠٦. ومسلم ٣٣٣.

(کاتێ خوێنی حەیزت پیا هات واز لە نوێژ بێنە وەکاتی کۆتایی هات ئەوە خۆت بشۆرەو نوێژ بکە).

زەیستانی -خوێنی دوا منداڵ بوون- وەك حەیز وایە بەیەك دەنگی زانایان.[1]

**مردن:** یەکێکی تر لەو شتانەی شۆردن پێویست دەکات مردنە. ئەگەر موسوڵمان مرد واجب لەسەر ئیمانداران دەورو بەری بیشۆرن.

(عن أُمِّ عَطِيَّةَ الآنْصَارِيَّةِ رضي الله عنها قالت دخل عَلَيْنا رسول اللَّهِ ﷺ حين تُوُفِّيَتْ ابْنَتُهُ فقال اغْسِلْنَهَا ثَلَاثًا أو خَمْسًا أو أَكْثَرَ من ذلك إن رَأَيْتُنَّ ذلك بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَاجْعَلْنَ في الْآخِرَةِ كَافُورًا أو شيئا من كَافُورٍ فإذا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي فلما فَرَغْنَا آذَنَّاهُ فَأَعْطَانَا حِقْوَهُ فقال أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ تَعْنِي إِزَارَهُ).[2] ئومو عەتییە ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ زەینەبی کچی وەفاتی کرد فەرمووی پێمان: (با شتنەکەی تاك بێت سێ یان پێنج جار لە پێنجەمدا کافوری تێکەڵ کەن یان کەمێك کافور ئەنجا کە لەشتنەکەشی بوونەوە ئاگادارم بکەن) ئوموعەتییە دەڵێ: ئێمەش کاتێ تەواو بووین ئاگادارمان کرد ئەویش پەشتە ماڵێکی داینێ و فەرمووی (لەشی پێ داپۆشن).

(عَنِ ابْنِ عَبَّاس رضى الله عنهم قَالَ بَيْنَمَا رَجُلٌ وَاقِفٌ بِعَرَفَةَ إِذْ وَقَعَ عَنْ رَاحِلَتِهِ فَوَقَصَتْهُ – أَوْ قَالَ فَأَوْقَصَتْهُ – قَالَ النَّبِىُّ ﷺ« اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ...»).[3] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئەو پیاوەی لە ئیحرامدا بوو لەوەشترەکەی کەوت و ملی شکا و مرد فەرمووی: (بیشۆرن بەئاوو سیدر..........).

---

١) بڕوانە : المجموع للنووي ٣/ ١٤٨.

٢) رواه البخاري ١٢٥٣. ومسلم ٩٣٩.

٣) رواه البخاري ١٢٦٧. ومسلم ١٢٠٦.

**چوارەم: ئەو شتانەی لەسەر لەشپیس حەرامە:**

**١- نوێژ:** (عن بن عُمَرَ قال إِني سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول لَا تُقْبَلُ صَلَاةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ).[١]
عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست فەرموو: (نوێژ دروست نییە بەبێ پاكێتی).

ئەم فەرمودە دەست نوێژ و خۆشۆردنیش دەگرێتەوە وە نوێژ دروست نی یە بەهەر دوو پاكیەتیەكەوە نەبێت -دەست نوێژ و لەش پاكی-.

**٢- مانەوە لە مزگەوتدا:** مانەوەو دانیشتن لە مزگەوتدا بۆ لەش پیس دروست نی یە بەڵام تێپەڕ بوون پیایدا بەبێ مانەوە دروستە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ﴾ النساء: ٤٣. واتە: بەلەش گرانی نزیكی جێگای نوێژ مەكەونەوە مەگەر هەر بەناویدا تێپەڕ بن.
قال رَسُولَ اللَّهِ ﷺ (فَإِنِّي لَا أُحِلُّ الْمَسْجِدَ لِحَائِضٍ ولا جُنُبٍ).[٢] پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (ڕێگە نادەم ئافرەت لەبێ نوێژی دا و پیاوانی لەش گران بێنە مزگەوت).

**٣- تەواف كردن بە دەوری كەعبەدا:** فەرز بێت یان سوننەت، چونكە تەواف وەك نوێژ وایە پاكێتی بۆی مەرجە وەك نوێژ.

(عن ابن عباس (رضي الله عنهما) قال قال رسول الله ﷺ الطواف بالبيت صلاة إلا أن الله أحل لكم فيه الكلام فمن يتكلم فلا يتكلم إلا بخير).[٣]عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (تەواف بە دەوری كەعبەدا نوێژە. بەڵام ئەوەندە هەیە، قسە كردنی تێدا حەڵاڵ كردووە بۆتان، جا هەر كەس قسەی كرد با قسەیەك نەكات چاك نەبێت).

---

١) رواه مسلم ٢٢٤.

٢) رواه ابوداود ٢٣٢.

٣) رواه الحاكم ١/ ٤٥٩. والترمذي ٩٦٠. وابن خزيمة ٢٧٣٩.

**پێنجەم: پایەکانی خۆشۆردن:**

ئەوەی فەرزەو پێویستە ئەم دوو خاڵەیە:

**١- نیەت:** پێویستە لەسەرەتای خۆشۆردنەکەوە نییەتی خۆشۆردنی یا لابردنی لەش گرانی هەبێت وە نییەتیش بە دڵە، ئەوەی باوە خەڵك بەووتن دەیلێن دا هێنراوە و بەڵگەی لەسەر نیە، بەڵگەی نییەت هێنان ئەو فەرمودەیەکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (إنما الآعْمَالُ بالنِّيَّاتِ)[١] (بەڕاستی دروستی کردەوەکان بەنییەتەکانیانەوەیە).

**٢- شۆردنی هەموو ئەندامەکانی لەش:** دەبێت هەموو پێست و مووی بەئاو بشوات و تەڕ بێن: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ﴾ المائدة: ٦ واتە: ئەگەر لەشتان گران بوو خۆتان بشۆرن.

(سئل جَابِرُ كَيْفَ الْغُسْلُ من الْجَنَابَةِ فقال كان النبي ﷺ يَأْخُذُ ثَلَاثَةَ أَكُفٍّ وَيُفِيضُهَا على رَأْسِهِ ثُمَّ يُفِيضُ على سَائِرِ جَسَدِهِ).[٢] جابیر (ڕەزای خوای لێ بێت) پرسیاری لێ کرا دەربارەی خۆشۆردن. وتی: پێغەمبەر (ﷺ) سێ مشت ئاوی — لە دەفەرەکەدا- هەڵئەگرت و دەیکرد بەسەریدا ، پاشان ئاوی دەکرد بەهەموو لاشەیدا)

(عن أُمِّ سَلَمَةَ قالت قلت يا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي فَأَنْقُضُهُ لِغُسْلِ الْجَنَابَةِ قال لَا إنما يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِيَ على رَأْسِكِ ثَلَاثَ حَثَيَاتٍ ثُمَّ تُفِيضِينَ عَلَيْكِ الْمَاءَ فَتَطْهُرِينَ).[٣] ئوموسەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ : ووتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من ئافرەتێکم پەلکەکانم دەبەستم ئایا بۆ خۆشۆردنی لەش گرانی بیانکەمەوە. ووتم. پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (ئەوەندەت بەسە: سێ مشت ئاو بکە بەسەرتدا پاشان ئاو بکە بەهەموو لەشتدا ئیتر پاك دەبیتەوە).

---

١) رواه البخاري ١. ومسلم ١٩٠٧.

٢) رواه البخاري، ٢٥٣. ومسلم ٣٢٩.

٣) رواه مسلم ٣٣٠.

**شەشەم: سوننەتەکانی خۆشۆردن:** جگە لە فەرزەکان چەند شتێکی تر پەسەند و سوننەتن موسوڵمان بیکات:

١ـ هەردوو دەستی سێ جار بشوات پێش ئەوەی دەست بخاتە ئاوەکەوە

٢ـ بە دەستی چەپی عەورەتی بشوات.

٣ـ ئاو لەدەم و لووت رادان.

٤ـ دەست نوێژ گرتن بەتەواوی پێیەکانی نەبێت دوا بخات تا لەشی ئەشۆرێ.

بەڵگەی ئەم خالآنە ئەم فەرموودە (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ قَالَتْ مَيْمُونَةُ وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ مَاءً لِلْغُسْلِ ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا ، ثُمَّ أَفْرَغَ عَلَى شِمَالِهِ فَغَسَلَ مَذَاكِيرَهُ ، ثُمَّ مَسَحَ يَدَهُ بِالأَرْضِ ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ ، ثُمَّ أَفَاضَ عَلَى جَسَدِهِ ، ثُمَّ تَحَوَّلَ مِنْ مَكَانِهِ فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ).[1] مەیموونەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەڵێ: ئاوی خۆ شۆردنم بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دانا جا هەردوو دەستی دووجار یا سێ جار شۆرد پاشان ئاوی کرد بەدەستی چەپیدا و عەورەتی پێ شۆرد، پاشان دەستی هێنا بەزەویدا، پاشان ئاوی لەدەم و لووتی ڕادا ئەنجا دەم و چاو و هەردوو دەستی شۆرد پاشان ئاوی کرد بەهەموو لاشەیدا ئەنجا شوێنکەی گۆڕی - کەمێ ڕۆشتە ئەو لاوە- هەردوو پێ ی شۆری).

٥ ـ سێ جار ئاو بکات بەسەریدا، دەست بخاتە نێوان مووەکانی سەری:

(....ثُمَّ يُدْخِلُ أَصَابِعَهُ فِي الْمَاءِ فَيُخَلِّلُ بِهَا أُصُولَ شَعَرِهِ ثُمَّ يَصُبُّ على رَأْسِهِ ثَلَاثَ غُرَفٍ بِيَدَيْهِ ثُمَّ يُفِيضُ الْمَاءَ على جِلْدِهِ كُلِّهِ).[2] مەیمونە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: دەربارەی خۆشۆردنی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: (......... پاشان پەنجەکانی کرد بەئاوەکەداو کردی بەناو مووکانی سەریدا، پاشان سێ مشت ئاوی کرد بەسەریدا و ئەنجا ئاوی کرد بە هەموو لاشەیدا).

---

١) رواه البخاري ٢٥٧. ومسلم ٣١٧.

٢) رواه البخاري، ٢٤٨.

٦ـ پێشخستنی لای ڕاست لەشۆردندا:
(عن عَائِشَةَ قالت كان النبي ﷺ يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ فِي تَنَعُّلِهِ وَتَرَجُّلِهِ وَطُهُورِهِ وفِي شَأْنِهِ كُلِّهِ).[1]
عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) حەزی دەکرد لەنەعل لەپێکردن و قژ داهێنان و خۆ پاککردنەوە -دەست نوێژو خۆشۆردن- هەموو کارێکیدا لای ڕاست پێش خات).
٧ـ دەست خستنە ئەندامەکانی لەشە و بەشوێن یەکتردا شۆرینیان: بۆ دەرباز بوون لەجیاوازی مالیکیەکان کەئەم خاڵەیان.بەلاوە واجبە.
٨ـ دەست خستنە چاڵ و پێچ و پلۆچەکان لەش و قولیەکانی پێچی ورگ و ناوك و بن باڵ بۆ ئەوەی دڵنیا بین ئەو شوێنانە تەڕ بوون.
٩ـ سێ بارە کردنەوە کارەکانی خۆ شۆردن وەك دەست نوێژ کە سێ بارەکردنەوەی سوننەتە.

**حەوتەم: خۆشۆردنی ئافرەت:**

خۆشۆردنی ئافرەت بەهۆی لەش گرانیەوە وەك خۆشۆردنی پیاو وایە وە پێویست ناکات ئافرەت پەلکە و پرچەکانی بکاتەوە (عن أُمِّ سَلَمَةَ قالت قلت: يا رَسُولَ اللَّهِ إني امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي فانقضه لِغُسْلِ الْجَنَابَةِ فقال إنما يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِي عليه ثَلَاثَ حَثَيَاتٍ).[2] بەبەڵگەی فەرموودەکەی ئەم موسەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من ئافرەتێکم قژی سەرم دەکەم بەپەلکە و دەیبەستم ئایا بیکەمەوە بۆ خۆشۆردنی لەش گرانی؟ فەرمووی: (نا ئەوەندەت بەسە: سێ مشت ئاو بکەیت بەسەرتداو لەپاشان ئاو بکەیت بەهەموو لەشت دا بەوە پاك دەبیتەوە).

بەڵام ئەگەر خۆشۆردنەکەی بۆ حەیزەوە بوو ئەوە پێویستە پەلکەکانی بکاتە.
قالت عَائِشَةَ رضي الله عنها (فَقَدِمْتُ مَكَّةَ وأنا حَائِضٌ لم أَطُفْ بِالْبَيْتِ ولا بين الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَشَكَوْتُ ذلك إلى رسول اللَّهِ ﷺ فقال انْقُضِي رَأْسَكِ وَامْتَشِطِي وَأَهِلِّي بِالْحَجِّ وَدَعِي الْعُمْرَةَ....).[3] بەڵگەی فەرموودەی عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) لەباسی حەج کردندا، دەڵێ:

---

١) رواه البخاري ١٦٨. ومسلم ٢٦٨.
٢) رواه مسلم ٣٣٠. وابوداود ٢٥١. والترمذي ١٠٥. والنسائي ١/ ١٣١.
٣) رواه مسلم ١٢١١. والترمذي ٨٢٠. والنسائي ٢٤٢.

كاتێ گەشتمە مەككە بێ نوێژ بووم، نەتەوانی صەفاو مەڕوەم نەكرد حاڵی خۆم بۆ پێغەمبەر (ﷺ) باس كرد فەرموو: (پەلكەكانت بكەرەوە قژت شانە بكەو نیتی حەج بێنەو واز لەعومەرە بێنە.....).

(عن عَائِشَةَ ﷺ قالت: ( أَنَّ النبي ﷺ قال لها وَكَانَتْ حَائِضًا انْقُضِي شَعْرَكِ وَاغْتَسِلِي).[١]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی فەرمووە لەكاتێكدا لەبێ نوێژی -حەیز-دا بوو بەلكەكانت بكەرەوە و خۆت بشۆرە).

وە پەسەندو سوننەتە كاتی ئافرەت خۆی شۆرد بەهۆی بێ نوێژی یا زەیستانی یەوە پارچە لۆكەیەك یا شتێكی لەو جۆرە میسك یا بۆنی خۆشی لێ بدات شوێنی خوێنەكەی پێ بسڕێتەوە تا ئەو شوێنە بۆنی خۆش بێت بۆنی ناخۆشی نەمێنێت.

(عن عَائِشَةَ ﷺ قالت: سَأَلَتْ امْرَأَةٌ النبي ﷺ كَيْفَ تَغْتَسِلُ من حَيْضَتِهَا فقال:( ثُمَّ تَأْخُذُ فِرْصَةً من مِسْكٍ فَتَطَهَّرُ بها) قالت كَيْفَ أَتَطَهَّرُ بها قال (تَطَهَّرِي بها سُبْحَانَ اللَّهِ) وَاسْتَتَرَ قالت عَائِشَةُ وَاجْتَذَبْتُهَا إلي وَعَرَفْتُ ما أَرَادَ النبي ﷺ فقلت تَتَبَّعِي بها أَثَرَ الدَّمِ)

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ : ئافرەتێك پرسیاری لە پێغەمبەر كرد (ﷺ) چۆن خۆی بشوات كاتێ پاك بوویەوە لە بێ نوێژی، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (........ پاشان پارچە لۆكەیەكی میسكاوی كراو بێنێ خۆی پێ پاك بكاتەوە) ووتی چۆن خۆ پێ پاك بكاتەوە؟ فەرمووی (سبحانە اللە، خۆتی پێ پاك بكەرەوە) جا عائیشە وەك بڵێ ئەمە بشارێتەوە ووتی: شوێنی خوێنەكەی پێ پاك بكەرەوە.....)[٢].

**هەشتەم: خۆشۆردنی سوننەت:**

واتەك ئەو خۆشۆردنە سوننەتانەی كە نوێژ كردن دروستە لەگەڵ نەكردنی ئەم خۆشۆردنانەدا بەڵام شەرع بەپەسەندی داناوون هەریەكە و لەبەر هۆیەك:

---

[١]) رواه ابن ماجه ٦٤١. بسند صحیح.

[٢]) رواه مسلم ٣٣٢.

**١ـ خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی:**

(أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال: إذا جاء أحدكم الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ).[1] پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان ویستی بڕوات بۆ نوێژی هەینی باخۆی بشۆرێت).

(قال رسول اللَّهِ ﷺ من تَوَضَّأَ يوم الْجُمُعَةِ فَبِهَا وَ نِعْمَتْ وَ من اغتسل فَالْغُسْلُ أَفْضَلُ).[2] ئەم فەرمانەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ پەسەندی و سوننەتیە بە بەڵگەی ئەم فەرموودەی کەدەفەرموێ: (هەرکەس ڕۆژی هەینی دەست نوێژ بگرێت ئەو بەسەو چاکە هەرکەسیش خۆبشۆرێ ئەوە خۆشۆردن گەورەترو چاکترە).

**٢ـ خۆشۆردن بۆ هەردوو جەژنەکان:**

بەززار دەڵێ: فەرموودەیەکی صەحیح نیە دەربارەی خۆشۆردنی جەژنەکان. لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێردرابێتەوە. بەڵام ئیمام مالیك لەکتێبی (موطأ)دا و ئیمامی شافیعی لەکتێبی (الأم)دا دەگێڕنەوە کە (أَنَّ عَبْدَ الله بن عُمَرَ كان يَغْتَسِلُ يوم الْفِطْرِ قبل أَنْ يَغْدُوَ إلى الْمُصَلَّى).[3] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) لەجەژنی ڕەمەزاندا پێش ڕۆشتنی بۆ نوێژگە[4] خۆی دەشۆرد).

**٣ـ خۆشۆردنی کەسێ مردو بشۆرێ:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من غَسَّلَ الْمَيِّتَ فَلْيَغْتَسِلْ وَمَنْ حَمَلَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ).[5] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کەسێ مردووی شۆری با خۆی بشوات وە کەسێکیش هەڵیگرت بادەست نوێژ بگرێت)

ئەم فەرموودەیە فەرمانەکەی بۆ پەسەند و سوننەتیە بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە (عن بن عباس قال قال رسول الله ﷺ ليس عليكم في غسل ميتكم غسل إذا غسلتموه فإن ميتكم ليس بنجس

---

١) رواه البخاري ٨٣٧. ومسلم ٨٤٤.

٢) رواه ابوداود ٣٥٤. والترمذي ٤٩٧. والنسائي ٣/ ٩٤. حديث حسن بطرقه.

٣) بڕوانە (الموطأ ١/ ٧٧ (٢) والأم ١/ ٢٦٥. وكشف الاستار ١/ ٣٠٠.

٤) نوێژگە ئەو شوێنەیە کە لە دەرەوەی شار نوێژی جەژنی تێدا کراوە لەو سەردەمەدا.

٥) رواه ابوداود ٣١٦١. والترمذي ٩٩٣. وابن ماجه ١٤٦٣. حديث صحيح.

فحسبكم أن تغسلوا أيديكم).[١] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بەشۆردنی مردووەکەتان کاتێ شۆردتان پێویست نیە لەسەرتان خۆتان بشۆرن. چونکە مردووەکەتان پیس نیە بەسە بۆتان کەدەستەکانتان بشۆرن).

**٤. خۆشۆردن بۆ ئیحرام بەستن:**

سوننەتە بۆ کەسێ بیەوێ ئیحرام ببەستێ بەحەج یا عومرە خۆی بشوات، بە بەڵگەی فەرمودەی زەیدی کوڕی سابت (ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەڵێ: (أَنَّهُ رَأَى النبي ﷺ تَجَرَّدَ لِإِهْلَالِهِ وَاغْتَسَلَ).[٢] (پێغەمبەری (ﷺ) بینی خۆ ڕووت کردۆتەوە بۆ ئیحرام بەستن و خۆی شوردووە).

**٥ - خۆشۆردن بۆ ڕۆشتنە ناو شاری مەککە:**

(أن بن عمر رضي الله عنه كان لا يقدم مكة إلا بات بذي طوى حتى يصبح ويغتسل ثم يدخل مكة نهارا ويذكر عن النبي ﷺ أنه فعله).[٣] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) هەر کاتێ بڕۆشتایە بۆ مەککە پێش ئەوەی بڕواتە ناو شاری مەککە شەو لە (ذی طوی) دەمایەوە کە ڕۆژ دەبوویەوە خۆی دەشۆرد پاشان بەڕۆژدا دەڕۆشتە ناو شاری مەککە وە دەیووت: پێغەمبەر (ﷺ) ئاوای کردووە).

**٦- خۆشۆردنی ئافرەتی (مُستحاضة)[٤]:**

بۆ هەموو نوێژێك یان بۆ نیوەڕۆ و عەسر یەك جار خۆی بشۆرێ وە بۆ مەغریب و عیشاش جارێ خۆی بشوات وە بۆ بەیانیش خۆی بشوات واتە لە شەو و ڕۆژێکدا سێ جار خۆی بشوات.

عن عَائِشَةَ ﷺ قالتَ :(أنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ اسْتُحِيضَتْ فِي عَهْدِ رسول اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَهَا بِالْغُسْلِ لِكُلِّ صَلَاةٍ).[١] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئوممو حەبیبە تووشی نەخۆشی ئافرەتانە (استحاضة) بوو

---

١) رواه البيهقي ٣/ ٣٩٨. والحاكم ١/ ٣٨٦. حديث صحيح.

٢) رواه الترمذي ٨٣٠.

٣) رواه البخاري ١٣٧٨. ومسلم ١٢٥٩.

٤) ئافرەتی (مستحاضة) بەو ئافرەتە دەوترێت کە تووشی نەخۆشی ژنانە بووە زیاد لە ماوەی عادەو بێ نوێژی ئافرەتانە خوێنی هەیە بە هۆی نەخۆشییەوە.

لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمانی پێ کرد کە هەموو نوێژێك خۆی بشوات).

(عن أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ قالت قلت يا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أبي حُبَيْشٍ اسْتُحِيضَتْ مُنْذُ كَذَا وَكَذَا فلم تُصَلِّ فقال رسول اللَّهِ ﷺ سُبْحَانَ اللَّهِ هذا من الشَّيْطَانِ لِتَجْلِسْ في مِرْكَنٍ فإذا رَأَتْ صُفْرَةً فَوْقَ الْمَاءِ فَلْتَغْتَسِلْ لِلظُّهْرِ وَالْعَصْرِ غُسْلًا وَاحِدًا وَتَغْتَسِلْ لِلْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ غُسْلًا وَاحِدًا وَتَغْتَسِلْ لِلْفَجْرِ غُسْلًا وَاحِدًا وَتَتَوَضَّأْ فِيمَا بين ذلك).[٢] ئەسمائی کچی عومەیس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فاطیمەی کچی حوبەیش لەکەیەوە بۆ کەی خوێنی هەیەو نوێژی نەکردووە، پێغەمبەریش فەرمووی: (ئەو –خوێن بوونە- لەشەیتانەوەیە با لەسەر تەشتێکی -پڕ لەئاو-دا دانیشێت ئەگەر زەردی بینی بەسەر ئاوەکەوە، ئەوە با یەك جار خۆی بشۆرێ بۆ نوێژی نیوەڕۆو عەسر، وەیەك جار خۆی بشۆرێ بۆ مەغریب و عیشا جارێك خۆی بشوات بۆ نوێژی بەیانی وە لە نێوانیاندا دەست نوێژێك بشوات).

**٧ـ خۆشۆردن بۆ ناشتنی بت پەرست:**

(عن عَلِيٍّ رضي الله عنه انه أتى النبي ﷺ فقال إِنَّ أَبَا طَالِبٍ مَاتَ فقال له النبي ﷺ اذْهَبْ فَوَارِهِ فقال انه مَاتَ مُشْرِكاً فقال اذْهَبْ فَوَارِهِ قال فلما وَارَيْتُهُ رَجَعْتُ إلى النبي ﷺ فقال لي اغْتَسِلْ).[٣] عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ ڕۆشتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و ووتم: ئەبو طالیب مردووە، فەرمووی: (بڕۆ بینێژە) دەڵێ ووتم: بەبت پەرستی مردووە، فەرمووی: (بڕۆ بینێژە) ئەنجا کەناشتم گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (خۆت بشۆ).

**٨ـ خۆشۆردن بۆ هەموو سەرجێ ییەک:**

سوننەتە بۆ هەر جووت بونێك پیاو یەك جار خۆی بشوات جاچ لەگەڵ یەك خێزانیدا بێت یان چەند خێزانێك. (عن أبي رَافِعٍ أَنَّ النبي ﷺ طَافَ ذَاتَ يَوْمٍ على نِسَائِهِ يَغْتَسِلُ عِنْدَ هذه وَعِنْدَ هذه قال فقلت له يا رَسُولَ اللَّهِ ألا تَجْعَلُهُ غُسْلًا وَاحِدًا قال هذا أَزْكَى وَأَطْيَبُ وَأَطْهَرُ).[٤] ئەبو

---

١) رواه ابوداود ٢٩٢، حديث صحيح.

٢) رواه ابوداود ٢٩٦. حديث صحيح.

٣) رواه ابوداود ٣٢١٤. والنسائي ١/ ١١٠. والبيهقي ٣/ ٣٩٨. حديث صحيح.

٤) رواه ابوداود ٢١٨. وابن ماجة ٥٩٠، حديث حسن.

ڕافیع (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) شەوێکیان هەموو خێزانەکانی بەسەر کردەوە لای ئەمە و لای ئەو خۆدەشۆری، دەڵێ منیش ووتم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ یەك جار خۆت ناشۆریت؟! فەرمووی: (ئەمە چاکتر و پاك و تەمیز ترە).

**٩. دوای هۆش هاتنەوە لەبێ هۆشی:**

(عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت: ثَقُلَ النبي ﷺ فقال أَصَلَّى الناس قُلْنَا لَا هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ قال ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ قالت فَفَعَلْنَا فاغْتَسَلَ فَذَهَبَ لِيَنُوءَ فَأُغْمِيَ عليه ثُمَّ أَفَاقَ فقال ﷺ أَصَلَّى الناس قُلْنَا لَا هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يا رَسُولَ اللَّهِ).[1] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆشی یەکەی قورس بوو فەرمووی: ( خەڵکی نوێژیان کرد؟) ووتمان: نەخێر چاوەڕوانی تۆ دەکەن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (ئاوم بۆ بکەنە کاسەکەوە) -مەنجەڵ یا تەشت- ئاومان تێکردوو خۆی شۆری ئینجا ویسی هەستێ بەڵام لەهۆش خۆی چوو، کەهۆشی هاتەوە بەخۆیدا فەرمووی: (ئایا خەڵکە کەنوێژیان کرد؟) ووتمان نەخێر چاوەڕێ ی بەڕێزتانن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ........).

---

١) رواه البخاري ٦٨٧. ومسلم ٤١٨.

# تەیەممووم

**یەکەم: پێناسەکەی**: بەکار هێنانی تۆزی خۆڵێکی پاکە بۆ ڕوخسارو دەستەکان لەجیاتی ئاو - لەدەست نوێژو غوسڵ دا- بەچەند مەرجێکی تایبەت.

**دووەم: بەڵگەی تەیەمموم لەقورئان و سوننەتدا:**

خوای گەورە لەقورئاندا ئەفەرمووێ: ﴿ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ ﴾ المائدة: ٦

واتە: نەخۆش بوون یا لەسەفەردا بوون یا کەسێکتان لەشوێنی دەست بەئاو گەیاندن هاتەوە یا ن جووت بوون لەگەڵ خێزانەکانتان و ئاوتان دەست نەکەوت (بۆ دەست نوێژ گرتن یا خۆ شتن) ئەوە تەیەمموم بکەن بەخۆڵێکی پاك، جا دەست بهێنن بەڕوخسارو دەستەکانتاندا بەو تۆز و خۆڵە پاکە....).

پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ: (وَجُعِلَتْ لنا الآرْضُ كُلُّهَا مَسْجدًا وَجُعِلَتْ تُرْبَتُهَا لنا طَهُورًا إذا لم نَجدْ الْمَاءَ).[١] واتە: زەوی هەمووی کراوە بە مزگەوت بۆمان، خۆڵەکەشی کراوەبە خاوێن کەرەوە بۆمان ئەگەر ئاومان دەست نەکەوت.

**سێ یەم: هۆیەکانی تەیەمموم کردن**، دروستە موسوڵمان تەیەمموم بکات ئەگەر یەکێ لەم هۆیانەی هەبێت:

**١. نەبوونی ئاو**: جا چ ئاو نەبێت وەك لەسەفەردا ئاووی دەست نەکەوێت. یاکەمێ ئاوی پێ بێت بۆ خواردنەوە پێویستی بێ. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ ﴾ المائدە:٦ واتە: ئاوتان دەست نەکەوت.

---

١) رواه مسلم ٥٢٢.

**٢. نەتوانینی ئاو بەکاربهێنی:**

أ. وەك ئەوەی ئاو نزیکی بێت بەڵام لەترسی دوژمن یا درندەیەك ناتوانرێت بگاتە ئاوەکەو بەکار بێنی.

ب. بترسێ بەبەکارهێنانی ئاو نەخۆش بکەوێ یا نەخۆشی یەکەی زیاد بکات یا درەنگ چاك بێتەوە بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە ( عِمْرَانُ بن حُصَيْنٍ الْخُزَاعِيُّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى رَجُلًا مُعْتَزِلًا لم يُصَلِّ في الْقَوْمِ فقال يا فُلَانُ ما مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ في الْقَوْمِ فقال يا رَسُولَ اللَّهِ أَصَابَتْنِي جَنَابَةٌ ولا مَاءَ قال عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ فإنه يَكْفِيكَ).[1] عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لەسەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا بووین (ﷺ) کاتێ نوێژ هات. پێغەمبەر (ﷺ) پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد کەسەیری کرد پیاوێك دوور لەخەڵکەکە وەستاوە، فەرمووی: چی ڕێگرت بوو کەنوێژ بکەیت؟) ووتی: لەش گرانیم تووش بوو ئاویش نیە خۆم بشۆم فەرمووی: بەخۆڵ تەیەمموم بکە ئەودت بەسە.

(عن جَابِرٍ قال خَرَجْنَا في سَفَرٍ فَأَصَابَ رَجُلًا مِنَّا حَجَرٌ فَشَجَّهُ في رَأْسِهِ ثُمَّ احْتَلَمَ فَسَأَلَ أَصْحَابَهُ فقال هل تَجِدُونَ لي رُخْصَةً في التَّيَمُّمِ فَقَالُوا ما نَجِدُ لك رُخْصَةً وَأَنْتَ تَقْدِرُ على الْمَاءِ فَاغْتَسَلَ فَمَاتَ فلما قَدِمْنَا على النبي ﷺ أُخْبِرَ بِذَلِكَ فقال قَتَلُوهُ قَتَلَهُمْ الله ألا سَأَلُوا إِذْ لم يَعْلَمُوا فَإِنَّمَا شِفَاءُ الْعِيِّ السُّؤَالُ إنما كان يَكْفِيهِ أَنْ يَتَيَمَّمَ وَيَعْصِرَ أو يَعْصِبَ شَكَّ مُوسَى على جُرْحِهِ خِرْقَةً ثُمَّ يَمْسَحَ عليها وَيَغْسِلَ سَائِرَ جَسَدِهِ).[2] جابر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ڕۆشتین بۆ سەفەرێك، پیاوێکمان بەردێك دای بەسەریدا و شکانی پاشان شەو شەیتانی بوو ئەنجا پرسیاری لە هاوڕێکانی کرد دەتوانم تەیەمموم بکەم؟ ووتیان ناتوانی و ڕێگەت پێ نادرێ تەیەمموم بکەیت چونکە ئاوت دەست دەکەوێت، ئەنجا خۆی شۆری و مرد، جابر دەڵێ: کە هاتینەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو هەواڵەی پێ درا فەرمووی: (کابرایان کوشت خوا بیانکوژێ، کە نەیانزانی بۆ پرسیاریان نەکرد؟ چونکە چارەی نەزانی پرسیار کردنە، ئەوەندەی بەس بوو تەیەمموم

---

١) رواه البخاري ٣٤٨. ومسلم ٦٨٢.

٢) رواه ابوداود ٣٣٦. والبيهقي ١/ ٢٢٨. والدارقطني ١/ ١٨٩ ـ ١٩٠. حديث صحيح بشواهده.

بکات پارچە قوماشێکی ببەستایە بە برینەکەیەوە و دەستی تەڕی بەسەردا بهێنایە و ئەندامەکانی تری لەشی بشۆردایە).

(عن عَمْرِو بن الْعَاصِ قال احْتَلَمْتُ فِي لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ فِي غَزْوَةِ ذَاتِ السُّلَاسِلِ فَأَشْفَقْتُ إن اغْتَسَلْتُ أَنْ أَهْلِكَ فَتَيَمَّمْتُ ثُمَّ صَلَّيْتُ بِأَصْحَابِي الصُّبْحَ فَذَكَرُوا ذلك لِلنَّبِيِّ ﷺ فقال يا عَمْرُو صَلَّيْتَ بِأَصْحَابِكَ وَأَنْتَ جُنُبٌ فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي مَنَعَنِي من الِاغْتِسَالِ وَقُلْتُ إني سمعت اللَّهَ يقول (ولا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كان بِكُمْ رَحِيمًا) فَضَحِكَ رسول اللَّهِ ﷺ ولم يَقُلْ شيئا).[1] عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لە جەنگی (ذات السلاس) شەوێکی زۆر سارد شەیتانی بووم، ترسام ئەگەر خۆم بشۆم بمرم، جا تەیەمموم کرد پێش نوێژی بەیانیم کرد بۆ هاوڕێکانم کە گەڕاینەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووداوەکەیان بۆ گێڕایەوە فەرمووی: (ئەی عەمر لەشت گران بوو پێش نوێژیت بۆ هاوڕێکانت کرد؟) منیش پێم ووت چی ڕێگرم بوو لە خۆشۆردن ووتم: بیستبووم خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ﴾ النساء: ٢٩ واتە: خۆتان مەکوژن چونکە بەڕاستی ـ خوا بەرامبەر بەئێوە میهرەبانە. ئیتر تەیەموومم کرد، پێغەمبەریش (ﷺ) پێکەنی و هیچی نەووت).

**چوارەم: چۆنیەتی تەیەمموم کردن:**

(عن عَمَّارِبن ياسر رضي الله عنهما قال: بَعَثَنِي رسول الله ﷺ فِي حَاجَةٍ فَأَجْنَبْت فلم أَجدْ الْمَاءَ فَتَمَرَّغْت فِي الصَّعِيدِ كما تَمَرَّغُ الدَّابَّةُ ثُمَّ أَتَيْت النبي ﷺ فَذَكَرْت ذلك له فقال إِنَّمَا يَكْفِيك أَنْ تَقُولَ بِيَدَيْك هَكَذَا ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدَيْهِ الأَرْضَ ضَرْبَةً وَاحِدَةً ثُمَّ مَسَحَ الشِّمَالَ على الْيَمِينِ وَظَاهِرَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ).[2] عەمماری کوڕی یاسر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ناردمی بۆ کارێك جا لەشم گران بوو ئاوم دەست نەکەوت خۆم گەوزانت لە خاکدا هەر چۆنێك ووڵاغ خۆی دەگەوزێنێ پاشان هاتمەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: تەنها ئاوە هات بەس بوو، پاشان یەك جار هەردوو دەستی دا بەزەوی دا پاشان دەست هێنانی بەدەم و چاویدا — دەستی چەپی هێنا بە دەستی ڕاستیدا و پشتی هەردوو

---

١) رواه ابوداود ٣٣٤، ٣٣٥. واحمد ٤/ ٢٠٣. وابن حبان ٢٠٢.

٢) رواه ابوداود ٣٤٧. ومسلم ٣٦٨.

دەستی تا مەچەك و ڕوخساری دا ، ئەم فەرمووده ئەوەی ڕوون کردەوە کە تەیەمموم یەك جار دەست دانە بەزەویدا و دەست هێنان بەڕوخسار و هەردوو دەستە تا مەچەك.

**پێنجەم: تەیەمموم کردن بەدیوار دروستە:**

(فقال أبو جُهَيْم أَقْبَلَ النبي ﷺ من نَحْوِ بئْرِ جَمَلٍ فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عليه فلم يَرُدَّ عليه النبي ﷺ حتى أَقْبَلَ على الْجِدَارِ فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ ثُمَّ رَدَّ عليه السَّلَامَ).[1] ئەبو جوهەیم (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەبیری حەمەلەوە هاتەوە، پیاوێك پێ ی گەیشت و سەلامی لێ کرد، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی نەدایەوە هەتا ڕۆشتە لای دیوارێك - دەستی دا بەدیوارەکەدا- و مەسحی دەم و چاو و دەستەکانی کرد، پاشان وەڵامی سەلامەکەی دایەوە).

**شەشەم: ئەو شتانەی تەیەمموم هەڵدەوەشێننەوە:**

ئەوەی دەست نوێژ هەڵ دەوەشێنێتەوە تەیەممومیش هەڵدەوەشێنێتەوە، هەروەها پەیدابوونی ئاو هەڵیدەوەشێنێتەوە بۆ کەسێ لەبەر نەبوونی ئاو تەیەممومی کردووە و توانای بەکارهێنانی ئاو هەڵیدەوەشێنێتەوە بۆ کەسێ کە نەیتوانیوە ئاو بەکاربێنێ، بەڵام هەر نوێژێکی کرد بێ بەتەیەمموم ئەوە دروستە و پێویست نیە بیگێڕێتەوە.

(عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قال خَرَجَ رَجُلَانِ فِي سَفَرٍ فَحَضَرَتْ الصَّلَاةُ وَلَيْسَ مَعَهُمَا مَاءٌ فَتَيَمَّمَا صَعِيدًا طَيِّبًا فَصَلَّيَا ثُمَّ وَجَدَا الْمَاءَ فِي الْوَقْتِ فَأَعَادَ أَحَدُهُمَا الصَّلَاةَ وَالْوُضُوءَ و لم يُعِدْ الْآخَرُ ثُمَّ أَتَيَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَا ذلك له فقال لِلَّذِي لم يُعِدْ أَصَبْتَ السُّنَّةَ وَأَجْزَأَتْكَ صَلَاتُكَ وقال لِلَّذِي تَوَضَّأَ وَأَعَادَ لك الأَجْرُ مَرَّتَيْنِ).[2] ئەبو سەعیدی خوردی (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: دوو پیاو - لەهاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) چوون بۆ سەفەرێك کاتێ نوێژکردن هات و ئاویان پێ نەبوو بۆیە بەخوڵێکی پاك تەیەممومیان کرد نوێژیان کرد پاشان کاتی نوێژەکە مابوو گەشتن بەئاو پیاوێکیان دەست نوێژ و نوێژەکەی دووبارە کردەوە ئەوی تریان نەیکردەوە پاشان هاتنەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەیان بۆ گێڕایەوە، فەرموو بەوەیان نەیکردەوە: سوننەتت پێکاوە و نوێژەکەت دروستە) وتیشی بەوەیان دووبارەکردەوە (تۆش دوو پاداشت بۆ نووسراوە).

---

١) رواه ابوداود ٣٣٨. والنسائي ١/ ٢١٣ (٤٣٣). حديث صحيح.

٢) رواه احمد ٥/ ١٤٦. وابوداود ٣٣٣. حديث صحيح.

ئەگەر لەش گرانێك یا حەیزدارێك كە حەیزەكەی تەواو بووە تەیەمومی كرد بە هۆیەك لە هۆیەكانی ڕەوا بوونی تەیەموم و نوێژی كرد پێویست نیە ئەو نوێژە بگرێرێتەوە، بەڵام واجبە هەر كات توانای بەكارهێنانی ئاوی بوو یا ئاوی دەست كەوت خۆی بشوات.

**حەوتەم: ئەگەر ئاو نەبوو ژن و مێردایەتی دروستە:**

ئەگەر كەسێك ئاوی دەست نەدەكەوت دەتوانێ سەرجێ ی لەگەڵ خێزانیدا بكات و پاشان تەیەموم بكات و نوێژ و عیبادەتەكانی ئەنجام بدات.

(فقال أبو ذَرٌّ إنِي اجْتَوَيْتُ الْمَدِينَةَ فَأَمَرَ لِي رسول اللَّهِ ﷺ بابل فكنت فيها فاتيت النبي ﷺ فقلت هَلَكْتُ أبو ذر قال: ما حالك؟ قال: كنت أتعرض للْجَنَابَةُ وليس قربي مَاءٍ، فقال إنَّ الصَّعِيدَ الطَّيِّبَ طَهُورٌ وَإِنْ لم تَجِدْ الْمَاءَ إلى عَشْرِ سِنِينَ).[1] ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئاو و هەوای مەدینەم پێ نەكەوت نەخۆش كەوتم بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی كرد چەند ووشترێكیان پێدام - چوومە دەرەوەی مەدینە- ئیتر من لەگەڵ ووشترەكاندا بووم، جا هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ووتم: ئەبو زەڕ فەوتاوە فەرمووی: (حالت چییە) ووتم تووشی لەش گرانی دەبم ئاویشم نزیك نیە، - خۆم بشۆم بەئاو - فەرمووی: (بێگومان خۆڵی پاككەرەوەیە ئەگەر تا دە ساڵیش ئاووت دەست نەكەوێت).

١) رواه البخاري ٢٢٨، ٣٠٦. ومسلم ٣٣٣.

## بێ نوێژی ( حەیز )

**یەکەم: حەیز چی یە:** ئەو خوێنەیە کە لە پێشی ئافرەتەوە دێتەدەر دوا باڵغ بوونی لەکاتی لەش ساغیدا لەکاتانێکی دیاری کراودا.

**دووەم: بەپاك بوونەوە لە حەیز خۆشۆردن واجب دەبێ:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ﴾ البقرة:٢٢٢

واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی حەیز. بڵێ حەیز ئازارە کەواتە دوور بکەونەوە لەهاوسەرەکانتان لەکاتی بێ نوێژییاندا و نزیکیان مەکەونەوە ـ سەرجێ یان لەگەڵدا مەکەن- تا پاك دەبنەوە، ئینجا کەخۆیان شت (دوا پاك بوونەوەیان) ئەنجا بچنە لایان لەو شوێنەوە کەخوا فەرمانی پێ کردوون.

(جاءت فَاطِمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ إلى النبي ﷺ فقالت يا رَسُولَ اللَّهِ إني امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ فلا أَطْهُرُ أَفَأَدَعُ الصَّلَاةَ فقال رسول اللَّهِ ﷺ لَا إنما ذَلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَ بِحَيْضٍ فإذا أَقْبَلَتْ حَيْضَتُكِ فَدَعِي الصَّلَاةَ وإذا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ ثُمَّ صَلِّي).[1] فاتیمەی کچی ئەبی حوبەیش (ڕەزای خوای لێ بێت) (هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من ئافرەتێکم بەردەوام خوێنم لەبەر دەڕوا و پاك نابمەوە، واز لە نوێژ کردن بێنم ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : (نوخێر واز لە نوێژ کردن مەهێنە چونکە ئەو خوێنە دەمارێکە -خوێنی بەربوە-و خوێنی حەیز نیە) ئەگەر خوێنی حەیزت پیا هات نوێژ مەکە. کاتێ خوێنەکە نەما خوێنەکە خۆت بشۆرەو نوێژ بکە).

---

١) رواه ابوداود ٢٨٦. والنسائي ١/ ١٨٥. والبيهقي ١/ ٣٢٥. حديث صحيح.

**سێ هەم: ڕەنگی خوێنی حەیز: مەرجە خوێنی حەیز یەکێک لەم ڕەنگانە بێت:**

١. ڕەش: (عن فَاطِمَةَ بِنْتِ أَبِي حُبَيْشٍ أَهَا كانت تُسْتَحَاضُ فقال لها النبي ﷺ إذا كان دَمُ الْحَيْضَةِ فإنه دم أَسْوَدُ يُعْرَفُ فإذا كان ذلك فامسكي عن الصَّلَاةِ فإذا كان الْآخَرُ فَتَوَضَّئِي وَصَلِّي فَإِنَّمَا هو عِرْقٌ).[١] فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش (ڕەزای خوای لێ بێت) خوێنی بەردەوامی هەبوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێی: (ئەگەر خوێنەکە خوێنی حەیز بوو ئەوە ڕەشە و دەناسرێ، جا ئەگەر وابوو ئەو ماوەیە نوێژ مەکە، بەڵام ئەگەر ڕەنگێکی تر بوو ئەوە دەست نوێژ بگرەو نوێژ بکە چونکە ئەوە دەمارە).

٢. سوور: چونکە خوێن لەبنەڕەتدا سوورە.

٣. زەرد: ئاوێکە لە ئافرەت دێتە دەرەوە وەك کێم وایە و زەردی یەکەی زۆرترە.

٤. لێڵ: لەنێوان سپی و ڕەشی دایە وەك ئاوی لێڵ وایە.

(عن مرجانه مَوْلَاةِ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَهَا قالت كان النِّسَاءُ يَبْعَثْنَ إلى عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ بِالدِّرَجَةِ فيها الْكُرْسُفُ فيه الصُّفْرَةُ من دَمِ الْحَيْضَةِ يَسْأَلْنَهَا عَنِ الصَّلَاةِ فَتَقُولُ لَهُنَّ لَا تَعْجَلْنَ حتى تَرَيْنَ الْقَصَّةَ الْبَيْضَاءَ).[٢] مورجانە کە نیزەکی عائیشە بوو (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ ژنان ئەو کۆکەی لەحەیزدا هەڵیان گرتبوو لەشتێکدا دەیاننارد بۆ عائیشە کەزەردی پێوە بوو عائیشەش دەیووت پەلە مەکەن هەتا لۆکەکە بەسپێتی ئەبینن).

(عن عَائِشَةَ انها قالت إذا رَأَتْ الدَّمَ فَلْتُمْسِكْ عن الصَّلَاةِ حتى تَرَى الطُّهْرَ أَبْيَضَ كالفضة ثُمَّ تغتسل وَتُصَلِّي).[٣] لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ: (عائیشە ووتی ئەگەر خوێنی بینا با نوێژ نەکات هەتا پاکی دەبینێ سپی وەك زیوو. پاشان خۆی بشوات و نوێژ بکات).

زەردو لێڵ لەماوەی ڕۆژانی حەیزدا بەحەیز دادەنرێ بەڵام لەڕۆژانی تردا بەحەیز دانانرێ بەبەڵگەی

---

١) رواه مالك ١/ ٥٩ (٥٧). حديث صحيح لغيره.

٢) رواه الدارمي ١/ ٢١٤. بسند حسن.

٣) رواه البخاري ٣٢٦. وابوداود ٣٠٧.

(عن أُمِّ عَطِيَّةَ قالت كنا لَا نَعُدُّ الْكُدْرَةَ وَالصُّفْرَةَ بَعْدَ الطُّهْرِ شيئا).[1] فەرموودەی ئوممو عەتییە (ڕەزای خوای لێ بێت) كە دەڵێ: (ئێمە زەردی و لێڵی دوا پاك بوونەوە-ی حەیز-مان بەهیچ دانەدەنا). كەواتە زەردی و لێڵی پێش پاك بوونەوە بەحەیز دادەنرێت.

**چوارەم: ماوەی حەیز:**

دەربارەی دیاری كردنی لایەنی كەمی و زۆری حەیز بەڵگەی وانیە پشتی پێ ببەسترێت و ڕاستی بێ بكرێتە بەڵگە، بەڵام بۆ ئافرەتان كاتێك هەیە وەك عادەت لەسەر ئەڕۆن و ماوەكەی دیاری ئەكەن بەڵگەی كاركردن بەم عادەتەش (عن أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها انها استفتت رسول اللّٰهِ ﷺ في امراة تهراق الدم، فقال لِتَنْظُرْ عِدَّةَ اللَّيَالِي وَالآيَّامِ التي كانت تَحِيضُهُنَّ من الشَّهْرِ قبل أَنْ يُصِيبَهَا الذي أَصَابَهَا فَلْتَتْرُكْ الصَّلَاةَ قَدْرَ ذلك من الشَّهْرِ فإذا خَلَّفَتْ ذلك فَلْتَغْتَسِلْ ثُمَّ لِتَسْتَثْفِرْ بِثَوْبٍ ثُمَّ لِتُصَلِّ فيه).[2] ئوممو سەلمە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر (ﷺ) كرد دەربارەی ئافرەتێك كەخوێنی لەبەر بڕوات بەهەمیشەیی، ئەویش فەرمووی: (با سەیر كات ئەندازەی ئەو شەو و ڕۆژانە چەندە لەهەر مانگێكدا دەكەوێتە حەیز تێیاندا، جا بەئەندازەی ئەو ماوەیە نوێژ نەكات، كە ئەو ئەندازەیە ڕۆشت باخۆی بشوات و پارچە پەڕۆیەك بەخۆیەوە هەڵگرێ و نوێژ بكات).

خۆ ئەگەر ئافرەتێك عادەتێكی دیاری كراوی نەبوو بۆ ماوەی حەیزەكەی لەسەری بڕوات، ئەوەی سەیری نیشانەكانی خوێنەكە بكات، بەبەڵگەی فەرموودەی

فاتیمەی كچی ئەبو حوبەیش (ڕەزای خوای لێ بێت) كە خوێنی بەردەوامی هەبوو ، فقال لها النبي ﷺ ( إذا كان دَمُ الْحَيْضَةِ فإنه دم أَسْوَدُ يُعْرَفُ).[3] پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی فەرموو: (ئەگەر خوێنەكە خوێنی حەیز بوو ئەوە ڕەشە و دەناسرێ).

ئەم فەرموودە ئەوە دەگەیەنێت خوێنی حەیز جیاوازە لەخوێنی تر لەلایەن ئافرەتانەوە دەناسرێت.

---

١) رواه احمد ٦/ ٣٢٠. وابوداود ٢٧٤. حديث صحيح.

٢) رواه ابوداود ٢٨٦. والنسائي ١/ ١٨٥. والبيهقي ١/ ٣٢٥. حديث صحيح.

٣) رواه ابوداود ٢٣٢.

ماوەی پاکێتی نێوان دوو حەیز: زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کەماوەی زۆری پاکێتی نێوان دوو حەیز ئەندازەیەکی دیاری کراوی نیە، دەربارەی لای خواروی پاکێتیش ڕایان جیاوازە هەندێکیان بەپانزە ڕۆژیان داناوە و هەندێکیان بە سیانزە ڕۆژ. بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە دەربارەی لای کەمیشی بەڵگەیەکی وانیە بکرێتە بەڵگەو کاری پێ بکرێت.

**پێنجەم: ئەو شتانەی بۆ ئافرەتی حەیزدار حەرامن:**

**١- نوێژ کردن:** بەبەڵگەی فەرمووی فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش (ڕەزای خوای لێ بێت) کەپێشتر ڕابوور دوو باسمان کرد.

**٢- مانەوە لەمزگەوتدا:** دروست نیە ئافرەت لەحەیزدا بێ لەمزگەوت دا بمێنێتەوە، بەڵام تێپەڕین بەمزگەوتدا دروستە وەك ئەوەی لەدەرگایەکی ترەوە دەربچێ ونەمێنێتەوە لەمزگەوتدا. (قال رَسُولَ اللَّهِ ﷺ (فَإِنِّي لَا أُحِلُّ الْمَسْجِدَ لِحَائِضٍ ولا جُنُبٍ).[1] پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (ڕێگە نادەم ئافرەتی لەبێ نوێژی دا و پیاوانی لەش پیس بێنە مزگەوت).

**٣- تەواف کردن بەدەوری کەعبەدا:**

(عَائِشَةَ تَقُولُ خَرَجْنَا لَا نَرَى إلا الْحَجَّ فلما كنا بسَرِفَ حِضْتُ فَدَخَلَ عَلَيَّ رسول اللَّهِ ﷺ وأنا أَبْكِي قال ما لَكِ أَنُفِسْتِ قلت نعم قال إِنَّ هذا أَمْرٌ كَتَبَهُ الله على بَنَاتِ آدَمَ فَاقْضِي ما يَقْضِي الْحَاجُّ غير أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ).[2] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لەمەدینە دەرچووین لەگەڵ موسوڵماندا — بەمەبەستی حەج لەکاتێکدا لە سەرەف دا بووین کەوتمە حەیزەوە. پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ لام دەگریام فەرمووی: (ئەوە چیتە کەوتوویتە حەیزەوە؟) ووتم: بەڵێ، فەرمووی: (ئەمە شتێکە خوا نووسیوویەتی لەسەر کچان ئادەم — واتە ئافرەتان- حاجی چی دەکات تۆش بیکە طەواف کردن بەدەوری کەعبەدا نەبێت هەتا پاك دەبێتە).

---

١) رواه ابوداود.

٢) رواه البخاري ٢٩٠. ومسلم ١٢١١.

**٤. ڕۆژو گرتن:** دروست نیە ئافرەتی حەیزدار نەڕۆژی فەرز نە ڕۆژی سوننەت بگرێت.

(عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال في المرأة وقد سئل عن معنى نقصان دينها قال: أليس إذا حاضت المرأة لم تصل و لم تصم).[١] ئەبو سەعید خودری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئافرەت كاتێ پرسیاری لێ كرا یانی چی ئافرەت ئاینی نوقصانە فەرمووی: (ئەوەنیە كاتێ كەوتە بێ نوێژی نوێژ ناكات و ڕۆژوویش ناگرێت؟)

بەڵام دەبێت ڕۆژووەكانی بگرێتەوە، (عن مُعَاذَةَ قالت سَأَلْتُ عَائِشَةَ فقلت ما بَالُ الْحَائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ ولا تَقْضِي الصَّلَاةَ فقالت كان يُصِيبُنَاذلك على عهد رسول اللّهِ ﷺ فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ ولا نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلَاةِ).[٢] موعازە دەڵێ: پرسیارم لەعائیشە كرد ووتی: ئەوە بۆچی ئافرەتی حەیزدار ڕۆژوو دەگێڕێتەوە بەڵام نوێژ ناگرێتەوە. عائیشە وتی: (لەكاتی پێغەمبەردا (ﷺ) دەكەوتینە بێ نوێژی فەرمانمان پێئەكرا بەگێڕانەوەی ڕۆژوو بەڵام فەرمانمان پێ نەدەكرا بەگێڕانەوەی نوێژ).

**٥. جووت بوون لەگەڵ پیاودا:** دروست نیە ئافرەت لەكاتی بێ نوێژیدا پیاوەكەی سەرجێ ی لەگەڵدا بكات. وە دروست نیە نێوان ناوك و ئەژنۆی ئارەزووی لێ ببرێت. قورئان دەفەرمووی: ﴿ فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَ ﴾ البقرة: ٢٢٢ واتە: دووركەونەوە لەسەر جێ یی ئافرەتان لەكاتی حەیزدا تا پاك دەبنەوە.

(قال أنس قال: رسول اللّهِ ﷺ اصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إلا الْجِمَاعَ).[٣] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی -دەربارەی ئافرەتی حەیزدار- (هەموو شتێكیان لەگەڵدا بكەن تەنها جووت بوو - جیماع - نەبێت).

---

١) رواه البخاري ٢٩٨. ومسلم ٨٠.

٢) رواه البخاري ٣٢١. ومسلم ٣٣٥.

٣) رواه مسلم ٣٠٢.

## خوێنی بەردەوام (الاستحاضة)

**یەکەم: پێناسەکەی:** هاتنە دەرەوەی خوێنە لەپێشی ئافرەتەوە بە بەردەوامی - بەدەر لەکاتی سوڕی مانگانەی خۆی- بەهۆی نەخۆشی یەوە، خۆشۆردن پێویست ناکات بەڵام دەست نوێژ دەشکێنێ، ڕێگری نوێژو ڕۆژوو نابێت. خوێن و جێگاکەی دەشۆردرێ و پارچە پەڕۆیەك بەخۆیەوە هەڵگرێ و بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژ دەگرێ و نوێژ دەکات.

(عن عَائِشَةَ قالت جَاءَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ أبي حُبَيْشٍ إلى النبي ﷺ فقالت يا رَسُولَ اللَّهِ إني امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ فلا أَطْهُرُ أَفَأَدَعُ الصَّلَاةَ فقال رسول اللَّهِ ﷺ لَا إنما ذَلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَ بِحَيْضٍ فإذا أَقْبَلَتْ حَيْضَتُكِ فَدَعِي الصَّلَاةَ وإذا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ ثُمَّ صَلِّي).[1] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: فاطیمە ی کچی ئەبو حوبەیش (ڕەزای خوای لێ بێت) پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد وتی: من هەمیشە خوێنم هەیەو پاك نابمەوە ئایا واز لەنوێژ کردن بێنم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (نەخێر ئەوە دەمارێکە - تووشی ئەوەی کردووی- بەڵکو بەئەندازە ئەو ڕۆژانە کە تێیدا دەکەوتیتە بێ نوێژ - لەمانگەکانی- ڕابردوودا واز لەنوێژ بێنە. پاشان خۆت بشۆ و نوێژ بکە).

(إنما ذَلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَ بِالْحَيْضَةِ فإذا أَقْبَلَتْ الْحَيْضَةُ فَاتْرُكِي الصَّلَاةَ فإذا ذَهَبَ قَدْرُهَا فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي).[2] لەڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: (ئەوە حەیز نیە، جا ئەگەر خوێنی حەیزی پیا هات ئەوە واز لەنوێژ کردن بێنە ئەنجا ئەگەر ئەندازەی خۆی تەواو بوو- چەند ڕۆژ پێشوو تر حەیزت هەبوو ئەوەندە تێپەڕی خۆت بشۆ دواتر گەر خوێنت بوو- ئەو خوێنە بشۆ و نوێژ بکە) وە ئەگەر ئافرەتەکە جیاوازی دەکرد لەنێوان خوێنەکەدا، ئەوە خوێنی حەیز ڕەشەو دەزانرێ لەلایەن ئافرەتانەوە ئەگەر وانە بوو ئەو خوێنی نەخۆشی یەکە باسمان کرد.

---

١) رواه البخاري ٣٢٥١. ومسلم ٣٣٣.

٢) رواه البخاري ٣٠٦.

**دووەم: حوكمەكانی خوێنی بەردەوام:** هیچ شتێك لەوانەی لەسەر ئافرەتی حەیزدار حەرامە بۆ ئافرەتیَ خوێنی بەردەوامی هەبیَ حەرام نیە، تەنها ئەوەندە هەیە پێویستە لەسەری بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژ بگرێت.

## زەیستانی

**یەكەم پێناسەكەی:** ئەو خوێنەیە دوای منداڵ بوو ن ئافرەت هەیەتی.

بەڵام خوێنی ژانی منداڵ بوون بەخوێنی زەیستانی دانانرێت و ئافرەتەكە نوێژی لەسەرە پێش منداڵ بوون باخوێنی ژانیشی هەبێت. ئەگەر نەیتوانی لەو كاتەدا نوێژەكەی بكات دەبێت دواتر بیگێڕێتەوە.

**دووەم: لای سەرووی زەیستانی چل ڕۆژە:**

(عن أُمِّ سَلَمَةَ قالت كانت النُّفَسَاءُ على عَهْدِ رسول اللّهِ ﷺ تَقْعُدُ بَعْدَ نِفَاسِهَا أَرْبَعِينَ يَوْمًا أو أَرْبَعِينَ لَيْلَةً).[1] بەبەڵگەی ئەم فەرموودەی ئوموسەلەمە (ڕەزای خوای لیَ بێت) دەڵیَ: (ئافرەتانی زەیستانی لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چل ڕۆژ یا چل شەو دوای منداڵ بوونەكەی دادەنیشت - خۆی نەدەشۆرد و نوێژی نەدەكرد -).

ئیمانی تورمزی دەڵیَ: زانایانی صەحابە و تابیعین و ئەوانەی دوا ئەوانیش یەك دەنگن لەسەر ئەوەی ئافرەتی زەیستان تا چل ڕۆژ دروست نی یە نوێژ بكات، مەگەر پێش ئەو كاتە پاكێتی ببینیَ ئەو كاتە دەبیَ خۆی بشوو نوێژ بكات. ئەگەر دوای چل ڕۆژ خوێنی هەبوو، ئەوە زۆربەی زانایان دەڵێن دوای چل ڕۆژ با خوێنیشی هەبێت نابیَ واز لەنوێژ بێنیَ[2].

**سێ هەم: لای خواروی زەیستانی دیاری نەكراوە:** چونكە بەڵگەیەك لەو بارەیەوە نەهاتووە پشتی پیَ ببەسترێت بەڵام ئەگەر پێش چل ڕۆژ خوێنی نەما ئەوە لەو كاتەوە خوێنەكەی نەماوە بەزەیستان دانانرێت و پاك بۆتەوە، هەروەها ئەگەر لەچل ڕۆژ تێپەڕی كرد

-

١) رواه احمد ٢٦٦٤٦. حديث حسن.

٢) بروانە سنن الترمذي ١/ ١٨٩.

ئەوە بەخوێنی زەیستانی دانانرێت بەڵکو بەخوێنی نەخۆشی (إستحاضة) دادەنرێت دەبێت خۆی بشواو نوێژ بکات.

**چوارەم: چ شتێک لەئافرەتی زەیستان حەرامە:**

زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی ئافرەتی زەیستان لەهەموو شتێکدا وەك ئافرەتی حەیزدار وایە بەبێ جیاوازی.

# كتێبی نوێژ و حوكمەكانی

**یەكەم: پێناسەی نوێژ:** پەرستشێكە لە چەند كردار و گوفتارێكی تایبەتی پێك دێت بە (الله أكبر) دەست پێ دەكات بەسەلامدانەوە كۆتایی دێت لەگەڵ نیەتدا. وە پێنج نوێژە فەرزەكە یەكێكە لەپێنج پایەكەی ئیسلام بەڵكو دوای شایەتومان لەهەموویان گەورەترە. بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەك دەنگی زانایان نوێژ واجبە ئەوەی دانی پێدا نەنێت كافر دەبێت.

**دووەم: مێژووی دانانی نوێژ:**

نوێژ لەو پەرستشە كۆنانەیە كەدانانراوە و پێویست كراوە خوای گەورە دەربارەی ئیسماعیل (علیه السلام) دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا ﴾ مریم:٥٥ واتە: ئیسماعیل (علیه السلام) فەرمانی بەخاوخێزانی دەكرد بەنوێژ و بەزەكات دان وە ئەو لای پەروەردگاری جێ ی ڕەزامەندی بوو.

ئەو ئاینەش كە ئیبراهیم (علیه السلام) هێنا بوو نوێژی تێدا بوو، هەروەها شوێنكەوتووانی مووساش (علیه السلام) نوێژیان هەبووە، لەسەر زمانی عیساش (علیه السلام) خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْصَٰنِى بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴾ مریم: ٣١ واتە: خوای گەورە ئامۆژگاری كردم بەئەنجامدانی نوێژو زەكاتدان. هەتا لە ژیاندا ماووم. كاتێكیش پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) نێردرا بەبەیانیان و ئێواران دا دوو نوێژی دوو ڕكاتی دەكرد.

**سێ یەم: نوێژە فەرزەكان:**

ئەو نوێژانەن لەسەر هەموو موسوڵمانێكی باڵغی عاقلی پاك لەحەیزو زەیستانی پێویستە ، كە ئەم پێنج نوێژەن: بەیانی، نیوەڕۆ، عەسر، مەغریب، عیشا. ئەم پێنج نوێژە فەرزە، لەشەوی ئیسراو میعراجدا خوای گەورە لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) و ئوممەتەكەی فەرز كرد لەسەرەتادا پەنجا نوێژ بوو، پاشان خوای گەورە لەسەر داوای پێغەمبەر (ﷺ) سووكی كردو كەمی كردەوە

بۆ پێنج نوێژ (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال فُرِجَ سَقْفُ بَيْتِي وأنا بِمَكَّةَ فَنَزَلَ جِبْرِيلُ ﷺ ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِي فَعَرَجَ بِي إلى السَّمَاءِ ..... فَفَرَضَ اللهُ على أُمَّتِي خَمْسِينَ صَلَاةً ..... فَرَاجَعْتُه فقال هِيَ خَمْسٌ وَهِيَ خَمْسُونَ لَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ).[1] پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (کاتێ لەمەککەدا بووم سەربانی ماڵەکەمان کەلێنێکی تێکەوت. جیبرییل هاتە خوارەوە.... پاشان دەستی گرتم و لەگەڵ خۆیدا بەرزی کردمەوە بۆ ئاسمان.... جا خوای گەورە پەنجا نوێژی لەسەر ئومەتەکەم فەرز کرد... منیش گەڕامەوە - داوای کەمکردنەوەیانم کرد - جا خوای گەورە فەرمووی ئەوە پێنج نوێژن بەڵام هەر پەنجان - لەپاداشتدا - چونکە ووتەی من گۆڕینی بەسەردا نایەت).

لەڕاستیدا ڕووداوی ئیسڕاو میعراج هەژدە مانگ پێش گۆچ کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بوو بۆ مەدینە کەواتە پێنج نوێژە فەرزەکە دوو نوێژە دوو ڕکاتیەکەی بەیانیان و ئێوارانیانی. لابردو ئەم نوێژانە جێیان گرتنەوە.

**چوارەم: بەڵگەی فەرز بوونی نوێژەکان:**

**لە قورئاندا** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴾ الروم: ١٧ – ١٨

(ابن عباس رضي الله عنه :أراد بقوله { فسبحان الله حين تمسون } قال : صلاة المغرب { و حين تصبحون } صلاة الصبح و عشيا صلاة العصر { و حين تظهرون } صلاة الظهر).[2]

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: مەبەست لە (حِينَ تُمْسُونَ) نوێژی مەغریب و عیشایە، وە مەبەستیش لە (وَحِينَ تُصْبِحُونَ) نوێژی بەیانی یە، وە مەبەست لە (وَعَشِيًّا) نوێژی عەسرە، وە مەبەست لە (وَحِينَ تُظْهِرُونَ) نوێژی نیوەڕۆیە).

وە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴾النساء:١٠٣

واتە: بێگومان نوێژ فەرزێکە لەسەر باوەڕداران کاتی دیاری کراوی هەیە.

---

١) رواه البخاري ٣٤٢. ومسلم ١٦٣.

٢) رواه الحاكم ٣٥ ٩٤. والدرر المنثور ٥/ ٢٩٥.

**لە سوننەتیشدا**

بەڵگەی فەرموودەکەی ئیسرایە کە لەصەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتبوو کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد. وە ئەم فەرموودەیەش: (عن بن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أَنَّ النبي ﷺ بَعَثَ مُعَاذًا رضي الله عنه إلى الْيَمَنِ فقال ادْعُهُمْ إلى شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله وَأَنِّي رسول اللَّهِ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قد افْتَرَضَ عليهم خَمْسَ صَلَوَاتٍ في كل يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) موعازی کوڕی جەبەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) نارد بۆ یەمەن فەرمووی پێ ی (بانگیان بکە بۆ شایەتومان هێنان کە (أشهد ان لا اله الا الله وأشهد ان محمدا رسول الله) یە ئەگەر ئەمەمان بەگوێ کردی پێیان ڕاگەیەنە کە خوا لەشەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون....).

وە بەڵگەیەکی تر: (جاء رَجُلٌ إلى رسول اللَّهِ ﷺ من أَهْلِ نَجْدٍ ثَائِرَ الرَّأْسِ يُسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ ولا يُفْقَهُ ما يقول حتى دَنَا فإذا هو يَسْأَلُ عن الْإِسْلَامِ فقال رسول اللَّهِ ﷺ خَمْسُ صَلَوَاتٍ في الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ فقال هل عَلَيَّ غَيْرُهَا قال لَا إلا أَنْ تَطَوَّعَ).[2] کاتێ پیاوێکی خەڵکی نەجد هات بۆخزمەت پێغەمبەر (ﷺ) قژی گژ و ئاڵۆسکاو بوو دەنگی دەبیستراو لێ ی تێنەدەگەیشتی چی دەڵێ هەتا نزیك بوویەوە دەرکەوت دەربارەی ئیسلام پرسیار دەکات پێغەمبەریش (ﷺ) لە وەڵامدا فەرمووی: (پێنج نوێژ لەشەو و ڕۆژێکدا) عەرزی کرد جگە لەمانە هیچی ترم لەسەرە فەرمووی: (نەخێر مەگەر نوێژی سوننەت بکەیت زیاد لە فەرزەکە).

**پێنجەم: کاتی نوێژەکان:**

مەبەستمان کاتی نوێژە فەرزەکانە: سەرەتا و کۆتایی کاتەکانیان کامەیە هاتنی کاتی نوێژەکان مەرجی دووەمی نوێژەکە بێ ئەو مەرجانە نوێژ دروست نیە، دەربارەی کاتی نوێژەکان .

ئەم فەرموودە کاتەکانیان دیاری دەکات:

(عن عبد اللَّهِ بن عَمْرٍو أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال وَقْتُ الظُّهْرِ إذا زَالَتْ الشَّمْسُ وكان ظِلُّ الرَّجُلِ كَطُولِهِ ما لم يَحْضُرْ الْعَصْرُ وَوَقْتُ الْعَصْرِ ما لم تَصْفَرَّ الشَّمْسُ وَوَقْتُ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ ما لم يَغِبْ

---

١) رواه البخاري ١٣٣١. رواه مسلم ١٩

٢) رواه البخاري ٤٦. رواه مسلم ١١.

الشَّفَقُ وَوَقْتُ صَلَاةِ الْعِشَاءِ إلى نِصْفِ اللَّيْلِ الأَوْسَطِ وَوَقْتُ صَلَاةِ الصُّبْحِ من طُلُوعِ الْفَجْرِ ما لم تَطْلُعْ الشَّمْسُ فإذا طَلَعَتْ الشَّمْسُ فَأَمْسِكْ عن الصَّلَاةِ فَإِنَّهَا تَطْلُعُ بين قَرْنَيْ شَيْطَانٍ).[1]
عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرمووی: (کاتی نیوەڕۆ کاتێکە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان بترازێت و سێبەری پیاو بەئەندازەی خۆی درێژ بێت مادام عەسر نەهاتبێت کاتی عەسریش هەتا پێش خۆر زەرد هەڵگەڕان، کاتی نوێژی مەغریبیش هەتا وون بوونی ڕووناکی ئاسۆ. کاتی نوێژی عیشاش هەتا نیوەی شەو، کاتی نوێژی بەیانیش لەبەرەبەیانەوە هەتا پێش خۆر کەوتن کەخۆر هەڵهات نوێژ مەکە چونکە خۆر لەنێوان دوو شاخی شەیتاندا هەڵدێت). ئێستا کاتەکان یەکە یەکە باس دەکەین:

**أ- نوێژی بەیانی:** کاتەکەی دەست پێ دەکات بەدەرکەوتنی بەیانی (سپێدەی) ڕاستگۆ هەتا ڕۆژهەڵدێ. قال رَسُولَ اللهِ ﷺ (وَوَقْتُ صَلَاةِ الصُّبْحِ من طُلُوعِ الْفَجْرِ ما لم تَطْلُعْ الشَّمْسُ).[2]
پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کاتی نوێژی بەیانی لەهەڵهاتنی بەیانەوە هەتا پێش خۆرکەوتن).

**ب - نوێژی نیوەڕۆ:** کاتەکەی دەست پێ دەکات بەلادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان بەلای خۆرئاوادا هەتا سێبەری هەموو شتێك بەقەدەر خۆی لێ دێ جگە لە سێبەری لادان کەسەرەتای کاتەکەیە.
(وَوَقْتُ الظُّهْرِ إذا زَالَتْ الشَّمْسُ وكان ظِلُّ الرَّجُلِ كَطُولِهِ ما لم يَحْضُرْ الْعَصْرُ).[3] پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (کاتی نیوەڕۆ کە خۆر لابدات لەناوەڕاستی ئاسمان و سێبەر هەموو کەسێك بەقەد درێژی خۆی بێت بەمەرجێ عەسر نەها تبێت).

**ج - نوێژی عەسر:** بەکۆتایی هاتنی کاتی نیوەڕۆ دەست پێ دەکات هەتا خۆر ئاوا دەبێت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (وَمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً من الْعَصْرِ قبل أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الْعَصْرَ) (هەرکەس رکاتێك لەنوێژی عەسر فریابکەوێت پێش ئاوا بوونی خۆر ئەوە گەیشتووە بە نوێژی عەسر دا). بەڵام کاتی هەڵبژاردەی نوێژی عەسر ئەوە یەکە دوای نەخات لەوکاتەی

---

١) رواه مسلم ٦١٢. واحمد ٢/ ٢١٣. وابوداود ٣٩٦. والنسائي ١/ ٢٦٠.
٢) رواه مسلم ٦١٢.
٣) رواه البخاري ٥٥٦ و مسلم ٦٠٨.

سێبەری هەموو شتێ دوو ئەوەندەی خۆی لێ دێ، جگە لە سێبەری لادان وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (وَإِنَّ آخِرَ وَقْتِهَا حِينَ تَصْفَرُّ الشَّمْسُ).[١] (کاتی عەسر تا پێش لەخۆر زەرد هەڵگەڕانە).

**د- نوێژی ئێوارە:** کاتەکەی بەئاوا بوونی خۆر دەست پێ دەکات هەتا سوورایی کاناری ئاسمان نامێنێ (وَوَقْتُ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ ما لم يَغِبْ الشَّفَقُ).[٢] پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (کاتی نوێژی ئێوارە تا پێش ئاوا بوونی سوورایی کەناری ئاسمان دەمێنێ).

**هـ - نوێژی عیشا:** کاتەکەی بەکۆتایی هاتنی کاتی ئێوارە دەست پێ دەکات تا هەڵهاتنی بەیانی ڕاستگۆ بەڵام کاتی هەڵبژاردە ئەوەیە لە سێ یەکی یەکەمی شەو دوا نەخرێت. (قَالَ رَسُولَ اللَّهِ: « أَمَا إِنَّهُ لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ إِنَّمَا التَّفْرِيطُ عَلَى مَنْ لَمْ يُصَلِّ الصَّلاَةَ حَتَّى يَجِيءَ وَقْتُ الصَّلاَةِ الأُخْرَى)[٣] پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (دەسا دڵنیابن لە خەوتندا درێغی و گوێ پێ نەدان نیە، بەڵکو درێغی کردن لەوەدایە کەسێك نوێژەکەی نەکات هەتا کاتی نوێژێکی تر دێت). ئەم فەرموودە ئەوە دەگەیەنێت کە کاتی هیچ نوێژێك کۆتایی نایەت تا کاتی نوێژەکەی دوا خۆی نەیەت، بەڵام نوێژ بەیانیان لەم یاسایە بەدەرە، چونکە پێش هاتنی کاتی نیوەڕۆ کاتی نوێژی بەیانی کۆتایی دێت بەهەڵهاتنی خۆر.

**شەشەم: سوننەتە نوێژی نیوەڕۆ لەسەرەتای کاتەکەدا بکرێت گەرزۆر گەرما نەبوو:**

(عن جَابِرِ بن سَمُرَةَ قال كان النبي ﷺ يصلى الظُّهْرَ إذا دَحَضَتْ الشَّمْسُ).[٤] (پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ نوێژی نیوەڕۆی دەکرد خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لایبدایە).

---

١) رواه مسلم ٦١٢.

٢) رواه مسلم ٦١٢.

٣) رواه مسلم ٦١٨.

٤) رواه مسلم ٦١٨. واحمد ٥/ ١٠٦. وابوداود ٨٠٦. وابن ماجه ٦٧٤.

**حەوتەم : سوننەتە نوێژی نیوەڕۆ دوا بخرێت لەکاتی زۆر گەرمادا:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال: قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا عن الصَّلَاةِ فإن شِدَّةَ الْحَرِّ من فَيْحِ جَهَنَّمَ).[١] ئەبو هورەیرە (ڕەزای وای لیّ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (ئەگەر زۆر گەرما بوو با فێنك بكات جا نوێژ بكەن چونكە گەرمای بەتین لە هالاّوی دۆزەخە).

**هەشتەم: سوننەتە نوێژی عەسر لەسەرەتایی كاتە كەیەوە بكرێت:**

(قال أَنَسُ بن مَالِكٍ كان رسول اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ حَيَّةٌ فَيَذْهَبُ الذَّاهِبُ إلى الْعَوَالِي فَيَأْتِيهِمْ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ).[٢] ئەنەس (ڕەزای خوای لیّ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی عەسری دەكرد خۆر بەرز و بەتین بوو. ڕێبوارێك دەڕۆشت بۆ لادێكانی دەوری مەدینە و دەگەشتە ئەویّ هێشتا خۆر بەرز بوو).

**نۆیەم: تاوانی ئەو كەسە نوێژی عەسر دوا دەخات بۆ كاتی ئاوا بوونی خۆر:**

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ قال سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول: تِلْكَ صَلَاةُ الْمُنَافِقِ يَجْلِسُ يَرْقُبُ الشَّمْسَ حتى إذا كانت بين قَرْنَيْ الشَّيْطَانِ قام فَنَقَرَهَا أَرْبَعًا لَا يَذْكُرُ اللَّهَ فيها إلا قَلِيلًا).[٣] ئەنەس (ڕەزای خوای لیّ بێت) دەڵێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست فەرمووی: (ئەو نوێژی دوو ڕووە دادەنیشیّ چاوەڕیّ ی خۆر دەكات، هەتا دەگاتە نێوان دوو شاخەكەی شەیتان ئەو هەڵدەسیّ چوار دەنووك دەدات بەزەویدا لە نوێژەكەیدا كەمێك نەبێت یادی خوا ناكات).

**دەیەم: تاوانی ئەو كەسەی نوێژی عەسری بڕوات:**

(عن بن عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال الذي تَفُوتُهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ).[٤] عەبدوڵلای كوڕی عومەر (ڕەزای خوای لیّ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەوەی نوێژی عەسری دەچێت، ئەوە وەك ئەوەوایە ماڵ و خێزانی تالاّن كرا بیّ - یا ماڵ و خێزانی كەمی كردبێت -).

---

١) رواه البخاري ٥٣٣، ٥٣٤. ومسلم ٦١٥.

٢) رواه البخاري ٥٥٠. ومسلم ٦٢١.

٣) رواه مسلم ٦٢٢. واحمد ٣/ ١٤٩.

٤) رواه البخاري ٥٥٢. ومسلم ٦٢٦.

(فإن النبي ﷺ قال من تَرَكَ صَلَاةَ الْعَصْرِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ).[١] پێغەمبەرم(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر كەسێ نوێژی عەسر نەكات ئەوە بێگومان كردەوەی هەڵوەشاوەتەوە).

**یازدەهەم: سوننەتە نوێژی ئێوارە زوو بكرێت و ناپەسەندە دوا بخرێت:**

(عن سَلَمَةَ بن الأكْوَعِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كان يُصَلِّي الْمَغْرِبَ إذا غَرَبَتْ الشَّمْسُ وَتَوَارَتْ بِالْحِجَابِ).[٢] سەلەمەی كوڕی ئەكوەع (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) كاتێ نوێژی ئێوارەی دەكرد كەخۆر ئاوا ببوایەو لەچاوو وون ببوایە).

(و قال عُقْبَةُ بن عَامِرٍ أن رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال لَا تَزَالُ أُمَّتِي بِخَيْرٍ أو قال على الْفِطْرَةِ ما لم يُؤَخِّرُوا الْمَغْرِبَ إلى أَنْ تَشْتَبِكَ النُّجُومُ).[٣] **عوقبەی كوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێت)دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ)** دەفەرموێ: (بەردەوام ئوممەتم لەخێردایە یا لەسەر سروشتی پاك و ڕاستە ئەوەندە نوێژی ئێوارە دوا نەخەن هەتا لەگەڵ هەڵهاتنی ئەستێرەكاندا تێكەڵ بن).

**دوازدەهەم: سوننەتە نوێژی عیشا دوا بخرێت ئەگەر ناڕەحەت بوو:**

(عن عَائِشَةَ قالت أَعْتَمَ النبي ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ حتى ذَهَبَ عَامَّةُ اللَّيْلِ وَحَتَّى نَامَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى فقال إنه لَوَقْتُهَا لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ على أُمَّتِي).[٤] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: شەوێكیان پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی عیشای دواخست هەتا زۆربەی شەو ڕۆشت و خەڵكی ناو مزگەوت خەوتن ئینجا هات و نوێژی كردو فەرمووی: (بێگومان ئەگەر گران نەبوایە لەسەر ئوممەتم ئەمە كاتەكەیەتی).

(قال أَنَسٍ أَخَّرَ النبي ﷺ صَلَاةَ الْعِشَاءِ إلى نِصْفِ اللَّيْلِ ثُمَّ صلى ثُمَّ قال قد صلى الناس وَنَامُوا أَمَا إِنَّكُمْ في صَلَاةٍ ما انْتَظَرْتُمُوهَا).[٥] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی عیشای دواخست بۆ نیوەی شەو پاشان نوێژی كرد ئەنجا فەرمووی: (بێگومان خەڵكانێك نوێژیان كردو خەوتن، بەڵام ئێوە لەنوێژدان هەتا چاوەڕوانی بكەن).

---

١) رواه البخاري ٥٥٣. ومسلم ٢٣٦.

٢) رواه البخاري ٥٦١. واحمد ٤/ ٥١.

٣) رواه احمد ٤/ ١٤٧. وابوداود ٤١٨. حديث حسن.

٤) رواه مسلم ٦٣٨. والنسائي ١م ٢٦٧.

٥) رواه البخاري ٥٧٢. ومسلم ٦٤٠.

**سیازدەهەم: ناپەسەندە خەوتن پێش عیشا و قسە کردن دوای عیشا مەگەر بەرژەوەندی تێدابێت:**

(قال أبو بَرْزَةَ الأسْلَمِيِّ كان رسول اللَّهِ ﷺ يَسْتَحِبُّ أَنْ يُؤَخِّرَ الْعِشَاءَ التِي تَدْعُونَهَا الْعَتَمَةَ وكان يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَهَا وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا).[١] ئەبو بەرزەی ئەسلەمی (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: پیٚغەمبەر (ﷺ) دواخستنی نوێژی ئیٚواران کە ئیٚوە پیٚ دەڵیٚن عەتەمە لا پەسەند بوو، حەزی نەدەکرد پیٚش کردنی نوێژی عیشا بخەویٚت، و حەزی نەدەکرد دوای نوێژ دانیشیٚ بۆ قسە کردن).

**چواردەهەم: سوننەتە نوێژی بەیانی بەتاریکی بکرێت:**

عن عائشة(رضي الله عنها) قالت : (إن كان رسول الله ﷺ لَيُصلي الصبح ، فينصرف النساء متلفعات بمروطهن ما يُعرفنَ من الفلس )[٢]

عائیشە (ڕەزا خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی بەیانی دەکرد، ئافرەتانی ئیمانداریش لەگەڵیدا ئامادەی نوێژ دەبوون بە پشتەماڵەکانیان خۆیان دەپیٚچایەوە پاشان - کەنوێژ دەکرا- دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوەیان لەبەر تاریکی کەس نەیدەناسین).

**پازدەهەم: نوێژ لەسەر کێ فەرزە:**

نوێژ لەسەر هەموو موسوڵمانیٚکی پیاو یا ئافرەتی باڵغی عاقڵی پاك پیٚویستە، کەواتە لەسەر کافر و منداڵ و شیٚت و ئافرەتی بیٚ نوێژ پیٚویست نیە.

**شازدەهەم: حوکمی نوێژ نەکەر:** ئەوەی نوێژ ناکات یا لە لەبەر تەمەڵی و تەوەزەلی یە، یا لەبەر ئەوەیە باوەڕی پیٚ ی نیە و گاڵتەی پیٚ ی دیٚ. جا هەر کەسیٚ باوەڕی پیٚ ی نەبیٚت و ئینکاری بکات ئەو کافرە و لەبازنەی ئیسلام دەرچووە بەیەك دەنگی زانایان.

بەڵام ئەگەر بەتەمەڵی بوو باوەڕیشی پیٚی هەبوو ئەو کار بەدەستی موسوڵمانان فەرمانی پیٚ دەکات نوێژەکەی بگیٚڕیٚتەوە و پەشیمان ببیٚتەوە لەنوێژنەکردن، جا ئەگەر هەر نەیکرد دوای

---

١) رواه البخاري ٥٤٧، ٥٩٩. ومسلم ٦٤٧.

٢) رواه البخاري ٥٦٧، ٥٧٨. ومسلم ٦٤٥.

ئەوە، ئەوە لەجیانی نوێژەکە دەکوژرێت بەڵام دوا کوشتنەکەی بەموسوڵمان دادەنرێت وە بۆ کفن و ناشتن و میراتەکەی وەك موسوڵمان هەڵس وکەوتی لەگەڵدا دەکرێت، چونکە موسوڵمانە.

(عن بن عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ الناس حتى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله وَأَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللَّهِ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ فإذا فَعَلُوا ذلك عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إلا بِحَقِّ الْإِسْلَامِ وَحِسَابُهُمْ على اللَّهِ).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (فەرمانم پێ کراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا تا شایەتی بدەت هیچ پەرستراێکی ڕاست نیە جگە لەخوا وەبێگومان موحەممەدیش نێردراوی خوایە وە نوێژ بکەن و زەکات بدەن جا ئەگەر ئەوەیان کرد خوێن وماڵیان لەلایەن منەوە پارێزراوە - مەگەر بەهەقی ئیسلام- لێپرسینەوەشیان لای خوایە). ئەم فەرموودە دەیگەنێ ئەوەی شایەتوومان بێنێ و نوێژ نەکات جەنگی لەگەڵدا دەکرێ بەڵام کافر نابێ بەبەڵگەی ئەم فەرموودەی کە

(قال عُبَادَةَ بن الصَّامِتِ قال سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول: خَمْسُ صَلَوَاتٍ كَتَبَهُنَّ الله على الْعِبَادِ فَمَنْ جاء بِهِنَّ لم يُضَيِّعْ مِنْهُنَّ شيئا اسْتِخْفَافًا بِحَقِّهِنَّ كان له عِنْدَ اللَّهِ عَهْدٌ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ وَمَنْ لم يَأْتِ بِهِنَّ فَلَيْسَ له عِنْدَ اللَّهِ عَهْدٌ إن شَاءَ عَذَّبَهُ وَإِنْ شَاءَ أَدْخَلَهُ الْجَنَّةَ).[2] عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خوای لێ بێت) دەیگێڕێتەوە و دەڵێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست فەرمووی: (خوا پێنج نوێژی لەسەر بەندەکان فەرز کردووە جا ئەوەی بیانکات و هیچیان لێ نەفەوتێنێ لەبەر بەسووك زانینیان. ئەوە لەلایەن خواوە بەڵێنی پێدراوە کەبیخاتە بەهەشتەوە. ئەو کەسەش بەجێیان نەهێنێ ئەو هیچ بەڵێنێکی لەلایەن خواوە پێ نەدراوە ئەگەر خوا ویستی سزای دەدات وە ئەگەر ویستی دەیخاتە بەهەشتەوە). ئەم فەرموودەیان دەیگەیەنێ کە نوێژ نەکەر کافر نابێت ئەگەر باوەڕی پێ ی هەبێ ئەوەتە لە کۆتاییەکەیدا دەفەرموێ: (ئەگەر ویستی دەیخاتە بەهەشتەوە) بێگومان کافر هەرگیز ناچێتە بەهەشتەوە کەواتە ئەو کەسە لەبەر تەمەڵی نوێژی نەکات ئەمە حوکمەکەیەتی بەڵام ئەگەر باوەڕی پێ ی نەبێت کافر دەبێت (قال جَابِر يقول

١) رواه البخاري ٢٥، ومسلم ٢٢.

٢) رواه ابوداود ١٤٢٠. حديث صحيح.

سمعت النبي ﷺ يقول إِنَّ بين الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلَاةِ).[١] ئەم فەرموودەی جابر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان لەنێوان مرۆڤ و لە نێوان بت پەرستی و بێ باوەڕیدا نوێژ نەکردنە).

**حەڤدەهەم: حوکمی نوێژ کردنی منداڵ:**

(قال رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رُفِعَ الْقَلَمُ عن ثَلَاثَةٍ عن الصَّبِيِّ حتى يَبْلُغَ وَعَنْ النَّائِمِ حتى يَسْتَيْقِظَ وَعَنْ الْمَجْنُونِ حتى يَعْقِلَ).[٢] پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (پێنووسی تاوان هەڵگیراوە لەسەر سێ کەس: لەسەر خەوتوو تا لە خەو هەڵدەسێت وە لەسەر منداڵ تا باڵغ دەبێت وە لەسەر شێت تا چاك دەبێتەوە).

**هەژدەهەم: منداڵ بۆ ڕاهێنانی فەرمانی پێ بکرێت بەنوێژ کردن:**

(عن عَمْرِو بن شُعَيْبٍ عن أبيه عن جَدِّهِ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ مُرُوا أَوْلَادَكُمْ بِالصَّلَاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ وَاضْرِبُوهُمْ عليها وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ في الْمَضَاجِعِ).[٣] عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (منداڵەکانتان لە حەوت ساڵی دافەرمانیان پێ بکەن بەنوێژ کردن وە لە دە ساڵیدا لەسەر نوێژنەکردن لێیان دەن وە جێگای خەوتنیان –کوڕ و کچ- لێك جیابکەنەوە).

**نۆزدەهەم: کەسێ خەوی لێ کەوت یا لەبیری چوو نوێژی نەکرد.**

ئەوەکەی لەخەو هەستا یا کەی بیری کەوتەوە ئەوە کاتی نوێژەکەیەتی بەحازر بیکات.

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ قال قال نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ من نَسِيَ صَلَاةً أو نَامَ عنها فَكَفَّارَتُهَا أَنْ يُصَلِّيَهَا إذا ذَكَرَهَا).[٤]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کەسێ نوێژێکی لەبیر چوو یان خەوی لێکەوت و نوێژی نەکرد ئەو کەفارەتەکەی ئەوەیە کەی بیرکەوتەوە بیکات). کەواتە ئەگەر

---

١) رواه مسلم ٨٢.

٢) رواه ابوداود ٤٩٥. حديث صحيح.

٣) رواه ابوداود ٤٩٥ . والحاكم ١/ ١٩٧. واحمد ٢/ ١٨٧. حديث صحيح.

٤) رواه البخاري ٥٩٧. ومسلم ٦٨٤.

کەسێك بیانووی هەبوو نوێژێکی نەکرد دروستە نوێژەکەی بکاتەوە. بەڵام ئەگەر بەدەست ئەنقەست نوێژی نەکرد وفەوتاندی ئایا دەتوانێ بیگێڕێتەوە ئەو سەرنجی بڕگەی داهاتوو بدە:

**بیستەم: ئەگەر کەسێک بەئەنقەست نوێژی نەکرد تا کاتەکەی بەسەرچوو:**

جەماوەری زانایان ڕایان وایە دەبێت نوێژەکەی بگێڕێتەوە و گوناهباریش بووە بەنەکردنەکەی بەڵام هەندێك لەزانایان لەوانە داودی زاهری و ئیبن حەزم و ئیبن تەیمییە و موحەممەدی کوڕی عەلی شەوکانی دەڵێن: هەر کەس نوێژ نەکات تاکاتەکەی تێدەپەڕێ و نامێنێ ئەوە ناتواتێ بێگێڕێتەوە، با نوێژی سوننەت و کردەوەی چاك بکات تا کێشی چالەکانی قورس بێت لەڕۆژی دوایی دا وە تەوبە بکات و پەشیمان ببێتەوە.

هەردوو کۆمەڵ لەزانایان بەڵگە دێننەوە بۆ ڕاکانیان و پشتیوانی لە بۆ چوونەکانیان.[1]

**بیست و یەکەم: ئەگەر کافر موسوڵمان بوو نوێژی ڕابوردوو ناگێڕێتەوە:**

(عن عبد اللَّهِ بن مسعود ﷺ قال:( قال أُنَاسٌ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ يا رَسُولَ اللَّهِ أَنُؤَاخَذُ بِمَا عَمِلْنَا في الْجَاهِلِيَّةِ قال أَمَّا من أَحْسَنَ مِنْكُمْ في الْإِسْلَامِ فلا يُؤَاخَذُ بها وَمَنْ أَسَاءَ أُخِذَ بِعَمَلِهِ في الْجَاهِلِيَّةِ وَالْإِسْلَامِ).[2] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: کەسانێ بە پێغەمبەریان (ﷺ) ووت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا تۆڵەمان لێ ئەسەنرێ لەبەرانبەر ئەو خراپانەی لەکاتی نەفامیدا - پێش موسوڵمان بوون مان- کردوومانە؟ فەرمووی: (ئەو کەسەتان لەئیسلامدا چاکەی کردبێت ئەوە تۆڵەی لێ ناسەنرێ بەو هۆیەوە، بەڵام ئەوەی خراپەی کردبێت ئەوە تۆڵەی کردەوە -خراپەکانی- لەکاتی نەفامی و ئیسلامدا لێ دەسەنرێ).

(و قال عَمْرَو بن الْعَاصِ أن رسول الله ﷺ قال: أما علمت أَنَّ الْإِسْلَامَ يَهْدِمُ ما كان قَبْلَهُ وَأَنَّ الْهِجْرَةَ تَهْدِمُ ما كان قَبْلِهَا وَأَنَّ الْحَجَّ يَهْدِمُ ما كان قَبْلَهُ).[3] عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەی نەتزانیوە ئیسلام هەرچی لەپێش

---

١) سەیری ئەم کتێبانە بکە بۆ زیاتر زانیاری لەو بارەیەوە: المجموع ٣/ ٧١. والانصاف ١/ ٣٤٢. ونيل الأوطار ٢٠/ ٣٢. والمحلى ٢/ ٢٣٧. ومجموع الفتاوى ٢٢/ ٤٠. وبداية المجتهد ونهاية المقتصد ١/ ٣٤٠. والروض النضير ٢/ ٢٦٤ ـ ٢٦٨.

٢) رواه مسلم ١٢٠.

٣) رواه مسلم ١٢١.

ئیسلامدا بووه نایهێڵێ؟ وه کۆچکردنی ئەوەی لەپێشەوە بووبێ لایدەبات.؟ وه حەج کردن ئەوەی پێش حەج کرابێت نایهێڵێ و لایدەبات).

**بیست و دووەم: سێ کات نوێژ کردنی تێدا قەدەغەکراوە :**

یەکەم : دوای نوێژی بەیانی تا خۆر بەرزدەبێتەوە.

دووەم: کاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندایە تا لادەدات بەلای خۆرئاوادا.

سێ یەم: لە دوای نوێژی عەسر تا خۆرئاوا دەبێت.

١ـ (قال عُقْبَةَ بن عَامِرٍ ثَلَاثُ سَاعَاتٍ كان رسول اللَّهِ ﷺ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ أو أَنْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا حِين تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حتى تَرْتَفِعَ وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حتى تَمِيلَ الشَّمْسُ وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ حتى تَغْرُبَ).[1] عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (لە سێ کاتدا پێغەمبەری خوا ڕێگری لێ دەکردین کە نوێژیان تێدا بکەین یا مردوومانی تێدا بنێژین: کاتێ خۆر هەڵدێ تا بەرز دەبێتەوە وە کاتێ خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندایە تا لادەدات وە کاتێ خۆر نزیکە ئاوا ببێ تا ئاوا دەبێت).

٢ـ (عن عُمَرُ بْنُ الْخَطَّاب رضي الله عنهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ).[2] عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوای نوێژی بەیانی ڕێگری کرد لە نوێژ تا خۆر هەڵدێت وە لە دوای نوێژی عەسریشەوە تا خۆر ئاوا دەبێت).

٣ـ (عن أَبی سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ رضي الله عنه يقول: سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول: لَا صَلَاةَ بَعْدَ الصُّبْحِ حتى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ ولا صَلَاةَ بَعْدَ الْعَصْرِ حتى تَغِيبَ الشَّمْسُ).[3] ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (پاش نوێژی بەیانی نوێژ نیە وە ناکرێ هەتا خۆر بەرز دەبێتەوە وە پاش نوێژی عەسریش نوێژ نیە و ناکرێ هەتا ئاوا دەبێت)

---

١) رواه مسلم ٢٩٣. وابوداود ٣١٧٦.

٢) رواه البخاري ٥٨١. ومسلم ٨٢٦.

٣) رواه البخاري ٥٨٦. ومسلم ٨٢٧.

ئەو ڕێگری و قەدەغە كردنە لەو فەرموودانەدا هاتووە بۆ نوێژێكە هۆكارێك نەبێ بۆ كردنی بەڵكو هەروەك نوێژێكی سوننەت بكرێت ئەو نابێت بەڵام ئەگەر هۆكارێك ببێت بۆ كردنی نوێژەكە ئەوە دروستە وەك لەم فەرموودانەدا ڕوون دەبێتەوە :

١ـ (عن أَنَسٍ عن النبي ﷺ قال من نَسِيَ صَلَاةً فَلْيُصَلِّ إذا ذَكَرَهَا لَا كَفَّارَةَ لها إلا ذلك).[١] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەركەس نوێژێكی لەبیرچوو كەی بیری هاتەوە بیكات هیچێك تاوانی نوێژ نەكراوەكە لانابات كردنی نوێژێكی وەك خۆی نەبێت).

ئەم فەرموودە وا دەگەیەنێ هەركات نوێژە لەبیرچووەكەی بیركەوتەوە بیكات با لەو سێ كاتەشدا بێت.

٢ـ (عن أُمُّ سَلَمَةَ رضي الله عنها أنه ﷺ صلى ركعتين بعد الْعَصْرَ، فسألته عن ذلك، فقال: يا بِنْتَ أبي أُمَيَّةَ سَأَلْتِ عن الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ إنه أَتَانِي نَاسٌ من عبد الْقَيْسِ فَشَغَلُونِي عن الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ فَهُمَا هَاتَانِ).[٢] ئوموسەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پاش نوێژی عەسر دوو ڕكات نوێژی كرد منیش پرسیاری ئەو نوێژەم لێ كرد فەرمووی: (ئەی كچی ئەبی ئومەیە پرسیاری ئەو دوو ڕكاتە نوێژەی پاش نوێژی عەسرت كرد ، ئەوە چەند كەسێكی هۆزی عەبدولقەیس هاتن بۆ لام سەرقاڵیان كردم لە كردنی دوو ڕكاتە سونەتەكەی پاش نیوەڕۆ ئەم دوو ڕكاتە ئەو دوو ڕكاتە سوننەتەیە).

**بیست و سێ هەم: كە قامەت كرا نابێ نوێژی سوننەت بكرێت:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ عن النبي ﷺ قال إذا أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ فلا صَلَاةَ إلا الْمَكْتُوبَةُ).[٣] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (كە قامەت كرا بۆ نوێژی فەرز نابێ نوێژ بكەیت جگە لە نوێژی فەرز).

---

١) رواه البخاري ٥٧٢. ومسلم ٦٨٤.

٢) رواه البخاري ١١٧٦. ومسلم ٨٣٤.

٣) رواه مسلم ٧١٠. والنسائي ٢/ ١١٦. والترمذي ٤٢١. وابن ماجه ١١٥١.

**بیست و چوارەم: ئەو شتانەی لە نوێژدا کەراهەتیان هەیە:**

ئەو شتانەی باسیان دەکەین لە نوێژدا کەراهەتیان هەیە واتە نەکردنیان چاکترە و سوننەتە بەڵام کردنیان نوێژەکە بەتاڵ ناکاتەوە :

**١ـ نوێژ کردن لە کاتی ئامادەبوونی خواردندا :**

(عن عَائِشَةَ عن النبي ﷺ قال إذا أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ وَحَضَرَ الْعَشَاءُ فابدؤوا بِالْعَشَاءِ).[1] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ و خواردنی ئێوارەش ئامادە بوو هێنرا، ئەوە خواردنەکە لە پێشدا بخۆن).

**٢ـ نوێژکردن لەگەڵ تەنگاو بوون:**

(عن عَائِشَةَ فقالت سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول لَا يُصَلَّى بِحَضْرَةِ الطَّعَامِ ولا وهو يُدَافِعُهُ الْأَخْبَثَانِ).[2] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بە ئامادە بوونی خواردن نابێ نوێژ بکرێت ، وە کاتێکیش تەنگاوە بە میز و پیسایی)

**٣ـ نوێژ کردن لە گەرماودا:**

(عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ إلا الْمَقْبَرَةَ وَالْحَمَّامَ).[3] ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (زەوی هەمووی مزگەوتە جگە لە قەبرسان و گەرماو).

**٤ـ سەیرکردنی شتێك کە مرۆڤ بێئاگا بکات لە نوێژەکەی:**

(عن عَائِشَةَ قالت صلى رسول اللَّهِ ﷺ في خَمِيصَةٍ ذَاتِ عَلَمٍ فلما قَضَى صَلاَتَهُ قال اذْهَبُوا بِهَذِهِ الْخَمِيصَةِ إلى أبي جَهْمٍ وائتوني بِأَنْبِجَانِيَّتِهِ فَإِنَّهَا ألهتني آنفاً عن صلاتي).[4] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ)هەستا دەستی کرد بە نوێژ بە بەرگێکی چوار گۆشەوە کە خەتخەت بوو سەیری خەتەکانی دەکرد کاتێ لە نوێژەکەی بوویەوە فەرمووی: (ئەم بەرگە ببەن بۆ

---

١) رواه البخاري ٥٤٦٥. ومسلم ٥٥٧.

٢) رواه مسلم ٥٦٠.

٣) رواه ابوداود ٤٩٢. والترمذي ٣١٧. وابن ماجه ٧٤٥. واحمد ٣/ ٨٣، ٩٦. حديث صحيح.

٤) رواه البخاري ٣٧٣. ومسلم ٥٥٦.

ئەبێ جەهم پۆشاکە سادەکەمی ئەبێ جەهمم بۆ بێنن چونکە ئەم بەرگە بێ ئاگای کردم لە نوێژەکەم).

(عن أَنَسٍ رضي الله عنه قال كان قِرَامٌ لِعَائِشَةَ سَتَرَتْ بِهِ جَانِبَ بَيْتِهَا فقال لها النبي ﷺ أَمِيطِي عَنِّي فإنه لَا تَزَالُ تَصَاوِيرُهُ تَعْرِضُ لِي فِي صَلَاتِي).[1] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ :عائیشە پەردەیەکی تەنکی هەبوو بە لا دیوارێکی ژوورەکەیدا هەڵیواسیبوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێی: (ئەو پەردە لابە لەبەرچاوم چونکە وێنەکانی ئەو پەردە بەردەوام دێنە پێش چاووم لە نوێژکردنم دا).

**٥ـ نوێژکردن لە مۆڵگای ووشتردا واتە ئەو جێگایەی ووشتر تێدا پشوو ئەدات .**

(عن الْبَرَاءِ بن عَازِبٍ قال سُئِلَ رسول اللَّهِ ﷺ عن الصَّلَاةِ في مَبَارِكِ الْإِبِلِ فقال لَا تُصَلُّوا في مَبَارِكِ الْإِبِلِ فَإِنَّهَا من الشَّيَاطِينِ وَسُئِلَ عن الصَّلَاةِ في مَرَابِضِ الْغَنَمِ فقال صَلُّوا فيها فَإِنَّهَا بَرَكَةٌ).[2] بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) کرا دەربارەی نوێژ کردن لە مۆڵگەی ووشتردا فەرمووی: (لە مۆڵگای ووشتردا نوێژ مەکەن چونکە ئەوانە لە شەیتانەکانن) پرسیاریشی لێ کرا دەربارەی نوێژکردن لە پەچەی مەڕ و بزن دا فەرمووی: (نوێژی تێدا بکەن چونکە ئەوە بەرەکەتە).

**٦ـ دەست خستنە سەر کەلەکە لە نوێژدا :**

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال نهي رسول الله ﷺ أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِرًا).[3] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردووە لەوەی نوێژ کەر دەستی لەسەر کەلەکەی دابنێ)

١) رواه البخاري ٣٧٤.

٢) رواه ابوداود ١٨٤، ٤٩٣. واحمد ٢٨٥٦٣. حديث صحيح.

٣) رواه مسلم ٥٤٥.

**٧ـ پاڵتۆکردنە سەرشان و دەم هەڵبەستن :**

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ السَّدْلِ فِي الصَّلَاةِ و أن يغگى الرجل فاه).[١] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کرد لە (سدل) کردن لە نوێژدا و کەسێك دەمی هەڵبەستێ)

سدل بە دوو مانا دێت: ١-جل و بەرگ بەردانەوە تادەگاتە زەوی ٢- پاڵتۆ و کەوا بدرێت بەسەر شانیدا و دەست نەکرێت بە قۆڵەکانیدا.[٢]

**٨ـ نوێژکردن لە کاتی خەو هاتنی زۆردا :**

(قال عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال إذا نَعَسَ أحدكم وهو يُصَلِّي فَلْيَرْقُدْ حتى يَذْهَبَ عنه النَّوْمُ فإن أَحَدَكُمْ إذا صلى وهو نَاعِسٌ لَا يَدْرِي لَعَلَّهُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبُّ نَفْسَهُ).[٣] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان خەو گرتی با ڕاکشێ هەتا خەوەکەی ئەڕەوێ، چونکە ئەگەر خەوی هات و نوێژی کرد لەوانەیە بڕوات لە باتی ئەوەی داوای لێ بوردن بکات جنێو بە خۆی بدات).

(عن أَنَسٍ ﷺ عن النبي ﷺ قال إذا نَعَسَ أحدكم في الصَّلَاةِ فَلْيَنَمْ حتى يَعْلَمَ ما يَقْرَأُ).[٤]وە ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان لە نوێژدا خەوی دەهات با بخەوێ هەتا بزانێ چی دەخوێنێ).

---

١) رواه ابوداود ٦٢٩. والترمذي ٣٧٦.

٢) بڕوانە: (النهاية في غريب الحديث والاثر لإبن الجزري ٢/ ٣٥٥).

٣) رواه البخاري ٢١٢. ومسلم ٧٨.

٤) رواه البخاري ٢١٣.

# بـانـگدان

**یەکەم: بانگ دان:** ئاگادارکردن بە هاتنی کاتی نوێژی فەرز بە هۆی چەند ووشە و ڕستەیەکی تایبەتەوە

بانگدان پاداشتی گەورەی هەیە (عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال لو يَعْلَمُ الناس ما في النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأوَّلِ ثُمَّ لم يَجِدُوا إلا أَنْ يَسْتَهِمُوا عليه لَاسْتَهَمُوا).[1] ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە لە بانگدان و ڕیزی یەکەمی نوێژدا چەند پاداشتی گەورە هەیە پاشان ڕێگەیەکیان دەست نەکەوتایە جگە لەوەی تیرو پشکیان لەسەر بکەن ئەوە تیرو پشکیان لێ دەکردن ئەنجا بۆ کێ دەربچوایە ئەوە بانگی دەدا یا لە ڕیزی یەکەمدا دەوەستا).

بانگدان فەرزی کیفایەیە لەسەر پیاوان بۆ هەر پێنج نوێژەکە، لە دروشمە دیارەکانی ئیسلامە، خەڵکی هەر شارێك بانگ نەدەن جەنگیان لەگەڵدا دەکرێ لە سەری، پێغەمبەری (ﷺ) پرس و ڕای بە موسوڵمانان کرد ڕێگایەك بدۆزنەوە کاتی نوێژی پێ بزانن تا بێن بۆ نوێژ بۆ مزگەوت ئەنجا عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی ئەنصاری خەوێکی بینی لە خەوەکەیدا شێوەی بانگیان فێر کردبوو خەوەکەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ( إِنَّهَا لَرُؤْيَا حَقٌّ فَقُمْ مع بِلَالٍ فَأَلْقِ عليه ما رَأَيْتَ فَلْيُؤَذِّنْ بِهِ فإنه أَنْدَى صَوْتًا مِنْكَ).[2] (بێگومان ئەوە خەوێکی ڕاستە بیڵێ بە بیلال با ئەو بیڵێ چونکە ئەو دەنگی لە تۆ بەرز ترو خۆشترە).

**دووەم: حوکمی بانگدان**

قسەی ڕاست و دروست ئەوەیە کە بانگدان فەرزی کیفایەیە ، بۆ دانیشتوانی هیچ شار و دێیەك نیە بانگ و قامەت واز لێ بێنن و نەیکەن (عن أبي قِلَابَةَ عن مَالِكِ بن الْحُوَيْرِثِ أَتَيْتُ النبي ﷺ في نَفَرٍ من قَوْمِي فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ لَيْلَةً وكان رَحِيمًا رَفِيقًا فلما رَأَى شَوْقَنَا إلى أَهَالِينَا قال

---

١) رواه البخاري ٦١٥. ومسلم ٤٣٧.

٢) رواه ابوداود ٤٩٨، ٤٩٩. والترمذي ١٨٩. وابن ماجة ٧٠٦. والبيهقي ١/ ٣٩٠. حديث حسن.

ارْجعُوا فَكُونُوا فِيهِمْ وَعَلِّمُوهُمْ وَصَلُّوا فإذا حَضَرَتْ الصَّلَاةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أحدكم وَلْيُؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ).[١] مالیکی کوڕی حوەیرث (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ : لەگەڵ چەند کەسێکی خێڵەکەمدا چوینە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) بیست شەو لە خزمەتیداماینەوە زۆر بەسۆز و سانا بوو کە زانی بیری ماڵ و منداڵمان ئەکەینەوە فەرمووی: (بگەڕێنەوە لەناو کەس و کارتان دا بن و شارەزایان بکەن و نوێژ بکەن، کە کاتی نوێژ هات با کەسێکتان بانگتان بۆ بدات و گەورەترینیشتان پێش نوێژیتان بۆ بکات).

(عن أَنسِ بن مَالِكٍ أَنَّ النبي ﷺ كان إذا غَزَا بِنَا قَوْمًا لم يَكُنْ يَغْزُو بِنَا حتى يُصْبِحَ وَيَنْظُرَ فَإِنْ سمع أَذَانًا كَفَّ عَنْهُمْ وَإِنْ لم يَسْمَعْ أَذَانًا أَغَارَ عليهم).[٢] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) یاسای وا بوو کە غەزای پێ بکردینایە بۆ سەر هۆزێك هەتا ڕۆژ نەبوایەتەوە هێرشی پێ نەدەکردین ، سەیری دەکرد جا ئەگەر گوێی لە بانگ بوایە وازی لێ دەهێنان بەڵام ئەگەر گوێی لە بانگ نەبوایە هێرشی دەکردە سەریان).

**سێ یەم: بەڵگەی دانانی بانگ**

أـ خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ﴾ الجمعة: ٩

واتە: کاتێ بانگدرا بۆ نوێژ لە ڕۆژی هەینی دا ئەوە بەپەلە بڕۆن بۆ یادی خوا (نوێژی هەینی) و واز لە کڕین و فرۆشتن بێنن.

ب ـ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (فإذا حَضَرَتْ الصَّلَاةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أحدكم وَلْيُؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ).[٣] (ئەگەر کاتی نوێژ هات ئەوە با کەسێکتان بانگتان بۆ بدات و ئەو کەسەتان گەورەترە پێش نوێژیتان بۆ بکات)

---

١) رواه البخاري ٦٢٨. ومسلم ٦٧٤.

٢) رواه البخاري ٦١٠.

٣) رواه البخاري ٦٢٨. ومسلم ٦٧٤.

**چوارەم: مێژووی دانانی بانگ:**

بانگ لە ساڵی یەکەمی کۆچی دا دانراوە و دەستی پێ کرد.

(أَنَّ بن عُمَرَ كان يقول كان الْمُسْلِمُونَ حين قَدِمُوا الْمَدِينَةَ يَجْتَمِعُونَ فَيَتَحَيَّنُونَ الصَّلَاةَ ليس يُنَادَى لها فَتَكَلَّمُوا يَوْمًا في ذلك فقال بَعْضُهُمْ اتَّخِذُوا نَاقُوسًا مِثْلَ نَاقُوسِ النَّصَارَى وقال بَعْضُهُمْ بَلْ بُوقًا مِثْلَ قَرْنِ الْيَهُودِ فقال عُمَرُ أَوَلَا تَبْعَثُونَ رَجُلًا يُنَادِي بِالصَّلَاةِ فقال رسول اللَّهِ ﷺ يا بِلَالُ قُمْ فَنَادِ بِالصَّلَاةِ).[1] عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: موسوڵمانان کاتێ کۆچیان کرد بۆ مەدینە کۆدەبونەوە لە کاتی نوێژدا بانگ نەدەدرا بۆ نوێژ ڕۆژێکیان لە بارەیەوە قسەیان کرد، هەندێکیان وتیان: زەنگێك دابنێین وەك زەنگی گاورەکان هەندێکی تریان ووتیان: نەخێر کەڕنایەك وەك کەڕنای جوولەکە دابنێین، عومەریش ووتی: ئەوە بۆ پیاوێ نانێرن بانگ بدات بۆ نوێژ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەی بیلال هەستە بانگ بدە بۆ نوێژ).

**پێنجەم: چۆنیەتی بانگ دان:**

بانگ لە چەند ووشەیەك پێك هاتووە کە بەم شێوەیە:

(الله اكبر الله اكبر الله اكبر الله اكبر أشهد أن لا اله إلا الله أشهد أن لا اله إلا الله، أشهد أن محمدا رسول الله أشهد أن محمدا رسول الله، حي على الصلاة حي على الصلاة، حي على الفلاح حي على الفلاح، الله اكبر الله اكبر لا اله إلا الله).

وە لە بانگی بەیانیدا: (الصلاه خير من النوم الصلاه خير من النوم) پاش (حی علی الفلاح)ی دووەم زیاد دەکرێت ئەم شێوە بانگدانە بە فەرموودەی صحیحی بوخاری و موسلیم ڕیوایەت کراوە و هەموو فەرمودەکانیش صەحیحن.

**شەشەم: سوننەتەکانی بانگ دان**

**أ ـ بانگبێژ ڕووی لە قیبلە بێت،** چونکە پیرۆزترین و گەورەترین شوێنە ئەمە لە پێشینان و پاشینانەوە هاتووە . (قال إبن المنذر: أجمع أهل العلم على أن من السنة أن تستقبل القبلة بالأذان).[2]

ئیبن مونزر دەڵێ : زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە سوننەتە ڕوو کردنە قیبلە لە بانگداندا .

---

١) رواه البخاري ٦٠٢. ومسلم ٦٧٤.

٢) بڕوانە: الأوسط، ٣/ ٢٨ م ٣٥٣.

**ب ـ بە پێوە بانگ بدات:** (قال رسول اللّهِ ﷺ يا بِلَالُ قُمْ فَنَادِ بِالصَّلَاةِ).[1] پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەی بیلال هەستە بە پێوە بانگ بدە).

**ج ـ ملی بسوڕێنێ نەك سنگی لە کاتی وتنی (حي على الصلاة) بە لای ڕاست و (حي على الفلاح) بەلای چەپدا:** (قال ابو جحيفة وَأَذَّنَ بِلَالٌ قال فَجَعَلْتُ أَتَتَبَّعُ فَاهُ هَا هُنَا وَهَا هُنَا يقول يَمِينًا وَشِمَالًا يقول حَيَّ على الصَّلَاةِ حَيَّ على الْفَلَاحِ).[2] ئەبو جوحەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ (.... بیلال بانگی دا من سەیری دەمیم دەکرد لێرە و لەوێ بە لای ڕاست و بە لای چەپدا کاتێ نەگەیشتە (حی علی الصلاه ) و (حی علی الفلاح).

**د ـ سوننەتە دوو (الله أکبر) بە یەك هەناسەدان بڵێ و ئەو کەسەش گوێی لێیە بە هەمان شێوە بیلێت:**

(عن عُمَرَ بن الْخَطَّابِ قال قال رسول اللّهِ ﷺ إذا قال الْمُؤَذِّنُ الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ فقال أحدكم الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ ثُمَّ قال أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله قال أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله ثُمَّ قال أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللّهِ قال أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللّهِ ثُمَّ قال حَيَّ على الصَّلَاةِ قال لَا حَوْلَ ولا قُوَّةَ إلا بِاللّهِ ثُمَّ قال حَيَّ على الْفَلَاحِ قال لَا حَوْلَ ولا قُوَّةَ إلا بِاللّهِ ثُمَّ قال الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ قال الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ ثُمَّ قال لَا إِلَهَ إلا الله قال لَا إِلَهَ إلا الله من قَلْبِهِ دخل الْجَنَّةَ).[3] عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێت ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کاتێ بانگبێژ وتی (الله اکبر الله اکبر ) پاشان کە ووتی (أشهد أن لا اله إلا الله) ئەویش بلێت (أشهد أن لا اله إلا الله)، پاشان بانگ بێژ بڵێت (أشهد أن محمدا رسول الله) ئەویش بلێت ( أشهد أن محمدا رسول الله)، پاشان بڵێت (حی علی الصلاه) ئەویش بلێت (لاحول ولا قوه إلا بالله) پاشان بڵێت (حی علی الفلاح) ئەویش بلێت (لا حول و لا قوه إلا بالله) پاشان بڵێت (الله اکبر الله اکبر) ئەویش بلێت (الله اکبر الله اکبر) هەریەك لە ئێوەش بڵێ (الله اکبر الله اکبر)پاشان بڵێت (لا اله إلا الله) ئەویش بڵێت (لا اله إلا الله) لە ناخی دڵیەوە دەچێتە بەهەشتەوە).

---

١) رواه البخاري ٦٠٤. ومسلم ٣٧٧.

٢) رواه البخاري ١٨٧. ومسلم ٥٠٣.

٣) رواه مسلم ٣٨٥. وابوداود ٥٢٧.

**هـ ـ شایەتومان (أشهد أن محمدا رسول الله و أشهد أن محمدا رسول الله) دوو جار بڵێت، یەکەم جار بە دەنگی نزم بڵێیت دووەم جار بە دەنگی بەرز بیڵێت.**

(عن أبي مَحْذُورَةَ ان نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ عَلَّمَهُ هذا الآذَانَ الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللَّهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللَّهِ ثُمَّ يَعُودُ فيقول أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللَّهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللَّهِ حَيَّ على الصَّلَاةِ مَرَّتَيْنِ حَيَّ على الْفَلَاحِ مَرَّتَيْنِ زَادَ إسحاق الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ لَا إِلَهَ إلا الله).[1] ئەبو مەحژورە (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەم بانگەی فێر کردم: **(الله اکبر الله اکبر، أشهد أن لا اله إلا الله أشهد أن لا اله إلا الله ، أشهد أن محمدا رسول الله أشهد أن محمدا رسول الله ،پاشان بگەڕێتەوە بڵێت (أشهد أن لا اله إلا الله) دوو جار (أشهد أن محمدا رسول الله) دوو جار (حی علی الصلاه) دوو جار (حی علی الفلاح) دووجار، (الله اکبر الله اکبر لا اله إلا الله).**

**ئەم فەرموودە لاواز بە ووتنی (الله أکبر) دووجار بەڵام بە چوار جارەکە صەحیحە.**

**و ـ وتنی (الصلاه خیر من النوم):**

**سوننەتە بانگبێژ دوو جار دوای (حی علی الفلاح)ی دووەم بڵێت (الصلاه خیر من النوم) لە بانگی یەکەمی بەیانیاندا.**

(عن ابن عمر قال كان في الأذان الأول بعد الفلاح الصلاة خير من النوم الصلاة خير من النوم).[2] **عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: (وتنی (الصلاه خیر من النوم) دووجار دوای (حی علی الفلاح)ی بانگی یەکەمی بەیانیاندا بوو لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ).**

(وفي رواية لأبو دَاوُد عن أبي مَحْذُورَةَ عن النبي ﷺ الصَّلَاةُ خَيْرٌ من النَّوْمِ الصَّلَاةُ خَيْرٌ من النَّوْمِ في الْأُولَى من الصُّبْحِ).[3] **وە لە ڕیوایەتی ئەبو داوددا کە لە ئەبو مەحزورەوە دەگێڕێتەوە کە**

---

١) رواه ابوداود ٥٠٢. وابن ماجه ٧٠٩. والنسائي ٦٣٠.

٢) رواه البيهقي في سنن الطبرى ١/ ٤٢٣. والطحاوي في شرح معاني الآثار ١/ ١٣٧ حديث حسن.

٣) رواه ابوداود، ٥٠٠. حديث صحيح.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (الصلاه خیر من النوم الصلاه خیر من النوم لە بانگی یەکەمی بەیانیدایە).

کەواتە (الصلاه خیر من النوم) لە ووشەکانی ئەو بانگە نیە کە خەڵك بانگ دەکات بۆ هاتن بۆ نوێژ کە کاتی هاتۆتە پێش، بەڵکو لەو ووشانەیە کە دانراوە بۆ خەبەرکردنەوەی خەووتوان لە بانگی یەکەمدا پێش هاتنی کاتی نوێژی بەیانی.

### ز- بانگی یەکەم پێش بانگی بەیانی

سوننەتە پێش بانگی بەیانی بانگی یەکەم بدرێت بۆ خەبەرکردنەوەی ئەو کەسانەی خەوتوون (عن عائشة و ابن عمر قالا قال رسول الله ﷺ ان بِلَالًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حتى يُؤَذِّنَ بن أُمِّ مَكْتُومٍ)[1] عائیشە و عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێن: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (بێگومان بیلال بەشەو دا بانگ دەدات پێش بانگی بەیانی بخۆن و بخۆنەوە لە پارشێودا هەتا عەبدوڵلای کوڕی ئوم مەکتوم بانگ دەدات).

وە پێغەمبەر (ﷺ) مەبەست لە بانگی یەکەمی پێش بانگی بەیانی ڕوون دەکاتەوە بە ئەم فورموودەی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود دەیگێڕێتەوە (عن عبد اللَّهِ بن مَسْعُودٍ عن النبي ﷺ قال لَا يَمْنَعَنَّ أَحَدَكُمْ أو أَحَدًا مِنْكُمْ أَذَانُ بِلَالٍ من سَحُورِهِ فإنه يُؤَذِّنُ أو يُنَادِي بِلَيْلٍ لِيَرْجِعَ قَائِمَكُمْ وَلِيُنَبِّهَ نَائِمَكُمْ وَلَيْسَ أَنْ يَقُولَ الْفَجْرُ أو الصُّبْحُ).[2] دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (با بانگدانی بیلال ڕێگری لە هیچ کەسێکتان نەکات لە پارشێو کردنەکەیدا چونکە بیلال بەشەو بانگ دەدات تا شەونوێژگەرتان بگەڕێتەوە بخەوێ وە خەوتووشتان بەخەبەر بێنێ بۆ ئەوە نی یە بڵێ بەیانە و نوێژ بووە).

### ح ـ پەنجە خستنە گوێ لە کاتی بانگ دان دا :

(عن أبي جُحَيْفَةَ قال رأيت بِلَالًا يُؤَذِّنُ وَيَدُورُ وَيُتْبِعُ فَاهُ هَا هُنَا وَهَا هُنَا وَإِصْبَعَاهُ في أُذُنَيْهِ).[3] ئەبو جوحەیفە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ (بیلام بینی بانگی دەدا.... دوو پەنجەی خستبووە هەردوو گوێیەوە)

---

١) رواه البخاري ٦٢٢. ومسلم ١٠٩٣.

٢) رواه البخاري ٦٢١. ومسلم ١٠٩٣.

٣) رواه الترمذي ١٩٧. وابن ماجة ٧١١ حديث صحيح.

**گ ـ سوننەتە ئەوەی گوێی لە بانگ و قامەتە ووتەکانی بانگ بێژ بڵێتەوە:**

(عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال إذا سَمِعْتُمْ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ ما يقول الْمُؤَذِّنُ).[1] ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کاتێك گوێتان لە بانگبێژ بوو بانگی دەدا ئەوە ئەو چی دەڵێ ئێوەش بیڵێن).

(عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من قال حين يَسْمَعُ النِّدَاءَ اللهم رَبَّ هذه الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الذي وَعَدْتَهُ حَلَّتْ له شَفَاعَتِي يوم الْقِيَامَةِ).[2] جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەسێك گوێی لە بانگ بوو بڵێ: (اللهم رب هذه دعوة التامة والصلاة القائمة آت محمداً الوسيلة و الفضيلة وابعثه مقاماً محموداً الذي وعدته) ئەوە لە ڕۆژی دوایی شەفاعەتی من دەیگرێتەوە).

---

١) رواه البخاري ٦١١. ومسلم ٣٨٣.

٢) رواه البخاري ٦١٤.

# قـامەت كردن

**قامەت كـردن هەر بانگە لەگەڵ ڕەچاوكـردنی ئەم جیاوازیانەدا :**

أ ـ بانگ ووشەكانی دوو دوون بەڵام یەك جار دەوترێت.

(عن أَنَسٍ رضي الله عنه أُمِرَ بِلَالٌ أَنْ يَشْفَعَ الآذَانَ وَيُوتِرَ الْإِقَامَةَ إلا الْإِقَامَةَ).[1] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ (بیلال فەرمانی پێكرا كە ووشەكانی بانگ دووجار بڵێت و ووشەكانی قامەت یەك جار جگە لە ووشەی (قد قامت الصلاه) دووجار دەوترێت لە قامەت دا).

**چۆنیەتی قامەت كـردن:** (الله اكبر الله اكبر أشهد أن لا اله إلا الله أشهد أن محمدا رسول الله، حي على الصلاة حي على الفلاح قد قامت الصلاة قد قامت الصلاة الله اكبر الله اكبر لا اله إلا الله).

ئەم شێوەی قامەتە لە فەرموودەی صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە.

ب ـ پەلە نەكردن و لەسەرخۆیی لە بانگدان دا، وە پەلەكردن لە قامەت كردن دا، چونكە بانگ دان بۆ ئامادەنەبوانە لەبەر ئەوە پەلە نەكردن چاكترە بۆ ئەو حاڵەتە، بەڵام قامەت كردن بۆ ئامادە بووانە لەبەر ئەوە پەلەكردن شیاوترە بۆی.

ج ـ ئەگەر كەسێك چەند نوێژێكی فەوتا بوو وویستی بیگێڕێتەوە ئەوە تەنها بۆ یەكەم نوێژیان بانگ دەدات بەڵام قامەت دەكات بۆ هەموو نوێژە فەوتاوەكان بە بەڵگەی ئەم فەرمودەیە (عن جابر بن عبدالله رضي الله عنه قال: أن رسول الله ﷺ جمع بين الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بمزدلفة بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ).[2] جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی مەغریب و عیشای كۆكردەوە لە موزدەلیفە بەیەك بانگدان و دوو قامەت).

---

١) رواه البخاري ٥٨٠. ومسلم ٣٧٨.

٢) رواه مسلم ١٢١٨.

## مەرجەکانی دروستی نوێژ

مەبەست پێیان ئەو مەرجانەیە کە پێویستە نوێژگەر بەجێیان بهێنێ وە ئەگەر یەکێکیان نەکات و وازی لێ بێنیٚ نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە مەرجەکانیش ئەمانەن:

**١ـ خاوێنی:** پاك و خاوێنی یەکێکە لە مەرجەکانی دروستی نوێژ، کە چەند بەش و جۆرە کە دەبێت هەموویان هەبن ئینجا نوێژەکە دروستە:

أـ پاك و خاوێنی لەش لە بێ دەس نوێژی و لەش گرانی: ئەگەر بێ دەستنوێژ بوو یان لەش گران نوێژەکەی دروست نی یە لەبەرئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (لَا تُقْبَلُ صَلَاةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ).[١] (نوێژ وەرناگیرێ وە دروست نیە بە بێ پاکێتی و دەست نوێژ بوون).

ب ـ پاك و خاوێنی لەش لە پیسی: پێشتر باسی پیسی و جۆرەکانی کرا (قوله ﷺ في اللذين يعذبان في قبرهما: أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لَا يَسْتَتِرُ من الْبَوْلِ).[٢] پێغەمبەر (ﷺ) لە باسی ئەو دوو کەسەی کە ڕۆشت بەلای گۆڕەکانیاندا فەرمووی (ئەم دووانە سزا دەدرێن یەکێکیان خۆی پاك نەدەکردەوە لە میز)

هەموو پیسیەکانی تر وەك میز وان (فقال رسول اللَّهِ ﷺ لفَاطِمَةُ بِنْتُ أبي حُبَيْشٍ رضي الله عنها: إنما ذَلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَ بِالْحَيْضَةِ فإذا أَقْبَلَتْ الْحَيْضَةُ فَاتْرُكِي الصَّلَاةَ فإذا ذَهَبَ قَدْرُهَا فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي).[٣] وەك پێغەمبەر (ﷺ) بە فاتیمەی کچی ئەبی حوبەیشی فەرموو: (ئەگەر خوێنی حەیزت پیا هات واز لە نوێژکردن بێنە جا کە بە ئەندازەی ڕۆژانی حەیزەکەت لە مانگەکانی ڕابردوو دا ڕۆشت (خۆت بشۆ) ئەو خوێنە پێتەوەیە بیشۆو نوێژ بکە) کەواتە خوێنیش دەبێ بشۆردرێت.

ج ـ پاکی جل و بەرگی نوێژ گەر لە پیسی: دەبێت جل و بەرگی نوێژگەر پاك بێت لە هەموو جۆرە پیسیەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ واتە : جل و بەرگەکانت پاك ڕاگرە.

---

١) رواه مسلم ٢٢٤.

٢) رواه البخاري ٢١٥. ومسلم ٢٩٢.

٣) رواه البخاري ٢٦٦. ومسلم ٣٣٣.

د- پاکی شوێنی نوێژکردنەکە لە پیسی، بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد ئاو بکەن بەو شوێنەدا لە مزگەوت کە عەرەبە دەشتەکیەکە میزی پیاکرد.[1]

**٢- زانینی کاتی نوێژ:** هەموو نوێژێك کاتی دیاری کراوی هەیە مەرجە نوێژەکە لەو کاتەدا بکرێت ئەنجا دروستە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾ النساء: ١٠٣ واتە : بێگومان نوێژ فەرز کراوێکی کات بۆ دیاری کراوە لەسەر باوەڕداران.

حوکمی ئەو کەسەی نوێژی کردبێت لە دەرەوەی کاتەکەی: ئەگەر کەسێك بۆی ڕوون بوویەوە کە ئەو نوێژەی کردوویەتی پێش کاتی نوێژەکە بووە ئەوە نوێژەکەی دروست نییە و ئەبێت بیکاتەوە.

**٣- داپۆشینی عەورەت:** مەبەست لە عەورەت هەموو ئەو شوێنانەیە لە لەشی مرۆڤ کە واجبە داپۆشینی یا حەرامە سەیرکردنی، عەورەتیش لە نوێژدا ، نێوان ناوك و ئەژنۆیە بۆ پیاو هەموو لەشی ئافرەتیشە جگە لە دەم و چاوو دەستەکانی، دەبێت ئەوەی پێ ی دەوترێت عەورەت بۆ پیاو و ئافرەت لە نوێژدا داپۆشرێت ئەگەر کەمێکیشی دانەپۆشرێت نوێژەکە دروست نی یە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ﴾ الأعراف: ٣١ واتە: پۆشاکی جوانیتان بپۆشن لە کاتی هەموو نوێژێکدا .

(عن عَائِشَةَ عن النبي ﷺ أَنَّهُ قال لَا يَقْبَلُ الله صَلَاةَ حَائِضٍ إلا بِخِمَارٍ).[2] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە نوێژی ئافرەتی باڵغ وەرناگرێ بە سەرپۆشەوە نەبێ)

**٤- ڕووکردنە قیبلە:** ئەمە مەرجی چوارەمە لە مەرجەکانی دروستی نوێژ مەبەست لە قیبلە کەعبەی پیرۆزە واتە کەعبە لە پێشیەوە بێت :

---

١) رواه البخاري ٢٢١. ومسلم ٢٨٥.

٢) رواه الترمذي ٣٧٥. وابوداود ٦٢٧. وابن ماجة ٦٥٥. حديث صحيح.

١ـ بەڵگەی واجبێتی ڕووکردنە قیبلە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە ﴿ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ﴾ البقرة: ١٥٠ واتە: (لە کاتی نوێژکردندا) ڕووت وەربگێڕە بۆ لای کەعبەی پیرۆز وە ئێوەش (ئەی موسوڵمانینە) لە هەر کوێ بوون ڕوو وەرگێڕن بۆ لای ئەو مزگەوتە .

(وجاء انه ﷺ قال للذي علمه كيف يصلي: إذا قُمْتَ إلى الصَّلَاةِ فَأَسْبِغْ الْوُضُوءَ ثُمَّ اسْتَقْبِلْ الْقِبْلَةَ فَكَبِّرْ).[1] پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بە کابرایەك کە فێری نوێژکردنی کرد (کاتێ هەستای بۆ نوێژکردن بە چاکی دەست نوێژ بگرە پاشان ڕوو لە قیبلە بکە و (الله اکبر) بکە) نوێژەکەت دەست پێ بکە

ب ـ چ کاتێ ڕوو کردنە قیبلە دانرا؟

(عن الْبَرَاءِ بن عَازِبٍ رضي الله عنهما قال كان رسول اللَّهِ ﷺ صلى نحو بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ أو سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْرًا وكان رسول اللَّهِ ﷺ يُحِبُّ أَنْ يُوَجَّهَ إلى الْكَعْبَةِ فَأَنْزَلَ الله ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِى ٱلسَّمَآءِ ﴾ البقرة: ١٤٤ فَتَوَجَّهَ نحو الْكَعْبَةِ).[2] بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) شانزە یان حەڤدە مانگ ڕوو بە بەیتولمەقدیس نوێژی کرد، بەڵام حەزی دەکرد ڕووی پێ بکرێتە کەعبە ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِى ٱلسَّمَآءِ ﴾ البقرة: ١٤٤ ئەوسا ڕووکردە کەعبە).

کەواتە مێژووی ڕووکردنە کەعبە لە سەرەتاکانی کۆچەوە بۆ مەدینە دەستی پێ کردووە.

١) رواه البخاري ٥٨٩٧. ومسلم ٣٩٧.

٢) رواه البخاري ٣٩٠. ومسلم ٥٢٥.

# پایەکانی نوێژ

نوێژ چەند پایەو ڕوکنێکی هەیە کە نوێژیان لێ پێك دێ و نەبوونی هەریەك لەو پایانە دەبێتە هۆی دروست نەبوونی نوێژەکە ئەمانەی خوارەوە ئەو ڕوکن و پایانەن:

**یەکەم: نیەت هێنان**: دەبێت لە سەرەتای دەست کردن بە نوێژەکەوە نیەت بهێنرێ، نیەتیش لە دڵدایە ووتنی بە زمان پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە (ﷺ) بەڵگەی نیەت هێنان فەرموودەکەی عومەری کوڕی خەتتابە پێویستە نیەت (إنما الأعمال بالنيات).[١] پێویستە نیەت لەگەڵ (الله اکبر)ی نوێژدا بەستن دا بێت، وە جۆر و ڕکات و کاتی نوێژەکە بێت بە دڵتدا.

**دووەم: وەستان بە پێوە بە پێی توانا لە نوێژی فەرزدا**: (عن عِمْرَانَ بن حُصَيْنٍ رضي الله عنه قال كانت بِي بَوَاسِيرُ فَسَأَلْتُ النبي ﷺ عن الصَّلَاةِ فقال صَلِّ قَائِمًا فَإِنْ لم تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا فَإِنْ لم تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ).[٢] عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خوای لێ بێ ) دەلێ: (نەخۆشی مایەسیریم هەبوو پرسیارم لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد دەربارەی نوێژ کردن فەرمووی بە پێوە نوێژ بکە جا ئەگەر نەتوانی ئەوە بە دانیشتنەوەجا ئەگەر ئەوەشتنەتوانی ئەوە بە ڕاکشانەوە(پاڵکەوتنەوە) بیکە).

بەڵام نوێژی سوننەت وەستان بە پێوە تێیدا سوننەتە دەتوانێ بە دانیشتنەوە بیکات با تواناشی هەبێت بەڵام پاداشتی کەمترە (قال النبي ﷺ من صلى قَائِمًا فَهُوَ أَفْضَلُ وَمَنْ صلى قَاعِدًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَائِمِ وَمَنْ صلى نَائِمًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَاعِدِ).[٣] پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (هەرکەس بە پێوە نوێژ بکات ئەوە چاکترە، هەرکەسیش بە دانیشتنەوە نوێژبکات ئەوە نیوەی پاداشتی نوێژکردنی بە پێوەی هەیە، کەسێکیش بە پاڵکەوتنەو نوێژ بکات ئەوە نیوەی پاداشتی نوێژکردنی بە دانیشتنەوەی هەیە).

---

١) رواه البخاري ١. ومسلم ١٩٠٧.

٢) رواه البخاري ١٠٦٦.

٣) رواه البخاري ١٠٦٥.

**سێ یەم: (الله اکبر)ی دەست بە نوێژکردن:**

(قال رسول اللَّهِ ﷺ مِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ).[١] پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (کلیلی نوێژ خۆپاککردنەوەیە بە دەست نوێژ گرتن وە (الله اکبر) ووتنی حەرامکەری جگە لە نوێژە وە سەلام دانەوەش تەواو بوونیەتی و هۆی حەڵاڵ بوونی ئەوە لێ ی قەدەغەکراوە).

**چوارەم: خوێندنی سورەتی فاتیحە:** دەبێت لە هەموو کاتێك دا سورەتی فاتیحە بخوێنرێت (عن عُبَادَةَ بن الصَّامِتِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال لَا صَلَاةَ لِمَنْ لم يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ).[٢] عوبادی کوڕی صامیت (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس سوڕەتی فاتیحە نەخوێنێ نوێژەکەی درووست نی یە).

**پێنجەم: کوڕنوش بردن و مانەوە تێیدا:** بەجۆرێك بچەمێتەوە ناو لەپەکانی بگاتە ئەژنۆکانی و پشتی ڕێك بکات خوای گەورە دەفەرموێ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ﴾ الحج:٧٧ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کڕنووش و سووژدە ببەن .پێغەمبەریش (ﷺ) خۆی بە کردار کڕنوشی بردووە لە نوێژەکانیدا لە چەندین فەرموودەی صەحیحدا هاتووە (وقول رسول الله ﷺ لمن علمه الصلاة: ثم اركع حتى تطمئن راكعا).[٣] پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ پیاوێکی فێری نوێژ دەکرد فەرمووی: (پاشان کڕنووش ببە و بوەستە تا ئارام دەبیتەوە جوڵەت نامێنێ).

**شەشەم: هەڵسانەوە لە کڕنووش مانەوە تێیدا:** ئەنجا لە کڕنووش ڕاست دەبیتەوە و جوڵەت نامێنێ

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها انها وصفت صلاة النبي ﷺ فقالت: فكان إذا رَفَعَ رَأْسَهُ من الرُّكُوعِ لم يَسْجُدْ حتى يَسْتَوِيَ قَائِمًا).[٤] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) باسی نوێژ کردنی پێغەمبەر

---

١) رواه ابوداود ٦١. والترمذي ٣ حديث صحيح.

٢) رواه البخاري ٧٥٦. ومسلم ٣٩٤.

٣) رواه البخاري ٧٢٤. ومسلم ٣٩٧.

٤) رواه مسلم ٤٩٨.

(ﷺ) دەکات و دەڵێ: (کە سەری بەرز دەکردەوە لە کڕنووش نەدەڕۆشت بۆ سوژدە هەتا تەواو ڕاست نەبوایەتەوە) (وقال ﷺ لرجل أساء صلاته، فكان يعلم كيفيتها: (ثُمَّ ارْفَعْ حتى تَعْتَدِلَ قَائِمًا).[1] کابرای نەشارەزای فەرموو: (پاشان هەڵسەرەوە لە کوڕنوش تا بە تەواوی ڕاست دەبیتەوە).

**حەوتەم: سوژدە بردن و مانەوە تێیدا:** دوو سوژدە دەبرێت لە هەر ڕکاتێکدا و دەبێت ئەوەندەش بوەستێت تا لەشی لە جووڵە دەوەستێتەوە، و دەبێت ناوچاوان و هەردوو ناو لەپ و هەردوو ئەژنۆ و سەر پەنجەکانی قاچی بخاتە سەر زەوی لە کاتی سوژدە بردن دا، خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ ﴾ الحج: ٧٧

واتە: کوڕنوش و سوژدە ببەن، پێغەمبەریش بە کابرای نەشارەزای فەرموو: (ثُمَّ اسْجُدْ حتى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا). (پاشان سوژدە ببە هەتا لەشت لە جووڵە دەوەستێتەوە).

**هەشتەم: دانیشتنی نێوان دوو سوژدەکە:** بە بەڵگەی فەرموودەی پێشوو، دەبێت ئەم دانیشتنە لە هەموو کاتێکدا هەبێت.

**نۆیەم: دانیشتنی کۆتایی:** مەبەست پێ ی ئەو دانیشتنەیە لە کۆتا ڕکاتی نوێژدایە و سەلام دانەوەی بە دوادا دێت.

**دەیەم: خوێندنی تەحییات لە دانیشتنی کۆتایی دا** (عن عبد اللَّهِ بن مسعود رضي الله عنه قال: عَلَّمَنِي رسول اللَّهِ ﷺ وَكَفِّي بين كَفَّيْهِ التَّشَهُّدَ كما يُعَلِّمُنِي السُّورَةَ من الْقُرْآنِ) عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێت) دەستم لەناو هەردوو دەستی پێغەمبەر بوو (ﷺ) فێری تەحیاتی کردم وەك چۆن فێری سوڕەتێکی قورئانی دەکردم بەم جۆرە (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النبي وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ).[2]

---

١) رواه البخاري ٧٢٤. ومسلم ٣٩٧.

٢) رواه البخاري ٨٣١. ومسلم ٤٠٢.

**یازدەیەم: سەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دوای تەحیاتی کۆتایی:**

(عن عَبْدَ الرحمن بن أبي لَيْلَى قال لَقِيَنِي كَعْبُ بن عُجْرَةَ فقال ألا أُهْدِي لك هَدِيَّةً إن النبي ﷺ خرج علينا فَقُلْنَا يا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ الصَّلَاةُ عَلَيْكُمْ عَلَّمَنَا كَيْفَ نُسَلِّمُ عَلَيْكُمْ قَالَ قُولُوا)[1] عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلا دەڵێ: کەعبی کوڕی عوجرە گەشت بە من و ووتی دیاریەکت پێشکەش کەم؟ پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ناومان ووتمان پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەزانین چۆن سەلامت چۆن سەلامت لەسەر بدەین ئەی چۆن صەلاواتت لەسەر بدەین ؟ فەرمووی بڵێن: (اللهم صَلِّ على مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كما صَلَّيْتَ على إبراهيم وَعَلَى آلِ إبراهيم إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ اللهم بَارِكْ على مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كما بَارَكْتَ على إبراهيم وَعَلَى آلِ إبراهيم إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ).[2]

**دوازدەیەم: سەلام دانەوەی یەکەم:** (وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ).[3] بەڵگەی فەرموودە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی نوێژ فەرمووی: (حەرام کردنی هەموو شتێ جگە لە نوێژ بە (الله اکبر)ە حەڵاڵ کردنیشی بە سەلام دانەوەیە).

کەمترینی سەلامدانەوە ئەمەیە (السلام علیکم) چاکترینیشی (السلام علیکم و رحمة الله) دوو جارە جارێ بە لای ڕاست داو جارێکیش بە لای چەپدا (عن سَعْد قال كنت أَرَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُسَلِّمُ عن يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ حتى أَرَى بَيَاضَ خَدِّهِ).[4] سەعد (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەرم دەبینی بە لای ڕاست و بە لای چەپدا سەلامی دەدایەوە ئەوەندە لای ئەکردەوە کوڵمیم دەبینی).

(عن عبد اللَّهِ أَنَّ النبي ﷺ كان يُسَلِّمُ عن يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ حتى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ).[5] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت)

---

١) رواه البخاري ٦٣٥٧. ومسلم ٤٠٦.

٢) رواه البخاري ٦٣٥٧. ومسلم ٤٠٦.

٣) رواه ابوداود ٦١. والترمذي ٣. وابن ماجه ٢٧٥. حديث حسن.

٤) رواه مسلم ٥٨٢.

٥) رواه ابوداود ٩٩٦. والترمذي ٢٩٥. وقال الترمذي حديث حسن صحيح.

دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) سەلامی دەدایەوە بەلای راستو بەلای چەپدا بەجۆرێ کوڵمی دەبینرا و دەیفەرموو: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ).

وە هەندێ جار تەنها یەك سەلامی دەدایەوە (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا : أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ . يُسَلِّمُ فِي الصَّلاَةِ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً تِلْقَاءَ وَجْهِهِ، يَمِيلُ إِلَى الشِّقِّ الأَيْمَنِ شَيْئًا أَوْ قَلِيلاً).[1] عائیشە رەزای خوای لێ بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا یەك سەلامی دەدایەوە ڕوو بە ڕووی خۆی کەمێك بە لای ڕاست لای دەدایەوە.

**سیازدەیەم: ڕیزبەندی لە نێوان پایەکاندا**، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هەمیشە بە ڕیز ڕووکنەکانی کردووە پێچەوانەی ئەوەی لێ نەبینراوە.

---

١) رواه الترمذي ٢٩٦. وابن ماجه ٩١٩. حديث صحيح.

# سوننەتەکانی نوێژ

**یەکەم: سوننەتەکانی پێش نوێژ:** ئەو سوننەتانەن پێش کردنی نوێژ ئەنجام دەدرێن کە سیانن:

**١ـ بانگدان** : پێشتر باسمان کرد

**٢ـ قامەت کردن:** ئەویشمان باس کرد

**٣ـ دانانی سوترە لە بەردەم نوێژگەردا :**

سوترە بۆ ئەوەی خەڵك بە بەردەم نوێژگەردا نەڕوات وەك دیوار و پایە و عەموود و دار ئەگەر نەبوو داخستنی بەڕماڵ و خەت کێشان بە بەردەم نوێژگەر دا.

(عن بن عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كان إذا خَرَجَ يوم الْعِيدِ أَمَرَ بِالْحَرْبَةِ فَتُوضَعُ بين يَدَيْهِ فَيُصَلِّي إِلَيْهَا وَالنَّاسُ وَرَاءَهُ وكان يَفْعَلُ ذلك في السَّفَرِ).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر ڕۆژی جەژن بڕۆیشتایەتە دەرەوە - بۆ نوێژکردن- فەرمانی دەکرد نێزەیەك لە بەردەمیدا داچەقێنن ئەنجا بەرانبەری نوێژی دەکرد خەڵکەکەش لە دوایەوە نوێژیان دەکرد وە لە سەفەریشدا هەمان شتی دەکرد).

چاکتر وایە سوترە نزیك بێت لە شوێنی سوژدەکەیەوە (عن سَهْلٍ قال كان بين مُصَلَّى رسول اللَّهِ ﷺ وَبَيْنَ الْجِدَارِ مَمَرُّ الشَّاةِ).[2] سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ لە نێوان شوێنی نوێژەکەی پێغەمبەر (ﷺ) و دیوارەکە دا ئەوەندە بووم مەڕێکی پیا بڕوات).

**دووەم: سوننەتەکانی ناو نوێژ:** ئەو سوننەتانەن کە لە ناو نوێژدا دەکرێن کە دوو بەشن :

أ ـ (الأبعاض): ئەو سوننەتەیە نەکردنی بە سوژدەی سەهوە لە کۆتایی نوێژەکەدا بڕ دەبێتەوە.

ب ـ (الهيئات): ئەو سوننەتەیە نەکردنی سوژدەی سەهوی ناوێ .

أ ـ (الأبعاض): ئەم سوننەتانە دەگرێتەوە:

---

١) رواه البخاري ٤٧٢. ومسلم ٥٠١.

٢) رواه البخاري ٤٧٤. ومسلم ٥٠٨.

١ـ تەحیاتی یەکەمی نوێژ: مەبەست پێ ی ئەو تەحیاتە بە کە سەلامدانەوەی بە دوادا نایەت .

٢ـ سەڵاوات دان لە سەر پێغەمبەر (ﷺ) پاش تەحییاتی یەکەم. (كنا نُعِدُّ له سِوَاكَهُ وَطَهُورَهُ فَيَبْعَثُهُ الله ما شَاءَ أَنْ يَبْعَثَهُ من اللَّيْلِ فَيَتَسَوَّكُ وَيَتَوَضَّأُ وَيُصَلِّي تِسْعَ رَكَعَاتٍ لَا يَجْلِسُ فيها إلا في الثَّامِنَةِ فَيَذْكُرُ اللَّهَ وَيَحْمَدُهُ وَيَدْعُوهُ ثُمَّ يَنْهَضُ ولا يُسَلِّمُ ثُمَّ يَقُومُ فيصلي التَّاسِعَةَ ثُمَّ يَقْعُدُ فَيَذْكُرُ اللَّهَ وَيَحْمَدُهُ وَيَدْعُوهُ ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمًا يُسْمِعُنَا).[١] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئێمە سیواك و ئاوی دەست نوێژمان بۆ پێغەمبەر ئامادە دەکرد جا خوا بە خەبەری دەهێنا لەشەودا هەرکات خۆی بیویستایە ئەنجا سیواکی دەکرد و دەست نوێژی دەگرت نۆ ڕکات نوێژی دەکرد دانەدەنیشت بۆتەحیات خوێندن لە هەشتەم ڕکات دا نەبێت یاد و ستایشی خوای دەکرد و دەپاڕایەوە پاشان هەڵدەستایەوە و سەلامی نەدەدایەوە جا هەڵدەستا ڕکاتی نۆیەمی دەکرد پاشان دادەنیشت و یاد و سوپاس و ستایش ودوعای دەکرد ئەنجا سەلامێکی دەدایەوە گوێمان لێ بوو).

٣ـ دانیشتنی تەحیاتی یەکەم: ئەم سیانە هەریەکەیان سوننەتێکی سەربەخۆن.

٤ـ سەڵاوات دان لەسەر ئالی پێغەمبەر (ﷺ) پاش تەحییاتی کۆتایی کە ڕوکنە بەڵگەی ئەو فەرموودە بوو لە ڕوکنی دەیەمدا باسمان کرد .

٥ـ (قنوت) خوێندن لە پاش کڕنوشی ڕکاتی دووەمی نوێژی بەیانی[٢] و لە پاش کڕنوشی کۆتا ڕکاتی نوێژی ویتر لە شانزەی ڕەمەزان بە دواوە تا کۆتایی ڕەمەزان، یا لە کۆتا ڕکاتی هەر نوێژێکدا بەهۆی ناڕەحەتی و هەر بەڵا و کارەساتی ناخۆشەوە ڕوودات (قنوت) دەخوێنرێت بۆ نەمان و لاچوونی.

(سُئِلَ أَنَسُ أَقَنَتَ النبي ﷺ في الصُّبْحِ قال نعم فَقِيلَ له أو قنت قبل الرُّكُوعِ؟ قال بَعْدَ الرُّكُوعِ يَسِيرًا).[٣] پرسیار لە ئەنەس کرا (ڕەزای خوای لێ بێت) ئایا پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژی

---

١) رواه مسلم ٧٤٦/١٣٩.

٢) بروانە: (بداية المجتهد ونهاية المقتصد ١/ ٢٤٦).

٣) رواه البخاري ١٠٠١. ومسلم ٦٧٧.

بەیانیاندا قنووتی خوێندووە؟ وتی: بەڵێ پێیان ووت: ئایا پێش کوڕنوش قنوتی خوێند؟ ووتی: کەمێ دوای کڕنووش قوونوتی خوێند.

(قال الْحَسَنُ بن عَلِيٍّ رضي الله عنهما عَلَّمَنِي رسول اللَّهِ ﷺ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي الْوِتْرِ: اللهم اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ وَقِنِي شَرَّ ما قَضَيْتَ إِنَّكَ تَقْضِي ولا يُقْضَى عَلَيْكَ وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ من وَالَيْتَ تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ).[1]

حەسەنی کوڕی عەلی (ڕەزای خوایان لێ بێ ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) چەند ووتەیەکی فێر کردم لە قنوتی نوێژی وویتردا بیڵێم کە ئەمەیە: (اللهم اهدني فيمن هديت و عافني فيمن عافيت و تولني فيمن توليت و بارك لي فيما أعطيت وقني شر ما قضيت، إنك تقضي و لا يقضى عليك و إنه لا يذل من واليت تباركت ربنا و تعاليت). سوننەتە ئەگەر پێش نوێژ ئەم دووعایەی خوێند بە ووشەکان شێوەی کۆ بڵێت نەك تاك کە لە فەرمودەکەدا هاتووە.

(عَنْ أَنَسٍ : أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ فَلَمْ يَزَلْ يَقْنُتُ فِي الصُّبْحِ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا).[2] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەر (ﷺ) هەتا لە دنیا دەرچوو لە نوێژی بەیانیاندا قنوتی دەخوێند).

**ب ـ (الهيئات):** ووتمان ئەو سوننەتانەیە ئەگەر نوێژگەر لە نوێژەکانیدا نەیکرد پێویست ناکات سوژدەی سەهوی بۆ ببات، ئەو سونەتانەش ئەمانەن:

**١ـ بەرزکردنەوەی هەردوو دەست :**

سوننەتە هەردوو دەست بەرزبکرێتەوە لە کاتی (الله أكبر) ی دەست کردن بە نوێژ و کاتی ڕۆشتن بۆ کڕنووشی و کاتی هەستانەوە لە کوڕنوش.

**شێوەکەی چۆنە:** دەبێت هەردوو دەستی بەرز بکاتەوە ڕوو بە قیبلە پەنجەکانی دەستی کراوە بن پەنجە گەورەی هەردوو دەستی لە ئاستی نەرمەی گوێیەکانیدا بن و دەستەکانی ڕووت بن و دەسکێش و شتی لەو جۆرەی تیا نەبێ .

(عن عَبْدَ اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما قال رأيت النبي ﷺ افْتَتَحَ التَّكْبِيرَ في الصَّلَاةِ فَرَفَعَ يَدَيْهِ حين يُكَبِّرُ حتى يَجْعَلَهُمَا حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ وإذا كَبَّرَ لِلرُّكُوعِ فَعَلَ مثله وإذا قال سمع الله لِمَنْ حَمِدَهُ

---

١) رواه ابوداود ١٤٢٥. وهو حديث صحيح.

٢) رواه احمد ٣/ ١٦٢. والدارقطني ٣/ ٣٩. وعبدالرزاق ٤٩٦٤. وابن أبي شيبة ٢/ ٣١٢. وهو حديث حسن.

فَعَلَ مثله وقال رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ ولا يَفْعَلُ ذلك حين يَسْجُدُ ولا حين يَرْفَعُ رَأْسَهُ من السُّجُودِ).[١] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لەسەر بێت) دەڵێ: پێغەمبەرم (ﷺ) بینی (الله اکبر)ی نوێژ دابەستنی کرد هەردوو دەستەکەی لە کاتی (الله أکبر) کردندا بەرزکردەوە تا ئاستی شانەکانی وە بۆ ڕۆشتن بۆ کڕنووش دووبارەی کردەوە، کاتێکیش ووتی (سمع الله لمن حمده) هەردوو دەستەکانی بەرز کردەوە بە هەمان شێوە و وتی: (ربنا و لك الحمد)، بەڵام کاتی سوژدە بردن و کاتی هەستانەوە لە سوژدە دەستی بەرز نەکردەوە.

**٢ـ دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ:**

دەبێت دەستی ڕاستی لەسەر پشتی دەست و مەچەکی چەپی دانێت و بە پەنجەکانی دەستی ڕاستی دەستی چەپی بگرێت وە دەستەکان لەسەر سنگی دانێت بەم بەڵگانە:

(عن وَائِلِ بن حُجْرٍ أَنَّهُ رَأَى النبي ﷺ رَفَعَ يَدَيْهِ حين دخل في الصَّلَاةِ ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى على الْيُسْرَى).[٢] وائیلی کوڕی حوجر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) نوێژم کرد دەستی ڕاستی خستە سەر دەستی چەپی لەسەر سینگی دانان).

(وعند النسائي: ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى على كَفِّهِ الْيُسْرَى وَالرُّسْغِ وَالسَّاعِدِ).[٣] وە لە ڕیوایەتێکی نەسائی دا ووتی: (پاشان دەستی ڕاستی دانا لەسەر پشتی دەستی چەپی و سەر مەچەك و بەشێکی باسکی).

**٣ـ سەیرکردنی شوێنی سوژدەکەی:**

(قالت عائشة رضي الله عنها: دخل رسول الله ﷺ الكعبة ما خلف بصره موضع سجوده حتى خرج منها).[٤] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆشتە ناو کەعبە و چاوی بڕیبووە شوێنی سوژدەکە تا هاتە دەرەوە لە کەعبە).

---

١) رواه البخاري ٧٠٥. ومسلم ٣٩٠.

٢) رواه ابن خزيمة.

٣) رواه النسائي ٢/ ١٢٦.

٤) رواه الحاكم ١/ ٤٧٩. والبيهقي ٥/ ١٥٨. وصححه الحاكم ووافقه الذهبي.

(عن أَنَسَ بن مَالِكٍ قال قال النبي ﷺ ما بَالُ أَقْوَامٍ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إلى السَّمَاءِ في صَلَاتِهِمْ فَاشْتَدَّ قَوْلُهُ في ذلك حتى قال لَيَنْتَهُنَّ عن ذلك أو لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ).[1] ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەوە خەڵکانێك چییانە لە نوێژەکانیاندا چاویان بەرز دەکەنەوە بۆ ئاسمان) جا قسەی توندی کرد لەو بارەیەوە هەتا فەرمووی: (بە ڕاستی یا واز دێنن لەو چاو بەرز کردنەوەیە بۆ ئاسمان یا بێگومان بینایی چاویان دەفڕێنرێ کوێر دەکرێن).

**٤ـ دوعای سەرەتای نوێژ:**

دوای (الله أکبر)ی نوێژ دابەستن و پێش خوێندنی سوڕەتی فاتیحە ئەم دوعایە دەخوێنرێ:

١ـ (قال أبو هُرَيْرَةَ كان رسول اللَّهِ ﷺ يَسْكُتُ بين التَّكْبِيرِ وَبَيْنَ الْقِرَاءَةِ إِسْكَاتَةً قال أَحْسِبُهُ قال هُنَيَّةً فقلت بِأَبِي وَأُمِّي يا رَسُولَ اللَّهِ إِسْكَاتُكَ بين التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ ما تَقُولُ قال أَقُولُ اللهم بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كما بَاعَدْتَ بين الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ اللهم نَقِّنِي من الْخَطَايَا كما يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ من الدَّنَسِ اللهم اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ).[2] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ نوێژی دائەبەست بە (الله أکبر) کەمێ بێ دەنگ ئەبوو پێش خوێندنی فاتیحە منیش پرسیارم کرد چی ئەکەیت فەرمووی: (ئەڵێم: اللهم باعد بيني و بين خطاياي كما باعدت بين المشرق و المغرب اللهم نقني من خطاياي كما ينقي الثوب الأبيض من الدنس، اللهم أغسلني من خطاياتي بالماء و الثلج و البرد).

٢ـ (عن علي بن أبي طالب عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أنه كان إذا قام إلى الصلاة قال: وجهت وجهي للذي فطر السماوات والأرض حنيفا وما أنا من المشركين إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين لا شريك له وبذلك أمرت وأنا من المسلمين).[3] عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ هەستایە نوێژی بکردایە لە سەرەتای نوێژەکەیدا دەیفەرموو: (وجهت وجهي للذي فطر السماوات و الأرض حنيفاً و ما أنا من المشركين، إن

---

١) رواه البخاري ٧٥٠.

٢) رواه البخاري ٧٤٤. ومسلم ٥٩٨. واحمد ٢/ ٢٣١.

٣) رواه مسلم ٧٧١..

الصلاتي و نسكي و محياي و مماتي لله رب العالمين لا شريك له و بذلك أمرت و أنا من المسلمين).

ئەم دووعایە سوننەتە لە نوێژی فەرز و سوننەت و تاك و كۆمەڵ دا بخوێنرێ بە مەرجێ دەستی بە خوێندنی سورەتی فاتیحە نەكردبێ، بەڵام ئەم دووعایە لە نوێژی مردوو و نوێژە فەرزكە كە كاتەكەی زۆر كەمی مابێت بە جۆرێ ئەگەر ئەم دووعایە بخوێنێ نوێژەكانی بەسەر دەچێت و نامێنێ، ناخوێنرێت.

**٥ـ وتنی (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم)** دوای ئەو دووعای پێشوو و پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە ، بەڵام ئەگەر دەستی بە خوێندنی فاتیحە كرد ئەوە ئیتر نابێ (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) بڵێیت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ النحل: ٩٨ واتە: كاتێ ویستت قورئان بخوێنی پەنا بگرە بەخوا لە شەیتانی دوور خراوە لە بەزەیی خوا .

**٦ـ دەنگ بەرزكردنەوە یا بەرزكردنەوەی هەریەكەیان لە شوێنی خۆیدا:**

أـ (عن جُبَيْرِ بن مطعم قال سمعت النبي ﷺ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ).[١] جوبەیری كوڕی موطعیم (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو لە نوێژی مەغریبدا سورەتی (والطور)ی خوێند).

ب ـ (عن الْبَرَاءَ بن عازب رضي الله عنه قال سمعت النبي ﷺ يَقْرَأُ وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ فِي الْعِشَاءِ وما سمعت أَحَدًا أَحْسَنَ صَوْتًا منه أو قِرَاءَةً).[٢] بەرائی كوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو لە نوێژی عیشادا سورەتی (والتین والزیتون)ی خوێند گوێم لە كەس نەبووە ئەوەندە دەنگی خۆش بێت).

ئەم فەرموودانە ئەوە دەگەیەنن لە كاتەكانی تردا بە بێ دەنگی قورئانی خوێندوە وەك لەم فەرموودەدا هاتووە.

١) رواه البخاري ٧٣٥. ومسلم ٤٦٣.

٢) رواه البخاري ٧٣٣. ومسلم ٤٦٤.

ج ـ (عن خَبَّاب رضي الله عنه قال: وقد سأله سائل: أَكَانَ رسول اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ قال نعم قُلْنَا بِمَ كُنْتُمْ تَعْرِفُونَ ذَاكَ قال بِاضْطِرَابِ لِحْيَتِهِ).[1] خەبباب (ڕەزای خوای لێ بێت) پرسیاریان لێ کرد، ئایا پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا قورئانی دەخوێند؟ ووتی: بەڵێ ووتمان بە چیا ئەتانزانی؟ وتی: بە جوڵانەوەی ڕیشی دا).

د ـ (عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه يقول في كل صَلَاةٍ يُقْرَأُ فما أَسْمَعَنَا رسول اللَّهِ ﷺ أَسْمَعْنَاكُمْ وما أَخْفَى عَنَّا أَخْفَيْنَا عَنْكُمْ).[2] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لە هەموو نوێژێکدا قورئان دەخوێنرێت، جا ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بە دەنگی بەرز دەیخوێند بۆمان، ئێمەش بە دەنگی بەرز دەیخوێنین بۆ ئێوە، ئەوەشی پەنهانی دەکرد لێمان ئێمەش پەنهانی دەکەین لێتان).

**٧ ـ وتنی (آمين) پاش خوێندنی فاتیحە بۆ هەموو نوێژکەرێك سوننەتە ئەم ئامین کردنە.**

جا چ بە تەنیا نوێژ بکەیت یا بە کۆمەڵ سوننەتە دوای تەواو بوونی سوڕەتی (فاتیحە) بڵێت (آمين) لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا بە پەنهانی و لە نوێژەکانی تردا بە دەنگی بەرز دەوترێت، وە مانای (آمين) واتە: خوایە ئەوەی خوێندمان ووتمان گیرای کەیت لێمان.

أ ـ (عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال إذا قال أحدكم آمِينَ وَقَالَتْ الْمَلَائِكَةُ فِي السَّمَاءِ آمِينَ فَوَافَقَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى غُفِرَ له ما تَقَدَّمَ من ذَنْبِهِ).[3] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان لە نوێژدا (دوای خوێندنی فاتیحە) بڵێت (آمين) فریشتەکانیش لە ئاسمان دەڵێن (آمين) ئەگەر ئەم ئامینە لەگەڵ ئەو ئامینەدا لەیەك کاتدا بن، ئەوە (خوای گەورە) لە هەرچی گوناهی ڕابردوویەتی خۆش دەبێ).

ب ـ (عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ النبي ﷺ قال إذا أَمَّنَ الْإِمَامُ فَأَمِّنُوا فإنه من وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ له ما تَقَدَّمَ من ذَنْبِهِ).[4] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)

---

١) رواه البخاري ٧٤٦ و ٧٦٠.

٢) رواه البخاري ٧٣٨. ومسلم ٣٩٦.

٣) رواه البخاري ٧٤٨. ومسلم ٤١٠.

٤) رواه البخاري ٧٨٠. ومسلم ٤١٠.

فەرمووی: (کاتێ ئیمام وتی (آمین) ئێوەش بڵێن (آمین) چونکە هەرکەس وتنی ئامینەکەی لەگەڵ ووتنی (آمین)ی فریشتەکاندا پێکەوە بێت گوناهی ڕابردووی دەسڕێتەوە).

### ٨ـ خوێندنی قورئان پاش سورەتی فاتیحە:

لە ڕکاتی یەکەم و دووەم دا سوننەتە دوای خوێندنی سورەتی فاتیحە سورەتێك یا چەند ئایەتێك بخوێنرێت چ ئیمام بێت یا بە تەنها بێت.

أـ (عن أبي قَتَادَةَ قال كان النبي ﷺ يَقْرَأُ في الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ من صَلَاةِ الظُّهْرِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ يُطَوِّلُ في الْأُولَى وَيُقَصِّرُ في الثَّانِيَةِ وَيُسْمِعُ الْآيَةَ أَحْيَانًا وكان يَقْرَأُ في الْعَصْرِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ وكان يُطَوِّلُ في الْأُولَى وكان يُطَوِّلُ في الرَّكْعَةِ الْأُولَى من صَلَاةِ الصُّبْحِ وَيُقَصِّرُ في الثَّانِيَةِ).[١] ئەبو قەتادە (خوای لیّ ڕازی بێت) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) لە دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆدا سورەتی فاتیحە و دوو سورەتی تری دەخوێند ڕکاتی یەکەمی درێژ دەکردەوە و ڕکاتی دووەمی کورت دەکردەوە، بەلاّم لە دوو ڕکاتەکەی تردا (ڕکاتی سێ یەم و چوارەم) تەنها سورتی فاتیحەی دەخوێند، وە لە نوێژی بەیانیان دا ڕکاتی یەکەمی درێژ دەکردەوە و ڕکاتی دووەمی کورت دەکردەوە، گومانمان وابوو پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی بە درێژ کردنەوەی ڕکاتی یەکەم ئەوە بوو خەڵك بگەن بە ڕکاتی یەکەمدا).[٢]

ب ـ (عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال كان النبي ﷺ يَقْرَأُ في الْجُمُعَةِ في صَلَاةِ الْفَجْرِ (الم تَنْزِيلُ) و (هل أتى على الْإِنْسَانِ).[٣] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لیّ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژی بەیانیانی ڕۆژی هەینی دا سورەتی (ألم تنزل) و (هل أتى على الإنسان) دەخوێند واتە سورەتی سەجدەی لە ڕکاتی یەکەمدا دەخوێند و سورەتی ئینسانیش لە ڕکاتی دووەم دا دەخوێند .

١) رواه البخاري ٧٥٩ و ٧٦٢. ومسلم ٤٥١.

٢) رواه ابوداود ٨٠٠.

٣) رواه البخاري ٨٥١. ومسلم ٨٨٠.

**٩ـ (الله اکبر) ی نێوان هەڵس و کەوتەکان:**

جگە لە (الله أكبر)ی نوێژ دەست پێ کردن سوننەتە لە هەموو دانەوینەوە و بەرز بونەوە و دانیشتن و هەستانەوەیەکدا (الله أكبر) بکرێت جگە بەرزبوونەوە لە ڕکوع کە دەوترێت (سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد)

(عن أَبى هُرَيْرَةَ يقول كان رسول اللَّهِ ﷺ إذا قام إلى الصَّلَاةِ يُكَبِّرُ حين يَقُومُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حين يَرْكَعُ ثُمَّ يقول سمع الله لِمَنْ حَمِدَهُ حين يَرْفَعُ صُلْبَهُ من الرَّكْعَةِ ثُمَّ يقول وهو قَائِمٌ رَبَّنَا لك الْحَمْدُ قال عبد اللَّهِ وَلَكَ الْحَمْدُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حين يَهْوِي ثُمَّ يُكَبِّرُ حين يَرْفَعُ رَأْسَهُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حين يَسْجُدُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حين يَرْفَعُ رَأْسَهُ ثُمَّ يَفْعَلُ ذلك في الصَّلَاةِ كُلِّهَا حتى يَقْضِيَهَا وَيُكَبِّرُ حين يَقُومُ من الثِّنْتَيْنِ بَعْدَ الْجُلُوسِ).[١] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ هەڵئەسا بۆ نوێژ کاتێ ڕائەوەستا (الله أكبر) ی دەکرد وە کاتێ ڕکوعی دەبرد (الله أكبر) ی دەکرد وە کاتێ پشتی بەرز کردەوە لە ڕکوع دەیفەرموو (سمع الله لمن حمده) وە کە ڕێك دەبوویەوە دەیفەرموو (ربنا ولك الحمد) پاشان دادەبەزی بۆ سووژدە دەیفەرموو (الله أكبر) ئەنجا کە سووژدەی دەبرد دەیفەرموو (الله أكبر) پاشان کە سەری بەرز دەکردەوە دەیفەرموو (الله أكبر) لە هەموو ڕکاتێکدا بە شێوەی دەکرد هەتا نوێژەکەی کۆتایی پێ دەهێنا وە لە پاش دوو ڕکات و دانیشتن و تەحییات خوێندن کە هەڵئەسایەوە دەیفەرموو (الله أكبر).

**١٠ ـ وتنی (سبحان ربی العظیم) لە رکوعداو (سبحان ربی الاعلی) لە سوژدەدا:**

(عن حُذَيْفَةَ قال صَلَّيْتُ مع النبي ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ ..... وفيه: ثُمَّ رَكَعَ فَجَعَلَ يقول سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ .... ثُمَّ سَجَدَ فقال سُبْحَانَ رَبِّيَ الأعلى).[٢] حوزەیفە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژم کرد... پاشان کوڕنوشی بردو فەرمووی (سبحان ربی العظیم) پاشان سوژدەی بردو و فەرمووی (سبحان ربی الاعلی).

---

١) رواه البخاري ٧٥٦. ومسلم ٣٩٢.

٢) رواه مسلم ٧٧٢.

**١١ ـ دانانی دەستەکانی لەسەر ڕانەکانی لە دانیشتنی تەحیاتەکاندا:**

(عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما في صفة جلوسه ﷺ قال: كان إذا جَلَسَ في الصَّلَاةِ وَضَعَ كَفَّهُ الْيُمْنَى على فَخْذِهِ الْيُمْنَى وَقَبَضَ أَصَابِعَهُ كُلَّهَا وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ التي تَلِي الْإِبْهَامَ وَوَضَعَ كَفَّهُ الْيُسْرَى على فَخْذِهِ الْيُسْرَى).[١] عەبدوللای کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێبێت دەربارەی شێوەی دانیشتنی پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا دەڵێ: کاتێ دابنیشتایە لە نوێژدا ـ بۆ تەحیات خوێندن ـ دەستی ڕاستی دەخستە سەر ڕانی ڕاستیو هەموو پەنجەکانی دەقوچا پەنجەی شایەتومان نەبێ ئاماژەی پێ دەکرد ـ لە کاتی وتنی (الا الله)و دەستی چەپی ـ بە کراوەیی ـ لەسەر ڕانی چەپی دادەنا".

وە سوننەتە کە پەنجەی بەرزکردەوە کاتێ وتی (الا الله) هەر بەرزکراوەیی بهێنێتەو تا کۆتایی نوێژەکەی نەیجولێنێت.

م ـ دانیشتنی بەشێوەی (تورك) لە تەحیاتی کۆتاییدا و بە شێوەی (إفتراش) لە تەحیاتەکانی تردا:

(إفتراش) واتە: پێی چەپی ڕادەخات و لەسەر قاپارەی چەپی دادەنیشێو پێی ڕاستی لەسەر پەنجەکانی ڕاست دەوەستێنێ بە جۆرێ سەرپەنجەکانی پێی ڕاستی ڕوو بە قیبلە بن. ئەمە بۆ هەموو دانیشتنێکی تەحیاتە جگە لە تەحیاتی کۆتایی.

(تورك): واتە پێی ڕاستی ڕاست دەوەستێنێ لەسەر پەنجەکانیو سەرەپەنجەکانی ڕوو بە قیبلە بن پێی چەپیشی لە لای ڕاستییەوە دەباتە دەرەوەو ڕانی چەپی دەخاتە سەر زەوی.

(عن أبو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ رضي الله عنه قال: أنا كنت أَحْفَظَكُمْ لِصَلَاةِ رسول اللَّهِ ﷺ .... وفيه: إذا جَلَسَ في الرَّكْعَتَيْنِ جَلَسَ على رِجْلِهِ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْيُمْنَى وإذا جَلَسَ في الرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ قَدَّمَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْأُخْرَى وَقَعَدَ على مَقْعَدَتِهِ).[٢] ئەبوحومەیدەی ساعیدی ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: من لە هەمووتان چاکتر شێوەی نوێژکردنی پێغەمبەرم ﷺ لە بیرە جا باسی دەکات تا دەگاتە: "جا دوای دوو ڕکات نوێژکردن دادەنیشت لەسەر پێی چەپی

---

١) رواه مسلم ٥٨٠.

٢) رواه البخاري ٧٩٤.

دادەنیشتو پێی راست راست دادەناو كاتێ لە ركاتی كۆتایی نوێژدا دادەنیشت پێی چەپی دەبردە پێشەوە ـ لای راستەوە دەیبردە دەرەوە ـ پێی راستی راست دادەناو لەسەر رانی چەپی دادەنیشت".

**١٢ـ سەڵاواتی ئیبراهیمی و پاشان دوعاكردن دوا تەحیاتی كۆتایی:**

پێشتر سەڵاواتی ئیبراهیمیمان باس كرد، دوا ئەوە سوننەتە پەنا بگرین بە خوا لە سزای گۆڕ و سزای دۆزەخ و ئەنجا هەر دوعایەكی پێ باشە بۆ خۆی بیكات بە مەرجێ لە خوێندنی تەحیات و سەڵاواتەكە زیاتر نەبێت.

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا تَشَهَّدَ أحدكم فَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ من أَرْبَعٍ من عَذَابِ جَهَنَّمَ وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ).[١] ئەبوهورەیرە ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "كاتێ كەسێكتان لە خوێندنی تەحیاتی كۆتایی بوویەوە با پەنا بگرێت بە خوا لەم چوار شتە: لە سزای دۆزەخ و سزای قەبر و لە فیتنەی ژیان و مردن و لە فیتنەی دەجال".

**١٣ـ سەلامدانەوەی دووەم:** پێشتر باسمان كرد كە سەلامدانەوەی یەكەم بەلای راستدا روكنە و فەرزە، بەڵام سەلامدانەوەی دووەی بەلای چەپدا سوننەتە و فەرموودەكانیشمان لەوێ باس كرد.

**١٤ـ پابەندبوون بە خوشوعەوە لە نوێژەكەدا سەراپا:**

خوشوع واتە: دڵت لای ئەو قورئان و زیكرخوێندنانە بێت و بیر لە ماناكانیان بكەیتەوە و تاوێتەیان ببی و هەست بكەیت قسە لەگەڵ پەروەردگار دەكەیت.

(عنْ عُثْمَانَ رضي الله عنه قال سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول: ما من امْرِئٍ مُسْلِمٍ تَحْضُرُهُ صَلَاةٌ مَكْتُوبَةٌ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهَا وَخُشُوعَهَا وَرُكُوعَهَا إلا كانت كَفَّارَةً لِمَا قَبْلَهَا من الذُّنُوبِ ما لم يُؤْتِ كَبِيرَةً وَذَلِكَ الدَّهْرَ كُلَّهُ).[٢] عوسمان (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: "هەر كەسێكی موسڵمان نوێژێكی فەرز كاتی بێت جا دەست نوێژ و خوشوع و

---

١) رواه مسلم ٥٨٨.

٢) رواه مسلم ٢٢٨.

رکوعی بە جوای بەجێ بێنێ ئیلا دەبێت بە کەفارەتی گوناهەکانی لەوەوپێش و ئەو ساڵەش هەمووی ئەگەر گوناهی گەورەی نەکردبێ".

**سێیەم: ئەو سوننەتانەی پاش نوێژ دەکرێن:**

**١ـ یادی خوا کردن پاش نوێژ:**

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ حين يَنْصَرِفُ الناس من الْمَكْتُوبَةِ كان على عَهْدِ النبي ﷺ وقال ابن عَبَّاسٍ كنت أَعْلَمُ إذا انْصَرَفُوا بِذَلِكَ إذا سَمِعْتُهُ).[١] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: "دەنگ بەرزکردنەوە بە زیکر و یادی خوا لە کاتی کۆتایی هاتنی نوێژ فەرزدا لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ بوو". عەبدوڵڵا دەڵێ من کاتێ گوێم لە زیکر دەبوو دەمزانی نوێژ تەواو بووە.

(وفي لفظ: ما كنا نَعْرِفُ انْقِضَاءَ صَلَاةِ رسول اللَّهِ ﷺ إلا بِالتَّكْبِيرِ).[٢] لە ریوایەتێکی تردا دەڵێ: "ئێمە تەواوبوونی نوێژمان نەدەزانی لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ بە (الله أكبر) کردندا نەبێت".

(عن وَرَّادٍ كَاتِبِ الْمُغِيرَةِ بن شُعْبَةَ قال أَمْلَى على الْمُغِيرَةُ بن شُعْبَةَ في كِتَابٍ إلى مُعَاوِيَةَ أَنَّ النبي ﷺ كان يقول في دُبُرِ كل صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ لَا إِلَهَ إلا الله وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ له له الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وهو على كل شَيْءٍ قَدِيرٌ اللهم لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ ولا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ ولا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ).[٣] وەڕڕاد ـ بەندەی ئازادکراوی موغیرەی کوڕی شوعبە ـ دەڵێ: موغیرەی کوڕی شوعبە لە نامەیەکدا کە بۆ موعاوییەی نووسیبوو بۆی خوێندمەوە کە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە پاش هەموو نوێژێکی فەرز دەیفەرموو: "لا إله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير، اللهم لا مانع لما أعطيت ولا معطي لما منعت، ولا ينفع ذا الجدّ منك الجد".

---

١) رواه البخاري ٨٤١، ومسلم ٥٨٣.

٢) رواه مسلم ٥٨٣.

٣) رواه البخاري ٨٤٢، ٦٣٣٠، ٦٦١٥، ٧٢٩٢، ومسلم ٥٩٣.

**٢ـ جێگای نوێژە فەرزەکەی بگۆڕێ ئەگەر نوێژی سوننەتی کرد:**

بۆ ئەوی شوێن سوژدەی زۆر بێت، چونکە شایەتی بۆ دەدەن، وا خێری زیاترە کە نوێژە فەرزەکەی لە مزگەوت کرد نوێژی سوننەتی بباتەوە لە ماڵەوە بیکات.

(قال ﷺ: فَصَلُّوا أَيُّهَا الناس فِي بُيُوتِكُمْ فإن أَفْضَلَ الصَّلَاةِ صَلَاةُ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إلا الْمَكْتُوبَةَ).[1] پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: "ئەی خەڵکینە نوێژەکانتان لە ماڵەوە بکەن، چونکە گەورەترین نوێژ ئەو نوێژەیە مرۆڤ لە ماڵەوە بیکات جگە لە نوێژە فەرزەکان".

**٣ـ ئەگەر مزگەوتەکە ئافرەتانیشی تیابوو، ئەوە سوننەتە پیاوەکان کەمێك بمێننەوە :**

تا ئافرەتان دەڕۆنە دەرەوە بۆ ئەوەی تێکەڵاو نەبن، چونکە تێکەڵاوی هۆی پەیدابوونی خراپەیە.

(عن أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها أَنَّ النِّسَاءَ فِي عَهْدِ رسول اللَّهِ ﷺ كُنَّ إذا سَلَّمْنَ من الْمَكْتُوبَةِ قُمْنَ وَثَبَتَ رسول اللَّهِ ﷺ وَمَنْ صلى من الرِّجَالِ ما شَاءَ الله فإذا قام رسول اللَّهِ ﷺ قام الرِّجَالُ).[2] ئوموسەلەمە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئافرەتان کە سەلامی نوێژی فەرزیان دەدایەوە هەڵدەستان ـ دەرۆشتنە دەرەوە لە مزگەوت ـ پێغەمبەر ﷺ و ئەو پیاوانەی ئامادەی نوێژکردن بوون ئەوەندە خوا پێی خۆشبوایە دەمانەوە، ئەنجا کە پێغەمبەر ﷺ هەڵدەسا پیاوەکانیش هەڵدەسان".

(وفي رواية قالت أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها كان رسول اللَّهِ ﷺ إذا سَلَّمَ قام النِّسَاءُ حين يَقْضِي تَسْلِيمَهُ وَيَمْكُثُ هو فِي مَقَامِهِ يَسِيرًا قبل أَنْ يَقُومَ قال نَرَى وَاللَّهُ أَعْلَمُ أَنَّ ذلك كان لِكَيْ يَنْصَرِفَ النِّسَاءُ قبل أَنْ يُدْرِكَهُنَّ أَحَدٌ من الرِّجَالِ).[3] لە ریوایەتێکی تردا دەڵێ: "کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە سەلامدانەوە دەبوویەوە ئافرەتان هەڵدەستان ـو دەرۆشتنە دەرەوە ـ پێغەمبەریش ﷺ ـ کەمێك لە جێگای خۆی دەمایەوە ـ لەگەڵ نوێژگەرە پیاوەکان دا پێش ئەوەی هەستێ ئیبنو شیهابی زوهری کە یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە دەڵێ: "پێمانوابوو ئەم مانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەبووە ئافرەتان بڕۆن پێش ئەوەی پیاوان پێیان بگەن".

---

١) رواه البخاري ٦٩٨ ومسلم ٧٨١.

٢) رواه البخاري ٨٢٨.

٣) رواه البخاري ٨٣٢.

# ئەو شتانەی کەراهەتیان هەیە لە نوێژدا

**١ـ دەست خستنە سەر کەلەکە لە نوێژدا:**

(عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال نهي رسول الله ﷺ أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِرًا).[١] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لەوەی مرۆڤ نوێژ بکات و دەستی لەسەر کەلەکەی دانێ".

**٢ـ لاکردنەوە لە نوێژدا بەبێ هۆ:**

(عن عَائِشَةَ قالت سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عن الِالْتِفَاتِ في الصَّلَاةِ فقال هو اخْتِلَاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ من صَلَاةِ الْعَبْدِ)[٢] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی لاکردنەوە لە نوێژدا، فەرمووی: "ئەو دزییە کە شەیتان لە نوێژی موسڵمانی دەدزێ".

**٣ـ تف کردنە بەردەمی یا لای ڕاستی:**

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا كان أحدكم في الصَّلَاةِ فإنه يُنَاجِي رَبَّهُ فلا يَبْزُقَنَّ بين يَدَيْهِ ولا عن يَمِينِهِ وَلَكِنْ عن شِمَالِهِ تَحْتَ قَدَمِهِ).[٣] ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێ کەسێکتان لە نوێژدا بوو ئەوە وتووێژ دەکات لەگەڵ پەروەردگاریدا با تف نەکاتە بەردەمی و لای ڕاستی، بەڵکو بیکاتە ژێر پێی یا لای چەپی". چونکە لەو کاتەدا ناوی مزگەوتەکە خۆڵ بووە ، بەڵام ئێستا نابێت تف بکاتە مزگەوت.

---

١) رواه البخاري ١٢١٩، ومسلم ٥٤٥.

٢) رواه البخاري ٧٥١.

٣) رواه البخاري ٧٥١.

**٤ـ چاو بەرزكردنەوە بۆ ئاسمان:**

(عن أَنَسَ بن مَالِكٍ رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال: ما بَالُ أَقْوَامٍ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إلى السَّمَاءِ فِي صَلَاتِهِمْ. ثم قال: لَيَنْتَهُنَّ عن ذلك أو لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ).[1] ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە خەڵكانێ چییانە لە نوێژدا چاویان بەرز دەكەنەوە بۆ ئاسمان" پاشان فەرمووی: "بەراستی یا واز لەو كارە دێنن یا ـ ڕووناكی ـ چاویان دەفڕێنرێت ـو كوێر دەكرێن ـ".

**٥ـ نوێژكردن لە كاتێكدا خواردن ئامادەیە، یان تەنگە تاوە،** پێشتر بە بەڵگەو باسمان كرد.

**٦ـ باوێشكدان لە نوێژدا:**

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال التَّثَاؤُبُ من الشَّيْطَانِ فإذا تَثَاءَبَ أحدكم فَلْيَكْظِمْ ما اسْتَطَاعَ).[2] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "باوێشكدان لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر كەسێكتان باوێشكی هات چەند دەتوانی بیگێڕێتەوە با وێشك نەدات".

**٧ـ كۆكردنەوەی جلو بەرگ و قژ:**

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أنَّ النبي ﷺ قال: .... ولا نكفت الثِّيَابَ ولا الشَّعَرَ).[3] عەبدوڵلا كوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ".. نابێ كە جلو بەرگ كۆكەیتەوە وە نابێ و قژیش خڕكەینەوە ـ بە بەستن و كۆكردنەوەـ".

**٨ـ دەم بەستن و (سَدل):**

(سَدل) دوو مانای هەیە:

١ـ جلەكانی بپێچێت بە خۆیەوە و دەستەكانی نەكات بە قۆڵەكانیدا، بەڵكو هەر لە ژێرەوە بن و هەر بەو شێوەیە كوڕنوش و سوژدە ببات.

٢ـ ئەوەیە پاڵتوو شتی لەو جۆرە بكاتە سەر شانی یا سەر سەری دەستی نەكات بە قۆڵەكانیدا.

---

١) رواه البخاري ٧١٧، ومسلم ٤٢٨، ٤٢٩.

٢) رواه مسلم ٢٩٩٤.

٣) رواه البخاري ٨١٢و مسلم ٤٩٠.

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نهى عن السَّدْلِ في الصَّلَاةِ وَأَنْ يُغَطِّيَ الرَّجُلُ فَاهُ).[١] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کرد لە (سَدل) لەو دەم هەڵبەستن لە نوێژدا".

**٩ـ پەنجە تەقاندن:**

(عن كَعْبَ بن عُجْرَةَ قال سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول: إذا تَوَضَّأَ أحدكم ثُمَّ خَرَجَ عَامِدًا إلى الْمَسْجِدِ فلا يُشَبِّكَنَّ بين يَدَيْهِ فإنه في صَلَاةٍ).[٢] کەعبی کوڕی عوجرە (ڕەزای خوای لیبێت) دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: "ئەگەر کەسێکتان دەستنوێژی گرت، پاشان ڕۆشتە دەرەوە و - بۆ مزگەوت- بە مەبەستی نوێژکردن با پەنجەکانی هەردوو دەستی نەکات بەناو یەکتریدا و نەیانتەقێنێ، چونکە ئەو کەسە لە نوێژدایە".

**١٠ـ دەست دان لە چەوو ڕێککردنی زیاتر لە جارێك:**

(عن مُعَيْقِيبٌ عنِ النبي ﷺ قال في الرَّجُلِ يُسَوِّي التُّرَابَ حَيْثُ يَسْجُدُ قال: إن كُنْتَ فَاعِلًا فَوَاحِدَةً).[٣] موعەیقیب (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ باسی دەست دان لە چەوی کرد لە مزگەوتداو فەرمووی: "جا ئەگەر هەر پێویست بوو یەك جار دەستی لێبدە و ڕێکی کە".

**١١ـ پێشکەوتن لە ئیمام:**

(عن أَبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: أَمَا يَخْشَى أحدكم أو ألا يَخْشَى أحدكم إذا رَفَعَ رَأْسَهُ قبل الْإِمَامِ أَنْ يَجْعَلَ الله رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ أو يَجْعَلَ الله صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ).[٤] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئایا کەسێ لە ئێوە ناترسێ ئەگەر سەری بەرزکاتەوە پێش لە ئیمام خوا سەری بکات بەسەری کەر یا خوا شێوەی بگۆڕێت بۆ شێوەی کەر".

---

١) رواه ابوداود ٦٤٣ حديث صحيح.

٢) رواه أحمد ٢٤١/٤، وابوداود ٥٦٢، والترمذي ٣٨٦، حديث صحيح.

٣) رواه البخاري ١٢٠٧ ومسلم ٥٤٦ وأحمد ٤٢٦/٣.

٤) رواه البخاري ٦٩١ ومسلم ٤٢٧.

**١٢ـ هەردوو باسکی لە کاتی سوژدەدا بخاتە سەر زەوی:**

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ عن النبي ﷺ قال اعْتَدِلُوا في السُّجُودِ ولا يَبْسُطْ أحدكم ذِرَاعَيْهِ انْبِسَاطَ الْكَلْبِ).[١] ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ڕێكو ڕاست بن لە سوژدەدا باسکتان ڕامەخەن بەسەر زەویدا وەك دەست دانانی سەگ".

**١٣ـ دانانی ئەژنۆکان پێش دەستەکان لە چوون بۆ سوژدە:**

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا سَجَدَ أحدكم فلا يَبْرُكْ كما يَبْرُكُ الْبَعِيرُ وَلْيَضَعْ يَدَيْهِ قبل رُكْبَتَيْهِ).[٢] ئەبوهورەیەرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەگەر کەسێکتان سوژدەی برد وەك وشتر دانەنوێتەوە ئەژنۆکانی پێش دەستەکانی دادەنێ، بەڵکو دەستەکانی پێش ئەژنۆکانی دانێ".

**١٤ـ سەیرکردنی شتێ بێ ئاگای بکات:**

(عن عَائِشَةَ أَنَّ النبي ﷺ صلى في خَمِيصَةٍ لها أَعْلَامٌ فَنَظَرَ إلى أَعْلَامِهَا نَظْرَةً فلما انْصَرَفَ قال: اذْهَبُوا بِخَمِيصَتِي هذه إلى أبي جَهْمٍ وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّةِ أبي جَهْمٍ فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِي آنِفًا عن صَلَاتِي).[٣] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە جلێکی خەت خەتەوە نوێژی کرد، جا لە نوێژەکەیدا سەیرێکی خەتەکانی کرد کاتێ لە نوێژەکەی بوویەوە فەرمووی: "ئەم جلوبەرگەم ببەم بۆ ئەبوجەهمو کراسە ئەنبیجانییە سادەکەی ئەو بێنن بۆ من، چونکە ئەم جلە خەتخەتە خەریکی کردم و نەیهێشت دلّم لای نوێژەکەم بێت".

---

١) رواه البخاري ٨٢٢ ومسلم ٤٩٣.

٢) رواه أبوداود ٨٤٠ ومسلم ٢٠٧ حديث صحيح.

٣) رواه البخاري ٣٧٣ ومسلم ٥٥٦.

# ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە

**١ـ قسەکردن بە ئەنقەست:** جگە لە قورئان خوێندن و دوعا و زیکرەکان هەر قسەیەك کە پەیوەندی بە نوێژەوە نەبێ نوێژ بەتاڵ ئەکاتەوە.
(عن زَيْدِ بن أَرْقَمَ قال كنا نَتَكَلَّمُ في الصَّلَاةِ يُكَلِّمُ أَحَدُنَا أَخَاهُ في حَاجَتِهِ حتى نَزَلَتْ هذه الْآيَةُ (حَافِظُوا على الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ) فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ).[1] زەیدی کوڕی ئەرقەم (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: ئێمە لە سەرەتادا لە کاتی نوێژکردن لەگەڵ یەکتردا قسەمان دەکرد هەتا ئەم ئایەتە دابەزی: (حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ) (البقرة: ٢٣٨)، ئیتر فەرمانمان پێ کرا بەبێ دەنگی لە نوێژدا.
(عن مُعَاوِيَةَ بن الْحَكَمِ السُّلَمِيِّ رضي الله عنه أنّ النبي ﷺ قال له. وقد شمت عاطسا في صلاته: إِنَّ هذه الصَّلَاةَ لَا يَصْلُحُ فيها شَيْءٌ من كَلَامِ الناس إنما هو التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ).[2] موعاوییەی کوڕی حەکەمی سولەمی (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: لە نوێژی جەماعەتدا کابرایەك پژمی منیش پێم وت: (یَرحمك الله) پێغەمبەر ﷺ پێی وتم: "ئەم نوێژە نابێ هیچێك لە قسەی مرۆڤەکانی تێدا بێت، بەڵکو تەنها بریتییە لە (سبحان الله و الله أكبر) و قورئان خوێندن".

**٢ـ جوڵانی زۆر:** مەبەست پێی جوڵانی پێچەوانەی جوڵانەکانی نوێژە بە مەرجێ زۆر بێ و لەسەر یەك بکرێت، چونکە ئەو زۆر جوڵانە لەگەڵ یاسای نوێژدا پێچەوانەیە، بە بەڵگەی فەرموودەکەی موعەیقیب، (عن مُعَيْقِيبٌ عنِ النبي ﷺ قال في الرَّجُلِ يُسَوِّي التُّرَابَ حَيْثُ يَسْجُدُ قال: إن كُنْتَ فَاعِلًا فَوَاحِدَةً).[3] کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "جا ئەگەر هەر پێویست بوو با یەك جار بێت ـ دەست دان لە چەوی ناو مزگەوت ـ ".

---

١) رواه البخاري ٤٢٦٠ ومسلم ٥٣٩.

٢) رواه مسلم ٥٣٧.

٣) رواه البخاري ١٢٠٧ ومسلم ٥٤٦ واحمد ٤٢٦/٣.

**٣- خواردن و خواردنەوە:** چونکە هەردووکیان لەگەڵ نوێژکردن ناگونجێن و پێچەوانەن.

**٤- دەرکەوتنی عەورەت:** پێشتر باسی عەورەتی پیاو و ئافرەتمان کرد بە بەڵگەوە. جا ئەگەر نوێژگەر خۆی عەورەتی دەرخست بە ئەنقەست ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر خۆی دەرکەوت و زوو داپۆشییەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، ئەگەر زوو داینەپۆشییەوە بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە یەکێك لە مەرجەکانی نوێژ نەماوە، بۆیە ئەو نوێژە بەتاڵ دەبێتەوە.

**٥- دەست نوێژ شکان بە دڵنیاییەوە:**

(عن عَبَّادِ بن تَمِيمٍ عن عَمِّهِ أَنَّهُ شَكَا إلى رسول اللَّهِ ﷺ الرَّجُلُ الذي يُخَيَّلُ إليه أَنَّهُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلَاةِ فقال لَا يَنْفَتِلْ أولا يَنْصَرِفْ حتى يَسْمَعَ صَوْتًا أو يَجِدَ رِيحًا).[١] عەببادی کوڕی تەمیم لە مامییەوە دەگێڕێتەوە کە وتی: پیاوێ بە پێغەمبەری ﷺ وت: "مرۆڤ لە نوێژدا وا دەزانێ دەست نوێژی شکاوە؟ فەرمووی: نوێژەکەی وازلێنەهێنێ و نەیبڕێت تا گوێی لە دەنگ نەبێت یان بۆن نەبیستێ".

**٦- پێکەنین:** (قال إبن المنذر: وأجمعوا على أن الضحك يفسد الصلاة).[٢] ئین مونزیر دەڵێ: زانایان یەك دەنگن کە پێکەنین نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە.

١) رواه البخاري ١٣٧ ومسلم ٣٦١.

٢) الإجماع ص٤٠، رقم ٤٨.

# ســوژدەکان

## سوژەی هەڵەکردن حوکمەکەی و هۆکارەکانی

**یەکەم: حوکمی سوژدەی هەڵەکردن:** سوننەتە لە کاتی ڕوودانی هۆیەك لە هۆیەکانی کە دواتر باسیان دەکەین خۆ ئەگەر سوژدەش نەبات نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، سوژدەی هەڵەکردن واجب نییە، چونکە لە بری نەکردنی واجبێك دانەنراوە.

بەڵگەی سوژدەی هەڵەکردن:

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال صلى بِنَا النبي ﷺ الظُّهْرَ أو الْعَصْرَ فَسَلَّمَ فقال له ذُو الْيَدَيْنِ الصَّلَاةُ يا رَسُولَ اللَّهِ أَنَقَصَتْ ؟ فقال النبي ﷺ لِأَصْحَابِهِ أَحَقٌّ ما يقول قالوا نعم فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ أُخْرَيَيْنِ ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ).[1] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە دەڵێت: "پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆ یا عەسری بۆ کردین و سەلامی دایەوە (ذو الیدین)[2] وتی: بە پێغەمبەر ﷺ نوێژ کورت بووەتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەوەی دەیلێی وایە ڕاستە؟" هاوەڵان وتیان: بەڵێ ڕاستە، جا دوو ڕکاتی تر نوێژی کرد و پاشان دوو سوژدەی برد".

**دووەم: هۆیەکانی سوژدەی هەڵەکردن:**

**أ ـ ئەگەر نوێژگەر یەکێك لەو سوننەتانە نەکات کە پێی دەڵێن (أبعاض) وەك تەحیاتی یەکەم یا قنوت:**

(عن عبد اللَّهِ بن بُحَيْنَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ قال صلى لنا رسول اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ من بَعْضِ الصَّلَوَاتِ ثُمَّ قام فلم يَجْلِسْ فَقَامَ الناس معه فلما قَضَى صَلَاتَهُ وَنَظَرْنَا تَسْلِيمَهُ كَبَّرَ قبل التَّسْلِيمِ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وهو جَالِسٌ ثُمَّ سَلَّمَ).[3] عەبدوڵڵای کوڕی ئیبن بوحینە (ڕەزای خوای لێبێت)

---

١) رواه البخاري ١٢٢٧.

٢) (ذوالیدین) پیاوێك بوو لە هاوەڵان دەستەکانی درێژبوون، بۆیە پێیان دەوت (ذوالیدین) بڕوانە (صحیح البخاري حدیث ٤٨٢).

٣) رواه البخاري ٨٢٩ ومسلم ٥٧٠.

دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ لە نوێژێكدا دوو ركات پێشنوێژی بۆ كردین، لە ریوایەتێكدا دەڵێ: لە دووەم ركاتی نیوەڕۆ هەڵسایەوەو تەحیاتی نەخوێند خەڵكیش لەگەڵیدا هەڵسانەوە، جا كە لە نوێژەكەی بوویەوە چاوەڕوانی سەلامدانەوەی بووین (ألله أكبر)ی كرد و دوو سوژدەی برد بە دانیشتنەوە، پاشان سەلامی دایەوە" لە فەرموودەدا پێغەمبەر ﷺ تەحیاتی یەكەمی نەخوێند لە جیاتیدا دوو سوجدەی برد پێش سەلامدانەوە.

**ب ـ گومان بوون لە ژمارەی ركاتەكان:**

دەبێت ژمارە كەمەكەیان دابنێت، پاشان نوێژەكەی تەواو بكات ئەگەر لە نێوان سێ ركات و چوار ركاتدا گومانی هەبوو و هێشتا لە نوێژەكەدا بوو ئەوە دادەنێ سێ ركاتی كردووە و ركاتی چوارەمیش دەكات، پاشان سوژدەی لە بیرچوو دەبات.

(عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا شَكَّ أحدكم في صَلَاتِهِ فلم يَدْرِ كَمْ صلى ثَلَاثًا أَمْ أَرْبَعًا فَلْيَطْرَحْ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ على ما اسْتَيْقَنَ ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ قبل أَنْ يُسَلِّمَ فَإِنْ كان صلى خَمْسًا شَفَعْنَ له صَلَاتَهُ وَإِنْ كان صلى إِتْمَامًا لِأَرْبَعٍ كَانَتَا تَرْغِيمًا لِلشَّيْطَانِ).[١] ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "ئەگەر كەسێكتان لە نوێژەكەیدا گومانی بۆ دروست بوو، نەیزانی سێ ركاتی كردووە، یا چوار، ئەوە با گومانەكەی فڕێدا و كار بەوە بكات گومانی لێی نییە، پاشان دوو سوژدە ببات پێش ئەوەی سەلام بداتەوە، جا ئەگەر پێنج ركاتی كردبێ ئەوە ژمارەی ركاتەكان جووت دەبن، خۆ ئەگەر ركاتی چوارەمی تەواو كردبێ ئەوە لووتی شەیتانی پێدەتەوسێتەوە".

**ج ـ سوژدەی هەڵەكردن پێش سەلامدانەوە لە دوو شوێندایە:**

١ـ ئەگەر ركاتی كەمی كردبێ: (عن عبد اللَّهِ بن بُحَيْنَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ قال إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قام من اثْنَتَيْنِ من الظُّهْرِ لم يَجْلِسْ بَيْنَهُمَا فلما قَضَى صَلَاتَهُ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ بَعْدَ ذلك).[٢] عەبدوڵلای كوڕی ئیبن بوحەینە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ركاتی

---

١) رواه مسلم ٥٧١.

٢) رواه البخاري ٨٢٩، ومسلم ٥٧٠.

دووەمی نیوەڕۆ هەستایەوە و دانەنیشت ئەنجا کە نوێژەکەی تەواو کرد دوو سوژدەی برد، پاشان سەلامی دایەوە".

٢ـ ئەگەر گومان هەبوو: (عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا شَكَّ أحدكم في صَلَاتِهِ فلم يَدْرِ كَمْ صلى ثَلَاثًا أَمْ أَرْبَعًا فَلْيَطْرَحْ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ على ما اسْتَيْقَنَ ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ قبل أَنْ يُسَلِّمَ فَإِنْ كان صلى خَمْسًا شَفَعْنَ له صَلَاتَهُ وَإِنْ كان صلى إِتْمَامًا لِأَرْبَعٍ كَانَتَا تَرْغِيمًا لِلشَّيْطَانِ).[١] ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەگەر کەسێکتان لە نوێژەکەیدا گومانی بۆ دروست بوو نەیزانی سێ ڕکاتی کردووە یا چوار، ئەوە با گومانەکەی فڕێدا و کار بەوە بکات گومانی لێی نییە، پاشان دوو سوژدە ببات پێش ئەوەی سەلام بداتەوە، جا ئەگەر پێنج ڕکاتی کردبێ ئەوە دەبنە جووت ، خۆ ئەگەر ڕکاتی چوارەمی تەواو کردبێ ئەوە هەردووکیان لووتی شەیتانیان پێ ئەتەوسێتەوە".

**د ـ سوژدەی هەڵەکردن دوای سەلامدانەوە لە دوو شوێندا:**

١ـ ئەگەر ڕکاتی زیادی کردبێ: (عن عبد اللَّهِ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صلى الظُّهْرَ خَمْسًا فَقِيلَ له أَزِيدَ في الصَّلَاةِ فقال وما ذَاكَ قلل صَلَّيْتَ خَمْسًا فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَ ما سَلَّمَ).[٢] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆدا پێنج ڕکاتی کرد پێی وترا: ئایا نوێژ زیاد کراوە؟ فەرمووی: "بۆچی"؟ ووتی: پێنج ڕکاتت کرد، جا دوو سوژدەی برد پاش ئەوەی سەلامی دایەوە".

٢ـ ئەگەر گومانی هەبوو، بەڵام لایەکیان پارسەنگ بوو:

(عن عبد اللَّهِ بن مسعود رضي الله عنه أن رسول اللَّهِ ﷺ قال: وإذا شَكَّ أحدكم في صَلَاتِهِ فَلْيَتَحَرَّ الصَّوَابَ فَلْيُتِمَّ عليه ثُمَّ لِيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ).[٣] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "ئەگەر کەسێکتان گومانی بۆ دروست بوو لە

---

١) رواه مسلم ٥٧١ واحمد ٣/ ٧٢.

٢) رواه البخاري ١٢٢٦ ومسلم ٥٧٢

٣) رواه البخاري ٤٠١ ومسلم ٥٧٢/٨٩.

کاتی نوێژەکەیدا با بگەڕێت بە شوێن ڕاستییدا، جا نوێژەکەی بەو پێیە تەواو بکات پاشان سەلام بداتەوە و ئەنجا دوو سوژدەی هەڵەکردن ببات".

**هـ ـ سوژدەی هەڵەکردن لەگەڵ (الله اکبر)ی دەست پێکردن و سەلامدانەوە:**

(عن ابن سِيرِينَ عن أبي هُرَيْرَةَ قال صلى بِنَا رسول اللَّهِ ﷺ إِحْدَى صَلَاتَيْ الْعَشِيِّ قال بن سِيرِينَ سَمَّاهَا أبو هُرَيْرَةَ وَلَكِنْ نَسِيتُ أنا قال فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ فَقَامَ إلى خَشَبَةٍ مَعْرُوضَةٍ في الْمَسْجِدِ فَاتَّكَأَ عليها كَأَنَّه غَضْبَانُ وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى على الْيُسْرَى وَشَبَّكَ بين أَصَابِعِهِ وَوَضَعَ خَدَّهُ الْأَيْمَنَ على ظَهْرِ كَفِّهِ الْيُسْرَى وَخَرَجَتْ السَّرَعَانُ من أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ فَقَالُوا قَصُرَتْ الصَّلَاةُ وفي الْقَوْمِ أبو بَكْرٍ وَعُمَرُ فَهَابَا أَنْ يُكَلِّمَاهُ وفي الْقَوْمِ رَجُلٌ في يَدَيْهِ طُولٌ يُقَالُ له ذُو الْيَدَيْنِ قال يا رَسُولَ اللَّهِ أَنَسِيتَ أَمْ قَصُرَتْ الصَّلَاةُ قال لم أَنْسَ و لم تُقْصَرْ فقال أَكَمَا يقول ذُو الْيَدَيْنِ فَقَالُوا نعم فَتَقَدَّمَ فَصَلَّى ما تَرَكَ ثُمَّ سَلَّمَ ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أو أَطْوَلَ ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أو أَطْوَلَ ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ فَرُبَّمَا سَأَلُوهُ ثُمَّ سَلَّمَ فيقول نُبِّئْتُ أَنَّ عِمْرَانَ بن حُصَيْنٍ قال ثُمَّ سَلَّمَ).[1] ئیبن سیرین لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ جارێك نوێژی نیوەڕۆ یا عەسر بوو دوو ركات نوێژی كرد و سەلامی دایەوە، هەڵسا ڕۆیشت بۆ لای ئەو تەختەدارەی لە مزگەوتدا بوو شانی لەسەر دادا وەك ئەوەی توڕە بوویێت وابوو، دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دانا بوو، پەنجەكانی هەردوو دەستی كردبوو بەناو یەكتریدا ڕوومەتی خستبوویە سەر پشتی دەستی چەپی ئەوانەی پەلەی چوونە دەرەوەیان بوو لە دەرگاكانی مزگەوتەوە چوونە دەرەوە، وتیان نوێژ كورت بۆتەوە؟ ئەبوبەكرو عومەر لە ناو خەڵكەكەدا بوون نەیانوێرا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ قسە بكەن، لەناو خەڵكەكەدا پیاوێكی دەست درێژی تیابوو، پێیان دەووت دەستدرێژەكە، وتی ئەی پێغەمبەری خوا لە بیرت چوو یان نوێژ كورت بۆتەوە؟ فەرمووی: "لە بیرم نەچووە و نوێژیش كورت نەبۆتەوە" فەرمووی: "ئەوی (ذوالیدین) دەیڵێ وایە؟" وتیان بەڵێ وایە، ئەنجا پێ خەڵكەكە كەوت و ئەو دوو ركاتەی لەبیری چوو بوو كردی، پاشان سەلامی دایەوە ئەنجا (الله اكبر)ی كرد

١) رواه البخاري، ٤٨٢، ٦٠٥١، ومسلم ٥٧٣/٩٧.

و سوژدەیەکی وەك سوژدەی نوێژەکە بگرە درێژتری برد، پاشان سەری بەرزکردنەوە و (الله اکبر)ی کرد، پاشان (الله اکبر)ی کردو سوژدەیەکی وەك یەکەم بگرە درێژتری بردەوە لە پاشان سەری بەرزکردەوەو (الله اکبر)ی کرد، پاشان سەلامی دایەوە".

و ـ ئەگەر پێشنوێژ سوژدەی هەڵەکردنی برد پێویستە نوێژگەرانیش ببەن:

(عن أبي هُرَيْرَةَ عن النبي ﷺ أَنَّهُ قال إنما جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ فلا تَخْتَلِفُوا عليه....).[1] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: "پێش نوێژ دانراوە بۆ ئەوە شوێنی بکەون کەواتە جیاواز مەبن لەگەڵیدا..".

## سوژدەی قورئان خوێندن

### ١ـ سوژدەکانی قورئان سوننەتن:

کاتێ قورئان خوێن دەگاتە ئەو ئایەتانەی سوژدەیان تێدایە سوونەتە سوژدە ببات لە کاتی نوێژدا بێت یان لە دەرەوی نوێژدا بێت، هەروەها بۆ ئەو کەسەش گوێی لێیە سوننەتە سوژدە ببات.

(عن عبدالله بن عُمَرَ رضي الله عنهما قال كان النبي ﷺ يَقْرَأُ عَلَيْنَا السُّورَةَ فيها السَّجْدَةُ فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ حتى ما يَجِدُ أَحَدُنَا مَوْضِعَ جَبْهَتِهِ).[2] عەبدوڵلا کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ قورئانی بۆ دەخوێندن سوژدەی تێدا بوو، خۆی سوژدەی دەبرد و ئێمەش سوژدەمان دەبرد بە جۆرێ هەندێکمان شوێنی سوژدە بردنی نەدەبوو". لەبەر زۆری سوژدە بەرەکات.

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا قَرَأَ بن آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي يقول يا وَيْلَهُ وفي رِوَايَةِ أبي كُرَيْبٍ يا وَيْلِي أُمِرَ بن آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ فَلِي النَّارُ).[3] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: فەرمووی:

---

١) رواه البخاري ٧٢٢ ومسلم ٤١٤.

٢) رواه البخاري ١٠٧٥ ومسلم ٥٧٥.

٣) رواه مسلم ٨١.

"کاتێ کەسێ ئایەتێکی سوژدە دەخوێنێ و سوژدە دەبات شەیتان کەنار دەگرێ دەگری و دەڵێ: هاوارو داماوی بۆ ئەو نەوەی ئادەم فەرمانی پێ کرا بە سودە بردن سوژدەی برد و بەهەشتی پاداشتییەتی، بەڵام من فەرمانم پێکرا بە سوژدەبردن سەرپێچیم کرد و تۆڵەم ئاگری دۆزەخە".

(عن عُمَرَ بن الْخَطَّابِ رضي الله عنه قال: يا أَيُّهَا الناس إِنَّا نَمُرُّ بِالسُّجُودِ فَمَنْ سَجَدَ فَقَدْ أَصَابَ وَمَنْ لم يَسْجُدْ فلا إِثْمَ عليه).[1] لە عومەرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "ئەی خەڵکینە ئێمە ئایەتێ سوژدەی تیابێت دەیخوێننەوە ئەوەی سوژدەی برد ئەو پێکاوێتی ـ سوننەتی بەجێهێناوە ـ ئەوەش سوژدە نەبات هیچ تاوانێکی لەسەر نییە".

**٢ـ ژمارەی سوژدەکان لە قورئاندا:**

سوژدەکانی قورئان خوێندن لە قورئاندا چواردە سوژدەیە لەم سورەتانەدایە: "الاعراف، الرعد، النحل، الاسراء، مريم، الحج (دوو سوژدەی تێدایە)، الفرقان، النمل، ألم تنزيل، حم، السجدة، النجم، الانشقاق، العلق" هەموو ئەم سوورەتانەی‌ـ یەکی یەك سوژدەیان تێدایە تەنها سورەتی حەج دوو سوژدەی تێدایە.

**٣ـ گەورەی سوژدەی قورئان خوێندن:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا قَرَأَ بن آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي يقول يا وَيْلَهُ وفي رِوَايَةِ أبي كُرَيْبٍ يا وَيْلِي أُمِرَ بن آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ فَلِي النَّارُ).[2] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "کاتی مرۆڤێك ئایەتێك بخوێنێ سوژدەی تێدابێ‌و سوژدە ببات شەیتان دووردەکەوێتەوە دەگری و دەڵێ: ئای هاوارو داماوی بۆ ئەو" لە ریوایەتی ئەبی کورەیبدا دەڵێ: "ئای هاوار بۆ من" مرۆڤ فەرمانی پێکرا بە سوژدە بردن و سوژدەی برد و بەهەشت پاداشتییەتی، بەڵام من فەرمانم پێکرا بە سوژدە بردن نەمبرد و تۆڵەم ئاگری دۆزەخە".

---

١) رواه البخاري ١٠٢٧.

٢) رواه مسلم ٨١/١٣٣.

**٤ـ لە سوژدەی قورئان خوێندندا چی دەڵێی:**

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت كان رسول اللَّهِ ﷺ يقول في سُجُودِ الْقُرْآنِ بِاللَّيْلِ يقول في السَّجْدَةِ مِرَارًا سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ).[1] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ لە کاتی سوژدەی قورئان خوێندن لە شەودا چەند جار دەیــفەرموو:

"سَجَدَ وجهي للذي خلقه وشقَّ سَمعَه وبَصَرهُ بحولِه وقوّته".

(عن ابن عَبَّاسٍ قال كنت عِنْدَ النبي ﷺ فَأَتَاهُ رَجُلٌ فقال إني رأيت الْبَارِحَةَ فِيمَا يري النَّائِمُ كَأَنِّي أُصَلِّي إلى أَصْلِ شَجَرَةٍ فَقَرَأْتُ السَّجْدَةَ فَسَجَدْتُ فَسَجَدَتْ الشَّجَرَةُ لِسُجُودِي فَسَمِعْتُهَا تَقُولُ اللهم احْطُطْ عَنِّي بها وِزْرًا وَاكْتُبْ لي بها أَجْرًا وَاجْعَلْهَا لي عِنْدَكَ ذُخْرًا قال ابن عَبَّاسٍ فَرَأَيْتُ النبي ﷺ قَرَأَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ فَسَمِعْتُهُ يقول في سُجُودِهِ مِثْلَ الذي أخبره الرَّجُلُ عن قَوْلِ الشَّجَرَةِ).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووم پیاوێك هات بۆ خزمەتی وتی: دوێنێ خەوێکم بینی لە خەومدا نوێژ دەکەم ڕوو بە بنی درەختێك ئایەتێکم خوێند سوژدەی تیابوو منیش سوجدەم برد درەختەکەش سوژدەی برد بە هۆی سوژدەکەی منە گوێم لێ بوو دەیووت: "اللہ احطط بها عني وِزراً، واكتب لي بها أجراً واجعلها لي عندك ذُخراً"، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ پێغەمبەرم ﷺ بینی ئایەتی سوژدەی خوێندو سوژدەی برد لە سوژدەکەیدا وێنەی ئەو دوعایەی دەخوێند کە پیاوەکە لە زمانی درەختەکەوە بۆی گێڕایەوە".

**٥ـ حوکمی سوژدە قورئان خوێندن:**

بەلای جەماوەری زانایانەوە سوژدەی قورئان خوێندن سوننەتە ئەوەی بۆ نوێژ مەرجە لە دەست نوێژ و شتانی تر بۆ سودەی قورئان خوێندن مەرج نییە. موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی صەنعانی ـ خاوەنی کتێبی سبل السلام ـ دەڵێ: "ئەصل وایە بوونی دەست نوێژ مەرج نییە بۆ سوژدەی قورئان خوێندن بە بەڵگە نەبێت، بەڵگەی واجب بوونی دەست نوێژیش دەربارەی

---

١) رواه احمد ٢١٧/٦ وابوداود ١٤١٤ والترمذي ٥٨٠ والنسائي ٢٢٢/٢ حديث صحيح.

٢) رواه الترمذي ٥٧٩ وابن ماجة ١٠٥٣ حديث حسن.

نوێژکردن هاتووە سوژدەش بە تەنها پێی ناوترێت نوێژ، ئەوە بەڵگەیە لە دژی ئەوەی دەست نوێژی بە مەرج گرتووە بۆ سوژدەی قورئان خوێندن، وە ئەو کاتانەش نوێژ تیایاندا کەراهەتی هەیە و رێگری کراوە لە نوێژکردن تیایاندا سوژدە بە تەنها ناگرێتەوەو دروستە سوژدەی تێدا ببرێت بۆ قورئان خوێندن"[١].

ئیبن حەزم دەڵێ: "سوژدەی قورئان خوێندن فەرز نییە، بەڵام پاداشتی گەورەیە، لە نوێژی فەرز و سوننەتداو لە دەرەوەی نوێژدا سوژدەی قورئان خوێندن دەبرێت لە هەر کاتێکدا بێت لە کاتی هەڵهاتنی خۆر یا ئاوابوونی و لە ناوەڕاستی ئاسماندا، روو بە قیبلە بێت یان نا دەست نوێژت هەبێت یا نەبێت دروستە سوژدە ببەیت"[٢].

## سوژدەی شوکر

سوننەتە ئەگەر مرۆڤ خوا چاکە و نیعمەتیکی پێدا یا خراپەو ناڕەحەتییەکی لەسەر لابرد یا موژدەیەکی خۆشی پێدرا سەر بخاتە سەر زەوی سوژدە بۆ خوای گەورە ببات، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە. (عن أبي بَكْرَةَ أَنَّ النبي ﷺ كان إذا أَتَاهُ أَمْرٌ يَسُرُّهُ أو يسر بِهِ خَرَّ سَاجِدًا شُكْرًا لِلَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى).[٣] ئەبوبەکرە (رەزای خوای لێبێت) کە دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ ئەگەر کارێکی بۆ بهاتایەتە پێشەوە پێی خۆش بوایە یا موژدەیەکی خۆشی پێ بدرایە سوژدەی شوکری دەبرد بۆ خوای گەورە".

(عن عبد الرحمن بن عوف : أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال : إني لقيت جبرئيل عليه السلام فبشرني و قال : إن ربك يقول : من صلى عليك صليت عليه و من سلم عليك سلمت عليه فسجدت لله شكرا).[٤]

---

١) سبل السلام ٢/٣٧٩.

٢) المحلى ٥/١٠٦

٣) رواه أبوداود ٢٧٧٤ والترمذي ١٥٧٨ وابن ماجة ١٣٩٤ حديث حسن.

٤) رواه أحمد ٢٧٧٤، والحاكم ١/٢٢٢ـ ٢٢٣ رقم ٢٠١٩ وصححه الحاكم ووافقه الذهبي، صحيـح بشواهده.

وە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بە خزمەت جیبرەئیل گەشتم (علیه سلام) مژدەی پێدام و فەرمووی : بێگومان پەروەردگارت دەفەرموێ:هەرکەس سڵاوات بدات لەسەرت من سڵاوات لەسەر ئەو کەسە دەدەم و لێ ی خۆش دەبم وە هەرکەس سەلامت لێ بکات من سەلامی لێ دەکەم ئیتر منیش سوژدەی شوکرم برد بۆ خوای گەورە).

(عن براء بن عازب رضي الله عنه أن النبي ﷺ بعث عليا الى اليمن ــ فذكر الحديث ــ قال فكتب علي بإسلامهم، فلما قرأ رسول الله ﷺ الكتاب خرّ ساجدا شكرا لله تعلى على ذلك).[١] بەڕائی کوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ عەلی نارد بۆ یەمەن، دەڵێ جا عەلی نامەی نووسی بۆ پێغەمبەر ﷺ کە خەڵکەکە موسڵمان بوون، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ نامەکەی خوێندەوە یەکسەر سوژدەی شوکری برد بۆ خوای گەورە بەو هۆیەوە".

حوکمی سوژدەی شوکر هەروەك حوکمی سوژدەی قورئان خوێندن وایە بێ جیاوازی.

---

١) رواه البيهقي في السنن الكبرى ٣٦٩/٢ أصله في صحيح البخاري ٤٠٩٢.

# نوێژی جەماعەت

**یەکەم: مێژووی کردنی:**

پێغەمبەر ﷺ نوێژی بە جەماعەت کرد پاش کۆچکردنی بۆ مەدینە، ماوەی سیانزە ساڵ کە لە مەککەدا بوو نوێژ بە جەماعەت نەدەکرد، چونکە موسڵمانان بێدەسەڵات و ژێر دەستە بوون لە ماڵ خۆیاندا نوێژیان دەکرد، تا ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە ئیتر نوێژی بە جەماعەت کردو بەردەوام بوو لە سەری تا وەفاتی کرد.

**دووەم: حوکمی نوێژی جەماعەت:**

١ـ فەرموودەکان لەو بارەیەوە هاتوون واجب بوونی جەماعەت دەگەیەنن:

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ ان أَثْقَلَ الصَّلاَةِ على الْمُنَافِقِينَ صَلاَةُ الْعِشَاءِ الآخِرَةِ وَصَلاَةُ الْفَجْرِ وَلَوْ يَعْلَمُونَ ما فِيهِمَا لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْواً لقد هَمَمْتُ ان آمُرَ بِالصَّلاَةِ فَتُقَامَ ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً يصلي بِالنَّاسِ ثُمَّ آخُذَ حُزَماً من حَطَبٍ فَآتِيَ الَّذِينَ تَخَلَّفُوا عَنِ الصَّلاَةِ فاحرق عليهم بُيُوتَهُمْ).[1] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "گرانترین و قورسترین نوێژ بەلای دووڕووەکانەوە نوێژی عیشاو نوێژی بەیانییە، ئەگەر بیانزانییایە چ پاداشتێکیان تێدایە ئامادەی ئەو دوو نوێژە دەبوون با بە گاگۆڵکێش بوایە، بە ڕاستی هات بە دڵمدا فەرمان بکەم کە قامەت بکەن بۆ نوێژ و فەرمان بکەم پیاوێك پێش نوێژییان بۆ بکات، پاشان لەگەڵ چەند پیاوێکدا چەند باوەشە داریان پێ بێت بڕۆم بۆ سەر ئەوانەی نایەن بۆ نوێژ ـ ی جەماعەت ـ خانووەکانیان بەسەردا بسووتێنم".

(عن عبد اللَّهِ بن مسعود رضي الله عنه قال: وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وما يَتَخَلَّفُ عنها إلا مُنَافِقٌ مَعْلُومُ النِّفَاقِ وَلَقَدْ كان الرَّجُلُ يؤتي بِهِ يُهَادَى بين الرَّجُلَيْنِ حتى يُقَامَ في الصَّفِّ).[2] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "بێگومان هاوەڵانت دەبینی کەس دوانەدەکەوت لە نوێژی

---

١) رواه مسلم ٢٥٢/ ٦٥١ والبخاري ٦٥٧ واحمد ٣٦٧/٢.

٢) رواه مسلم ٢٥٦/ ٦٥٤ واحمد ٣٨٢/١ وابوداود ٥٥٠ والنسائي ١٠٨/٢ وابن ماجة ٧٧٧.

جەماعەت مەگەر دوو ڕوویەك کە دووڕوویەکەی ئاشکرا بوو و پیاو هەبوو خۆ دەدا بەسەر دوو کەسدا ـ ئەوەندە ناساغ بوو ـ دەیان هێنا تا لە ریزی جەماعەتدا دەوەستێنرا".

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال أتى النبي ﷺ رَجُلٌ أَعْمَى فقال يا رَسُولَ اللَّهِ إنه ليس لي قَائِدٌ يَقُودُنِي إلى الْمَسْجِدِ فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُرَخِّصَ له فَيُصَلِّيَ في بَيْتِهِ فَرَخَّصَ له فلما وَلَّى دَعَاهُ فقال هل تَسْمَعُ النِّدَاءَ بِالصَّلَاةِ فقال نعم قال فَأَجِبْ).[1] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پیاوێکی کوێر وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەس نییە دەستم بگرێ بمهێنێ بۆ مزگەوت، داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد ڕێگەی بدات لە ماڵەوە نوێژ بکات، ئەویش ڕێگەی دا، بەڵام کاتێ ڕۆشت، بانگی کردو فەرمووی: "ئایا گوێت لە بانگە؟" وتی: بەڵێ، فەرمووی: "وەڵامی بدەرەوەو وەرە بۆ مزگەوت".

٢ـ ئەو فەرموودانەی نوێژی جەماعەت لە واجبیەوە دەگۆڕن بۆ سوننەت:

(عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ على صَلَاةِ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ درجه).[2] عەبدوڵلا کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "نوێژی جەماعەت بیستو حەوت پلە لە نوێژی تاكو تەنیا گەورەترە".

(عن مَحْمُودِ بن الرَّبِيعِ الْأَنْصَارِيِّ أَنَّ عِتْبَانَ بن مَالِكٍ كان يَؤُمُّ قَوْمَهُ وهو أَعْمَى وَأَنَّهُ قال لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ يا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهَا تَكُونُ الظُّلْمَةُ وَالسَّيْلُ وأنا رَجُلٌ ضَرِيرُ الْبَصَرِ فَصَلِّ يا رَسُولَ اللَّهِ في بَيْتِي مَكَانًا أَتَّخِذُهُ مُصَلًّى فَجَاءَهُ رسول اللَّهِ ﷺ فقال أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ فَأَشَارَ إلى مَكَانٍ من الْبَيْتِ فَصَلَّى فيه رسول اللَّهِ ﷺ).[3] مەحمودی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "عیتبانی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) پیاوێکی کوێر بوو پێش نوێژی دەکرد بۆ هۆزەکەی، ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جاری وا هەیە تاریکیو لافاوە، منیش پیاوێکی کوێرم ـ ناتاوانم بێم بۆ مزگەوت ـ لە شوێنێکی ماڵەکەمدا نوێژ بکە با بیکەم بە نوێژگە،

١) رواه مسلم ٦٥٣ والنسائي ١٠٩/٢.

٢) رواه البخاري ٦٤٥ ومسلم ٦٥٠ واحمد ١١٢/٢.

٣) رواه البخاري ٦٦٧ ومسلم ٣٣/٥٤.

پێغەمبەریش ﷺ هات بۆ ماڵیان فەرموی: "حەز ئەکەیت لە کوێدا نوێژ بکەم؟" ئەویش ئاماژەی کرد بۆ جێگایەك لە ماڵەکەیدا و پێغەمبەر ﷺ نوێژی تێدا کرد".

(عن أبي مُوسَى قال قال النبي ﷺ أَعْظَمُ الناس أَجْرًا في الصَّلَاةِ أَبْعَدُهُمْ فَأَبْعَدُهُمْ مَمْشًى وَالَّذِي يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ حتى يُصَلِّيَهَا مع الْإِمَامِ أَعْظَمُ أَجْرًا من الذي يُصَلِّي ثُمَّ يَنَامُ).[١] ئەبوموسا (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەو کەسە لە نوێژدا پاداشتی گەورەترە لە دورترەوە بێت، ئەنجا ئەو کەسەی چاوەڕوانی نوێژ دەکات هەتا لەگەڵ ئیمامدا بیکات ـ بە جەماعەت ـ پاداشتی گەورەترە لەو کەسەی بە تەنها نوێژەکەی دەکات، پاشان دەخەوێت".

نوێژی جەماعەت لە سوننەتە گەورەکانە کە پێغەمبەر ﷺ زۆر بایەخی پێداوە، گەورەترینی دروشمەکانی ئیسلامەو لەو چاکانەیە کە پاداشتی زۆری هەیە وەك لەم فەرموودانەدا روون بوویەوە بۆمان.

**سێیەم: بە دوو کەس نوێژی جەماعەت دەکرێ:**

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال نِمْتُ عِنْدَ مَيْمُونَةَ وَالنَّبِيُّ ﷺ عِنْدَهَا تِلْكَ اللَّيْلَةَ فَتَوَضَّأَ ثُمَّ قام يُصَلِّي فَقُمْتُ على يَسَارِهِ فَأَخَذَنِي فَجَعَلَنِي عن يَمِينِهِ......).[٢] عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "شەوێك لە ماڵی مەیموونە خەوتم کە پێغەمبەریش ﷺ لەوێ بوو، جا پێغەمبەر ﷺ هەستاو دەست نوێژی گرتو هەستا نوێژی کرد منیش لای چەپییەوە نوێژم دابەست، پێغەمبەر ﷺ ملی گرتمو بردمییە لای راستییەوە".

ئەم نوێژە شەونوێژ بووە کە پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی مەیموونەی خێزانییدا کردوویەتی عەبدوڵلاش لەگەڵیدا جەماعەتی کردووە.

**چوارەم: ئادابەکانی رۆشتن بۆ مزگەوت:**

**١ـ رۆشتن بۆ مزگەوت بە هێواشیو لەسەرخۆیی:**

(عن أبي قَتَادَةَ رضي الله عنه قال بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مع رسول اللهِ ﷺ فَسَمِعَ جَلَبَةً فقال ما شَأْنُكُمْ قالوا اسْتَعْجَلْنَا إلى الصَّلَاةِ قال فلا تَفْعَلُوا إذا أَتَيْتُمْ الصَّلَاةَ فَعَلَيْكُمْ السَّكِينَةُ فما أَدْرَكْتُمْ

---

١) رواه البخاري ٦٥١ ومسلم ٦٦٢.

٢) رواه البخاري ٦٩٨ ومسلم ٧٦٣.

فَصَلُّوا وما سَبَقَكُمْ فَأَتِمُّوا).[١] ئەبوقەتادە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: لە کاتێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژمان دەکرد گوێی لە زرمە زرمی پێی کەسانێك بوو، کە لە نوێژەکە بوویەوە، فەرمووی: "ئەوە چیتانە؟" وتیان: پەلەی نوێژمان بوو، فەرمووی: "وامەکەن، کاتێ هاتن بۆ نوێژ بە هێواشی لەسەرخۆ بێن جا بە چەندی نوێژەکەدا گەیشتن بیکەن ئەوەشی پیایا نەگەیشتن ـ پاش سەلامدانەوەی ئیمام ـ تەواوی بکەن".

**٢ـ دوعای دەرچوون لەماڵ بۆ مزگەوت:**

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال: (.... فَأَتَاهُ بِلَالٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلَاةِ فَقَامَ فَصَلَّى و لم يَتَوَضَّأْ، وكان في دُعَائِهِ: اللهم اجْعَلْ في قَلْبِي نُورًا وفي بَصَرِي نُورًا وفي سَمْعِي نُورًا وَعَنْ يَمِينِي نُورًا وَعَنْ يَسَارِي نُورًا وَفَوْقِي نُورًا وَتَحْتِي نُورًا وَأَمَامِي نُورًا وَخَلْفِي نُورًا وَعَظِّمْ لي نُورًا).[٢] عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "بیلال هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەوە ئاگاداری کرد کە نوێژ بووە، ئەویش هەڵسا نوێژی ـ سوننەتی کردو دەست نوێژی نەگرت و ئەم دوعایەی دەخوێند ـ لە کاتی ڕۆشتنی بۆ مزگەوت: "اللهم اجعل في قلبي نوراً وفي بصري نوراً وفي سمعي منوراً وعن يميني نورا وعن يساري نوراً وتحتي نورا وأمامي نوراً وخلفي نوراً وعظم لي نوراً".

**٣ـ دوعای ڕۆشتنە مزگەوت و هاتنە دەرەوە لێی:**

(عن فَاطِمَةَ بِنْتِ رسول اللَّهِ ﷺ قالت كان رسول اللَّهِ ﷺ إذا دخل الْمَسْجِدَ يقول بِسْمِ اللَّهِ وَالسَّلَامُ على رسول اللَّهِ اللهم اغْفِرْ لي ذُنُوبِي وَافْتَحْ لي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ وإذا خَرَجَ قال بِسْمِ اللَّهِ وَالسَّلَامُ على رسول اللَّهِ اللهم اغْفِرْ لي ذُنُوبِي وَافْتَحْ لي أَبْوَابَ فَضْلِكَ).[٣] فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ هەر کات دەچوو بۆ مزگەوت دەیفەرموو: "بسم الله والسلام على رسول الله اللهم اغفر لي ذنوبي وافتح لي أبواب رحمتك" وە کاتێکیش بهاتایەتە دەرەوە دەیفەرموو: "بسم الله والسلام على رسول الله اللهم اغفرلي ذنوبي وافتح لي أبواب فضلك".

---

١) رواه البخاري ٦٣٥ ومسلم ٦٠٣ واحمد ٣٠٦/٥.

٢) رواه مسلم ٧٦٣/٨١ وابو داود ١٣٥٣.

٣) رواه الترمذي ٣١٤ وابن ماجة ٧٧١ حديث صحيح.

**٤ـ نوێژی ڕۆشتنە مزگەوت:**

(عن أبي قَتَادَةَ أَنَّ النبي ﷺ قال إذا دخل أحدكم الْمَسْجِدَ فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ قبل أَنْ يَجْلِسَ). [١] ئەبوقەتادە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: "ئەگەر كەسێكتان ڕۆشتە مزگەوتەوە با دوو ركات نوێژ بكات پێش ئەوەی دانیشێت".

**٥ـ ئەگەر كەسێ چووە مزگەوتو ئیمام وتاری دەخوێندەوە:**

(عَنْ جَابِرٍ قَالَ جَاءَ سُلَيْكٌ الْغَطَفَانِيُّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ فَجَلَسَ فَقَالَ لَهُ يَا سُلَيْكُ قُمْ فَارْكَعْ رَكْعَتَيْنِ وَتَجَوَّزْ فِيهِمَا ثُمَّ قَالَ إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ والإمام يَخْطُبُ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ وَلْيَتَجَوَّزْ فِيهِمَا). [٢] جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "لە ڕۆژی هەینییدا سولەیكی غەتەفانی هات، پێغەمبەریش ﷺ وتاری دەدا، سولەیك دانیشت، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: "ئەی سولەیك هەستە دوو ركات نوێژ بكەو بەكورتی بیان كە". پاشان فەرمووی: "ئەگەر كەسێكتان ڕۆرژی هەینی هات ـ بۆ مزگەوتو ـ ئیمام وتاری دەدا، ئەوە با دوو ركات نوێژ بكات پەلە بكات تیایاندا".

**٦ـ گەورەیی گەیشتن بە (الله اكبر)ی نوێژ دابەستندا:**

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من صلى لِلَّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا في جَمَاعَةٍ يُدْرِكُ التَّكْبِيرَةَ الْأُولَى كُتِبَتْ له بَرَاءَتَانِ بَرَاءَةٌ من النَّارِ وَبَرَاءَةٌ من النِّفَاقِ). [٣] ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "هەركەس چل ڕۆژ بە جەماعەت نوێژ بكات بۆ خوا و بگات بە (الله اكبر)ی نوێژ دابەستندا دوو بەریبوونی بۆ دەنووسرێت، بەریبوونو دووربوون لە ئاگری دۆزەخو بەریبوونو دووربوون لە دووڕوویی".

**٧ـ چوونە مزگەوت لە كاتی قامەتكردندا:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ عن النبي ﷺ أَنَّهُ قال إذا أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ فلا صَلَاةَ إلا الْمَكْتُوبَةُ). [٤]

---

١) رواه البخاري ٤٤٤ ومسلم ٧١٤.

٢) رواه البخاري ٩٣٠ ومسلم ٨٧٥.

٣) رواه الترمذي ٢٤١ حديث حسن.

٤) رواه مسلم ٧١٠.

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژی فەرز ئەو تەنیا نوێژی فەرز دەکرێت ـ نابێ سوننەت بکرێت ـ".

**٨ـ شوێن ئیمام کەوتن و پێشنەکەوتن لێی:**

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال أَمَا يَخْشَى أحدكم أو ألا يَخْشَى أحدكم إذا رَفَعَ رَأْسَهُ قبل الْإِمَامِ أَنْ يَجْعَلَ الله رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ أو يَجْعَلَ الله صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ).[١] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "ئایا ئەو کەسەی پێش ئیمام سەری بەرز دەکاتەوە ناترسێ کە خوا سەری بکات بەسەری کەر یان شێوەی بگۆڕێ بۆ شێوەی کەر".

(عن أبي هُرَيْرَةَ عن النبي ﷺ أَنَّهُ قال إنما جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ فلا تَخْتَلِفُوا عليه فإذا رَكَعَ فَارْكَعُوا وإذا قال سمع الله لِمَنْ حَمِدَهُ فَقُولُوا رَبَّنَا لك الْحَمْدُ وإذا سَجَدَ فَاسْجُدُوا وإذا صلى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا أَجْمَعُونَ...).[٢] هەروەها ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: "پێش نوێژ دانراوە بۆ ئەوەی نوێژگەران شوێنی بکەون، کەواتە جیاواز مەبن لەگەڵیدا، جا ئەگەر (الله اکبر)ی کرد ئێوەش (الله اکبر) بکەن و ئەگەر کڕنووشی برد ئێوەش کڕنووش ببەن و ئەگەر ووتی: (سمع الله لمن حمده) ئێوەش بڵێن: (ربنا ولك الحمد)، ئەگەر سوژدەی برد ئێوەش سوژدە ببەنو ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەش هەمووتان بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن..".

(عن عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أنها قالت صلى رسول اللَّهِ ﷺ في بَيْتِهِ وهو شَاكٍ فَصَلَّى جَالِسًا وَصَلَّى وَرَاءَهُ قَوْمٌ قِيَامًا فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنْ اجْلِسُوا فلما انْصَرَفَ قال: إنما جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ فإذا رَكَعَ فَارْكَعُوا وإذا رَفَعَ فَارْفَعُوا وإذا صلى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا أَجْمَعُونَ).[٣] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ نەخۆش بوو لە ماڵەوە بە دانیشتنەوە نوێژی کرد، خەڵکانێکیش لە دوایەوە بەپیوە نوێژیان کرد، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کردن کە دانیشن جا

١) رواه البخاري ٦٩١ ومسلم ٤٢٧.

٢) رواه البخاري٧٢٢، ٧٣٤، ومسلم ٤١٤.

٣) رواه البخاري ١١١٣ ومسلم ٤١١.

كە لە نوێژەكە بوویەوە فەرمووی: "پێش نوێژ دانراوە..." هەمان فەرموودەی ئەبوهورەیرەی دووبارە كردەوە.

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ النبي ﷺ قال إذا أَمَّنَ الْإِمَامُ فَأَمِّنُوا فإنه من وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ له ما تَقَدَّمَ من ذَنْبِهِ).[1] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: "پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "كە ئیمام ئامینی كرد ئێوە ئامین بكەن، چونكە هەركەس ئامینەكەی لەگەڵ ئامینی فریشتەكان پێكەوە بێت خوا لە گوناهی رابوردووی خۆش دەبێت".

(قال البراء بن عازب كان رسول اللَّهِ ﷺ إذا قال سمع الله لِمَنْ حَمِدَهُ لم يَحْنِ أَحَدٌ مِنَّا ظَهْرَهُ حتى يَقَعَ النبي ﷺ سَاجِدًا ثُمَّ نَقَعُ سُجُودًا بَعْدَهُ).[2] بەڕائی كوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "كاتێ پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: "سمع الله لمن حمده" كەسمان پشتی نەدەچەماندەوە هەتا پێغەمبەر ﷺ دەچووە بە سوژدەدا ئەنجا ئێمەش پاش ئەو دەچووینە سوژدەدا".

**پێنجەم : پێش نوێژی**

**١ـ كێ قورئان چاكتر و زۆرتر دەزانێ پێش نوێژی دەكات:**

(عن أبي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ فَإِنْ كَانُوا في الْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ فَإِنْ كَانُوا في السُّنَّةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً فَإِنْ كَانُوا في الْهِجْرَةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ سِلْمًا ولا يَؤُمَّنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ في سُلْطَانِهِ ولا يَقْعُدْ في بَيْتِهِ على تَكْرِمَتِهِ إلا بِإِذْنِهِ).[3] ئەبومەسعودی ئەنساری (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "ئەوەی زۆرتر قورئانی لەبەرە پێش نوێژی دەكات بۆ خەڵكی، جا ئەگەر لە قورئان لەبەربووندا یەكسان بوون ئەوەیان شارەزاترە لە سوننەتدا پێش نوێژی دەكات خۆ ئەگەر لە شارەزایی سوننەتیشدا یەكسان بوون ئەوەیان زووتر كۆچی كردووە پێش نوێژی دەكات. ئەگەر لە كۆچ كرندیشدا یەكسان بوون ئەوەیان زووتر موسڵمان بووە پێش نوێژی دەكات، نابێ كەس پێش

---

١) رواه البخاري ٧٨٠و ٦٤٠٢، ومسلم ٤٠٩و ٤١٠.

٢) رواه البخاري ٨١١ ومسلم ٤٧٤.

٣) رواه مسلم ٦٧٣ واحمد ٤/١١٨.

نوێژی لە شوێنی دەسەڵاتی کەسی تردا بکاتو کەس لە جێگەی خاوەن ماڵ دانەنیشێ هەتا خاوەن ماڵ مۆڵەتی پێنەدات".

**٢ـ پێش نوێژی منداڵ:**

(عن عَمْرِو بن سَلَمَةَ قال لما كانت وَقْعَةُ الْفَتْحِ بَادَرَ كُلُّ قَوْمٍ بِإِسْلَامِهِمْ وَبَدَرَ أبي قَوْمِي بِإِسْلَامِهِمْ فلما قَدِمَ قال جِئْتُكُمْ والله من عِنْدِ النبي ﷺ حَقًّا فقال صَلُّوا صَلَاةَ كَذَا في حِينِ كَذَا وَصَلُّوا صَلَاةَ كَذَا في حِينِ كَذَا فإذا حَضَرَتْ الصَّلَاةُ فَلْيُؤَذِّنْ أحدكم وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْثَرُكُمْ قُرْآنًا فَنَظَرُوا فلم يَكُنْ أَحَدٌ أَكْثَرَ قُرْآنًا مِنِّي لِمَا كنت أَتَلَقَّى من الرُّكْبَانِ فَقَدَّمُونِي بين أَيْدِيهِمْ وأنا إبن سِتٍّ أو سَبْعِ سِنِينَ وَكَانَتْ عَلَيَّ بُرْدَةٌ كنت إذا سَجَدْتُ تَقَلَّصَتْ عَنِّي فقالت امْرَأَةٌ من الْحَيِّ ألا تغطون عَنَّا اسْتَ قَارِئِكُمْ فاشتروا فَقَطَعُوا لي قَمِيصًا فما فَرِحْتُ بِشَيْءٍ فَرَحِي بِذَلِكَ الْقَمِيصِ).[1] عەمری کوڕی سەلەمە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: کە ڕووداوی ئازادکردنی شاری مەککە ڕووی دا، هەموو هۆزێ بۆ موسڵمان بوونیان دەستپێشخەرییان دەکرد، باوکیشم پێش هۆزەکەم کەوت لە موسڵمان بووندا کاتێ کە هاتەوە بۆ ناویان وتی لای پێغەمبەرێکی ڕاستەوەوە هاتوومەتەوە بۆ لاتان فەرموویەتی: "ئەو نوێژە لەو کاتەدا بکەن و ئەو نوێژەش لەو کاتەدا بکەن، جا ئەگەر کاتی نوێژ هات با یەکێکتان بانگ بدات و ئەوەتان قورئان زۆرتر دەزانێ پێش نوێژیتان بۆ بکات، ئەوانیش سەرنجیان دا کەس لەمن زیاتر قورئانی نەدەزانی، چونکە من پێشتر ئەو قورئانەم لە کاروانییەکان وەردەگرتو لەبەرم دەکرد، لەبەرئەوە منیان خستە پێش خۆیان ـ پێش نوێژییان بۆ بکەم ـ کە تەمەنم شەشە یا حەوت ساڵ بوو، وە باڵاپۆشییەکم لەبەردابوو کاتێ دەچووم بە سوژدەدا کوڵ دەبوویەوە دەهاتەوە یەك، ژنێ لە هۆزەکەمان وتی: ئەوە سمتو ڕانی پێش نوێژەکەتان داناپۆشن، ئەوانیش قوماشیان کڕیو کراسێکی پانو پۆریان بۆ دووریم ـ وەك دیشداشە ـ بە هیچ شتێك ئەوەندەی ئەو کراسە دڵخۆش نەبووم".

١) رواه البخاري ٤٣٠٢ واحمد ٧١/٥ وابوداود ٥٨٥ والنسائي ٨٠/٢ ـ ٨١.

**٣- پێش نوێژی کوێرو کۆیلە:**

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ ان رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اسْتَخْلَفَ إبن أُمِّ مَكْتُومٍ على الْمَدِينَةِ مَرَّتَيْنِ يصلي بِهِمْ وهو أَعْمَى). [١] ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتومی دووجار لە شوێنی خۆی دانا بەسەر شاری مەدینەوە ـ کاتێ لە مەدینە دەردەچوو بۆ غەزاو شتی تر ـ پێش نوێژی بۆ خەڵك دەکردو کوێریش بوو".

(عن إبن عُمَرَ قال لَمَّا قَدِمَ الْمُهَاجِرُونَ الأَوَّلُونَ الْعُصْبَةَ قبل مَقْدَمِ رسول اللَّهِ ﷺ كان يَؤُمُّهُمْ سَالِمٌ مولى أبي حُذَيْفَةَ وكان أَكْثَرَهُمْ قُرْآنًا وَفِيهِمْ عُمَرُ بن الْخَطَّابِ وأبو سَلَمَةَ بن عبد الأَسَدِ). [٢] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: کاتێ کۆچەرییە پێشینەکان هاتنە عوصبە[٣] پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بێت بۆ مەدینە سالیم ـ کۆیلەی ئازادکراوی ئەبوحوزەیفە ـ پێش نوێژی بۆ دەکردن کە لە هەموویان زیاتر قورئانی لەبەر بوو لە کاتێکدا عومەری کوڕی خەتتاب و ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەدیان تێدابوو".

**٤- پیش نوێژ نوێژکردنی درێژ نەبێت:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال إذا صلى أحدكم لِلنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ فإن منهم الضَّعِيفَ وَالسَّقِيمَ وَالْكَبِيرَ وإذا صلى أحدكم لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ ما شَاءَ). [٤] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەگەر کەسێکتان پێش نوێژی کرد بۆ خەڵك با نوێژەکەی درێژ نەبێت، چونکە لاوازو نەخۆش‌و پیریان تێدایە، بەڵام ئەگەر بە تەنها خۆی بوو چەند دەیەوێ نوێژەکەی درێژ کات".

(عن أَنَسَ بن مَالِكٍ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: إِني لأَدْخُلُ في الصَّلَاةِ وأنا أُرِيدُ إِطَالَتَهَا فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَأَتَجَوَّزُ في صَلَاتِي مِمَّا أَعْلَمُ من شِدَّةِ وَجْدِ أُمِّهِ من بُكَائِهِ) [٥]. ئەنەس (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "من دەست بە نوێژ دەکەم‌و دەمەوێ درێژەی

---

١) رواه أحمد ٣/١٩٢ وابوداود ٥٩٥ حديث حسن.

٢) رواه البخاري ٦٩٢ وابوداود ٥٨٥.

٣) عوصبە شوێنێکە لە قوبا.

٤) رواه البخاري ٧٠٣ ومسلم ٤٦٧ واحمد ٢/٤٨٦.

٥) رواه البخاري ٧٠٩ ومسلم ١٩٢/ ٤٧٠ وأحمد ٣/١٠٩.

پیێ بدەم، بەڵاك گوێم لە گریانی منداڵ دەبێ بۆیە نوێژەکەم کورت دەکەمەوە، لەبەرئەوەی کە دەزانم دایکی بەو گریانەی چەند دڵی دەسووتێ بۆی".

(عن أَنَسٍ قال كان النبي ﷺ يُوجِزُ الصَّلَاةَ وَيُكْمِلُهَا. وفي رواية: ما صَلَّيْتُ وَرَاءَ إِمَامٍ قَطُّ أَخَفَّ وأتم من صلاة رسول اللَّهِ ﷺ)[١] ئەنەس (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی کورت و ڕێكو تەواوی دەکرد لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ: "لە دوای هیچ پێش نوێژێکەوە نوێژم نەکردووە بە قەدەر پێغەمبەر ﷺ نوێژی کورت و تێرو تەواو بێت".

### ٥ـ درێژکردنی ڕکاتی یەکەمی نوێژ:

سوننەتە ڕکاتی یەکەمی نوێژ درێژتر بێت لە ڕکاتی دووەم بۆ ئەوەی خەڵك بگەن بە جەماعەتی نوێژدا، وە ئەگەر پیش نوێژ هەستی کرد بە هاتنە ژوورەوەی کەسێك چاوەڕوانی بکات تا ئەو کەسە بگات بەو ڕکاتەدا.

(عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قال لقد كانت صَلَاةُ الظُّهْرِ تُقَامُ فَيَذْهَبُ الذَّاهِبُ إلى الْبَقِيعِ فَيَقْضِي حَاجَتَهُ ثُمَّ يَتَوَضَّأُ ثُمَّ يَأْتِي وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ في الرَّكْعَةِ الْأُولَى مِمَّا يُطَوِّلُهَا)[٢] ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵی: قامەت دەکرا بۆ نوێژ کەسێك دەڕۆشت بۆ بەقیع دەستی بە ئاو دەگەیاندو دەست نوێژی دەگرت، پاشان دەهاتەوە هێشتا پێغەمبەر ﷺ لە ڕکاتی یەکەمدا بوو ئەوەندەی درێژ دەکردەوە".

### ٦ـ پێش نوێژێك نوێژکەرەکان خۆشیان نەوێت:

(عن عبد اللَّهِ بن عَمْرٍو أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كان يقول ثَلَاثَةٌ لَا يَقْبَلُ الله منهم صَلَاةً من تَقَدَّمَ قَوْمًا وَهُمْ له كَارِهُونَ....)[٣] عەبدوڵڵا کوڕی عەمر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "سێ کەس خوا نوێژیان لێ وەرناگرێ: کەسێ پێش نوێژی کەسانێ بکات خۆشیان نەوێ و ڕقیان لێی بێ...".

---

١) رواه البخاري ٧٠٦، ومسلم ١٨٩/ ٤٦٩/١٩٠ وأحمد ٢٦٢/٣.

٢) رواه مسلم ٤٥٤ واحمد ٣٠٥/٣ والنسائي ١٦٤/٢ وابن ماجة ٨٢٥

٣) رواه ابوداود ٥٩٣ وابن ماجة ٩٧٠ حديث صحيح.

(عن أَبي أُمَامَةَ رضي الله عنه قال: قال رسول اللَّهِ ﷺ ثَلَاثَةٌ لَا تُجَاوِزُ صَلَاتُهُمْ آذَانَهُمْ الْعَبْدُ الْآبِقُ حتى يَرْجِعَ وَامْرَأَةٌ بَاتَتْ وَزَوْجُهَا عليها سَاخِطٌ وَإِمَامُ قَوْمٍ وَهُمْ له كَارِهُونَ) [١] ئەبوئومامە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "سێ کەس نوێژەکانیان لە گوێکانیان تێپەرش ناکات ـ و بەرز نابێتەوەو گیرا نابێت ـ کۆیلەیەك لە دەستی خاوەنەکەی هەڵهاتبێ تا دەگەڕێتەوە، ئافرەتێك شەو بکاتەوە مێردەکەی تورە و ناڕازی بێت لێی، پێش نوێژی کۆمەڵێ کە رقیان لێی بێت".

**شەشەم: ریزی نوێژ:**

**١ـ پێویستە ریزی نوێژ رێك و پەیوەستو پێکەوە نوساوبن:**

(عن أَنَسٍ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ سَوُّوا صُفُوفَكُمْ فإن تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ من تَمَامِ الصَّلَاةِ). [٢]
ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: "ریزەکانتان رێكو راست کەن، چونکە بە راستی رێکی ریزەکان لە تەواوێتی نوێژە".

(عن النُّعْمَانَ بن بَشِيرٍ قال سمعت يقول النبي ﷺ لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أو لَيُخَالِفَنَّ الله بين وُجُوهِكُمْ). [٣]
نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست فەرمووی: "ریزەکانتان رێكو راست دەکەن یا بە دڵنیاییەوە خوا جیاوازی دەخاتەوە نێوانتانەوە".

(وفي رواية مسلم: كان رسول اللَّهِ ﷺ يُسَوِّي صُفُوفَنَا حتى كَأَنَّمَا يُسَوِّي بها الْقِدَاحَ حتى رَأَى أَنَّا قد عَقَلْنَا عنه ثُمَّ خَرَجَ يَوْمًا فَقَامَ حتى كَادَ يُكَبِّرُ فَرَأَى رَجُلًا بَادِيًا صَدْرُهُ من الصَّفِّ فقال عِبَادَ اللَّهِ لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أو لَيُخَالِفَنَّ الله بين وُجُوهِكُمْ). [٤] لە ریوایەتەکەی موسلیمدا دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ ریزەکانمان رێك دەکرد بەو شێوەی تیر رێك دەکرێ ـ هەر ریزی دەکردین ـ هەتا زانی کە ئیتر لێیەوە فێر بووین، پاشان ڕۆژێك لە ماڵ دەرچوو هات نزیك بوو نوێژ دابەستێ

١) رواه الترمذي ٣٦٠ حديث حسن.
٢) رواه البخاري ٧٢٣ ومسلم ٤٣٣.
٣) رواه البخاري ٧١٧ ومسلم ٤٣٦.
٤) رواه مسلم ١٢٨/ ٤٣٦.

پیاوێکی دی سنکی هاتبووە پێشەوە فەرمووی: "بەندەکانی خوا ریزەکانتان راستو رێك دەکەن یا دڵنیابن خوا جیاوازی دەخاتە نێوانتانەوە".

هەندێك لە زانانیان دەڵێن رێکی ریز لە نوێژدا بۆ ئەوەیە وەك ریزی فریشتەکان بن (عن جَابِرِ بن سَمُرَةَ قال خَرَجَ عَلَيْنَا رسول اللَّهِ ﷺ فقال: ألا تَصُفُّونَ كما تَصُفُّ الْمَلَائِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا فَقُلْنَا يا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ تَصُفُّ الْمَلَائِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا قال يُتِمُّونَ الصُّفُوفَ الْأُوَلَ وَيَتَرَاصُّونَ في الصَّفِّ).[1] جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ هاتە ناومان فەرمووی: "ئەوە بۆ ریز نابن هەرچۆنێك فریشتەکان لە خزمەت پەروەردگاریاندا ریز دەبن؟" وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فریشتەکان چۆن لە خزمەتی پەروەردگاریاندا ریز دەبن؟ فەرمووی: "ریزەکانی پێشەوە تەواو دەکەنو لە ریزدا بەیەکەوە دەنوسێنو بۆشایی لە نێوانیاندا نییە".

**٢ـ نوێژکەرەکان چۆن ریز دەبن لەدوای ئیمامەوە:**

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ أَنَّ جَدَّتَهُ مُلَيْكَةَ دَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِطَعَامٍ صَنَعَتْهُ له فَأَكَلَ منه ثُمَّ قال قُومُوا فَلِأُصَلِّ لَكُمْ قال أَنَسٌ فَقُمْتُ إلى حَصِيرٍ لنا قد اسْوَدَّ من طُولِ ما لُبِسَ فَنَضَحْتُهُ بِمَاءٍ فَقَامَ رسول اللَّهِ ﷺ وَصَفَفْتُ أنا وَالْيَتِيمَ وَرَاءَهُ وَالْعَجُوزُ من وَرَائِنَا فَصَلَّى لنا رسول اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ انْصَرَفَ).[2] ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: نەنکی کە ناوی مولەیکە بوو، پێغەمبەری ﷺ بانگ کرد بۆ خوانێك کە بۆی دروست کردبوو لە خواردنەکەی خواردوو فەرمووی: "هەستن با پێش نوێژیتان بۆ بکەم" ئەنەس دەڵێ: حەسیرێکمان هەبوو لەبەر ئەوە زۆر مابوویەوە رەش بوو بوو هێنام و ئاوم لێ پرژاند پێغەمبەر ﷺ لەسەری وەستاو ـ نوێژی دابەست ـ منو هەتیوەکە[3] لە پشتییەوە بووین بەریزێ، پیرەژەنەکەش لەپشت ئێمەوە بوو جا پێغەمبەر ﷺ دوو رکات نوێژی ـ نوسەننەتی ـ بۆ کردین، پاشان گەڕایەوە".

---

١) رواه مسلم ١١٩/ ٤٣٠ وابود داود ٦٦١.

٢) رواه البخاري ٣٨٠ ومسلم ٦٥٨.

٣) ناوی ضەمیرەی کوڕی ئەبوضەمیرە بوو.

(ولمسلم: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صلى بِهِ وَبِأُمِّهِ أو خَالَتِهِ قال فَأَقَامَنِي عن يَمِينِهِ وَأَقَامَ الْمَرْأَةَ خَلْفَنَا).[١]
لە ریوایەتێکی موسلیمدا دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی کرد بۆ خۆی - واتە ئەنەس - و دایکی یا پوری جا منی لا راستییەوە دانا ئافرەتەکەش لە پشتمانەوە بوو".
(عن ابن عَبَّاسٍ قال بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي فَقَامَ النبي ﷺ يُصَلِّي من اللَّيْلِ فَقُمْتُ أُصَلِّي معه فَقُمْتُ عن يَسَارِهِ فَأَخَذَ بِرَأْسِي فَأَقَامَنِي عن يَمِينِهِ).[٢] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "شەو لە ماڵی مەیموونەی پورم مامەوە - کە خێزانی پێغەمبەرە ﷺ - جا پێغەمبەر ﷺ - شەو هەستاو شەونوێژی کرد منیش لای چەپیەوە وەستام - و نوێژم دابەست - ئەنجا پێغەمبەر ﷺ سەری گرتمو بردمیە لای راستییەوە وەستاندمی".

**٣- چاکترین ریز لە نوێژدا:**

- چاکترین رێز ریزی یەکەمە بۆ پیاوانو ریز کۆتاییە بۆ ئافرەتان لە نوێژدا، ئەگەر لە مزگەوتەکەدا پیاوو ئافرەتیش نوێژیان دەکرد. -
(عن أَبِي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا وَشَرُّهَا آخِرُهَا وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا)[٣] ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "چاکترین ریزی پیاوان یەکەمیان و خراپترینیان ئاخرەمینیان و چاکترین ریزی ئافرەتان ئاخرەمینیانەو خراپترینیان یەکەمینییانە".

- گەورەیی ریزی یەکەم و لای راستی ریزەکان:
(عن الْبَرَاءِ بن عَازِبٍ قال كان رسول اللَّهِ ﷺ يَتَخَلَّلُ الصَّفَّ من نَاحِيَةٍ إلى نَاحِيَةٍ يَمْسَحُ صُدُورَنَا وَمَنَاكِبَنَا وَيَقُولُ: لَا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ وكان يقول إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ على الصُّفُوفِ الْأُوَلِ)[٤] بەرائی کوڕی عازیب (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەگەڕا بە ناو ریزەکاندا لەم لا بۆ ئەولا دەستی دەهێنا بە سنگو شانماندا - رێکی دەکردین - دەیفەرموو:

١) رواه مسلم ٢٦٩/ ٦٦٠.
٢) رواه البخاري ٦٣١٦ ومسلم ٧٦٣.
٣) رواه مسلم ٤٤٠، وابوداود ٦٧٨ والترمذي ٢٣٤ والنسائي ٢٨٩٣ وابن ماجة ١٠٠٠.
٤) رواه ابوداود ٦٦٤، والنسائي ٢/ ٩٠ وابن حبان ٣٨٦ فەرموودەیەکی صەحیحە.

"نارێك مەبن دڵەكانیشتان جیاواز ببێ" و دەیفەرموو: "بێگومان خوای گەورە بەزەیی دەڕژێنێ بەسەر ریزی یەكەمدا و فریشتەكان بۆیان دەپاڕێنەوە".

(عن الْبَرَاءِ قال كنا إذا صَلَّيْنَا خَلْفَ رسول اللَّهِ ﷺ أَحْبَبْنَا أَنْ نَكُونَ عن يَمِينِهِ يُقْبِلُ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ قال فَسَمِعْتُهُ يقول رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يوم تَبْعَثُ أو تَجْمَعُ عِبَادَكَ)[1] هەروەها بەڕائی كوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "ئێمە ئەگەر نوێژمان بكردایە لە پشت پێغەمبەرەوە ﷺ حەزمان دەكرد لای ڕاستییەوە بین، چونكە ـ پاش نوێژەكە ـ ڕووی تێئەكردین، لێم بیست فەرمووی: "پەروەردگارم لە سزات بمپارێزە لەو ڕۆژەدا بەندەكانی تێدا زیندوو یا كۆدەكەیتەوە".

**٤ـ كێ شایستەترە بە ریزی یەكەم:**

(عن أبي مَسْعُودٍ قال كان رسول اللَّهِ ﷺ يَمْسَحُ مَنَاكِبَنَا في الصَّلَاةِ وَيَقُولُ اسْتَوُوا ولا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُو الأحْلَامِ وَالنُّهَى ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)[2] ئەبومەسعودی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی دەهێنا بە سەنگ‌و شانماندا لە كاتی ـ ئامادەبوونی ـ نوێژدا و دەیفەرموو: "ڕاست بوەستن نارێك مەبن ئەو سا دڵەكانتان جیاواز و نارێك ببێ با خاوەن ئاوەزو ژیرەكان لێم نزیك بن، پاشان ئەوانی دواتر لەوان، پاشان ئەوانی دواتر لەوان".

**٥ـ چۆن ریزەكان ڕێك دەكرێن:**

(عن أَنَسٍ عن النبي ﷺ قال أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ فَإِنِّي أَرَاكُمْ من وَرَاءِ ظَهْرِي وكان أَحَدُنَا يُلْزِقُ مَنْكِبَهُ بِمَنْكِبِ صَاحِبِهِ وَقَدَمَهُ بِقَدَمِهِ)[3] ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ریزەكانتان ڕێك‌و ڕاست كەن‌و پاڵبدەن بەیەكترییەوە، چونكە دڵنیا بن من لە پشتەوە دەتان بینم" جا هەریەكەمان شانی دەلكاند بە شانی هاوڕێكەیەوەو پێی دەنوساند بەپێی هاوڕێكەیەوە".

---

١) رواه مسلم ٧٠٩ وابوداود ٦١٥ وابن ماجه ١٠٠٦ واحمد ٤/٢٩٠.

٢) رواه مسلم ٤٣٢/١٢٣ وابودود ٦٧٥ والترمذي ٢٢٨ وابن ماجه ٩٧٦ والنسائي ٢/٩٠ فەرموودەیەكی صەحیحە.

٣) رواه البخاري ٧١٨ ومسلم ٤٣٤.

**٦ـ کەراهەتی هەیە ریزبوون لە نێوان پایەو کۆڵەکەدا:**

(عن عبد الْحَمِيدِ بن مَحْمُودٍ قال صَلَّيْنَا خَلْفَ أَمِيرٍ من الْأُمَرَاءِ فَاضْطَرَّنَا الناس فَصَلَّيْنَا بين السَّارِيَتَيْنِ فلما صَلَّيْنَا قال أَنَسُ بن مَالِكٍ كنا نَتَّقِي هذا على عَهْدِ رسول).[1] عەبدولحەمید کوڕی مەحمود دەڵێ: لە دوای یەکێك لە ئەمیرەکانەوە نوێژمان کرد خەڵك ناچاریان کردین لە نێوان دوو پایەدا نوێژمان کرد، ئەنجا کاتێ نوێژمان کرد ئەنەسی کوڕی مالیك وتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ خۆمان دەپاراست لە ئەمە ـ کە ئێوە کردتان ـ".

**٧ـ نوێژ لە نێوان دووپایەدا بۆ کەسێ بە تەنها بێت:**

(عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دخل الْكَعْبَةَ وَأُسَامَةُ بن زَيْدٍ وَبِلَالٌ وَعُثْمَانُ بن طَلْحَةَ الْحَجَبِيُّ فَأَغْلَقَهَا عليه وَمَكَثَ فيها فَسَأَلْتُ بِلَالًا حين خَرَجَ ما صَنَعَ النبي ﷺ قال جَعَلَ عَمُودًا عن يَسَارِهِ وَعَمُودًا عن يَمِينِهِ وَثَلَاثَةَ أَعْمِدَةٍ وَرَاءَهُ وكان الْبَيْتُ يَوْمَئِذٍ على سِتَّةِ أَعْمِدَةٍ ثُمَّ صلى).[2] عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ناو کەعبەوە لەگەڵ ئوسامەی کوڕی زەیدو بیلالو عوسمانی کوڕی تەڵحە حەجەبی دەرگاکەی داخست لەسەرخۆی تێیدا مایەوە، کاتێ بیلال هاتە دەرەوە لێمپرسی پێغەمبەر ﷺ چی کرد وتی: عەمودێکی خستە لای چەپیو عەمودێکەی تری خستە لای ڕاستیو سیانیش لە پشتییەوە، لەو کاتەدا کەعبە لەسەر شەش عەمود ڕاوەستابوو، پاشان نوێژی کرد".

**حەوتەم: عوزرەکانی نەڕۆیشتن بۆ نوێژی جەماعەت:**

ئەو عوزرانە دوو بەشن عوزرە گشتییەکان، عوزرە تایبەتییەکان

**یەکەم: عوزرە گشتییەکان:**

وەك : باران، بای توند بە شەودا، قوڕی زۆری ڕێگا.

(أَنَّ إبن عُمَرَ أَذَّنَ بِالصَّلَاةِ فِي لَيْلَةٍ ذَاتِ بَرْدٍ وَرِيحٍ ثُمَّ قال ألا صَلُّوا فِي الرِّحَالِ ثُمَّ قال إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كان يَأْمُرُ الْمُؤَذِّنَ إذا كانت لَيْلَةٌ ذَاتُ بَرْدٍ وَمَطَرٍ يقول ألا صَلُّوا فِي الرِّحَالِ).[3]

---

١) رواه احمد ١٣١/٣ وابوداود ٦٧٣ والترمذي ٢٢٩ حديث صحيح.

٢) رواه البخاري ٥٠٥ ومسلم ١٣٢٩.

٣) رواه البخاري ٦٣٥ ومسلم ٦٩٧.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لە شەوێکدا ساردبوو باشی هەبوو بانگی داو پاشان وتی: لە شوێنی خۆتان نوێژ بکەن، پاشان وتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر شەوێك ساردو باراناوی بوایە فەرمانی ئەکرد بە بانگبێژ بانگ بدات بڵێت: "لە شوێنەکانی خۆتان نوێژ بکەن". واتە لە ماڵەوە نوێژ بکەنو مەیەن بۆ مزگەوت.

**دووەم: عوزرە تایبەتییەکان:**

نەخۆشی، تینوێتیو برسێتی زۆر، ترسی گیانو ماڵ هەبێت لە دەست ستەمکارێك، تەنگەتاو بوون بە هۆی مێز یاپیسییەوە.

(عن ابن عُمَرَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا وُضِعَ عَشَاءُ أَحَدِكُمْ وَأُقِيمَتْ الصَّلَاةُ فابدؤوا بِالْعَشَاءِ ولا يَعْجَلَنَّ حتى يَفْرُغَ منه) [1] پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "ئەگەر کەسێکتان خواردنەکەی ئامادەبوو قامەتیشی کرابوو بۆ نوێژ ئەو خواردنەکەی بخواتو پەلەش نەکات هەتا بە ئاسایی لێ دەبێتەوە".

(ولخبر: لَا صَلَاةَ بِحَضْرَةِ الطَّعَامِ ولا هو يُدَافِعُهُ الآخْبَثَانِ). [2] هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "نابێ بە ئامادەبوونی خواردن نوێژ بکرێت، هەروەها گەر تەنگەتاو بێ بە مێز یا پیسی وە عوزرێکی تر وەك قەرزاری نەدار کە خاوەن قەرزەکە لە مزگەوت بێ و داوای دانەوەی قەرزەکەی لێ بکات.

هەروەها سیر یان پیاز یا شتی بۆن ناخۆشی خواردبێ یان جلێکی بۆن ناخۆشی و پیسی لەبەردابێ کە ئەزێتی خەڵکی بدات.

(عن جَابِرَ بن عبد اللَّهِ رضي الله عنه أَنَّ النبي ﷺ قال: من أَكَلَ ثُومًا فَلْيَعْتَزِلْنا أو قال: فَلْيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا وَلْيَقْعُدْ في بَيْتِهِ). [3] جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەرکەس سیری خوارد با توخنی مزگەوت نەکەویو لێم دوورکەوێتەوەو لە ماڵەوەیان دانیشێت".

---

١) رواه البخاري ٦٤٢ ومسلم ٥٥٩.

٢) رواه مسلم ٥٦٠.

٣) رواه البخاري ٨١٧ ومسلم ٥٦٤.

هەموو ئەو عوزرانەی باسمان کردن ئەوە بەڵگانەی کە باسمان کردن ئەوە بەڵگەیەتی و ئەوانی تریش بە قیاس لەسەر بەڵگەدارەکان.

**٩. نوێژی فەرز لە پشت ئیمامێکەوە نوێژی سوننەت دەکات:**

(عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ أَنَّ مُعَاذَ بن جَبَلٍ كان يُصَلِّي مع رسول اللَّهِ ﷺ الْعِشَاءَ ثُمَّ يَأْتِي قَوْمَهُ فَيُصَلِّي بِهِمْ تِلْكَ الصَّلَاةَ).[1] جابیر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: موعاز لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی عیشای دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ ناو هۆزەکەی خۆی پێش نوێژی هەمان نوێژ بۆ دەکردن". کەواتە نوێژی یەکەمیان فەرزەکە بووە لەگەڵ پێغەمبەرو دووەمیش سوننەت بووە، چونکە ئەو فەرزەکەی کردووە.

هەروەها نوێژی سوننەت لە پشت ئیمامێکەوە نوێژ سوننەت بکات دروستە بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس لە شەونوێژ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی کردووە پێشتر باسمان کرد و هەروەها نوێژکردنی ئەنەس و منداڵەکەو دایکی لە پشت پێغەمبەرەوە ﷺ کە دوو رکاتی سوننەتی بە پێش نوێژی کرد بۆیان.

(قال يَزِيدَ بن الأَسْوَدِ أَنَّهُ صلى مع رسول اللَّهِ ﷺ وهو غُلَامٌ شَابٌّ فلما صلى إذا رَجُلَانِ لم يُصَلِّيَا في نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ فَدَعَا بِهِمَا فَجِيءَ بِهِمَا تُرْعَدُ فَرَائِصُهُمَا فقال ما مَنَعَكُمَا أَنْ تُصَلِّيَا مَعَنَا قالا قد صَلَّيْنَا في رِحَالِنَا فقال لَا تَفْعَلُوا إذا صلى أحدكم في رَحْلِهِ ثُمَّ أَدْرَكَ الْإِمَامَ و لم يُصَلِّ فَلْيُصَلِّ معه فَإِنَّهَا له نَافِلَةٌ).[2] یەزیدی کوڕی ئەسوەد (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: کوڕێك گەنج بوو لەگەڵ پێغەمبەردا نوێژی کرد کە لە نوێژەکەی بوویەوە دوو کەسی بینی لە کەنارێکی مزگەوتدا نوێژییان نەکردبوو، بانگی کردن، هێنانیان گیانیان دەلەرزی فەرمووی: "چی بوو لەگەڵ ئێمەدا نوێژتان نەکرد؟" وتیان لە ماڵەوە نوێژمان کردبوو فەرمووی: "وامەکەن، ئەگەر کەسێکتان لە ماڵەوە نوێژی کرد، پاشان گەشت بە نوێژی ئیمامدا هێشتا نوێژەکەی نەکردبوو با لەگەڵیدا نوێژ بکات، چونکە ئەمەیان دەبێتە سوننەت بۆی".

---

١) رواه البخاري ٧٠٥ ومسلم ٤٦٥/١٧٩.

٢) رواه احمد ١٦٠/٤ وابوداود ٥٧٥ والترمذي ٢١٩ والنسائي ١١٢/٢، ١١٣. ٨٥٨ حديث صحيح.

**١٠. کەسێ لە سەرەتای نوێژی جەماعەتدا ئامادەنەبوو:**

ئیمام لە هەر شوێنێکی نوێژەکەدا بوو با نوێژی لەگەڵدا دابەستێ، بەڵام ئەگەر نەگەیشت بەرکوعدا ئەوە ئەو ڕکاتەی نەکردووەو بۆی حساب ناکرێ.

(عن عَلِيٍّ أبن ابي طالب و عن مُعَاذِ بن جَبَلٍ قالا قال النبي ﷺ إذا أتى أحدكم الصَّلَاةَ وَالْإِمَامُ على حَالٍ فَلْيَصْنَعْ كما يَصْنَعُ الْإِمَامُ).[1] عەلی کوڕی ئەبوتالیب و موعازی کوڕی جەبەل ڕەزای خوایان لێ بێت دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "ئەگەر کەسێکتان هات بۆ نوێژ پێش نوێژ لە هەر حاڵەتێکدا بوو با پێش نوێژ چی دەکات ئەمیش هەمان شت بکات" واتە کە هات ئیمام لەهەر بەشێکی نوێژدا بوو ئەو کەسەش نیەت بێنێ‌و ئیمام چی دەکات ئەمیش بیکات، کە سەلامی دایەوە ئەم کەسە هەڵدەستێتەوە نوێژەکەی تەواو دەکات. (عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا جِئْتُمْ إلى الصَّلَاةِ وَنَحْنُ سُجُودٌ فَاسْجُدُوا ولا تَعُدُّوهَا شيئا وَمَنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ).[2] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەگەر هاتن بۆ نوێژ لەو کاتەدا ئێمە لە سوژدەدا بووین ئێوەش سوژدە بەرن و بە هیچی دامەنێن ـ چونکە نەگەیشتوون بە ڕکوعدا ـ وەکەسێك بگات بە ڕکاتێکدا ئەوە گەشتووە بەو نوێژدا". با سێ ڕکاتەکەی تریشی بکەوێتە کاتی نوێژێکی ترەوە.

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من أَدْرَكَ رَكْعَةً من الصَّلَاةِ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ).[3] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "هەرکەس بگات بە ڕکاتێکدا لەگەڵ ئیمامدا ئەوە بێگومان گەشتووە بەو نوێژەدا".

---

١) رواه الترمذي ٥٩١ حديث حسن.

٢) رواه ابوداود ٨٩٣ حديث حسن.

٣) رواه البخاري ٥٨٠ ومسلم ٦٠٧.

# نوێژی هەینی

**یەکەم: دانانی ئەم نوێژە:**

نوێژی هەینی لەو کارە گەورەو گرنگانەیە کە خوای گەورە تایبەتی کردووە بە ئوممەتی پێغەمبەرەوە ﷺ کە لە سودو گەورەیی ئەو رۆژە بەهرەمەند بن.

(عن أَبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ سمع رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول نَحْنُ الْآخِرُونَ السَّابِقُونَ يوم الْقِيَامَةِ بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ من قَبْلِنَا ثُمَّ هذا يَوْمُهُمْ الذي فُرِضَ عليهم فَاخْتَلَفُوا فيه فَهَدَانَا الله فَالنَّاسُ لنا فيه تَبَعٌ الْيَهُودُ غَدًا وَالنَّصَارَى بَعْدَ غَدٍ).[1] ئەبوهورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: "ئێمە دوایین ئوممەتین ـ لە دونیادا ـ یەکەمین لە دوارۆژدا ئەگەرچی ئەوان لە پێش ئێمەدا کتێبیان بۆ هاتووە، پاشان ئەمە ئەو رۆژەیە فەرز کرابوو لەسەریان تێیدا راجیابوون، خوا ئێمە رێنمایی کردو خەڵکی بە دوای ئێمەدا دێن جوولەکە رۆژەکەیان ـ سبەینێیە گاوریش دوو سبەی".

نوێژی هەینی پێش کۆچ لە مەککە فەرزکراوە، بەڵام لەبەر لاوازو بێدەسەڵاتی موسڵمانان لە مەککە ئەم نوێژە نەکراوە (وأول من جمع لها وصلاها في المدينة قبل هجرة النبي ﷺ أسعد بن زرارة رضي الله عنه، كما جاء ذلك عن كعب بن مالك رضي الله عنه).[2] یەکەم کەس کە خەڵکی کۆکردەوەو ئەم نوێژەی کرد لە مەدینە پێش کۆچی پێغەمبەر ﷺ ئەسعەدی کوڕی زورارە بوو رەزای خوای لێبێت وەك کەعبی کوڕی مالیك گێڕاویەتییەوە".

**دووەم: بەڵگەی فەرزبوونی ئەم نوێژە:**

بەڵگەی فەرزبوونی ئەم نوێژە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ الجمعة: ٩ واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە کاتێ بانگ درا بۆ نوێژ لە رۆژی

---

١) رواه البخاري ٨٧٦ ومسلم ٨٥٥.

٢) رواه ابوداود ١٠٦٩ حديث حسن.

هەینیدا بە پەلە بڕۆن بەرەو یادی خوا ـ گوێگرتن لە وتار ـ واز لە کڕین و فرۆشتن بێنن، چونکە ئەوە چاکترە بۆتان ئەگەر بزانن.

(عن طَارِقِ بن شِهَابٍ عن النبي ﷺ قال الْجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ على كل مُسْلِمٍ في جَمَاعَةٍ إلا أَرْبَعَةً عَبْدٌ مَمْلُوكٌ أو امْرَأَةٌ أو صَبِيٌّ أو مَرِيضٌ).[١] تاریقی کوڕی شیهاب (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "نوێژی هەینی هەقەو واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك بە جەماعەت بیكات جگە لە چوار كەس، كۆیلە، ئافرەت، منداڵ، نەخۆش".

(عن حَفْصَةَ زَوْجِ النبي ﷺ أَنَّ النبي ﷺ قال رَوَاحُ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ على كل مُحْتَلِمٍ).[٢] حەفصەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ڕۆشتن بۆ نوێژی هەینی لەسەر هەموو باڵغێك پێویستە".

**سێ یەم: كاتەكەی:**

كاتی نوێژی هەینی كاتی نوێژی نیوەڕۆیە، چونكە لەبری ئەودایە، فەرموودەش هەیە دەیگەیەنێ كە پێش نیوەڕۆش دروستە.

(عن سَلَمَةَ بن الأَكْوَعِ رضي الله عنه قال كنا نصلى مع النبي ﷺ الْجُمُعَةَ ثُمَّ نَنْصَرِفُ وَلَيْسَ لِلْحِيطَانِ ظِلٌّ نَسْتَظِلُّ فيه)[٣] سەلەمەی كوڕی ئەكوەع ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی هەینیمان دەكرد و دەرۆشتینەوە بۆ ماڵەوە هێشتا دیوارەكان ئەوەندە سێبەریان نەبوو بچینە ژێری".

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّ النبي ﷺ كان يُصَلِّي الْجُمُعَةَ حين تَمِيلُ الشَّمْسُ).[٤] ئەنەس ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كاتێ خۆر لای ئەدا لە ناوەراستی ئاسمان نوێژی هەینی دەكرد".

---

١) رواه ابوداود ١٠٦٧ حديث صحيح.

٢) رواه النسائي ٣/٨٩ حديث صحيح.

٣) رواه البخاري ٣٩٣٥ ومسلم ٨٦٠.

٤) رواه البخاري ٩٠٤.

(عن سَهْلٍ رضي الله عنه قال: ما كنا نَقِيلُ ولا نَتَغَدَّى إلا بَعْدَ الْجُمُعَةِ) [١] سەهلی کوڕی سەعد ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: ئێمە نەدەخەوتین و نانمان نەدەخوارد پاش نوێژی هەینی نەبێ".

**چوارەم: نوێژی هەینی بە چەند کەس دەکرێت:**

شەوکانی دەڵێ: "بزانە بەمەرجگرتنی هەشتا یا بیست، یا نۆ، یا حەوت کەس بۆ نوێژی هەینی هیچ بەڵگەو پشتیوانییەکی نییە، هەروەها بەیەك کەس دروست بێ هیچ بەڵگەیەکی نییە، بەڵام ئەوەی کە دەڵێ بە دوو کەس دروستە بەوە بەڵگەی هێناوەتەوە کە ژمارەبوون فەرموودەو یەکدەنگی زانایانی لەسەرە بەڵام بەڵگەیەك نییە ژمارەیەکی دیاریکراوی بەمەرج گرتبێت، وە لە نوێژەکانی تردا جەماعەت بە دوو وکەس دروستە، وە هیچ جیاوازییەك لە نێوان نوێژی هەینیو نوێژی جەماعەتدا نییە، هیچ بەڵگەیەکیش لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەهاتووە بڵێت نوێژی هەینی بە ئەوەندە کەس نەبێ دروست نییە، بۆیە ئەم رایە لای من بەهێزو راستە کە بە دوو کەسو زیاتر دروستە". [٢]

**پێنجەم: بێداری لەبەر سستی نوێژی هەینییدا:**

(عن عبد اللَّهِ بن مسعود رضي الله عنه أَنَّ النبي ﷺ قال لِقَوْمٍ يَتَخَلَّفُونَ عن الْجُمُعَةِ لقد هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ رَجُلًا يُصَلِّي بِالنَّاسِ ثُمَّ أُحَرِّقَ على رِجَالٍ يَتَخَلَّفُونَ عن الْجُمُعَةِ بُيُوتَهُمْ) [٣] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە خەڵکانێ کە نەدەهاتن بۆ نوێژی هەینی: "هات بە دڵمدا فەرمان بکەم پیاوێ نوێژ بکات بۆ خەڵکی پاشان - بڕۆم - ئەو کەسانەی نایەن بۆ نوێژی هەینی ماڵەکانیان بسوتێنم بە سەریاندا".

(عن ابن عُمَرَ وَأَبَا هُرَيْرَةَ حَدَّثَاهُ أَنَّهُمَا سَمِعَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول على أَعْوَادِ مِنْبَرِهِ لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عن وَدْعِهِمْ الْجُمُعَاتِ أو لَيَخْتِمَنَّ الله على قُلُوبِهِمْ ثُمَّ لَيَكُونُنَّ من الْغَافِلِينَ). [٤] عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو ئەبوهورەیرە ڕەزای خوایان لێبێت دەڵێن: لە پێغەمبەریان ﷺ بیست لەسەر داری

١) رواه البخاري ٢٩٣٩ ومسلم ٨٥٩.

٢) بڕوانە: نيل الاوطار في شرح حديث ١١٨٨.

٣) رواه مسلم ٦٥٢، واحمد ٤٠٣/١، والحاكم ٢٩٢/١.

٤) رواه مسلم ٨٦٥/٤٠ والدارمي ٣٦٨/١ والبيهقي ١٧١/٣.

مینبەرەکەی فەرمووی: "سوێند بێ خەڵکانێ وازدێنن لە نەکردنی نوێژی هەینی یا دڵنیابن خوای مۆر دەنێ بەسەر دڵیاندا، پاشان لە بێ ئاگایان دەبن".

(عن أبي الْجَعْدِ الضَّمْرِيِّ وَكَانَتْ له صُحْبَةٌ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من تَرَكَ ثَلَاثَ جُمَعٍ تَهَاوُنًا بها طَبَعَ الله على قَلْبِهِ) [١] ئەبوجەعدی ضەمری ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەرکەسێ سێ نوێژی هەینی نەکات بە تەمەڵی خوا مرۆدەنێ بەسەر دڵیدا".

**شەشەم: فەرزەکانی نوێژی هەینی:**

**نوێژی هەینی دوو فەرزی هەیە:**

**یەکەم: دوو وتار:**

**یەکەم: پێغەمبەر ﷺ چۆن وتاری دەدا لە ڕۆژی هەینیدا:**

أ ـ دەست پێکردنی وتارەکە بەم دەقە: "(إنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نحمده ونَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاللَّهِ من شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا من يَهْدِهِ الله فلا مُضِلَّ له وَمَنْ يُضْلِلْ فلا هَادِيَ له وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ له وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ ال عمران: ١٠٢

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ النساء: ١

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾ الأحزاب: ٧٠ – ٧١

أَمَّا بَعْدُ

فإن أَصْدَقَ الحديث كِتَابُ اللَّهِ وَإِنَّ أَفْضَلَ الهدي هدي مُحَمَّدٍ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ وكل ضَلاَلَةٍ في النار)". [٢]

---

١) رواه احمد ٣/٤٢٤ وابوداود ١٠٥٢ والنسائي ٣/٨٨ وابن ماجه ١١٢٥ والحاكم ١/٢٨٠ حديث صحيح.

٢) رواه مسلم ٤٣/ ٨٦٧ واحمد ٣/٣١٠ أ ٣١١.

**ب ـ درێژی نوێژی هەینی و کورتی وتارەکەی:**

(قال عَمَّارٌ سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول: إِنَّ طُولَ صَلَاةِ الرَّجُلِ وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ من فِقْهِهِ فَأَطِيلُوا الصَّلَاةَ وَاقْصُرُوا الْخُطْبَةَ وَإِنَّ من الْبَيَانِ سِحْرًا). [١] عەممار ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: "بێگومان درێژی نوێژی پیاوو کورتی وتاری نیشانەی شارەزاییەتی لە ئاییندا، نوێژەکانتان درێژبکەنەوەو وتارەکانتان کورت، چونکە قسەی ڕەوان وەك جادوو وایە لە کاریگەرییدا".

**دووەم: وتاردان دەبێت لەسەر مینبەر بێت:**

(عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما قال سمعت النبي ﷺ يَخْطُبُ على الْمِنْبَرِ فقال من جاء إلى الْجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ) [٢] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: گوێم لێبوو پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر وتاری دەدا و دەیفەرموو: "هەرکەس هات بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوات".

سوننەتە مینبەر سێ پلە بێت و زیاترنەبێت چونکە زۆرجار ئەبێتە هۆی بچڕانی ڕیزەکان یا دەبرێتە گۆشەیەکی مزگەوتەوە، بۆ ئەوەی ڕیزەکان نەپچڕێ، کە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ.

(عن أم هشام بنت حارثة بن النعمان رضي الله عنها قالت: ما أخذت (ق والقرآن المجيد ) إلا عن لسان رسول الله ﷺ يقرؤها كل جمعة على المنبر إذا خطب الناس). [٣] ئوممو هیشامی کچی حاریسەی کوڕی نیعمان ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: سورەتی (ق والقرآن المجيد) م لەسەر زمانی پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگرتو فێری بووم کە هەموو ڕۆژێکی هەینی لەسەر مینبەر دەیخوێند کاتێ وتاری دەدا بۆ خەڵکی".

---

١) رواه مسلم ٤٧/ ٨٦٩.

٢) رواه البخاري ٩١٩.

٣) رواه مسلم ٨٧٣/٥٢ وابوداود ١١٠٠ والنسائي ١٠٧/٣ واحمد ٤٦٣/٦.

**سێیەم: بەپێوە وتار بدات و لە نێوانیاندا دانیشێت:**

(عن بن عُمَرَ رضي الله عنهما قال كان النبي ﷺ يَخْطُبُ قَائِمًا ثُمَّ يَقْعُدُ ثُمَّ يَقُومُ كما تَفْعَلُونَ الْآنَ). [١] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەپێوە وتاری دەدا، پاشان دادەنیشت ئەنجا هەڵدەسایەوە، بەو شێوەیەی کە ئێستا وتار دەدەن".

**چوارەم: وتارەکە چەند ئایەتێکی قورئانی تێدا بێت:**

(عن يعلي بن أميه رضي الله عنه قال سمعت النبي ﷺ يَقْرَأُ على الْمِنْبَرِ ﴿وَنَادَوْاْ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ﴾. [٢] یەعلا کوڕی ئومەیە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست لەسەر مینبەر دەیفەرموو: ﴿وَنَادَوْاْ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ﴾. هەروەها فەرموودەکەی ئومو هیشام کە لە خاڵی دووەمدات باسمان کرد کە سورەتی قافی لە وتاری هەنیی پێغەمبەرەوە وەرگرتووەو لەبەری کردووە.

**پێنجەم: دەنگ بەرزکردنەوە لە وتاردا لە کاتی پێویستدا:**

(عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ قال كان رسول اللَّهِ ﷺ إذا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ وَعَلَا صَوْتُهُ وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ يقول صَبَّحَكُمْ مَسَّاكُمْ....). [٣] جابری کوڕی عەبدوڵڵا ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ وتاری بدایە چاوەکانی سوور دەبوویەوەوە دەنگی بەرزدەبوویەوە زۆر تووڕە دەبوو هەتا دەتووت ئاگادارکەرەوەیە لە هاتنی لەشکرێك و دەیفەرموو: "ئەو سوپایە لەوانەیە بەیانی یا ئێوارە بدات بەسەرتاندا...".

**شەشەم: باسکردنی ناتەواوییەکان لە وتاردا بەبێ بریندارکردن و ناوزڕاندن:**

(عن شَبِيبِ أَبِي رَوْحٍ عن رَجُلٍ من أَصْحَابِ النبي ﷺ عن النبي ﷺ أَنَّهُ صلى صَلَاةَ الصُّبْحِ فَقَرَأَ الرُّومَ فَالْتَبَسَ عليه فلما صلى قال ما بَالُ أَقْوَامٍ يُصَلُّونَ مَعَنَا لَا يُحْسِنُونَ الطُّهُورَ فَإِنَّمَا يَلْبِسُ عَلَيْنَا الْقُرْآنَ أُولَئِكَ). [٤] شەبیبی ئەبو ڕەوح لە یەکێك لە هاوەڵانەوە دەگێڕێتەوە کە وتی: پێغەمبەر

---

١) رواه البخاری ٩٢٠ ومسلم ٨٦١/٣٣.

٢) رواه البخاري ٨١٩ ومسلم ٤٩/ ٨٧١.

٣) رواه مسلم ٤٣/ ٨٦٧، وابن ماجة ٤٥.

٤) رواه النسائي ١٥٦/٢ ٩٤٧.

ﷺ نوێژی بەیانی کردو تێیدا سورەتی ڕوومی خوێند و لێی تێکچوو کە نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: "ئەوە بۆچی کەسانێ لەگەڵماندا نوێژ دەکەن نازانن جوان دەستنوێژ بگرن، بێگومان ئا ئەوانە قورئانەکە لە ئێمە تێك دەدەن".

(عن ثَابِتٍ عن أَنَسٍ رضي الله عنه قال فَأَخَذَ يُوَاصِلُ، أي الصيام، رسول اللَّهِ ﷺ وَذَاكَ في آخِرِ الشَّهْرِ فَأَخَذَ رِجَالٌ من أَصْحَابِهِ يُوَاصِلُونَ فقال النبي ﷺ ما بَالُ رِجَالٍ يُوَاصِلُونَ إِنَّكُمْ لَسْتُمْ مِثْلِي....).[1] ئەنەس ڕەزای خوای لێبێت دەڵی: پێغەمبەر ﷺ لە کۆتایی مانگدا دەستی کرد بە ڕۆژوو گرتن چەند ڕۆژێك لەسەریەك چەند پیاوێکیش لە هاوەڵان بەسەریەکەوە ڕۆژوویان گرت جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "بۆچی کەسانێك لەسەریەك ـ بێئەوەی بەربانگ بکەنەوە ـ ڕۆژوو دەگرن ئێوە وەك من نین..".

**حەوتەم: لە کاتی دوعاکردنی وتاری دووەمدا نابێ دەستەکانی بەرز بکاتەوە:**

(عن عُمَارَةَ بن رُؤَيْبَةَ قال رَأَى بِشْرَ بن مَرْوَانَ على الْمِنْبَرِ رَافِعًا يَدَيْهِ فقال قَبَّحَ الله هَاتَيْنِ الْيَدَيْنِ لقد رأيت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ما يَزِيدُ على أَنْ يَقُولَ بيده هَكَذَا وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ الْمُسَبِّحَةِ).[2] عومارەی کوڕی ڕوئەیبە بیشری کوڕی مەروانی دی لەسەر مینبەر هەردوو دەستی بەرز کردبوویەوە وتی: خوا ئەو دوو دەستە نابووت کات، چونکە من پێغەمبەرم ﷺ دیوە ئاماژەی تەنها بە پەنجەی شایەتومانی دەکرد".

**فەرزی دووەم: کردنی دوو ڕکات نوێژ بە جەماعەت:**

(عن ابن عَبَّاسٍ أَنَّ النبي ﷺ كان يَقْرَأُ في صَلَاةِ الْفَجْرِ يوم الْجُمُعَةِ آلم تَنْزِيلُ السَّجْدَةِ و ( هل أتى على الْإِنْسَانِ حِينٌ من الدَّهْرِ) وَأَنَّ النبي ﷺ كان يَقْرَأُ في صَلَاةِ الْجُمُعَةِ سُورَةَ الْجُمُعَةِ وَالْمُنَافِقِينَ).[3] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ڕەزای خوای لێبێت دەڵی: پێغەمبەر ﷺ لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینییدا (الم ، تنزیل) (السجدة)ی دەخوێند و لە ڕکاتی

---

١) رواه مسلم ٥٩/ ١١٠٤.

٢) رواه مسلم ٥٣/ ٨٧٤.

٣) رواه البخاري ٨٩١ و ١٠٦٨، ومسلم ٨٧٩ و ٨٨٠.

دووەمیشدا (هل أتى على الانسان)ی دەخوێند. پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی هەینیدا سورەتی (الجمعة)و (المنافقين)ی دەخوێند"، واتە: سورەتی (الجمعة)ی لە ركاتێكدا دەخوێندو سورەتی (المنافقين)یش لە ركاتێكدا.

**حەوتەم: ئادابەكانی ڕۆژی هەینی:**

**١- خۆشۆردن:**

(عن عَبْدَ اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما يقول سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول من جاء مِنْكُمْ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ). [١] عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەر كەسێكتان هات بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوات".

(عن سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ قال قال النبي ﷺ لَا يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يوم الْجُمُعَةِ وَيَتَطَهَّرُ ما اسْتَطَاعَ من طُهْرٍ وَيَدَّهِنُ من دُهْنِهِ أو يَمَسُّ من طِيبِ بَيْتِهِ ثُمَّ يَخْرُجُ فلا يُفَرِّقُ بين اثْنَيْنِ ثُمَّ يُصَلِّي ما كُتِبَ له ثُمَّ يُنْصِتُ إذا تَكَلَّمَ الْإِمَامُ إلا غُفِرَ له ما بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى) [٢] سەلمانی فارسی (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەر پیاوێ ڕۆژی هەینی خۆی بشۆرێ چەند لە توانایدایە خۆی پاكو خاوێن كات وە لە ڕۆن یا بۆنی خۆشی ماڵەوەیان بدات لە سەرو ریشی، پاشان لە ماڵ دەرچێ بۆ مزگەوت ئەزێتی خەڵك نەداو هەنگاو نەنێت بە سەریاندا و لێكیان جیاكاتەوە، پاشان ئەوەندەی خوا بۆی نوسیووە نوێژی سوننەت بكات، پاشان كە ئیمام دەستی كرد بە وتاردان بێدەنگ بێت ئەوە خوا لە گوناهی نێوان ئەو هەینییەو هەینییەكەی تری خۆش دەبێت".

**٢- زوو ڕۆشتن بۆ مزگەوت:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من اغتسل يوم الْجُمُعَةِ غُسْلَ الْجَنَابَةِ ثُمَّ رَاحَ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً وَمَنْ رَاحَ في السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً وَمَنْ رَاحَ في السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشًا أَقْرَنَ وَمَنْ رَاحَ في السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً وَمَنْ رَاحَ في السَّاعَةِ

١) رواه البخاري ٨٩٤ و ٨٧٧ و ٩١٩ ومسلم ٢/ ٨٤٤.

٢) رواه مسلم ٥٩/ ١١٠٤.

الْخَامِسَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضَةً فإذا خَرَجَ الْإِمَامُ حَضَرَتْ الْمَلَائِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ).[١] ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "هەركەسێ رۆژی هەینی خۆی بشۆرێ و پاشان لە ساتی یەكەمدا رۆیشت بۆ مزگەوت وەك ئەوە وایە وشترێكی كردبێ بە خێر ئەو كەسەش لە ساتی دووەمدا رۆشت بۆ مزگەوت وەك ئەوە وایە مانگایەكی كردبێت بە خێر ئەو كەسەش لە ساتی سێیەمدا رۆشت بۆ مزگەوت وەك ئەوە وایە بەرانێكی شاخداری كردبێ بەخێر ئەو كەسەش لە ساتی چوارەمدا رۆشت بۆ مزگەوت وەك ئەوە وایە مریشكێكی كردبێ بە خێر ئەو كەسەش لە ساتی پێنجەمدا رۆشت بۆ مزگەوت وەك ئەوە وایە هێلكەیەكی كردبێ بە خێر جاكاتێ ئیمام هات فریشتەكان ئامادە دەبن گوێ لە وتارەكەی دەگرن".

**٣. كردنی دوو ركات نوێژ كاتی چوونە مزگەوت:**

(عَنْ جَابِرٍ قَالَ رضي الله عنه قال قال رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ والإمام يَخْطُبُ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ وَلْيَتَجَوَّزْ فِيهِمَا).[٢] جابر (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەگەر كەسێكتان رۆژی هەینی هات بۆ مزگەوت و ئیمام وتاری دەدا با دوو ركات نوێژی سوننەت بكاتو درێژەی نەداتێ".

**٤. گوێگرتن لە وتار واجبەو قسەكردن حەرامە:**

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال: إذا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ يوم الْجُمُعَةِ أَنْصِتْ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ).[٣] ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەگەر لە رۆژی هەینییدا بەهاورێكەت ووت گوێبگرە كاتێ ئیمام وتاری دەخوێندەوە ئەوە قرقرت كردووە".

**٥. زۆر سەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ:**

(عن شداد بن أَوْسٍ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ إِنَّ من أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يوم الْجُمُعَةِ فيه خُلِقَ آدَمُ وَفِيهِ قُبِضَ وَفِيهِ النَّفْخَةُ وَفِيهِ الصَّعْقَةُ فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ من الصَّلَاةِ فيه فإن صَلَاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ قال قالوا

---

١) رواه البخاري ٨٨١ ومسلم ٨٥٠.

٢) رواه مسلم ٨٧٥.

٣) رواه البخاري ٩٣٤ ومسلم ٨٥١.

يا رَسُولَ اللّٰهِ وَكَيْفَ تُعْرَضُ صَلَاتُنَا عَلَيْكَ وقد أَرِمْتَ فقال إنَّ اللَّهَ عز وجل حَرَّمَ على الأرض أن تأكل أَجْسَادَ الأنْبِيَاءِ).[١] شەددادی کوڕی ئەوس (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "بێگومان ڕۆژی هەینی لە ڕۆژە زۆر چاکەکانتانە لەو ڕۆژەدا ئادەم ـ علیه السلام ـ دروست کراوەو تێیدا گیانی کێشراوەو تێیدا فوو دەکرێ بە شەیپوورداو گیانداران دەمرد، لەو ڕۆژەدا زۆر سەڵاوات لەسەر من بدەن، چونکە سەڵاواتەکانی ئێوەم پیشان دەدرێت"، جا پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن سەڵاواتەکانی ئێمە پیشان تۆ ئەدرێ لە کاتێکدا تۆر رزیویت لە گۆڕدا؟ فەرمووی: "خوا ڕێگەی نەداوە بە زەوی لاشەی پێغەمبەران بخوات".

**٦ـ خوێندنی سورەتی (الکهف):**

(عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال: من قرأ سورة الكهف يوم الجمعة أضاء له من النور ما بين الجمعتين).[٢] ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەر کەس ڕۆژی هەینی سورەتی (کهف) بخوێنێ خوا نێوان ئەو هەینییەو هەینی داهاتووی بۆ ڕووناك دەکاتەوە".

**٧ـ زۆر دوعا کردن: بەڵکو بکەوێتە ئەو کاتەو کە دوعای تێدا گیرا دەبێت:**

(عن أبي هريرة رضي الله عنه قال قال رسول اللّٰهِ ﷺ إن في الجمعة لساعة، لا يوافقها مسلم وهو قائم يصلي يسأل الله فيها خيرا إلا أعطاه الله تعالى إياه، وقال بيده يقللها ويزهدها).[٣] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "لە ڕۆژی هەینیدا ساتێك هەیە هەر موسڵمانێ لە وساتەدا هەستابێ نوێژ بکاتو لە خوای گەورە داوای خێرو چاکە بکات، بێگومان خوا دەیداتێ", جا بە دەستی ئاماژەی کرد، ساتەکەی بە کەم دانا".

---

١) رواه أحمد ٨/٤ وابوداود ٥٣١ والنسائي: ٩١/٣ (١٣٧٤).

٢) رواه الحاكم ٣٦٨/٢، والبيهقي ٤٩/٣ حديث صحيح.

٣) رواه البخاري ٩٣٥، ومسلم ٨٥٢ واحمد ٢٣٠/٢.

**هەشتەم: چەند وردە بابەتێک:**

**١ـ نوێژی سوننەت پاش نوێژی هەینی:**

(عن أبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا صلى أحدكم الْجُمُعَةَ فَلْيُصَلِّ بَعْدَهَا أَرْبَعًا). [١] ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر کەسێکتان نوێژی هەینی کرد با لە دوایەوە چوار رکات نوێژی سوننەت بکات".

(عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّهُ ﷺ كَانَ يُصَلِّي بعد الجمعة رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ). [٢] هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دوای نوێژی هەینی لە ماڵەوە دوو رکات نوێژی سوننەتی دەکرد".

**٢ـ ئەگەر جەژن و هەینی لە یەك رۆژدا بوون:**

(عن زيد بن أرقم رضي الله عنه وسأله معاوية: هل شهدت مع رسول الله ﷺ عيدين اجتمعا؟ قال: نعم صلى العيد في أول النهار، ثم رخص في الجمعة فقال: من شاء أن يجمع فليجمع). [٣] زەیدی کوڕی ئەرقەم (رەزای خوای لێبێت) موعاویە پرسیاری لێ کرد ئایا دیوتە لە سەردەمی پێغەمبەردا دوو جەژن ـ جەژن و هەینی ـ لە رۆژێکدا کۆببنەوە؟ وتی: بەڵێ، لە سەرەتای رۆژەوە نوێژی جەژنی کرد، پاشان روخصەتی دا بۆ نەکردنی نوێژی هەینی فەرمووی: "هەرکەس ویستی نوێژی هەینی بکات با بیکات". واتە: هەرکەسیش نەیکات قەیناکات.

**٣ـ ئەگەر جەژن و هەینی لە رۆژێکدا بوون سوننەتە ئیمام نوێژی هەینی بکات:**

بۆ ئەوەی ئەوانەی ئامادەی نوێژی جەژن نەبوون نوێژی هەینی بکەن، (عن أبِي هُرَيْرَةَ عن رسول اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قال قد اجْتَمَعَ فِي يَوْمِكُمْ هذا عِيدَانِ فَمَنْ شَاءَ أَجْزَأَهُ من الْجُمُعَةِ وَإِنَّا مُجَمِّعُونَ). [٤] ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "لە ئەمڕۆدا دوو جەژن

---

١) رواه مسلم ٦٧/ ٨٨١ وابوداود ١١٣١.

٢) رواه البخاري ٩٣٧ ومسلم ٨٨٢ وابوداود ١١٣٢.

٣) رواه احمد ٣٧٢/٤ وابوداود ١٠٧٠ حديث صحيح.

٤) رواه ابوداود ١٠٧٣، وابن ماجة ١١٣١ حديث صحيح.

کۆبووەتەوە جا ئەوەی نوێژی جەژنی کردووە ئەوە بەری نوێژی هەینیش کەوتووە، بەڵام ئێمە نوێژی هەینی دەکەین".

**٤ـ کەسێ هات بۆ نوێژی هەینی نوێژی سوننەت دەکات:**

دەتوانێ چەند بیەوێ نوێژی سوننەت بکات هەتا ئیمام دەست بە وتار دەکات ئیتر نابێ سوننەت بکات.

(عن أبي هُرَيْرَةَ عن النبي ﷺ قال من اغْتَسَلَ ثُمَّ أتى الْجُمُعَةَ فَصَلَّى ما قُدِّرَ له ثُمَّ أَنْصَتَ حتى يَفْرُغَ من خُطْبَتِهِ ثُمَّ يُصَلِّي معه غُفِرَ له ما بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى وَفَضْلُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ). [١]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەرکەس خۆی بشۆرێ، پاشان بێت بۆ نوێژی هەینی چەندی بۆ نووسرابو نوێژی سوننەت بکات، پاشان بێدەنگ بێ تا ئیمام لە وتارەکەی دەبێتەوە، پاشان نوێژەکەی هەینی لەگەڵ ئیمامدا بکات ئەو خوا لە گوناهی نێوان ئەو دوو هەفتەیەو سێ ڕۆژیشی لەسەر بێ خۆش دەبێت".

---

١) رواه مسلم ٨٥٧/٢٦٠.

# نوێژی سەفەر

**یەکەم: خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴾ الحج: ٧٨ واتە: خوای گەورە لە ئاییندا هیچ کارێکی قورس‌و گرانی لەسەر دانەناون. بەڵکو هەر کاتێ موسڵمان بکەوێتە تەنگییەکەوە لە هەر کارێك لە کارەکانی ئاینەکەیدا خوا بۆی ئاسان‌و سانا دەکات بۆ ئەوەی بڕیارەکانی جێگای ڕەزامەندی بێت‌و لە توانا بەندەکاندا بێت.

لەم باسەدا ئاسانکاری و مەرجەکانی شێوەی سوود لێ بێنێ باس دەکەین.

**دووەم: نوێژی ڕێبوار (المسافر) چۆنە:**

ڕێبوار لە نوێژەکەیدا لە دوو ڕووەوە ئاسانکاری بۆ کراوە.

١ـ کەم کردنەوەی ژمارەی ڕکاتەکان کە پێی دەوترێت کورتکردنەوە.

٢ـ کۆکردنەوەی دوو نوێژ پێکەوەو کردنیان لە یەك کاتدا کە پێی دەوترێت کۆکردنەوە.

**کورتکردنەوە:** واتە ئەو نوێژانەی چوار ڕکاتن وەك نیوەڕۆو عەسرو عیشا کورت کرێتەووە بۆ دوو ڕکات لە بری چوار ڕکات، وەك دواتر ڕوونی دەکەینەوە.

**بەڵگەی ئەم نوێژ کورتکردنەوە ئەم بەڵگانەیە:** خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ ﴾ النساء: ١٠١ واتە: کاتێ سەفەرتان کرد تاوانبار نابن نوێژ ـ ی چوار ڕکاتی ـ کورت بکەنەوە.

(عن يَعْلَى بن أُمَيَّةَ قال قلت لِعُمَرَ بن الْخَطَّاب أَرَأَيْتَ إِقْصَارَ الناس الصَّلَاةَ وَإِنَّمَا قال تَعَالَى (إن خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمْ الَّذِينَ كَفَرُوا) فَقَدْ ذَهَبَ ذلك الْيَوْمَ فقال عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ منه فَذَكَرْتُ ذلك لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فقال صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ الله بها عَلَيْكُمْ فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ).[١] یەعلای کوڕی ئومەیە دەڵێ: وتم بە عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) ئەم ئایەتە (إن خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمْ

١) رواه مسلم ٢٦/ ٨٥٧.

الَّذِينَ كَفَرُوا) واتە: گوناهتان ناگات نوێژ کورت بکەنەوە ئەگەر ترسان لە کافران تووشی بەڵاو زیانتان کەن، دەی خۆ ئێستا خەڵك ترسی نییەو نوێژیش کورت دەکەنەوە؟ عومەر وتی: منیش وەك ئەوەم پێ سەیر بوو بۆیە پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کردو لەوبارەیەوە فەرمووی: "ئەوە بەخششێکی خواییە پێی بەخشیون ئێوەش بەخشینەکەی وەرگرن".

(عن عبدالله بن عُمَرَ رضي الله عنهما يقول صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَكَانَ لَا يَزِيدُ فِي السَّفَرِ على رَكْعَتَيْنِ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ كَذَلِكَ). [1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێ: لەسەفەردا هاوڕێ پێغەمبەر ﷺ بووم، لە سەفەردا دوو رکات زیاتری نەدەکرد ـ لە نوێژی چوار رکاتی ـ هەروەها ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانیش بەهەمان شێوەیان دەکرد".

**سێیەم: حوکمی نوێژ کورت کردنەوە:**

**١ـ نوێژ کورتکردنەوە لە سەفەردا واجبە:** (عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت: فُرِضَتْ الصَّلَاةُ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ هَاجَرَ النبي ﷺ فَفُرِضَتْ أَرْبَعًا وَتُرِكَتْ صَلَاةُ السَّفَرِ على الأول). [2] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: نوێژ لە سەرتاوە کە فەرز کرا دوو رکات بوو، پاشان پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد نوێژی چوار کات فەرز کرا، بەڵام نوێژی سەفەر لەسەر دوو رکاتی پێشوو مایەوە". وەك پێشتر باسمان کرد پێغەمبەریش ﷺ هەمیشە لە سەفەردا دوو رکاتی کردووە هەروەها هاوەڵانیشی هەر دوو ڕکاتیان کردووە ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ واجبە ئەگەر وانەبوایە دەبوو بۆ جارێکیش بوایە چوار رکاتی بکردایە تا بزانرایە واجب نییە.

**٢ـ مەرجی ئەو سەفەرەی نوێژی تێدا کورت دەکرێتەوە:**

**أ ـ ماوەی کورت کردنەوە:**

زانایان راجیان لەو ماوەی کە نوێژی تێدا کورت دەکرێتەوە زۆریش قسەو باسیان لەو بارەیەوە کردووە، بەڵام ئەوەی لە سەرنجدانی بەڵگەو قسەی زانایان بۆمان روون دەبێتەوە ئەوەیە کە قسەی بەهێزو پوخت لەو مەسەلەیدا قسەو رای ئیبن تەیمییەو ئیبن قەیمی جەوزییە:

---

١) رواه البخاري ١١٠٢ ومسلم ٦٩٤.

٢) رواه البخاري ٣٩٣٥ ومسلم ٦٨٥.

ئیبن تەیمیە دەڵێ: هەر ناوێ نەلە زمانەوانیدا پێناسەیەکی دیاری کراوی هەبوو نە لە شەرعدا ئەوە بۆ دیاری کردنی دەگەڕێتەوە بۆ عورفو عادەت، کەواتە ئەوەی بە عورفو عادەتی خەڵك سەفەر بێت ئەوە ئەو سەفەرەیە خوا حوکمو بڕیارەکانی پێوە پەیوەست کردووە".[١]

ئیبنولقەییمیش دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی دیاری کراوی بۆ ئوممەتەکەی دیاری نەکرد بۆ نوێژ کورتکردنەوەو رۆژوو شکاندن، بەڵکو بە رەهایی باسی کردووە لەهەر سەفەرێکدا بێت و هەرچۆنێك تەیەمومیش بەرەهایی باسکردووە لەهەر سەفەرێکدا بێت کورت بێت یا درێژ، ئەوەش کە ریوایەت دەکرێ لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە دیاری کردنی ماوەی سەفەرە بە دوو یا سێ رۆژ ئەو هیچیان راست نین و خواش زاناترە".[٢]

مەبەستی ئەوە نییە کە ئەو فەرموودانە راست نین، چونکە فەرموودەی دوو و سێ رۆژ باسی سەفەر بکات هەیەو سەحیحە. بەڵام باسی دیاری کردنی ماوەی سەفەر نییە و تێیاندا نییە بڵێت لە دوو یا سێ رۆژ کەمتر پێی ناوترێت سەفەر.

**ب ـ لە کوێوە نوێژ کورت دەکرێتەوە:**

بە دەرچوون لە سنووری شارەکە یا گوندەکە نوێژ کورت کردنەوە دەست پێدەکات، ئەمە رای جەماوەری زانایانە.

**ج ـ ماوەی نوێژ کورت کردنەوە:**

(عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ قال أَقَامَ رسول اللَّهِ ﷺ بِتَبُوكَ عِشْرِينَ يَوْمًا يَقْصُرُ الصَّلَاةَ).[٣]

جابیر (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ لە تەبووك بیست رۆژ مایەوە نوێژی کورت دەکردەوە".

هەروەها ئەگەر نیەتی هەبوو نیشتەجێ ببێ و بە سەفەری نەمێنێت ئەوە دوای نۆزدە رۆژ دەبێت نوێژی تەواو بکاتو کورتی نەکاتەوە، بە بەڵگەی فەرموودەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رەزای خوای لێبێت)

---

١) بروانە (مجموع الفتاوى) ٢٤/٤٠.

٢) زاد المعاد ١/ ٤٦٢.

٣) رواه ابوداود ١٢٣٥ حديث صحيح.

(عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: لما فتح النبي ﷺ مكة أقام فيها تسع عشرة يصلي ركعتين، قال: فنحن إذا سافرنا تسعة عشر قصرنا وإن زدنا أتممنا).[1] دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ شاری مەککەی ئازاد کرد نۆزدە ڕۆژ تێیدا مایەوە نوێژی کورت دەکردەوەو بە دوو رکاتی دەیکرد بۆیە ئێمە ئەگەر سەفەرمان بکردایە و نۆزدە ڕۆژ بمایناپەتەوە نوێژمان کورت دەکردەوە، بەڵام ئەگەر زیاتر بمایناپەتەوە نوێژمان بە تەواوی دەکرد و کورتمان نەدەکردەوە".

**د ـ نوێژی سوننەت کردن لە سەفەردا:**

ئیبنولقەیم دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە سەفەردا سوننەتی وابوو تەنها نوێژی فەرزی دەکرد و لێی نەبیستراوە لە سەفەردا نوێژی سوننەتی کردبێت، جگە لە سوننەتی ویترو دوو رکاتی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی کە نە لە سەفەرداو نە لە ماڵەوە وازی لێنەهێناون‌و هەر کردوونی.

(قال ابن عمر، وقد سئل عن ذلك، فقال: إني صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ في السَّفَرِ فلم يَزِدْ على رَكْعَتَيْنِ حتى قَبَضَهُ الله وَصَحِبْتُ أَبَا بَكْرٍ فلم يَزِدْ على رَكْعَتَيْنِ حتى قَبَضَهُ الله وَصَحِبْتُ عُمَرَ فلم يَزِدْ على رَكْعَتَيْنِ حتى قَبَضَهُ الله ثُمَّ صَحِبْتُ عُثْمَانَ فلم يَزِدْ على رَكْعَتَيْنِ حتى قَبَضَهُ الله وقد قال الله (لقد كان لَكُمْ في رسول اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ)[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لەوبارەیەوە پرسیاری لێ کرا وتی: لەسەفەردا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بووم لە دوو رکات زیاتری نەدەکرد هەتا وەفاتی کرد. لەگەڵ ئەبوبەکردا (ڕەزای خوای لێبێت) بووم لەسەفەردا ئەویش لە دوو رکات زیاتری نەدەکرد هەتا وەفاتی کرد، وە لەسەفەردا لەگەڵ عومەردا (ڕەزای خوای لێبێت) بووم ئەویش لە دو رکات زیاتری نەدەکرد هەتا وەفاتی کرد پاشان لەگەڵ عوسمان دا (ڕەزای خوای لێبێت) بووم لەسەفەردا ئەویش لە دو رکات زیاتری نەدەکرد تا وەفاتی کرد، بێگومان خوای گەورە دەفەرموێت: (لقد كان لَكُمْ في رسول اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ) واتە: بێگومان لە پێغەمبەر ﷺ چاکترین سەرمەشقی بۆ ئێوە هەیە.

پاشان ئیبنولقەیم دەڵێ: بەڵام فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەرە ﷺ کە نوێژی سوننەتی دەکرد بەسەر وڵاخەکەیەوەو بەرەو هەر شوێنێك بڕۆشتایە".

---

١) رواه البخاري ١٠٨٠.

٢) رواه البخاري ١١٠١ ومسلم ٨/ ٦٨٩.

(عن عبدالله بن عمر أن رسول الله ﷺ كان يصلي سبحته حيثما توجهت به ناقته).[١]
عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی سوننەتی بەسەر وڵاخەکەیەوە دەکرد رووی لەهەر شوێنێك بوایە نوێژی ویتریشی بەسەروە دەکرد، بەڵام نوێژی فەرزی بەسەرەوە نەدەکرد".

**هـ ـ کۆکردنەوەی نوێژ لە شاردا لەبەر پێویستی:**

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: کۆمەڵێك لە پێشەوایان دەڵێن کۆکردنەوەی نوێژ لە شاردا لەبەر پێویستی دروستە گەر ئەو کەسە نەیکات بە خوویەکی هەمیشەیی، ئەمە رای ئیبن سیرینو ئەشهەبە لە زانایانی مالیکیو خەتتابیش گێڕاویەتییەوە لە قەففالی شاشی گەورەوە ئەویش لە ئیسحاقی میروەزییەوە لە کۆمەڵێك لە زانایانی فەرمووده وە دەگێڕنەوە ئیبن مونزیریش ئەم رایەی هەڵبژاردووە بە لایەوە راستە".[٢]

وتەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێت) پشتیوانی لەو بۆچوونە دەکات کە دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆو عەسری لە مەدینە کۆکردەوەو پێکەوە کردنی. نەترس بوو نە سەفەر بوو، ئەبوزوبەیر وتی: پرسیارم لە سەعید کرد: بۆچی ئەو نوێژەی وا کرد؟ ئەویش وتی: ئەم پرسیارەی تۆم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس کرد وتی: پێغەمبەر ﷺ ویستی ئوممەتەکەی نارەحەت نەبێ".[٣]

(عن ابن عَبَّاسٍ قال جَمَعَ رسول اللّهِ ﷺ بين الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِالْمَدِينَةِ في غَيْرِ خَوْفٍ ولا مَطَرٍ (في حيث أبي كريب) قال قلت لابن عَبَّاسٍ لم فعل ذلك؟ قال أَرَادَ أَنْ لَا يُحْرِجَ أُمَّتَهُ).[٤] لە شێوەی گێڕانەوەیەکی تردا دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەدینەدا نوێژی نیوەڕۆو عەسری پێکەو کرد، مەغریبو عیشاشی پێکەوە کرد، نەترس بوو نەباران ئەبوکورەیب وتی: وتم بە عەبدوڵڵا بۆچی وای کرد؟ وتی بۆ ئەوەی ئوممەتەکەی نارەحەت نەبێ.

---

١) رواه البخاري ١٠٩٨ ومسلم ٣٩/٧٠٠.
٢) بروانە: (شرح صحیح مسلم للنووي ٢١٩/٥).
٣) رواه مسلم ٧٠٥/٥٠.
٤) رواه مسلم ٧٠٥/٥٤.

لەم فەرموودانەوە بۆمان دەردەکەوێ ڕێگەدان بە کۆکردنەوەی نوێژ لە شاردا لەبەر پێویستی ڕایەکی بەجێیە لەبەرئەوەی فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بە ئاشکراو وا دەگەیەنێ کە دەڵێ (أراد أن لا يحرج أمته) کە نەخۆشی یا هۆیەکی تری نەکردە هۆی کۆکردەنەوەی نوێژەکان، بەڵکو هۆکەی بۆ لابردنی نارەحەتی و قورسی گێڕایەوە کەواتە ئەو ڕایە دەچەسپێ کە دەڵێ کۆکردنەوەی نوێژەکان لەبەر پێویستی و ناچاری دروستە، بەڵام نابێ بکرێتە عادەتو خوو هەمیشە پێویست بێت یان نا هەر کۆبکرێتەوەە بەڵکو تەنها لە حاڵەتی پێویستییدا دەکرێو بەس.

**و ـ کۆکردنەوەی نوێژ بە بانگێك دوو قامەت دەکرێ بەبێ نوێژی سوننەت لە نێوانیاندا:**

(عن جابر رضي الله عنه أن النبي ﷺ صلى الصلاتين بعرفة بأذان واحد وإقامتين، وأَتَى الْمُزْدَلِفَةَ فَصَلَّى بِهَا الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا شَيْئًا ثُمَّ اضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ).[1] جابیر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵی: پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفەدا دوو نوێژی کۆکردەوە پێکەوە کردنی بە یەك بانگو دوو قامەت، ڕۆشت بۆ موزەدەلیفەش نوێژی مەغریبو عیشا بەیەك بانگ و دوو قامەت کرد، نوێژی سوننەتیشی نەکرد لە نێوانیاندا پاشان ڕاکشا تا سپێدە هەڵهات ـ نوێژی بەیانی بوو ـ".

**ز ـ کۆکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا:**

(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ – رضى الله عنه – قَالَ كَانَ النَّبِىُّ ﷺ إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الظُّهْرَ إِلَى وَقْتِ الْعَصْرِ ، ثُمَّ يَجْمَعُ بَيْنَهُمَا ، وَإِذَا زَاغَتْ صَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ رَكِبَ).[2] ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵی: "ئەگەر پێغەمبەر ﷺ پێش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان بە ڕێگادا بڕۆشتنایە نوێژەی نیوەڕۆ دوادەخست بۆ کاتی عەسر پاشان دادەبەزی پێکەوە دەیکردن، بەڵام ئەگەر خۆر لای بدایە لەناوەڕاستی ئاسمان پێش ڕۆیشتن ئەو نوێژی نیوەڕۆی دەکردو پاشان سواری وڵاخەکەی دەبوو دەڕۆیشت".

---

١) رواه مسلم ١٢١٨ واحمد ٣/٣٢٠.

٢) رواه البخاري ١١١٢ ومسلم ٤٦/ ٧٠٤ واحمد ٥/٢٤١.

(عن مُعَاذِ بن جَبَلٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كان في غَزْوَةِ تَبُوكَ إذا زَاغَتْ الشَّمْسُ قبل أَنْ يَرْتَحِلَ جَمَعَ بين الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَإِنْ يَرْتَحِلْ قبل أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الظُّهْرَ حتى يَنْزِلَ لِلْعَصْرِ وفي الْمَغْرِبِ مِثْلُ ذلك إن غَابَتْ الشَّمْسُ قبل أَنْ يَرْتَحِلَ جَمَعَ بين الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ وَإِنْ يَرْتَحِلْ قبل أَنْ تَغِيبَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الْمَغْرِبَ حتى يَنْزِلَ لِلْعِشَاءِ ثُمَّ جَمَعَ بَيْنَهُمَا).[1] موعازی کوڕی جەبەل (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵی: پێغەمبەر ﷺ لە غەزای تەبووکدا ئەگەر پێش ڕۆیشتن نیوەڕۆ بهاتایە ئەوە نوێژی نیوەڕۆو عەسری کۆدەکردەوەو پێکەو دەیکردن، بەڵام ئەگەر پێش کاتی نیوەڕۆ بڕۆشتایە ئەو کاتە نوێژی نیوەڕۆی دوادەخست تا بۆ عەسر دادەبەزی هەردووکی کۆدەکردوەوەو پێکەوە دەیکردن، لە مەغریبیشدا هەر بەم جۆرە ئەگەر پێش ڕۆشتن خۆرئاوا ببوایە ئەوە نوێژی مەغریبو عیشای پێکەوە ـ لە کاتی مەغریب ـ دەکرد، بەڵام ئەگەر پێش خۆرئاوابوون بڕۆشتایە ئەوکات نوێژی مەغریبی دوادەخست تا بۆ عیشا دادەبەزی و هەردووکی ـ لە کاتی عیشادا ـ دەکرد".

---

١) رواه احمد ٥/٢٤١ وابوداود ١٢٠٦ والترمذي ٥٥٣ حديث صحيح.

# نوێژی هەردوو جەژنەکە

**یەکەم: حوکمی نوێژی جەژن:** نوێژی جەژن واجبە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەردەوام بووە لەسەری و فەرمانی کردووە خەڵکی لە شار بڕۆنە دەرەوە بۆ ئەنجامدانی.

(عن أُمِّ عَطِيَّةَ قالت أَمَرَنَا رسول اللَّهِ ﷺ أَنْ نُخْرِجَهُنَّ في الْفِطْرِ وَالأَضْحَى الْعَوَاتِقَ وَالْحُيَّضَ وَذَوَاتِ الْخُدُورِ فَأَمَّا الْحُيَّضُ فَيَعْتَزِلْنَ الصَّلَاةَ وَيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ قلت يا رَسُولَ اللَّهِ إِحْدَانَا لَا يَكُونُ لها جِلْبَابٌ قال لِتُلْبِسْهَا أُخْتُهَا من جِلْبَابِهَا)[1] ئومو عەتییە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردین کە ئافرەتان بنێرین بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزانو قوربان ـ لەوانەش ـ کچە عازەبو ئەوانەشی لە حەیزدان، ئەوانەش کە خۆیان دەرنەدەخست، جا حەیزدارەکان نوێژیان نەدەکرد، بەڵام ئامادەی خێرو دوعای موسڵمانان دەبوون، ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا یەکێکمان عابای نییە؟ فەرمووی: با خوشکەکەی بیخاتە ژێر عاباکەی خۆیەوە".

**دووەم: کاتی نوێژی جەژن:**

(عن عبد اللَّهِ بن بُسْرٍ صَاحِبُ رسول اللَّهِ ﷺ أنه خَرَجَ مع الناس يَوْمِ عِيدِ فِطْرٍ أو أَضْحَى فَأَنْكَرَ إِبْطَاءَ الْإِمَامِ فقال إِنَّا كنا قد فَرَغْنَا سَاعَتَنَا هذه وَذَلِكَ حين التَّسْبِيحِ)[2] عەبدوڵڵای کوڕی بوسر (ڕەزای خوای لێبێت) کە هاوەڵی پێغەمبەرە ﷺ لە جەژنێکی ڕەمەزان یا قورباندا لەگەڵ خەڵکەکە لەشار چووە دەرەوە ئینکاری درەنگ کردنی ئیمامی کردو وتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئەم کاتانە نوێژمان کردبوو، کاتەکەش کاتی چێشتەنگاو بوو".

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کاتی نوێژ لە خۆرهەڵهاتنەوە دەست پێدەکات و ئەوەش دەگەیەنێ کە زوو ڕۆشتن بۆ نوێژی جەژن سوننەتە و زۆر دواخستنی کەراهەتی هەیە.

---

١) رواه البخاري ٩٧٤ ومسلم ١٢/ ٨٩٠ واحمد ٨٤/٥ وابوداود ١١٣٦ والترمذي ٥٣٩ وابن ماجه ١٣٠٨ والنسائي ١٨٠/٣.

٢) رواه ابوداود ١١٣٥ وابن ماجه ١٣١٧ حديث صحيح.

**سێ یەم: ڕۆشتنە دەرەوەی شار بۆ نوێژگە:**

(عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قال كان رسول اللَّهِ ﷺ يَخْرُجُ يوم الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى إلى الْمُصَلَّى فَأَوَّلُ شَيْءٍ يَبْدَأُ بِهِ الصَّلَاةُ) ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ هەمیشە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو ڕۆژی جەژنی قوربان دەرۆشتە دەرەوەی شار بۆ نوێژگە یەکەم شتێك کە دەیکرد نوێژی جەژن بوو..".[1]

لەگەڵ گەورەیی نوێژ لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ لە مەدینە کە دەفەرموێ: (صَلَاةٌ في مَسْجِدِي هذا خَيْرٌ من أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ إلا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ) "نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا لە هەزار نوێژی شوێنی تر گەورەترە جگە لە کەعبە".[2] لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ دەرۆشتە دەرەوەی مەدینە بۆ ئەنجامدانی نوێژی جەژنەکان.

بەڵام ئەگەر عوزر هەبوو وەك باران و شتی لەو جۆرە، یان هەندێ کەس لەبەر نەخۆشی یا پیری نەیتوانی بڕوات بۆ نوێژگە لەدەرەوەی شار ئەوە قەیناکا لە مزگەوت نوێژەکەی بکات.

بەڵام لە مەککەدا نوێژی جەژن لە کەعبەدا دەکرێت، چونکە خەلیفەو پێشەوایانی ئیسلام هەر لە مەککەدا نوێژی جەژنیان کردووە و ئەوە گەورەترە تا چوونە دەرەوە بۆ نوێژگە.[3]

**چوارەم: نوێژی جەژن چۆن دەکرێت:**

**أ ـ بانگو قامەتی نییە:**

نوێژی جەژن نەبانگی بۆ دەدرێ نەقامەتی بۆ دەکرێو وتنی (الصلاه جامعة) سوننەت نییە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە.

(قال عَطَاءٌ عن بن عَبَّاسٍ وَعَنْ جَابِرِ بن عبد اللَّهِ الْأَنْصَارِيِّ قالا لم يَكُنْ يُؤَذَّنُ يوم الْفِطْرِ ولا يوم الْأَضْحَى ثُمَّ سَأَلْتُهُ بَعْدَ حِينٍ عن ذلك فَأَخْبَرَنِي قال أخبرني جَابِرُ بن عبد اللَّهِ الْأَنْصَارِيُّ أَنْ لَا أَذَانَ لِلصَّلَاةِ يوم الْفِطْرِ حين يَخْرُجُ الْإِمَامُ ولا بَعْدَ ما يَخْرُجُ ولا إِقَامَةَ ولا نِدَاءَ ولا شَيْءَ لَا نِدَاءَ

١) رواه البخاري ٩٥٦ ومسلم ٨٨٩ والنسائي ١٨٧/٣.

٢) رواه البخاري ١١٩٠ ومسلم ١٣٩٤.

٣) بروانە (المجموع للنووي) ٥٢٤/٥.

يَوْمَئِذٍ ولا إِقَامَةَ) [١] عەتا دەڵێ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس‌و جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنساری (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێن: "بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان‌و جەژنی قوربان بانگ نەئەدرا "، عەتا دەڵێ پاش ماوەیەك پرسیارم لێ کرد لەو بارەیەوە ؟ جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری پێ ی ووتم : بانگ دان نیە بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان نە لە کاتی هاتنی ئیمام نە قامەت و نە بانگ و هیچ نیە لە کاتی پێغەمبەردا ﷺنە بانگ دان نە قامەت کردن نەبوو- بۆ نوێژی جەژن- .

**ب ـ نوێژی جەژن دوو ركاتە:**

بە (الله اكبر) دەس پێدەکات، پاشان دوعای سەرەتای نوێژ دەخوێنێ، پاشان حەوت (الله اكبر) دەکات لەگەڵ هەر (الله اكبر)ێکدا هەردوو دەستی بەرز دەکاتەوە تا ئاستی شانەکانی، بەئەندازەی ئایەتێکی مامناوەندی (الله أكبر)ەکان نێوانیان هەبێت ئەم زیکرە لە نێوانیاندا بلێ: (سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اكبر) پاشان (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم) بلێ‌و سورەتی فاتیحە بخوێنێ‌و پاشان سورەتێك یا چەند ئایەتێك بخوێنێ، ئەنجا هەڵسایەوە بۆ رکاتی دووەم پێش خوێندنی فاتیحە پێنج (الله اكبر) بکات جگە لە (الله اكبر)ی هەستانەوەو لە نێوانیاندا (سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اكبر) بخوێنێ.

(ذكر عن ابن مسعود رضي الله عنه أنه قال: يحمد الله ويثنى عليه ويصلي على النبي ﷺ ذكره الخلال). [٢] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "لەنێوان (الله اكبر)ەکاندا سوپاس‌و ستایشی خوا بکرێت و سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر بدرێ". (وكان ابن عمر مع تحريه للاتباع يرفع يديه مع كل تكبيرة). [٣] هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عومەر سەرەڕای پابەندی بە شوێنکەوتنی سوننەتەوە لەگەڵ هەموو (الله اكبر)ێکدا دەستەکانی بەرز دەکردەوە.

---

١) رواه البخاري ٩٦٠ ومسلم ٨٨٦/٥ واللفظ لمسلم.

٢) رواه البيهقي في السنن ٢٨٥/٣.

٣) بڕوانە کتێبی (التمهيد) ٣٧/١٦.

(عن ابن عَبَّاسٍ أَنَّ النبي ﷺ صلى يوم الْفِطْرِ رَكْعَتَيْنِ لم يُصَلِّ قَبْلَهَا ولا بَعْدَهَا ثُمَّ أتى النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلَالٌ فَأَمَرَهُنَّ بالصَّدَقَةِ فَجعَلْنَ يُلْقِينَ ، تُلْقِي الْمَرْأَةُ خُرْصَهَا وَسِخَابَهَا).[١] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنی ڕەمەزانی کرد لە پێش‌و دوایەوە نوێژی سوننەتی نەکرد، پاشان ڕۆشت بۆ لای ئافرەتان‌و بیلالیشی لەگەڵدا بوو، جا فەرمانی پێکردن بە ماڵ بەخشین، ئافرەتەکانیش ملوانەکەو ئەڵقەی ئاڵتونیان دەهاوێشتە سەر ئەو جلەی بیلال ڕایخستبوو".

(عن عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كان يُكَبِّرُ فِي الْفِطْرِ وَالأَضْحَى فِي الْأُولَى سَبْعَ تَكْبِيرَاتٍ وفي الثَّانِيَةِ خَمْسًا سِوَى تَكْبِيرَتَيْ الرُّكُوعِ).[٢] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قورباندا لە ڕکاتی یەکەمدا حەوت (الله اکبر)ی دەکردو لە ڕکاتی دووەمدا پێنج (الله اکبر)ی دەکرد جگە لە (الله اکبر)ی چوون بۆ ڕکوع".

(عن عبد اللَّهِ بن عَمْرِو بن الْعَاصِ قال قال نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ التَّكْبِيرُ فِي الْفِطْرِ سَبْعٌ فِي الْأُولَى وَخَمْسٌ فِي الْآخِرَةِ وَالْقِرَاءَةُ بَعْدَهُمَا كِلْتَيْهِمَا).[٣] عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی "(الله اکبر) کردن لە ڕکاتی یەکەمی جەژنی ڕەمەزاندا حەوت (الله اکبر)ەو لە ڕکاتی دووەمدا پێنجە، لە دوای ئەو (الله اکبر)انەوە سورەتی فاتیحەو قورئان دەخوێنرێ".

**ج ـ ئیمام لە نوێژی جەژنەکاندا چ سورەتێك دەخوێنێ:**

(عن أبي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ قال سَأَلَنِي عُمَرُ بن الْخَطَّابِ عَمَّا قَرَأَ بِهِ رسول اللَّهِ ﷺ فِي يَوْمِ الْعِيدِ فقلت بِاقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ).[٤] ئەبوواقیدی لەیسی دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) پرسیاری لێ کردم کە پێغەمبەر ﷺ چ سورەتێکی دەخوێند لە نوێژی جەژندا؟ منیش وتم: "اقتربت الساعة" و (ق والقرآن المجید)ی دەخوێند".

---

١) رواه البخاري ٩٨٩ ومسلم ٨٨٤ واحمد ٣٥٥/١.

٢) رواه ابوداود ١١٤٩ حديث حسن.

٣) رواه ابوداود ١١٥١ والدارقطني ٤٨/٢.

٤) رواه مسلم ٨٩١.

(عن النُّعْمَانِ بن بَشِيرٍ قال كان رسول اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ في الْعِيدَيْنِ وفي الْجُمُعَةِ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأعلى وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ قال وإذا اجْتَمَعَ الْعِيدُ وَالْجُمُعَةُ في يَوْمٍ وَاحِدٍ يَقْرَأُ بِهِمَا أَيْضًا في الصَّلَاتَيْنِ).[١] نوعمانی کوڕی بەشیریش (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەژنەکانو لە نوێژی هەینیدا (سبح اسم ربك الاعلى)و (هل أتاك حديث الغاشية)ی خوێندووەو فەرمووی: "ئەگەر جەژنو هەینی کەوتنە ڕۆژێکەوە لە هەردوو نوێژەکەدا هەر ئەو دوو سورەتەی دەخوێند".

**پێنجەم: وتاری جەژن:**

سوننەتە پاش نوێژی جەژن دوو ووتار بدرێ بەم شێوەیەی خوارەوە:

أ ـ ووتارەکان دوای نوێژی جەژنەکان دەدرێن، بە پێچەوانەی ووتاری ڕۆژی هەینی کە پێش نوێژەکە دەدرێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەو شێوە وتاری جەژنی داوە.

(عن ابن عُمَرَ قال كان رسول اللَّهِ ﷺ وأبو بَكْرٍ وَعُمَرُ رضي الله عنهما يُصَلُّونَ الْعِيدَيْنِ قبل الْخُطْبَةِ).[٢] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەرو ﷺ ئەبوبەکرو عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت) پێش ووتاردان نوێژی جەژنەکانیان کردووە".

(عن ابن عَبَّاسٍ قال خَرَجْتُ مع النبي ﷺ يوم فِطْرٍ أو أَضْحَى فَصَلَّى ثُمَّ خَطَبَ).[٣] هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان یا قوربان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕۆشتوومەتە دەری شار پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد، پاشان ووتاری دەدا".

٢ـ ئەگەر ووتارەکەی خستە پێش نوێژی جەژن ئەوە دروست نییەو بە نوێژی جەژن دانانرێت.

---

١) رواه مسلم ٨٧٩.

٢) رواه البخاري ٩٢٠ ومسلم ٨٨٨.

٣) رواه البخاري ٩٣٢.

**شەشەم: ئاداب و سوننەتەکانی جەژن:**

**١ـ خۆشۆردن:**

(عن نافع أن إبن عمر كان يغتسل يوم الفطر قبل أن يغدو إلى المصلى) [١] **نافیع دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) هەمیشە لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا پێش ئەوەی بڕوات بۆ نوێژگە خۆی دەشۆرد".**

(عن علي رضي الله عنه أنه سئل عن الغسل فقال: يوم الجمعة ويوم العرفة ويوم الفطر ويوم الأضحى). [٢] **پرسیار کرا لە عەلی کوڕی ئەبوتالیب دەربارەی خۆشۆردنی سوننەت ئەویش وتی: "ڕۆژی هەینیو ڕۆژی عەرەفەو ڕۆژی جەژنی قوربانو ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان" - سوننەتە خۆشۆردن- .**

**٢ـ خۆجوان کردنو لەبەرکردنی جلی جوانو تازە:**

(عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ أَنَّ عُمَرَ بن الْخَطَّابِ رَأَى حُلَّةً سِيَرَاءَ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ فقال يا رَسُولَ اللَّهِ لو اشْتَرَيْتَ هذه فَلَبِسْتَهَا يوم الْجُمُعَةِ وَلِلْوَفْدِ إذا قَدِمُوا عَلَيْكَ) [٣] **عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێ: "عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) جوبەیەکی ئاوریشم کە لە بازاڕدا دەفرۆشرا لە خاوەنەکەی وەرگرتو هێنای بۆ پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە بکڕە بۆ کاتی جەژنو پێشوازی وەفدو نوێنەرەکان خۆتی پێ بڕازێنەوە". لەم فەرموودەیەوە دەزانرێ خۆجوانکردن بۆ جەژن لە ناویاندا باوێکی دامەزراو بووە و پێغەمبەریش ﷺ ڕێگری لێ نەکردووە بەوەدا دەزانرێ هەر لە ناویاندا ماوەتەوە.** [٤]

(عن ابن عباس قال كان رسول الله ﷺ يلبس يوم العيد بردة حمراء) **عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژندا عەبایەکی سووری لەبەردەکرد".** [٥]

---

١) رواه مالك ٤٢٦ وعبدالرزاق في مصنف ٥٧٥٤ بسند صحيح.

٢) رواه الشافعي ١١٤ والبيهقي ٢٧٨/٣ بسند صحيح.

٣) رواه البخاري ٨٨٦ ومسلم ٢٠٨٦.

٤) سەیری (حاشية السندي على النسائي ١٨١/٣) بکە.

٥) مجمع الزوائد ومنفع الفوائد ٤٢٦/٢.

**٣ـ لە جەژنی ڕەمەزاندا پێش ڕۆشتن بۆ نوێژگە خواردن دەخورێ:**

(عن أَنَسٍ قال كان رسول اللَّهِ ﷺ لَا يَغْدُو يوم الْفِطْرِ حتى يَأْكُلَ تَمَرَاتٍ) [١] ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ لە جەژنی ڕەمەزاندا نەدەڕۆیشت بۆ نوێژ تا چەند دەنکە خورمایەکی نەخواردایە".

**٤ـ جەژنی قوربان هیچ نەخورێت تا دوای نوێژی جەژن لە گۆشتی قوربانییەکەی دەخوات:**

(عن أبي بريدة أن رسول الله ﷺ كان لا يخرج يوم الفطر حتى يطعم ولا يطعم يوم النحر حتى يذبح) [٢] بورەیدە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ لە جەژنی ڕەمەزاندا لە ماڵ دەرنەچوو تا شتێکی نەخواردایە، بەڵام لە جەژنی قورباندا هیچی نەدەخوارد هەتا - لە نوێژ دەگەڕایەوە - قوربانیەکەی سەردەبڕی و- لە گوشتی قوربانییەکەی دەخوارد".

**٥ـ ڕێگا گۆڕین لە ڕۆشتنو گەڕانەوەدا:**

(عن جَابِرٍ قال كان النبي ﷺ إذا كان يَوْمُ عِيدٍ خَالَفَ الطَّرِيقَ). [٣] جابیر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژندا ڕێگای دەگۆڕی". واتە لە ڕێگایەکەو دەڕۆیشتو لە ڕێگایەکی ترەوە دەگەڕایەوە.

**٦ـ (الله اكبر) کردن لە جەژنەکاندا:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِتُكْمِلُواْ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ البقرة: ١٨٥ واتە: تا ڕۆژووەکانی ڕەمەزان تەواو بکەنو (الله اکبر) بکەن لەسەر ئەوەی ڕێنموونی کردوون بە ئومێدی ئەوەی سوپاسو ستایشی خوا بکەن. ئەمە لە جەژنی ڕەمەزاندایە. [٤]

---

١) رواه البخاري ٩٥٣ والترمذي ٥٤٣ وابن ماجة ١٧٥٤ واحمد ١٢٦/٣.

٢) رواه الترمذي ٥٤٢ وابن ماجه ١٧٥٦ واحمد ٣٥٢/٥ حديث حسن.

٣) رواه البخاري ٩٤٣.

٤) بڕوانە تەفسیری (ابن كثير) ٤٤٥/١.

هەروەها خوا دەربارەی (الله اكبر)ی جەژنی قوربان دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ ﴾ البقرة: ٢٠٣ واتە: (الله اكبر) بکەن لە ڕۆژانێکی دیاری کراودا کە ڕۆژانی جەژنی قوربانە.[١]

(عن علي وعمار أن النبي ﷺ كان يكبر من يوم عرفة صلاة الغداة ويقطعها صلاة العصر آخر أيام التشريق)[٢] عەممارو عەلی (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێن: "پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانی ڕۆژی عەرەفەوە (الله اكبر)ی دەکرد لە نوێژی عەسر کۆتا ڕۆژی جەژنی قورباندا کۆتایی پێ دەهێنا". واتە پێنج ڕۆژ (الله اكبر)ی دەکرد.

دەربارەی (الله اكبر)ی جەژنی ڕەمەزان: (أن رسول الله ﷺ كان يخرج في العيدين من المسجد فيكبر حتى يأتي المصلى، وحتى يقضي الصلاة، فإذا قضى الصلاة قطع التكبير).[٣] پێغەمبەر ﷺ جەژنی ڕەمەزان لە ماڵ دەردەچوو (الله اكبر)ی دەکرد هەتا دەگەیشتە نوێژگەو تا نوێژەکەی تەواو دەکرد، کە نوێژەکەی تەواو دەکرد (الله اكبر) کردنەکەشی کۆتایی پێ دەهێنا".

(عن شَرِيكٌ قال قُلْت لأَبِي إِسْحَاقَ كَيْفَ كان يُكَبِّرُ على وَعَبْدُ الله قال كَانَا يَقُولَانِ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاَللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ وَلِلَّهِ الْحَمْدُ) شورەیك دەڵێ: بە ئەبی ئیسحاقم ووت عەلی و عەبدوڵڵا چۆن ئەڵڵاهو ئەکبەریان دەکرد - لە جەژندا- ئەویش ووتی دەیانووت: "الله اكبر الله اكبر لا اله الا الله الله اكبر والله اكبر ولله الحمد".[٤]

**٧ـ ئەگەر جەژنو هەینی لەیەك ڕۆژدا بوون:**

ئەگەر جەژنو هەینی لەیەك ڕۆژدا بوون ئەو کەسەی نوێژی جەژنی کرد نوێژی هەینی لەسەر پێویست نییەو نوێژی نیوەڕۆ دەکات.

(عن أبي هُرَيْرَةَ عن رسول اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قال: قد اجْتَمَعَ في يَوْمِكُمْ هذا عِيدَانِ فَمَنْ شَاءَ أَجْزَأَهُ من الْجُمُعَةِ وَإِنَّا مُجَمِّعُونَ).[١] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

---

١) عیکرەمە وا تەفسیری ئەم ئایەتەی کردووە، بڕوانە: تفسير القرآن العظيم لابن كثير، ١/٤٩٦.

٢) (رواه الحاكم ١/٢٩٩ اسيناده صحيح.

٣) رواه ابن ابي شيبة ١/٤٨٧ مرسل له شواهد (سلسلة الاحاديث الصحيحة ١٧٠).

٤) رواه ابن ابي شيبة ٢/١٦٨ اسناده صحيح.

"لە ئەمڕۆدا دوو جەژن کۆبووەتەوە، هەرکەس ویستی ـ نوێژی هەینی نەکات ـ ئەوە نوێژی جەژن بەسە لەبری ئەویش، ئێمە نوێژی هەینی دەکەین".

**٨ـ بردنی ئافرەتان ـ با حەیزداریش بن ـ بۆ نوێژگە:**

بۆ بەڵگەی ئافرەتان ببرێن بۆ نوێژگە سەیری فەرموودەی ئوممو عەتییە بکە.[٢]

**٩ـ بە پێ ڕۆشتن بۆ نوێژگە:**

سوننەتە بەپێ بڕۆیت بۆ نوێژگەو سواری وڵاخو سەیارە نەبیت مەگەر کەسێك نەتوانێو پێویستی بە سواربوون بێت. ئەمە بۆ کاتێك نوێژگەکە نزیك بێتو نارەحەت نەبێ ڕۆشتن بۆی، بەڵام ئەگەر دووربوو ئەوە دروستە سواری سەیارە یا هەر شتێکی تر ببیت. (عن بن عُمَرَ قال كان رسول اللّٰهِ ﷺ يَخْرُجُ إلى الْعِيدِ مَاشِيًا وَيَرْجِعُ مَاشِيًا)[٣] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ بە پیادە دەڕۆشت بۆ نوێژی جەژن و بە پیادەش دەگەڕایەوە".

**١٠ـ زوو ڕۆشتن بۆ نوێژگە:**

دوای ئەوەی نوێژی بەیانییان کرد سوننەتە بڕۆن بۆ نوێژگە بە (الله اكبر) کردن تا ئیمام دێت نوێژ دەست پێدەکات.[٤]

**١١ـ ئەگەر کەسێك نەگەیشت بە نوێژی جەژندا:**

(عن عبيد الله بن أبي بكر بن أنس بن مالك خادم رسول الله ﷺ قال كان أنس إذا فاتته صلاة العيد مع الإمام جمع أهله فصلى بهم مثل صلاة الإمام في العيد)[٥] عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکری کوڕی ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێ: "ئەنەس ئەگەر نەگەیشتایە بە نوێژی جەژندا لەگەڵ ئیمامدا ئەندامانی خێزانەکەی کۆدەکردەوە نوێژی جەژنی لەگەڵدا دەکردن وەك نوێژی جەژنی ئیمام".

---

١) رواه ابوداود ١٠٧٣، وابن ماجه ١١٣١ حديث صحيح.

٢) لە باسی حوکمی نوێژی جەژندا هێناومانە.

٣) رواه ابن ماجه ١٢٩٥ حديث حسن، (صحيح سنن ابن ماجة (١٠٧١ للالباني).

٤) بڕوانە (شرح السنة للبغوي ٣٠٢/٤).

٥) رواه البيهقي ٣٠٥/٣ واخرجه البخاري بنحوه معلقا بصيغة الجزم ٢/ ٤٧٤ فتح الباري.

هەروەها ئیبنومونزیر دەڵێ: "هەركەس فریای نوێژی جەژن نەكەوت ئەوە وەك ئیمام دوو ركات بكات".[١]

**١٢ـ پیرۆزبایی جەژن لە یەكتری كردن:**

پیرۆزبایی جەژن لە یەكتری كردن لە رۆژی جەژندا پاش نوێژی جەژن كاتێ بە یەكتری گەشتن بڵێن (تقبل الله منا ومنكم) واتە: خوا لە ئێمەو ئێوەشی قبوڵ كات.

ئیبن حەجەر دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر رۆژی جەژن بەیەكتری بگەشتنایە بە یەكتریان دەووت: خوا لە ئێمەو ئێوەشی قبوڵ كات".[٢]

١) الاقناع ١.

٢) بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري ٢/٥١٧).

# نوێژی ترس

**یەکەم: هۆی کردنی نوێژی ترس:**

هۆی کردنی نوێژی ترس تەنها بوونی ترسە لە دوژمن لە شاردا بێت یا لە سەفەردا، بوونی ئەم نوێژ بە قورئان و سوننەتو یەك دەنگی زانایان بۆ موسڵمانان دانراوە، بەچەند شێوەیەك هاتووە کە هەموویان دروستو ڕەوان.

لەبەرئەوەی ئەم نوێژە لەبەر ئاسانکاری و نەهێشتنی گرانیو نارەحەتی بۆ موسڵمانان ڕێگەی پێدراوە بۆیە نوێژگەران کام لە شێوەکانی لەگەڵ حاڵەتەکەیاندا گونجاوترە دەتوانن بیکەن.

**دووەم: حاڵەتەکانی نوێژی ترس:**

**حاڵەتی یەکەم:** ئامادەباشی و ئێشك گری، بێ دروست بوونو ڕوودانی جەنگو تێکەڵ بوون لەگەڵ دوژمنناندا، لەم حاڵەتەدا نوێژەکە شێوەیەکی دیاری کراوی هەیە، کە جیاوازی هەیە لەگەڵ نوێژی کاتی ئاسایدا بەڵگەی ئەم حاڵەتە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا۟ فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾ النساء: ١٠٢ واتە: ئەگەر کاتی جەنگ تۆ (ئەی موحەممەد) لەناو باوەڕدارانددا بوویتو پێش نوێژیت بۆ کردن ئەوە با دەستەیەکیان لەگەڵ تۆدا نوێژ بکەنو با چەکەکانیان پێ بێت ئەنجا کاتێ سوژدەیان برد با دەستەی دووەم لە پشتیانەوە بن بۆ پاسەوانی کردنتان ـ دەستەی یەکەم ڕکاتێ تەواو ئەکەنو سەلام ئەدەنەوە ـ پاشان ئەو دەستەی دووەم کە نوێژیان نەکردووە بابێن

لەگەڵتا نوێژ بكەنو با وریا بنو چەكەكانیشیان هەڵگرن كافرەكان ئاواتیانە كە بێ ئاگا بن لە چەكو شتومەكەكانتان بۆ ئەوەی لە پڕ هێرشێك بكەنە سەرتانو لەناوتان بەرن وە گوناح نییەو قەیناكات ئەگەر ئازارتان تووش بوو بە هۆی بارانێكەوە یان نەخۆش بوون چەكەكانتان دابنێن، بەڵام وشیاری خۆتان وەرگرن بێگومان خوا بۆ بێ باوەڕان سزایەكی ریسواكەری ئامادەكردووە".

ئەم شێوە نوێژی ترسە ئایەتەكە باسی كرد بە دوو جۆر دەكرێت كە پێغەمبەر ﷺ بە كرداری خۆی روونی كردۆتەوە جیاوازییان لەوەدایە ئایا دوژمن لە رووی قیبلەوەیە یان نا.

أ- (عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال قام النبي ﷺ وَقَامَ الناس معه فَكَبَّرَ وَكَبَّرُوا معه وَرَكَعَ وَرَكَعَ نَاسٌ منهم ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدُوا معه ثُمَّ قام لِلثَّانِيَةِ فَقَامَ الَّذِينَ سَجَدُوا وَحَرَسُوا إِخْوَانَهُمْ وَأَتَتْ الطَّائِفَةُ الْأُخْرَى فَرَكَعُوا وَسَجَدُوا معه وَالنَّاسُ كلهم في صَلَاةٍ وَلَكِنْ يَحْرُسُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا).[١] عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (رەزای خوایان لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ راوەستاو موسڵمانانیش لەگەڵیدا راوەستان (الله اكبر)ی كرد ئەوانیش (الله اكبر)یان كرد لەگەڵیدا ئەنجا بەشێكیان لەگەڵیدا رۆشتن بۆ ركوع ـ بەشەكەی تریان پاسەوانییان كردن ـ و پاشان سوژدەیان برد لەگەڵی، پاشان هەستایەوە بۆ ركاتی دووەم جا ئەوانەی سوژدەیان بردبوو پاسەوانی براكانیان گرتو بەشەكەی تریان ـ كە پاسەوان بوون ـ هاتن ركوعو سوژدەیان برد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ جا خەڵكەكە هەموویان لە نوێژدا بوون، بەڵام پاسەوانی یەكتریان دەگرت".

ب ـ ئەم شێوەیەیان كاتێكە دوژمن لە رووی قیبلەوە نەبێتو جەنگو تێڕژان و تێكەڵ بوون نەبێت لەو كاتەدا ئەم شێوە سوننەتە:

(عن يَزِيدَ بن رُومَانَ عن صَالِحِ بن خَوَّاتٍ عَمَّنْ شَهِدَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يوم ذَاتِ الرِّقَاعِ صلى صَلَاةَ الْخَوْفِ أَنَّ طَائِفَةً صَفَّتْ معه وَطَائِفَةٌ وِجَاهَ الْعَدُوِّ فَصَلَّى بِالَّتِي معه رَكْعَةً ثُمَّ ثَبَتَ قَائِمًا وَأَتَمُّوا لِأَنْفُسِهِمْ ثُمَّ انْصَرَفُوا فَصَفُّوا وِجَاهَ الْعَدُوِّ وَجَاءَتْ الطَّائِفَةُ الْأُخْرَى فَصَلَّى بِهِمْ الرَّكْعَةَ التي بَقِيَتْ من صَلَاتِهِ ثُمَّ ثَبَتَ جَالِسًا وَأَتَمُّوا لِأَنْفُسِهِمْ ثُمَّ سَلَّمَ بِهِمْ).[٢] یەزیدی كوڕی رومان لە صاڵحی كوڕی خەوواتی كوڕی جوبەیر ئەویش لە هاوەڵێكی بەشداربووی غەزای (ذات الرقاع)ی

---

١) رواه البخاري ٩٠٢.

٢) رواه البخاري ٢١٢٩، ٤١٣١ ومسلم ٨٤٢.

گێڕاوەتەوە کە لەگەڵ پێغەمبەردا نوێژی ترسی کردووە دەڵێ: "دەستەیەك لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ریز بوونو دەستەیەکیش رو وبە دوژمن وەستابوون جا رکاتێ نوێژ کرد لەگەڵ ئەوانەی ریزبووبوون بەن لەگەڵیدا، پاشان هەر لە شوێنی خۆی راوەستا بوو جا نوێژگەرەکان رکاتەکەی تریان کردو تەاوو بوون، پاشان گەڕانەوە روو بە دوژمن ریز بوون، دەستەکەی تر هاتن پێغەمبەر ﷺ رکاتەکەی کە مابوو لەگەڵیاندا کردی، پاشان لە تەحیاتدا بەدانیشتنەوە مایەوە جا ئەوان رکاتەکەی تریان کرد ئەوسا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ سەلامیان دایەوە". ئەو هاوەڵەی فەرمودەکەی گێڕایەوە سەهلی کوڕی ئەبی حەثمە بوو (رەزای خوای لێبێت) ئەم نوێژە لە غەزای (ذات الرقاع)دا بوو کە پێغەمبەر ﷺ دژ بە غەتەفان کردبووی.

**حاڵەتی دووەم:** کاتێك لەشکری ئیسلام لەگەڵ لەشکری دوژمندا تێکەڵ دەبن و تێڕژان بێت و ترسی زۆر دروست ببێ لەم کاتەدا شێوەیەکی دیاری کراو نییە بۆ نوێژی ترس، بەڵکو هەرکەس چۆن بۆی کرا نوێژەکەی بکات، بەپیادە یا بە سواری یا وەستان روو بە قیبلە بێت یا نا رکوع و سوژدە بردن بە ئاماژەیە نەك رکوعو سوژدەی ئاسایی، بەڵام بۆ سوژدە زیاتر سەری نزم کاتەوە، لەم باریەوە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢٣٨ – ٢٣٩ واتە: ئاگاداری نوێژەکانتان بکەن بەتایبەتی نوێژی عەسر، وە لە نوێژدا بە گەردن کەچی بوەستن بۆ خوا (قسە مەکەن) ئینجا ئەگەر ترسان ـ لە دوژمن لە جەنگدا ـ ئەو نوێژ بکەن بە پیادە یا بە سواری، بەڵام ترستان نەما ئەوسا یادی خوا بکەن بەو شێوەیەی کە فێری کردوون کە پێشتر نەتاندەزانی.

(عن ابن عمر أنه كان إذا سئل عن صلاة الخوف فذكر الحديث بطوله وقال فإن كان خوف أشد من ذلك صلوا رجالا قياما على أقدامهم أو ركبانا مستقبلي القبلة وغير مستقبليها قال مالك:قال نافع: لا أرى عبدالله بن عمر ذكره إلا عن رسول الله

(ﷺ).[1] عەبدوڵڵای كوڕی عومەر(ڕەزای خوایان لێبێت ) دوای ئەوەی باسی چۆنێتی دوو شێوەكەی پێشوو دەكات كە باسمان كردن دەڵێ:

"ئەگەر ترسەكە لەوە زیاتر بوو ئەوە نوێژەكەیان بكەن بە پیادە یا بە سواری ڕوو بە قیبلە بن یا ڕوو بە قیبلە نەبن".

ئیمام مالیك دەڵێ نافیع ووتی وانازانم عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ئەمە بڵێ لە پێغەمبەرەوە نەبێ ﷺ".

(وفي رواية : فصل راكبا أو قائما تومىء إيماء).[2] لە ریوایەتێكی تردا دەڵێ: "نوێژ بكە بە پیادە یا بە سواری ئاماژە بكە بە ركوع و سوژدە".

**سێیەم: چەند شێوەیەكی تری كردنی نوێژی ترس:**

١ـ (عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ أَنَّهُ صلى مع رسول اللَّهِ ﷺ صَلاَةَ الْخَوْفِ وَذَكَرَ أَنَّ الْعَدُوَّ كَانُوا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ وأنا صَفَفْنَا خَلْفَهُ صَفَّيْنِ فَكَبَّرَ وَكَبَّرْنَا معه جَمِيعاً ثُمَّ رَكَعَ وَرَكَعْنَا معه جَمِيعاً فلما رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ سَجَدَ وَسَجَدَ معه الصَّفُّ الذي يَلِيهِ وَقَامَ الصَّفُّ الْمُؤَخَّرُ في نحر الْعَدُوِّ فلما قام وَقَامَ معه الصَّفُّ الذي يَلِيهِ انْحَدَرَ الصَّفُّ الْمُؤَخَّرُ بِالسُّجُودِ ثُمَّ تَقَدَّمَ الصَّفُّ الْمُؤَخَّرُ وَتَأَخَّرَ الصَّفُّ الْمُقَدَّمُ فَرَكَعَ وَرَكَعْنَا معه جَمِيعاً ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدَ معه الصَّفُّ الذي يَلِيهِ فلما سَجَدَ الصَّفُّ الذي يَلِيهِ وَجَلَسَ انْحَدَرَ الصَّفُّ الْمُؤَخَّرُ بِالسُّجُودِ ثُمَّ سَلَّمَ وَسَلَّمْنَا جَمِيعاً قال جَابِرٌ كما يَفْعَلُ حَرَسُكُمْ هَؤُلاَءِ بِأُمَرَائِهِمْ).[3] جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی ترسم كرد، لە پشت پێغەمبەرەوە ریز بووین ـ بە دوو ریز ـ دوژمن لە نێوان ئێمە قیبلەدا بوو، پێغەمبەر ﷺ نوێژی دابەست ئێمەش هەموومان نوێژمان دابەست، پاشان كڕنووشی برد، ئێمەش كوڕنوشمان برد، پاشان سەری بەرز كردەوە لە كڕنووش ئێمەش هەموومان سەرمان بەرز كردەوە، پاشان دانەویەوە بۆ سوژدە بردن لەگەڵ ئەو ریزەی لە دوایەوە بوو وە ڕیزەكەی دواوە بەرانبەر دوژمن وەستان ، جا كە پێغەمبەر سوژدە

---

١) رواه البخاري ٤٥٣٥.

٢) رواه مسلم ٨٣٩.

٣) رواه مسلم ٨٤٠.

بردنەکەی تەواو کرد و ئەو ڕیزەی لە دوایەوە بوو هەستانەوە ریزەکەی دووەم دانەوینەوەو سوژدەیان بردو هەستانەوە، پاشان ریزەکەی دواوە رۆشتنە پێشەوەو ریزەکەی پێشەوە رۆشتنە دواوە پاشان پێغەمبەر ﷺ کوڕنوشی برد ئێمەش هەموومان کڕنووشمان برد، پاشان سەری بەرز کردەوە لە کوڕنووش ئێمە هەموومان سەرمان بەرزکردەوە پاشان دانەوییەوە بۆ سوژدەبردن لەگەڵ ئەو ریزەی لە دوایەوە بوو ـ کە جاری یەکەم لەرکاتی یەکەمدا لەدواوە بوون ـ وە ریزەکەی دواوە بەرانبەر دوژمن وەستان، کاتێ پێغەمبەر ﷺ و ئەو ریزەی لەدوایەوە بوون سوژدەیان تەواو کرد ریزەکەی دواوەیان دانەوینەوەو سوژدەیان برد، پاشان پێغەمبەر ﷺ سەلامی دایەوە ئێمەش هەموومان سەلامان دایەوە".

٢ـ (عَنِ ابن عُمَرَ قال صلى رسول اللَّهِ ﷺ صَلاةَ الْخَوْفِ بِإِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَةً وَالطَّائِفَةُ الأُخْرَى مُوَاجِهَةُ الْعَدُوِّ ثُمَّ انْصَرَفُوا وَقَامُوا في مَقَامِ أَصْحَابِهِمْ مُقْبِلِينَ على الْعَدُوِّ وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمُ النبي ﷺ رَكْعَةً ثُمَّ سَلَّمَ ثُمَّ قَضَى هَؤُلاَءِ رَكْعَةً وَهَؤُلاَءِ رَكْعَةً).[1] عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی ترسی کرد ـ خەڵکەکەی کرد بە دوو دەستەوە ـ لەگەڵ دەستەیەکیان رکاتێکی کردو دەستەکەی تریان بەرانبەر دوژمن بوون، پاشان گەڕانەوە لە شوێنی هاوڕێکانیان بەرانبەر دوژمن وەستان ئەنجا ئەوانی تر هاتن، پاشان پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوانیشدا رکاتێکی کرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ سەلامی دایەوە، پاشان هەردوو دەستەکە رکاتەکەی تریان تەواو کرد".

٣ـ (عن مَرْوَانَ بن الْحَكَمِ أَنَّهُ سَأَلَ أَبَا هُرَيْرَةَ هل صَلَّيْتَ مع رسول اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْخَوْفِ قال أبو هُرَيْرَةَ نعم قال مَرْوَانُ مَتَى فقال أبو هُرَيْرَةَ عَامَ غَزْوَةِ نَجْدٍ قام رسول اللَّهِ ﷺ إلى صَلَاةِ الْعَصْرِ فَقَامَتْ معه طَائِفَةٌ وَطَائِفَةٌ أُخْرَى مُقَابِلَ الْعَدُوِّ ظهورهم إلى الْقِبْلَةِ فَكَبَّرَ رسول اللَّهِ ﷺ فَكَبَّرُوا جميعا الَّذِينَ معه وَالَّذِينَ مُقَابِلِي الْعَدُوِّ ثُمَّ رَكَعَ رسول اللَّهِ ﷺ رَكْعَةً وَاحِدَةً وَرَكَعَتْ الطَّائِفَةُ التي معه ثُمَّ سَجَدَ فَسَجَدَتْ الطَّائِفَةُ التي تَلِيهِ وَالْآخَرُونَ قِيَامٌ مُقَابِلِي الْعَدُوِّ ثُمَّ قام رسول اللَّهِ ﷺ وَقَامَتْ الطَّائِفَةُ التي معه فَذَهَبُوا إلى الْعَدُوِّ فَقَابَلُوهُمْ وَأَقْبَلَتْ الطَّائِفَةُ التي كانت مُقَابِلِي الْعَدُوِّ فَرَكَعُوا وَسَجَدُوا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ كما هو ثُمَّ قَامُوا فَرَكَعَ رسول اللَّهِ ﷺ رَكْعَةً

---

١) رواه البخاري ٩٤٢ ومسلم ٨٣٩.

أُخْرَى وَرَكَعُوا معه وَسَجَدَ وَسَجَدُوا معه ثُمَّ أَقْبَلَتْ الطَّائِفَةُ التِي كانت مُقَابِلِي الْعَدُوِّ فَرَكَعُوا وَسَجَدُوا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَاعِدٌ وَمَنْ معه ثُمَّ كان السَّلَامُ فَسَلَّمَ رسول اللَّهِ ﷺ وَسَلَّمُوا جميعا فَكَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَانِ وَلِكُلِّ رَجُلٍ من الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَةٌ رَكْعَةٌ).[١] مەروانی کوڕی حەکەم پرسیاری لە ئەبوهورەیرە کرد (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: ئایا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی ترست کردووە؟ ئەبوهورەیرەش (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: بەڵێ، وتی کەی؟ وتی: ساڵی جەنگی نەجد، پێغەمبەر ﷺ هەستا بۆ نوێژی عەسر کۆمەڵێك لەگەڵیدا هەڵسان، کۆمەڵێکی تریان روو بە دوژمن وەستانو پشتیان لە قیبلە بوو، جا پێغەمبەر ﷺ نوێژی دابەست ئەوانیش هەموویان نوێژیان دابەست چ ئەوانەی لەگەڵیدا بوونو چ ئەوانەی بەرانبەر دوژمن بوون، پاشان پێغەمبەر ﷺ کوڕنوشی برد ئەوانەش لە دوایەوە بوون کوڕنوشیان برد، پاشان سوژدەی برد ئەوانەی لە دوایەوە بوون سوژدەیان برد کۆمەڵەکەی تر بەرانبەر دوژمن وەستابوون پاشان پێغەمبەر ﷺ هەستایەوە ـ بۆ رکاتی دووەم ـ ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ـ رکاتێکی تریان کرد ـ رۆشتن بۆ بەرانبەری دوژمن جا ئەو کۆمەڵەیان هاتن کە بەرانبەر دوژمن بوون کڕنوشو سوژدەیان برد، پێغەمبەر ﷺ هەر بە پێوە وەستابوو، پاشان ئەوان هەستانەوە و پێغەمبەر ﷺ کڕنوشیەکی تری برد ئەوانیش کوڕنوشیان برد لەگەڵیدا و سوژدەی برد ئەوانیش سوژدەیان برد، پاشان کۆمەڵەکەی بەرانبەر دوژمن بوون هاتن کوڕنوشو سوژدەیان برد پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو لەگەڵ کۆمەڵەکەی کە لەگەڵیدا بوون، پاشان پێغەمبەر ﷺ سەلامی دایەوە ئەوانیش هەموویان سەلامیان دایەوە، ئەم نوێژە پێغەمبەر ﷺ دوو رکاتی کرد و هەریەك لەو دوو کۆمەڵە یەك رکاتیان کرد"

وفي رواية النسائي : (وَلِكُلِّ رَجُلٍ من الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَتَانِ رَكْعَتَانِ) لە ڕیوایەتی نەسائی دا بەم شێوەیە (وە هەریەك لەو دوو کۆمەڵە دوو ڕکاتیات کرد).

---

١) رواه النسائي ١٧٣/٣ وابوداود ١٢٤٠ حديث صحيح.

**چوارەم: بۆچی نوێژی ترس ڕێگەی پێدراوە؟**

ئەم شێوانەی نوێژی ترس کە باسکران مەبەست لێیان ئاسانکارییە بۆ موسڵمان هەتا بتوانێ فەرزەکانی جێەجێ بکات لەکاتێکدا کە زۆر پێویستی بە بەهێزکردنی پەیوەندی هەیە لەگەڵ خوا تا کۆمەك و یارمەتی لێوەرگرێ لە کاتی جەنگو ڕووبەڕووبوونەوەدا بۆ ئەوەی دڵی بە یادی خوا دامەزراو بێتو متمانەی بە پشتیوانی و یارمەتی دانی خوا زیاد بکات و پێیەکانی دامەزراوبێت لە گۆڕەپانی جەنگدا تا هەڵگرانی هەق و ڕاستی سەرکەوتوو بنو بێ باوەڕو ناڕەوایانیش تێکبشکێنێ ، خوای گەورەش جوانی فەرموورە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةً فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ الأنفال: ٤٥ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر بە دەستەیەك ـ لە بێ باوەڕان ـ گەشتن ئەو خۆراگر بنو یادی خوا زۆر بکەن تا سەرکەوتوو سەرفراز بن.

ئەوەی شایەنی باسە نوێژی ترس بەو شێوانەی باسمان کرد، وا دەکات سەربازی موسڵمان نوێژەکەی بکات بەبێ نارەحەتی هەرچۆنێ شێوازی جەنگ بگۆڕێو کەرەستەی جەنگ هەرچۆنێك بێت لە هەرکات لەهەر شوێنێکدا، بەتایبەتی ئەگەر سروشتی جەنگەکە پێویست بە ڕووبەڕووبوونەوە نەکات وەك زۆرێك لە جەنگەکانی ئەم سەردەمە.

**پێنجەم: نوێژ بە هیچ کولۆجێ لەسەر موسڵمان لا ناچێ:**

لەم باسەی پێشوودوە دەردەکەوێ کە نوێژ بەهیچ شتێك و لە ژێر هیچ بیانوویەکدا لەملی موسڵمان نابێتەوە و بەجۆرێ پێویست نەکات بیکات هەرچەندە عوزرو بەهانەکەش بەهێز بێت بەمەرجێ ئەو کەسە بە (مکلف) مابێ، بەڵام خوای گەورە مۆڵەتی داوە دوابخرێت وەك کۆکردنەوەی نوێژەکان یا کورتکردنەوەیان بۆ ڕێبواران یا ئاسانکاری لە شێوەی کردنەکەیدا وەك نوێژی ترسو نوێژی نەخۆش ئەوەش بەپێی هەلومەرجو هۆکارەکان.

# نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران

**یەکەم: پێناسەکەیان و کەی دانراون لە ئیسلامدا:**

**خۆرگیران**: واتە تیشك و ڕووناکیی خۆر نەمێنێ هەمووی بە جارێ یا بەشێکی.

**مانگ گیرانیش** واتە: دیار نەمانی ڕووناکیی مانگ هەموو یان هەندێکی.

**نوێژی خۆر گیران و مانگ گیران**: نوێژێکە بەشێوەیەکی تایبەتی دەکرێ لە کاتی گیران و تاریك بوونی خۆر یا مانگدا هەمووی یا بەشێکی.

نوێژی خۆرگیران ساڵی دووەمی کۆچی ئەم نوێژە دامەزراوەو دانراوە، بەڵام نوێژی مانگ گیران لە ساڵی پێنجەمی کۆچییدا دانراوەو دامەزراوە.

**دووەم: حوکمەکەی**: سوننەتێکی زۆر گەورەیە:

بە بەڵگەی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: (إن الشمس والقمر آيتان من آيات الله لا يكسفان لموت أحد ولا لحياته فإذا فصلوا وادعوا حتى).[1] بەراستی خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوای گەورە بە هۆی مردنی یا ژیان و لەدایکبوونی هیچ کەسەوە ناگیرێن و تاریك نابن جا ئەگەر ئەو گیرانەتان بینی نوێژ بکەن و بپاڕێنەوە هەتا بەردەبن".

هەروەها پێغەمبەر ﷺ بە کردەوەش ئەو نوێژەی کردووە ئەو فەرمان پێکردنەی پێغەمبەریش ﷺ لە فەرموودەکەی ڕابردوودا نابڕێت بەسەر (وجوب) دا لەبەر ئەو فەرموودەیە کە دەڵێ: (أن أعرابيا سَأَلُ رسول اللّهِ ﷺ عن الصَلَوَاتِ الخَمْسُ فقال هل عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ فقال عليه الصلاة والسلام: لَا إلا أَنْ تَطَوَّعَ).[2] پیاوێکی بیابان نشین پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی پێنج فەرزەکە و وتی: جگە لەم پێنج فەرزە هیچ نوێژێکم لەسەر فەرزە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "نەخێر مەگەر نوێژی سوننەت بکەیت".

---

١) رواه مسلم ٩٠٤.

٢) رواه البخاري ٤٦ ومسلم ١١.

**سێیەم: بانگ دان و ئاگادارکردنەوە بۆی:**

(عن عَائِشَةَ قالت خَسَفَتْ الشَّمْسُ على عَهْدِ رسول اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَ النبي ﷺ مُنَادِيًا يُنَادِي أَنْ الصَّلَاةَ جَامِعَةً فَاجْتَمَعُوا وَاصْطَفُّوا فَصَلَّى بِهِمْ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ في رَكْعَتَيْنِ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ).[١]

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ خۆر گیرا، جا جاڕدەرێکی نارد جاڕ بداتو بڵێ: (الصلاه جامعة) جا خەڵکیش کۆبوونەوە، پێغەمبەر ﷺ پێش خەڵکەکە کەوت نوێژی دابەست لە دوو ڕکاتدا چوار کڕنووشو چوار سوژدەی برد". واتە لە هەر ڕکاتێکدا دوو کوڕنوشی تێدا بووە.

**چوارەم: شێوەی کردنی نوێژەکە:**

(عن عَائِشَةَ زَوْجِ النبي ﷺ قالت خَسَفَتْ الشَّمْسُ في حَيَاةِ رسول اللَّهِ ﷺ فَخَرَجَ رسول اللَّهِ ﷺ إلى الْمَسْجِدِ فَقَامَ وَكَبَّرَ وَصَفَّ الناس وَرَاءَهُ فَاقْتَرَأَ رسول اللَّهِ ﷺ قِرَاءَةً طَوِيلَةً ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فقال سمع الله لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ ثُمَّ قام فَاقْتَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً هِيَ أَدْنَى من الْقِرَاءَةِ الْأُولَى ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا هو أَدْنَى من الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ ثُمَّ قال سمع الله لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ ثُمَّ سَجَدَ و لم يذكر أبو الطَّاهِرِ ثُمَّ سَجَدَ ثُمَّ فَعَلَ في الرَّكْعَةِ الْأُخْرَى مِثْلَ ذلك حتى اسْتَكْمَلَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ وَانْجَلَتْ الشَّمْسُ قبل أَنْ يَنْصَرِفَ ثُمَّ قام فَخَطَبَ الناس فَأَثْنَى على اللَّهِ بِمَا هو أَهْلُهُ ثُمَّ قال إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ من آيَاتِ اللَّهِ لَا يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ ولا لِحَيَاتِهِ فإذا رَأَيْتُمُوهَا فَافْزَعُوا لِلصَّلَاةِ»).[٢] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ دەرچوو بۆ مزگەوت، هەستاو نوێژی دابەستو خەڵکیش لە دوایەوە ریزبوون، جا قورئانێکی زۆری خوێند، پاشان (الله اكبر)ی کردو کڕنووشێکی درێژی برد، پاشان سەری بەرز کردەوە فەرمووی : (سمع الله لمن حمد ربنا ولك الحمد) پاشان هەستایەوەو قورئانێکی زۆری خوێند بەڵام کەمتر بوو لە قورئان خوێندنەکەی یەکەمی، پاشان (الله اكبر)ی کرد، جا کوڕنوشێکی درێژی برد بەڵام کەمتر بوو لە کوڕنوشی یەکەم، پاشان فەرمووی: (سمع الله لمن حمد ربنا ولك الحمد) پاشان سوژدەی برد، پاشان

---

١) رواه البخاري ١٠٦٦ ومسلم ٩٠١.

٢) رواه البخاري ١٠٥١ ومسلم ٩١٠ واحمد ٩٨/٦.

لە رکاتەکەی تردا بە شێوەی رکاتی یەکەمی کرد تا چوار کرنوشو چوار سوژدەی تەواو کرد خۆر بەربوو پێش ئەوەی سەلام بداتەوە پاشان هەستا وتارێکی بۆ خەڵکەکە دا سوپاسو ستایشی خوای کرد بەو شێوەی شایستەیەتی پاشان فەرمووی: "بێگومان خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوای گەورە و بۆ مردنو ژیانی هیچ کەس ناگیرێن جا ئەگەر دیتان گیران پەلاماری نوێژ بدەن".

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ خَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالنَّاسُ مَعَهُ ، فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً نَحْوًا مِنْ سُورَةِ الْبَقَرَةِ ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً وَهْوَ دُونَ الْقِيَامِ الآوَّلِ ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الآوَّلِ ، ثُمَّ سَجَدَ ، ثُمَّ قَامَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً وَهْوَ دُونَ الْقِيَامِ الآوَّلِ ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الآوَّلِ ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً وَهْوَ دُونَ الْقِيَامِ الآوَّلِ ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الآوَّلِ ، ثُمَّ رَفَعَ ثُمَّ سَجَدَ ، ثُمَّ انْصَرَفَ ، وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ ، فَقَالَ « إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَاذْكُرُوا اللَّهَ»)[١] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: " لە سەردەمی پێغەمبەر دا خۆر گیرا خۆرگیرا جا پێغەمبەر ﷺ نوێژی کردو خەڵکەکەش نوێژیان کرد لەگەڵیدا ماوەیەکی دوورو درێژ بەپێوە وەستا بە ئەندازەی خوێندنی سورەتی بەقەرە، پاشان روکوعێکی درێژی برد، پاشان بەرزبوویەوە لە رکوع ماوەیەکی دوورودرێژ بە پێوە وەستا، بەڵام کەمتر لە وەستانەکەی یەکەم، پاشان روکوعێکی دوورودرێژی برد، بەڵام کەمتر لە روکوعەکەی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، پاشان هەستایەوەو ماوەیەکی دوورودرێژ وەستا ـ قورئانی دەخوێند ـ بەڵام کەمتر بوو لە وەستانەکەی یەکەم، پاشان روکوعێکی دووردرێژی برد کورت تر لە روکوعی یەکەم، پاشان سەری بەرزکردەوە لە روکوع جا ماوەیەکی دووردرێژ وەستا بەپێوە، بەڵام کورت تر بووە لەوەستانی یەکەم، پاشان روکوعێکی دووردرێژی برد کورت تر بوو لە روکوعی یەکەم، پاشان سوژدەی برد، پاشان سەری بەرزکردەوە لە روکوع پاشان سەلامی دایەوە لەو کاتەدا خۆر بەربوو جا فەرموی: "بێگومان خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوای گەورە و بۆ

---

١) رواه البخاري ١٠٥١ ومسلم ٩١٠ واحمد ٣٥٨/١

مردنو ژیانی هیچ کەس ناگیرێن، جا ئەگەر خۆرگیران و مانگ گیرانەتان دی زیکرو یادی خوا بکەن".

**پێنجەم: قورئان خوێندن لە نوێژی خۆرگیران و مانگ گیراندا:**

(عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَهَرَ فِي صَلاَةِ الْخُسُوفِ بِقِرَاءَتِهِ فَصَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي رَكْعَتَيْنِ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ). عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی خۆرگیراندا بە دەنگی بەرز قورئانی دەخوێند جا چوار ڕوکوعو چوار سوژدەی برد لە دوو ڕکاتدا".

(وفي لفظ: صلى صَلَاةَ الْكُسُوفِ وَجَهَرَ بِالْقِرَاءَةِ).[1] لە گێڕانەوەیەکی تردا دەڵێ: "نوێژی خۆرگیرانی کرد قورئانی بە دەنگی بەرز خوێند تێیدا".

(وفي لفظ قال: خَسَفَتِ الشَّمْسُ على عَهْدِ النبي ﷺ فَأَتَى الْمُصَلَّى فَكَبَّرَ وَكَبَّرَ الناس ثُمَّ قَرَأَ فَجَهَرَ بِالْقِرَاءَةِ وَأَطَالَ الْقِيَامَ).[2] لە گێڕانەوەیەکی تردا دەڵێت: "لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ خۆر گیرا، جا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ نوێژگەو نوێژی دابەستو خەڵکیش نوێژیان دابەست، پاشان قورئانی خوێند بە دەنگی بەرزو زۆریش ڕاوەستا ـ قورئانی دەخوێند ـ".

**شەشەم: نوێژی خۆرو مانگ گیران گێڕانەوەی نییە:**

(عن الْمُغِيرَةِ بن شُعْبَةَ قال كَسَفَتْ الشَّمْسُ على عَهْدِ رسول اللَّهِ ﷺ يوم مَاتَ إِبْرَاهِيمُ فقال الناس كَسَفَتْ الشَّمْسُ لِمَوْتِ إبراهيم فقال رسول اللَّهِ ﷺ إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ ولا لِحَيَاتِهِ فإذا رَأَيْتُمْ فَصَلُّوا وَادْعُوا اللَّهَ تعالى وَصَلُّوا حتى يَنْجَلِيَ).[3] موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ خۆرگیرا لەو ڕۆژەدا کە ئیبراهیم ـ ی کوڕی پێغەمبەر ﷺ ـ مرد، خەڵکیش وتیان خۆر لەبەر مردنی ئیبراهیم گیراوە و تاریك بووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بێگومان خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوای گەورە و بۆ مردنو ژیانی هیچ کەس ناگیرێن، جا ئەگەر دیتان گیران بپاڕێنەوە لە خوای گەورە و نوێژ بکەن هەتا بەر دەبێ".

---

١) رواه الترمذي ٥٦٠ فەرموودەیەکی صەحیحە.

٢) رواه البخاري ١٠٦٥ ومسلم ٩٠١/٥ واحمد ٦٥/٦.

٣) رواه البخاري ١٠٦٠ ومسلم ٩٣٥ واحمد ٢٤٥/٤.

**حەوتەم: سوننەتەکانی نوێژی خۆرو مانگ گیران:**

۱ـ سوننەتە ئیمام دوای سەلامدانەوە وتارێك بدات بۆ خەڵکی بە بەڵگەی فەرموودەکی عائیشە (رەزای خوای لێبێت) کە رابوورد.

۲ـ هاندانی موسڵمانان لەسەر تەوبەکردنو ماڵ بەخشینو زیکر کردن: (عن أَسْمَاءَ بنت ابي بكر قالت: لقد أَمَرَ النبي ﷺ بِالْعَتَاقَةِ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ). [1] ئەسمائیی کچی ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە ئازادکردنی کۆیلە کرد لە کاتی خۆرگیراندا".

(عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّ النبي ﷺ قَالَ « إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ ، لاَ يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَادْعُوا اللَّهَ وَكَبِّرُوا ، وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا »). [2]

هەروەها عائیشە (رەزای خوایٰ لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: " بێگومان خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوای گەورە و بۆ مردنو ژیانی هیچ کەس ناگیرێن جا ئەگەر ئەو گیرانەتان دی لە خوا بپارێنەوەو (الله اکبر) بکەن و نوێژ بکەن و ماڵ ببەخشن".

(عن أَبِي مُوسَى قال خَسَفَتْ الشَّمْسُ فَقَامَ النبي ﷺ فَزِعًا يَخْشَى أَنْ تَكُونَ السَّاعَةُ فَأَتَى الْمَسْجِدَ فَصَلَّى بِأَطْوَلِ قِيَامٍ وَرُكُوعٍ وَسُجُودٍ رَأَيْتُهُ قَطُّ يَفْعَلُهُ وقال هذه الْآيَاتُ التي يُرْسِلُ الله لَا تَكُونُ لِمَوْتِ أَحَدٍ ولا لِحَيَاتِهِ وَلَكِنْ يُخَوِّفُ الله بِهِ عِبَادَهُ فإذا رَأَيْتُمْ شيئا من ذلك فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِهِ وَدُعَائِهِ وَاسْتِغْفَارِهِ). [3] ئەبوموسای ئەشعەری (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: خۆر لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ گیرا، پێغەمبەر ﷺ راپەرشی و شڵەژا، ترسا ـ نیشانەی هاتنی ـ قیامەت بێ هەتا رۆیشت بۆ مزگەوت جا وەستاو نوێژێکی کرد وەستان کڕنووش‌و سوژدەکەی ئەوەندە درێژ بوو، هەرگیز نەم دیبوو لە هیچ نوێژێکدا وا بکات، پاشان فەرمووی: "ئەم نیشانانەی کە خوای گەورە دانانرێ لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەس نییە، بەڵکو خوا دەیان نێرێ، بەندەکانی پێ دەترسێنێ، ئەگەر هەندێ لە ونیشانانەتان دی هانا بەرن بۆ یادی خواو پاڕانەوەو داوای لێبوردن لە خوا".

---

۱) رواه احمد ٦/ ٣٤٥ وابوداود ١١٩٢ فەرموودەیەکی صەحیحە.

۲) رواه البخاري ١٠٥١ ومسلم ٩١٠ واحمد ٩٨/٦.

۳) رواه البخاري ١٠٥٩ ومسلم ٩١٢.

# نوێژە بارانە

**یەکەم پێناسەکەی:** نوێژێکە کاتی وشکەساڵی و بێ بارانی دەکرێ بۆ ئەوەی خوا باران ببارانێ، بەشێوەیەکی تایبەت دەکرێ.

**هۆی نوێژە بارانە:** زیان لێکەوتنی خەڵکی بە هۆی بێ بارانیو ڕۆچوونی ئاوی ڕووبارو بیرەکان.

**دووەم: نوێژەبارانە چۆن دەکرێ:**

**١- ڕۆیشتن بۆ نوێژگە، نوێژکردنەکەی، وتارخوێندنەوەی:**

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال: خَرَجَ رسول اللَّهِ ﷺ مُتَوَاضِعًا مُتَبَذِّلًا مُتَخَشِّعًا مُتَضَرِّعًا فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ كما يُصَلِّي في الْعِيدَيْنِ و لم يَخْطُبْ خُطْبَتَكُمْ هذه).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە دەرەوە ـ بۆ نوێژگە ـ بە ملکەچیو جلو بەرگێکی کۆنو بە دەم پاڕانەوەو بە لەسەرخۆییو لالانەوە جا دوو رکات نوێژی بۆ کردین وەك چۆن نوێژی جەژنی بۆ کردین، بەڵام وتارەکەی وەك ئەم وتارەی ئێوە نەبوو".

**٢- دوعا کردن لە وتاری ڕۆژی هەینیدا:**

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ أَنَّ رَجُلًا دخل الْمَسْجِدَ يوم جُمُعَةٍ من بَابٍ كان نحو دَارِ الْقَضَاءِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ يَخْطُبُ فَاسْتَقْبَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَائِمًا ثُمَّ قال يا رَسُولَ اللَّهِ هَلَكَتْ الْأَمْوَالُ وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ فَادْعُ اللَّهَ يغثنا فَرَفَعَ رسول اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ ثُمَّ قال اللهم أَغِثْنَا اللهم أَغِثْنَا اللهم أَغِثْنَا).[2] ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پاوێك لە ڕۆژێکی هەینیدا لە دەرگایەکەوە کە ڕوو بە ـ دار القضاء ـ بوو هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا بە پێوە ڕاوەستاو ڕووی کردە پێغەمبەرو ﷺ پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵو سامانمان هەمووی تیاچوو گشت ڕێگەیەکمان لێ بڕا، دەی داوا لە خوا بکە

---

١) رواه احمد ١/٢٣٠ والترمذي ٥٥٩ والنسائي ١٦٣/٣ حديث حسن.

٢) رواه البخاري ٩٣٣ ومسلم ٨٩٧/٨.

بارانمان بۆ ببارێنێ، ئەنەس وتی: پێغەمبەریش ﷺ هەردو ودەستی بەرز کردەوەو و فەرمووی: خوایە بێ بە هانامانەوەو بارانمان بۆ ببارێنە" سێ جار ئەم دوعایەی دووبارە کردەوە.

**٣- دوعای باران بارینی کردنی لە مینبەری مزگەوتی مەدینەدا:**

پێغەمبەر ﷺ داوای باران بارینی کرد لەسەر مینبەرەکەیەوە، (عن شُرَحْبِيلَ بن السِّمْطِ أَنَّهُ قال لِكَعْبٍ يا كَعْبُ بن مُرَّةَ حَدِّثْنَا عن رسول اللَّهِ ﷺ وَاحْذَرْ قال جاء رَجُلٌ إلى النبي ﷺ فقال يا رَسُولَ اللَّهِ اسْتَسْقِ اللَّهَ فَرَفَعَ رسول اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ فقال اللهم اسْقِنَا غَيْثًا مَرِيئًا مَرِيعًا طَبَقًا عَاجِلًا غير رَائِثٍ نَافِعًا غير ضَارٍّ قال فما جَمَّعُوا حتى أحيوا قال فَأَتَوْهُ فَشَكَوْا إليه الْمَطَرَ فَقَالُوا يا رَسُولَ اللَّهِ تَهَدَّمَتْ الْبُيُوتُ فقال اللهم حَوَالَيْنَا ولا عَلَيْنَا قال فَجَعَلَ السَّحَابُ يَنْقَطِعُ يَمِينًا وَشِمَالًا). [1] شورەحبیلی کوڕی سمیط دەڵێ: وتی بە کەعب ئەی کەعبی کوڕی موڕڕە، فەرموودەیەکی پێغەمبەرمان بۆ بگێڕەرەوەو وریاش بە، وتی: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ دلوای باران بارین بکە لە خوا، پێغەمبەریش ﷺ دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرمووی: "خوایە بارانێکی فریادڕەسی خێرداری زۆری گشتی زووی بە پەلەی بەسوودمان بۆ ببارێنە" وتی: نوێژی هەینیان نەکرد بارنیان بۆ باری، ئەنجا خەڵکەکە هاتنەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بێزاری خۆیان لە زۆری باران بارین دەربڕیو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خانووەکانمان هەمووی روخا، جا پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "خوایە لە دوورو پشتمان ببارێنە لەسەر ئێمە مەیبارێنە". کەعب وتی: جا هەورەکە بەلای راستو چەپدا بڵاوبوویەوەو نەما".

**٤- پێغەمبەر ﷺ داوای باران بارینی کرد لە مزگەوتدا دانیشتبوو دەستەکانی بەرزکردەوەو پاڕایەوە:**

(عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ قال أَتَتْ النبي ﷺ بَوَاكِي فقال اللهم اسْقِنَا غَيْثًا مُغِيثًا مَرِيئًا مَرِيعًا نَافِعًا غير ضَارٍّ عَاجِلًا غير آجِلٍ). [2] جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: چەند کەسێك ـ لەبەر بێ بارانی ـ بە گریانەوە هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەریش دەستی

---

١) رواه ابن ماجة ١٢٦٩ والحاكم ٣٢٨/١ والبيهقي ٣/ ٣٥٥ـ ٣٥٦ واحمد ٢٣٦/٤ حديث صحيح.

٢) رواه ابوداود ١١٦٩ والبيهقي ٣٥٥/٣ والحاكم ٣٢٧/١ حديث صحيح.

بەرزکردەوەو بە پاڕانەوەو فەرمووی: "خوایە بارانی ڕزگارکەری خێرداری زۆری بەسودی بێ زیانی بەپەلەمان بۆ ببارێنە".

**٥- پێغەمبەر ﷺ لە هەندێ غەزاکانیدا داوای باران بارینی کردووە:**

ئیبنولقەییم دەڵێ: لە غەزایەکدا بت پەرستەکان پێش پێغەمبەر ﷺ چووبوونە سەر ئاوەکە بۆیە موسڵمانەکان تووشی تینوێتی بوونو هانایان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا، ئەویش داوای باران بارینی لە خوای گەورە کرد، هەندێ لە دوورووەکان وتیان ئەگەر پێغەمبەر بێت داوای باران بارین دەکات بۆ شوێنکەوتووانی هەرچۆنێ موسا داوای کرد بۆ گەلەکەی ئەم قسەیە گەشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو قسەیەیان کردووە؟ ئومێد دەکەم پەروەردگارتان بارانتان بۆ ببارێنێ" پاشان دەستەکانی بەرزکردەوەو پاڕایەوە دەستەکانی دانەگرت هەور پەیدابوو لەسەریانەوە ئەنجا باران باری و لافاو هەستا لەو دۆڵەدا جا خەڵکەکە ئاویان خواردەوەو تێراوبوون".[١]

**سێیەم: ئادابەکانی نوێژە بارانە:**

١ـ پەشیمان بوونەوەیەکی ڕاستەقینە.

٢ـ یارمەتی دانی هەژارانو دانەوەی مافی خەڵکی و چاك کردنی نێوانیان.

٣ـ چوار ڕۆژ لەسەریەك بە ڕۆژوو بوون.

٤ـ لە ڕۆژی چوارەمی ڕۆژووەکەیاندا بە زمانی بە ڕۆژووەوە ئیمام دەیانباتە دەرەوەی شار بە جلوبەرگی کۆنی شڕەوە بە ملکەچیو زەلیلییەوە ئیمام بە جەماعەت دوو ڕکات نوێژیان بۆ دەکات وەك نوێژی جەژن.

٥ـ کە نوێژەکەیان تەواو کرد دوو ووتاریان بۆ دەدات وەك وتاری جەژن کە دەستی کرد بە وتاری دووەم و گەشتە سێ یەکی وتارەکە وتارخوێن ڕوو دەکاتە قیبلە و پشت دەکاتە نوێژگەرەکان پشتەماڵەکەی ـ یا پاڵتۆکەی ـ هەڵدەگێڕێتەوەو لای ڕاستی ئەدات بەسەر لای چەپیداو لای چەپی بەسەر لای ڕاستییدا و لای سەرەوەی دەکاتە خوارەوەو لای خوارەوە دەباتە سەرەوە.

---

١) بڕوانە: (زاد المعاد في هدي خير العباد لابن القيم ١/٤٤١).

(عن عبدالله بن زيد الْمَازِنِيُّ قال خَرَجَ النبي ﷺ يَسْتَسْقِي فَتَوَجَّهَ إلى الْقِبْلَةِ يَدْعُو وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ ثُمَّ صلى رَكْعَتَيْنِ جَهَرَ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَةِ)[١] عەبدوڵڵای كوڕی زیدی مازینی (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ـ ﷺ لە مەدینە ـ ڕۆشتە دەرەوە بۆ نوێژگە بۆ نوێژەبارانە جا ڕووی كردە قیبلەو پارایەوەو عەباكەی هەڵگەڕاندەوەو ڕاستو چەپی پێ كرد، پاشان دوو ركات نوێژی كرد بە دەنگی بەرز قورئانی تیا خوێند".

٦ـ سوننەتە منداڵو پیرو ئاژەڵ لەگەڵ خۆیاندا ببەن بۆ نوێژگە، چونكە ئەو نارەحەتییەی هۆی چوونە دەرەوەیانە بۆ نوێژگە هەموو ئەوانەش دەگرێتەوە.

٧ـ هەندێ دوعا دەربارەی باران بارین هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ:

( اللَّهُمَّ اسْقِنَا غَيْثًا مُغِيثًا هَنِيئًا مَرِيئًا مَرِيعًا غَدَقًا مُجَلِّلًا عَامًّا طَبَقًا سَحًّا دَائِمًا اللَّهُمَّ اسْقِنَا الْغَيْثَ وَلَا تَجْعَلْنَا من الْقَانِطِينَ اللَّهُمَّ إنَّ بِالْعِبَادِ وَالْبِلَادِ وَالْبَهَائِمِ وَالْخَلْقِ من اللَّأْوَاءِ وَالْجَهْدِ وَالضَّنْكِ ما لَا نَشْكُو إلَّا اليك اللَّهُمَّ أَنْبِتْ لنا الزَّرْعَ وَأَدِرَّ لنا الضَّرْعَ وَاسْقِنَا من بَرَكَاتِ السَّمَاءِ وَأَنْبِتْ لنا من بَرَكَاتِ الْأَرْضِ اللَّهُمَّ ارْفَعْ عَنَّا الْجَهْدَ وَالْجُوعَ والعرى وَاكْشِفْ عَنَّا من الْبَلَاءِ ما لَا يَكْشِفُهُ غَيْرُكَ اللَّهُمَّ إنَّا نَسْتَغْفِرُكَ إنَّكَ كُنْتَ غَفَّارًا فَأَرْسِلْ السَّمَاءَ عَلَيْنَا مِدْرَارًا)[٢]

---

١) رواه البخاري ١٠٢٤و ١٠٢٧ ومسلم ١، ٢، ٣، ٤/ ٨٩٤.

٢) رواه الشافعي في الام : ٢٥١/١

# نوێژی سوننەت

**نوێژی سوننەت:** ئەو نوێژانەن کە فەرز نین، دوو جۆرن: جۆرێکیان سوننەت نییە بە جەماعەت بکرێ،، جۆرەکەی تریان: سوننەتە بە جەماعەت بکرێن.

**جۆری یەکەم:** ئەو جۆرەی سوننەت نییە کە بە جەماعەت بکرێ، کە ئەمانیش دوو بەشن:

**بەشی یەکەم:** لەگەڵ نوێژە فەرزەکاندایە، کە لە پێش یا پاش نوێژە فەرزەکان دەکرێن.

**بەشی دووەم:** سوننەتە و لەگەڵ نوێژە فەرزەکاندا نییەو پەیوەندی بە نوێژە فەرزەکانەوە نییە.

**بەشی یەکەم:** ئەو سوننەتانەی لە پێشو پاشی نوێژە فەرزەکانەوەیە کە دەبنە دوو بەش: (موئەکەد)و (غەیر موئەکەد).

**ئەوانەیان کە سوننەتی (مؤكدة)ن:** ئەم نوێژانەن: دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی، دوو ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆ، دوو ڕکات پاش نوێژی نیوەڕۆ، دوو ڕکات پاش نوێژی مەغریب، دوو ڕکات پاش نوێژی عیشا.

(عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما قال حَفِظْتُ من النبي ﷺ عَشْرَ رَكَعَاتٍ: رَكْعَتَيْنِ قبل الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ فِي بَيْتِهِ وَرَكْعَتَيْنِ قبل صَلَاةِ الصُّبْحِ كانت سَاعَةً لَا يُدْخَلُ على النبي ﷺ فيها).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ دە ڕکات نوێژی سوننەتم لە پێغەمبەر ﷺ بەبیردێ بەردەوام دەیکردن: دوو ڕکات لە پێش نیوەڕۆ، دوو ڕکات لە دوای نیوەڕۆ، دوو ڕکات لە پاش مەغریب لەماڵەوە دەیکردن دوو ڕکات لە پاش عیشاو دوو لە پێش نوێژی بەیانی".

هەروەها عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ من الدُّنْيَا وما فيها) " دوو ڕکاتەکە ـ سوننەتەکەی پێش نوێژ ـ ی بەیانی لە دونیاو هەرچی تێدایە چاکترە".

---

١) رواه البخاري ١١٢٦ ومسلم ٧٢٩.

گەورەترینی ئەو سوننەتانە دوو رکاتەکەی نوێژی بەیانییە بە بەڵگەی ئەم فەرمودەی رابورد لە عائیشەوە رەزای خوای لێبێت ئەم فەرمودەی تریش کە هەر عائیشە رەزای خوای لێبێت دەڵی: (لم یکن النبي ﷺ علی شيء من النوافل أشد منه تعاهدا علی رکعتي الفجر).[1] "ئەوەندەی پێغەمبەر ﷺ بەردەوام دەبوو لەسەر ئەو دوو رکاتەی پێش نوێژی بەیانی لەسەر هیچ نوێژیکی تر بەردەوام نەدەبوو".[2]

**قورئان خوێندن لە دوو رکاتی پێش نوێژی بەیانییدا:**

(عن عائشة رضي الله عنها قالت: کان النبي ﷺ یخفف الرکعتین اللتین قبل صلاة الصبح حتی إني لأقول هل قرأ بأم الکتاب).[3] عائیشە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی ئەوەندە خێرا دەیکردن هەتا دەمووت ئاخۆ سورەتی فاتیحەی خوێندبێ؟".

(عن أبي هریرة أن النبي ﷺ قرأ في رکعتي الفجر ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾[4] هەروەها ئەبوهورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانییدا . ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ی دەخوێند لە رکاتی یەکەمدا و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ی دەخوێند لە رکاتی دووەمدا ".[5]

(قولوا أمنا بالله و ما انزل الینا..) تا کۆتایی ئایەتەکی ١٣٦ ی البقرە ی دەخوێند لە ڕکاتی یەکەمدا ، وە (أمنا بالله و اشهد بأنا مسلمون) تا کۆتایی ئایەتەکەی ٥٢ ی ال عمران دەخوێند.

راکشان پاش کردنی دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی:

---

١) رواه مسلم ٩٦/ ٧٢٥ واحمد ٦/ ٥٠ ـ ٥١ والترمذي ٤١٦.

٢) رواه البخاري ١١١٦ ومسلم ٧٢٤.

٣) رواه البخاري ١١٧١ ومسلم ٧٢٤.

٤) رواه مسلم ٩٧/ ٧٢٦.

٥) رواه مسلم دەفەرموێت/٧٢٧.

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا صلى أَحَدُكُمْ الرَّكْعَتَيْنِ قبل صَلاَةِ الصُّبْحِ فَلْيَضْطَجِعْ على جَنْبِهِ الأيْمَنِ). [١] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەر کەسێکتان کاتێ دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی کرد با لەسەر لای ڕاستی ڕاکشێت".

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت كان النبي ﷺ إذا صلى رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ اضْطَجَعَ على شِقِّهِ الأيْمَنِ). [٢] عائیشەش ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد لەسەر لای ڕاستی ڕادەکشا".

**ئەو نوێژە سوننەتانەی لە پێش پاشی فەرزەکانەوەن و (مؤکد) نین:**

**١ـ چوار ركات پێش نوێژی عەسر:**

(عن ابن عُمَرَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ رَحِمَ الله امْرَأً صلى قبل الْعَصْرِ أَرْبَعًا). [٣] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێبێت دەڵی: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێ: "ڕەحمەتی خوا لە کەسێك بێت پێش نوێژی عەسر چوار ركات نوێژی سوننەت بكات".

**٢ـ دوو ركات پێش نوێژی مەغریب:**

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ قال كنا بِالْمَدِينَةِ فإذا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ لِصَلَاةِ الْمَغْرِبِ ابْتَدَرُوا السَّوَارِيَ فَيَرْكَعُونَ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ حتى إِنَّ الرَّجُلَ الْغَرِيبَ لَيَدْخُلُ الْمَسْجِدَ فَيَحْسِبُ أَنَّ الصَّلَاةَ قد صُلِّيَتْ من كَثْرَةِ من يُصَلِّيهِمَا). [٤] ئەنەس ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: ئێمە لە مەدینەدا بووین، کاتێ بانگبێژ بانگی مەغریبی دەدا بە پەلە هاوەڵان دەچوونە لای پایەو کۆڵەکەکانی مزگەوتو دوو ركات نوێژیان دەکرد ئەوانەی دەیانکرد ئەوەندە زۆر بوون ئەگەر کەسێکی دەرەوەی مەدینە بڕۆشتایەتە مزگەوتی مەدینە وای دەزانی نوێژی مەغریب کراوە ـ ئەمە سوننەتی پێش مەغریبە".

---

١) رواه احمد ٤١٥/٢ وابوداود ١٢٦١ والترمذي ٤٢٠ حديث صحيح.

٢) رواه البخاري ١١٦٠ ومسلم ٧٤٣ وابوداود ١٢٦٢.

٣) رواه الترمذي ٤٣٠ حديث حسن.

٤) رواه البخاري ٥٩٩، ومسلم ٨٣٧.

**بەشی دووەم: كە لەگەڵ نوێژە فەرزەكاندا نییە:** ئەم بەشەش دەبێت بە دوو بەشەوە سوننەتی خاوەن ناوو كاتی دیاری كراو، سوننەتی ڕەها كە ناوو كاتی دیاری كراوی نییە.

**١ـ نوێژی سوننەتی ناوو كاتی بۆ دیاری كراو:**

**أ ـ نوێژی ڕۆشتنە مزگەوت:**

كە دوو ركات نوێژە لە كاتی ڕۆشتنە مزگەوتدا پێش دانیشتن دەكرێت.
(أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال: إذا دخل أحدكم الْمَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قبل أَنْ يَجْلِسَ). [١]
پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "هەر كاتێ كەسێكتان چووە ناو مزگەوت ئەوە با دانەنیشێت هەتا دوو ركات نوێژ دەكات".

**ب ـ نوێژی ویتر:**

ئەم نوێژە سوننەتێكی جەخت لەسەر كراوەیە (مؤكدة)، بۆیە ئەو ناوەشی لێ نراوە، چونكە بە یەك ركات كۆتایی دێت بە پێچەوانەی نوێژە سونەتەكانی ترەوە.
**١ـ كاتی نوێژی ویتر:** (عن عَائِشَةَ قالت كُلَّ اللَّيْلِ أَوْتَرَ رسول اللَّهِ ﷺ وَانْتَهَى وِتْرُهُ إلى السَّحَرِ). [٢] عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: لە هەموو كاتەكانی شەودا پێغەمبەر ﷺ نوێژی ویتری كردووە تا گەیشتووەتە كاتی بەرەبەیان".
(عن خارجه بن حذافة أنه قال: خرج علينا رسول الله ﷺ فقال إن الله أمدكم بصلاة هي خير لكم من حمر النعم الوتر جعله الله لكم فيما بين صلاة العشاء إلى أن يطلع الفجر ..). [٣] خاریجەی كوڕی حوزافە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "بێگومان خوا نوێژێكی پێداوون لە حوشترە سوورەكان چاكترە بۆتان" وتمان ئەو نوێژە كامەیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "نوێژی ویترە ـ كاتەكەی ـ لە نێوان عیشاو بەیانیی دایە".
**٢ـ ئەگەر كەسێك دڵنیا نەبوون شەو خەبەری دەبێتەوە ئەوە با لە سەرەتای كاتەكەیەوە نوێژی ویترەكەی بكات.**

١) رواه البخاري ٤٣٣ ومسلم ٧١٤.
٢) رواه البخاري ٩٩٦ ومسلم ٧٤٥.
٣) رواه ابوداود ١٤١٨ والترمذي ٤٥٢ وابن ماجه١١٦٨ حديث صحيح.

(عن جَابِرٍ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من خَافَ أَنْ لَا يَقُومَ من آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ أَوَّلَهُ وَمَنْ طَمِعَ أَنْ يَقُومَ آخِرَهُ فَلْيُوتِرْ آخِرَ اللَّيْلِ فإن صَلَاةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَشْهُودَةٌ وَذَلِكَ أَفْضَلُ).[1] جابیر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەرکەس ترسا لە کۆتایی شەودا بەخەبەر نەیەت، با لە سەرەتای شەوەوە نوێژی ویترەکەی بکات، ئەوە کەسەش کە بە تەمایە لە کۆتایی شەودا هەستێ با لە کۆتایی شەودا ویترەکەی بکات، چونکە نوێژی کۆتایی شەو فریشتەکان ئامادەی ئەبن ئەمەشیان باشترە".

(عن عَائِشَةَ قالت من كل اللَّيْلِ قد أَوْتَرَ رسول اللَّهِ ﷺ من أَوَّلِ اللَّيْلِ وَأَوْسَطِهِ وَآخِرِهِ فَانْتَهَى وِتْرُهُ إلى السَّحَرِ).[2] عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: "لە هەموو کاتەکانی شەودا پێغەمبەر ﷺ نوێژی ویتری کردووە لە سەرەتای شەوداو لە ناوەڕاستی شەوداو لە کۆتایی شەودا، وە دواجار نوێژی ویتری خستە بەرەبەیان".

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ لا تُوتِرُوا بِثَلاثٍ أَوْتِرُوا بِخَمْسٍ أَوْ بِسَبْعٍ وَلا تَشَبَّهُوا بِصَلاةِ الْمَغْرِبِ).[3] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "سێ ڕکات نوێژی ویتر مەکەن ـ بەیەك سەلام دانەوە بەسەر یەکەوە ـ پێنج یا حەوت ـ ڕکات ـ بکەن، بۆ ئەوەی نوێژەکەتان لە نوێژی مەغریب نەچێت".

**٣ـ قنوت لە نوێژی ویتردا:**

(عن الْحَسَنِ بن عَلِيٍّ قال عَلَّمَنِي جَدِّي رسول اللَّهِ ﷺ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ في قُنُوتِ الْوِتْرِ: اللهم عَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ وَاهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ وَقِنِي شَرَّ ما قَضَيْتَ وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ إِنَّكَ تَقْضِي ولا يُقْضَى عَلَيْكَ إنه لَا يَذِلُّ من وَالَيْتَ سُبْحَانَكَ رَبَّنَا تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ) حەسەنی کوڕی عەلی ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فێری چەند وتەیەکی کردم لە قنوتی نوێژی ویتردا بیڵێم: "اللهم عَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ وَاهْدِنِي

---

١) رواه مسلم ٧٥٥.

٢) رواه البخاري ٩٩٦ ومسلم ٧٤٥.

٣) ر واه الدارقطني ٢/٢٤، وابن حبان في صحيحه ٢٤٢٩. والحاكم ١/٣٠٤. حديث صحيح.

فِيمَنْ هَدَيْتَ وَقِنِي شَرَّ ما قَضَيْتَ وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ إِنَّكَ تَقْضِي ولا يُقْضَى عَلَيْكَ إنه لَا يَذِلُّ من وَالَيْتَ سُبْحَانَكَ رَبَّنَا تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ".[١]

**٤ـ شوێنی قنوت لە نوێژی ویتردا:**

(عن أُبَيٍّ بن كَعْبٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كان يُوتِرُ وَيَقْنُتُ قبل الرُّكُوعِ)[٢] **ئوبەی کوڕی کەعب ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی ویتری دەکردو پێش روکوع قنوتی دەخوێند".**

**کەواتە قنوت لە پێش رکوعدا دەخوێنرێت بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە.**

(عن مُحَمَّدٍ قال :(سَأَلْتُ أَنَسَ بن ما لك عن الْقُنُوتِ فقال قَنَتَ رسول اللَّهِ ﷺ بَعْدَ الرُّكُوعِ)[٣] **موحەممەد دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەس کرد دەربارەی قنوت ئەویش وتی: پێغەمبەر ﷺ پاش رکوع قنوتی خوێندووە".**[٤]

**٥ـ ژمارەی رکاتەکانی نوێژی ویتر:**

**١ـ لای کەمی ویتر یەك رکاتە:**

(عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما قال: قال رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى فإذا خَشِيَ أحدكم الصُّبْحَ صلى رَكْعَةً وَاحِدَةً تُوتِرُ له ما قد صلى).[٥] **عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "شەونوێژ دوو رکات دوو رکاتە جا ئەگەر کەسێکتان سپێدە هەڵبێت ـ نوێژی بەیانی ببێت ـ یەك رکات ویتر بکات، ئیتر بەوە ئەو نوێژانەی کردوونی بۆی دەکات بە ویتر".**

**٢ـ دروستە نوێژی ویتر سێ یا پێنج یا حەوت یا نۆ رکات بێت:**

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت: ما كانت رسول اللَّهِ ﷺ يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ ولا فِي غَيْرِهِ على إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يُصَلِّي أَرْبَعًا فلا تَسَلْ عن حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا فلا تَسَلْ عن

---

١) رواه احمد ١/١٩٩ وابوداود ١٤٢٥ والترمذي ٤٦٤ والنسائي ٢/٢٤٨ وابن ماجة ٧٧٨ حديث صحيح.

٢) رواه النسائي ٣/ ٢٣٥ وابن ماجه ١١٨٢ حديث صحيح.

٣) رواه ابن ماجه ١١٨٤.

٤) رواه ابن ماجه ١١٨٤.

٥) رواه البخاري ٩٩٠ ومسلم ١٤٥/ ٧٤٩.

حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ ثُمَّ يُصَلِّي ثَلَاثًا.....) [١] عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مانگی ڕەمەزانو غەیری ڕەمەزانیش یازدە ڕکات زیاتر - شەونوێژو ویتر - ی نەکردووە، چوار ڕکاتی دەکرد مەپرسە چەند جوانو درێژ دەیکردن، پاشان چواری تر دەکرد مەپرسە چەند جوانو درێژ دەیکردن پاشان سی ڕکاتی دەکرد...".

(عن عَائِشَةَ قالت كان رسول اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي من اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً يُوتِرُ من ذلك بِخَمْسٍ لَا يَجْلِسُ في شَيْءٍ إلا في آخِرِهَا). [٢] عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵی: پێغەمبەر ﷺ لە شەودا سیازدە ڕکات نوێژی دەکرد، پێنجیان لەوانە ویتر بوون تەنیا لە ڕکاتی کۆتاییاندا دادەنیشت - بۆ تەحیات خوێندن -".

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ لا تُوتِرُوا بِثَلاثٍ أَوْتِرُوا بِخَمْسٍ أَوْ بِسَبْعٍ وَلا تَشَبَّهُوا بِصَلاةِ الْمَغْرِبِ). [٣] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "سێ ڕکات نوێژی ویتر مەکەن، بەڵکو پێنج یا حەوت ڕکات بکەن بۆ ئەوەی نوێژەکەتان لە نوێژی مەغریب نەچێت".

**ج - شەونوێژ:**

سێیەم لەو نوێژە سوننەتانەی کە ناوو کاتی دیاری کراویان هەیە "شەونوێژ"ە:

شەونوێژ ئەو نوێژە سوننەتەیە کە لە شەودا دەکرێت لە پاش نوێژی عیشا تا نوێژی بەیانی چاکتر وایە لە پاش خەوتنو لە سی یەکی کۆتایی شەودا بکرێت.

**بەڵگەی شەونوێژ:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴾ الإسراء: ٧٩ واتە: لە شەودا نوێژ بکە خوا بە زیادە بۆت دەنووسێ، بە هیوای ئەوەی پەروەردگارت لە زیندووکردنەوەتدا پلەو پایەیەکی بەرێزو چاکت پێ ببەخشێت.

---

١) رواه البخاري ١١٤٧ ومسلم ١٢٥/ ٧٣٧ وابوداود ١٣٤١.

٢) رواه مسلم ١٢٣/ ٢٣٧، واحمد ٢٣٠/٦ وابوداود ١٣٣٨ والترمذي ٤٥٩ والنسائي ٢٤٠/٣.

٣) رواه الدارقطني ٢٤/٢، حبان في صحيحه ٢٤٢٩. والحاكم ٣٠٤/١. والبيهقي ٣١/٣ حديث صحيح.

عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال ( سُئِلَ رسول اللَّهِ ﷺ أَيُّ الصَّلَاةِ أَفْضَلُ بَعْدَ الْمَكْتُوبَةِ ....فقال أَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ الصَّلَاةُ في جَوْفِ اللَّيْلِ).[١]

ئەبوهورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا پاش نوێژی فەرز چ نوێژێك چاکترو گەورەترە؟ فەرمووی: "نوێژ لە نیوەشەودا".

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال كان رسول اللَّهِ ﷺ يُرَغِّبُ في قِيَامِ رَمَضَانَ من غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَهُمْ بِعَزِيمَةٍ ثُمَّ يقول من قام رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ له ما تَقَدَّمَ من ذَنْبِهِ).[٢] ئەبوهورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هانی دەدا بۆ شەونوێژی رەمەزان بەبێ ئەوەی فەرمانی پێ بکات، دەیفەرموو: "هەرکەس لە رەمەزاندا بە بڕوای تەواو هیوای پاداشتەوە شەونوێژ بکات خوا لە گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبیت".

### د ـ نوێژی چێشتنگا:

**١ـ بەڵگەی ئەم نوێژە:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ بِثَلَاثٍ صِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ من كل شَهْرٍ وَرَكْعَتَيْ الضُّحَى وَأَنْ أُوتِرَ قبل أَنْ أَنَامَ).[٣] ئەبوهورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: خۆشەویستم پێغەمبەر ﷺ رایسپاردووم بۆ سێ شت: بە گرتنی سێ رۆژ رۆژوو لە هەموو مانگێکدا، دوو رکاتی چێشتنگاو، هەورەها پێش ئەوەی بخەوم نوێژی ویتر بکەم".

**٢ـ ژمارەی رکاتەکانی: دوورکات، چوار رکات، هەشت رکات:**

دوو رکات بەڵگەی فەرموودەکەی پێشووی ئەبوهورەیرەیە (خۆشەویستم رایسپاردووم..).

**چوار رکات:**

(عن نُعَيْمِ بن هَمَّارٍ الْغَطَفَانِيِّ عن النبي ﷺ قال قال الله تَعَالَى يا بن آدَمَ صَلِّ لي أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ من أَوَّلِ النَّهَارِ أَكْفِكَ آخِرَهُ).[٤] نوعەیمی کوڕی هەمماری غەطفانی رەزای خوای لێبێت دەڵێ:

---

١) أخرجه مسلم، ١١٦٣.

٢) رواه البخاري ٢٧ ومسلم ١٧٣/

٣) رواه البخاري ١٩٨١ ومسلم ٧٠٢١ واحمد ٢/٢٥٨.

٤) رواه مسلم ١٤٤/ ٧٤٨ واحمد ٣٦٩/٤.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "پەروەردگارتان دەفەرموێ: ئەی نەوەی ئادەم لە سەرەتای ڕۆژەوەی چوار ركات نوێژم بۆ بكە منیش تا كۆتایی دەت پارێزم".

**هەشت ركات:**

عن بن أبي لَيْلَى قال:( ما أنبأنا أَحَدٌ أَنَّهُ رَأَى النبي ﷺ صلى الضُّحَى غَيْرُ أُمِّ هَانِئٍ ذَكَرَتْ أَنَّ النبي ﷺ يوم فَتْحِ مَكَّةَ اغْتَسَلَ في بَيْتِهَا فَصَلَّى ثمان رَكَعَاتٍ فما رَأَيْتُهُ صلى صَلَاةً أَخَفَّ منها غير أَنَّهُ يُتِمُّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ)

ئیبن ئەبی لەیلا دەڵێ: جگە لە ئومو هانی كەس بۆی نەگێراوینەتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ دیبێ نوێژی چێشتانگای كردبێ، كە دەڵێ: لە ڕۆژی ئازادكردنی مەككەدا پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی ئەودا خۆی شۆری جا هەشت ركات نوێژی ـ چێشتنگای ـ كرد، كە نەمدیووە پێشتر نوێژی ئەوەندە كورت و بەپەلەی كردبێت، بەڵام ڕوكوعو سوژدەی بەرێكی دەبرد"[1].

**٣ـ چاكترین كاتی:**

بۆ كردنی ئەم نوێژە چاكترینو گەورەترین كات ئەو كاتەیە لەم فەرمودەدا هاتووە:

(عن زَيْدِ بن أَرْقَمَ قال خَرَجَ رسول اللَّهِ ﷺ على أَهْلِ قُبَاءَ وَهُمْ يُصَلُّونَ الضُّحَى فقال صَلَاةُ الْأَوَّابِينَ إذا رَمِضَتِ الْفِصَالُ مِنَ الضُّحَى).[2] زەیدی كوڕی ئەرقەم ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەری لە خەڵكی قوبا دا لەو كاتەدا نوێژی چێشتنگایان دەكرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: نوێژی ئەوابین لە كاتێكدایە كە بەچكە ووشتر هەست بە گەرما دەكات لە چێشتناگادا ـ یان بە گەرما سمی دەسووتێ ـ".

**٤ـ پاداشتی نوێژی چێشتنگا:**

(عن أَبِي ذَرٍّ عن النبي ﷺ أَنَّهُ قال يُصْبِحُ على كل سلامي من أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ فَكُلُّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ وَنَهْيٌ عن الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ وَيُجْزِئُ من ذلك رَكْعَتَانِ يَرْكَعُهُمَا من الضُّحَى).[3] ئەبوزەڕ ڕەزای خوای لێبێت

---

١) رواه البخاري ١١٠٣ ومسلم ٨٠/ ٣٣٦.

٢) رواه مسلم ١٦٣٠.

٣) رواه مسلم ٧٢٠ وابوداود ١٢٨٥ واحمد ١٦٧/٥.

دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "هەرکە رۆژ دەبێتەوە هەموو جومگەکانی هەرکەسێکتان خێرێکی لەسەرە، جا هەموو (سبحان الله)یەك خێرێکەو هەموو (الحمدلله)یەك خێرێکەو هەموو (لا اله الا الله)یەك خێرێکە، هەموو (الله اکبر)ێك خێرێکە، فەرمان کردن بە چاکە خێرێکەو رێگریی کردن لە خراپەش خێرێکە، کردنی دوو رکات لە چێشتانگادا بری هەموو ئەوانە دەکەوێت".

**٥ ـ نوێژی ئیستیخارە:**

(عن جَابِرِ بن عبداللَّهِ رضي الله عنهما قال: كان رسول اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا الإِسْتِخَارَةَ كما يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، يقول: إذا هَمَّ أحدكم بِالأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ من غَيْرِ الْفَرِيضَةِ ثُمَّ لِيَقُلِ اللهم إِنِي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ من فَضْلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ اللهم فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ هذا الأَمْرَ يُسَمِّيهِ بِاسْمِهِ خَيْراً لي في دِينِي ومعاشي قال أبو سَعِيدٍ ومعيشتي وَعَاقِبَةِ أمري فَاقْدُرْهُ لي وَيَسِّرْهُ ثُمَّ بَارِكْ لي فيه اللهم وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُهُ شَرًّا لي في دِينِي ومعاشي وَعَاقِبَةِ أمري فاصرفني عنه وأصرفه عني وأقدر لي الْخَيْرَ حَيْثُ كان ثُمَّ رضني بِهِ قال: ويسمى حاجته)[١].

جابیری کوڕی عەبدوڵلا رەزای خوایان لێبێت دەڵێ: "پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەموو کاروبارێ فێری ئیستیخارەی دەکردین[٢]، وەك چۆن فێری سورەتەکانی قورئانی دەکردین، دەیفەرموو: "ئەگەر یەکێکتان نیازی کارێکی هەبوو ـ نەیدەزانی چاکە یا خراپە ـ با دوو رکات نوێژی سوننەت بکات، پاشان ـ دوای سەلامدانەوە ـ بڵێ: "اللهم إِنِي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ من فَضْلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ اللهم فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ هذا الآمْرَ يُسَمِّيهِ بِاسْمِهِ خَيْراً لي في دِينِي ومعاشي قال أبو سَعِيدٍ ومعيشتي وَعَاقِبَةِ أمري فَاقْدُرْهُ لي وَيَسِّرْهُ ثُمَّ بَارِكْ لي فيه اللهم وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُهُ شَرًّا لي في دِينِي ومعاشي وَعَاقِبَةِ أمري فاصرفني عنه وأصرفه عني وأقدر لي الْخَيْرَ حَيْثُ كان ثُمَّ رضني بِهِ. قال: ويسمى حاجته".[٣] واتە:

١) رواه البخاري ١١٦٢ و ٦٣٨٢ واحمد ٣/٣٤٤ وابوداود ١٥٣٨.

٢) ئیستیخارە: واتە داواکردن لە خوا کە کام لە کردن یا نەکردن چاکترە نیشانی ئەو کەسەی بدا و بیخاتە دڵیەوە.

٣) رواه البخاري ١١٦٢ و ٦٣٨٢ واحمد ٣/٣٤٤ وابوداود ١٥٣٨.

ئەی خوایە داوات لێدەکەم بە عیلمو زانستی خۆتو بە دەسەڵاتو توانایی خۆت و داوای بەهرەی گەورەی خۆتت لێدەکەم، چونکە بە راستی تۆ توانات هەیە و من بێدەسەڵاتم و تۆ زاناو ئاگایت و من نەزانم و تۆ زاناو ئاگایت لە هەموو نهێنییەکان، ئەی خوایە ئەگەر خۆت دەزانی ئەم کارە ـ ناوی ئیشەکەی ببات ـ چاکە بۆ ئایینو ژیانو سەرئەنجامی کارم ـ یا فەرمووی: چاکە بۆ ئێستاو پاشەرۆژم ـ ئەوە لە چارەم بنووسەو ئاسانی بکە، بەڵام پاشان پیتو فەڕی تێبخە بۆم، ئەی خوایە خۆ ئەگەر دەزانی ئەم کارە ـ ناوی ئیشەکە ببات ـ خراپە بۆ ئایینو ژیانو سەرئەنجامی کارم ئەوا لایدە لێمو منیش لەولادە، وەچی چاکە ئەوە لە چارەم بنووسە، پاشان رازیشم بکە پێی"، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ناوی کارو پێویستییەکەی بێنێ".

**٢- نوێژە سوننەتە ڕەهاکان ناوو کاتی دیاری کراویان نییە:**

ئەو نوێژە سوننەتانەیە رکاتو کاتی دیاری کراویان بۆ دانەنراوە، بەڵکو چەند رکات بکات لە هەر کاتێکدا بیکات ـ جگە لە کاتە مەکروهەکان ـ دروستە.

دەبێ ئەوە بزانین لەم جۆرە نوێژە سوننەتانەدا سوننەتە لە دوای دوو رکات سەلام بدرێتە لە شەودا بێت یان لە رۆژدا .

جۆری دووەم: ئەو نوێژە سوننەتانەی سوننەتە بە جەماعەت بکرێن:

جا ئەو نوێژە سوننەتانەی کە سوننەتە بە جەماعەت بکرێن ئەم نوێژانەن: نویژی جەژنەکان، نویژی تەراویح، نوێژی خۆرگیرانو مانگ گیران، نوێژەبارانە. کە پێشتر باسی ئەم نوێژانەمان کرد لەگەڵ هەر خاڵێك پەیوەندی پێیانەوە هەبێت لەگەڵ بەڵگەکانیاندا.

# کتێبی جەنازە ( مردوو )

**یەکەم: ئەو کارە چاکانەی کە پێویستە لەسەر نەخۆش:**

**١ـ گومانی چاك بردن بە خوای گەورە:**

(عن جَابِرٍ قال: سمعت النبي ﷺ قبل وفاته بثلاث يقول لا يَمُوتَنَّ أحدكم إلا وهو يُحْسِنُ بِاللَّهِ الظَّنَّ). [1] جابیر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: سێ ڕۆژ پێش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ گوێم لێبوو فەرمووی: "با هیچ کام لە ئێوە نەمرێ ئیللا گومانی چاك بەخوا ببات".

**٢ـ پەلەکردن لە تەوبەکردندا:**

چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ النور: ٣١ واتە: ئەی باوەڕداران هەمووتان تەوبە بکەنو بگەڕێنەوە بۆ لای خوا تا ڕزگارو سەرفراز بن لە ڕۆژی دواییدا.

**٣ـ وەسیەت نووسین:**

(عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال: ما حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ له شَيْءٌ يُوصِي فيه يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ إلا وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ). [2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "هەق نییە هیچ موسڵمانێك کە شتێکی هەبێت پێویستی بەوەسێت بێت دوو شەوی بەسەردا تێپەڕێت، مەگەر وەسیەتی لای خۆی نووسیبێت".

**٤ـ دانەوەی قەرزەکان:** ئەگەر نەخۆش قەرزدار بوو و توانای دانەوەی قەرزەکەشی هەبوو دەبێت بەزووترین کات قەرزەکان بداتەوە بێ دواخستن، چونکە نازانێ کەی مردن یەخەی پێ دەگرێ، ئەگەر مرد ، کێ دەڵێ کەسوکاری قەرزەکانی بۆ دەدەنەوە.

---

١) رواه مسلم ٢٨٧٧.

٢) رواه البخاري ٢٧٣٨ ومسلم ١٦٢٧.

**دووەم: ئەرکی ئامادەبووانی مردوو:**

ئەو کەسانەی لە کاتی مردنی کەسێکدا ئامادەن چ کاتی سەرەمەرگ بێت یا کاتی دوامردنی ئەوە چەند ئەرکێکیان لەسەرە کە ئەمانەن:

**١ـ (لا اله الا الله) خستنە سەر زمانی ئەو کەسەی لەسەرەمەرگدایە:**

(عن أَبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ يقول قال رسول اللَّهِ ﷺ لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لَا إِلَهَ إلا الله).[1] ئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێبێت دەڵی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "لا اله الا الله" بدەن بە گوێی مردووەکانتاندا"،مەبەست لە مردووەکان ئەو کەسانەیە کە لە سەرەمەرگدان.

**٢ـ دواخستنی چاوی مردووەکە و دوعا کردن بۆی:**

(عن أُمِّ سَلَمَةَ قالت دخل رسول اللَّهِ ﷺ على أبي سَلَمَةَ وقد شَقَّ بَصَرُهُ فَأَغْمَضَهُ ثُمَّ قال إِنَّ الرُّوحَ إذا قُبِضَ تَبِعَهُ الْبَصَرُ فَضَجَّ نَاسٌ من أَهْلِهِ فقال لَا تَدْعُوا على أَنْفُسِكُمْ إلا بِخَيْرٍ فإن الْمَلَائِكَةَ يُؤَمِّنُونَ على ما تَقُولُونَ ثُمَّ قال اللهم اغْفِرْ لِأَبِي سَلَمَةَ وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ في الْمَهْدِيِّينَ وَاخْلُفْهُ في عقبة في الْغَابِرِينَ وَاغْفِرْ لنا وَلَهُ يا رَبَّ الْعَالَمِينَ وأفسح له في قَبْرِهِ وَنَوِّرْ له فيه).[2] ئوموسەلەمە ڕەزای خوای لێبێت دەڵی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشتە سەر تەرمی ئەبوسەلەمە چاوکرابۆوە پێغەمبەر ﷺ چاوەکانی لێکنان پاشان فەرمووی: "کاتێ گیان دەردەچێت چاو لە دوای دەڕاوانێت" هەندێ لە کەسوکاری دەنگی ـ گریانیان ـ لێ بەرزبوویەوە ((نزای خێر نەبێت لە خۆتانی مەکەن چونکە فریشتەکان ئامین دەکەن لەسەر نزاکانتان)) ئینجا فەرمووی: "خوایە لە ئەبوسەلەمە خۆش ببە، پەلوپایەی لە ریز هیدایەتدراواندا بەرز بکەرەوە، خۆت سەرپەرشتی ئەو نەوانەی بکە کە لە دوای بەجێ ماوون، لە ئێمەش و لەویش خۆش ببە ئەی پەروەردگاری جیهانیان، گۆڕەکەشی بۆ فراوانو گوشادو ڕووناك بکە".

---

١) رواه البخاري ١٢٤٠ ومسلم ٢١٦٢.

٢) رواه مسلم ٩٢٠.

**٣ـ داپۆشینی لاشەی مردووەکە بە قوماشێك:**

(عن عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ رضي الله عنها قالت: سُجِّيَ رسول اللَّهِ ﷺ حين مَاتَ بِثَوْبِ حِبَرَةٍ). [١] **عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: "کاتێ پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد بە پارچە قوماشێکی سەوز داپۆشرا".**

**٤ـ پەلەکردن لە دانەوەی قەرزی مردووەکە:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حتى يُقْضَى عنه). [٢] **ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: "گیانی باوەڕدار بە قەرزکەیەوە هەڵبەستراوە تا بۆی دەدرێتەوە"، واتە: بە هۆی قەرزەکەیەوە قەدەغە دەکرێت لە چوونە بەهەشت تا قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە.**

**٥ـ لادانی دەم و چاوی و ماچ کردنی:**

(عن عَائِشَةَ قالت رأيت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُقَبِّلُ عُثْمَانَ بن مَظْعُونٍ وهو مَيِّتٌ حتى رأيت الدُّمُوعَ تَسِيلُ). [٣] **عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: "عوسمانی کوڕی مەزعون مردوو پێغەمبەری خوام ﷺ دی ماچی کرد بە جۆرێ هەتا فرمێسك بە چاویدا هاتە خوارەوە".**

**٦ـ شۆردنی مردووەکە:**

(عن بن عَبَّاسٍ رضي الله عَنْهُمْ قال أَنَّ رَجُلٌ وَقَصَهُ بعيره ونحن مع النبي ﷺ وهو محرم فقال النبي ﷺ: اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَكَفِّنُوهُ في ثَوْبَيْنِ ولا تُحَنِّطُوهُ ولا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ فإنه يُبْعَثُ يوم الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا). [٤] **عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بووین، پیاوێك لە ئیحرامدا وشترەکەی ملی شکاندو مرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "بە ئاوو سیدر بیشۆن لە دوو پۆشاکدا کفنی بکەن، بۆنی خۆشی لێ مەدەن و سەری دامەپۆشن، چونکە لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە بەدەم (لبيك) وتنەوە زیندووی دەکاتەوە".**

---

١) رواه البخاري ١٢٤١و ١٢٤٢ ومسلم ٩٤٢.

٢) رواه احمد ٢/٤٤٠ والترمذي ١٠٧٩ وابن ماجه ٢٤١٣ حديث صحيح.

٣) رواه ابوداود ٣١٦٣ والترمذي ٩٨٩ وابن ماجه ١٤٥٦ حديث صحيح بشواهده.

٤) رواه البخاري ١٢٦٧ ومسلم ١٢٠٦.

**سێیەم: شۆردنی مردوو:**

١ـ (عن أُمِّ عَطِيَّةَ الأَنْصَارِيَّةِ رضي الله عنها قالت دخل عَلَيْنَا رسول اللَّهِ ﷺ حين تُوُفِّيَتْ ابْنَتُهُ فقال اغْسِلْنَهَا ثَلَاثًا أو خَمْسًا أو أَكْثَرَ من ذلك إن رَأَيْتُنَّ ذلك بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَاجْعَلْنَ في الْآخِرَةِ كَافُورًا أو شيئا من كَافُورٍ فإذا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي فلما فَرَغْنَا آذَنَّاهُ فَأَعْطَانَا حِقْوَهُ فقال أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ تَعْنِي إِزَارَهُ).[١] ئومو عەتییەی ئەنساری ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ کچەکەی کۆچی دوایی کرد بوو هات بۆ لامانو فەرمووی: "سێ جار یان پێنج جار یا زیاتر بیشۆرن ئەگەر بە پێویستتان زانی لە دواجاردا کافوری تێ بکەن ـ یان کەمێك لە کافور ـ ئەنجا کە لێبوونەوە ئاگادارم بکەن" جا کە لێبوینەوە بانگمان کردو هات بەرگە پۆشەکەی خۆی پێداینو فەرمووی: "لە پێشدا ئەوەی پێوە پێچن ئینجا کفنی بکەن بە بەریدا".

**٢ـ باشتر وایە ژنو مێرد یەکتری بشۆن:**

(عن عَائِشَةَ قال رسول اللَّهِ ﷺ ما ضَرَّكِ لو مِتِّ قَبْلِي فَقُمْتُ عَلَيْكِ فَغَسَّلْتُكِ وَكَفَّنْتُكِ وَصَلَّيْتُ عَلَيْكِ وَدَفَنْتُكِ).[٢] عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "چ زیانێك دەکەین ـ ئەی عائیشە ـ ئەگەر پێش من مردبێت ئەوە لە سەرت ڕادەوەستامو دەمشۆردیتو کفنم دەکردیو نوێژم لەسەر دەکردیتو دەمناشتیت".

**٣ـ مردوو کەس و کاری خۆی بیشوات چاکترە:**

چاکتر وایە مردوو خزمی نزیکی بیشوات بەتایبەتی ئەگەر شارەزای مردوو شۆردن بوو ئەوە زۆر باشترە لە خەڵکی تر:

بە مەرجێ پیاو پیاوی خزمی بیشتوانو ئافرەتیش ئافرەت. ئەوەتە ئەو کەسانەی پێغەمبەریان ﷺ شۆردووە خزمو نزیکانی خۆی بوون، (قال علي بن أبي طالب غسلت رسول الله فذهبت أنظر ما يكون من الميت فلم أر شيئا وكان طيبا صلى الله عليه وآله وسلم حيا وميتا ﷺ).[٣] عەلی کوڕی ئەبوتالیب ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ شۆرد جا سەیرم کرد

---

١) رواه البخاري ١٢٥٣ ومسلم ٩٣٩.

٢) رواه ابن ماجة ١٤٦٥ والدارمي ١/٣٧ ـ ٣٨ حديث حسن.

٣) رواه ابن ماجة ١٤٦٧ والحاكم ١/٣٦٢ والبيهقي ٣/٣٩٨ حديث صحيح.

ئەوەی بە سەر مردوودا دێت، لە پێغەمبەردا ﷺ هیچم نەدی‌و پێغەمبەر ﷺ بە زیندوویی‌و بە مردوویی هەر بۆن خۆش‌و جوان بوو".

**٤ـ لای راستی مردوو پێشتر بشۆردرێ:**

(عن أُمِّ عَطِيَّةَ قالت قال النبي ﷺ لَهُنَّ فِي غَسْلِ ابْنَتِهِ ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ منها).[1] ئومو عەتییە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە کاتی شۆردنی کچەکەیدا پێی وتن: "لە شۆردندا لەلای راستەوە و لە شوێنەکانی دەست نوێژییەوە دەست پێ بکەن".

**چوارەم: کفن کردنی مردوو:**

چاك وایە کفنی مردوو قوماشێکی چاك‌و پاك بێت‌و هەموو لاشەی مردووەکە داپۆشێت‌و بیگرێتەوە، (قال جابر رضی الله عنه وقال النبي ﷺ إذا كَفَّنَ أحدكم أَخَاهُ فَلْيُحَسِّنْ كَفَنَهُ).[2] جابیری کوڕی عەبدوڵلا رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەگەر کەسێکتان کفنی بۆ براکەی ئامادە کرد با بە چاکی‌و تێرو تەواوی بیکات".

باشتر وایە کفنەکە لە قوشای سپی بێت: (عن ابن عَبَّاسٍ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ الْبَسُوا من ثِيَابِكُمْ الْبَيَاضَ فَإِنَّهَا من خَيْرِ ثِيَابِكُمْ وَكَفِّنُوا فيها مَوْتَاكُمْ).[3] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "لە پوشاکەکانتاندا رەنگی سپی لەبەرکەن، چونکە پۆشاکی سپی لە چاکترین پۆشاکتانە، مردووەکانیشتانی پێ کفن بکەن".

**پێنجەم: نوێژی مردوو:**

**١ـ نوێژکردن لە سەر مردوو پێویستە لەسەر موسڵمانان ئەگەر کەسێك لەناویاندا مرد نوێژی لەسەر بکەن ئەگەرنا هەموویان گوناهبار دەبن، بەڵام ئەگەر کۆمەڵێکیان پێی هەستن ئەو واجبەکە لەسەر هەموان دەکەوێت، چونکە حوکمی ئەم نوێژە فەرزی کیفایەیە، بە بەڵگەی**

١) رواه البخاري ١٦٧ ومسلم ٤٢/ ٩٣٩.

٢) رواه مسلم ٩٤٣.

٣) رواه مسلم ١٢٤٦ واحمد ٢٤٧/١ وابوداود ١٨٨٩ حديث صحيح.

ئەوەی هاوەڵان لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ نوێژیان لەسەر مردوو کردووە، پێغەمبەریشیان ﷺ ئاگادار نەکردووە لە مردنەکەی.

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ أَسْوَدَ رَجُلًا أو امْرَأَةً كان يَقُمُّ الْمَسْجِدَ فَمَاتَ و لم يَعْلَمْ النبي ﷺ بِمَوْتِهِ فَذَكَرَهُ ذَاتَ يَوْمٍ فقال ما فَعَلَ ذلك الْإِنْسَانُ قالوا مَاتَ يا رَسُولَ اللَّهِ قال أَفَلَا آذَنْتُمُونِي فَقَالُوا إنه كان كَذَا وَكَذَا قِصَّتُهُ قال فَحَقَرُوا شَأْنَهُ قال فَدُلُّونِي على قَبْرِهِ فَأَتَى قَبْرَهُ فَصَلَّى عليه).[1] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: ئەسوەد پیاوێك بوو یان ئافرەتێك خزمەتی مزگەوتی دەکرد، مرد، پێغەمبەر ﷺ ئاگادار نەبوو لە مردنەکەی، بۆیە ڕۆژێك باسی کردوو فەرمووی: "ئەو کەسە چی لێ هات؟" وتیان: مرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: "ئەی بۆ ئاگادارتان نەکردم؟"، وتیان ئەوە وابوو وابوو ـ بەسەرهاتەکەیان گێڕایەوە ـ ئەبوهورەیرە دەڵێ: بەچاوێکی کەم سەیریان کردبوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "گۆڕەکەیم نیشان دەن". جا هات بۆ سەر گۆڕەکەی‌و نوێژی لەسەر کرد".

(عن زَيْدِ بن خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ أَنَّ رَجُلًا من أَصْحَابِ النبي ﷺ تُوُفِّيَ يوم خَيْبَرَ فَذَكَرُوا ذلك لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فقال صَلُّوا على صَاحِبِكُمْ).[2] زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی غەزای خەیبەردا مردو باسیان کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرموی: نوێژ بکەن لەسەر هاوڕێکەتان".

کەواتە واجب نییە لەسەر هەموان نوێژ بکەن لەسەر مردو وەك لەم دوو فەرموودەوە دەرکەوت و روون بووەوە.

**٢ـ گەورەیی نوێژ کردن لە سەر مردوو:**

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من شَهِدَ الْجَنَازَةَ حتى يُصَلِّيَ فَلَهُ قِيرَاطٌ وَمَنْ شَهِدَ حتى تُدْفَنَ كان له قِيرَاطَانِ قِيلَ وما الْقِيرَاطَانِ قال مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ).[3] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەوەی ئامادەی جەنازەیەك

١) رواه البخاري ١٣٣٧ ومسلم ٩٥٦.

٢) رواه ابوداود ٢٦٩٣ والنسائي ٤/٦٤ وابن ماجة ٢٨٤٨ حديث صحيح.

٣) رواه البخاري ١٣٢٥ ومسلم ٩٤٥.

بێت هەتا نوێژی لەسەر دەکرێت قیراتێکی دەست دەکەوێت ئەو کەسەش شوێنی دەکەوێت هەتا دەینێژن ئەوە دوو قیراتی دەست دەکەوێت" پرسیاریان کرد دوو قیرات چین‌و چەندە؟ فەرمووی: وەك دوو چیای گەورە وان.

(عن مَالِكِ بن هُبَيْرَةَ قال:( قال رسول اللَّهِ ﷺ ما من مُسْلِمٍ يَمُوتُ فَيُصَلِّي عليه ثَلَاثَةُ صُفُوفٍ من الْمُسْلِمِينَ إلا أَوْجَبَ قال فَكَانَ مَالِكٌ إذا اسْتَقَلَّ أَهْلَ الْجَنَازَةِ جَزَّأَهُمْ ثَلَاثَةَ صُفُوفٍ) [1] مالیکی کوڕی هوبەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هیچ باوەڕدارێك نییە بمرێت ئەنجا کۆمەڵێك لە موسڵمانان کە سێ ریز بن نوێژی لەسەر بکەن ئیللا ـ خوا ـ لە گوناهەکانی دەبورێ". جا مالیکی کوڕی هوبەیرە ئەگەر ئامادەبوانی جەنازەکەم بوونایە هەوڵی دەدا بیانکات بە سێ ریزەوە".

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها عَنِ النبي ﷺ قال: ما من مَيِّتٍ يصلي عليه أُمَّةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَبْلُغُونَ مِائَةً، كلهم يَشْفَعُونَ له الا شُفِّعُوا فيه). [2] عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هیچ مردوویەك نییە کۆمەڵێك لە موسڵمانان کە سەد کەس بن نوێژی لەسەر بکەن، هەموویان تکای بۆ بکەن ـ لای خوا ـ ئیللا تکاکەیان وەردەگیرێ".

**٣ـ نوێژکردن لەسەر زیاتر لە یەك تەرم:**

(عن نَافِعِ بن عُمَرَ : أنه صلى على تِسْعِ جَنَائِزَ جميعا فَجَعَلَ الرِّجَالَ يَلُونَ الْإِمَامَ وَالنِّسَاءَ يَلِينَ الْقِبْلَةَ فَصَفَّهُنَّ صَفًّا وَاحِدًا وَوُضِعَتْ جَنَازَةُ أُمِّ كُلْثُومِ بِنْتِ عَلِيٍّ امْرَأَةِ عُمَرَ بن الْخَطَّابِ وابن لها يُقَالُ له زَيْدٌ وُضِعَا جميعا وَالْإِمَامُ يَوْمَئِذٍ سَعِيدُ بن الْعَاصِ وفي الناس ابن عُمَرَ وأبو هُرَيْرَةَ وأبو سَعِيدٍ وأبو قَتَادَةَ فَوُضِعَ الْغُلَامُ مِمَّا يَلِي الْإِمَامَ فقال رَجُلٌ فَأَنْكَرْتُ ذلك فَنَظَرْتُ إلى ابن عَبَّاسٍ وَأَبِي هُرَيْرَةَ وَأَبِي سَعِيدٍ وَأَبِي قَتَادَةَ فقلت ما هذا قالوا هِيَ السُّنَّةُ). [3] نافیع دەگێڕێتەوە و دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوای لێبێت لەسەر نۆ تەرمی ژن‌و پیاو نوێژی کردووە، پیاوەکانی لەبەردەم ئیمامەوە دانا، ژنەکانیش لای قیبلەوە، بەیەك ریز ریزی کردن، تەرمەکەی

---

١) رواه احمد ٧٩/٤ وابوداود ٣١٦٦ والترمذي ١٠٢٨ وابن ماجه ١٤٩٠ حديث حسن.

٢) رواه مسلم ٩٤٧ واحمد ٤٠/٦ والترمذي ١٠٢٩ والنسائي ٧٥/٤.

٣) رواه النسائي ٧١/٤ـ ٧٢ والدارقطني ٧٩/٢ـ ٨٠ والبيهقي ٣٣/٤ وعبدالرزاق ٦٣٣٧ حديث صحيح.

ئوموکەلسومی کچی عەلی کە خێزانی عومەری کوڕی خەتتاب بوو ڕەزای خوایان لێبێت لەگەڵ کوڕێکیدا ـ کە ناوی زەید بوو ـ دانرا، ئیمامەکەش ئەو کاتە سەعیدی کوڕی عاص بوو، لەناو خەڵکەکەشدا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و ئەبوهورەیرەو ئەبو سەعیدو قەتادە ئامادەبوون ئەنجا منداڵەکە لە نزیک ئیمامەکەوە دانرا، جا پیاوێك وتی: ئەو کارەم لا ڕاست نەبوو، بۆیە سەیری عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس‌و ئەبوهورەیرەو ئەبو سەعیدو قەتادەم کرد وتم: ئەوە چییە؟ وتیان: سوننەت وایە".

**٤ـ دروستە چەند تەرمێك هەریەکە نوێژێکی لەسەر بکرێت:**

(عن عبد اللَّهِ بن الزُّبَيْرِ رضي الله عنهماقال:( أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ يوم أُحُدٍ بِحَمْزَةَ فسجى بِبُرْدِهِ ثُمَّ صلى عليه فَكَبَّرَ تِسْعَ تَكْبِيرَاتٍ ثُمَّ أتى بِالْقَتْلَى يُصَفُّونَ ويصلى عليهم وَعَلَيِ مَعَهُمْ)[1]

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد تەرمەکەی حەمزەیان بە قوماشێك داپۆشا، پاشان نوێژی لەسەر کردو نۆ (الله اکبر)ی کرد، پاشان شەهیدەکان هێنران‌و ڕیزکران‌و نوێژیان لەسەر کرا عەلیشیان لەگەڵدا بوو".

**٥ـ نوێژکردن لەسەر مردوو لە مزگەوتدا دروستە:**

(عن عائشة: أنها لما توفي سعد بن أبي وقاص أرسل أزواج النبي ﷺ أن يمروا بجنازته في المسجد فيصلين عليه ففعلوا فوقف به على حجرهن يصلين عليه أخرج به من باب الجنائز الذي كان إلى المقاعد فبلغهن أن الناس عابوا ذلك وقالوا ما كانت الجنائز يدخل بها المسجد فبلغ ذلك عائشة فقالت ما أسرع الناس إلى أن يعيبوا ما لا علم لهم به عابوا علينا أن يمر بجنازة في المسجد وما صلى رسول الله ﷺ على سهيل بن بيضاء إلا في جوف المسجد).[2] عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: کاتی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص ڕەزای خوای لێبێت مرد، خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ هەواڵیان نارد کە حەز دەکەن سەری تەرمەکەی بدەن‌و نوێژی لەسەر بکەن، خەڵکەکەش داواکەیان بەجێ هێنا، تەرمەکەی سەعد لە بەردەم ژووری خێزانەکانی پێغەمبەردا

---

١) رواه الطحاوي في معاني الآثار ١/٢٩٠ حديث حسن.

٢) رواه مسلم ١٠٠/ ٩٧٣ وابوداود ٣١٨٩ والترمذي ١٠٣٣ وابن ماجه ١٥١٨.

ﷺ دانراو خێزانەکانی پێغەمبەریش ﷺ نوێژیان کرد لەسەری، پاشان لە دەرگای تەرم کردنە دەرەوە تەرمەکەیان بردە شوێنێ پێیان دەووت (مقاعد) هەواڵ گەیشت بە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کە خەڵکی ئەمەیان پێ باش نەبوو، وتیان: جاران تەرم بەو جۆرە نەدەبرایە ناو مزگەوت، ئەم هەواڵە گەشتە عائیشە رەزای خوای لێبێت، بۆیە وتی: خەڵکی چەند پەلە دەکەن لە شتێکدا کە شارەزاییان لێی نییە، رەخنەیان لە ئێمە گرت کە تەرمێ برایە نزکەوت، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو مزگەوتدا نوێژی لەسەر سوهەیلی کوڕی (بیضاء) کرد".

**٦- جێگەی وەستانی پێش نوێژ:**

**پێش نوێژ لە نوێژی مردوودا لە رێکی سەری پیاوو لە ناوەراستی ئافرەتدا دەوەستێت.**

(عن أَبِي غَالِبٍ قال صَلَّيْتُ مع أَنَسِ بن مَالِكٍ على جَنَازَةِ رَجُلٍ فَقَامَ حِيَالَ رَأْسِهِ ثُمَّ جاؤوا بِجَنَازَةِ امْرَأَةٍ من قُرَيْشٍ فَقَالُوا يا أَبَا حَمْزَةَ صَلِّ عليها فَقَامَ حِيَالَ وَسَطِ السَّرِيرِ فقال له الْعَلَاءُ بن زِيَادٍ هَكَذَا رَأَيْتَ النبي ﷺ قام على الْجَنَازَةِ مُقَامَكَ منها وَمِنْ الرَّجُلِ مُقَامَكَ منه قال نعم فلما فَرَغَ قال احْفَظُوا).[١] ئەبوغالیب دەڵێ لەگەڵ ئەنەسی کوڕی مالیکدا رەزای خوای لێبێت لەسەر تەرمی پیاوێك نوێژم کرد، ئەنەس لای سەرییەوە راوەستا، پاشان تەرمی ئافرەتێکیان هێنا، کە قورەیشی بوو، وتیان باوکی حەمزە نوێژی لەسەر بکە، جا لە ناوەڕاستی تەرمەکەدا وەستا، ئەنجا عەلای کوڕی زیاد پێی وت ئایا پێغەمبەرت ﷺ دیوە بەو شێوەیە راوەستا لە سەر تەرمی ئافرەتو پیاو کە تۆ راوەستایت لەسەریان؟ وتی: بەڵێ، کاتێ ئەنەس تەواو بوو وتی: لەبەریکەن و بیزانن".

**شەشەم: چۆنیەتی کردنی نوێژی مردوو:**

**أ - چوار (الله اکبر) دەکات:**

(عن جَابِرٍ رضي الله عنه أَنَّ النبي ﷺ صلى على أَصْحَمَةَ النَّجَاشِيِّ فَكَبَّرَ أَرْبَعًا).[٢] جابر رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی - مردووی - کرد لەسەر ئەصحەمەی نەجاشی و چوار (الله اکبر)ی کرد".

---

١) رواه ابوداود ٣١٩٤ والترمذي ١٠٣٤ وابن ماجة ١٤٩٤ حديث صحيح.

٢) رواه البخاري ١٣٣٤ ومسلم ٩٥٤.

**ب ـ یان پێنج (الله اکبر) دەکات:**

(عن بن أبي لَيْلَى قال كان زَيْدٌ يُكَبِّرُ على جَنَائِزِنَا أَرْبَعًا وَإِنَّهُ كَبَّرَ على جَنَازَةٍ خَمْسًا فَسَأَلْتُهُ فقال كان رسول اللَّهِ ﷺ يُكَبِّرُهَا). [1] عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلا دەڵێ: زەید لە نوێژی مردووەکانماندا چوار (الله اکبر)ی دەکرد، جارێك لەسەر مردوویەك پێنج (الله اکبر)ی کرد، پرسیارم لێی کرد وتی: "پێغەمبەریش ﷺ پێنج (الله اکبر)ی کردووە".

**ج ـ یان شەش (الله اکبر) دەکات:**

(عن عبد الله بن مغفل أن عليا رضي الله عنه صلى على سهل بن حنيف فكبر عليه ستا ثم التفت إلينا فقال إنه من أهل بدر). [2] عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: "عەلی کوڕی ئەبوتالیب نوێژ لەسەر سەهلی کوڕی حونەیف کرد شەش (الله اکبر)ی لەسەر کرد، پاشان لایکردەوەو بە لای ئێمەداو وتی: بێگومان سەهل لە بەشداربووانی بەدرە".

(قال الشعبي وقدم علقمة من الشام فقال لابن مسعود إن إخوتك بالشام يكبرون على جنائزهم خمسا فلو وقتم لنا وقتا نتابعكم عليه فأطرق عبد الله ساعة ثم قال انظروا جنائزكم فكبروا عليها ما كبر أئمتكم لا وقت ولا عدد) شەعبی دەڵێ: " شەعبە دەڵێ عەلقەمە لە شامەوە هات بە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودی وت: براکانت لە شام پێنج (الله اکبر) دەکەن لەسەر جەنازەکانیان، خۆزگە دیاریتان بکردایە بۆمان بە دیاری کردن، ئێمە بە شوێنتاندا بڕۆشتینایە، عەبدوڵڵاش ماوەیەك سەری داخست، پاشان وتی: سەرنجی جەنازەکانتان بدەن، پێشەواکانتان (الله اکبر) چۆن دەکەن ئێوەش وا بکەن، نەکات نە ژمارەیان بۆ دیاریی ناکرێت". [3]

---

١) رواه مسلم ٩٥٧.

٢) رواه ابوداود ٣١٩٤. والترمذي ١٠٣٤. وابن ماجة ١٤٩٤.

٣) رواه ابن حزم في المحلى ١٢٦/٥، والطحاوي ٢٨٧/١ والحاكم ٤٠٩/٣ والبيهقي ٣٦/٤ سنده صحيح.

**د ـ یان حەوت (الله اکبر) دەکات:**

(عن موسى بن عبد الله بن يزيد أن عليا رضي الله عنه صلى على أبي قتادة فكبر عليه سبعا وكان بدريا) **موسای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی یەزید دەڵێ: "عەلی نوێژی کرد لەسەر قەتادەو حەوت (الله اکبر)ی لەسەر کرد، قەتادەش بەدری بوو".**[1]

**و ـ لە هەموو (الله اکبر)ەکاندا هەردوو دەستی بەرز دەکاتەوە:**

عن نافع (أن إبن عمر رضي الله عنهما كان يرفع يديه على كل تكبيرة من تكبير الجنازة وإذا قام بين الركعتين)[2] **عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رەزای خوای لێبێت "هەردوو دەستی لە هەموو (الله اکبر)ێکی جەنازەدا بەرز دەکردەوە، هەروەها کاتێکیش لە دوو رکاتی نوێژ هەڵسایەتەوە هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە".**

(وقد صَحَّ عن بن عَبَّاسٍ رضي الله عنه أَنَّهُ كان يَرْفَعُ يَدَيْهِ في تَكْبِيرَاتِ الْجِنَازَةِ )[3]

**هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش رەزای خوای لێبێت وای دەکرد. ئەمە رای زۆربەی زانایانە وەك ئیمامی شافیعیو ئەحمەدو ریوایەتێکیشە لە ئەبوحەنیفەو ئیمام مالیکەوە. رایەکی تریش هەیە کە تەنها لە (الله اکبر)ی یەکەمدا دەستی بەرز بکاتەوە چەند فەرموودەیەکی لەسەرە، بەڵام بەلای زۆربەی زانایانی فەرمودەوە لاوازن، ئەم فەرموودەیەش لای هەندێ لە زانایان (حسن لغيره)یە، ئەبوهورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێ:** ( أَنَّ النبي ﷺ كَبَّرَ على جِنَازَةٍ فَرَفَعَ يَدَيْهِ في أَوَّلِ تَكْبِيرَةٍ وَوَضَعَ الْيُمْنَى على الْيُسْرَى) **"پێغەمبەر ﷺ (الله اکبر)ی کرد لەسەر جەنازەیەك لە یەکەم (الله اکبر)دا دەستەکانی بەرزکردەوەو دەستی راستی لەسەر دەستی چەپی دانا".**[4] **ئەمەش رایەکە لە ئەبوحەنیفەو ئیمام مالیکەوە ئیبن حەزمو شەوکانی ئەمیان هەڵبژاردووە.**[5]

---

١) رواه الطحاوي في معاني الاثار ٢٩٠/١.

٢) رواه البخاري في (رفع اليدين) ١١٠ والبيهقي ٤٤/٤ سنده صحيح.

٣) بروانە: التخليص لابن حجر العسقلاني ١٤٧/٢ حديث صحيح.

٤) المبسوط ٤٦/٢ والمدونة ١٦٠/١ والمجموع ٢٣٢/٥ والمحلى ١٢٨/٥ نيل الاوطار ١٠٢/٤، ١٠٥ وأحكام الجنائز ١٤٨.

٥) رواه الترمذي ١٠٧٧ والدارقطني ٧٥/٢/٢.

**ز ـ دەستی ڕاستی لەسەر دەست و مەچەك و بەشێكی باسكی دادەنێت لەسەر سنگی:**

(يقول ابن عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) سمعت نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ يقول إِنَّا مَعْشَرَ الأَنْبِيَاءِ أُمِرْنَا بِتَعْجِيلِ فِطْرِنا وَتَأْخِيرِ سُحُورِنا وَوَضَعِ أَيْمَانِنَا على شمائِلِنا في الصَّلاةِ).[1] عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: "ئێمە كۆڕی پێغەمبەران فەرمانمان پێ كراوە بە زوو ڕۆژوو شكاندن و درەنگ پارشێو كردن، وە فەرمانمان پێ كراوە دەستی ڕاستمان لەسەر دەستی چەپمان دانێین لە نوێژدا".

**ح ـ خوێندنی سورەتی فاتیحە پاش (الله اكبر)ی یەكەم:**

(عن طَلْحَةَ بن عبد اللَّهِ بن عَوْفٍ قال صَلَّيْتُ خَلْفَ عبدالله بن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما على جَنَازَةٍ فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فقال لِيَعْلَمُوا أَنَّهَا سُنَّةٌ).[2] تەڵحەی كوڕی عوبەیدوڵڵای كوڕی عەوف دەڵێ: لە دوای عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسەوە نوێژم كرد لەسەر جەنازەیەك سورەتی فاتیحەی خوێند، وتی: بۆ ئەوەی بزانن ئەمە سوننەتە".

(و في رواية النسائي فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَةٍ فَجَهَرَ حَتَّى سَمِعْنَا فَلَمَّا انْصَرَفَ أَخَذْتُ بِيَدِهِ فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ سُنَّةٌ وَحَقٌّ).[3] لە ڕیوایەتی نەسائیدا دەڵێ: "جا سورەتی فاتیحە و سورەتێكی خوێند دەنگی بەرزكردەوە و تا گوێمان لێ بوو، ئەنجا كە لێبوویەوە دەستیم گرت و پرسیارم لێ كرد، وتی: سوننەت و هەقە".

(عن أبي أُمَامَةَ أَنَّهُ قال السُّنَّةُ في الصَّلَاةِ على الْجَنَازَةِ أَنْ يَقْرَأَ في التَّكْبِيرَةِ الْأُولَى بِأُمِّ الْقُرْآنِ مُخَافَتَةً ثُمَّ يُكَبِّرَ ثَلَاثًا وَالتَّسْلِيمُ عِنْدَ الْآخِرَةِ).[4] ئەبوئومامە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: "سوننەتی نوێژی جەنازە دەبێت دوای (الله اكبر) ی یەكەم سورەتی فاتیحە بخوێنرێ بەبێ دەنگ بەرزكردنەوە، پاشان سێ (الله اكبر) بكرێت لە پاش ئەوە سەلام بدرێتەوە".

---

١) رواه ابن حبان ٨٨٥، والطبراني في الكبير ١٠٨٥١ وفي الاوسط ١٨٨٤ حديث صحيح.

٢) رواه البخاري ١٣٣٥.

٣) رواه النسائي ٧٤/٤ حديث صحيح.

٤) رواه النسائي ١٩٨٨ وابن حزم ١٢٩/٥ حديث صحيح.

**گ ـ سەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ پاش (الله اکبر)ی دووەم:**

(عن أبي أمامة سعد بن سعد بن حنيف يحدث عن ابن المسيب قال السنة في الصلاة على الجنازة أن تكبر ثم تقرأ بأم القرآن ثم تصلي على النبي ﷺ ثم تخلص الدعاء للميت ولا تقرأ إلا في التكبيرة الأولى ثم تسلم في نفسه عن يمينه)[1] ئەبو ئومامە کە سەعدی کوڕی سەعدی کوڕی حونەیفە دەگێڕێتەوە لە سەعیدی کوڕی موسەیبدا کردو وتی: "سوننەتی جەنازە وایە (الله اکبر) بکەیت، پاشان سورەتی فاتیحە بخوێنێت، پاشان سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدەیت، پاشان بە دڵسۆزی دوعا بۆ مردووەکە بکەیت لە دوا (الله اکبر)ی یەکەم نەبێت قورئان ناخوێنرێ، پاشان بەبێ دەنگی سەلام دەداتەوە بەلای راستیدا".

**ی ـ جا (الله اکبر)ەکانی تر دەکات، بە دڵسۆزی دوعا بۆ مردووەکە دەکات:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال صلى رسول اللَّهِ ﷺ على جَنَازَةٍ فقال اللهم اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا اللهم من أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ على الْإِيمَانِ وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ على الْإِسْلَامِ اللهم لَا تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ ولا تُضِلَّنَا بَعْدَهُ) ئەبوهورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر جەنازەیەك كردو فەرمووی: (اللهم اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا اللهم من أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ على الْإِيمَانِ وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ على الْإِسْلَامِ اللهم لَا تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ ولا تُضِلَّنَا بَعْدَهُ)[2]. واتە: خوایە گیان لە زیندوو مردوو گەورەو بچووك و نێرو مێ ئامادەبوو ئامادەنەبوومان خۆش ببە، خوایە گیان هەرکەسێکت لە ئێمە ژیان لەسەر ئیمان بیژیەنە هەرکەسێکیشت لێمان مراند لەسەر ئیسلامەتی بیمرێنە خوایەگیان لە پاداشتی ئەم مردووە بێبەشمان مەکە و لەدوا ئەویش گومڕامان مەکە".

(عن عَوْفِ بن مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ قال سمعت النبي ﷺ وَصَلَّى على جَنَازَةٍ يقول اللهم اغْفِرْ له وَارْحَمْهُ وَاعْفُ عنه وَعَافِهِ وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ وَاغْسِلْهُ بِمَاءٍ وَثَلْجٍ وَبَرَدٍ وَنَقِّهِ من الْخَطَايَا كما يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ من الدَّنَسِ وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا من دَارِهِ وَأَهْلًا خَيْرًا من أَهْلِهِ وَزَوْجًا خَيْرًا من زَوْجِهِ وَقِهِ فِتْنَةَ الْقَبْرِ وَعَذَابَ النَّارِ قال عَوْفٌ فَتَمَنَّيْتُ أَنْ لو كنت أنا الْمَيِّتَ لِدُعَاءِ رسول

---

١) رواه عبدالرزاق ٦٤٢٨ وابن الجارود في المنتقى ٥٤٠ حديث صحيح.

٢) رواه ابوداود ٣٢٠١ والترمذي ١٠٢٤ حديث صحيح.

اللَّهِ ﷺ على ذلك الْمَيِّتِ). عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ کاتێ نوێژی دەکرد لەسەر جەنازەیەك دەیفەرموو: " اللهم اغْفِرْ له وَارْحَمْهُ وَاعْفُ عنه وَعَافِهِ وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ وَاغْسِلْهُ بِمَاءٍ وَثَلْجٍ وَبَرَدٍ وَنَقِّهِ من الْخَطَايَا كما يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ من الدَّنَسِ وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا من دَارِهِ وَأَهْلًا خَيْرًا من أَهْلِهِ وَزَوْجًا خَيْرًا من زَوْجِهِ وَقِهِ فِتْنَةَ الْقَبْرِ وَعَذَابَ النَّارِ ".[1] واتە: خوایە گیان لێی خۆشبە و بەزەییت پێدابێتەوە لێی ببورە و بیپارێزە شوێنو جێگای چاکی پێ ببەخشەو فراوانی کە بۆی بە ئاوو بەفرو تەرزە بیشۆرە ـ و پاکی بکرەوە لە گوناهەکانی ـ وە لە گوناهەکانی پاکی بکەرەوە هەر چۆنی جلی سپی لە چڵك پاکدەکرێتەو ماڵێکی پێ بدە چاکتر لە ماڵەکەی خۆیو کەسوکاریشی پێبدە چاکتر لە کەسو کارەکەی و هاوسەرێکی چاکتر لە هاوسەرەکەی خۆی پێببەخشە، وە بیپارێزە لە بەڵاو فیتنەی گۆڕو دۆزەخ". عەوف دەڵێ: وتم خۆزگە ئەو مردووە من بومایە لەبەر ئەو دوعایەی پێغەمبەر ﷺ کردی بۆ ئەو مردووە.

**ك ـ دوو سەلام دەداتەوە بەلای ڕاستو چەپیدا:**

(عن عبد الله قال ثلاث خلال كان رسول الله ﷺ يفعلهن تركهن الناس إحداهن التسليم على الجنازة مثل التسليم في الصلاة).[2] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سێ شتی دەکرد کە خەڵکی نایانکەن و وازیان لێ هێناون، یەکێکیان سەلامدانەوەیە لەسەر جەنازە وەك سەلامدانەوەی نوێژ".

دروستە یەك سەلام دانەوە وەك لە فەرموودەکەی ئەبو ئومامەدا باسکرا.[3]

**ل ـ کاتی نوێژکردن لەسەر مردوو:**

لەو سێ کاتەدا کە دروست نییە نوێژی تێدا بکرێت دروست نییە نوێژی مردووش بکرێت.

(عن عُقْبَةَ بن عَامِرٍ رضي الله عنه قال:( ثَلَاثُ سَاعَاتٍ كان رسول اللَّهِ ﷺ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ أو نَقْبِرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا حين تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حتى تَمِيلَ الشَّمْسُ

---

١) رواه مسلم ٩٦٣ والنسائي ٧٣/٤.

٢) رواه البيهقي ٤٣/٤ حديث حسن.

٣) لە برگەی گ هاتووە.

وَحِينَ تَضَيَّفُ لِلْغُرُوبِ حتى تَغْرُبَ)[1] عوقبەی کوڕی عامیر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: "پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێ کردین لە سێ کاتدا نوێژی تێدا بکەین، یا مردووەکانمان تێدا بنێژین، کاتێ خۆر هەڵدێت بە تەواوی هەتا بەرزدەبێتەوە، کاتێ لە نیوەڕۆدا بە پێوە وەستاو سێبەری نامێنێ تا لا دەدات، کاتێکیش خۆری لار دەبێتەوە بۆ ئاوابوون هەتا ون دەبێت"،[2] بەڵام ئەگەر زۆر پێویست بوو قەیناکات لەو کاتانەشدا بنێژرێت، عەرەبیەکەی (عن بن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال: ( صلى النبي ﷺ على رَجُلٍ بَعْدَ ما دُفِنَ بِلَيْلَةٍ قام هو وَأَصْحَابُهُ وكان سَأَلَ عنه فقال من هذا فَقَالُوا فُلَانٌ دُفِنَ الْبَارِحَةَ فَصَلَّوْا عليه) عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بەشەو ناشتو چراشیان لە گۆڕەکەیدا داگیرساند".

**حەوتەم: لە سوننەتو ئادابەکانی ناشتنی مردوو:**

**١ـ هەڵگرتنی جەنازە:**

(عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال إذا وُضِعَتْ الْجِنَازَةُ وَاحْتَمَلَهَا الرِّجَالُ على أَعْنَاقِهِمْ فَإِنْ كانت صَالِحَةً قالت قَدِّمُونِي وَإِنْ كانت غير صَالِحَةٍ قالت يا وَيْلَهَا أَيْنَ يَذْهَبُونَ بها يَسْمَعُ صَوْتَهَا كُلُّ شَيْءٍ إلا الْإِنْسَانَ وَلَوْ سَمِعَهُ صَعِقَ)[3] ئەبوسەعیدی خودری ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "کاتێ جەنازە دانرا ـ لەناو دارە مەیتدا ـ و پیاوان خستیانە سەر شانیان، جا ئەگەر چاك بێت دەڵێ: زووکەن زوو ببەن، بەڵام ئەگەر چاك نەبێت دەڵێ: هەی هاوار بۆ کوێم دەبەن؟ جگە لە مرۆڤ هەموو شتێ دەنگی دەبیستێ، ئەگەر مرۆڤ دەنگی ـ هاوارو قیژەی ـ گوێ لێ بێ بێ هۆش دەبێو دەمرێ".

**٢ـ ڕۆشتن لەگەڵ جەنازەدا بۆ گۆڕستان:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من اتَّبَعَ جَنَازَةَ مُسْلِمٍ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا وكان معه حتى يصلي عليها وَيَفْرُغَ من دَفْنِهَا فَإِنَّه يَرْجِعُ من الأَجْرِ بِقِيرَاطَيْنِ كُلُّ قِيرَاطٍ مِثْلُ أُحُدٍ وَمَنْ صلى عليها ثُمَّ رَجَعَ قبل أَنْ تُدْفَنَ فإنه يَرْجِعُ بِقِيرَاطٍ).[4] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ:

---

١) رواه ابن ماجه ٤٦٤/١ والترمذي ١٠٦٣.

٢) رواه ٢٩٣/ ٨٣١,

٣) رواه البخاري ١٣١٤.

٤) رواه البخاري ٤٧ ومسلم ٩٤٥.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەرکەس بە باوەڕو خوامەبەست بوونی ساغەوە شوێن جەنازەی موسڵمانێك بکەویو لەگەڵیدا بێت تا نوێژی لەسەر دەکریو ناشتنی تەواو دەبێ، ئەو بە دوو قیرات پاداشتەوە دەگەڕێتەوە هەر قیراتێکیان بە قەدەر ئوحود دەبێت، هەرکەسێکیش نوێژی لەسەر بکات و ئەنجا پێش ئەوەی بنێژرێ بگەڕێتەوە ئەوە بێگومان بە قیراتێك پاداشتەوە دەگەڕێتەوە".

٣ـ جەنازە بە پەلە ببرێت بۆ گۆڕستان:

(عن أبي بَكْرَةَ قال لقد رَأَيْتُنَا مع رسول اللَّهِ ﷺ وَإِنَّا لَنَكَادُ نَرْمُلُ بها رَمَلًا) [1] ئەبوبەکرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: "ئەگەر چاووت لێمان ئەبوو لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەرۆیشین بە پەلە هەروەك لۆقەما بە تەرمەکە بکردایە وابوو".

٤ـ لەگەڵ جەنازەدا سواربوونی سەیارەو وڵاخ مەکروهە:

(عن ثوبان أن النبي ﷺ شيع جنازة فأتي بدابة فأبى أن يركبها فلما انصرف أتي بدابة فركبها فقيل له فقال إن الملائكة كانت تمشي فلم أكن لأركب وهم يمشون فلما ذهبوا أو قال عرجوا ركبت). [2] سەوبان ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: وڵاخێکیان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ کاتێ لەگەڵ جەنازەیەکدا بوو سواری نەبوو، بەڵام کاتێ گەڕانەوە وڵاخێکیان هێناو سواری بوو، پرسیاری لێ کرا، فەرمووی: "ـ لە هاتنماندا ـ فریشتەکانیش بە پیادە دەرۆیشتن بۆیە شیاو نەبوو بۆ من سوار بم و ئەوان بە پیادە دەڕۆن ، بەڵام ـ دواتر لە گەڕانەوەدا ـ کە ئەوان ڕۆشتن منیش سوار وڵاخەکە بووم".

٥ـ دروستە ڕۆشتن لە پاشو پێشو ڕاستو چەپی جەنازەوە:

بە مەرجێ نزیك بیت جگە لەو کەسەی بە سواری سەیارە یا وەڵاخەوەیە دەبێت لە دوایەوە بڕوات، (عن الْمُغِيرَةِ بن شُعْبَةَ أَنَّ النبي ﷺ قال الرَّاكِبُ خَلْفَ الْجَنَازَةِ وَالْمَاشِي حَيْثُ شَاءَ منها وَالطِّفْلُ يُصَلَّى عليه). [3] موغیرەی کوڕی شوعبە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ

---

١) رواه ابوداود ٣١٨٢ والنسائي ٤/٤٣ (١٩١٣) حديث صحيح.

٢) رواه ابوداود ٣١٧٧ حديث صحيح.

٣) رواه ابوداود ٣١٨٠ والترمذي ١٠٣١ والنسائي ٤/٨٥ حديث صحيح.

فەرمووی: "سوار لە دوای جەنازەوە بێت، بەڵام پیادە لەهەر لایەکییەوە بێت خۆی حەز دەکات ـ دروستە ـ منداڵیش نوێژی لەسەر دەکرێ".

**هەشتەم: ئەوەی بۆ کەسو کاری مردوو دروست نییە بیکەن:**

**١ـ شینو شەپۆڕ:**

(عن أبي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيَّ رضي الله عنه قال:( أنَّ النبي ﷺ قال أَرْبَعٌ فِي أُمَّتِي من أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ لَا يَتْرُكُونَهُنَّ الْفَخْرُ فِي الْأَحْسَابِ وَالطَّعْنُ فِي الْأَنْسَابِ وَالاسْتِسْقَاءُ بِالنُّجُومِ وَالنِّيَاحَةُ وقال النَّائِحَةُ إذا لم تَتُبْ قبل مَوْتِهَا تُقَامُ يوم الْقِيَامَةِ وَعَلَيْهَا سِرْبَالٌ من قَطِرَانٍ وَدِرْعٌ من جَرَبٍ). [١] ئەبومالیکی ئەشعەری رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "چوار شت لە ناو ئوممەتدا هەیە لە کرداری سەردەمی نەفامینو ـ خەڵك ـ دەستبەرداری نابن: خۆهەڵکێشان بە رەچەڵەكو بنەماڵە، تانەو تەشەر لە تایفەو هۆز بە تەمابوونی باران بە هۆی ئەستێرەکانەوە، شین و شەپۆڕ لە کاتی لێقەوماندا". هەروەها فەرمووی: "ئەو ژنەی بالۆرە دەڵێ ئەگەر پێش مردنی تەوبە نەکات لە رۆژی دواییدا کە زیندوو دەکرێتەوە، کراسێکی قەترانو گەرِی لەشی دادەپۆشێ وەك زرێپۆشی لەبەردا بێت".

**٢ ـ لە روومەت دانو یەخە دادڕین:**

(عن عبد اللَّهِ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال ليس مِنَّا من ضَرَبَ الْخُدُودَ وَشَقَّ الْجُيُوبَ وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ). [٢] عەبدوڵلا رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "لە ئێمە نییە ئەوەی لە روومەتی خۆی دەداو یەخە دادەڕیو دەنگو هاواری لێ بەرز دەبێتەوە وەك سەردەمی نەفامی".

**٣ـ قژ رنین:**

(قال أبو موسى الأشعري رضي الله عنه أنا بَرِيءٌ مِمَّنْ بَرِئَ منه رسول اللَّهِ ﷺ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَرِئَ من الصَّالِقَةِ وَالْحَالِقَةِ وَالشَّاقَّةِ). [٣] ئەبوموسای ئەشعەری رەزای خوای لێبێت دەڵێ: من

---

١) رواه مسلم ٢٩/ ٩٣٤ واحمد ٥/ ٣٤٢ والحاكم ١/ ٣٨٣ والبيهقي ٦٣/٤.

٢) رواه البخاري ١٢٩٧ ومسلم ١٦٥ / ١٠٣.

٣) رواه البخاري ١٢٩٦ ومسلم ١٦٧/ ١٠٤.

بەریم لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لێ بەری کرد، بێگومان پێغەمبەر ﷺ خۆی بەری کرد لە شینو شەپۆڕکەرو ئەوەی قژی دەڕنێو یەخەی دادەڕێ".

**٤ـ پیاهەڵدان:**

لە کاتی مردندا حەرامە پیاهەڵدان بە شانو باڵاو وتی مردووەکە، (عن حُذَيْفَةَ بن الْيَمَانِ قال إذا مِتُّ فلا تُؤْذِنُوا بِي إني أَخَافُ أَنْ يَكُونَ نَعْيًا فَإِنِّي سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْهَى عن النَّعْيِ).[١] حوزەیفەی کوڕی یەمان ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: "ئەگەر مردم جاڕ مەدەن بۆ مردنەکەم چونکە دەسترم لە پیاهەڵدان بێ لەبەرئەوەی لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە ڕێگری کرد لە پیاهەڵدان".

**٥ـ نابێت ئاگر دوای جەنازە بخرێت:**

قال أبو بردة رضي الله عنه:( أوصى أبو موسى رضي الله عنه حين حضره الموت ....قال لا تتبعوني بمجمر ...قالوا له سمعت فيه شيئا قال نعم من رسول الله ﷺ) ئەبو بورەیدە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: ئەبوموسا ڕەزای خوای لێبێت لە کاتی سەرەمەرگیدا وەسیەتی کرد و وتی: ئاگر شوێن تەرمەکەم مەخەن، وتیان شتێکت لەوبارەوە بیستووە، وتی: بەڵێ، لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە وای فەرمووە".[٢]

**نۆیەم: ناشتن:**

**١ـ دوعای چوونە گۆڕستان:**

ئەگەر کەسێك ڕۆرشتە گۆڕستان یان بەلایدا تێپەڕیوو ئەو سوننەتە ئەم دوعایە بڵێ: (عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أتى الْمَقْبُرَةَ فقال السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وَإِنَّا إن شَاءَ الله بِكُمْ لَاحِقُونَ).[٣] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ گۆڕستان و فەرمووی: "السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وَإِنَّا إن شَاءَ الله بِكُمْ لَاحِقُونَ". واتە: سڵاوتان لێ بێ ئەی خەڵکانی ئیمانداری ئەم شوێنە دڵنیابن کەی خوا ویستی پێتان دەگەین.

---

١) رواه احمد ٣٨٥/٥ والترمذي ٩٨٦ وابن ماجة ١٤٧٦ حديث حسن.

٢) رواه البيهقي في السنن الكبرى ٧٤/٤ حديث حسن.

٣) رواه احمد ٣٠٠/٢ ومسلم ٢٤٩.

(عن بُرَيْدَةَ رضي الله عنه قال: كان رسول اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُهُمْ إذا خَرَجُوا إلى الْمَقَابِرِ أن يقول قَائِلُهُمْ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ من الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ وَإِنَّا إن شَاءَ الله لَلَاحِقُونَ أَسْأَلُ اللَّهَ لنا وَلَكُمْ الْعَافِيَةَ). [١] بورەیدە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری دەکردین ئەگەر رۆشتین بۆ گۆڕستان ئەم دوعایە بڵێین: "السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ من الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ وَإِنَّا إن شَاءَ الله لَلَاحِقُونَ أَسْأَلُ اللَّهَ لنا وَلَكُمْ الْعَافِيَةَ". واتە: سڵاوتان لێ بێ ئەی خەڵکی ئەم شوێنە لە ئیمانداران و موسڵمانان دڵنیابن خوا کەی ویستی ئێمەش پێتان دەگەین داوای پێوەی دەکەین لە خوا بۆ خۆمان و بۆ ئێوەش.

**٢ـ سوننەتە قەبر قووڵ و فراوان و رێك و پێك بێت:**

(عن هِشَامِ بن عَامِرٍ رضي الله عنه عن رسول اللَّهِ ﷺ فقال في قتلى يوم أُحُد: احْفِرُوا وَأَوْسِعُوا وَأَحْسِنُوا) [٢] هیشامی کوڕی عامیر رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەربارەی گۆڕی شەهیدەکانی ئوحود فەرمووی: "گۆڕەکان هەڵکەنن و فراوان و قووڵ و رێك و پێکی کەن".

**٣ـ سوننەتە گۆڕ لادڕ بێت:**

ئەگەر زەوییەکە رەق و توند بوو، (عن سَعْدَ بن أبي وَقَّاصٍ قال في مَرَضِهِ الذي هَلَكَ فيه ألحدوا لِي لَحْدًا وَانْصِبُوا عَلَيَّ اللَّبِنَ نَصْبًا كما صُنِعَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ). [٣]

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص رەزای خوای لێبێت لە نەخۆشی مردنیدا وتی: "گۆڕێکی لادڕم بۆ هەڵکەنن خشت بەرووی گۆڕیچەکەمدا هەڵچنن هەروەکو چۆن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرا".

(عن عبدالله بن عَبَّاسٍ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ اللَّحْدُ لنا وَالشَّقُّ لِغَيْرِنَا). [٤] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "لادڕ بۆ ئێمەیە و هەڵکەندن بۆ خەڵکانی ترە".

١) رواه مسلم ٩٧٥ واحمد ٣٥٣/٥.

٢) رواه ابوداود ٣٢١٥ والترمذی ١٧١٣.

٣) رواه مسلم ٩٦٦.

٤) رواه ابوداود ٣٢٠٨ والترمذي ١٠٤٥ والنسائي ٨٠/٤ وابن ماجه ١٥٥٤ حديث حسن.

**لاحد**: واتە پاش هەڵکەندنی گۆڕەکەو قوڵکردنی لە ڕووی قیبلەوە ئەوەندەی جێگای مردووەکە ببێتەوە هەڵدەکەنرێ مردووەکەی تێدەخرێت، پاشان پشتی مردووەکە بەخشت هەڵدەچنرێ.

**بەڵام هەڵکەندن**: چاڵێکە لە ناوەڕاستی گۆڕەکەداو ئەملاولای بە بلۆك یا خشت هەڵئەچنرێتو مردووەکەی تیدەخرێت بەرد ئەخرێت بەسەری بلۆکەکاندا وەکو گۆڕی کوردستانی خۆمان کە بەم جۆرەی دووەمیانە. بەڵام ئەگەر زەوییەکە فشەڵ بوو ئەو دەبێت گۆڕەکە هەڵکەندن بێت واتە ناوەڕاستی هەڵکەندرێ یا بە بلۆك هەردوو لای هەڵچنرێت وەك باسمان کرد.

**٤ـ شێوەی مردوو خستنە ناو گۆڕ:**

سوننەتە لە پێشدا قاچەکانی دابهێلرێتە ناو گۆڕەکە ئەگەر توانرا، (ان عبد اللّٰهِ بن أَدْخَلَ الحارث الْقَبْرَ من قِبَلِ رِجْلَيْ الْقَبْرِ وقال هذا من السُّنَّةِ). [١] عەبدوڵڵای کوڕی زەید حاریثی خستە ناو گۆڕەکەیەوە لە پێشدا قاچەکانی بردە ناو گۆڕەکەیەوە، وتی: ئەمە سوننەتە".

**٥ـ کەسوکاری مردووەکە بینێژن چاکترە:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ الأحزاب: ٦، واتە: لە کتێبی خوادا خزمان لە پشتەوە لە پێشترن بۆ یەکتری.

(قال علي بن أبي طالب غسلت رسول الله ولي دفنه وإجنانه دون الناس أربعة علي والعباس والفضل وصالح مولى رسول الله ﷺ). [٢] عەلی دەڵێ: من پێغەمبەری خوام ﷺ شۆرد... و سەرپەرشتی ناشتنو ئەسپەردەکردنی چوار کەس بوون لەناو خەڵکەکەدا عەلیو عەبباس و فەزڵو صاڵحی بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەر ﷺ".

**٦ـ کاتێ مردووەکە خرایە گۆڕ ئەم دوعایە سوننەتە:**

(بِسْمِ اللّٰهِ وَعَلَى سُنَّةِ رسول اللّٰهِ) . (عن ابن عُمَرَ أَنَّ النبي ﷺ كان إذا وَضَعَ الْمَيِّتَ في الْقَبْرِ قال بِسْمِ اللّٰهِ وَعَلَى سُنَّةِ رسول اللّٰهِ ﷺ) [٣] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ:

---

١) رواه ابوداود ٣٢١١ حديث صحيح.

٢) رواه الحاكم ٣٦٢/١ والبيهقي ٥٣/٤. حديث صحيح.

٣) رواه ابوداود ٣٢١٣ والترمذي ١٠٤٦ حديث صحيح.

پێغەمبەر ﷺ کاتێ مردووەکە دەنرایە ناو گۆڕەکەی دەیفەرموو: (بِسْمِ اللَّهِ وَعَلَى سُنَّةِ رسول اللَّهِ).

**٧ـ سێ مشت خۆڵ بکرێتە گۆڕەکەوە:**

سوننەتە کە مردووەکە خرایە گۆڕەکە لە کاتی داپۆشینندا سێ مشت خۆڵ لای سەرییەوە بکرێتە گۆڕەکەی، (عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: أن رسول الله ﷺ صلى على جنازة ثم اتى القبر فحثى عليه من قبل رأسه ثلاثا). [١] ئەبوهورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ نوێژ لەسەر جەنازەیەك کرد، پاشان هاتە سەر قەبری مردووەکەو لای سەرییەوە سێ مشت خۆڵی کرد بەسەریدا".

**دەیەم: سوننەتەکانی پاش ناشتن:**

**١ـ بەرزکردنەوەی گۆڕ بستێك:**

بۆ ئەوەی بزانرێت گۆڕەو بپارێزرێت، بەڵام لە بستێك زیاتر حەرامە، (عن جابر : أن النبي صلى الله عليه و سلم ألحد له لحدا ونصب عليه اللبن نصبا ورفع قبره من الأرض نحوا من شبر). [٢] جابیر رەزای خوای لێبێت دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ گۆڕی لادڕی بۆ هەڵکەنرا پشتەوەشی بە خشت هەڵچنرا،... گۆڕەکەشی بە قەدەر بستێك لە زەوی بەرزکرایەوە".

**٢ـ بە بەردێك یا شتی لەو جۆرە دیاری بکرێت:**

بۆ ئەوەی کەس و کاری لە نزیکیدا بنێژرێت و بشناسرێتەوە بۆ سەردانی و دوعا بۆ کردنی، (عن الْمُطَّلِبِ قال لَمَّا مَاتَ عُثْمَانُ بن مَظْعُونٍ أُخْرِجَ بِجَنَازَتِهِ فَدُفِنَ أمر النبي ﷺ رَجُلًا أَنْ يَأْتِيَهُ بِحَجَرٍ فلم يَسْتَطِعْ حَمْلَهُ فَقَامَ إِلَيْهَا رسول اللَّهِ ﷺ وَحَسَرَ عن ذِرَاعَيْهِ قال كَثِيرٌ قال الْمُطَّلِبُ قال الذي يُخْبِرُنِي ذلك عن رسول اللَّهِ ﷺ قال كَأَنِّي أَنْظُرُ إلى بَيَاضِ ذِرَاعَيْ رسول اللَّهِ ﷺ حين حَسَرَ عنهما ثُمَّ حَمَلَهَا فَوَضَعَهَا عِنْدَ رَأْسِهِ وقال أَتَعَلَّمُ بها قَبْرَ أَخِي وَأَدْفِنُ إليه من مَاتَ من أَهْلِي). [٣]

---

١) رواه ابن ماجه ١٥٦٥ حديث صحيح.

٢) رواه لبن حبان ٢١٦٠ والبيهقي ٣/٤١٠ حديث حسن.

٣) رواه ابوداود ٣٢٠٦ والبيهقي ٣/٤١٢ حديث حسن.

موتەلیب دەڵێ: کاتێ عوسمانی کوڕی مەزعون مرد - کە برای شیری پێغەمبەر ﷺ بوو، جانەزاکەی برایە دەرەوەو نێژرا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە پیاوێ کە بەردێکی بۆ بێنێ، جا پیاوەکە نەیتوانی بەردەکە هەڵگرێ، ئەنجا پێغەمبەریش هەڵساو هەردوو قۆڵی لێ هەڵکرد - کەثیر وتی موتەلیب وتی ئەوەی لە پێغەمبەرەوە بۆی گێڕاوەمەتەوە و وتی: - دەڵێ سپێتی هەردوو باڵی پێغەمبەر ﷺ ئێسات بە پێش چاومەوەیە کاتێ هەڵی کردبوون، پاشان بەردەکەی هەڵگرتو بردی بۆ لای سەری مردووەکە دایاناو فەرمووی: "بۆ ئەوەی گۆڕی براکەمی پێ بزانمو کەسوکاریشم لە نزیکیدا بنێژم".

**٣- ڕاوەستان لای گۆڕەکەو دوعاکردن بۆی:**

پاش ناشتنی مردووەکە سوننەتە داوای لێبوردنو داوای دامەزراوی بۆ بکرێت لەوەڵامدانەوەی فریشتەکان کە پرسیاری لێدەکەن، (عن عُثْمَانَ بن عَفَّانَ قال كان النبي ﷺ إذا فَرَغَ من دَفْنِ الْمَيِّتِ وَقَفَ عليه فقال اسْتَغْفِرُوا لأَخِيكُمْ وَسَلُوا له التثبيت فإنه الْآنَ يُسْأَلُ).[١] عوسمانی کوڕی عەففان ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ هەرکاتێ لە ناشتنی مردوویەك ببوایەتەوەو لە سەری ڕادەوەستاو دەیفەرموو: "داوای لێخشبوون بکەن بۆ براکەتان و داوای دامەزراوی بۆ بکەن، چونکە تا ئێستا پرسیاری لێ دەکرێ".

**یازدەیەم: حوکمی شەهیدو منداڵی لەبارچوو:**

**١- شەهید:** ئەو کەسەیە لە جەنگی ئیسلام دژ بە دوژمنانی شەهید ببێت و بکوژرێت بۆ بەرزکردنەوەی وشەی (لا اله الا الله محمد رسول الله)و پارێزگاری لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

**شەهید:** ناشۆردرێو نوێژی لەسەر ناکرێت، وە سوننەتە بە جلەکانی خۆیەوە بنێژرێت کە پێوە شەهید بووە، عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ رضي الله عنهما (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كان يَجْمَعُ بين الرَّجُلَيْنِ من قَتْلَى أُحُدٍ في ثَوْبٍ وَاحِدٍ ثُمَّ يقول أَيُّهُمْ أَكْثَرُ أَخْذًا لِلْقُرْآنِ فإذا أُشِيرَ له إلى أَحَدِهِمَا قَدَّمَهُ في اللَّحْدِ وقال أنا شَهِيدٌ على هَؤُلَاءِ وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ بِدِمَائِهِمْ و لم يُصَلِّ عليهم و لم يُغَسِّلْهُمْ).[٢]

---

١) رواه ابوداود ٣٢٢١ والحاكم ١/٣٧٠ والبيهقي ٥٦/٤ حديث صحيح.

٢) رواه البخاري ١٢٧٨.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەر دوو کەس لە شەهیدەکانی ئوحود یەك پۆشاکی پێوە ئەپێچان، پاشان دەیفەرموو: "کامیان قورئانی زیاتر دەزانێ ؟ جا ئاماژە بۆ یەکێکیان بکرایە ئەوەیانی لە گۆڕەکەدا دەخستە پێشەوەو دەیفەرموو: "من شایەتیم بەسەر ئەمانەوە" و فەرمانی کرد بە خوێنەکەیانەوە بنێژرێن نوێژی لەسەر نەکردن و نەشی شۆردن".[1] جابیر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: (قال النبي ﷺ ادْفِنُوهُمْ فِي دِمَائِهِمْ يَعْنِي يوم أُحُدٍ و لم يُغَسِّلْهُمْ) "پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد شەهیدەکانی ئوحود بە جلە خوێناوییەکانیانەوە بنژرێن نەشۆران و نوێژیشیان لەسەر نەکرا".

ئیمامی نەوەوی دەڵێ: (ئەو شەهیدانەی بە هۆی جەنگ لەگەڵ کافراندا نەکوژراون وەك کەسێك بە سك ئێشە بمرێ یا بە تاعون بمرێ یا بخنکێ لە ئاودا یا شتێك بروخێ بە سەریداو بکوژێ یان ئافرەت بە هۆی سك و ژانی منداڵ بوونەوە بمرێ هەموو ئەمانە دەشورێن و نوێژیان لەسەر دەکرێ بە یەك دەنگی زانایان)[2]. ئەمانە لە فەرموودەی صەحیحدا بە شەهید هاتوون.

**٢ـ منداڵی لەبارچوو:** ئەو منداڵەیە پێش تەواوبوونی ماوەی دیاری کراو بۆ لەدایکبوونی بە مردوویی لە دایك دەبێت. دەربارەی حوکمی ئەم جۆرە منداڵە دوو حاڵەتی هەیە:

**یەکەم:** لە کاتی لەدایکبوونی دا هیچ دەنگ و گریانی نەبێت، جا ئەگەر چوار مانگی تەواو نەکردبوو ئەو شۆردن و کفن کردن و نوێژ لەسەرکردنی واجب نییە، بەڵام سوننەتە بە قوماشێك کفن بکرێت و بنێژرێت بەبێ نوێژ لەسەر کردنی.

**دووەم:** دەنگ و گریانی هەبێت لە کاتی لەدایك بوونیدا، یان گومان نەبێت کە گیانی تێدایە بوونی بە نیشانەی جوڵانەوەو شتی لەو جۆرە، ئەوە واجبە بشۆردرێت و کفن بکرێت و نوێژیشی لەسەر بکرێت و بشنێژرێت. هیچ جیاوازی نییە لەگەڵ کەسێکی گەورەدا.

(عن جَابِرٍ عن النبي ﷺ قال الطِّفْلُ لَا يُصَلَّى عليه ولا يَرِثُ ولا يُورَثُ حتى يَسْتَهِلَّ).[3] جابیر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "منداڵ نوێژی لەسەر ناکرێ و میرات نابات و میراتی

---

١) رواه البخاري ١٣٤٧.

٢) بڕوانە (المجموع ٥/٢٦٤).

٣) رواه الترمذي ١٠٣٢.

لێ نابرێت هەتا دەنگی لێوە نەیەت‌و زیندوو نەبێت...". کەواتە: ئەگەر دەنگی لێوە هات‌و زیندووبوو ئەوە حوکمەکەی بە پێچەوانەوە دەبێت، نوێژی لەسەر دەکرێ و میرات دەبات‌و لێی دەبرێت.

(عن جابر قال قال رسول الله ﷺ إذا استهل السقط صلي عليه وورث).[١] هەروەها جابیر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوای ﷺ فەرمووی: "ئەگەر منداڵی لەبارچوو قیرەی لێوە هات نوێژی لەسەر دەکرێ‌و میرات دەبات".

**دوانزەیەم: تەعزیەو سەرەخۆشی کردن**

**١ـ بەڵگەی دروستی سەرەخۆشی کردن:**

(عن أُسَامَةَ بن زَيْدٍ رضي الله عنهما أَنَّ ابْنَةً لِلنَّبِيِّ ﷺ أَرْسَلَتْ إليه وهو مع النبي ﷺ وَسَعْدٌ وَأُبَيٌّ نَحْسبُ أَنَّ ابْنَتِي قد حُضِرَتْ فَاشْهَدْنَا فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا السَّلَامَ وَيَقُولُ إِنَّ لِلَّهِ ما أَخَذَ وما أَعْطَى وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ مُسَمًّى فَلْتَحْتَسِبْ وَلْتَصْبِرْ فَأَرْسَلَتْ تُقْسِمُ عليه فَقَامَ النبي ﷺ وَقُمْنَا فَرُفِعَ الصَّبِيُّ في حَجْرِ النبي ﷺ وَنَفْسُهُ تقعقع فَفَاضَتْ عَيْنَا النبي ﷺ فقال له سَعْدٌ ما هذا يا رَسُولَ اللَّهِ قال هذه رَحْمَةٌ وَضَعَهَا الله في قُلُوبِ من شَاءَ من عِبَادِهِ ولا يَرْحَمُ الله من عِبَادِهِ إلا الرُّحَمَاءَ).[٢] ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ لە حزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین یەکێك لە کچەکانی ناردی بە شوێنیداو بانگی کرد و پێی ڕاگەیاند کەوا کوڕێکی لەسەرەمەرگدایە، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "بگەڕێرەوە بۆ لای و پێی ڕابگەیەنە: کەوا ئەوەی دەیباتەوە موڵکی خوایەو ئەوەشی دەیبەخشێ موڵی خۆیەتی هەموو شتێکیش لای ئە وماوەی دیاری کراوی هەیە، جا فەرمانی پێ بکە ئارام بگرێت‌و چاوەڕوانی پاداشت لای خوا بێت... جا ئەویش ناردی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ سوێندی لێ خوارد ـ کە بڕوات بۆ لای ـ جا پێغەمبەر ﷺ هەستاو ئێمەش هەستاین ـ ڕۆشتین بۆ لای، ئەنجا منداڵەکە بەرز کرایەوەو خرایە کۆشی پێغەمبەر ﷺ و گیانی دەداو هەناسەی سوار بوو بوو ـ وەك مەشکەیەك بیژەنی بە دەم گیانەڵاوە دەهات‌و چووە ـ جا هۆن هۆن فرمێسك بە هەردو وچاوی پێغەمبەردا ﷺ دەهاتە خوارەوە، سەعدیش (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: ئەم گریانە چییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟

١) رواه ابن ماجة ١٥٠٨.

٢) رواه البخاري ٥٦٥٥ ومسلم ٩٢٣.

فەرمووی: "ئەم بەزەییە خوا دەیخاتە دڵی هەرکام لە بەندەکانی کە بیەوێ، خوای گەورە لەناو بەندەکانیدا تەنیا رەحم بەوانەیان دەکات کە بە بەزەیی‌و میهرەبانن".

**٢ـ سوننەتە خواردن بۆ خاوەن تەعزیە دروست کرێت:**

(عن عبد اللّٰهِ بن جَعْفَرٍ قال قال رسول اللّٰهِ ﷺ اصْنَعُوا لِآلِ جَعْفَرٍ طَعَامًا فإنه قد أَتَاهُمْ أَمْرٌ شَغَلَهُمْ). [١] عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "خواردن بۆ کەسوکاری جەعفەر دروست بکەن، چونکە بەراستی کارێکیان بۆ پێشهاتووە کە سەرقاڵی کردوون ـ کە مردنی جەعفەرە ـ".

**سیازدەیەم: سەردانی گۆڕستانی:**

دروستە سەردانی گۆڕستان بکرێت بۆ پەندوەرگرتن‌و شین و شەپۆر و بیرکەوتنەوەی رۆژی دوایی، بەمەرجێ شتێك نەڵێ خەشم‌و رقی پەروەردگار هەستێنێ، وەك هاوارکردن لە مردوو، هانا بردن بۆی و داواکردنی شتانێك لە مردووەکە کە تەنیا لە دەسەڵاتی پەروەردگاردایە.

**١ـ سەردانی گۆڕستان بۆ پیاوان:**

سەردانی گۆڕستانی موسڵمانان بۆ پیاوان سوننەتە بەیەك دەنگی زانایان. (عن بُرَيْدَةَ رضي الله عنه قال قال رسول اللّٰهِ ﷺ نَهَيْتُكُمْ عن زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا). [٢] پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "من پێشتر رێگەم پێنەدان سەردانی گۆڕستان بکەن دە ئێستا سەردانی بکەن".

**٢ـ دوعای سەردانی گۆڕستان:**

ـ (عن أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ أَتَى الْمَقْبُرَةَ فقال: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وَإِنَّا إن شَاءَ الله بِكُمْ لَاحِقُونَ). [٣] ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ گۆڕستان‌و فەرمووی: "السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وَإِنَّا إن شَاءَ الله بِكُمْ لَاحِقُونَ". پێشتر ئەم دوعایەمان مانا کرد.

---

١) رواه ابوداود ٣١٣٢ والترمذي ٩٩٨ وابن ماجة ١٦١٠ حيث صحيح.

٢) رواه مسلم ٩٧٧.

٣) رواه مسلم ٢٤٩ واحمد ٢/٣٠٠.

ـ بورەیدە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فێری دەکردن کاتێ ڕۆیشتن بۆ گۆڕستان بڵێن: " السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ من الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ وَإِنَّا إن شَاءَ الله لَلَاحِقُونَ أَسْأَلُ اللَّهَ لنا وَلَكُمْ الْعَافِيَةَ".[١] پێشتر ئەم دوعایەمان مانا کرد.

**٣ـ وەستان روو بە قیبلە:**

(عن الْبَرَاءِ بن عَازِبٍ قال خَرَجْنَا مع رسول اللَّهِ ﷺ في جَنَازَةِ رَجُلٍ من الأَنْصَارِ فَانْتَهَيْنَا إلى الْقَبْرِ و لم يُلْحَدْ بَعْدُ فَجَلَسَ النبي ﷺ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ وَجَلَسْنَا معه).[٢] بەڕائی کوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕۆشتینە دەرەوەی مەدینە ـ لەگەڵ جەنازەی پیاوێکی ئەنصارییدا تا گەیشتینە لای گۆڕەکە هێشتا لادڕەکە ـ گۆڕینچەکەی ـ هەڵنەکەنرابوو، جا پێغەمبەر ﷺ و ئێمەش لەگەڵیدا روو بە قیبلە دانیشتین".

**٤ـ حەرامە نوێژکردن لای گۆڕدا یا رووشی تێنەکرێت:**

(عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ إلا الْمَقْبَرَةَ وَالْحَمَّامَ) ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "زەوی هەمووی مزگەوتە جگە لە گۆڕستاو گەرماو".[٣]

**٥ـ حەرامە مزگەوت دروست کردن لەناو گۆڕستان:**

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها عن النبي ﷺ قال في مَرَضِهِ الذي مَاتَ فيه: لَعَنَ الله الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسْجِدًا)[٤] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەو نەخۆشییەی کە تێیدا وەفاتی کرد فەرمووی: "خوا نەفرینی کرد لە گاورو جولەکە، چونکە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کرد بە مزگەوت". واتە: لەسەر گۆڕەکانیان مزگەوتیان دروست کرد.

---

١) رواه مسلم ٩٧٥ واحمد ٥/ ٣٥٣.

٢) رواه ابوداود ٣٢١٢ والنسائي ٤/٧٨ وابن ماجة ١٥٤٨ حديث صحيح.

٣) رواه ابوداود ٤٩٢ والترمذي ٣١٧ وابن ماجة ٧٤٥ حديث صحيح.

٤) رواه البخاري ١٣٣٠ ومسلم ٥٣٤.

**٦ـ حەرامە رازاندنەوەو نووسین لەسەری:**

(عن جابر قال نهى رسول الله ﷺ أن يجصص القبر وأن يقعد عليه وأن يبنى عليه و ان يرفع وأن يكتب عليه) [١] جابر (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ رێگری کرد کە گۆڕ گەچکاری بکرێتو خانووی لەسەر دروست بکرێت یا زیاد بەرزبکرێتەوە یا لەسەر بنووسرێت".

**٧ـ حەرام کردنی بە شوێنی جەژنو شادی:**

وەك ئەوەی لە چەند کاتێکی دیاری کراودا سەردانی بکرێت بۆ خواپەرستی کردن لە پەنایدا یا بۆ هەر مەرامێکی تر، (عن علي بن أبي طالب رضي الله عنه قال قال رسول اللّٰهِ ﷺ لاَ تَتَّخِذُوا قبري عِيداً وَلاَ تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُوراً وَحَيْثُمَا كُنْتُمْ فَصَلُّوا علي فإن صَلاَتَكُمْ تبلغني). [٢] عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "گۆڕەکەم مەکەنە ـ شوێنی ـ جەژنو ماڵەکانیشتان مەکەنە گۆڕستانو لەهەر شوێنێکدا بوون سڵاواتم لەسەر بدەن، چونکە دڵیابن سڵاواتەکانتان پێم دەگات".

**٨ـ دانیشتن لەسەر گۆڕ:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللّٰهِ ﷺ لأنْ يَجْلِسَ أحدكم على جَمْرَةٍ فَتُحْرِقَ ثِيَابَهُ فَتَخْلُصَ إلى جِلْدِهِ خَيْرٌ له من أَنْ يَجْلِسَ على قَبْرٍ). [٣] ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەگەر کەسێکتان لەسەر بشکۆیەك دانیشێتو جلەکانی بسوتێنێو بگاتە پێستی، ئەوە چاکتر لەوەی لەسەر گۆڕی دانیشێت".

(عن أبي مَرْثَدٍ الْغَنَوِيِّ قال سمعت رسول اللّٰهِ ﷺ قال لَا تَجْلِسُوا على الْقُبُورِ ولا تُصَلُّوا إِلَيْهَا) ئەبومەرسەدی غەنەوی (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: "روو بە قەبر نوێژ مەکەنو لەسەریشی دامەنیشن".

---

١) رواه مسلم ٩٧٠ والترمذي ١٠٥٨ وابوداود ٣٢١٠ والنسائي ٢٨٤/١.

٢) رواه الضياء في المختار ٤٢٨ وابويعلى ٤٦٩ وابن ابي شيبة في المصنف ٣٧٥/٢ حديث صحيح.

٣) رواه مسلم ٩٧١ وابوداود ٣٢٢٨ والنسائي ٩٥/٤ (٢٠٤٤).

**٩- جنێودان بەمردوو حەرامە:**

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت قال النبي ﷺ لَا تَسُبُّوا الأمْوَاتَ فَإِنَّهُمْ قد أَفْضَوْا إلى ما قَدَّمُوا)[١] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "جنێو مەدەن بە مردووان، چونکە ئەوان ڕۆشتوون بۆ لای ئەو کردەوانەی پێش خۆیان ناردوویانە".

**١٠- کام کردەوەی خەڵك سوودی بۆ کردوو هەیە:**

**أ ـ دوعای موسڵمان بۆی:**

ئەگەر مەرجی گیرا بوونی تێدا بێت خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾ الحشر: ١٠ واتە: ئەو موسڵمانانەی لەپاش کۆچەرو یاریدەدەرەکان هاتوون دەڵێن ئەی پەروەردگارمان لە ئێمەو لەو برایانەشمان خۆش ببە کە پێشمان کەوتوون لە ئیمان هێناندا و هیچ ڕق و کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە دەربارەی باوەڕداران ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی هەر تۆی دڵسۆزو میهرەبان.

(كَانَ رسول الله ﷺ يَقُولُ « دَعْوَةُ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ مُسْتَجَابَةٌ عِنْدَ رَأْسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ كُلَّمَا دَعَا لأَخِيهِ بِخَيْرٍ قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ آمِينَ وَلَكَ بِمِثْلٍ »)[٢] پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: "دوعای موسڵمان بۆ برای موسڵمان لەپاش ملە گیرایە فریشتەیەك لای سەریدایەو ڕاسپێرراوە هەرکە دوعای خێری کرد بۆ برایەکی فریشە ڕاسپێرراوەکە بەو کەسە دەڵێ ئامین تۆش وەك ئەو خێرەت بۆ بنووسرێت".

**ب ـ خێری نەبڕاوە (الصدقه الجارية):**

(عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ « إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلا مِنْ ثَلاَثَةٍ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ »)[٣] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵی:

---

١) رواه البخاري ١٣٩٣.

٢) رواه مسلم ٨٨/ ٢٧٣٣ وابوداود ١٥٣٤ واحمد ٤٥٢/٤.

٣) رواه مسلم ١٦٣١/١٤ واحمد ٣٧٢/٢ والنسائي ٢٥١/٦ وابواود ٢٨٨٠ والترمذي ١٣٧١.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "کاتێ مرۆڤ مرد کردەوەی کۆتایی دێت و نامێنێ لە سێ رێگاوە نەبێت: خێری بەردەوامو نەبڕاوە یان زانیارییەك ـ ی بەجێهێشتبێ ـ سودی لێ ببینرێ، یان منداڵێکی ساڵەح دوعای خێری بۆ بکات".

خێری نەبڕاوە وەك دروست کردنی مزگەوتو بیر لێدان بۆ خواردنەوەی خەڵك یا ئاژەڵ، باخێك یاخوونەیەك بکرێتە خێر بۆ هەژاران یا بۆ مزگەوت یا کتێبی قورئان بکرێتە وەقفی خێری لە مزگەوتی و شوێنی وادا..

**ج ـ گرتنەوەی رۆژوی مردووەکە:**

ئەگەر مردووەکە رۆژووی نەزر یا رەمەزان قەرزار بوو ئەوە دەبێت وەلییەکەی بۆی بگرێتەوە، (عَنْ عَائِشَةَ رضى الله عنها أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ « مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ »)[1] عائیشە (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کەسێك مردو رۆژوو قەرزار بوو ئەوە باکەسوکارەکەی بۆی بگرێتەوە".

**د ـ دانەوەی قەرزی مردوو:**

عن أَبِي هُرَيْرَةَ قال:( قال رسول اللَّهِ ﷺ نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حتى يقضي عنه)[2] ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "گیانی بڕوادار بەستراوە بە قەرزەکەیەوە ـ ناچێتە بەهەشت ـ تا بۆی نەدرێتەوە".

عن سَلَمَةَ بن الْأَكْوَعِ رضي الله عنه قال:(.... ثُمَّ أُتِيَ بِجَنَازَةٍ أُخْرَى فَقَالُوا يا رَسُولَ اللَّهِ صَلِّ عليها قال هل عليه دَيْنٌ قِيلَ نعم قال فَهَلْ تَرَكَ شيئا قالوا ثَلَاثَةَ دَنَانِيرَ فَصَلَّى عليها ثُمَّ أُتِيَ بِالثَّالِثَةِ فَقَالُوا صَلِّ عليها قال هل تَرَكَ شيئا قالوا لَا قال فَهَلْ عليه دَيْنٌ قالوا ثَلَاثَةُ دَنَانِيرَ قال صَلُّوا على صَاحِبِكُمْ قال أبو قَتَادَةَ صَلِّ عليه يا رَسُولَ اللَّهِ وَعَلَيَّ دَيْنُهُ فَصَلَّى عليه)[3] سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: ".... پاشان جەنازەی سێیەمیان هێنا وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر بکە، فەرمووی: "هیچی لێ بەجێماوە؟"، وتیان: نەخێر،

---

١) رواه البخاري ١٩٥٢ ومسلم ١٥٣/ ١١٤٧.

٢) رواه الترمذي ١٠٧٨ وابن ماجه ٢٤١٣.

٣) رواه البخاري ٢٢٨٩ ، ٢٢٩٥.

فەرمووی: "ئەی قەرزارە؟"، وتیان: بەڵێ، سێ دینار قەرزارە، فەرمووی: "نوێژ لەسەر هاوڕێکەتان بکەن". ئەبوقەتادە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر بکە قەرزەکەی لەسەر من ـ بۆی دەدەمەوە ـ جا نوێژی لەسەر کرد".

**هـ ـ چاکەی منداڵی ساڵەح:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾ النجم: ٣٩ واتە: هیچ شتێك بۆ ئینسان نییە جگە لە کۆشش‌و کاری خۆی...

(عن عُمَارَةَ بن عُمَيْرٍ عن عَمَّتِهِ أنها سَأَلَتْ عَائِشَةَ رضي الله عنها في حِجْرِي يَتِيمٌ أَفَآكُلُ من مَالِهِ فقالت قال رسول اللَّهِ ﷺ إِنَّ من أَطْيَبِ ما أَكَلَ الرَّجُلُ من كَسْبِهِ وَوَلَدُهُ من كَسْبِهِ).[1]

عومارەی کوڕی عومەیر دەڵێ: پورێکم کوڕێکی هەتیوی هەبوو ـ باوکی نەمابوو ـ خۆی بەخێوی دەکرد، منداڵە هەیتوەکە ئیشوکاری دەکرد، پورم بە لایەوە گران بوو لەو پارە بخوات کە ئەو پەیدای دەکات، بۆیە پرسیاری لە عائیشە کرد لەو بارەیەوە، عائیشەش وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "پاکترین شتێ مرۆڤ بیخوات ئەوەیە لەبەری ڕەنج‌و کۆششی خۆی بێت و بێگومان منداڵی مرۆڤ لەبەرهەم‌و ڕەنجی خۆیەتی".

١) رواه احمد ٦/ ٣١و ١٢٧ والدارمي ٢/ ٢٤٧ وابوداود ٣٥٢٨ والنسائي ٤/ ٢٤٠ـ ٢٤١. حديث صحيح.

# کتێبی ڕۆژوو گرتن

**یەکەم: پێناسەی ڕۆژووگرتن**

(صیام) لە زمانی عەرەبیدا واتە خۆگرتنەوە لە کردن جا قسە بێت یا خواردن وەك قورئان لەسەر زمانی مەریەم دەفەرموێ: ﴿إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا﴾ مریم: ٢٦ واتە: من ڕۆژووم بۆ خودای بەبەزەیی لە خۆم گرتووە ئەمڕۆ قسە لەگەڵ هیچ کەس نەکەم.

**ڕۆژووگرتن لە شەرعدا:** بریتییە لە خۆگرتنەوە لەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن لە سەرەتای ڕۆژەوە تا ئاوابوونی خۆر لەگەڵ نیەت بووندا.

**حوکمی ڕۆژووگرتن:** ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان پایەیەکە لە پایەکانی ئیسلام، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ البقرة: ١٨٣ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووگرتنتان لەسەر پێویست کراوە وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە پێویست کرابوو بۆ ئەوەی پارێزکاری بکەن.

هەرکەس باوەڕی بە واجبوونی ڕۆژوو نەبێت کافر دەبێتو لە بازنەی ئیسلام دەچێتە دەرەوە.

**دووەم: مێژووی فەرزبوونی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان:**

ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز لە مانگی شەعبانیساڵی دووەمی کۆچییدا فەرزبووە و پێویست کراوە لەسەر موسڵمانان.

ڕۆژووگرتن لە مێژووی پێش ئیسلامیشدا هەبووە و نامەدارەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لە گاورو جولەکە ڕۆژوگرتنیان هەبووە وەك قورئان ئاماژەی پێدەکات کە پێشتر باسمان کرد

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾ البقرة: ١٨٣.

**سێیەم: بەڵگەی پێویست بوونی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان:**

خوای گەورە دەفەرمویت:﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ ﴾ البقرة: ١٨٥ واتە: مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوارەوە بە ڕێنما بۆ خەڵکی و بەڵگەیانی ڕۆشن بۆ ڕێنموونی و جیاکەرەوەی ڕاستو ناراست ئینجا هەرکەس لە ئێوە مانگی ڕەمەزانی بینی با ئەو مانگە بە ڕۆرژوو بێت.

(قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ ، وَالْحَجِّ ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ »).[١] پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: "ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: شایەتیدان کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوداو بێگومان موحەممەدیش پێغەمبەری خوادایە، نوێژکردن و زەکات دانو حەج کردنو ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان".

(قوله ﷺ للأعرابي الذي سَأَلَهُ، أخبرني ماذا فرض علي الله من الصوم؟ فقال رسول اللّهِ ﷺ: صِيَامُ رَمَضَانَ).[٢] کاتێ پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی دێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێدەکات و دەڵێ: خوا چ ڕۆژوویەکی فەرزکردووە لەسەرم؟ فەرمووی: "ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان".

---

١) رواه البخاري ٨ ومسلم ١٦.

٢) رواه البخاري ١٧٩٢ ومسلم ١١.

**چوارەم: چۆن هاتنی مانگی ڕەمەزان دەزانرێت:**

هاتنی مانگی رەمەزان بەدوو شێوە دەزانرێت: بینینی مانگی رەمەزان یا تەواوکردنی سی رۆژەی شەعبان:

**١ـ بینینی مانگی رەمەزان:** ئەگەر لە شەوی سی شەعباندا مانگی رەمەزان بینرا لەلایەن کەسێکی عادلەوە بڕوات لەبەردەم قازی دا شایەتی بدات کە مانگی رەمەزانی بینیوە دەبێتە رەمەزانو واجبە موسڵمانان بەرۆژوو بن.

(عن بن عُمَرَ قال تَرَاءَى الناس الْهِلَالَ فَأَخْبَرْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنِّي رَأَيْتُهُ فَصَامَهُ وَأَمَرَ الناس بِصِيَامِهِ) [١] عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "خەڵکی بۆ مانگی رەمەزان دەگەڕان، منیش بە پێغەمبەرم ﷺ وت من مانگم دیوە، پێغەمبەریش ﷺ خۆی بەرۆژوو بوو فەرمانیشی کرد خەڵکی بە رۆوژوو بن".

**٢ـ تەواو کردنی سی رۆژەی شەعبان:**

ئەگەر بە هۆی هەور یا هەر هۆیەکی ترەوە مانگی رەمەزان نەبینرا لە شەوی سی شەعباندا ئەوە دەبێت سی رۆژەی مانگی شەعبان تەواو ببێت جا دەبێتە رەمەزان وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ فَإِنْ غُبِّيَ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا عِدَّةَ شَعْبَانَ ثَلَاثِينَ يوماً). [٢]

"بە بینینی مانگی رەمەزان بە رۆژوو بنو بە بینینی مانگی ـ شەوال ـ بیشکێنن، ئەگەر هەور بوو سی رۆژەی شەعبان تەواو بکەن ـ ئەنجا بە رۆژوو بن ـ".

ـ ئەگەر خەڵکی وڵاتێك یا شارێك مانگیان بینی دەبێت وڵاتەکانی تر کاری پێ بکەنو بەرۆژوو بن، چونکە فەرموودە صەحیحەکان داوا لە هەمو موسڵمانان دەکەن کە بە بینینی مانگی رەمەزان هەموویان بە رۆژوو بن و بە بینینی مانگی شەوال جەژن بکەن.

(عن كُرَيْبٍ أَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ بِنْتَ الْحَارِثِ بَعَثَتْهُ إلى مُعَاوِيَةَ بِالشَّامِ قال فَقَدِمْتُ الشَّامَ فَقَضَيْتُ حَاجَتَهَا وَاسْتُهِلَّ عَلَيَّ رَمَضَانُ وأنا بِالشَّامِ فَرَأَيْتُ الْهِلَالَ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ ثُمَّ قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ في آخِرِ الشَّهْرِ فَسَأَلَنِي عبد اللَّهِ بن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما ثُمَّ ذَكَرَ الْهِلَالَ فقال مَتَى رَأَيْتُمْ الْهِلَالَ فقلت

---

١) رواه ابوداود ٢٣٣٩ حديث صحيح.

٢) رواه البخاري ١٨١٠ ومسلم ١٠٨٠.

رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ فقال أنت رَأَيْتَهُ فقلت نعم وَرَآهُ الناس وَصَامُوا وَصَامَ مُعَاوِيَةُ فقال لَكِنَّا رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ السَّبْتِ فلا نَزَالُ نَصُومُ حتى نُكْمِلَ ثَلَاثِينَ أو نَرَاهُ فقلت أَوَ لَا تَكْتَفِي بِرُؤْيَةِ مُعَاوِيَةَ وَصِيَامِهِ فقال لَا هَكَذَا أَمَرَنَا رسول اللَّهِ ﷺ).[1] کورەیب دەڵێ: ئوممو فەزڵی کچی حاریسە، ناردی بۆ لای موعاویە لە شام، دەڵێ: ڕۆشتم بۆ شام و کارەکەی ئوموفەزڵم ئەنجامدا، مانگی ڕەمەزانم بەسەردا هات لەو کاتەدا لە شام بووم، شەوی هەینی مانگی ڕەمەزانم بینی لە کۆتایی ڕەمەزاندا هاتمەوە بۆ مەدینە، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێت) پرسیاری لێ کردم، پاشان باسی مانگ بینینی کردو وتی کەی مانگتان بینی وتم شەوی هەینی وتی تۆ خۆت بینیت وتم بەڵی خەڵکیش بینیان جا خەڵكو موعاویە بەڕۆژوو بوون. وتی: بەڵام ئێمە شەوی شەممە بینیمان بویە بەردەوام بە ڕۆژوو دەبین تا سی ـ ڕۆژەی ـ ڕەمەزان تەواو دەکەین یان مانگ دەبینین، منیش وتم: ئەی بینینی موعایەو ڕۆژوو گرتنی بەس نییە بۆت؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەر ﷺ ئەوا فەرمانی پێ کردین.

ئەم فەرمووده لەگەڵ فەرموودەکەی پێشوودا کە فەرکمانی کرد بە بینینی مانگی ڕەمەزان هەموو بە ڕۆژووبن بەم جۆرە ماناکانیان ڕێك دەخرێت:

ئەم فەرموودە کوڕەیب دەربارەی کەسێکە بە پێی بینینی شارەکە یا وڵاتەکەی خۆی ڕۆژووی گرتووە، پاشان هەر لە ناو مانگی ڕەمەزاندا هەواڵی پێدەگات کە شوێنێکی ترو وڵاتێکی تر پێش ئەم مانگیان بینیوە، تا لەم کاتەدا ئەوە لەسەر ڕۆژووگرتنی وڵاتەکەی خۆی بەردەوام دەبێت تا سی ڕۆژەی ڕەمەزان تەواو دەکەن یان مانگ دەبینن، بەڵام جگە لەم حاڵەتە ئەوە هەر کار فەرموودەکەی پێشو دەکرێ کە دەفەرموێ: (صوموا لرؤيته وأفطروا لرؤيته) هەموو موسڵمانێك دەگرێتەوە کە پێی بگات مانگ بینراوە لەهەر وڵاتێك بێت نزیك بێت یا دوور بەبێ دیاری کردنی ماوە.[2]

---

١) رواه مسلم ٢٨/ ١٠٨٧.

٢) بڕوانە: (مجموع الفتاوى لابن تيمية، ٢٥/١٠٧).

**پێنجەم: مەرجەکانی دروستی ڕۆژووگرتن**

**١- ئیسلامەتی:**

واتە ڕۆژووگر دەبێت موسڵمان بێت.

**٢- ژیریی:**

(عن عائشة رضي الله عنها قالت: قال رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رُفِعَ الْقَلَمُ عن ثَلَاثَةٍ عن الصَّبِيِّ حتى يَبْلُغَ وَعَنْ النَّائِمِ حتى يَسْتَيْقِظَ وَعَنْ الْمَجْنُونِ حتى يَعْقِلَ).[1] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "سێ کەس قەڵەمی - نووسینی تاوان - یان لەسەر هەڵگیراوە: خەوتوو هەتا لەخەو هەڵدەستێت، منداڵ هەتا باڵغ دەبێت، شێت هەتا چاك دەبێتەوە".

**٣- نیەت هێنان لە شەودا:**

(عن حَفْصَةَ رضي الله عنها عن النبي ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من لم يُجْمِعْ الصِّيَامَ قبل الْفَجْرِ فلا صِيَامَ له).[2] حەفصە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "هەرکەس لە پێش نوێژی بەیانییەوە نییەتی ڕۆژووی نەهێنانی نەبێ ئەوە ڕۆژووەکەی دروست نییە".

**٤- بە ڕۆژووبوونی هەموو ڕۆژەکە:**

(عن عبدالله بن عمر بن الخطاب رضي الله عنهما قال: رسول الله ﷺ: إذا أقبل الليل من هاهنا وأدبر النهار من هاهنا وغابت الشمس فقد أفطر الصائم).[3] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "ئەگەر شەو ئالەوێوە داهاتو ڕۆژیش ئا لەوێوە ئاوبوو خۆر نیشت ئەوە ڕۆژووەوان ڕۆژوو دەشکێنێ".

**٥- بەربەست نەبێ لە ڕۆژووگرتن:**

وەك حەیزو زەستانی، (عن أبي سَعِيدٍ رضي الله عنه قال قال النبي ﷺ أَلَيْسَ إذا حَاضَتْ لم تُصَلِّ و لم تَصُمْ فَذَلِكَ نُقْصَانُ دِينِهَا).[4] ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر

---

١) رواه احمد ٦/ ١٠٠- ١٠١ وابوداود ٤٣٩٨ والنسائي ١٥٦/٦ (٣٤٣٢) وابن ماجة ٢٠٤١ حديث صحيح.

٢) رواه الترمذي ٧٣٠ وابوداود ٢٤٥٤ والنسائي ١٩٦/٤- ١٩٧ وابن ماجه ١٧٠٠ حديث حسن.

٣) رواه البخاري ١٩٥٤ ومسلم ١١٠٠.

٤) رواه البخاري ٣٠٤ ومسلم ٨٨٩.

ﷺ فەرمووی: "ئەو نیە ئافرەت کاتێ کەوتە حەیزەوە نوێژ ناکاتو ڕۆژو ناگرێت، ئەوەیە ناتەواوی دینی ئافرەت".

**شەشەم: پایەکانی ڕۆژووگرتن**

ڕۆژوو دوو پایەی سەرەکی هەیە کە ئەمانەن: نییەت هێنانو خۆگرتنەوە لە ئەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن لە بەیانییەوە تا خۆرئاوبوون.

**١ـ نییەت هێنان:**

واتە نییەتی ڕۆژووگرتنت هەبێ لە شەوی ڕەمەزاندا کە ڕۆژەکەی بەرۆژوو دەبی، نییەتیش بە دڵە هیچ پێویست بەوتن ناکات بە زمان، (قال رسول الله ﷺ إِنَّمَا الآعْمَالُ بِالنِّيَاتِ) [١] پێغەمبەر ﷺ دەربارەی نییەت هێنان دەفەرموێ: "بێگومان کردەوەکان هەموو بە نییەتە".

**٢ـ خۆگرتنەوە لەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن لە بەیانییەوە تا خۆرئاوابوون:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ﴾ البقرة: ١٨٧ واتە: لە شەوانی ڕەمەزاندا سەرجێی ژنەکانتان بۆ حەڵاڵ کراوە، ئەوان پۆشاکم بۆ ئێوە، ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان خوای گەورە دەیزانی کە ئێوە ناپاکیتان دەکرد لە خۆتان بۆیە پەشیمانی لێ گیرا کردنو لێتان خۆش بوو ئیتر لە ئێستاوە (بەشەودا) بچنە لای ژنەکانتانو مەبەستتان ئەوە بێ کە خوای بۆی نووسیون ـ لە منداڵی صاڵحو داوێن پاکی ڕاگرتنی خرتانو هاوسەرەکانتان ـ وە بخۆنو بخۆنەوەو هەر ڕوشتەی سپی بەرەبەیانتان لە ڕوشتەی ڕەش بۆ جیا دەبێتەوە لە پاشان بە ڕۆژوو بن تا شەو دادێ".

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال قال رسول اللّهِ ﷺ من نَسِيَ وهو صَائِمٌ فَأَكَلَ أو شَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ الله وَسَقَاهُ). [١] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ

---

١) رواه البخاري ١ ومسلم ١٩٠٧.

فەرمووی: "کەسێك بەڕۆژوو بوو لە بیرچوو خواردنی خوارد یا خواردنەوەی خواردەوە، ئەوە با ڕۆژووکەی تەواو بکات، چونکە خوا خواردنو خواردنەوەکەی پێداوە".

**حەوتەم: ئادابەکانی ڕۆژووگرتن**

**١ـ پارشێو کردنو دواخستنی:**

(قال النبي ﷺ تَسَحَّرُوا فإن في السَّحُورِ بَرَكَةً) [٢] پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "پارشێو بکەن، چونکە لە پارشێو کردندا فەڕو بەرەکەت هەیە".

(عن أَنسٍ عن زَيْدِ بن ثَابِتٍ رضي الله عنه قال تَسَحَّرْنَا مع النبي ﷺ ثُمَّ قام إلى الصَّلَاةِ. قال انس: قلت لزيد: كَمْ كان بين الآذَانِ وَالسَّحُورِ؟ قال: قَدْرُ خَمْسِينَ آيَةً). [٣] ئەنەسی کوڕی مالیك لە زەیدی کوڕی سابیتەوە گێڕاویەتییەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ پارشێومان کرد، پاشان هەستا بۆ نوێژ ـ ی بەیانی ـ ئەنەس دەڵێ: بەزەیدم وت نێوان بانگو پارشێو چەند بوو؟ وتی: بە قەدەر خوێندنی پەنجا ئایەت بوو".

**٢ـ زوو بەربانگ کردنەوە:** (عن سَهْلِ بن سَعْدٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال لَا يَزَالُ الناس بِخَيْرٍ ما عَجَّلُوا الْفِطْرَ). [٤] سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "بەردەوام خەڵکی لە چاکەکردندان هەتا زوو ڕۆژوو بشکێنن ".

**٣ـ بەربانگ کردنەوە بە چی سوننەتە:** (عن أَنسَ بن مَالِكٍ يقول كان رسول اللَّهِ ﷺ يُفْطِرُ على رُطَبَاتٍ قبل أَنْ يُصَلِّيَ فَإِنْ لم تَكُنْ رُطَبَاتٌ فَعَلَى تَمَرَاتٍ فَإِنْ لم تَكُنْ حَسَا حَسَوَاتٍ من مَاءٍ). [٥] ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە چەند دەنکە خورمایەکی تازە پێگەیشتوو ڕۆژووەکەی دەشکاند پێش ئەوەی نوێژ ـ ی مەغریب ـ بکات جا

---

١) رواه البخاري ١٩٣٣ ومسلم ١١٥٥.

٢) رواه البخاري ١٩٢٣ ومسلم ١٠٩٥.

٣) رواه البخاري ١٩٢١ ومسلم ١٠٩٧.

٤) رواه البخاري ١٩٥٧ ومسلم ١٠٩٨.

٥) رواه ابوداود ٢٣٥٦ والترمذي ٦٩٦ خديث صحيح.

ئەگەر خورمای تازە نەبوایە ئەوە بە چەند دەنکە خورمایەکی وشك ڕۆژووەکەی دەشکاند ئەگەر خورمای وشك نەبوایە بەچەند قومێك ئاو دەیشکاند".

**٤ـ وازهێنان لە کردارو گوفتاری خراپ:**

وەك درۆو غەیبەت و دووزمانی و سەیرکردنی نامەحرەم.. هتد.

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من لم يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ). [1] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەرکەس واز لە وتەی درۆو کار پێکردنی نەیەنێت ئەوا خوای گەورە هیچ پێویستی نییە بەوەی کە واز لە خواردنو خواردنەوە بهێنێ".

(قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلاَّ الصِّيَامَ هُوَ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ الصِّيَامُ جُنَّةٌ فَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فَلاَ يَرْفُثْ وَلاَ يَصْخَبْ فَإِنْ شَاتَمَهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ انى امرؤ صائم »). [2] لە فەرموودەیەکی قودسییدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "خوای گەورە فەرموویەتی: هەموو کردەوەکانی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتی جگە لە ڕۆژووگرتن، ئەوە بێگومان تەنیا بۆ منەو خۆشم پاداشتی دەدەمەوە، وە ڕۆژووگرتن قەڵغانو پارێزەرە لە گوناهو هەڵە، جا ئەگەر یەکێکتان لە ڕۆژێکدا بە ڕۆژوو بوو با قسەی نابەجێو قڕەو گاڵتەو نەفامی نەکات ئەگەر کەسێکیش جنێوی پێدا یا شەڕی پێ فرۆشت با بڵێ: من بە ڕۆژووم من بە ڕۆژووم".

**٥ـ دوعاکردن لەکاتی ڕۆژووشکاندندا:**

(عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما قال: كان رسول اللَّهِ ﷺ إذا أَفْطَرَ قال: اللهم لك صُمْتُ وَعَلَى رِزْقِكَ أَفْطَرْتُ، ذَهَبَ الظَّمَأُ وَابْتَلَّتْ الْعُرُوقُ وَثَبَتَ الآجْرُ إن شَاءَ الله). [3] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ پێغەمبەر ﷺ ڕۆژووی دەشکاندو دەیفەرموو: "اللهم لك صُمْتُ وَعَلَى رِزْقِكَ أَفْطَرْتُ، ذَهَبَ الظَّمَأُ وَابْتَلَّتْ الْعُرُوقُ وَثَبَتَ الآجْرُ إن شَاءَ الله". واتە:

---

١) رواه البخاري ١٩٠٣.

٢) رواه البخاري ١٨٩٤ ومسلم ١١٥١.

٣) رواه ابوداود ٢٠٦٦ حديث حسن.

خوایە بۆ تۆ ڕۆژووم گرت و بەرۆزی تۆش بەربانگم کردەوە تینویەتی نەماو دەمارەکان تەڕبوونەوەو پاداشتەکەش تۆمار کرا ئینشائەڵڵا".

**٦ـ خۆشۆردنی لەشگران پێش نوێژی بەیانی:**

بۆ ئەوەی لە سەرتای بەرۆژوو بوونەوە پاكو خاوێن بێت، لەشگرانی ئەگەر لە شەودا بووبێت پێچەوانە نییە لەگەڵ رۆرژووگرتندا، بەڵام چاکتر وایە پێش نوێژی بەیانی خۆی بشوات، (أَنَّ عَائِشَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ قالتا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كان يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ وهو جُنُبٌ من أَهْلِهِ ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَيَصُومُ). [١] عائیشە و ئوممو سەلەمە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێن: "پێغەمبەر ﷺ بانگی بەیانی دەدا و لەشی گران بوو بەسەرجێی لەگەڵ خێزانەکانیدا، پاشان خۆی دەشۆردو بەرۆژوو دەبوو".

**٧ـ ٨ـ قورئان خوێندن و ماڵ بەخشین:**

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال كان النبي ﷺ أَجْوَدَ الناس بِالْخَيْرِ وكان أَجْوَدُ ما يَكُونُ في رَمَضَانَ حين يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ وكان جِبْرِيلُ عليه السَّلَام يَلْقَاهُ كُلَّ لَيْلَةٍ في رَمَضَانَ حتى يَنْسَلِخَ يَعْرِضُ عليه النبي ﷺ الْقُرْآنَ فإذا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ عليه السَّلَام كان أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ من الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ). [٢] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەس سەخیتر بوو بۆ خەیرو چاکە لە ڕەمەزانیشدا لە هەموو کاتەکانی تر سەخی تر بوو کە هەموو شەوێك جبریل (علیه السلام) دەهاتە لایو پێغەمبەر ﷺ قورئانی بۆ دەخوێندەوە تا ڕەمەزان تەواو دەبوو جا کاتێ جبریل (علیه السلام) پێی بگەشتایە پێغەمبەر ﷺ لە خێرکردندا لە با توند خێراتر بوو - لە ماڵ بەخشیندا-".

---

١) رواه البخاري ١٩٢٥ و ١٩٢٦.

٢) رواه البخاري ٦و ١٩٢٠ ومسلم ١٦٣/ ١١٥١.

**هەشتەم: ئەو شتانەی بۆ ڕۆژووەوان دروستە:**

**١ـ خۆشۆردن بۆ خۆ فێنك كردنەوە:**

(عن أَبِي بَكْرِ بن عبد الرحمن عن بَعْضِ أَصْحَابِ النبي ﷺ قال لقد رأيت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِالْعَرْجِ يَصُبُّ على رَأْسِهِ الْمَاءَ وهو صَائِمٌ من الْعَطَشِ أو من الْحَرِّ). [١] ئەبوبەكری كوڕی عەبدوڕەحمان دەڵێ: لە هاوەڵێكی پێغەمبەرم ﷺ بیست وتی: "پێغەمبەرم ﷺ دی لە عەرج[٢] دا ئاوی دەكرد بە سەریداو بەرۆژوویش بوو لە تینویەتیدا یان لە گەرماندا".

**٢ـ ئاو لە دەم و لووت رادان بەبێ زیادەڕۆیی:**

(عن لَقِيطِ بن صَبْرَةَ قال: قال رسول اللَّهِ ﷺ بَالِغْ في الِاسْتِنْشَاقِ إلا أَنْ تَكُونَ صَائِمًا). [٣] لەقیتی كوڕی صەبرە (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: " لە ئاو رادانە دەم و لووت دا زیاد هەڵیمژە مەگەر بە رۆژوو بیت".

**٣ـ ماچ كردن و یاری كردن:**

ئەگەر كەسێ توانای خۆگرتنی هەبوو ئەوە دروستە خێزانی ماچ بكات یان یاری لەگەڵدا بكات، (عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت كان النبي ﷺ يُقَبِّلُ وَيُبَاشِرُ وهو صَائِمٌ وكان أَمْلَكَكُمْ لِإِرْبِهِ). [٤] عائیشە (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ خێزان ماچ دەكردو یاریشی لەگەڵدا دەكرد بەرۆژوویش بووو ئەو لە هەمووتان خۆگرتربوو".

**٤ـ بەلەش گرانی رۆژ بكاتەوە:**

(عن عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كان يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ وهو جُنُبٌ من أَهْلِهِ ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَيَصُومُ). [٥] عائیشە (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "بێگومان بانگی بەیانی دەبوو پێغەمبەر ﷺ لەش گران دەبوو بە رەفاقەتی خێزانی، پاشان خۆی دەشۆردو بەرۆژوو دەبوو".

---

١) رواه ابوداود ٢٣٤٨.

٢) عەرج گوندێكە چەند رۆژێك بە پێ لە مەدینەوە دوورە.

٣) رواه ابوداود ١٤٢ والترمذي ٧٨٨ حديث صحيح.

٤) رواه البخاري ١٩٢٧ ومسلم ١١٠٦.

٥) رواه البخاري ١٩٢٥ء ١٩٢٦.

**٥- خوێن گرتن (کەڵەشاخ گرتن):**

(عن ابن عَبَّاسٍ قال احْتَجَمَ رسول اللَّهِ ﷺ وهو صَائِمٌ). [١] **عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: "پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵەشاخی گرتو بەڕۆژووش بوو".**

**بەڵام ئەگەر لە بەر لاوازی ترسی هەبوو ئەوە دروست نییە کاتی بە ڕۆژووبوون خوێن بگرێت** (عن ثَابِت الْبُنَانِيَّ يسأل أَنَسُ بن مَالِكٍ رضي الله عنه أَكُنْتُمْ تَكْرَهُونَ الْحِجَامَةَ لِلصَّائِمِ؟ قال لَا إلا من أَجْلِ الضَّعْفِ). [٢] **سابیتی بەنانی دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالیك کرد (ڕەزای خوای لێبێت) ئایا ئێوە کەلەشاخ گرتنتان بە چاك نەدەزانی بۆ ڕۆژووەوان؟ ئەنەسیش وتی: نەخێر مەگەر لەبەر لاوازی و بێ هێزی".**

**٦- سیواك کردن:**

(عن عبيد اللَّهِ بن عَامِرِ بن رَبِيعَةَ عن أبيه قال رأيت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْتَاكُ وهو صَائِمٌ مالا أَعُدُّ ولا أُحْصِي) [٣] **عەبدوڵڵای کوڕی عامیری کوڕی ڕەبیعە لە باوکییەوە دەیگێڕێتەوە کە وتوویەتی: "چەند جار کە لە ژمارە نایەت پێغەمبەرم ﷺ دیوە سیواکی دەکرد بە ڕۆژووش بوو".**

**٧- چاوڕشتن و بۆنی خۆش لە خۆدان و قەترەکردنە گوێ و چاو:**

**ئەمانە ڕۆژوو ناشکێنن، چونکە بەڵگەیەك نییە لەسەر ڕۆژوو شکان بەم شتانە ئەگەر پێیان بشکایە پێغەمبەر ﷺ و خوای گەورە ڕوونیان دەکردەوەو بۆمان، کە ئەوان لێی بێ دەنگ بوون، کەواتە ئەصڵ وایە نەیشکێنن.**

---

١) رواه البخاري ١٩٣٩ وابوداود ٢٣٥٥ والترمذي ٧٧٢.

٢) رواه البخاري ١٩٤٠.

٣) رواه ابوداود ٢٣٦٤ والترمذي ٧٢٥.

**نۆیەم: فەزڵو گەورەیی ڕۆژووگرتن**

**١ـ ئەوەی لە بەهەشتدا بۆ ڕۆژووەوانانە:**

(عن سَهْلٍ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال إِنَّ فِي الْجَنَّةِ بَابًا يُقَالُ له الرَّيَّانُ يَدْخُلُ منه الصَّائِمُونَ يوم الْقِيَامَةِ لَا يَدْخُلُ منه أَحَدٌ غَيْرُهُمْ يُقَالُ أَيْنَ الصَّائِمُونَ فَيَقُومُونَ لَا يَدْخُلُ منه أَحَدٌ غَيْرُهُمْ فإذا دَخَلُوا أُغْلِقَ فلم يَدْخُلْ منه أَحَدٌ).[١] سەهل (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "لەبەهەشتدا دەرگایەك هەیە پێی دەوترێت ڕەییان لە ڕۆژی دواییدا ڕۆژووەوانان لێیەوە دەچنە ژوورەوە جگە لەوان کەسی تر لێیەوە ناچێتە ژوورەوە، دەوترێت ڕۆژووەوانان کامەتان؟ ئەوانیش هەڵدەسنەوە، جگە لەوان کەسی تر لێیەوە ناچێتە ژوورەوە جا کە ئەوان چوونە ژوورەوە دەرگاکە دادەخرێت، ئیتر کەسی لێوە ناچێتە ژوورەوە".

**٢ـ ڕۆژوو قەڵغانە:**

(عن أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ عن النبي ﷺ قال من صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ جَعَلَ الله بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّارِ خَنْدَقًا كما بين السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ).[٢] ئەبوئومامەی باهیلی (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەرکەس ڕۆژێك لەبەر خوا بە ڕۆژوو بێت خوای گەورە خەندەقێکی بە قەدەر نێوان ئاسمانو زەوی لەنێوان ئەو کەسەو ئاگری دۆزەخدا دروست دەکات". واتە زۆر دووری دەخاتەوە لەوەی کە بچێتە دۆزەخ.

(قال عُثْمَان بن أبي الْعَاصِ رضي الله عنه سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول: الصِّيَامُ جُنَّةٌ كَجُنَّةِ أَحَدِكُمْ من الْقِتَالِ).[٣] عوسمانی کوڕی ئەبولعاس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: "ڕۆژوو قەڵغانە لە ئاگری دۆزەخ وەك قەڵغانی کەسیکتان لە جەنگدا ـ خۆی پێ دەپارێزێ ـ ".

---

١) رواه البخاري ١٨٩٦ ومسلم ١٠٢٧.

٢) رواه الترمذي ٤/١٦٧ (١٦٢٤) والطبراني في الكبير ٨/٢٨٠ (٧٩٢١) حديث حسن.

٣) رواه النسائي ٤/ ١٦٧ (٢٢٣١) وابن حزيمة في صحيحه ٣/١٩٣ (١٨٩) واحمد ٤/٢٢ حديث حسن.

(عن أبي سَعِيدٍ رضي الله عنه قال سمعت النبي ﷺ يقول من صَامَ يَوْمًا في سَبِيلِ اللَّهِ بَعَّدَ الله وَجْهَهُ عن النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا). [١] ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: "هەرکەس ڕۆژێك لەبەر خوا بە ڕۆژوو بێت خوای گەورە حەفتا ساڵ ـ ڕێگا ـ لە دۆزەخ دووری دەخاتەوە".

**٣ـ ڕۆژوو کەفارەتی گوناهەکانە:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ له ما تَقَدَّمَ من ذَنْبِهِ) ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەرکەس ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێت بە ئیمانو ئیخلاصەوە لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبوردرێ"". [٢]

**٤ـ بۆنی دەمی لە میسك خۆشترە لای خودا:**

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها عن النبي ﷺ قال: .... وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بيده لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ من رِيحِ الْمِسْكِ). [٣] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ".... سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای خوا لە بۆنی میسك خۆشترە".

**٥ـ ڕۆژووەوانان پاداشتیان بێشومارە:**

(عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ – رضى الله عنه – قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ يُضَاعَفُ الْحَسَنَةُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلاَّ الصَّوْمَ فَإِنَّهُ لِى وَأَنَا أَجْزِى بِهِ يَدَعُ شَهْوَتَهُ وَطَعَامَهُ مِنْ أَجْلِى لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ فَرْحَةٌ عِنْدَ فِطْرِهِ وَفَرْحَةٌ عِنْدَ لِقَاءِ رَبِّهِ. وَلَخُلُوفُ فِيهِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ »). [٤] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەموو کردەوە چاکەکانی ئادەمیزاد یەك بە دە تا یەك بە حەوت سەد پاداشتی زیاد دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت جگە لە ڕۆژوو، چونکە بێگومان ڕۆژوو هەر بۆ

---

١) رواه البخاري ٢٨٤٠ ومسلم ١١٥٣ والترمذي ١٦٢٣ والنسائي ٢٢٤٧.

٢) رواه البخاري ٧٥٩ وابوداود ١٣٧٢.

٣) رواه النسائي ١٦٧/٤ (٢٢٣٤) حديث صحيح.

٤) رواه مسلم ١١٥١ والنسائي ٢٢١٢ وابن ماجة ١٦٣٨ واحمد ٩٧٢٠.

منەو تەنیا منیش پاداشتی دەدەمەوە، وازدێنێ لە ئارەزوو خواردنی لەبەر مـن، ڕۆژووەوان دوو خۆشی بۆ هەیە، خۆشـییەکی کـاتی بـەربانگ کردنـەوەی و ڕۆژوو شـکاندنی خۆشـییەکەی تـری کاتی بە خزمەت پەروەردگار دەگات ـ لە قیامەتدا و پاداشتی ڕۆژووەکـەی دەبینێـت ـ وە بـۆنی دەمی ڕۆژووەوان ـ کاتێ بە ڕۆژووە ـ لای خوا لە بۆنی میسك خۆشترە".

## دەیەم: ئەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن:

### ١ـ خواردن و خواردنەوە:

ئەگەر کەسێ خوادرنی خوارد یا خواردنەوەی خواردەوە لە بیری بوو کە بە ڕۆژووە ئەوە ڕۆژووەکەی دەشکێت خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ﴾ البقرة: ١٨٧ واتە: بخۆن و بخۆنەوە تا سپیایی ڕۆژتان لە تاریکی شەو بۆ ڕوون دەبێتەوە لە بەرەبەیاندا، پاشان ڕۆژووەکانتان تەواو بکەن تاوەکو شەو خۆرئاوا دەبێت.

بەڵام ئەگەر لە بیری چوو خواردن و خواردنەوەی خوارد ئەوە ڕۆژووەکەی ناشکێت، (عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال قال رسول اللهِ ﷺ من نَسِيَ وهو صَائِمٌ فَأَكَلَ أو شَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ فإنَّمَا أَطْعَمَهُ الله وَسَقَاهُ).[1] وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "هەرکەس لە بیری نەبوو کە بە ڕۆژووە خواردنی خوارد یان خواردنەوەی خواردەوە ئەوە با ڕۆژووەکەی تەواو بکات ـ نەیشکێنێ ـ ئەوە بێگومان خوای گەورە خواردن و خواردنەوەی پێداوە".

### ٢ـ خۆڕشاندنەوە بە ئەنقەست:

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ النبي ﷺ قال من ذَرَعَهُ الْقَيْءُ فَلَيْسَ عليه قَضَاءٌ وَمَنْ اسْتَقَاءَ عَمْدًا فَلْيَقْضِ).[2] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی"هەرکەس ڕشانەوە زۆری بۆ هێنا ئەو ـ ڕۆژووەکەی ناشکێ و ـ گێڕانەوەی لەسەر نییە، بەڵام هەرکەس بە ئەنقەست خۆی ڕشاندەوە ئەوە ـ ڕۆژووەکەی دەشکێ و با ڕۆژووەکەی بگێڕێتەوە ".

---

١) رواه البخاري ١٩٢٩.

٢) رواه ابوداود ٧٧٦ والترمذي ٧٢٠ حديث صحيح.

**٣ـ حەیزو زەیسانی:**

با لە بەشێکی کۆتایی ڕۆژدا بێت ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە و زانایان لەسەری یەك دەنگن. (قال رسول الله ﷺ : أليس إذا حاضت المرأة لم تصل و لم تصم). [١] پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "ئەوە نییە ئافرەت کاتێ کەوتە بێ نوێژی نوێژ ناکات و ڕۆژوو ناگرێت..".

(عَنْ مُعَاذَةَ قَالَتْ سَأَلْتُ عَائِشَةَ فَقُلْتُ مَا بَالُ الْحَائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ وَلاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ فَقَالَتْ أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ قُلْتُ لَسْتُ بِحَرُورِيَّةٍ وَلَكِنِّي أَسْأَلُ. قَالَتْ كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ وَلاَ نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلاَةِ) [٢]. مەعازە دەڵێ: لە عائیشەم پرسی ڕەزای خوای لێبێت وتم ئەوە چییە ئافرەتی حەیزدار ڕۆژوو دەگێڕێتەوە، بەڵام نوێژ ناگێڕێتەوە؟ وتی: ئایا تۆ حەروورِیت؟ [٣] وتم من حەرووری نیم، بەڵکو پرسیار دەکەم، وتی: کی تووشی دەبووین فەرمانمان پێدەکرا ڕۆژوو بگێڕینەوە، بەڵام فەرمانمان پێ نەدەکرا نوێژ بگێڕینەوە".

**٤ـ دروست بوونی ژن و مێرد (جماع):**

دروست بوونی ژن و مێرد ڕۆژوو دەشکێنێ و کەفارەتیش دەکەوێتە سەر پیاوەکە.

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ النبي ﷺ إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ فقال يا رَسُولَ اللَّهِ هَلَكْتُ قال ما لك قال وَقَعْتُ على امْرَأَتِي وأنا صَائِمٌ و في رواية في رمضان فقال رسول اللَّهِ ﷺ هل تَجِدُ رَقَبَةً تُعْتِقُهَا قال لَا قال فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ قال لَا فقال فَهَلْ تَجِدُ إِطْعَامَ سِتِّينَ مِسْكِينًا قال لَا قال فَمَكَثَ النبي ﷺ فَبَيْنَا نَحْنُ على ذلك أُتِيَ النبي ﷺ بِعَرَقٍ فيه تَمْرٌ وَالْعَرَقُ الْمِكْتَلُ قال أَيْنَ السَّائِلُ فقال أنا قال خذ هذا فَتَصَدَّقْ بِهِ فقال الرَّجُلُ أَعَلَى أَفْقَرَ مِنِّي يا رَسُولَ اللَّهِ فَوَاللَّهِ ما بين لَابَتَيْهَا يُرِيدُ الْحَرَّتَيْنِ أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرُ من أَهْلِ بَيْتِي فَضَحِكَ النبي ﷺ حتى بَدَتْ أَنْيَابُهُ ثُمَّ قال أَطْعِمْهُ أَهْلَكَ). [٤] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا دانیشتبووین، لە پڕ پیاوێك هات و وتی: ئەی

---

١) رواه البخاري ٢٩٨ ومسلم ٨٠.

٢) رواه البخاري ٣٢١ ومسلم ٦٧/ ٣٣٥.

٣) حەرووری کۆمەڵێك بوون لە خەواریج دەیانوت دەبێ ئافرەت حەیزدار نوێژ بگێڕێتەوە.

٤) رواه البخاري ١٨٣٤ ومسلم ١١١١.

پێغەمبەری خوا ﷺ تیاچووم، فەرمووی: "چیتە؟" وتی: ڕەفاقەتی خێزانم کردووە لە کاتێکدا کە بە ڕۆژوو بووم ـ لە ریوایەتیکدا لە ڕەمەزاندا ـ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "کۆیلەیەکت هەیە ئازادی بکەیت؟" وتی: نەخێر، فەرمووی: "ئەی دەتوانی دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژوو بیت؟" وتی: نەخێر، فەرمووی: "ئەی هەتە خواردنی شەست هەژار بدەیت؟" وتی: نەخێر، ئەبوهورەیرە وتی: پێغەمبەر ﷺ ماوەیەك ڕاما ئەنجا ئێمە لەو حاڵەتەدا بووین زەمیلەیەك خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "کوا پرسیارکەرەکە؟" ئەویش وتی: ئا ئەمەتام، فەرمووی: "ئەمە ببەو بیبەخشە" پیاوەکە وتی: بیبەخشم بە لە خۆم هەژارتر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ دەی سوێند بە خوا لە نێوان دوو حەرەکەی مەدینەدا ماڵێکی تیدا نییە لە ماڵی من هەژارتر بێت، جا پێغەمبەر ﷺ پێکەنی تا دانەکانی پێشەوەی دەرکەوتن، پاشان فەرمووی: "بیدە بە ماڵو منداڵەکەت با بیخۆن".

**یازدەیەم: گێڕانەوەی ڕۆژوو**

**١ـ هەرکەس بە بیانوویەکی شەرعی ڕۆژووی شکاندووە دەبێت بیگێڕێتەوە:**

وەك نەخۆش و سەفەری و حەیزدارو زەیسان، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾ البقرة: ١٨٤ واتە: هەرکەستان نەخۆش بوو یا لە سەفەردا بوو ـ بەرۆژوو نەبوو ـ ئەوە پێویستە بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانە ـ بە ڕۆژوو نەبووە ـ بیگێڕێتەوە لە ڕۆژانی تردا.

بە بەڵگەی فەرمودەی موعاز کە کەمێ پێشتر باسمان کرد کە عائیشە دەڵێ: (كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ وَلاَ نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلاَةِ) [١]. دەکەوتینە ئەو حاڵەتە فەرمانمان پێدەکرا بە گێڕانەوەی ڕۆژوو، بەڵام فەرمانمان پێنەدەکرا بە گێڕانەوەی نوێژ".

**٢ـ کەسێ بمرێ و ڕۆژوویی لەسەر بووبێ:**

(عَنْ عَائِشَةَ رضى الله عنها أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ « مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ »). [١]

---

١) لە باسی حەیزو زەیسانایدا و فەرمودەکەش (رواه البخاري ٣٢١ ومسلم ٦٧/ ٣٣٥ دا.

عائیشه ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەرکەس مرد و ڕۆژوو قەرزار بوو با خزمەکانی ڕۆژووەکەی بۆ بگرنەوە".

**٣ـ پیری پەککەوتەو نەخۆشی درێژخایەن:**

ئەگەر پیری بەساڵاچوو پیاو بێت یا ئافرەت نەیدەتوانی ڕۆرژوو بگرێت ئەوە دەبێت خواردنی هەژارێك بدات بۆ هەر ڕۆژێك كە بە ڕۆژوو نابێت لە مانكی ڕەمەزاندا جگە لەووە هیچی تری لەسەر نییە نەخۆی نەکەسوکاری.

(عن عَطَاءٍ سمعت ابن عَبَّاسٍ يَقْرَأُ وَعَلَى الَّذِينَ يُطَوَّقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ قال ابن عَبَّاسٍ لَيْسَتْ بِمَنْسُوخَةٍ هو الشَّيْخُ الْكَبِيرُ وَالْمَرْأَةُ الْكَبِيرَةُ لَا يَسْتَطِيعَانِ أَنْ يَصُومَا فَيُطْعِمَانِ مَكَانَ كل يَوْمٍ مِسْكِينًا). [٢] عەتا دەڵێ بیستم لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ڕەزای خوای لێبێت ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە (وَعَلَى الَّذِينَ يُطَوَّقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ) عەبدوڵلا وتی: ئەم ئایەتە حوکمەکەی نەسڕاوەتەوە مەبەست بەو ئایەتە پیاوی پیر و پیرە ژنە کە ناتوانن بە ڕۆژوو بن بۆیە لە بری هەر ڕۆژێ خواردنی هەژارێك دەدەن".

**٤ـ ئافرەتی سکپڕو شیردەر:**

ئەگەر ئافرەتی شیردەر و سکپڕ ڕۆژوویان نەگرت لەبەر ترس لە خۆیان ئەوە تەنیا گێڕانەوەی ڕۆژووەکانیان لەسەرەو بەس بەڵگەی ئەم حاڵەتە: (عن أَنَسٍ الكَعْبِي رضي الله عنه عن رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى وَضَعَ عن الْمُسَافِرِ الصَّوْمَ وَشَطْرَ الصَّلَاةِ وَعَنْ الْحَامِلِ أو الْمُرْضِعِ الصَّوْمَ). [٣] ئەنەسی کەعبی ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "خوای گەورە ڕۆژوو نیوەی نوێژی لەسەر کەسی سەفەری لابردووە، ڕۆژووشی لەسەر ئافرەتی سکپڕو شیردەر لابردووە". ئەم فەرمودەیە ئەوە دەگەیەنێت کە کەسێ لە سەفەردا بێت نوێژ کورت دەکاتەوە و ڕۆژوو ناگرێت دواتر دەیگێڕێتەوە و سکپڕ و شیردەریش ڕۆژوو ناگرن و دواتر دەیگێڕنەوە.

---

١) رواه البخاري ١٨٥١ ومسلم ١١٤٧.

٢) رواه البخاري ٤٢٣٥.

٣) رواه الترمذي ٧١٥ وابوداود ٢٤٠٨.

بەڵام ئەگەر لەبەر منداڵەکەیان ڕۆژوویان نەگرت، وەك ئەوە ئافرەتە سکپڕە کە بترسێت منداڵەکەی لەبار بچێت یا شیردەرەکە بترسێت شیری نەبێت و منداڵەکەی تووشی زیان یا مردن بێت ئەگەر بە ڕۆژوو بن لەم حاڵەتەدا کە لە ترسی زیان گەیشتن بە منداڵەکانیان ڕۆژوویان نەگرت ئەوە دەبێت ڕۆژووەکانیان بگێڕنەوە و مودێکیش لە خواردنی زۆربەی خەڵکی ئەو شوێنە بکەن بە خێر.(عن ابن عباس {وعلى الذين يطيقونه فدية طعام مسكين} قال كانت رخصة للشيخ الكبير والمرأة الكبيرة وهما يطيقان الصيام أن يفطرا ويطعما مكان كل يوم مسكينا والحبلى والمرضع إذا خافتا (يعني على أولادهما ) أفطرتا وأطعمتا). بەڵگەی ئەم حاڵەتەش عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ ئەم ئایەتە: (وعلى الذين يطيقونه فدية طعام مسكين) ڕوخسەت بوو بۆ پیاوی پیرو ژنی پیر کە بە نارەحەتی دەتوانن ڕۆژوو بگرن بە ڕۆژوو نەبن‌و لە جیاتی هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك بدەن، هەروەها ئافرەتی دووگیان‌و شیردەریش ئەگەر ترسان ـ لە زیانی کەوتن بە منداڵەکانیان ـ ڕۆژووەکەیان دەشکێنن خواردن دەدەن".

**دوازدەیەم: حوکمی ئەوەی بەبێ عوزر ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان ناگرێت**

لەبەرئەوەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان پایەیەکە لە پایەکانی ئیسلام و یەکێکە لە فەرزە ڕوون‌و ئاشکراکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەوەی باوەڕی پێ نەبێت کافر دەبێت و لە بازنەی ئیسلام دەچێتە دەرەوە وەك هەڵگەڕاوە لە ئایین ڕەفتاری لەگەڵدا دەکرێت، داوای لێدەکرێت پەشیمان بێتەوە ئەگەر پەشیمان بوویەوە لێی وەردەگیرێ ئەگەرنا لە جیاتی ئەو ڕۆژنەگرتنە دەکوژرێ ئەم حوکمە کاتێ جێبەجێ دەکرێت ئەو کەسە تازە موسڵمان نەبوو بێت یا لە شوێنێکی دوور لە ئاوەدانی و زاناو شارەزایانی ئیسلام نەژیابێت ئەگەر هەرکام لەم دوو بیانوەی هەبوو ئەو ناکوژرێت، بەڵکو ئەبێ شارەزا کرێت‌و تێگەیەنرێت لە ئیسلام ئەگەر دوای ئەوە ڕۆژووی گرت ئەوە باشە ئەگەر نەیگرێت ئەوسا حوکم دەدرێت بە کوشتنی.

بەڵام ئەگەر ڕۆژوونەگرتنەکەی بەبێ عوزر بوو، بەڵام باوەڕی هەبوو ڕۆژوو واجبە، بەڵام ڕۆژووی نەدەگرت ئەوە فاسق‌و گوناهبارە دەبێت، بەڵام کافر نابێت، وە دەبێت کاربەدەستی موسڵمانان

بەندی بکات و خوادرنو خواردنەوەی لێ بگرێتەوە بە ڕۆژداو تاوەك ڕۆژووەوانی لێ بێت با بە ڕوالّەتیش بێت.

**سیازدەیەم: ڕۆژووی سوننەت**

گومانی تێدا نییە کە ڕۆژووی سوننەت لە عیباداتە هەرە گەورەو گرنگەکانە، (عن أبي سَعِيدٍ رضي الله عنه قال سمعت النبي ﷺ يقول من صَامَ يَوْمًا في سَبِيلِ اللَّهِ بَعَّدَ الله وَجْهَهُ عن النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا).[1] ئەبوسەعیدی خودری ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەر کەس ڕۆژێك لەبەر خوا بە ڕۆژوو بێت خوای گەورە حەفتا ساڵ ڕووی لە ئاگری دۆزەخ دوور دەخاتەوە".

**ـ لەبەرچی ڕۆژووی سوننەت دانراوە**

بۆ زیاتر بەندایەتی کردنو نزیك بوونەوە لەخوا، چونکە ئەنجامدانی هەر پەرستشێك مرۆڤ لە خوا نزیك دەکاتەوە ئەوەتە لە فەرموودەیەکی قودسییدا خوای گەورە دەفەرموێت: (وما يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إلي بِالنَّوَافِلِ حتى أُحِبَّهُ..).[2] "بەندەم بە سوننەت کردن بەردەوام لێم نزیك دەبێتەوە هەتا وای لێ دێ خۆشم دەوێ..". بێگومان خۆشەویستی خوای گەورەش بۆ بەندەکەی و نزیکی لێیەوە لە گوناه دووری دەخاتەوە لە گوێڕایەڵیو بەندایەتی نزیکی دەخاتەوەو کۆششی زیاتر دەکات لە ئەنجامدانی چاکەو خێردا ئەمەش وای لێ دەکات ببێتە کەسێکی ڕێكو ڕاست لە دنیاداو سەرکەوتوو لە دوارۆژدا.

ئێستاش ئەمانەی باسیان دەکەین هەندێکن لە ڕۆژووە سوننەتەکان لە ئایینی ئیسلامدا:

**١ـ ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە:** کە ڕۆژی نۆیەمی مانگی (ذي الحجة) دەکات کە ڕۆژی پێش جەژنی قوربانە بۆ هەموو موسڵمانان سوننەتە بەڕۆژوو بن جگە حاجی لەوکاتەدا لە حەجدایە.

(عن أبي قَتَادَةَ رضي الله عنه قال: سئل رسول الله ﷺ عن صوم عَرَفَةَ قال: يُكَفِّرُ السَّنَةَ الْمَاضِيَةَ والباقية).[3]

---

١) رواه البخاري ٢٦٨٥ ومسلم ١١٥٣.

٢) رواه البخاري ٦٥٠٢.

٣) رواه مسلم ١١٦٢.

ئەبو قەتادە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: دەربارەی رۆژووی رۆژی عەرەفە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا ئەویش فەرمووی: " گوناهی ساڵی رابردوو ساڵی داهاتووش دەسڕێتەوە".

بەڵام حاجی سوننەت نییە بەرۆژوو بێت، بەڵکو سوننەتە بە رۆژوو نەبێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ وای کردووە و بۆ ئەوەش لە رۆژی عەرەفەدا بەهێزبێ بۆ دوعاکردن‌و پاڕانەوە کە زۆر گەورەو خێرە لە عەرەفەدا.

(قال رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: ما من يَوْمٍ أَكْثَرَ من أَنْ يُعْتِقَ الله فيه عَبْدًا من النَّارِ من يَوْمِ عَرَفَةَ).[1] پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: "هیچ رۆژێك نییە بە قەدەر رۆژی عەرەفە خوای گەورە بەندەی تێدا ئازاد کات لە ئاگری دۆزەخ".

**٢- رۆژووی نۆو دەی موحەڕڕەم**

(عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: أن رسول الله ﷺ صام يوم عاشوراء وأمر بصيامه قالوا يا رسول الله إنه يوم تعظمه اليهود والنصارى فقال رسول الله ﷺ فإذا كان العام المقبل إن شـــاء الله صمنا اليوم التاسع قال فلم يأت العام المقبل حتى توفي رسول الله ﷺ).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رەزای خوای لێبێت دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ رۆژی عاشورا ـ دەی موحەڕڕەم ـ بە رۆژوو بوو فەرمانیشی کرد بە ـ موسڵمانان ـ بە رۆژووگرتنی".

عەرزیان کرد عاشورا رۆژێکە جوولەکەو گاور بە گەورەی دەگرن پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "ئینشائەڵڵا ساڵی داهاتوو رۆژی نۆیەمیش ـ موحەڕەم ـ بە رۆژوو دەبین". عەبدوڵڵا دەڵێ ساڵی داهاتوو نەهات پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد".

(عن أبي قَتَادَةَ رضي الله عنه قال: سئل رسول الله ﷺ عن صيام يوم عاشوراء فقال: يُكَفِّرُ السَّنَةَ الْمَاضِيَةَ).[3] ئەبوقەتادە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: دەربارەی رۆژووگرتنی رۆژی عاشورا پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: "گوناهی ساڵی پێشوو دەسڕێتەوە".

---

١) رواه مسلم ١٣٣٨.

٢) رواه البخاري ١٩٠٠ ومسلم ١١٣٠.

٣) رواه مسلم ١١٦٢.

**٣ـ ڕۆژووی دووشەممەو پێنجشەممە:**

(عن أسامة بن زيد قال إن نبي الله ﷺ كان يصوم يوم الاثنين ويوم الخميس وسئل عن ذلك فقال " إن أعمال العباد تعرض يوم الاثنين ويوم الخميس ").[١] ئوسامە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرا بۆچی ڕۆژی دووشەممەو پێنجشەممە بەڕۆژوو دەبی؟ فەرمووی: "کردەوەی بەندەکان هەموو هەفتەیەك دووجار رادەنوێنرێن ڕۆژی دووشەممەو ڕۆژی پێنجشەممە".

(عن عَائِشَةَ قال كان رسول اللَّهِ ﷺ يَتَحَرَّى صَوْمَ يَوْمِ الإثنين وَالْخَمِيسِ).[٢] هەروەها عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: "پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر مەبەستی بوو دووشەممەو پێنجشەممە بە ڕۆژوو بێت".

**٣ـ لە هەر مانگێکدا سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بوون:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ بِثَلَاثٍ صِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ من كل شَهْرٍ وَرَكْعَتَيْ الضُّحَى وَأَنْ أُوتِرَ قبل أَنْ أَنَامَ).[٣] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: خۆشەویستەکەم ڕایسپاردووم کە سێ شت بکەم: لە هەر مانگێکدا سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بوون ـ کردنی ـ دوو رکات نوێژی چێشتنگاو نەخەوم هەتا نوێژی ویتر نەکەم".

**٥ـ شەشەڵان ـ شەش ڕۆژی مانگی شەوال**

چاکتر وایە بەسەر یەکەوە بێت پاش ڕۆژی جەژن، بەڵام ئەگەر کەسێ بۆی نەکرا بەسەریەکەوە بیگرێت ئەوە جیا جیاو لە هەر کاتێکی مانگی شەوالدا بیگرێت دروستەو سوننەتە، بەڵام بەسەریەکەوە چاکترە. (عَنْ أَبِى أَيُّوبَ الأَنْصَارِىِّ - رضى الله عنه - قال أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ « مَنْ صَامَ رَمَضَانَ ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ كَانَ كَصِيَامِ الدَّهْرِ ).[٤]

---

١) رواه ابوداود ٢٤٣٦ والترمذي ٧٤٥ والنسائي ٢٣٥٧ وابن ماجه ٢٧٣٩.

٢) رواه الترمذي ٧٤٥ء ٧٤٧.

٣) رواه البخاري ١١٧٨ ومسلم ٨٥/ ٧٢١.

٤) رواه مسلم ١١٦٤.

ئەبوئەیوبی ئەنصاری ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەرکەسێ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێ، پاشان شەش ڕۆژیش لە مانگی شەوال ـ شەشەڵان ـ بگرێت ئەوە وەك ساڵەکە هەموو ڕۆژووبێ وایە".

**٦ـ ڕۆژووی مانگی موحەڕەم**

(عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ – رضى الله عنه – قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ« أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ وَأَفْضَلُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلاَةُ اللَّيْلِ»)[١] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "پەسەندترین ڕۆژوو دوای مانگی ڕەمەزان ڕۆژووی مانگی موحەرەمەو گەورەترین نوێژیش دوای فەرزەکان شەونوێژە".

**٧ـ ڕۆژووی مانگی شەعبان:**

عن عَائِشَةَ رضي الله عنها أنها قالت:(... ما رأيت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اسْتَكْمَلَ صِيَامَ شَهْرٍ قَطُّ إلا رَمَضَانَ وما رَأَيْتُهُ في شَهْرٍ أَكْثَرَ منه صِيَامًا في شَعْبَانَ)[٢] عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ نەدیوە بێجگە لە مانگی ڕەمەزان هەرگیز ڕۆژوو گرتنی هیچ مانگێکی تەواو کردبێ، وە نەمدیوە لە هیچ مانگێکدا بە قەدەر شەعبان بەڕۆژوو بێ".

**٨ـ نۆ ڕۆژی لە سەرەتای مانگی (ذي الحجة):**

(عن هُنَيْدَةَ بن خَالِدٍ عن امْرَأَتِهِ عن بَعْضِ أَزْوَاجِ النبي ﷺ قالت كان رسول اللَّهِ ﷺ يَصُومُ تِسْعَ ذِي الْحِجَّةِ).[٣] هونەیدەی کوڕی خالید لە خێزانییەوە لە یەکێك هاوسەرەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ هەمیشە نۆ ڕۆژی مانگ "ذی الحجة" بەڕۆژوو دەبوو".

**٩ـ ڕۆژی ناڕۆژێك:**

(عن عبد اللَّهِ بن عَمْرٍو رضي الله عنها فقال النبي ﷺ لَا صَوْمَ فَوْقَ صَوْمِ دَاوُدَ شَطْرُ الدَّهْرِ صِيَامُ يَوْمٍ وَإِفْطَارُ يَوْمٍ).[٤] ئەوە شێوەی ڕۆژوو گرتنی داود پێغەمبەرە "علیه السلام" عەبدوڵڵای

---

١) رواه مسلم ١١٦٣ واحمد ٢/ ٣٤٤ وابوداود ٢٤٢٩ والترمذي ٧٤٠ وابن ماجه١٧٤٢ والنسائي ٣/٢٠٦ .

٢) رواه البخاري ١٩٦٩ ومسلم ١١٥٦.

٣) رواه ابوداود ٢٤٣٧ حديث صحيح.

٤) رواه البخاری ١٩٨٠ ومسلم ١١٥٩.

کوری عەمر کوری عاص: ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "هیچ ڕۆژووگرتنێك لەسەرووی ڕۆژووگرتنی داودەوە نییە: نیوەی ساڵەکە ـ بە ڕۆژوو دەبوو ـ ڕۆژێك بە ڕۆژوو بەو ڕۆژێك بە ڕۆژوو مەبە".

وقال أيضا عبد اللَّهِ بن عَمْرٍو فقال النبي ﷺ (أَفْضَلَ الصِّيَامِ عِنْدَ اللَّهِ صَوْمَ دَاوُدَ عليه السَّلَام كان يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا)[١] هەروەها عەبدوڵڵای کوری عەمر ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "خۆشەویسترین ڕۆژوو لای خوا ڕۆژووی داود پێغەمبەر ـ علیه السلام ـ کە ڕۆژێك ڕۆژووی دەگرتو ڕۆژێك نەیدەگرت".

**چواردەیەم: ڕۆژووە قەدەغە کراوەکان**

پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەکانیدا ڕۆژووگرتنی لە چەند ڕۆژێکدا بە حەرام یا ناپەسەند "مکروە" داناوە، کە ئەمانەن:

**١ـ٢ ـ ڕۆژووی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژووی جەژنی قوربان:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نهى عن صِيَامِ يَوْمَيْنِ يَوْمِ الْأَضْحَى وَيَوْمِ الْفِطْرِ).[٢] ئەبوهورەیرە ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ دەڵێ: "پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕۆژوو بوونی دوو ڕۆژی قەدەغە کرد ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو ڕۆژی جەژنی قوربان".

**٣ـ سێ ڕۆژی پاش جەژنی قوربان: کە پێی دەڵێن "أيام التشريق":**

عن نُبَيْشَةَ الْهُذَلِيِّ رضي الله عنها قال قال رسول اللَّهِ ﷺ( أَيَّامُ التَّشْرِيقِ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ) وفي رواية (وَذِكْرٍ لِلَّهِ))[٣] نوبەیشەی هوزەلی ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا: فەرموویەتی: "سێ ڕۆژەی دوای جەژنی قوربان ڕۆژانی خواردنوخواردنەوەن "لە ریوایەتێکی تردا هاتووە" یاد کردنی خوای گەورەشن".

---

١) رواه البخاري ١١٣١ ومسلم ١١٥٩.

٢) رواه مسلم ١١٣٨.

٣) رواه مسلم ١١٤١.

**٤ـ ڕۆژی گومان لێکراو "یوم الشك":**

کە ڕۆژی سی شەعبانە کاتێ خەڵکی گومانیان هەبێ ئایا سی شەعبانە یان یەکەم ڕۆژی ڕەمەزانە؟ ئەوەش کاتێ دەبێ بینینی مانگ یەکلانەبوو بێتەوە، ئەوە نابێ تێدا ڕۆژوو بگیرێت‌و بە شەعبان دادەنرێت.

(عن عَمَّار بن ياسر قال: من صَامَ الْيَوْمَ الذي يُشَكُّ فيه فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ)[١] عەمماری کوری یاسر "ڕەزای خوای لێبێت" دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەر کەسێك ئەو ڕۆژە بە ڕۆژوو بێت کە گومانی تێدایە ـ ڕەمەزانە یا نا ـ ئەوە سەرپێچی ئەبولقاسیمی کردووە".ئەبولقاسیم واتە پێغەمبەر ﷺ.

بەڵام ئەگەر عادەتێکی خۆی هەبوو لە ڕۆژوو گرتندا ڕۆژووی گومان لێکراوەکە بەر ئەو عادەتەی کەوت ئەو گوناهی ناگات بەڕۆژوو بێت. بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە: (عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال لَا يَتَقَدَّمَنَّ أحدكم رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ أو يَوْمَيْنِ إلا أَنْ يَكُونَ رَجُلٌ كان يَصُومُ صَوْمَهُ فَلْيَصُمْ ذلك الْيَوْمَ).[٢] ئەبو هورەیرە" ڕەزای خوای لێبێت" دەڵێ: "پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "ڕۆژێ یا دوو ڕۆژ پێش ڕەمەزان بە ڕۆژوو مەبن مەگەر کەسێك باوو عادەتێکی هەبووبێ بکەوێتە ئەو ڕۆژانەوە ئەوە با بە ڕۆژوو بێ". وەکو ئەوەی کەسێك دووشەممان‌و پێنجشەممان بە ڕۆژوو بووبێ سی شەعبانیش یەکێك بێت لەو دوو ڕۆژە.

**٥ـ ڕۆژی هەینی بەتەنیا:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ لَا يَصُومُ أحدكم يوم الْجُمُعَةِ إلا أَنْ يَصُومَ قَبْلَهُ أو يَصُومَ بَعْدَهُ).[٣] پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: "هیچ کەسێکتان ڕۆژی هەینی ڕۆژوو نەگرێت مەگەر ڕۆژێ لە پێشەوە یا لە پاشیەوە ڕۆژوو بگرێت".

---

١) رواه ابوداود ٢٣٣٤ والترمذي ٦٨٦ حديث صحيح.

٢) رواه البخاري ١٩١٤ ومسلم ١٠٨٢.

٣) رواه البخاري ١٨٨٤ ومسلم ١١٤٤.

**٦ـ ڕۆژی شەممە بەتەنیا:**

(عن أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها إنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَكْثَرُ مَا كَانَ يَصُومُ مِنَ الأَيَّامِ يَوْمُ السَّبْتِ وَالأَحَدِ وَكَانَ يَقُولُ إِنَّهُمَا عِيدَانِ لِلْمُشْرِكِينَ وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَهُمْ). [١] ئوموسەلەم "ڕەزای خوای لێبێت" دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەزۆری ڕۆژانی شەممەو یەکشەممە بە ڕۆژوو دەبوو وە دەیفەرموو: ئەو دوو ڕۆژە ڕۆژانی جەژنی هاوبەشدانەرەکانن، بۆیە منیش دەمەوێ پێچەوانەیان ڕەفتار بکەم". ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێت ئەگەر بە تەنیا نەبێ دورستە، بەڵام بە تەنیا دورست نییە وەك لەم فەرموودەدا هاتووە (عن عبد اللَّهِ بن بُسْرٍ السُّلَمِيِّ عن أُخْتِهِ وقال يَزِيدُ الصَّمَّاءِ أَنَّ النبي ﷺ قال لَا تَصُومُوا يوم السَّبْتِ إلا في ما افْتُرِضَ عَلَيْكُمْ وَإِنْ لم يَجِدْ أحدكم إلا لِحَاءَ عِنَبَةٍ أو عُودَ شَجَرَةٍ فَلْيَمْضَغْهُ). [٢] عەبدوڵڵای کوری بوسری سولەمی لە خوشکەکەیەوە "ڕەزای خوای لێبێت" دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "ڕۆژی شەممە ڕۆژوو مەگرن جگە لەوەی فەرزکراوە لەسەرتان، خۆ ئەگەر کەسێکتان هیچی دەست نەکەوت جگە لە توێکڵی دەنکە ترێیەك یا چوڵکەدارێك با بیهەجوێت".

**٧ـ هەموو ڕۆژەکانی ساڵ:**

(عن عَبْدَ اللَّهِ بن عَمْرِو بن الْعَاصِ رضي الله عنهما يقول بَلَغَ النبي ﷺ أَنِّي أَصُومُ أَسْرُدُ... فقال: لَا صَامَ من صَامَ الْأَبَدَ لَا صَامَ من صَامَ الْأَبَدَ لَا صَامَ من صَامَ الْأَبَدَ). [٣] عەبدوڵڵای کوری عەمری کوری عاص "ڕەزای خوای لێبێت" دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەواڵیان پێدا کە من بەردەوام ڕۆژوو دەگرم پێی وتم: "هەر کەسێ هەمیشە بەڕۆژوو بێ ڕۆژووی نەگرتووە." سێ جار ئەم وتەیەی دووبارە کردەوە.

**٨ـ ئافرەت بەبێ ڕەزامەندی مێردی ڕۆژووی سوننەت بگرێ:**

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ عن النبي ﷺ لَا تَصُومُ الْمَرْأَةُ وَبَعْلُهَا شَاهِدٌ إلا بِإِذْنِهِ). [٤] ئەبو هورەیرە: "ڕەزای

---

١) رواه احمد ٦/ ٣٢٣ وابن خزيمة ٢١٦٧ والحاكم ١٦٣٥ وابن حبان ٣٦١٦.

٢) رواه ابوداود ٢٤٢١ والترمذي ٧٤١ صحيحة.

٣) رواه البخاري ١٩٧٧ ومسلم ١١٥٩.

٤) رواه البخاري ٥١٩٢ ومسلم ١٠٢٦ وابوداود ٢٤٤١ والترمذي ٧٧٩.

خوای لێبێت" دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئافرەت بۆی ڕەوانییە مادام مێردەکەی لە ماڵەوە بێت بەبێ ڕێپێدانی مێردەکەی بە ڕۆژوو ـ ی سوننەت ـ بێت".

**٩ـ نیوەی دووەمی مانگی شەعبان:**

بۆ کەسێ نەبی کە عادەتی هەبوو بێت، یا قەرزار بێتو بیگرێتەوە، (عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال إذا انْتَصَفَ شَعْبَانُ فلا تَصُومُوا). [١] ئەبو هورەیرە "ڕەزای خوای لێبێت" دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: "هەرکات شەعبان نیوە بوو ئیتر بە ڕۆژوو مەبن". بەڵام ئەگەر کەسێك عادەتی هەبوو ئەوە قەیناکا وەك لە فەرموودەکەی ئەبوهورەیرەدا کە باسکرا هاتووە. [٢]

## پازدەیەم: ئیعتیکاف

**١ـ پێناسەی ئیعتیکاف:**

لە زمانی عەرەبی دا (اعتكاف) برتییە لەمانەوەو پەیوەست بوون بە شوێنێکەوە یا بە شتێکەوە.

**لە شەرعیش دا:** بریتییە لە مانەوەی کەسێکی تایبەت بەشێوەیەکی دیاری کراو لە مزگەوتدا. [٣]

**٢ـ بەڵگەی دانان و دروستی ئیعتیکاف:**

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمۡ عَٰكِفُونَ فِي ٱلۡمَسَٰجِدِ﴾ **البقرة:** ١٨٧ واتە: لەکاتێکدا لە مزگەوتەکاندا لە ئیعتیکاف دان مەچنە لای خێزانەکانتان ـ سەرجێیان لەگەڵ مەکەن ـ.

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّ النبي ﷺ كان يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْآوَاخِرَ من رَمَضَانَ ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ من بَعْدِهِ) عائیشەوە "ڕەزای خوای لێبێت" دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دە شەوو ڕۆژی

---

١) رواه ابوداود ٢٣٢٠ والترمذي ٧٣٥ وابن ماجة ١٦٥١ صحيحة.

٢) بڕوانە خاڵی (٤) لەم باسەدا کە فەرموودەکەش (رواه البخاري ١٩١٤، ومسلم ١٠٨٢) دا هێناویانە.

٣) بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري ٨٠٥/٤ وبداية المجتهد ونهاية المقتصد ٥٥٩/١).

کۆتایی ڕەمەزان ـ لە مزگەوتدا ـ ئیعتیکافی دەکرد، پاشان خێزانەکانیشی لەدوا ئەو ئیعتیکافیان دەکرد".[١]

ئیعتیکاف لەو عیبادەتە دێرینانەیە لە ئایینەکانی پێش ئیسلامیشدا هەبووە بەبەڵگەی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾ البقرة: ١٢٥. واتە: ئێمە سپاردمان بە ئیبراهیمو ئیسماعیل "علیهما السلام" کە ماڵەکەم ـ کەعبە ـ پاك بکەنەوە بۆ تەوافکەرانو ئیعتیکافکەرانو کوڕنووش بەرانو سوژدەبەران.

**٣ـ بۆچی ئیعتیکاف دانراوە:**

ئیماندار دەبێت بەیناو بەین هەوڵبدات نەفسی لەئارەزووە حەڵاڵەکانی بگرێتەوەو بۆ ماوەیەك خۆی یەکلاکاتەوە بۆ بەندایەتی و بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار تا بگاتە پلەیەك ببێتە خۆشەویستی خوای گەورە، ڕەزامەندی خوا نەگۆڕێتەوە بە هیچ شتێکی تر لە دونیاو ئارەزووەکانی دونیا. نەفسی ئادەمیزادیش هەردەم مرۆڤ بەرەو خراپە دەبات ﴿إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّىٓ﴾ یوسف: ٥٣. واتە بێگومان نەفس زۆر فەرمانکەرە بە خراپە مەگەر نەفسی کەسێ خوا ڕەحمە پێ کردبێ. دونیاش بە ئارەزوو شتە بریقو باقەکانی خەڵەتێنەری ئادەمیزادەو ناتوانرێت ڕێگری لێ بکرێتو جڵەوی بگیرێت بەم پەروەدەکردنە نەبێت بە تەنیایی و خۆ تەرخانکردن بۆ بەندایەتی لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوادا.

**٤ـ حوکمی ئیعتیکاف:**

زانایان یەك دەنگنو جیاوازیان نییە لەوەدا کە ئیعتیکاف کردن سوونەتەو فەرز نییە.

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها زَوْجِ النبي ﷺ أَنَّ النبي ﷺ كان يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الآوَاخِرَ من رَمَضَانَ).[٢] عائیشە "ڕەزای خوای لێبێت" دەڵێ: "پێغەمبەری خوا ﷺ دە شەوو ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان ئیعتیکافی دەکرد". بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی نەکردووە بە

---

١) رواه البخاري ١٩٢٢ ومسلم ١١٧٢.

٢) سەرچاوەکانی پێشوو.

موسوڵمانان کە هەموویان ئیعتیکاف بکەن، بەڵکو هەرکامیان ویستوویەتی کردوویەتی ئەوەش نەیکردبێ هیچ رەخنەیەکی لێ نەگیراوە.

**٥ـ ئیعتیکاف دەبێت لە مزگەوتدا بێت:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَٰجِدِ ﴾ البقرة: ١٨٧ واتە: لە کاتێکدا لە مزگەوتەکاندا لە ئیعتیکاف دان مەچنە لای خێزانەکانتان. بە بەڵگەی ئەم ئایەتە جەماوەری زانایان دەڵێن ئیعتیکاف دەبێت لە مزگەوتدا بێتو پێغەمبەر ﷺ و خێزانەکانیشی لە مزگەوتدا ئیعتیکافیان کردووە وەك پێشتر باسمان کرد.[1]

**٦ـ مەرجەکانی ئیعتیکاف:**

مەرجە ئەو کەسەی ئیعتیکاف دەکات موسوڵمانو بالغو عاقل بێت. (قال رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ رُفِعَ الْقَلَمُ عن ثَلَاثَةٍ عن الصَّبِيِّ حتى يَبْلُغَ وَعَنْ النَّائِمِ حتى يَسْتَيْقِظَ وَعَنْ الْمَجْنُونِ حتى يَعْقِلَ).[2] پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "نووسینی تاوان لەسەر سێ کەس لابراوە: منداڵ تابالغ دەبێت، خەوتوو تا هەڵدەسێت، شێت تا چاك دەبێتەوە". وە خاوێن بێت لە لەش گرانیو بێ نوێژی و زەیسانی، چونکە بەلای جەماوەری زانایانەوە ئیعتیکاف دەبێت لە مزگەوتدا بێت لەش گرانیو بێ نوێژیش دروست نییە بچنە مزگەوتەوە لەبەر ئەوە دروست نییە بۆیان ئیعتیکاف بکەن.

**٧ـ پایەکانی ئیعتیکاف:**

ئیعتیکاف لەدوو پایی بنەڕەتی پێك دێت:

**أ ـ نیێتو مەبەست بوون:** لەسەرەتاوە نییەتی هەبێت ماوەیەکی دیاری کراو لە مزگەوت دا بمێنێتەوە بە مەبەستی بەندایەتی. (قال رسول الله ﷺ إِنَّمَا الآعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ).[3] پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: "بێگومان کردەوەکان بە نییەتەکانیانەوەیە".

---

١) بڕوانە (بداية المجتهد ١/ ٥٥٩، بەڵام ئەبوحەنیفە بەلایەوە دروستە بۆ ئافرەت کە لەو ژوورەی نوێژی تێدا دەکات لە ماڵەکەیدا ئیعتیکافی تێدا بکات. فتح الباری ٣٤٦/٥.

٢) رواه ابوداود ٤٤٠٣ صحيحه.

٣) رواه البخاري ١ ومسلم ١٩٠٧.

**ب ـ مانەوە لەمزگەوتدا:** دەبێت ئەوەند بمێنێتەوە کە پێی بوترێت مانەوە بە عورفو عادەت و بە مەبەستی بەندایەتی بمێنێتەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمۡ عَٰكِفُونَ فِي ٱلۡمَسَٰجِدِ ﴾ البقرة: ١٨٧ واتە: لەکاتێکدا لەمزگەوتەکاندا لە ئیعتیکاف دان مەچنە لایان ـ واتە سەرجێی لەگەڵ ژنەکانتاندا مەکەن ـ نابێ ئەو کەسەی لەئیعتیکافدایە لەمزگەوت بچێتە دەرەوە بۆ کاری زۆر پێویست نەبێ ئەوەتا عائیشە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: (کان رسول اللَّهِ ﷺ لَيُدْخِلُ عَلَيَّ رَأْسَهُ وهو فِي الْمَسْجِدِ فَأُرَجِّلُهُ وكان لَا يَدْخُلُ الْبَيْتَ إلا لِحَاجَةٍ إذا كان مُعْتَكِفًا) [١] "پێغەمبەر ﷺ خۆی لە مزگەوتدا بوو سەری دەهێنایە ژوورەوە منیش سەریم شانە دەکرد، ئەگەر لە ئیعتیکاف دابوایە نەدەهاتەماڵەوە بۆ کاری پێویست نەبێ".

**٨ـ ئیعتیکاف لە رەمەزاندا گەورەیە بەتایبەت لەدەی کۆتاییدا:**

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّ النبي ﷺ كان يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الآوَاخِرَ من رَمَضَانَ ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ من بَعْدِهِ) [٢] عائیشە "رەزای خوای لێبێت"دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لە دە ـ شەوو رۆژ ـ ی کۆتایی رەمەزاندا ئیعتیکافی دەکرد تا وەفاتی کرد، پاشان لە دوای خۆی خێزانەکانیشی ئیعتیکافیان دەکرد".

**٩ـ سوننەتە کۆشش کردن لە بەندایەتیدا لە دەی کۆتایی رەمەزاندا:**

(عن عَائِشَةَ أَنَّ النبي ﷺ كان إذا دخل الْعَشْرُ أَحْيَا اللَّيْلَ وَشَدَّ الْمِئْزَرَ وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ) [٣] عائیشە "رەزای خوای لێبێت" دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە دە شەوی کۆتایی رەمەزان بهاتایە خۆی کۆدەکردەوە ـ خۆی گورج دەکردەوە ـ شەوەکانی زیندوو دەکردەوەو خاوخێزانی بەخەبەر دەهێنا ـ بۆ بەندایەتی کردن ـ".

---

١) رواه البخاري ٢٠٢٩ ومسلم ٢٢٩٧.

٢) رواه البخاري ٢٠٢٦ ومسلم ٥/ ١١٧١.

٣) رواه البخاري ٢٠٢٤ ومسلم ١١٧٤.

**١٠ـ سوننەتە ئەو شەوانەی گومانی شەوی قەدری لێ دەکرێ زیندوو بکرێتەوە:**

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من يَقُمْ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ له ما تَقَدَّمَ من ذَنْبِهِ)[١] ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "هەر کەس شەوی قەدر هەستێو زیندووی کاتەوە بە ئیمانو بە هیوای پاداشتی پەروەردگارەوە خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت".

**١١ـ دوعای شەوی قەدر:**

ئەگەر کەسێك شەوی قەدری زیندوو کردەوە سوننەتە ئەم دوعایە بڵێ: (عن عَائِشَةَ رضي الله عنه قالت: قلت يا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إن عَلِمْتُ أَيُّ لَيْلَةٍ لَيْلَةُ الْقَدْرِ ما أَقُولُ فيها؟ قال: قُولِي: اللهم إِنَّكَ عُفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي) عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر زانیم شەوی قەدر چ شەوێکە چی بڵێم تێیدا؟ فەرمووی بڵێ" اللهم إِنَّكَ عُفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي"[٢] واتە: خوایە گیان بە ڕاستی تۆ لێبووردەیو حەزیشت لە لێبووردنە دەی لێم ببوورە و لێم خۆشبە.

**ئیعتیکاف بە چی هەڵدەوەشێتەوە**

ئیعتیکاف بەیەکێك لە مانەی باسی دەکەین هەڵدەوەشێتەوە:

١ـ ڕۆشتنە دەرەوە لە مزگەوت بە ئەنقەستو بەبێ بوونی پێویستێك. چونکە مانەوە لە مزگەوتدا مەرجە بۆ ئیعتیکاف. " .

٢ـ پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام، کە لەگەڵ بەندایەتیدا یەك ناگرێتەوە خوای گەورە دەفەرموێ: " ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ الزمر: ٦٥". واتە: ئەگەر هاوبەشە پەیدا بکەیت، کردەوە چاکەکانت پوچەڵ دەبێتەوە.

٣ ـ ٤ـ نەمانی عەقڵ بەشێت بوونو سەر خۆش بوون.

٥ـ ٦ـ حەیزو زەیسانی: ئەم دووانەش ئیعتیکاف بەتاڵ دەکەنەوە ئەگەر ئافرەت تووشی بوو.

٧ـ جووت بوونی ژنو پیاو (جماع): خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ﴾ البقرە: ١٨٧

واتە: لە خێزانەکانتان نزیك مەکەونەوە لە کاتی ئیعتیکاف لە مزگەوتدا.

---

١) رواه البخاري ٣٥ ومسلم ٧٦٠.

٢) رواه الترمذي ٣٥١٣ وابن ماجة ٣٨٥٠ حديث صحيح.

# کتێبی زەکـات

### یەکەم: پلەو پایەیی زەکات لەئاینی ئیسلامدا:

زەکات فەرزێکە لەفەرزەکانی ئاینو وە پایەکە لەپایەکانی. (عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما قال قال رسول اللَّهِ ﷺ بُنِيَ الْإِسْلَامُ على خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله وَأَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَالْحَجِّ وَصَوْمِ رَمَضَانَ).[١] عەبدوللای کوڕی عومەر "ڕەزای خوایان لێبێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەرزێنردراوە: شایەتوومان هێنان بەوەی کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە و کە موحەممەد ﷺ نێردراوی خوایەو نوێژ بەرپاکردن و زەکات دانو حەجی ماڵی خواو گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان".

### دووەم: گەورەیی زەکات:

ناوی زەکات کە لەم دووڕشمە نراوە گەورەی ئەم دووڕشمە دەگەیەنێ کە لەلایەکەوە مانای پاکیو زیاد بوون دەگەیەنێ وەك قورئان دەفەرموێ: ﴿ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ﴾ التوبة: ١٠٣ واتە: ئەی موحەممەد ﷺ لەماڵو سامانیان صەدەقەیەك وەربگرە بەهۆیەوە پاکیان دەکەیتەوە ـ گوناە ـ و دڵیان پوختو خاوێن دەکەیت بەو ماڵ بەخشینە.

زەکاتو ماڵ بەخشین پاك بوونەوەو گەشەکردنە بۆ دەوڵەمەندو هەژار بۆ خۆیانو ماڵو سامانیان وە مایەی رزگاریو سەر فرازییە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرۡبُواْ عِندَ ٱللَّهِۖ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن زَكَوٰةٖ تُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ ﴾ الروم: ٣٩

---

١) رواه البخاري ٨ و مسلم ١٩/ ١٦.

واتە: هەر زەکاتو خێرێك داوتانە و مەبەستان ڕەزامەندی خوا بووە ئا ئەوانە ـ پاداشتیان ـ دوو چەندان دەکەینەوە.

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من تَصَدَّقَ بِعَدْلِ تَمْرَةٍ من كَسْبٍ طَيِّبٍ ولا يَقْبَلُ الله إلا الطَّيِّبَ وَإِنَّ اللَّهَ يَتَقَبَّلُهَا بِيَمِينِهِ ثُمَّ يُرَبِّيهَا لصاحبها كما يُرَبِّي أحدكم فَلُوَّهُ حتى تَكُونَ مِثْلَ الْجَبَلِ)[١] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "هەر کەس بەئەندازەی دەنکە خورمایەك ماڵی بە حەڵاڵ پەیدا کراو ببەخشێت ـ خواش ماڵ پاكو حەڵاڵ وەری ناگرێت ـ بە دەستی ڕاستی وەری دەگرێو پاشان گەورەی دەکات بۆ خاوەنەکەی وەك چۆن کەسێکتان جوانوویەك بەخێودەکاتو گەورەی دەکات هەتا ـ ماڵە بەخشراوەکە ـ بەقەدەر ئوحودی لێ دێ".

**سێیەم: کەی زەکات فەرز بوو:**

سەرەتا زەکات بەرەهایی فەرمانی پێکرا بوو هیچ مەرجو شەرتێکی نەبوو و ئەندازەو ڕێژەو ساڵ تێپەرینی بۆ دیاری نەکرابوو ئایەتەکانی قۆناغی مەککە دەربارەی ماڵ بەخشین لەم جۆرە بوون وەك: ﴿ طسٓۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ۝١ هُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴾ النمل: ١ ـ ٣ واتە: ئەمە ئایەتەکانی قورئانو کتێبی ئاشکرایە هۆی ڕێنموونیو مژدەدانە بۆ باوەڕداران ئەوانەی کە نوێژ بەجێ دێننو زەکات دەدەنو ئەوانەی باوەڕی بتەویان بە ڕۆژی دوای هەیە.

جا قوناغی مەدینە هات لە ساڵی دووەمی کۆچیدا زەکات بە هەموو باسو بەشە پەیوەندی دارەکانیەوە لە ساڵی دووەمی کۆچیدا فەرز کرا.

---

١) رواه البخاري ١٤١٠ ومسلم ١٠١٤.

**چوارەم: بەڵگەی پێویست بوونی زەكات**

زەكات پایەكی گرنگی ئیسلامە ئەوەندە بەڵگەی بەهێز لەسەر واجبیەتی هەیە كە چووتە ریزی ئەو بابەتانەوە كە زۆر روونو ئاشكران لە ئیسلامدا كە هەركەس ئینكاریان لێ بكات كافر دەبێت و لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە، ئەمانەش هەندێكن لەو بەڵگانە پێویست "واجب" بوونی:

قورئان دەفەرموێ: ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ البقرة: ٤٣ واتە: نوێژ بە چاكی بكەنو زەكات بدەن. قورئان لە چەندین شوێندا فەرمان دەكات بەزەكات دان، لە سی و دوو جێگادا وشەی زەكات هاتووە لە قورئاندا. لە سوننەتی پێغەمبەریشدا ﷺ بەڵگەی واجب بوونی زۆرە یەكێكان ئەم فەرموودەیە:

(عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما قال قال رسول اللَّهِ ﷺ بُنِيَ الْإِسْلَامُ على خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله وَأَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَالْحَجِّ وَصَوْمِ رَمَضَانَ)[1] پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "ئیسلام لەسەر پێنج ـ پایە ـ دامەزرێنردراوە: شایەتومان كە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێكی راست نییە و موحەممەدیش پێغەمبەرە ﷺ نوێژ كردنە و زەكاتدانە و حەجی ماڵی خوایە وەرگرتنی رۆژووی رەمەزانە".

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال قال رسول اللَّهِ ﷺ لِمُعَاذِ بن جَبَلٍ حين بَعَثَهُ إلى الْيَمَنِ إِنَّكَ سَتَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ فإذا جِئْتَهُمْ فَادْعُهُمْ إلى أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله وَأَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللَّهِ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لك بِذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قد فَرَضَ عليهم خَمْسَ صَلَوَاتٍ في كل يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لك بِذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قد فَرَضَ عليهم صَدَقَةً تُؤْخَذُ من أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ على فُقَرَائِهِمْ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لك بِذَلِكَ)[2] عەبدوڵلای كوڕی عەبباس "رەزای خوای لێبێت" دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە موعازی كوری جەبەل فەرموو كاتێ ناردی بۆ یەمەن: "بێگومان تۆ دەچیتە لای كۆمەڵێك لە خاوەنەكان كتێبەكان ـ گاورو جوولەكە ـ، جا كاتێ چوویتە ناویان بانگیان بكە بۆ ئەوەی شایەتوومان بێنن، كە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێكی راست نییە و موحەممەدیش

---

١) رواه البخاري ٨ ومسلم ١٦.

٢) رواه البخاري ٤٣ ٤٧ ة ١٣٩٥ و ١٤٥٨ ومسلم ١٩.

ﷺ نێردراوی خوایە، جا ئەگەر ئەمەیان بەگوێ کردی ئەوە پێیان بڵێ: بێگومان خوا لەشەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون، جا ئەگەر ئەوەشیان بە گوێ کردی ئەوە پێیان بڵێ: بێگومان خوا زەکاتێکی لەسەر فەرز کردوون کە لە دەوڵەمەندەکانیان دەسەنرێتو دەدرێت بە هەژارەکانیان، جا ئەگەر ئەمەشیان بەگوێ کردی....".

**پێنجەم: حوکمی زەکات نەدەر**

**أ ـ ئەوەی باوەڕی بە زەکات نییە:** وتمان زەکات یەکێکە لەپایەکانی ئاینی ئیسلام پاش شایەتومانو نوێژ سێیەم پایەی ئیسلامە. لەبەر ئەوە زانایانی ئیسلام یەك دەنگن لەسەر ئەوەی هەر کەس دانی پێدا نەنێو باوەڕی پێی نەبێت ئەوە کافر دەبێت لە ئاین هەڵگەڕاوەتەوە، ئەگەر تەوبە نەکاتو پەشیمان نەبێتەوە خوێنی حەڵاڵەو دەکوژرێت.

ئیمامی نەوەوی لە ئیمامی خەتابیەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: بێگومان هەر کەس داننەنێ بەوەدا کە زەکات فەرزە لەم سەردەمانەدا ئەوە بەیەك دەنگی زانایان کافرە.... وە لە ناو موسوڵمانان فەرز بوونی زەکات ئەوەندە ڕوونو ئاشکرایە هەموو کەس دەیزانێو زاناو نەزان تێیدا یەکسانن، لەبەرئەوە کەس بیانووی نییە بڕو بیانو بێنێتەوە بۆ دانپێدانەنانی. هەروەها بۆ هەر شتێکی تریش یەك دەنگ زانایانی لەسەر بێ لەکاروباری ئاین دا.. [1]

ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەڵێ: "باوەڕ نەبوونو داپێدا نەنانی ئەوەی کە زەکات فەرزە کوفرە". [2]

**ب ـ حوکمی ئەوەی لەبەر ڕژدەییو ڕەزیلی زەکات نادات:**

بەڵام ئەگەر کەسێ زەکات نەدات لەبەر ڕەزیلیو چروکی، بەڵام باوەڕی پێی هەبێو بە فەرزی بزانێت ئەوە گوناهبارە دەبێو سزای سەختی دوارۆژی بۆ هەیە وەك لەم ئایەتە پیرۆزانەدا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ

---

١) شرح صحيح مسلم ١/ ٢٠٥.

٢) فتح الباري شرح صحيح البخاري ٣/ ٢٦٢.

﴿فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ٣٤ يَوۡمَ يُحۡمَىٰ عَلَيۡهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكۡوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمۡ وَجُنُوبُهُمۡ وَظُهُورُهُمۡۖ هَٰذَا مَا كَنَزۡتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡنِزُونَ﴾

التوبة:٣٤- ٣٥. واتە: ئەوانەی ئاڵتوونو زیو سەر یەك دەنێنو كۆی دەكەنەوەو لەرێی خوادا بەختی ناكەن ئەوە مژدەیان پێی بدە بەسزایەكی پڕ ئێشو ئازار ـ ماڵو سامانەكەیان ـ لەو رۆژەدا لەئاگی دۆزەخدا سوور دەكرێتەوە ئەنجا روومەتو تەنیشتو پشتیانی پێ داخ دەكرێ ـ پێیان دەوترێ ـ ئەمە ئەو سامانەیە كۆتان دەكردەوە بۆ خۆتان دەی بیچەژن ـ تۆڵە ـ ئەوەی كۆتان دەكردەوە.

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من آتاهُ الله مَالًا فلم يُؤَدِّ زَكَاتَهُ مُثِّلَ له يوم الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ له زَبِيبَتَانِ يُطَوَّقُهُ يوم الْقِيَامَةِ ثُمَّ يَأْخُذُ بلهزميه يَعْنِي شدقيه ثُمَّ يقول أنا مَالُكَ أنا كَنْزُكَ ثُمَّ تَلَا ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾ آل عمران: ١٨٠.[١] ئەبوهورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: "هەر كە خوا ماڵو سامانی پێ ببەخشێو زەكاتی لێ نەدات رۆژی دوایی ئەو سامانە بۆی دەبێتە نێرە مارێكی كەچەڵ كە دوو خاڵی رەش لەپشت چاوەكانییەوەیە رۆژی دوایی لە ملی دەئاڵێو پاشان بە قەپ هەردوو شەویلكەی دەگرێو دەڵێ: من ماڵە كۆكراوەكەت منم ماڵكەت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (ولا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ......).

واتە: ئەوانەی ئاڵتون و زیوو سەریەك دەنێنو كۆی دەكەنەوە و لە رێی خوادا بەختی ناكەن ئەوە مژدەیان پێ بدە بە سزایەكی پڕ ئێش و ئازار (ماڵ و سامانەكەیان) لەو رۆژەدا لە ئاگری دۆزەخدا سور دەكرێتەوە ئەنجا روومەت و تەنیشت و پشتیانی پێ داخ دەكرێ - پێیان دەوترێت- ئەمە ئەو سامانەیە كۆتان دەكردەوە بۆ خۆتان دەی بیچەژن- تۆڵەی- ئەوەی كۆتان دەكردەوەو ، (عن أبي هريرة قال لما توفي رسول الله ﷺ واستخلف أبو بكر رضي الله عنه بعده

---

١) رواه البخاري ١٣٣٨.

وكفر من كفر من العرب قال عمر بن الخطاب رضي الله عنه لأبي بكر رضي الله عنه كيف نقاتل الناس وقد قال رسول الله ﷺ أمرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا لا آله الا الله فمن قال لا آله الا الله فقد عصم مني ماله ونفسه الا بحقه وحسابه على الله فقال أبو بكر رضي الله عنه والله لأقاتلن من فرق بين الصلاة والزكاة فإن الزكاة حق المال والله لو منعوني عقالا كانوا يؤدونه إلى رسول الله ﷺ لقاتلتهم على منعه قال عمر بن الخطاب رضي الله عنه فوالله ما هو الا أن رأيت الله قد شرح صدر أبي بكر للقتال فعرفت أنه الحق)[1] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: "پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد دوای ئەو ئەبوبەکر بوو بە جێنشینی کۆمەڵێ لە عەرەبەکان لەئیسلام هەڵگەڕانەوە، عومەر ڕەزای خوای لێبێت وتی بە ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێ بێت): چۆن دەجەنگی دژی ئەو خەڵکە؟ لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "فەرمانم پێدراوە دژی خەڵکی بجەنگم هەتا دەڵێن "لا اله الا الله" ئەنجا ئەبوبەکر "ڕەزای خوای لێبێت" وتی: سوێند بەخوا دەجەنگم دژ بەوانەی نوێژو زەکات لەیەك جیادەکەنەوە، چونکە زەکات مافی ماڵو سامانە. سوێند بە خوا ئەگەر کارە بچکۆلەیەکم پێ نەدەن کە لەوەو پێش دەیاندا بە پێغەمبەر ﷺ لە دژیان دەجەنگم، عومەر "ڕەزای خوای لێبێت" وتی: سوێند بەخوا هەرکە خوا دڵی بۆ "جەنگین" ڕێنموونی کرد ئیتر منش زانیم ئەو ـ جەنگین لەدژی زەکات نەدەران ـ ڕاستو هەقە".

**شەشەم: زەکات دان لەسەر کێ پێویستە:**

زەکات لەسەر کەسێ واجبە کە ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١ـ موسڵمان بێت.

٢ـ ماڵەکەی گەشتبێتە ڕادەی زەکات، ئەمە دواتر بە درێژی باسی دەکەین.

٣ـ ساڵ بەسەر ماڵکەیدا ـ کە لە ڕادەی زەکات دا بێت ـ تێپەڕێ، جگە لە دانەوێڵەو میوەجات ئەوە لە ڕۆژە ڕنینو دروێنەیاندا زەکاتیان لێ دەدرێت ئەگەر بگەنە ڕادەی زەکات قورئان

---

١) رواه البخاري ١٣٣٥ ومسلم ٢٠.

دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ﴾ الأنعام: ١٤١. واتە: زەکاتو مافەکەی لە ڕۆژی دروێنەو چنیندا بدەن.

**حەوتەم: ئەو شتانەی زەکاتیان لێ دەدرێت:**

**١ـ ئاڵتوون و زیو.**

**٢ـ بەرووبوومی کشتووکاڵو میوەجات.**

**٣ـ ئاژەڵو ماڵات.**

**٤ـ خەزنەو کانزایەکان.**

**٥ـ ماڵی بازرگانی.**

## یەکەم: زەکاتی ئاڵتوون و زیو

قورئان دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ التوبة: ٣٤. واتە: ئەو کەسانەی ئاڵتوون و زیو لەسەر یەك دەنێن و کۆی دەکەنەوە و لە ڕێی خوادا بەختی ناکەن ـ زەکاتی لێ نادەن ـ ئەوە مژدەیان پێ بدە بە سزایەکی سەخت.

(قال ابن عُمَرَ رضي الله عنهما من كَنَزَهَا فلم يُؤَدِّ زَكَاتَهَا فَوَيْلٌ له) [١] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر "ڕەزای خوای لێبێت" لە تەفسیری ئەم ئایەتدا دەڵێ: "ئەوەی ماڵ و سامان کۆدەکاتەوە و زەکاتی لێ نەدات داماوی و تیاچوون بۆ ئەو کەسە".

(قال أبو هريرة رضي الله عنه يقول قال رسول الله ﷺ ما من صاحب ذهب ولا فضة لا يؤدي منها حقها إلا إذا كان يوم القيامة صفحت له صفائح من نار فأحمي عليها في نار جهنم فيكوى بها جنبه وجبينه وظهره كلما ردت أعيدت له في يوم كان مقداره خمسين ألف سنة حتى يقضى بين العباد فيرى سبيله إما إلى جنة وإما إلى نار) [٢] ئەبوهورەیرە "ڕەزای خوای لێبێت" دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "هیچ خاوەن زێڕ و زیوێك نییە کە زەکاتەکەی نەدات ئیللا لە ڕۆژی دواییدا پلێتی ئاگرینی بۆ ئامادە دەکرێت کە لە ئاگری دۆزەخدا سوور کراوەتەوە، تەنیشت و ناو چاو و پشتی پێ داخ دەکرێت، هەرکاتێ سارد بوویەوە بۆی تازە دەکرێتەوە لە ڕۆژێکدا کە ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە، هەتا دادوەری لەنێوان بەندەکاندا کۆتایی پێ دەهێنرێ، پاشان ڕێگای نیشان دەدرێت یا بۆ بەهەشت یا بۆ دۆزەخ".

---

١) رواه البخاري ١٣٣٩.

٢) رواه مسلم ٩٨٧.

**٢ـ مەرجی زەکاتی ئاڵتوون و زیو:**

(عن عَلِيٍّ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: إذا كانت لك مِائَتَا دِرْهَمٍ وَحَالَ عليها الْحَوْلُ فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ وَلَيْسَ عَلَيْكَ شَيْءٌ يَعْنِي فِي الذَّهَبِ حتى يَكُونَ لك عِشْرُونَ دِينَارًا فإذا كان لك عِشْرُونَ دِينَارًا وَحَالَ عليها الْحَوْلُ فَفِيهَا نِصْفُ دِينَارٍ فما زَادَ فَبِحِسَابِ ذلك). [1] عەلی کوڕی ئەبوتالیب "ڕەزای خوای لێبێت" دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "دوو سەد دیرهەم ـ زیوت هەبوو ساڵی بە سەردا تێپەر بوو ئەوە پێنج دیرهەم زەکاتی تێدا واجب دەبێت، وە هیچت لەسەر نییە ـ واتە ئاڵتوون دا ـ هەتا بیست دینار ـ مسقاڵ ـ ت نەبێ، ئەگەر بیست دینار ـ مسقاڵ ـ ت هەبوو ساڵی بەسەردا تێپەڕی ئەوە نیو دینار ـ نیو مسقاڵ ـ زەکاتی لێ دەکەوێت، جا ئەگەر زیاتر بوو هەر بەم شێوە حسێب دەکرێ".

**٣ـ زیو چەند بێت زەکاتی لێ دەدرێت و چەندی لێ دەدرێت؟**

زیو بگاتە دووسەد دیرهەم زەکاتی لێ دەدرێت و چل یەکی ١/٤٠ دەکەوێ واتە: ٢,٥٪ لەسەدا دوو نیوی لێدەدەرێ بە بەڵگەی فەرموودەکەی پێشووی عەلی کوڕی ئەتالیب، ئەنەسیش ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: (أَنَّ أَبَا بَكْرٍ رضي الله عنه كَتَبَ له هذا الْكِتَابَ لَمَّا وَجَّهَهُ إلى الْبَحْرَيْنِ.... وفي الرِّقَّةِ رُبْعُ الْعُشْرِ...) [2] ئەبوبەکری صدیق کاتێ ناردی بۆ بەحرەین ئەم نامەی نووسی کە تێیدا هاتووە: (.. لە زیودا چارەکی دەیەك دەکەوێ..). ئەمەی فەرموودەکەش هەر دەکاتی ١/٤٠ یان ٢,٥٪ کە لە دوو سەد دیرهەمەکە پێنج دیرهەم دەکەوێ.

بە پێی ئەمڕۆ یەك دیرهەم دەکاتە ٢,٩٧٥ گرام، دوو گرام و لە هەزاردا نۆ سەدو حەفتاو پێنجی گرامێك.

پێنج دیرهەم دەکاتە ١٤,٦٧٥ گرام چواردە گرامو لە هەزاردا شەش سەدو حەفتاو پێنجی گرامێك.

---

١) رواه ابوداود ١٥٧٢ حديث حسن.

٢) رواه البخاري ١٤٥٤ وابوداود ١٥٦٧ والنسائي ١٨/٥.

دوو سەد دیرهەم دەکاتە ٥٩٥ گرام زیوی پوخت، هیچی تێکەڵ نەبێت ڕادەی گەشتنە زەکاتی زیوە، ئەوەشی لێ ی دەدەرێت ١٤,٦٧٥ چواردە گرامو لە هەزاردا شەش سەدو حەفتاو پێنجی گرامێك.

**٤ـ ئاڵتون لە چەندا زەكاتی لێ دەدریۆ چەندی لێ دەدرێت**

لە بیست دیناردا کە بیست مسقاڵە زەکاتی لێ دەدریۆ چارەکی دەیەکی دەدرێت کە ١\٤٠ یان ٢,٥٪ دەکات بە بەڵگەی فەرموودەی عەلی کە پێشتر هێنامان.

دینارێك دەکاتە: ٤,٢٥ چوار گرامو لەسەدا بیستو پێنجی گرامێك ئاڵتون. بیست دینار دەکاتە ٨٥ هەشتاو پێنج گرام ئاڵتون ئەمە ڕادەی گەشتنە زەکاتی ئاڵتونە. ئەو ئەندازەش لێی دەدرێت دەکاتە ٢,١٢٥ دوو گرامو لەهەزاردا سەدو بیست و پێنجی گرامێك ئاڵتونە کە دەکاتە نیو مسقاڵ ئاڵتون.

**٥ـ ئەو شتە گرانبەهایانەی کە زەکات تێیاندا فەرز نییە**

دوورڕو یاقوتو ئەڵماسو لوئلوئو مەرجان و زوویەرجە دومس زەکاتیان تێدا فەرز نییە، چونکە بەڵگەیەك نییە کە بڵێ ئەمانە زەکاتیان تێدایە، ئەصڵیش وایە زەکات نەدرێ لەو شتانەدا نەبێت کە بەڵگەی هەیە لەسەر زەکات لێکەوتنیان چونکە زەکات عیبادەتە عیبادەتیش ئەصڵو یاسا تێیدا ئەوەیە کە تەنیا لە شتێکدا دروستە بەڵگەی لەسەر هاتبێت.

**٦ـ ئایا خشڵ زەکاتی هەیە؟**

ئەگەر ئافرەت ئاڵتون وەك خشڵ بۆ جوانی و خۆ پێرازندنەوە بەکار بێنێ زەکاتی لێ ناکەوێت و فەرز نییە بیدات، بەڵام بە ڕەهایی پێویستە ماڵ ببەخشێت چەند خۆی پێی خۆشەو لە دەستی دێت، لەم بارەیەوە هەندێ ڕوونکردنەوە بە پێویست دەزانین، چونکە هەندێك لە زانایانی ڕایان وایە خشڵ زەکاتی تێدایە

(عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ أَنَّ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَبِنْتٌ لَهَا فِي يَدِ ابْنَتِهَا مَسَكَتَانِ غَلِيظَتَانِ مِنْ ذَهَبٍ فَقَالَ « أَتُؤَدِّينَ زَكَاةَ هَذَا ». قَالَتْ لاَ. قَالَ « أَيَسُرُّكِ أَنْ يُسَوِّرَكِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِهِمَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ سِوَارَيْنِ مِنْ نَارٍ ». قَالَ فَخَلَعَتْهُمَا فَأَلْقَتْهُمَا إِلَى رَسُولِ

اللهِ ﷺ فَقَالَتْ هُمَا لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ ﷺ.)[١] عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: ئافرەتێکی یەمەنی و کچێکی هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دووبازنی ئاڵتونی گەورە لە دەستی کچەکەیدا بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "زەکاتی ئەم بازنانە دەدەیت؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: "پێت خۆشە بە هۆی ئەم بازنانەوە خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا دوو بازنی ئاگرت بکاتە دەست؟" عەبدوڵلا دەڵێ: دوو بازنەکەی لە دەستی داکەندو فڕێی دان بۆ پێغەمبەر ﷺ وتی: هەردوکیان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ".

(عن عبد الله بن شداد بن الهاد قال دخلنا على عائشة زوج النبي ﷺ فقالت دخل علي رسول الله صلى الله عليه وسلم فرأى في يدي سخابا من ورق فقال ما هذا يا عائشة فقلت صنعتهن اتزين لك بهن يا رسول الله فقال اتؤدين زكاتهن فقلت لا أو ما شاء الله من ذلك قال هو حسبك من النار)[٢] عەبدوڵڵای کوڕی شەددادی کوڕی هاد دەڵێ چووین بۆ خزومەتی عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: "پێغەمبەری خوا ﷺ جارێك هاتە ژوورەوە بۆ لام و چەند ئەنگوستیلەیەکی زیوی لە دەستمدا بینی، فەرمووی: "ئەمە چییە عائیشە؟" منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دروستم کردوون بۆ ئەوەی خۆم برازێنمەوە بۆ تۆ پێیان، فەرمووی: "ئەی زەکاتەکەیان دەدەیت؟" وتم: نەخێر یان شتێکی ترم وت کە خوا ویستی بوو، فەرموی: "تەنیا سزای ئەوەت بەسە لە دۆزەخدا".

ئەم دوو فەرموودەیە بە ڕواڵەت وادەگەیەنن زەکات لە خشڵی ئافرەتاندا واجب بێت باوەك خشڵیش بەکاربێت، بەڵام بە وردبوونەوە لێیان بۆمان دەردەکەوێت ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە زەکات ناوی بردووە ئەوە زەکاتە نییە کە فەرز بێت مەرجی گەشتنە ڕادەی زەکات (النصاب)و ساڵ بەسەردا تێپەڕین تێیدا بە مەرج گیراوە لەبەر ئەم خاڵانە:

أ ـ دوو بازنەکە یا ئەنگوستیلەکان هیچیان نەگەشتبوونە ڕادەی زەکات لێکەوتن.

---

١) رواه النسائي ٣٨/٥ وابوداود ١٥٦٣ والترمذي ٦٣٧ وحسنه الشيخ الالباني في إرواء الغليل ٢٩٦/٣.

٢) رواه ابوداود ١٥٦٥ والحاكم ٣٨٩/١ ـ ٣٩٠ صححه الحاكم ووافقه الشيخ الالباني في الارواء ٢٩٧/٣ وصححه اسناده ابن حجر في التلخيص ٢/ ١٧٨.

ب ـ پێغەمبەر ﷺ پرسیاری ساڵ بەسەردا ڕۆشتنی نەکرد لێیان، نابێ بوترێت ساڵیان بە سەردا تێپەڕیوە، چونکە فەرموودەکەی عائیشە ڕۆشن دەیگەیەنێ کە ئەنگوستیلەکانی تازە دروست کرد بوو، چونکە پێغەمبەر ﷺ پێشتر نەیدیبوو، کەواتە ساڵی بە سەردا تێنەپەڕیبوو.

ج ـ ئەو فەرموودانە باسی واجبوونی زەکات دەکات باسی لە ئاڵتونی و زیو و پارە دەکات، چونکە لە عورفو زمانیشدا ئەو دوو وشەیە (الذهب اوالفضة) بۆ پارە بەکاردەهێنرێن نەك بۆ هەموو جۆرێکی ئاڵتونو زیو.

د ـ خشڵی ئافرەت کە بە کاری بێنێ وەك وشترو گایەکە ئیشی پێ دەکرێ و زەکاتی لێ ناکەوێ لەگەڵ ئەوەشدا هاوێنەیان زەکاتی لێ دەکەوێ (واتە وشتر یا گاو مانگا) کە بۆ ئیش بەکار نەهێنرێن.

هـ ـ زۆربەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ڕایان وایە کەزەکات ناکەوێ لە خشڵی بەکارهاتووی ئافرەت.

و ـ هەندێ لە زانایانی سەلەف دەڵێن زەکاتی خشڵی ئافرەت ئەوەیە بیدات بە ئافرەت بۆ شاییو شتی وا بەکاری بێنن. (عن نافع ان عبد الله بن عمر رضي الله عنهما كان يحلي بناته وجواريه الذهب فلا يخرج منه الزكوة) [1] نافیع دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوای لێبێت کچو کەنیزەکەکانی بە ئاڵتون و خشڵی پیاداد دەکردن پاشان زەکاتیشی لە خشڵەکانیان نەدەدا".

(عن الْقَاسِمِ بن محمد رحمه الله أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النبي ﷺ كانت تَلِي بَنَاتَ أَخِيهَا يَتَامَى فِي حَجْرِهَا لَهُنَّ الْحَلْيُ فَلاَ تُخرِجُ من حُلِيِّهِنَّ الزَّكَاةَ) [2] قاسیمی کوڕی موحەممەد دەڵێ: عائیشە ڕەزای خوای لێبێت چەند کچێکی برازای هەبوو هەتیوو بوون سەرپەرشتی دەکردن لای خۆی خشڵیان هەبوو زەکاتیشی لێ دەرنەئەکرد".

---

١) رواه ماليك في الموطأ ١/٢٥٠.

٢) رواه مالك في الموطأ ١/٢٥٠ واسناده صحيح.

## دووەم: زەکاتی بەروبوومی کشتوکاڵو میوەجات

**أ ـ ئەو بەربوومانەی زەکاتی لێدەدرێت:**

(عن أبي موسى ومعاذ بن جبل رضي الله عنهما ان النبي ﷺ قال لهما: لا تأخذوا الصدقة إلا من هذه الأربعة: الشعير والحنطة والزبيب والتمر) [١] ئەبوموسای ئەشعەری و موعازی کوڕی جەبەل ڕەزای خوایان لێبێت دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "لە زەکات ـ ی بەروبومی کشتوکاڵو میوەجات ـ دا جگە لەم چوار جۆرە: جۆو گەنمو مێوژو خورما وەرمەگرن".

زانایان یەکدەنگن لەسەر واجب بوونی زەکات لەم چوار جۆرەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەنمو جۆو مێوژو خورمان، بەڵام دەربارەی بەروبوومو میوەجات جگە لەم چوار جۆرە رایان جیایە بە کورتی ئەمە راکانیانە:

١ـ تەنیا لەو چوار جۆرەدا زەکات واجبە، واتە لە هیچ دانەوێڵە و میوەیەکدا زەکات پێویست نییە ئەمە رای عەبدوڵلای کوڕی عومەر ڕەزای خوای لێبێتو حەسەنی بەصریو سەوریو شەعبیو ئیبن سیرینو عەبدوڵلای کوڕی موبارەكو ئەبوعوبەیدەو ریوایەتێکیشە لە ئیمام ئەحمەدەوە رای ئیبن حەزمیشە، بەڵام ئەم مێوژی لێ کەم کردۆتەوەو رای ئیمامی شەوکانی و شێخ ئەلبانیشە.

**بەڵگەیان ئەمانەیە:**

(عن أبي بردة عن أبي موسى ومعاذ بن جبل حين بعثهما رسول الله ﷺ إلى اليمن يعلمان الناس أمر دينهم لا تأخذوا الصدقة إلا من هذه الأربعة الشعير والحنطة والزبيب والتمر) [٢] ئەبوبورەیدە دەڵێ: ئەبوموسای ئەشعەری و موعازی کوڕی جەبەل دەڵێن: "پێغەمبەر ﷺ ناردنی بۆ یەمەن ـ بۆ ئەوەی خەڵك فێر ئاینیەکەیان بکەن ـ جا فەرمانی پێکردن کە تەنیا لەم چوار جۆرە ـ دانەوێڵەو میوە ـ زەکات وەربگرن: گەنمو جۆو خورماو مێوژ".

---

١) رواه الحاكم ٤٠١/١ وقال صحيح الاسناد ووافقه الذهبي، وفي اسناده كلام حديث حسن.

٢) رواه الحاكم ٤٠١/١ والبيهقي ١٢٥/٤ وصححه الالباني (سلسلة الاحاديث الصحيحة ٨٧٩).

[1]دەڵێن جگە لەم چوار جۆرە نەدەقێك نەیەك دەنگی زانایان لەسەر نییە ، وە هیچ دانەوێڵەیەو میوەیەك وەك ئەم چوارە نییە لەودا بەزۆری بژێوی بێتو سودو کەڵکی زۆری وەك ئەمان بێت لەبەرئەوە دروست نییە هیچ دانەوێڵەو میوەیەك وەك ئەمان بژمێردرێت و زەکاتی لێ بکەوێ، بەڵکو وەك خۆی دەمێنێتەوەو زەکاتی لێ نادرێ".

٢- هەر شتێ بژێوی بێت و هەڵبگیرێ: ئەمەش رای ئیمامی مالیكو شافیعییە مەبەست لە بژێوی ئەوەیە لە کاتی ئاساییدا بژێوی خەڵك بێتو پێی بژین نەك لە کاتی ناچاریدا، وەك گەنمو جۆو زەراتو چەڵتوك، بەڵام گوێزو بادامو فستەق ئەمانە با هەڵدەگیرێن و خراپ نابن، بەڵام بژێوی نین لە کاتی ئاساییدا ئادەمیزاد پێی ناژی بۆیە زەکاتیان لێ ناکەوێت.

**بەڵگەیان چییە لەسەر ئەم بۆچوونەیان:**

(عن معاذ بن جبل رضي الله عنه قال :(فأما القثاء والبطيخ والرمان والقضب فقد عفا عنه رسول الله)[2] ئەم فەرموودەی موعازە رەزای خوای لێبێت کە دەڵێ: "... بەڵام خەیارو کاڵەك و هەنارو قامیشو سەوزە ئەوە پێغەمبەر ﷺ چاوپۆشی لێ کرد و زەکاتیان وەرنەگرت".

[3] هەروەها دەڵێن ئەوەی بژێوی بێت سوودی زۆرە وەك ئەو ئاژەڵو ماڵاتە وایە کە زەکاتی لێ دەکەوێ لەناو هەموو جۆرە ئاژەڵەکاندا.

٣- هەر شتێ وشك ببێو بمێنێتەوەو پێوانە بکرێت زەکاتی لێ دەدرێ: ئەمە باوترین و دیارترین رای ئیمام ئەحمەدە، بەم رایە دانەوێڵەو میوەیە کە پێوانە بکرێن و هەڵبگیرێن وشك بکرێنەوە دەگرێتەوە، لەگەڵ نۆكو فاصۆلیاو نیسكو خورماو مێوژو بادامو فستەقو ئەو جۆرە شتانە، چونکە ئەو سێ مەرجە یان تێدایە: وشك بوونەوە مانەوەو پێوانەکردن.

وە دەڵێن جۆرەکانی تری میوەجات وەك گوێزو سێوو پرتەقاڵ زەکاتیان تێدا نیە هەروەها سەوزەواتیش بەڵگەیان ئەمەیە:

---

١) المحلى ٢٠٩/٥ ونيل الاوطار ١٠٧/٤ والاموال ٤٦٩ / ١٣٧٨ وتمام المنة ص ٣٧٢- ٣٧٣ وفقه الزكاة ٣٧٧/١.

٢) رواه البيهقي ١٢٩/٤ والحاكم ٥٥٨/١ والدارقطني ٩٧/٢ حديث ضعيف (التخليص ٨٣٧).

٣) الموطأ ٢٧٦/١ والمجموع ٤٩٣/٥ وفقه الزكاة ٣٧٨/١

أ ـ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (« لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ »).[١] "لە پێنج ویسق کەمتر زەکاتی لێ ناکەوێ". دەڵێن ئەم فەرموودەیە پێوانەی لەبەرچاوگرتووە کەواتە زەکات لە شتێك دەکەوێ کە پێوانە بکرێت.

ب ـ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (لَيْسَ فِي حَبٍّ وَلاَ تَمْرٍ صَدَقَةٌ حَتَّى يَبْلُغَ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ... )[٢] "لە دانەوێڵەو خورمادا زەکات نییە هەتا نەگاتە پێنج ویسق..".

دەڵێن ئەمە بەڵگەیە کە زەکات لە دانەوێڵەو خورما دەکەوێت لە شتی تر وانەبێت ناکەوێت.[٣]

٤ـ هەر شتێك لە زەویدا دەروێنرێ بە مەبەستی سوودو بەرهەم زەکاتی لێدەدرێ: ئەمە رای عومەری کوری عەبدولعەزیز و رای ئەبوحەنیفەو داودی زاهیریە بەڵگەیان بەم شێوەیە هێناوەتەوە:

أ ـ خوای گەورە بە گشتیو بەبێ هەڵاواردن فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴾ البقرة: ٢٦٧ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە لە ماڵو سامانە پاكو حەڵاڵەی پەیداتان کردووە زەکاتی لێ بدەنو لەو بەروبوومانەش لە زەویدا بۆمان رواندوون.

ب ـ لە سورەتی (الانعام)دا دوای ئەوەی بە گشتی باسی کشتوکاڵو میوەجاتی کردوەو دەفەرموێ ﴿ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ وَلَا تُسْرِفُوٓاْ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾ الأنعام: ١٤١ واتە: لە رۆژی دروێنەو چنینو هەڵگرتنەوەی بەربوومەکەیدا هەقەکەی بدەن کە زەکاتەکەیەتی.

ج ـ (ان النَّبِيَّ ﷺ قَالَ « فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْعُيُونُ أَوْ كَانَ عَثَرِيًّا الْعُشْرُ ، وَمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ »).[٤] پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "ئەوەی بە باران ئاو بخوات دە یەکی زەکاتە

---

١) رواه البخاري ١٤٤٧ ومسلم ٩٧٩.

٢) رواه مسلم ٩٧٩ والنسائي ٢٤٨٥.

٣) المغني ٢/٦٩٠ وشرح منتهى الارادات ١/٣٨٨ وفقه الزكاة ١/٣٨١.

٤) رواه البخاري ١٤٨٣.

ئەوەش بە ولاخ ئاوی بۆ هەلگۆزرابێ و ئاو درابێ ئەوە نیوەی دە یەکی زەکاتە". جا ئەم فەرموودەیەش گشتییەو جیاوازی نەکردووە لە نێوان بژێوی بێت یان نا بخورێت یا نەخورێت، بمێنێتەوە یا نەمێنێتەوە.

(إبن العربی)ی مالیکی دەڵێ: (بەهێزترین را لە رووی بەلگەوە و دووربینانە ترینی بۆ هەژارانو نزیکترینی بۆ سوپاسگوزاری چاکی ـ ی خوا ـ رای ئەبوحەنیفەیە کە گشتییەتی ئایەتو فەرموودەش دەلالەتی لەسەر دەکەن) [١].

**ب ـ رادەی گەشتنە زەکاتی بەروبوومی کشتوکاڵو میوەجات:**

ئەگەر بەروبومی کشتوەکاڵو میوەجات بگاتە پێنج ویسق زەکاتی لێ دەکەوێت، ئەبوسەعیدی خودری رەزای خوای لێبێت دەڵێ: عن سَعِيدٍ رضي الله عنه يقول قال النبي ﷺ (وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ)پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "... لە پێنج ویسق کەمتر زەکاتی تێدا نییە". ویسق بە کیلۆی ئەمڕۆ دەکاتە (٦٥٢,٨) شەش سەد و پەنجا و دوو کیلۆو لە دەیا هەشت.

راست تر ڕایە بە پێوانە دیاری بکرێت، چونکە ویسق پێوانەیە نەك کێشانە، بەڵام کردنی ویسق بە کێشانە بۆ نزیك کردنەوەیەو کێشانەش زۆرتر خەڵك دەیزانن‌و بەکاردێنن.

**ج ـ لە بەروبومو میوەجات چەند دەدرێت لە زەکات دا؟**

(عن عَبْدِ اللَّهِ ابن عمر رضى الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ « فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْعُيُونُ أَوْ كَانَ عَثَرِيًّا الْعُشْرُ ، وَمَا سُقِىَ بِالنَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ »).[٢] عەبدوڵلای کوڕی عومەر رەزای خوایان لێبێت دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: "هەرچی بە ـ ئاوی ـ ئاسمانو کانی ئاو بدرێت یا بە ریشکی خۆی ئاو بخوات دە یەکی دەکەوێت، وە هەرچی بە ولاخی ئاو هەلکێش ئاو بدرێ نیوەی دەیەکی دەکەوێت".

١) عارضة الاحوذي في شرح الترمذي ١٣٥/٣.

٢) رواه البخاري ١٤٨٣ وابوداود ١٥٨١ والترمذي ٦٣٥ والنسيائي ٤١/٥ وابن ماجه ١٨١٧.

## سێ یەم: زەكاتی ئاژەڵ، ماڵات

زەكاتی ئاژەڵ سێ جۆر لەئاژەڵو ماڵات دەگرێتەوە كە پێویستە زەكاتیان لێ بدرێت كەئەمانەن (ووشترو رەشەوڵاخ (مانگاو گامێش) و مەڕو بزن.

**١ـ رادەی گەشتنە زەكاتی ووشتر:**

ووشتر تانەگاتە پێنج زەكاتی تێدانییە كە گەشتە پێنج ووشتر ئەندازەی زەكات تێیدا كاوڕێكە ئیتر لەهەر پێنج ووشترێكدا كاورێك زیاد دەكات تا دەگاتە (٢٤) بیستو چوار وە لە (٢٥) بیستو پێنج ووشتردا بەچكە ووشترێكی مێنیەی یەك ساڵ دەدرێت لە زەكاتدا تا ٣٥ وە لە٣٦ سیو شەش ووشتر بەچكە ووشترێكی مێینەی دوو ساڵ دەدرێت تا ٤٥ چلو پێنج وە لە ٤٦ تا ٦٠) چلو شەش تا شەست بەچكە ووشترێكی مێنەی سێ ساڵ دەدرێت وە لە (٦١-٧٥) شەستو یەك تا حەفتاو پێنج ووشترێكی مێنەی چوار ساڵ دەدرێت وە لە (٧٦-٩٠) حەفتاو شەش تا نەوەد دوو ووشتری مێنەی دوو ساڵ دەدرێت وە لە (٩١-١٢٠) نەوەد و یەك تا سەد و بیست دوو ووشتری مێنەی سێ ساڵ دەدرێت، پاشان لەهەموو چل ووشترێكدا بەچكە ووشترێكی مێنەی دوو ساڵ زیاد دەكرێتو لەهەموو پەنجا ووشترێكدا بەچكە مێنەیەكی سێ ساڵ زیاد دەكرێت بەڵگەی ئەمەی سەرەوە: عن سَعِيدٍ رضي الله عنه يقول قال النبي ﷺ (وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ) ئەبو سەعیدی خودری رەزای خوای لێ بێت دەڵێت: پێغەمبەری خوای ﷺ فەرمووی: (لە پێنج ووشتر كەمتردا زەكاتی تێدا نییە.....).[١]

((عن أَنَسٍ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ رضي الله عنه كَتَبَ له هذا الْكِتَابَ لَمَّا وَجَّهَهُ إلى الْبَحْرَيْنِ بِسْمِ اللَّهِ الرحمن الرَّحِيمِ هذه فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ التي فَرَضَ رسول اللَّهِ ﷺ على الْمُسْلِمِينَ وَالَّتِي أَمَرَ الله بها رَسُولَهُ فَمَنْ سُئِلَهَا من الْمُسْلِمِينَ على وَجْهِهَا فَلْيُعْطِهَا وَمَنْ سُئِلَ فَوْقَهَا فلا يُعْطِ في أَرْبَعٍ وَعِشْرِينَ من الْإِبِلِ فما دُونَهَا من الْغَنَمِ من كل خَمْسٍ شَاةٌ فإذا بَلَغَتْ خَمْسًا وَعِشْرِينَ إلى

١) رواه البخاري ١٤٤٧ ومسلم ٩٧٩.

خَمْسٍ وَثَلَاثِينَ فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ أُنْثَى فإذا بَلَغَتْ سِتًّا وَثَلَاثِينَ إلى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ أُنْثَى فإذا بَلَغَتْ سِتًّا وَأَرْبَعِينَ إلى سِتِّينَ فَفِيهَا حِقَّةٌ طَرُوقَةُ الْجَمَلِ فإذا بَلَغَتْ وَاحِدَةً وَسِتِّينَ إلى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ فَفِيهَا جَذَعَةٌ فإذا بَلَغَتْ يَعْنِي سِتًّا وَسَبْعِينَ إلى تِسْعِينَ فَفِيهَا بِنْتَا لَبُونٍ فإذا بَلَغَتْ إِحْدَى وَتِسْعِينَ إلى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِيهَا حِقَّتَانِ طَرُوقَتَا الْجَمَلِ فإذا زَادَتْ على عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِي كل أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ وفي كل خَمْسِينَ حِقَّةٌ وَمَنْ لم يَكُنْ معه إلا أَرْبَعٌ من الْإِبِلِ فَلَيْسَ فيها صَدَقَةٌ إلا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا فإذا بَلَغَتْ خَمْسًا من الْإِبِلِ فَفِيهَا شَاةٌ)).[١] ئەنەس ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت کاتێ ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێت ناردی بۆ بەحرەین ئەم نوسراوەی بۆ نوسی بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، ئەمە ئەو زەکاتە فەرزو دیاری کراوەیە. کە پێغەمبەری خوا ﷺ دیناوە - فەرزی کردووە- لەسەر موسڵمانان ئەوەیە کە خوا فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرەکەی جا هەرکەس لە موسوڵمانان بەو شێوە داوای لێ کرا ئەوەبا بیداتو هەر کەسیش لەو زیاترداوا لێ کرا ئەوە با نەیدات: لەبیستو چوار ووشتر کەمتر لەمەڕ دەدرێت بۆ هەر پێنج ووشترێك کاورێك جا ئەگەر گەشتە بیستو پێنج تاسی و پێنج ئەوە یەك بەچکە ووشترە مێـنەی یەك ساڵ دەدرێت، جا ئەگەر گەشتە سیو شەش تاچلو پێنج ئەوە یەك بەچکە ووشترە مێینەی دوو ساڵ دەدرێت، جا ئەگەر گەشت چلو شەش تا شەست ئەوە ووشترە مێنیەیەکی سێ ساڵی کەڵگرتوو دەدرێت، جا ئەگەر گەشتە شەستو یەك تاحەفتاو پێنج ئەوە ووشترە مێنەیەکی چوار ساڵ دەدرێت، جا ئەگەر گەشتە حەفتاو شەش تا نەوەد ئەوە دوو بەچکە ووشتری مێینەی دوو ساڵ دەدرێت جا ئەگەر گەشتە نەوەدو یە تاسەدو بیست ئەوە دوو ووشترە مێینەی سێ ساڵی کەڵگرتوو دەدرێت، جا ئەگەر لەسەدو بیست زیادی کرد ئەوە لەهەر چل ووشترێکدا بەچکە ووشترێکی مێینەی دوو ساڵ دەدرێت و لەهەر پەنجا ووشترێکدا ووشترە مێینەیەکی سێ ساڵی کەڵگرتوو دەدرێت، وە هەر کەسێ نەیبوو تەنها چوارووشتر نەبێت ئەوە زەکاتی تێدا واجب نییە مەگەر خاوەنەکەی خۆی بیەوێت زەکات بدات جا ئەگەر گەشتە پێنج ووشتر ئەوە کاورێکی تێدایە.

---

١) رواه البخاري ١٤٥٤ وابو داود ١٥٥٢.

**لەم نەخشەی خوارەوەدا زیاتر ئەم باسەمان روون کردۆتەوە.**

| رادەی گەشتنە زەکات | ئەو ئەندازەی کە پێویستە بدرێت | تەمەنی ئەوەی دەدرێت لە زەکاتدا |
| --- | --- | --- |
| لە ٥ تا ٩ | کاوڕێك یاچتێرێك | کاوڕێك ساڵێکی تەواو کرد بێتو چتێرێك دوو ساڵی تەواو کردبێت. |
| لە ١٠ تا ١٤ | دوو کاوڕ یا دوو چتێر | کاوڕەکان یەك ساڵێیان تەواوکردبێ‌و چتێرەکان دوو ساڵیان تەواو کردبێ. |
| لە ١٥ تا ١٩ | سێ کاوڕ یا سێ چتێر | کاورەکان یەك ساڵێیان تەواوکردبێ‌و چتێرەکان دوو ساڵیان تەواو کردبێ. |
| لە ٢٠ تا ٢٤ | چوار کاوڕ یاچوار چتێر | کاوڕەکان یەك ساڵێیان تەواوکردبێ‌و چتێرەکان دوو ساڵیان تەواو کردبێ. |
| لە ٢٥ تا ٣٥ | بنت مخاض | بەچکە ووشترێکی مێینەی یەك ساڵی پێ لەدوو بێت. |
| لە ٣٦ تا ٤٥ | ابنة لبون | بەچکە ووشترێکی مێینەی دوو ساڵی پێ لەدوو بێت. |
| لە ٤٦ تا ٦٠ | حقة | ووشترێکی مێینەی کەڵگرتووی سێ ساڵ پێ لەچوار بێت. |
| لە ٦١ تا ٧٥ | جذعة | ووشترێکی مێینەی چوار ساڵی پێ لە پێنج بێت. |
| لە ٧٦ تا ٩٠ | دوو (بنت لبون) | بەچکە ووشترێکی مێینەی دوو ساڵی پی لە سێ ساڵ بێت. |
| لە٩١تا ١٢٠ | دوو (حقة) | سێ ساڵی پێ لەچوار بن. |

**٢ـ ڕادەی گەشتنە زەكاتی ڕەشەوڵاخ (مانگاو گامێش)**

هەتا ژمارەیان نەاتە سی زەكاتی تێدانییە جا لە (٣٠) سی سەردا گوێرەكەیەكی یەك ساڵەی نێر یا مێ دەكەوێت تا نەگاتە (٣٩) سی سەر نۆ سەر وە لە (٤٠) چل سەردا نێونێكی دەكەوێت كە دوو ساڵی تەواو كردبێت چوو بێتە ساڵی سێیەمەوە.

(عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ بَعَثَنِي النَّبِيُّ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ فَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنْ كُلِّ ثَلاَثِينَ بَقَرَةً تَبِيعًا أَوْ تَبِيعَةً وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةً).[1] موعازی كوڕی جەبەل ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت پێغەمبەر ﷺ ناردمی بۆ یەمەنو فەرمانی پێكردم لەهەموو سی سەر مانگادا گوێرەیەكی یەك ساڵەی نێر یا مێ وەرگرم، وە لەهەموو چل سەر مانگایەكدا نێونێكی مێینەی دوو ساڵ وەرگرم.

**بۆ ڕوون كردنەوەی زیاتر سەیری ئەم خشتەی خوارەوە بكە:**

| ڕادەی گەشتنە زەكات | ئەو ئەندازەی پێویستە لە زەكاتدا بدرێت |
|---|---|
| لە ٣٠ تا ٣٩ | گوێرەیەكی یەك ساڵەی نێر یا مێ. |
| لە ٤٠ تا ٥٩ | نێونێكی مێینەكە دوو ساڵەی تەواو كردبێتو چوبێتە ساڵی سێیەمەوە. |
| لە ٦٠ تا ٦٩ | دوو گوێرەكەی یەك ساڵەی نێر |
| لە ٧٠ تا ٧٩ | گوێرەكە نێرێكی یەك ساڵەو نێونێكی دوو ساڵەی پێ لە سێ ساڵ. |
| لە ٨٠ تا ٨٩ | دوو نێونی دوو ساڵی پێ لە سێ |
| لە ٩٠ تا ٩٩ | سێ گوێرەكە نێری یەك ساڵە |
| لە ١٠٠ تا ١٠٩ | نێونێكی دوو ساڵەو دوو گوێرەكە نێری یەك ساڵە |
| لە ١١٠ تا ١١٩ | دوو نێونی دوو ساڵەو گوێرەكە نێرێكی یەك ساڵە |
| لە ١٢٠ تا ١٢٩ | سێ نێونی دوو ساڵە یا چوار گوێرەكە نێری یەك ساڵە |

١) رواه الترمذي ٦٢٣ وابو داود ١٥٧٦ حديث صحيح

### ٣ـ رادەی گەشتنە زەکاتی مەڕو بزن:

مەڕو بزن زەکاتی تێدانییە تا نەگاتە چل سەر کە گەشتە چل سەر ئەو کاوڕێکی یەك ساڵە یا چتیرێکی دوو ساڵەی دەکەوێت هە تا سەدو بیست، لەسەدو بیستو یەك سەر دوو کاوڕی یەك ساڵە یا دوو چتیری دوو ساڵەی دەکەوێت هەتا دوو سەد ، کە گەشتە دوو سەدو یەك سەر سێ کاوڕ یا سێ چتیی دەکەوێت تا سێ سەد ،ئەگەر لەسێ سەد زیاتر بوو لە هەر سەد سەر کاوڕێك یا چتیرێك زەکاتی دەکەوێت لە مەڕو بزندا کاوڕی یەك ساڵ وەردەگیرێ و لە بزن دا چتیری دوو ساڵ وەردەگیرێ.

وە بەیەك دەنگی زانایان دروستە نێر بدرێت لە زەکاتی ئەو مەڕو بزنانەی هەموویان نێر بن.

**بۆ زیاتر بەرچاو روونی سەیری ئەم خشتەی خوارەوە بکە:**

| رادەی زەکاتی مەڕو بزن | ئەو ئەندازەی کە پێویستە لەزەکاتدا بدرێت |
|---|---|
| لە ١ تا ٣٩ | زەکاتی ناکەوێت |
| لە ٤٠ تا ١٢٠ | کاوڕێکی یەك ساڵە یا چتیرێکی دوو ساڵە (شەك) |
| لە ١٢١ تا ٢٠٠ | دوو کاوڕ یا دوو چتیر |
| لە ٢٠١ تا ٣٩٩ | سێ کاوڕ یا سێ چتیر |
| لە ٤٠٠ تا ٤٩٩ | چوار کاوڕ یا چوار چتیر |
| لە ٥٠٠ تا ٥٩٩ | پێنج کاوڕ یا پێنج چتیر |

**بەڵگەی زەکاتی مەڕو بزنو رادەی گەشتنە زەکاتو ئەندازە زەکات لێدانی:**

(قال أَنَسٍ رضي الله عنه أَنَّ أَبَا بَكْرٍ رضى الله عنه كَتَبَ لَهُ هَذَا الْكِتَابَ لما بعثه الى بحرين وفيه: .... وَفِي صَدَقَةِ الْغَنَمِ فِي سَائِمَتِهَا إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ شَاةٌ ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ إِلَى مِائَتَيْنِ شَاتَانِ ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى مِائَتَيْنِ إِلَى ثَلاَثِمِائَةٍ فَفِيهَا ثَلاَثٌ ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى ثَلاَثِمِائَةٍ فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ ، فَإِذَا كَانَتْ سَائِمَةُ الرَّجُلِ نَاقِصَةً مِنْ أَرْبَعِينَ شَاةً وَاحِدَةً فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ ، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا »).[١] ئەنەس رەزای خوای لێ بێت دەڵێت: کاتێ ئەبو بەکر ناردی

---

١) رواه البخاري ١٤٥٤.

بۆ بەحرەین ئەم نامەیەی بۆ نوسی کە لە بەشێکیدا دەڵێت: (.......وە لە زەکاتی مەڕدا کە خۆی بلەوەڕێ ئەگەر چل سەر بوو تاسەدو بیست کاوڕێ یا چتێرێکە، ئەگەر لەسەدو بیستو یەك تادوو سەد سەر دوو کاوڕ یا دوو چتێرە، ئەگەر لەدوو سەد تێپەڕی تاسێ سەد ئەوە سێ کاوڕ یا سێ چتێری دەکەوێت جا ئەگەر لە سێ سەد تێپەڕی کرد ئەوە لەهەموو سەد سەرێکدا کاوڕێك یا چتێرێك دەکەوێت جا ئەگەر کەسێك مەڕو بزنەکانی لە چل سەر کەمتر بوون ئەوە زەکاتی لێ ناکەوێت مەگەر خۆی حەز بکات بیدات).

**مەرجەکانی زەکات لێکەوتنی ئاژەڵ:**

بۆ ئەوەی ئاژەڵو ماڵات زەکاتی لێ بکەوێت ئەم مەرجانەی خوارەوە پێویستە بن:

**١ـ ئاژەڵەکە خۆ لەوەڕ بێ:** واتە زۆربەی ساڵ لە لەوەڕگای دەرو دەشت بلەوەڕێو پێویستی بە ئالف نەبێت وەك لە فەرمودەکەی ئەنەسدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (وَفِی صَدَقَةِ الْغَنَمِ فِی سَائِمَتِهَا إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِینَ إِلَی عِشْرِینَ وَمِائَةٍ شَاةٌ ،) (... لەمەڕدا لەوەی خۆی دەلەوەڕێ ئەگەر چل سەر بوو تاسەدو بیست سەر شەکێك زەکاتیەتی..).[1] قال رَسُولَ اللَّهِ ﷺ : (... فی کل سَائِمَةِ إِبِلٍ فِي أَرْبَعِینَ بِنْتُ لَبُونٍ...) وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: لە هەموو خۆلەوەڕێکی ووشتردا لە چل سەردا، بەچکە ووشترێکی دوو ساڵی مێینە دەکەوێت).[2]

**٢ـ گەشتنە رادەی زەکات لێکەوتن:** کە زانایان لەسەری یەك دەنگن کەلەهەر سێ جۆرەکەدا بەبەڵگەوە باسمان کرد.

**٣ـ ساڵ بەسەردا تێپەڕین:** (قال النَّبِی-صلی الله علیه وسلم- « وَلَیْسَ فِی مَالٍ زَكَاةٌ حَتَّی یَحُولَ عَلَیْهِ الْحَوْلُ »).[3] پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (هیچ ماڵێك زەکاتی تێدا نییە هەتا ساڵی بەسەردا تێنەپەڕێ). لەمەرجی ساڵ بەسەردا تێپەڕین ئەو بەچکانەی لەنێوان ساڵەکەدا پەیدا

---

١) رواه البخاري١٤٥٤ .

٢) رواه ابوداود ١٥٧٥ والنسائي ٢٤٤٩ واحمد ٢،٤/٥.

٣) رواه ابن ماجة ١٧٩٢ والدارقطني ٣ والبیهقي ٣ ١٠٣ فیه اختلاف.

دەبن ئەوە مەرج نییە لەپەیدا بوونیانەوە ساڵیان بەسەردا تێپەڕێ، بەڵکو لەگەڵ ساڵی ئاژەڵە گەورەکانا ساڵی ئەمانیش تەواو دەبێتو زەکاتیان دەدرێت.

**٤ـ نابێت ئیشکەر بێ وەك زەوی کێلانو ئاو هەڵگوزینو بارلێنان:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ليس فِي الْبَقَرِ الْعَوَامِلِ صَدَقَةٌ...) [١] (لەمانگای ئیشکەردا هیچ زەکاتی ناکەوێت) ، بەڵکو دەبێت ئاژەڵ کە بۆ شیر یان بەر و زیادکردن یا قەڵەو بوون بێت.

### خستنە سەریەكو جیاكردنەوەو نێوان

**١ـ ئاژەڵی جیا ناخرێنە سەریەكو ئاژەڵی کۆش جیاناکرێتەوە لەترسی زەکات لێکەوتن:**

ئەنەس رەزای خوای لێ بێت دەڵێت: (قال أنس رضى الله عنه حَدَّثَنا أَنَّ أَبَا بَكْرٍ رضى الله عنه كَتَبَ لَهُ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «وَلاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ ، خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ»). [٢] (ئەبوبکر رەزای خوای لێ بێت ئەو زەکاتەی پێغەمبەر ﷺ دیاری کردبوو بۆی نووسی (... نابێت ئاژەڵی جیا بخرێتە سەر یەك وەنابێت ئاژەڵی کۆ جیاکرێتەوە لە ترسی زەکات لێکەوتن).

نمونەی جیاکردنەوەی کۆو پێکەوە بوو: دوو کەس دوو سەدو یەك مەڕیان هەبێت دەبێت سێ مەڕ بدەن ، جیای دەکەنەوە بۆ ئەوەی هەر یەکەیان یەك مەڕی بکەوێت، ئەو دروست نییەو حەرامەو هەر دەبێت سیان بدەن وە نمونەی خستنە سەر یەکی جیا: سێ کەس هەر یەکەیان چل مەڕی هەیە ئەگەر کۆی نەکەنەوە دەبێت هەر یەکەیان مەڕێك بدات ، بەڵام ئەگەر کۆیان کەنەوەو بیخەنە سەریەك پێکەوە یەك مەڕی لێ دەکەوێت ئەمەشیان نابێتو دروست نییە.

**٢ـ ئەگەر ئاژەڵ نەگاتە رادەی زەکات:**

زەکاتی لێ ناکەوێت، وە ئەوەی لەنێوان دوو رێژەی زەکاتی لێکەوتندایە زەکاتی لێناکەوێت کە پێی دەڵێن (الأوقاص) ئەگەر سەیری خشتەکانی پێشوو بکەیت جوان بۆت روون دەبێتەوە، نمونەیەك بۆ (الاوقاص) مەڕو بزن لەچل مەڕدا مەڕێك دەکەوێت دوا ئەوە تاسەدو بیست سەر

---

١) رواه الطبراني حديث صحيح

٢) رواه البخاري ١٤٥٠

هەریەك مەڕە ، کە گەشتە سەدوبیستو یەك سەر دوو مەڕی دەکەوێت، نێوان چلو سەدو بیستو یەك پێی دەوترێت (اوقاص) و زەکاتی تێدانییە، بەبەڵگەی ئەمەی کە لە فەرمودە درێژەکەی موعازدا هاتووە کە دەڵێ: (أَنَّ الأَوْقَاصَ لاَ فَرِيضَةَ فِيهَا).[1] (ئەوقاص زەکاتی تێدا نییە).

**٣ـ زەکاتی ئاژەڵی تێکەڵ:**

ئەگەر دوو کەس یا زیاتر ئاژەڵەکانیان پێکەوە بوو یەك شوانو لەوەڕگا و شوێن حەوانەوەیان هەبوو ئەوە وەك یەك خاوەن دادەنرێن بۆ زەکات لێ وەرگرتن بە گوێرەی ژمارەی ئاژەڵەکانیان زەکاتیان بەر دەکەوێت لە نامەکەی ئەبو بەکر بۆ ئەنەس ڕەزای خوایان لێ بێت کە پێغەمبەر ﷺ وای دانابوو « وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ »).[2] (ئەو ئاژەڵانەی - هی دوو کەس یا زیاترن- پێکەوە تێکەڵن ئەو بێگومان بەیەکسانی دەیگێڕنەوە- دابەشی دەکەنەوە بەسەر خۆیاندا هەر کەس بە ئەندازەی بەشی خۆی بەشە زەکاتی دەکەوێتە سەر...).

بۆ نمونە دوو کەس یەکی بیست مەڕیان هەیە ئەو کەسەی زەکات وەردەگرێت لێیان مەڕێکیان لێ وەردەگرێت کە ئەو مەڕەی وەرگیراوە هی یەکێکیانە جا دەبێت ئەوی تریان نیوەی نرخەکەی بۆ بگێڕێتەوە.

**٤ـ ئەو ئاژەڵانەی کە کۆکەرەوەی زەکات نابێ وەریبگرێت:**

أ ـ ئاژەڵی پیری دان کەوتوو

ب ـ ئاژەڵی کوێر.

ج ـ ئاژەڵی نێر، مەگەر هەموویان نێر بن لەوکاتەدا دروستە.

د ـ ئاژەڵی ناتەواو عەیبدار

ئەنەس ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێ ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێت ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دیاری کردبوو ، نووسی بۆم:

---

١) احمد ٥/٢٤٠

٢) رواه البخاري ١٤٥٠، ١٤٥١

(« وَلاَ يُخْرَجُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ ، وَلاَ ذَاتُ عَوَارٍ ، وَلاَ تَيْسٌ ، إِلاَّ مَا شَاءَ الْمُصَدِّقُ»).[١] (لە زەكاتدا ئاژەڵی پیر نادرێت، ئاژەڵی كوێرو عەیبدار نادرێت، نێریش نادرێت مەگەر زەكات وەرگرەكە بیەوێت - و بۆ هەژاران باشتر بێت-).

(عن النبي ﷺ وَلاَ يُؤْخَذُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ وَلاَ ذَاتُ عَيْبٍ»).[٢] وەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ئاژەڵی پیر وەرناگیرێت وە ئاژەڵی عەیبدار وەرناگیرێت لە زەكاتدا).

هـ ـ ئاژەڵی دابەستە بۆ سەربڕین نێر بێ یا مێ.

وـ ئاژەڵی كە بۆ شیر لەماڵدا خزمەتی دەكەن.

زـ ئاژەڵی ئاووس كە كاتی زانو بەچكەبوونی بێت.

ح ـ بەرانو سابرێنی ناوڕانو ئاژەڵ كە پێویستە لەناویاندا بێت.

---

١) رواه البخاري ١٤٥٥

٢) رواه مالك في الموطأ ٢٥٧/١ حديث حسن

## چوارەم: زەکاتی خەزنەو کانزایەکان (الركاز والمعادن)

لەم باسەدا سێ ووشە هەیە پێویستە ماناکەیان روون بکەینەوە وەك رێ خۆش کردنێك بۆ باسەکەکە ئەمانەن:

أ ـ (المعادن) کۆی (معدن)ە لەشەرعدا بەو مادە کانزاییانە دەوترێت کە خوای بەخشندە لە رۆژی دروستبوونی دونیاوە خستونیەتی نێو زەوی.

ب ـ (کنز) بەو خەزنەو ماڵو سامانانە دەوترێت کە پێش ئیسلام خەڵکی لە ژێر خاكو لە ئەشکەوتدا شاردویانەتەوە).[١]

ج ـ (الركاز) زانایان بە دوو مانا لێکیان داوەتەوە: بەلای شەرعزانانی حیجازەوە بەخەزنەی سەردەمی نەفامی دەوترێت. کە لە زەویدا شاردرابێتەوە، بەڵام بەلای شەرعزانانی عێراقەوە بەکانزایەکان دەوترێت بە پێ زمانی عەرەبیش هەردوو بۆچوونەکە هەڵدەگرێت، چونکە خەزنەو کانزاش لە زەویدا پەنهان کراون.[٢]

**أ ـ خەزنە (کنز):**

**١ـ بەڵگەی زەکات لێکەوتنیو ئەندازەکەی:**

(قال رسول الله (ﷺ) وَفِى الرِّكَازِ الْخُمُسُ »).[٣] پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی (لە خەزنەی شاراوەدا پێنج یەکی زەکاتە).

( سُئِلَ رسول اللَّهِ ﷺ عن اللُّقَطَةِ فقال ما كان في طَرِيقٍ مَأْتِيٍّ أو في قَرْيَةٍ عَامِرَةٍ فَعَرِّفْهَا سَنَةً فَإِنْ جاء صَاحِبُهَا وَإِلَّا فَلَكَ وما لم يَكُنْ في طَرِيقٍ مَأْتِيٍّ ولا في قَرْيَةٍ عَامِرَةٍ فَفِيهِ وفي الرِّكَازِ الْخُمُسُ)[٤]

---

١) بڕوانە (النهاية في غريب الحديث والأثر ١٩٢/٣و ٢٠٣/٤

٢) بڕوانە (النهاية في غريب الحديث والأثر ٢٥٨/٢

٣) رواه البخاري ١٤٩٩ ومسلم ١٧١٠

٤) رواه النسائي ٤٤/٥

وەلەوەلامی کەسێکدا لەبارەی ماڵی دۆزراوە پرسیاری کرد فەرمووی (ئەوەی لە ڕێگایەکدا کە خەڵکی هاتوچۆی پێدا بکات یان لە دێیەکی ئاوەداندا بدۆزرێتەوە، ساڵێك بانگەوازی بۆ بکە، جا ئەگەر خاوەنەکەی هات باشە ئەگەر نا ئەوە هی تۆ دەبێت، بەڵام ئەگەر لە ڕێگایەکی هاتوچۆ پێداکراو دێیەکی ئاوەدا نەبوو ئەوە لەو شتە دۆزراوەو خەزنەدا پێنج یەکی لە زەکاتدا دەدرێت.

٢ـ بەلای زۆربەی زانایانەوە (ــب) گەشتنە رادەی زەکات مەرج نییە لە زەکاتی خەزنەدا، بەڵام پێشەوا شافیعی بەمەرجی داناوە، دیارە رای یەکەم بەهێزەکە زۆربەی زانایانی لەسەرە.

وەزانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی ساڵ بەسەردا تێپەرین مەرج نییەو هەر بەدۆزینەوەی زەکات لێدەکەوێت.[1]

٣ـ زەکاتی خەزنە لەچیدا سەرف دەکرێت؟

زۆربەی شەرعزانان دەڵێن زەکاتی خەزنە لەوەدا سەرف دەکرێت کەئەم ئایەتە دیاری کردوون کە دەفەرموێت: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ الأنفال: ٤١ واتە: بزانن هەرچیەکتان دەستکەوت لە غەنیمە ئەو بێگومان بۆ خواو پێغەمبەر ﷺو خزمانی پێغەمبەر ﷺ و هەتیوانو هەژارانو رێبوارانە.[2]

**ب ـ کانزایەکان (المعادن):**

پێشتر مانای ئەم زاراوەمان کرد ئێستاش ئەم چەند بڕگەیە باس دەکەین کە پەیوەندیان بەم باسەوە هەیە:

١ـ بەڵگەی زەکات لێکەوتنیو ئەندازەکەشی کە دەدرێت:

زانایان یەك دەنگن کە کانزایەکان پێویستە —واجبە- زەکاتی لێبدرێت بەم بەڵگانەش بەڵگە دێننەوە :

---

١) بروانە نيل الأوطار ٢١١/٤ والمجموع ٨٣/٦ والمغني ٦١٥/٢

٢) بروانە المغني لإبن قدامة ٦١٤/٢ ونيل الأوطار ١٤٨/٤

یەکەم: خوای گەورە دەفەرمویێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴾ البقرة: ٢٦٧ ، ئەم بەشە لە ئایەتەکە ﴿كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: وە لەوەی کە لەزەوی بۆتامان دەرهێناوە، هەموو شتێك دەگرێتەوە کە لەزەوی پەیدا دەبێتو تایبەت نییە بە ڕووی زەوییەوە.

دووەم: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت: (وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ).[١] (... لە ڕکازدا پێنج یەکی زەکات هەیە) وە پێشترروونمان کردەوە کە-ڕکاز- خەزنەو کانزا دەگرێتەوە.

لەسەر ئەندازەی زەکاتەکەی چەند ڕای جیاواز هەیە:

زۆربەی زانایان دەڵێن ١/٤٠ چل یەکی لێ دەدرێت وەك زەکاتی ئاڵتونو زێرو بەڵگەیان لەسەر چل یەك فەرمودەیەکە کە لاوازە،[٢] ئەبو حەنیفەش دەڵێت ١/٥ پێنج یەکی لێدەدرێت بە بەڵگەی (وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ)[٣]، ودەڵێت (ڕکاز) خەزنەو کانزاش دەگرێتەوە.

٢ـ دەربارەی ڕادەی گەشتنەی زەکاتی کانزا: ئەو ڕایە بەهێزەکە دەڵێت پێویستە کانزا بگاتە ڕادەی زەکات لێکەوتن ئەنجا زەکاتی لێدەکەوێت ئەوەیش دەبێت نرخەکەی بگاتە نرخی بیست مسقاڵ ئاڵتون. ئەنجا زەکاتی دەکەوێت.

٣ـ ساڵ بەسەردا تێپەڕین: کانزا لە بەرئەوەی وەك دانەوێڵە و میوەجات وایە پێویست ناکات ساڵی بەسەردا تێپەڕێت، بەڵکو بەدەستکەوتنو دەرهێنانی زەکاتەکەی واجب دەبێت بەلای جەماوەری زانایانەوە.[٤]

---

١) رواه البخاري ١٤٩٩ ومسلم ١٧١٠

٢) بروانە إرواء الغليل ٣/٣١١-٣١٣ حديث ٨٣٠

٣) واه البخاري ١٤٩٩ ومسلم ١٧١٠١

٤) بروانە المجموع النووي ١٨/٦ والموطأ ١٠٤/٢ والمغني لإبن قدامة ٢٦/٣

## پێنجەم: زەكاتی ماڵی بازرگانی

**١ـ ماڵی بازرگانی بەچی دەوترێ:**

بە هەموو ئەو كەلو پەلو شتـ ـەكانە دەوترێت كەمامەڵەیان پێوە دەكرێت بەمەبەستی قازانجكردن جا چ گوازراوەبن (المنقولة) وەك ئاژەڵو سەیارەو قوماش یان نەگوازراوە، وەك زەوی‌و زارو خانووبەرە.[1]

**٢ـ بەڵگەی فەرز بوونی زەكات لەماڵی بازرگانیدا:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴾ البقرە:٢٦٧ زانایانی توێژەرەوەی قورئان دەڵێن: مەبەست لە (ما كسبتم) لەم ئایەتەدا (ئەوەی بەدەستان هێناوە) ماڵێكە لەرێگەی مامەڵەو بازرگانییەوە بەدەست هێنرا بێت[2]، وە ئیمامی بوخاری لەصەحیحەكەیدا لەباسی زەكاتدا دەڵێت (باب صدقة الكسب والتجارة) پاشان بەڵگە بەئایەتەكەی سورەتی بەقەرە دێنێتەوە[3].

(عن عَبْدِ القاريء وكان على بَيْتِ الْمَالِ فِي زَمَنِ عُمَرَ .... فإذا خَرَجَ العطاء جَمَعَ عُمَرُ أَمْوَالَ التِّجَارَةِ فَحَسَبَ عَاجِلَهَا وَآجِلَهَا ثُمَّ يَأْخُذُ الزَّكَاةَ من الشَّاهِدِ وَالْغَائِب)[4]

ئیبن عەبدی لقاری دەڵێت (لەسەردەمی عومەری كوڕی خەتتابدا من بەرپرسی (بيت المال) بووم كاتێ موچەی بدایە سامانی بازرگانەكانی كۆدەكردەوە پاشان ژمارەی دەكرد ئەوەی ئامادەیەو ئەوەشی ئامادە نییە پاشان لەسامانە ئامادەكە زەكاتی سامانی ئامادەو ئامادەنەبووشی وەردەگرت).

---

١) بروانە مطالب اولي النهى ٩٦/٢

٢) بروانە تفسير الطبري ٥٥٥/٥ واحكام القرآن لإبن العربي ٢٣٥/١.

٣) سورة البقرة الآية ٢٦٧

٤) بروانە الأموال لأبي عبيد ومصنف ابن ابي شيبة والمحلى ٣٤/٦ وصححه ابن حزم ) صحيح فقه السنة ٥٤/٢

(عن بن عُمَرَ أَنَّهُ قال(ليس في الْعَرَضِ زَكَاةٌ إِلَّا أَنْ يُرَادَ بِهِ التِّجَارَةُ)) [١] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت (لە کەل و پەلدا زەکات نییە مەگەر بۆ بازرگانی بێت).

(عن رُزَيْقِ بن حَكِيمٍ أَنَّ عُمَرَ بن عبد الْعَزِيزِ كَتَبَ إِلَيْهِ أَنْ انْظُرْ من مَرَّ بِكَ من الْمُسْلِمِينَ فَخُذْ مِمَّا ظَهَرَ من أَمْوَالِهِمْ من التِّجَارَاتِ من كل أَرْبَعِينَ دِينَارًا دِينَارًا) [٢]

وەعومەری کوڕی عەبدولعەزیز ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت بە زورەیق (سەیرکە هەر بازرگانێکی موسڵمان بەسنورکەتاندا تێپەڕی لەو ماڵو سامانەی کە دیارەو بازرگانی پێوە دەکەن لەهەر چل دینار دینارێکیان لێ وەرگرن).

وەئیبن مونزیر دەڵێت (یەك دەنگی زانایان لەسەر فەرزبوونی زەکاتی ماڵی بازرگانی هەیە، بەڵام کەسێ بڕوای پێ نەبێت کافر نابێت چونکە ڕاجیای تێدایە)[٣].

**٣ـ مەرجەکانی زەکاتی ماڵی بازرگانی:**

أ ـ گەشتنە ڕادەی زەکات کە نرخی (٨٥) هەشتاو پێنج گرامە ئاڵتونە، چونکە ماڵی بازرگانی بۆ گەشتنە ڕادەی زەکات وەك ئاڵتون دادەنرێت.

ب ـ ساڵ بەسەردا تێپەڕین دەبێت لەو کاتەوە کە گەشتۆتە ڕادەی زەکات لێکەوتن ساڵێکی بەسەردا تێپەڕێت ئەنجا زەکاتی دەکەوێت، عن جابر بن زيد أنه قال في مثل ذلك قومه بنحو من ثمنه يوم حلت فيه الزكاة ثم أخرج زكاته) [٤] ئیبن مونزیر دەڵێت (ساڵ تێپەڕێن بەسەر ماڵی بازرگانیدا یەك دەنگی زانایانی لەسەرە).

ج ـ ئەو ماڵە نیازو مەبەستی بازرگانی و مامەڵە پێوەکردنی لەدڵدا بوو بێت یان بەکردەیی خەریکی بازرگانی پێوەکردن بێت.

---

١) رواه الشافعي في الأم ٦٨/٢ وعبدالرزاق ٩٧/٤ والبيهقي ١٤٧/٤ بسند صحيح

٢) رواه مالك في الموطأ ٥٤٩ والشافعي في الأم ٦٨/٢ باسناد صحيح.

٣) بروانە الفتاوى لإبن تيمية ١٣/٢٥ وسبل السلام ٨٢٥/٢

٤) المغني لإبن قدامة ٣٠/٣

**٤ـ بازرگان چۆن زەکاتی ماڵی بازرگانیەکەی دەدات؟**

ئەگەر کاتی زەکات دانەکە هات دەبێت کابرای بازرگان هەرچی سامانی هەیە هەمووی کۆ بکاتەوە کە ئەمانە دەگرێتەوە

أ ـ پارەی نەختینە.

ب ـ نرخی ئەو شتومەکانەی بازرگانیان پێوە دەکات لای خۆیەتی نەیفرۆشتوون.

ج ـ هەرچی قەرزی هەیە کە بێهیوا نییە لەوەرگرتنەوەی.

دـ ئەمانە هەمووی کۆ دەکاتەوە ئەنجا ١/٤٠ چل یەکی لێدەدات وەك زەکات

**٥ـ ئایا ماڵە بازرگانیەکە دەدرێت لە زەکاتدا یا نرخەکەی؟**

رای بەهێز کە بەڵگەکان پشتیوانی لێ دەکەن ئەوەیە کە زەکات لەنرخی ماڵە بازرگانییەکە دەدرێت ئەمە رای جەماوەری زانایانەو بەهێزترە لەراکانی تر، بەڵام هەندێ لە زانایان دەڵێن: بازرگان سەر پشکە لەنێوان ماڵەکە یا نرخەکەیدا هەرکامیان بدات دروستە ئیبن تەیمیەش دەڵێت: کامیان -ماڵەکەیان نرخەکەی- بۆ هەژار باشترە ئەوەیان بدات.[1]

**٦ـ کەلو پەلی بازرگانی بۆ زەکاتدانی بەچ نرخێك دادەنرێت؟**

پێویستە ماڵو سامانی بۆ ئەوەی زەکاتی لێ بدرێت وەك پێشتروونمان رای بەهێز ئەوەیە کە زەکات لە نرخەکەی بدرێت، بەڵام بەکام نرخی دادەنرێت ئەو نرخەی پێکراوە یا ئەو نرەخەی کەلەکاتی زەکاتی دانەکەدا هەیەتی، رای بەهێز ئەوەیە کەلەکاتی زەکاتدانەکەدا نرخی چەندە بەو نرخە ماڵە بازرگانیەکە دادەنرێت (عن جابر بن زيد أنه قال في مثل ذلك قومه بنحو من ثمنه يوم حلت فيه الزكاة ثم أخرج زكاته) لە جابیری کوڕی زەیدەو ریوایەتی کراوە ووتویەتی (بەنرخی ئەو رۆژە کە زەکاتی تێدا فەرز بووە بینرخێنەو پاشان زەکای لێ دەربکە)[2] ئەمە رای زۆربەی زانایانە.

---

١) بروانه البدائع ٢/٢١ والمغني ٣/٣١ ومجموع الفتاوى ٨٠/٢٥ وبداية المجتهد لإبن رشد ١/٢٦٠

٢) بروانه الأموال لأبي عبيد ص ٤٢٦.

## هەشتەم: زەكات بەكێ دەدرێت؟

### یەكەم: ئەوانەی زەكاتیان پێ دەدرێت:

خوای گەورە ئەو كەسانەی دیاری كردووە لە زەكاتیان پێ دەشێ‌و پێیان دەدرێت‌و دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ التوبة: ٦٠ واتە: بێگومان زەكاتەكان تەنها بۆ هەژاران‌و نەداران‌و ئەوانەی كۆی دەكەنەوە‌و دڵ ڕاگیراون ئەو كۆیلانەی دەیانەوێت خۆیان ئازاد بكەن‌و قەرزداران‌و لەرێی خوادا جەنگاوان و ڕێبوارانە.

لەلایەن خواوە پێویست كراوە‌و خوای زاناو دانایە، ئێستاش باهەریەك لەمانە كەهەیە روونی بكەینەوە.

**١ـ هەژاران:**

هەژار: ئەو كەسەیە كە هیچی نییە: (عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عن النَّبِيَّ ﷺ أنه قالَ: الْمَسْأَلَةَ لاَ تَصْلُحُ إِلاَّ لِثَلاَثَةٍ لِذِى فَقْرٍ مُدْقِعٍ أَوْ لِذِى غُرْمٍ مُفْظِعٍ أَوْ لِذِى دَمٍ مُوجِعٍ »).[١] ئەنەس ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (سواڵكردن دروست نییە بۆ سێ كەس نەبێت: بۆ هەژارێكی هیچ نەبوو، یا بۆ قەرزدارێكی زۆر قەرزار یا بۆ خوێن خۆشەكەرێكی پارەی خوێنەكەی خستۆتە ئەستۆی خۆی ئەگەر نەیدات بكوژكە دەكوژنەوە‌و بۆ ئەو بە ئێش و ئازارە).

(عَنْ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَدِىٍّ أَنَّ رَجُلَيْنِ أَخْبَرَاهُ أَنَّهُمَا أَتَيَا النَّبِىَّ ﷺ يَسْأَلاَنِهِ مِنَ الصَّدَقَةِ فَقَلَّبَ فِيهِمَا الْبَصَرَ وَرَآهُمَا جَلْدَيْنِ فَقَالَ « إِنْ شِئْتُمَا أَعْطَيْتُكُمَا وَلاَ حَظَّ فِيهَا لِغَنِىٍّ وَلاَ لِقَوِىٍّ مُكْتَسِبٍ ».[٢]

عوبەیدوڵڵای عەدیی كوڕی خیار دەڵێت: دوو پیاو پێیان ووت: كە ڕۆشتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ داوا یارەمەتیان لێكرد ئەویش سەرنجی دان بینی دوو پیاوی بەتوانان بۆیە فەرمووی(ئەگەر

---

١) رواه احمد ١٢٧/٣ وابو داود ١٦٣٥ الحدث صحيح لغيره.

٢) رواه احمد ٣٦٥/٥ وابوب داود ١٦٣٣ حديث صحيح

دەتانەوێتو حەز دەکەن پێتان دەدەم، بەڵام ئەم –زەکاتە- بەشی دەوڵەمەندو بەشی بەتوانایەکی ئیشکەری تێدا نییە).

**٢ـ دەستکورت (نەداران):**

کەسێکە کەمێکی هەیە، بەڵام بەشی ناکاتو پێی ناژی، عن أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال ليس الْمِسْكِينُ بِهذا الطَّوَّافِ الذي يَطُوفُ على الناس فَتَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ قالوا فما الْمِسْكِينُ يا رَسُولَ اللَّهِ قال الذي لَا يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ ولا يُفْطَنُ له فَيُتَصَدَّقَ عليه ولا يَسْأَلُ الناس شيئا).[1] ئەبو هورەیرە رەزای خوای لیٚ بێت دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ( نەدارو دەست کورت ئەو کەسە نییە بەسەر خەڵکدا دەگەڕێت تیکەیەك و دوو تیکە دەیگێڕێتەوە یا خورمایەكو دوو خورما دەیگێڕێتەوە) جا عەرزیان کرد ئەی نەدار کێیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (کەسێکە ئەوەندەی نییە بیٚ نیازی بکات، ناشناسرێت تا زەکاتی پیٚ بدرێت خۆشی هەڵناسیٚ داوا لەخەڵکی بکات).

**٣ـ کۆکەرەوانی زەکات:**

ئەو کەسانەی هەڵدەسن بە کۆکردنەوەو ئیشو کاری پەیوەندیدار بەکۆکردنەوەی زەکاتو دابەشکردنی، نابێت لەخزمو کەسوکاری پێغەمبەر بن ﷺ.

عن عبد الْمُطَّلِبِ رَبِيعَةَ بن الحرث وَعَبَّاسَ بن عبد الْمُطَّلِبِ وَفَضْلِ بن عَبَّاسٍ أتوارَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُالوا له يا رَسُولَ اللَّهِ ...اسْتَعْمِلْنَا يا رَسُولَ اللَّهِ على الصَّدَقَاتِ فقال: ( إِنَّ هذه الصَّدَقَةَ إنما هِيَ أَوْسَاخُ الناس وَإِنَّهَا لَا تَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ ولا لِآلِ مُحَمَّدٍ).[2] عەبدولموتەلیب کوڕی رەبیعەی کوڕی حارس دەڵێت خۆی عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب و فەزڵی کوڕی عەبباس (رەزای خوایان لیٚ بێت) رۆشتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بمانکە بە کۆکەرەوەی زەکات ئەویش فەرمووی: بێگومان زەکات حەڵاڵ نییە بۆ موحەممەدو کەسوکاری موحەممەد ، چونکە ئەوە چڵکی خەڵکییە).

١) رواه احمد ٢٦٠/٢ والبخاري ١٤٧٩ ومسلم ١٠٣٩/١٠١

٢) رواه مسلم ١٠٧٢ وابو داود ٢٩٦٩

(عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ عَنِ ابْنِ السَّاعِدِيِّ الْمَالِكِيِّ أَنَّهُ قَالَ: اسْتَعْمَلَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رضى الله عنه عَلَى الصَّدَقَةِ فَلَمَّا فَرَغْتُ مِنْهَا وَأَدَّيْتُهَا إِلَيْهِ أَمَرَ لِي بِعُمَالَةٍ فَقُلْتُ: إِنَّمَا عَمِلْتُ لِلَّهِ وَأَجْرِي عَلَى اللَّهِ. فَقَالَ: خُذْ مَا أُعْطِيتَ فَإِنِّي عَمِلْتُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَعَمَّلَنِي فَقُلْتُ: مِثْلَ قَوْلِكَ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « إِذَا أُعْطِيتَ شَيْئًا مِنْ غَيْرِ أَنْ تَسْأَلَ فَكُلْ وَتَصَدَّقْ»)[1]. بوسری کوڕی سەعید دەڵێت: ئیبن سەعدی مالیکی دەڵێت : عومەر کردمی بەکۆکەرەوەی زەکات جا کاتێ لێ بوومەوە و هێنامەوە بۆی فەرمانیدا کرێی ئەوەی کردومە پێم بدەن، منیش ووتم : من ئەو کارەم لەبەر خوا کردووە! ووتی ئەوەی پێت دراو وەریگرە، چونکە منیش لەسەردەمی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم کارەی پێ سپاردم کە پارەی پێدام منیش ئەم قسەیەی تۆم کرد، جا پێغەمبەریش بەمنی فەرموو( ئەگەر شتێکت پێتدرا بێ ئەوەی داوای بکەیت ئەوە بیخۆو بیبەخشە).

**٤ـ دڵ ڕاگیراوان:**

ئەو کەسانەن کە بەشێك لە زەکاتیان پێ دەدرێت بۆ ئەوەی دڵیان دابمەزرێت لەسەر ئیمان، چونکە تازە موسڵمانن، (عن عَمْرُو بْنُ تَغْلِبَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِمَالٍ أَوْ سَبْيٍ فَقَسَمَهُ ، فَأَعْطَى رِجَالاً وَتَرَكَ رِجَالاً فَبَلَغَهُ أَنَّ الَّذِينَ تَرَكَ عَتَبُوا ، فَحَمِدَ اللَّهَ ثُمَّ أَثْنَى عَلَيْهِ ، ثُمَّ قَالَ: « أَمَّا بَعْدُ ، فَوَاللَّهِ إِنِّي لأُعْطِي الرَّجُلَ ، وَأَدَعُ الرَّجُلَ ، وَالَّذِي أَدَعُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الَّذِي أُعْطِي وَلَكِنْ أُعْطِي أَقْوَامًا لِمَا أَرَى فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الْجَزَعِ وَالْهَلَعِ ، وَأَكِلُ أَقْوَامًا إِلَى مَا جَعَلَ اللَّهُ فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الْغِنَى وَالْخَيْرِ ، فِيهِمْ عَمْرُو بْنُ تَغْلِبَ» . فَوَاللَّهِ مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِكَلِمَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حُمْرَ النَّعَمِ).[2] عەمری کوڕی تەغلیب ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: هەندێ ماڵ یان کۆیلەو دیلیان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا، ئەویش دابەشیکرد بەشی کەسانێکی دا و کەسانێکیشی بێ بەش کرد ئەنجا پێی گەشتەوە ئەوانەی بەشی نەدابوون گلەییان کردبوو ئەویش سوپاس‌و ستایشی خوای کردووو فەرمووی: (لەپاشان دەی سوێند بەخوا دڵنیابن بەشی کەسێك دەدەم‌و بەشی یەکێکی تر نادەم ، ئەوەیان بەشی نادەم لام خۆشەویستترە لەوەیان بەشی دەدەم ، بەڵام من بەشی کەسانێك

١) رواه احمد ٥٢/١ والبخاري ١٧٦٤ ومسلم ١٠٤٥

٢) رواه البخاري ٩٢٣ واحمد ٦٩/٥

دەدەم لەبەر ئەوەی دەزانم دڵیان دامەزراو نییە، بەڵام كەسانێك دەسپێرم بەو بێ نیازیو چاكەو ئیمانەی لە دڵیاندایە، لەوانە عەمری كوڕی تەغلیب) جا سوێند بەخوا ووشتری سوورم پێ بدرایە بەقەدەر ئەو ووتەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم خۆش نەبوو).

(عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَسْمًا فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعْطِ فُلاَنًا فَإِنَّهُ مُؤْمِنٌ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ « أَوْ مُسْلِمٌ » أَقُولُهَا ثَلاَثًا. وَيُرَدِّدُهَا عَلَيَّ ثَلاَثًا « أَوْ مُسْلِمٌ » ثُمَّ قَالَ « إِنِّى لأُعْطِي الرَّجُلَ وَغَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُ مَخَافَةَ أَنْ يَكُبَّهُ اللَّهُ فِي النَّارِ»).[1] عامیری كوڕی سەعد لەسەعدی باوكیەوە رەزای خوایان لێ بێت دەگێڕێتەوە كە ووتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ ماڵو سامانی دابەشكرد دەڵێت: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی فلان كەسیش بدە، چونكە بێگومان ئیماندارە ئەویش فەرمووی یا موسڵمانە، من سێ جار ئەو قسەیەم كرد ئەویش سێ جار ئەو وەڵامەی دووبارە كردەوە پاشان فەرمووی (دڵینا بە من بەشی كەسێك دەدەم كەسی تر لام لەو خۆشەویستترە لەترسی ئەوەی خوا بەروودا بیخاتە دۆزەخەوە).

**٥ـ كوێلە ژێر دەستەكان:**

ئەمانە كەسانێك بوون لە پێش ئیسلامدا هەبوون كە ئیسلام هات وردە وردە نەیهێڵاوە كە بەهۆی جەنگو قەرزارییەوە كراونەتە كوێلە جا ئیسلام بەشێكی پارەی زەكاتی تەرخان كردووە بۆ ئازادكردنی ئەم كۆیلانە جا چ نوسراویان نوسیبێت لەگەڵ خاوەنەكانیاندا پارەیان پێبدەن و خۆیان پێ بكڕن یان هەر بەو بەشە پارەیە كۆیلە بكڕدرێتو ئازادبكرێت.

**٦ـ قەرزداران:**

كەسانێكن بوونەتە ژێر قەرزارییەوە توانای دانەوەی قەرزەكانیان نییە، ئەمانەش بەشێك لە زەكاتیان پێ دەدرێت، بەمەرجێ قەرزدارییەكەی بەهۆی گوناەو ئیسراف و زیادەڕەوییەوە نەبوو بێت.

**٧ـ لە رێگای خوادا:**

ئەو جەنگاوەرانە دەگرێتەوە كە لە پێناوی ئایینی ئیسلامدا جەنگو جیهاد دەكەنو موچەی تایبەتیان نییە لەلایەن دەوڵەتەوە، هەروەها بۆ حەجكردنیش سەرف دەكرێت.

---

١) رواه البخاري ٢٧ ومسلم ٢٣٦/١٥٠

(عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِىٍّ إِلاَّ لِخَمْسَةٍ لِعَامِلٍ عَلَيْهَا أَوْ رَجُلٍ اشْتَرَاهَا بِمَالِهِ أَوْ غَارِمٍ أَوْ غَازٍ فِى سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ مِسْكِينٍ تُصُدِّقَ عَلَيْهِ مِنْهَا فَأَهْدَى مِنْهَا لِغَنِىٍّ»).[1] ئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (زەکاتی حەڵاڵ نییە بۆ دەوڵەمەند جگە لە پێنج کەس: بۆ کرێکار کۆکەرەوەی زەکات یا کەسێ ئەو ماڵی زەکاتەی بە پارە کڕی بێ-وەك ئەوەی زەکاتەکە ئاژەڵ و شتی لەو جۆرە بێت- یاقەرزدار بێت[2]- یا جەنگاوەر بێت لە ڕێگای خوادا یا نەدارێك زەکاتی پێدرا بێ ئەویش هەندێکی بەدیاری برد بێت بۆ دەوڵەمەندێك).

(عَنْ أُمِّ مَعْقِلٍ قَالَتْ: لَمَّا حَجَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَجَّةَ الْوَدَاعِ وَكَانَ لَنَا جَمَلٌ فَجَعَلَهُ أَبُو مَعْقِلٍ فِى سَبِيلِ اللَّهِ وَأَصَابَنَا مَرَضٌ وَهَلَكَ أَبُو مَعْقِلٍ وَخَرَجَ النَّبِىُّ ﷺ فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ حَجِّهِ جِئْتُهُ فَقَالَ « يَا أُمَّ مَعْقِلٍ مَا مَنَعَكِ أَنْ تَخْرُجِى مَعَنَا ». قَالَتْ لَقَدْ تَهَيَّأْنَا فَهَلَكَ أَبُو مَعْقِلٍ وَكَانَ لَنَا جَمَلٌ هُوَ الَّذِى نَحُجُّ عَلَيْهِ فَأَوْصَى بِهِ أَبُو مَعْقِلٍ فِى سَبِيلِ اللَّهِ. قَالَ « فَهَلاَّ خَرَجْتِ عَلَيْهِ فَإِنَّ الْحَجَّ فِى سَبِيلِ اللَّهِ فَأَمَّا إِذْ فَاتَتْكِ هَذِهِ الْحَجَّةُ مَعَنَا فَاعْتَمِرِى فِى رَمَضَانَ فَإِنَّهَا كَحَجَّةٍ ». فَكَانَتْ تَقُولُ الْحَجُّ حَجَّةٌ وَالْعُمْرَةُ عُمْرَةٌ وَقَدْ قَالَ هَذَا لِى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا أَدْرِى أَلِىَ خَاصَّةً).[3] ئوممو مەعقەل ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت (کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ حەجیماڵئاوایی کرد ، ئێمە ووشترێکمان هەبوو ئەبو مەعقەل تەرخانی کردبوو بۆ جیهاد لەرێی خوادا، ئێمە تووشی نەخۆشی بووین و ئەبو مەعقەل مرد، پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ حەج جاکاتێ گەڕایەوە لە حەجەکەی چوومە خزمەتی فەرمووی (ئەی ئوممو مەعقەل چی ڕێگر بوو لەوەی لەگەڵماندا بێیت بۆ حەج؟ ئوممو مەعقەل ووتی: بەراستی خۆمان ئامادەکرد لەو کاتەدا ئەبو مەعقەل مرد، ئێمەش ووشترێکمان هەبوو سواری بین بۆ حەج، ئەبو مەعقەل ووسیەتی کرد لە ڕێی خوادا بەکاربهێنرێت فەرموی (دەی بۆ بەسوار- ئەو وشترە- نەهاتیت بۆ حەج ، چونکە بێگومان حەج لەرێی خوادایە جا کە مادەم ئەو حەجەت لەگەڵ ئێمە لەکیس چوو لە ڕەمەزاندا عەمرە بکە، چونکە

---

١) رواه احمد ٥٦/٣ وابوداود ١٦٣٦ حديث صحيح

٢) کەسێکە دەوڵەمەندە، بەڵام بۆ کوژاندنەوەی ئاژاوەو خوێن خۆشکردن پارەی ئەو ئاشتەواییە دەخاتە سەر خۆی بۆیە قەرزار بووەئەوە یەکێکە لەو کەسانەی زەکاتی دەدرێتێ.

٣) رواه ابوداود ١٠٧٢ حديث صحيح.

وەك حەج وایە) جا ئوممو مەعقەل دەیوت حەج حەجەو عەمرە عەمرەیە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بەمن فەرمووە نازانم هەر بۆ من بەتایبەتی؟) یا بۆ هەموو موسڵمانێکە.

**٨ـ ڕێبواران:**

کەسێکە لە جێگاو شوێنێکی دوور لە وڵاتی خۆی پارەو پێویستی سەفەر لێبڕاوە ئەوە لە زەکات بەشی دەدرێت تا بگاتە وڵاتی خۆی.

**زەکاتی هەر شوێنێك بەسەر هەژارو نەداریو ئەو شوێنەدا دابەش دەکرێت:**

لە فەرموودەکەی موعازدا کاتێ پێغەمبەر ﷺ دەینێرێت بۆ یەمەن چەند شتێکی پێ دەڵێت لەوانە : (فأخبرهم أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ).[1] (جا پێیان بڵێ کە خوا زەکاتی فەرز کردووە لەسەریان لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێتو دەدرێت بە هەژارو نەدارەکانیان) واتە هەر لەهەمان شوێندا کە وەرگیراوە دابەش دەکرێتەوە بەسەر هەژارەکاندا.

**دووەم: مەرجی ئەو کەسانەی زەکاتیان پێ دەدرێت:**

ئەو هەشت جۆرەی کە زەکاتیان پێ دەدرێت کە باسمان کردن چەند مەرجێك هەیە دەبێت تێیاندا بێت کەئەمانەن:

**١ـ موسڵمانێتی:**

زەکاتی فەرز نادرێتە نا موسڵمان، بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە: (ادْعُهُمْ إِلَى شهادة أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ فَأَعلمهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ افتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ)[2]. (بانگیان بکە بۆ شایەتومان هێنان کە هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خواو موحەممەدیش نێردراوی خوایە.. جا ئەگەر ئەمەیان بە گوێکردی ئەوسا ئاگاداریان بکە کە خوای گەورە زەکاتی فەرزکردووە لەسەریان لەدەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێتو دەدرێتەوە بەهەژارەکانیان..) ، لەم فەرموودەیەوە بەروونی دەردەکەوێت کە

---

١) رواه البخاري ١٤٩٦ ومسلم ١٩/٢٩.

٢) رواه البخاري ١٣٣١ ومسلم ١٩

زەکات لە دەوڵەمەنی موسڵمان وەردەگیرێتو دەدرێت بە هەژاری موسڵمان، کەواتە دەبێت ئەو کەسەی زەکاتی پێ دەدرێت موسڵمان بێت.

**٢ـ نەتوانێ ئیشو کار بکات:**

بەڵام ئەگەر هەژارو نەدار بتوانن کارو کاسابەت بکەنو ژیانیان دابین ببێ ئەوە دروست نییە زەکاتیان پێ بدرێت، وە ئەویش دروست نییە بۆی وەریبگرێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (« لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ وَلاَ لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ »).[1] (زەکات دروست نییە بۆ دەوڵەمەندو کەسێ توانی ئیشو کەسابەتی هەبێت).

**٣ـ نابێت خەرجی لە سەر زەکات دەرەکە بێت:**

چونکە ئەو کەسەی مەسرەفی لەسەر زەکاتدەرەکە بێ ئەوە پێویستی بە زەکات نییە زەکاتدەرەکە دەبێت خەرجی بکێشێت ئەگەر زەکاتی پێ بدات وەك ئەوە وایە زەکاتەکە بگەڕێتەوە بۆ زەکاتدەرەکە، لەبەر ئەوە دروست نییە زەکات بدرێت بە باوكو دایك باپیرە و نەنگ چونکە خەرجیان لەسەر منداڵەکانیانەوە، هەروەها دروست نییە زەکات بدرێت بە کچو کوڕو منداڵیان ئەگەر بچوك بوون یا گەورە بوون لەبەر شێتی یا نەخۆشی یاهەر هۆیەکی تر باوکیان مەسرەفی دەکردن ئەوە دروست نییە باوکیان زەکاتیان پێ بدات، چونکە بۆ زەکاتدەرەکە دەگەڕێتەوە وەك پێشتر باسمان کرد.

هەروەها پیاو دروست نییە زەکات خۆی بدات بەهاوسەرەکەی چونکە خەرجی ئافرەتەکە لەسەر پیاوەکەیەتی.

ئەمەی باسمان کرد کە زەکاتیان پێ نادرێت لەلایەن کەسو کاریانەوە بەهۆی هەژاریو نەداریەو پێیان نادرێت بەڵام وەك شتی تر پێیان دەدرێت وەك قەرزاری یا جەنگاوەری ئیسلام بن ئەوە دروستە بۆیان زەکاتیان پێ بدەن نەك وەکو هەژار بەڵکو قەرزارو جەنگاوەر.

بەڵام زەکاتدان بەو خزمانەی کە خەرجیان واجب نییە لەسەر زەکات دەرەکە ئەوە دروست زەکاتیان پێ بدرێت وەك براو خوشكو ئامۆزاو خاڵو پوور و منداڵەکانیان، لەم بارەیەوە (عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ« الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ وَهِيَ

---

١) رواه ابوداود ١٦٣٣ والترمذي ٦٥٢

عَلَى ذِي الْقَرَابَةِ اثْنَتَانِ صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ »).[١] سەلمانی کوڕی عامیر رەزای خوای لیٚ بیٚت دەڵیٚ پیٚغەمبەر ﷺ فەرموی (زەکاتدان بەهەژار هەر زەکاتدانە بەڵام زەکاتدان بەخزم دوو شتە زەکات و پەیوەندی خزمایەتیشە).

**٤ـ نابیٚت (هاشمیو موتەلیبی) بیٚت:**

واتە: ئەو کەسەی بەرەچەڵەك بچیٚتە سەر بەنو هاشمو بەنو موتەلیب زەکاتی پیٚ نادریٚت، چونکە پیٚغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویٚت: (« إِنَّ هَذِهِ الصَّدَقَاتِ إِنَّمَا هِيَ أَوْسَاخُ النَّاسِ وَإِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ وَلاَ لآلِ مُحَمَّدٍ»).[٢] (ئەم ماڵی زەکاتە بیٚگومان چڵکی خەڵکییەو حەڵاڵ نییە بۆ موحەممەدو کەسوکاری موحەممەد).

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضى الله عنه قَالَ أَخَذَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ رضى الله عنهما تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ ، فَجَعَلَهَا فِي فِيهِ ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ « كِخٍ كِخٍ - لِيَطْرَحَهَا ثُمَّ قَالَ - أَمَا شَعَرْتَ أَنَّا لاَ نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ »).[٣] ئەبو هورەیرە رەزای خوای لیٚ بیٚت دەڵیٚت: (حەسەنی کوڕی عەلی خورمایەکی لە خورمای زەکات هەڵگرتو خستییە دەمی ویستی بیخوات جا پیٚغەمبەر ﷺ فەرمووی: کخ کخ بۆ ئەوەی لەدەمی دەریبیٚنیٚتو فڕیٚیدا، پاشان فەرمووی (ئەی نەتزانیوە ئیٚمە شتی زەکات ناخۆین).

**دروستە ئافرەت زەکات بدات بە میٚردەکەی:**

بەڵکو سونەتە ئەگەر ئافەرت زەکاتی هەبوو میٚردەکەی هەژار بوو زەکاتەکەی بدات بە میٚردەکەی، هەروەها سوننەتە مەسرەفی منداڵەکانی بکات ئەگەر میٚردەکەی هەژار بوو، بۆیە لیٚرەدا دروستە، بەڵام بە پیٚچەوانەوە دروست نییە پیاو زەکات بدات بە ژنی خۆی، چونکە پیاو واجبە لەسەر خیٚزانی بەخیٚوکات، بەڵام ئافرەت لەسەری واجب نییە، میٚرو منداڵەکانی بەخیٚو بکات، (عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود رضى الله عنهما سألت رسول الله ﷺ أَيجْزِى عَنِّي أَنْ أُنْفِقَ عَلَى زَوْجِي وَأَيْتَامٍ لِي فِي حَجْرِي؟ فقال لمن بلغه سؤالها: «نَعَمْ لَهَا أَجْرَانِ أَجْرُ

---

١) رواه الترمذ ٦٥٨ والنسائي ٩٢/٥ وابن ماجة ١٨٤٤ صحيح لغيره.

٢) رواه مسلم ١٠٧٢ .

٣) رواه البخاري ١٤٢٠ ومسلم ١٠٦٩

الْقَرَابَةِ وَأَجْرُ الصَّدَقَةِ »).[١] زەینەبی خێزانی عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوایان لێ بێت پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرد ئایا دروستە بۆ من مەسرەفی مێردەکەم و چەند منداڵکی هەتییو کەلامە بکەم بە پارەی زەکاتی خۆم؟ پێغەمبەریش فەرموی بەو کەسەی پرسیارەکەی زەینەبی لێ کردبوو: بەڵێ دوو پاداشتی هەیە، پاداشتی خزمایەتیو پاداشتی زەکاتەکەش).

(عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلِيَ أَجْرٌ أَنْ أُنْفِقَ عَلَى بَنِي أَبِي سَلَمَةَ إِنَّمَا هُمْ بَنِيَّ. فَقَالَ « أَنْفِقِي عَلَيْهِمْ، فَلَكِ أَجْرُ مَا أَنْفَقْتِ عَلَيْهِمْ».[٢] ئوممو سەلەمە ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێ ووتم: ئەی پێغەمبەر خوا ﷺ ئایا من پاداشتم دەگات کە مەسرەفی کوڕانی ئەبو سەلەمە بکەم چونکە کوڕی خۆمن؟ فەرمووی مەسرەفیان بکە پاداشتی ئەو مەسرەف کردنەت بۆ دەنووسرێت).

ئیمامی بوخاری ئەم دوو فەرمودەی باسمان کردن لەژێر ناونیشانی (الزكاة على الزوج والأيتام في الحجر) هێناویەتی، واتە: زەکاتدان بەمێردو هەتیوی لای زەکاتەدەر —ی ئافرەت-.

### زەکاتدان بەکاربەدەستی ستەمکار

ئەگەر زەکات بدرێت بەکاربەدەستی موسڵمانی ستەمکارو نارێك زەکاتە کەلەملی خاوەنەکەی دەبێتەوە (عن عَبْدَ اللَّهِ بن مسعود قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِى أَثَرَةً وَأُمُورًا تُنْكِرُونَهَا . قَالُوا فَمَا تَأْمُرُنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ « أَدُّوا إِلَيْهِمْ حَقَّهُمْ وَسَلُوا اللَّهَ حَقَّكُمْ »). عەبدوڵلای کوڕی مەسعودە ڕەزای خوای لێ بێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێمان: بێگومان دوا من خۆپەسندیو خۆی خۆیو ستانێك کە بەلاتانەوە خراپە دەبینن) عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ فەرمانێکمان پێ دەکەیت فەرمووی (مافی خۆیان پێ بدەنو مافی خۆشتان لەخوا داوا بکەن)[٣].

---

١) رواه البخاري ١٣٧٩ ومسلم ١٠٠٠

٢) رواه البخاري ١٣٩٨ ومسلم ١٠٠١

٣) رواه البخاري ٧٠٥٢

# زەكاتی سەرفیترە

**یەكەم:پێناسەكەی:** زەكاتێكە بەهۆی كۆتایی هاتنی رۆژووی مانگی رەمەزانەوە واجب دەبێت.

زانایان یەك دەنگن لەواجب بوونی، وە لەبەر چەند حیكمەتێك خوای گەورە پێوستی كردووە لەوانە: پاككەرەوەیە بۆ رۆژوەوانو سوپاسكردنی خوایە بە بۆنەی تەواوكردنی رۆژووی مانگی رەمەزانەوە وە هاوكاریو یارمەتیدانی هەژارانە لەلایەن دەوڵەمەند و دارایانەوەو راهێنانی موسڵمانانە بەگشتی بۆ بەخشینیماڵو سامان.

· عن بن عَبَّاسٍ (قال فَرَضَ رسول اللَّهِ ﷺ زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ من اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ من أَدَّاهَا قبل الصَّلَاةِ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلَاةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ من الصَّدَقَاتِ)[1]. عەبدوڵلای كوڕی عەبباس رەزای خوای لێ بێت دەڵێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ زەكاتی سەرفیترەی فەرز كرد پاككەرەوەی رۆژوەوان بێت لەقسەو كرداری ناپەسندو خۆراكیش بێت بۆ هەژاران جا هەر كەس پێش نوێژی جەژن دای ئەوە زەكاتێكی وەرگیراوە هەر كەسێكیش دوا نوێژی جەژن بیدات ئەو خێرێكە لە خێرەكان).

**دووەم: بەڵگەی زەكاتی سەرفیترە:**

(عنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى الْعَبْدِ وَالْحُرِّ وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِنْ الْمُسْلِمِينَ وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ)[2] . عەبدوڵلای كوڕی عومەر رەزای خوایان لەسەر بێت دەڵێت: (پێغەمبەری خوا زەكاتی سەرفیترەی واجب كرد مەنێك لە خورما یان لە جۆلەسەر كۆیلەو ئازادو نێرو مێو منداڵو گەورە ئەگەر ئەوانە موسڵمان بن، هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە پێش چوون بۆ نوێژی جەژن سەرفیترەكە بدرێت).

---

١) رواه ابوداود ١٦٠٩ ابن ماجة ١٨٢٧ والحاكم ٤٠٩/١

٢) رواه البخاري ١٥٠٣ ومسلم ٩٨٤

(عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضى الله عنه قَالَ كُنَّا نُعْطِيهَا فِي زَمَانِ النَّبِيِّ ﷺ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ ، فَلَمَّا جَاءَ مُعَاوِيَةُ وَجَاءَتِ السَّمْرَاءُ قَالَ أُرَى مُدًّا مِنْ هَذَا يَعْدِلُ مُدَّيْنِ). [١] ئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: (ئێمە لەکاتی پێغەمبەردا ﷺ مەنێك لە خۆراك یا لەخورما یا لەجۆ یا لەکەشك یا لەمێوژ زەکاتی سەرفیترەمان ئەدا جا کاتی موعاوییە هات بوویە گەورەی موسڵمانان ئەم گەنمەش پەیدا بوو ووتی مشتێك لەم گەنمە بەرانبەر دوو مشت لەو شتانەی تر دەبێت)، (قَالَ أَبُو سَعِيدٍ لاَ أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ) ئەبو سەعید دەڵێت بەڵام من لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا زەکاتی سەرفیترەکەم چۆن دەردەکرد هەروادەری دەکەم)[٢].

**سێیەم: کاتی واجب بوونی زەکاتی سەرفیترە:**

لەسوننەت وا بڵاوە زەکاتی سەرفیترە لە ساڵی دووەمی کۆچی واجب بووە لەهەمان ساڵدا کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی تێدا پێوست بووە.

**چوارەم: سەرفیترە کەی دەدرێت:**

(عَنِ عبدالله بْنِ عُمَرَ رضى الله عنهما قالَ: أَمَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلاَةِ). [٣] عەبدوڵلای کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێت دەڵێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد زەکاتی سەرفیترە پێش ڕۆشتنی خەڵك بۆنوێژی جەژن بدرێت).

وە دروستە ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ پێش جەژن بدرێت (عَنْ نَافِعٍ قالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ رضى الله عنهما يُعْطِيهَا الَّذِينَ يَقْبَلُونَهَا، وَكَانُوا يُعْطُونَ قَبْلَ الْفِطْرِ بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ). [٤] نافیع دەڵێت عەبدوڵلای کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێت زەکاتی سەرفیترەکەی دەدا بەو کەسانەی وەریان دەگرت، وە ئەوان ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ پێش جەژن سەرفیترەکەیان دەدا).

---

١) رواه البخاري ١٥٠٨،١٥٠٦،١٥٠٥ ومسلم ١٨،،١٧، ٩٨٥/١٩ وابوداود ١٦١٦

٢) رواه البخاري ١٥٠٨ ومسلم ٩٨٥/١٨

٣) رواه احمد٢/٥ والبخاري١٥٠٣ ومسلم ٩٨٤/١٤ وابوداود ١٦١٣ والترمذي ٦٧٥.

٤) رواه البخاري ١٥١١ وابوداود ١٦١٠

**پێنجەم: زەکاتی سەرفیترە بەکێ دەدرێت؟**

زەکاتی سەرفیترە دەدرێت بەو کەسانەی زەکاتیان پێ دەدرێت بەڵام پێویست ناکات هەموو ئەو کەسانەی زەکاتیان پێ دەدرێت لە زەکاتی سەرفیترەشدا پێیان بدرێت، چونکە دڵڕاگیراوانو کۆکەرەوانی زەکات پێیان نادرێتو پێویست ناکات، بەڵکو ئەوەی سەرفیترە دەدات خۆی دەیدات یا دەیدات بە کەسێك بیدات بە هەژاران، ﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ التوبة: ٦٠ ئەمە رای پێشەوایان ئەبو حەنیفەو مالیكو شافیعیو ئەحمەدو ئیبن حەزمە رحمەتی خوایان لێ بێت[١].

وەهەندێ لە زانایان دەڵێن دەدرێت بەهەژارانو نەداران، ئەمەش رای مالیكییەكانو ین تەیمییەیە[٢].

١) بروانه المجموع للنوي ٦/١٤٤ والدر المختار ٢/٣٦٩

٢) بروانه مجموع الفتاوى ٢٥/٧٣

# کتێبی حەج کردن

## حەجکردنی پێغەمبەر ﷺ

**یەکەم: حەج چییەو کەی فەرز بووە؟**

حەج: ووشەی (حَجٌّ)و (حِجٌّ) لە زمانی عەرەبیدا بەمانای جێی مەبەست دێ[١] و هەندێکیان دەڵێن: حەج واتە زۆر روو تێکردن سەردانی کردنی بە پیرۆز گیراوێك[٢].

عومرەش لەزمانی عەرەبیدا بەمانای سەردان دێ[٣].

وە لەشەرعدا ووشەی حەج رۆشتنە بۆ ماڵی خوا بەچەند کردەوەیەکی دیاریکراوو تایبەتەوە.

یا رۆشتنە بۆ ماڵی خوا بۆ بەجێهێنانی عیبادەتێکی تایبەت لەکاتێك تایبەتداو بەشێوەیەکی تایبەت[٤].

حەج قورئانو سونئەتو یەك دەنگی زانایان فەرز بووە لە دروشمە دیارو ئاشکراکانی ئیسلامە کە هەر کەس لە موسڵمانان ئینکاری بات کافر دەبێتو لەبازنەی ئیسلام دەچێتە دەرەوە.

**کەی حەج فەرز بوو؟**

حەج لەساڵی نۆی کۆچیدا فەرز بووە وە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا حەجێکی کردووەو ئەویش لەساڵی دەی کۆچیدا بوو پاش ئەوەی کەعبەی لە بتو بتپەرستان پاك کردەوە.

---

١) بروانە (النهاية في غريب الحديث والأثر ١/٣٤٠ وفتح الباري ٤/٤٨٢ ومختار الصحاح ص ١١٢).

٢) بروانە فتح الباري ٤/٤٨٢ وشرح صحيح مسلم للنووي ١١/٥.

٣) بروانە صحيح مسلم بشرح النووي ١١/٥.

٤) فتح الباري شرح صحيح البخاري ٤/٤٨٢ وصحيح مسلم بشرح النووي ١١/٥.

**دووەم: دەربارەی گەورەیی حەج:**

لە زۆر شوێنو دەقی قورئانو سوننەتدا پلیو پایەیی حەج باس کراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴾ البقرة: ١٩٦ واتە: وە حەجو عومرە بۆ خوا تەواو بکەن وە دەفەرموێت ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ آل عمران: ٩٧ واتە: هەقی خوایە بەسەر خەڵکەوە کە هەر کەسێك توانای هەبوو -ڕێ ی پێدرا- حەجی ماڵەکەی بکات، هەر کەسێکیش کافر بێت ئەوە دڵنیابن خوا بێ نیازە لەهەموو جیهانیان، وەدەفەرموێت: ﴿ وَأَذِّن فِى ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴾ الحج: ٢٧ واتە: جاڕ بدە بەناو خەڵکدا بێن بۆ حەج بەپیادەو بەسواری هەر وڵاخێکی لەڕو لاواز- بەهاتنیان لە ڕێگای دوورەوە- کە لە هەموو ڕێگایەکی دوورە دێن.

وەپێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: (مَنْ حَجَّ لِلَّهِ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ).[١] (هەر کەس حەج بکات هیچ قسەو کردەوەیەکی نابەجێ نەکاتو گوناهیش ئەنجام نەدات وەك ئەو ڕۆژی لەدایکبووە-بێگوناهـ- دەگەڕێتەوە).

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ سُئِلَ رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ قَالَ: « الإِيمَانُ بِاللَّهِ وبرسوله».. قَالَ ثُمَّ مَاذَا قَالَ « حَجٌّ مبرور»).[٢] ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا کام لە کردەوەکان چاکترە؟ فەرموی (بڕوا بەخوا و بە پێغەمبەرەکەی، ووترا دوا ئەوە چی تر فەرمووی (حەجێکی تێرو تەواو).

**سێیەم: حوکمی حەجو بەڵگەی فەرزبوونی:**

بەیەك دەنگی زانایانی ئیسلامیی حەج فەرزەو پایەیەکە لە پایەکانی ئیسلام کەس نییە ڕایەکی جیاواز لەم ڕایەی هەبێت لەناو موسڵمانان‌دا.

---

١) رواه البخاري ١٥٢١ ومسلم ١٣٥٠.

٢) رواه البخاري ٢٦ ومسلم ٨٣.

**بەڵگەی فەرز بوونی حەج:**

حەج بە قورئانو بە سوننەتو بەکۆ دەنگی زانایانی ئیسلام فەرز بووە ئەمەش بەڵگەکانە:

**لە قورئاندا:** خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَـٰتٌۢ بَيِّنَـٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ آل عمران: ٩٦ - ٩٧ واتە: بێگومان یەکەم ماڵی کەدانراوە بۆ -خواپەرستی- خەڵکی ئەو ماڵەیە کە لە بەککە-مەککە-دایە پیرۆزکراوو ڕێنموونییە بۆ جیهانیان چەند بەڵگەو نیشانەی دیاری تیایە-یەکێکیان- شوێن وەستانەکەی ئیبراهیمەو هەرکەس چوو بێتە ئەو شوێنە بێ ترس بووە(لەزیانو ئازاردان)وە بۆ خوا هەیە بەسەر خەڵکییەوە حەج کردنی ئەو ماڵە، هەر کەس کە توانای گەیشتنی (ڕۆشتنی) هەبێت بۆ ئەو ماڵە، هەر کەسێکیش باوەڕی نەبێت (یاتوانای هەبێت نەڕوات) ئەو بێگومان خوا بێ نیازەی لەهەموو جیهانیان.

**لەسوننەتدا:** («عن أبي هريرة رضي الله عنه قال رسول الله (ﷺ): بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ وحَجُّ الْبَيْتِ لَمَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً». [١] ئەبو هورەیرە-ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزرێنراوە: شایەتیدان بەوەی کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لەخوا وە کە موحەممەد پێغەمبەر ی خودایەو نوێژکردنو زەکاتو ڕۆژووگرتنی ڕەمەزانو حەجی ماڵی خوا بۆ کەسێك کە توانای گەیشتنی ئەو ماڵەی هەبێت).

زانایانی ئیسلام یەك دەنگنو کۆن کە حەج لە تەمەندا یەك جار واجبە بۆ ئەو کەسەی توانای هەبێت.[٢]

بۆیە هەر کەس دانی پێدانەنێت کافر دەبێتو لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە.

---

١) رواه البخاري ٨ ومسلم ١٦/١٩

٢) بروانە المجموع شرح المهذب ١٣/٧ والمغني لإبن قدامة ٢١٧/٣

**چوارەم: حوکمی حەجی منداڵ:**

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أَنَّ امْرَأَةً رَفَعَتْ إِلَي النَّبِيِّ ﷺ صَبِيًّا فَقَالَتْ: أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: «نَعَمْ وَلَكِ أَجْرٌ»).[١] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ڕەزای خوایان لێ بێت دەڵێت: (ئافرەتێك منداڵێکی بەرز کردەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ-تابیبینێ-و وتی: ئەمە حەجی بۆ هەیە و دروستە؟ فەرمووی: بەڵێ‌و پاداشتەکەی بۆ تۆیە).

(عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ حُجَّ بِى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا ابْنُ سَبْعِ سِنِينَ). سائبی کوڕی یەزید ڕەازی خوای لێ بێت دەڵێت: (لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ حەجیان پێکردم لەکاتێکدا کە تەمەنم حەوت ساڵ بوو)[٢].

(عن عائشة رضي الله عنها قالت: قالَ ﷺ: « رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَفيق»).[٣] ئەم فەرمودەی عائیشە دەیگێڕێتەوە پاڵپشتی ئەوە دەکات کە حەجی منداڵ دروست نەبێت کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (سێ کەس قەڵەمی -تاوان نووسین- یان لەسەر هەڵگیراوە، لەسەر خەوتوو هەتا لەو خەو هەڵدەسێ‌و لەسەر منداڵ هەتا باڵغ دەبێت‌و لەسەر شێت هەتا چاك دەبێتەوە).

**پێنجەم: حەجکردنی کەسێک لەبری کەسێکی تر:**

**ئەگەر کەسێك نەخۆش یا پیر یامرد بێت‌و منداڵ‌و براو خزمی حەجی بۆ بکەن دروستە بەم بەڵگانە:**

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ امْرَأَةً مِنْ خَثْعَمَ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِى شَيْخٌ كَبِيرٌ عَلَيْهِ فَرِيضَةُ اللَّهِ فِى الْحَجِّ وَهُوَ لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَسْتَوِىَ عَلَى ظَهْرِ بَعِيرِهِ. فَقَالَ النَّبِىُّ ﷺ « فَحُجِّى عَنْهُ»).[٤] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ڕەزای خوایان لێ بێت دەڵێت: (ئافرەتێکی خەسعەمی

---

١) رواه مسلم ١٣٣٦/٤٠٩ وابو داود ١٧٣٦

٢) رواه البخاري ١٨٥٨ واحمد ٤٤٩/٣

٣) رواه احمد ١٠٠/٦ وأبوداود ٤٣٩٨ والنسائي ١٥٦/٦ صحيح

٤) رواه البخاري ١٥/٣، ١٨٥٤ ومسلم ١٣٣٤/٤٠٧

ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوکم حەجی لەسەر فەرز بووە پیرو بەتەمەنە ناتوانێت بەسەر پشتی وەشترەکەیەوە بوەستێ فەرمووی: (تۆ حەجی بۆ بکە).

(عَنْ أَبِي رَزِينٍ الْعُقَيْلِيِّ أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ لاَ يَسْتَطِيعُ الْحَجَّ وَلاَ الْعُمْرَةَ وَلاَ الظَّعْنَ. قَالَ « حُجَّ عَنْ أَبِيكَ وَاعْتَمِرْ»).[1] ئەبو رەزینی عوقەیلی رەزای خوای لێ بێ دەڵێت رۆشتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ووتی: باوکم پیرو بەساڵاچووە ناتوانێت حەجو عومرە بکاتو بەسواری بڕوات، فەرمووی: (حەجو عومرە بکە بۆ باوکت).

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضى الله عنهما أَنَّ امْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: إِنَّ أُمِّي نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ ، فَلَمْ تَحُجَّ حَتَّى مَاتَتْ أَفَأَحُجُّ عَنْهَا قَالَ «نَعَمْ. حُجِّي عَنْهَا، أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ أَكُنْتِ قَاضِيَةً).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رەزای خوایان لێ بێت دەڵێت: ئافرەتێکی هۆزی جوهەینە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ووتی دایکم نەزری کرد حەج بکات بەڵام حەجەکەی نەکرد هەتا مرد ئایا دەبێ من حەجی بۆ بکەم فەرمووی ((بەڵێ حەجی بۆ بکە پێم بڵێ ئەگەر دایکت قەرزدار بوایە بۆت دەدایەوە؟)).

## شەشەم: حەج لە سەرکێ واجبە؟

حەج لەسەر کەسێك واجبە کە ئەم شەش مەرجەی تێدا بێت:

١ـ **موسڵمان بوون:** حەج لەسەر ناموسڵمان واجب نییە لەدنیادا داوا لێ بکرێت بیکات، چونکە حەج لەو پەرستشانەیە موسڵمان بوون مەرج بۆ دروستی ئەو پەرستشە.

٢ـ **عاقڵ بوون:** کەسێك شێت بێت حەجی لەسەر نییە، چونکە جیاوازی ناکات لەنێوان چاکو خراپدا وە کەسێ خوا عەقڵی لێسەندەوە واجبەکانی لەسەر نامێنێتو بەرپرسیارێتی پەیوەستە بە عەقڵەوە.

٣ـ **باڵغ بوون:** حەج لەسەری نابالغ واجب نییە، چونکە منداڵ داوای حەجو پەرستشەکانی تری لێ ناکرێت (: قالَ رسول الله ﷺ: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ

---

١) رواه أحمد ٤/١٠ ، ١١، ١٢ وابوداود ١٨١٠ والترمذي ٩٣١ والنسائي ١١٧/٥ وابن ماجه ٢٩٠٦ صحيح

٢) رواه البخاري ٦٦٩٩ والنسائي ١١٦/٥

حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَفِيقَ»).[1] پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (قەڵەمی تاوان لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە لەسەر خەوتوو هەتا لەو خەو هەڵدەسێو لەسەر منداڵ هەتا باڵغ دەبێتو لەسەر شێت هەتا چاك دەبێتەوە).

**٤ـ ئازادی:** دەبێت ئەو کەسە کۆیلە نەبێت چونکە کۆیلە ماڵی نییە بەڵکو خۆشی هی خاوەنەکەیەتی.

**٥ـ ڕێگا ترسی تێدا نەبێت:** ئەگەر موسڵمان ترسی دوژمنی هەبوو بۆ گیانی یا سامانی یا ڕێگا ترسی هەبوو بەهۆی جەنگو شتی واوە ئەوە حەج واجب نییە لەسەری، چونکە تووشی زەرەرو زیان دەبێت قورئانیش دەفەرموێت ﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ البقرة: ١٩٥ بەگشتی ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێت نابێت ئادەمیزاد بەدەستی خۆی خۆی تووشی ئەزێتو زیان بکات.

**٦ـ توانا بوون:** خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴾ آل عمران: ٩٧ واتە: هەقی خوایە بەسەر خەڵکییەوە حەجی ماڵ-ی خوا- بکە بۆ هەر کەسێ توانای چوونی هەبێت بۆ ئەو ماڵە.

(عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا يُوجِبُ الْحَجَّ قَالَ « الزَّادُ وَالرَّاحِلَةُ»)[2]. عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێت دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی حەج واجب دەکات؟ فەرموی: تۆێشوو وڵاخی سواری) تۆیشوو وەڵاخ مانای تواناکەیە کە لە قورئاندا هاتووە بۆ حەج کردن .

توانا بەچی دەبێت؟ توانا بەوە دەبێت مرۆڤ ئەوەندە سامانی هەبێت بۆ ڕۆشتنو گەڕانەوە بەشی بکات وەدەبێت ئەم سامانە زیاد بێت لە مەسرەفی خۆیو خێزانی و قەرزاری-ئەگەر قەرزار بوو- وە توانا بوونیش دوو جۆرە:

---

١) پێشتر باسکرا.

٢) رواه الترمذي ٨١٣ وقال حديث حسن

**أ ـ توانابوونی ڕاستەوخۆ:** ئەو کەسەی خۆی بتوانێت حەج بکاتو لەش ساغ بێت توانای سەفەری حەج و بەجێهێنانی ئەرکەکانی هەبێت بێ ئەوەی زەرەرو زیانێکی وا لێ بکەوێت لەتوانایدا نەبێت.

**ب ـ توانابوونی ناڕاستەوخۆ:** ئەوەیە سامانی هەبێت بۆ حەجکردن کە کەسێکی تر حەجی بۆ بکات خۆی لە ژیاندا بێت کاتێ کە خۆی لەبەر نەخۆشی یا پیری نەتوانێ حەج بکات یا پاش مردنی بێت.

### حەوتەم: حەج کردنی ئافرەت:

ئەگەر مەرجەکانی توانابوون کە باسکرا لە ئافرەتدا هەبوو حەجی لەسەر واجب دەبێت وەك پیاو، لەگەڵ مەرجێکی زیاتر کە دەبێت لە ئافرەتدا ببێت: مێرد یا مەحرەمێکی لەگەڵیدا بێت ئەگەر نەبوو ئەوە واجب نییە لەسەری، (عن ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ سَمِعْتُ النَّبِىَّ ﷺ يَخْطُبُ يَقُولُ « لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلاَّ وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ وَلاَ تُسَافِرِ الْمَرْأَةُ إِلاَّ مَعَ ذِى مَحْرَمٍ ». فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ امْرَأَتِى خَرَجَتْ حَاجَّةً وَإِنِّى اكْتُتِبْتُ فِى غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا. قَالَ « انْطَلِقْ فَحُجَّ مَعَ امْرَأَتِكَ»).[1] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ڕەزای خوایان لێ بێت- دەڵێت: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرموی: پیاو بەتەنیا لەگەڵ ئافرەتی بێگانەدا نەبێت مەگەر مەحرەمێکی لەگەڵدا بێتو ئافرەت سەفەر نەکات لەگەڵ مەحرەمدا نەبێت) پیاوێك هەستاو ووتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرەکەم دەڕوات بۆ حەجو منیش لەو غەزایەدا بەشداری دەکەم فەرمووی: بڕۆ لەگەڵ هاوسەرکەتدا حەج بکە).

### هەشتەم: میقاتە کاتیو شوێنیەکانی حەج

بۆ ئیحرام بەستنی حەج چەند کاتو شوێنێك مەرجە کەدەبێت ڕەچاوبکرێنو لەبەرچاوبگیرێن:

**١ـ کاتەکانی ئیحرام بەستنی بەحەجو عومرە:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ۖ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ﴾ البقرة:١٨٩ واتە: دەربارەی نوێ بوونەوەی مانگە نوێکان پرسیارت لێ دەکەن تۆش بڵێ ئەمانە

---

١) رواه البخاري ٣٠٠٦ ومسلم ١٣٤١

نیشانەی کاتەکانن بۆ خەڵکیو بۆ حەج و دەفەرموێت ﴿ ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ ﴾ البقرة:١٩٧ واتە: کاتی حەج کردن لە چەند مانگێکی دیاری کراودایە، زۆربەی زانایان رایان وایە کە مانگەکانی حەج تێدا کردن (شوال و ذي القعده)و دە رۆژی سەرەتای مانگی (ذو الحجه)ن، (قال ابْنُ عُمَرَ رضى الله عنهما أَشْهُرُ الْحَجِّ شَوَّالٌ وَذُو الْقَعْدَةِ وَعَشْرٌ مِنْ ذِي الْحَجَّةِ).[1] عەبدوڵلای کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێت دەڵێت: (مانگەکانی حەج کردن (شوال و ذو القعده)و دە رۆژی سەرەتای (ذو الحجة)ن) وە (وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رضى الله عنهما مِنَ السُّنَّةِ أَنْ لاَ يُحْرِمَ بِالْحَجِّ إِلاَّ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ).[2] عەبدوڵلای کوڕی عەباس ڕەزای خوایان لێ بێت دەڵێت: (سوننەت وایە لەمانگەکانی حەجکردندا نەبێت ئیحرام بەحەج نەبەسترێت).

**٢ـ شوێنەکانی ئیحرام تێدا بەستن بەحەجو عومرە:**

(عَنِ عبدالله بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَقَّتَ لأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلأَهْلِ الشَّأْمِ الْجُحْفَةَ، وَلأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنَ الْمَنَازِلِ، وَلأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ، هُنَّ لَهُنَّ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِهِنَّ ، مِمَّنْ أَرَادَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ ، وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَمِنْ حَيْثُ أَنْشَأَ ، حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ مِنْ مَكَّةَ).[3] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ڕەزای خوایان لێ بێت دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ (ذو الخليفه)ی کردە شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی مەدینەو (جُحفة) بۆ خەڵکی شامو (قَرن المنازل) بۆ خەڵکی نەجدو (يَلَملَم) بۆ خەڵکی یەمەن، فەرمووی (ئەم جێگایانە شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی ئەو شوێنانەو هەر کەسێکی تریشە کە بە مەبەستی حەجو عەمرە پیاندا دێ، کەسێکیش لەو جێگایانە نزیکترە لە+مەککە ئەو ئیحرامە بەستنەکەی لە شوێنی خۆیەتی تەنانەت خەڵکی مەککە لەمەکە ئیحرام دەبەستن).

(عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال يُهِلُّ أَهْلُ الْمَدِينَةِ من ذِي الْحُلَيْفَةِ وأهل الشام من الْجُحْفَةِ وَأَهْلُ نَجْدٍ من قَرْنٍ قال عبد اللَّهِ وَبَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال وَيُهِلُّ

---

١) رواه البخاري معلق ٤١٩/٣.

٢) رواه البخاري معلق ٤١٩/٣.

٣) رواه البخاري (١٥٢٤، ١٥٢٦، ١٥٢٩، ١٥٣٠،) ومسلم (١٨٨١/١٢)

أَهْلُ الْيَمَنِ من يَلَمْلَم).[١] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لیٚ بیٚت دەڵیٚت (پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (خەڵکی مەدینە لە (ذا الحليفة) وە ئیحرام دەبەستنو خەڵکی شام لە (جُحفة) وە خەڵکی نەجد لە (قَرن المنازل) ەوە) عەبدوڵڵا دەڵیٚت و پیٚم گەشتووە کە پیٚغەمبەر ﷺ فەرمویەتی (ئیحرام بەستنی خەڵکی یەمەنیش لە(يَلَملَم) ەوەیە).

(عَنْ عَائِشَةَ رضی الله عنها أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَقَّتَ لأَهْلِ الْعِرَاقِ ذَاتَ عِرْقٍ).[٢] عائیشە ڕەزای خوای لیٚ بیٚت دەڵیٚت: (پیٚغەمبەری خوا ﷺ (ذات عرق) بۆ خەڵکی عیٚراق دیاری کرد-ئیحرام تیٚدا بەستن)، کەواتە شویٚنی ئیحرام بەستنەکان ئەمانەن:

(ذو الحليفة) شویٚنی ئیحرام بەستنی خەڵکی مەدینەیە، دێیەکە ٤٥٠کم لەمەککەوە دوورە کە دوورترین شویٚنی ئیحرام بەستنە لە مەککەوە.

(جُحفة) شویٚنی ئیحرام بەستنی خەڵکی شامە، دێیەکە ١٨٧ کم لە مەککەوە دوورە ئیٚستا ڕوخاوە بۆیە خەڵکی ئیٚستا لە (رابغ) ەوە ئیحرام دەبەستن کە ٢٠٤ کم لەمەککەوە دوورە.

(قَرن المنازل) پیٚشی دەوتریٚت (قرن الثعالب) شویٚنی ئیحرامە بەستنی خەڵکی نەجدە ٩٤ کم لە مەککەوە دوورە.

(يَلَملَم) شویٚنی ئیحرام بەستنی خەڵکی یەمەنەوە ٥٤ کم لەمەککەوە دوورە.

(ذات عرق) شویٚنی ئیحرام بەستنی خەڵکی عیٚراقە شویٚنیٚکە لەنیٚوان نەجدو توهامەدایەو ٩٤ کم لە مەککەوە دوورە.

**نۆیەم: چۆنیەتی حەج کردنی پیٚغەمبەر ﷺ**

(عن جابر بن عبدالله رضي الله عنه: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَكَثَ تِسْعَ سِنِينَ لم يَحُجَّ ثُمَّ أَذَّنَ في الناس في الْعَاشِرَةِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَاجٌّ فَقَدِمَ الْمَدِينَةَ بَشَرٌ كَثِيرٌ كلهم يَلْتَمِسُ أَنْ يَأْتَمَّ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَيَعْمَلَ مِثْلَ عَمَلِهِ فَخَرَجْنَا معه حتى أَتَيْنَا ذَا الْحُلَيْفَةِ فَوَلَدَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ مُحَمَّدَ بن أبي بَكْرٍ فَأَرْسَلَتْ إلى رسول اللَّهِ ﷺ كَيْفَ أَصْنَعُ قال اغْتَسِلِي وَاسْتَثْفِرِي بِثَوْبٍ وَأَحْرِمِي فَصَلَّى رسول اللَّهِ ﷺ في الْمَسْجِدِ ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حتى إذا اسْتَوَتْ بِهِ نَاقَتُهُ على الْبَيْدَاءِ

---

١) رواه البخاري ١٥٢٥ ومسلم ١١٨٢.

٢) رواه ابو داود ١٧٤٠ والنسائي ١٢٥/٥.

نَظَرْتُ إلى مَدِّ بَصَرِي بين يَدَيْهِ من رَاكِبٍ وَمَاشٍ وَعَنْ يَمِينِهِ مِثْلَ ذلك وَعَنْ يَسَارِهِ مِثْلَ ذلك وَمِنْ خَلْفِهِ مِثْلَ ذلك وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ بين أَظْهُرِنَا وَعَلَيْهِ يَنْزِلُ الْقُرْآنُ وهو يَعْرِفُ تَأْوِيلَهُ وما عَمِلَ بِهِ من شَيْءٍ عَمِلْنَا بِهِ فَأَهَلَّ بِالتَّوْحِيدِ لَبَّيْكَ اللهم لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لك لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لك وَالْمُلْكَ لَا شَرِيكَ لك وَأَهَلَّ الناس بهذا الذي يُهِلُّونَ بِهِ فلم يَرُدَّ رسول اللَّهِ ﷺ عليهم شيئا منه وَلَزِمَ رسول اللَّهِ ﷺ تَلْبِيَتَهُ قال جَابِرٌ رضي الله عنه لَسْنَا نَنْوِي إلا الْحَجَّ لَسْنَا نَعْرِفُ الْعُمْرَةَ حتى إذا أَتَيْنَا الْبَيْتَ معه اسْتَلَمَ الرُّكْنَ فَرَمَلَ ثَلَاثًا وَمَشَى أَرْبَعًا ثُمَّ نَفَذَ إلى مَقَامِ إبراهيم عليه السَّلَام فَقَرَأَ ( وَاتَّخِذُوا من مَقَامِ إبراهيم مُصَلًّى) فَجَعَلَ الْمَقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ فَكَانَ يَقْرَأُ في الرَّكْعَتَيْنِ قُلْ هو الله أَحَدٌ وَقُلْ يا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ثُمَّ رَجَعَ إلى الرُّكْنِ فَاسْتَلَمَهُ ثُمَّ خَرَجَ من الْبَابِ إلى الصَّفَا فلما دَنَا من الصَّفَا قَرَأَ ( إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ من شَعَائِرِ اللَّهِ ) أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ الله بِهِ فَبَدَأَ بِالصَّفَا فَرَقِيَ عليه حتى رَأَى الْبَيْتَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَوَحَّدَ اللَّهَ وَكَبَّرَهُ وقال لَا إِلَهَ إلا الله وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ له له الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وهو على كل شَيْءٍ قَدِيرٌ لَا إِلَهَ إلا الله وَحْدَهُ أَنْجَزَ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ ثُمَّ دَعَا بين ذلك قال مِثْلَ هذا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ نَزَلَ إلى الْمَرْوَةِ ففعل على المروة كما فعل على الصفا حتى إذا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ في بَطْنِ الْوَادِي سَعَى حتى إذا صَعِدَتَا مَشَى حتى أَتَى الْمَرْوَةَ فَفَعَلَ على الْمَرْوَةِ كما فَعَلَ على الصَّفَا حتى إذا كان آخِرُ طَوَافِهِ على الْمَرْوَةِ فقال لو أَنِّي اسْتَقْبَلْتُ من أَمْرِي ما اسْتَدْبَرْتُ لم أَسُقْ الْهَدْيَ وَجَعَلْتُهَا عُمْرَةً فَمَنْ كان مِنْكُمْ ليس معه هَدْيٌ فَلْيَحِلَّ وَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً فَقَامَ سُرَاقَةُ بن مَالِكِ بن جُعْشُمٍ فقال يا رَسُولَ اللَّهِ أَلِعَامِنَا هذا أَمْ لِأَبَدٍ فَشَبَّكَ رسول اللَّهِ ﷺ أَصَابِعَهُ وَاحِدَةً في الْأُخْرَى وقال دَخَلَتْ الْعُمْرَةُ في الْحَجِّ مَرَّتَيْنِ لَا بَلْ لِأَبَدِ أَبَدٍ وَقَدِمَ عَلِيٌّ من الْيَمَنِ بِبُدْنِ النبي ﷺ فَوَجَدَ فَاطِمَةَ رضي الله عنها مِمَّنْ حَلَّ وَلَبِسَتْ ثِيَابًا صَبِيغًا وَاكْتَحَلَتْ فَأَنْكَرَ ذلك عليها فقالت إِنَّ أبي أَمَرَنِي بهذا قال فَكَانَ عَلِيٌّ يقول بِالْعِرَاقِ فَذَهَبْتُ إلى رسول اللَّهِ ﷺ مُحَرِّشًا على فَاطِمَةَ لِلَّذِي صَنَعَتْ مُسْتَفْتِيًا لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِيمَا ذَكَرَتْ عنه فَأَخْبَرْتُهُ أَنِّي أَنْكَرْتُ ذلك عليها فقال صَدَقَتْ صَدَقَتْ مَاذَا قُلْتَ حين فَرَضْتَ الْحَجَّ قال قلت اللهم إني أُهِلُّ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُكَ قال فإن مَعِيَ الْهَدْيَ فلا تَحِلُّ قال فَكَانَ جَمَاعَةُ الْهَدْيِ الذي قَدِمَ بِهِ عَلِيٌّ من الْيَمَنِ وَالَّذِي أتى بِهِ النبي ﷺ مِائَةً قال فَحَلَّ الناس كلهم وَقَصَّرُوا إلا النبي ﷺ وَمَنْ كان معه هَدْيٌ فلما كان يَوْمُ التَّرْوِيَةِ تَوَجَّهُوا إلى

مِنًى فَأَهَلُّوا بِالْحَجِّ وَرَكِبَ رسول اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى بِهَا الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ وَالْفَجْرَ ثُمَّ مَكَثَ قَلِيلًا حتى طَلَعَتْ الشَّمْسُ وَأَمَرَ بِقُبَّةٍ من شَعَرٍ تُضْرَبُ له بِنَمِرَةَ فَسَارَ رسول اللَّهِ ﷺ ولا تَشُكُّ قُرَيْشٌ إلا أَنَّهُ وَاقِفٌ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ كما كانت قُرَيْشٌ تَصْنَعُ في الْجَاهِلِيَّةِ فَأَجَازَ رسول اللَّهِ ﷺ حتى أتى عَرَفَةَ فَوَجَدَ الْقُبَّةَ قد ضُرِبَتْ له بِنَمِرَةَ فَنَزَلَ بها حتى إذا زَاغَتْ الشَّمْسُ أَمَرَ بِالْقَصْوَاءِ فَرُحِلَتْ له فَأَتَى بَطْنَ الْوَادِي فَخَطَبَ الناس وقال إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هذا في شَهْرِكُمْ هذا في بَلَدِكُمْ هذا ألا كُلُّ شَيْءٍ من أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمَيَّ مَوْضُوعٌ وَدِمَاءُ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ وَإِنَّ أَوَّلَ دَمٍ أَضَعُ من دِمَائِنَا دَمُ بن رَبِيعَةَ بن الْحَارِثِ كان مُسْتَرْضِعًا في بَنِي سَعْدٍ فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ وَرِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ وَأَوَّلُ رِبًا أَضَعُ رِبَانَا رِبَا عَبَّاسِ بن عبد الْمُطَّلِبِ فإنه مَوْضُوعٌ كُلُّهُ فَاتَّقُوا اللَّهَ في النِّسَاءِ فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللَّهِ وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ ولكم عَلَيْهِنَّ أَنْ لَا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ فَإِنْ فَعَلْنَ ذلك فَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غير مُبَرِّحٍ وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وقد تَرَكْتُ فِيكُمْ ما لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ إن اعْتَصَمْتُمْ بِهِ كِتَابُ اللَّهِ وَأَنْتُمْ تُسْأَلُونَ عَنِّي فما أَنْتُمْ قَائِلُونَ قالوا نَشْهَدُ أَنَّكَ قد بَلَّغْتَ وَأَدَّيْتَ وَنَصَحْتَ فقال بِإِصْبَعِهِ السَّبَّابَةِ يَرْفَعُهَا إلى السَّمَاءِ وَيَنْكُتُهَا إلى الناس اللهم اشْهَدْ اللهم اشْهَدْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ أَذَّنَ ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ و لم يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شيئا ثُمَّ رَكِبَ رسول اللَّهِ ﷺ حتى أتى الْمَوْقِفَ فَجَعَلَ بَطْنَ نَاقَتِهِ الْقَصْوَاءِ إلى الصَّخَرَاتِ وَجَعَلَ حَبْلَ الْمُشَاةِ بين يَدَيْهِ وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فلم يَزَلْ وَاقِفًا حتى غَرَبَتْ الشَّمْسُ وَذَهَبَتْ الصُّفْرَةُ قَلِيلًا حتى غَابَ الْقُرْصُ وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ خَلْفَهُ وَدَفَعَ رسول اللَّهِ ﷺ وقد شَنَقَ لِلْقَصْوَاءِ الزِّمَامَ حتى إِنَّ رَأْسَهَا لَيُصِيبُ مَوْرِكَ رَحْلِهِ وَيَقُولُ بيده اليمني أَيُّهَا الناس السَّكِينَةَ السَّكِينَةَ كُلَّمَا أتى حَبْلًا من الْحِبَالِ أَرْخَى لها قَلِيلًا حتى تَصْعَدَ حتى أتى الْمُزْدَلِفَةَ فَصَلَّى بها الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ و لم يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا شيئا ثُمَّ اضْطَجَعَ رسول اللَّهِ ﷺ حتى طَلَعَ الْفَجْرُ وَصَلَّى الْفَجْرَ حين تَبَيَّنَ له الصُّبْحُ بِأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حتى أتى الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَدَعَاهُ وَكَبَّرَهُ وَهَلَّلَهُ وَوَحَّدَهُ فلم يَزَلْ وَاقِفًا حتى أَسْفَرَ جِدًّا فَدَفَعَ قبل أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ وَأَرْدَفَ الْفَضْلَ بن عَبَّاسٍ وكان رَجُلًا حَسَنَ الشَّعْرِ أَبْيَضَ وَسِيمًا فلما دَفَعَ رسول اللَّهِ ﷺ مَرَّتْ بِهِ ظُعُنٌ يَجْرِينَ فَطَفِقَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهِنَّ فَوَضَعَ رسول اللَّهِ ﷺ يَدَهُ على وَجْهِ الْفَضْلِ فَحَوَّلَ الْفَضْلُ وَجْهَهُ إلى

الشِّقِّ الْآخَرِ يَنْظُرُ فَحَوَّلَ رسول اللَّهِ ﷺ يَدَهُ من الشِّقِّ الْآخَرِ على وَجْهِ الْفَضْلِ يَصْرِفُ وَجْهَهُ من الشِّقِّ الْآخَرِ يَنْظُرُ حتى أتى بَطْنَ مُحَسِّرٍ فَحَرَّكَ قَلِيلًا ثُمَّ سَلَكَ الطَّرِيقَ الْوُسْطَى التي تَخْرُجُ على الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى حتى أتى الْجَمْرَةَ التي عِنْدَ الشَّجَرَةِ فَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مع كل حَصَاةٍ منها مِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ رَمَى من بَطْنِ الْوَادِي ثُمَّ انْصَرَفَ إلى الْمَنْحَرِ فَنَحَرَ ثَلَاثًا وَسِتِّينَ بيده ثُمَّ أَعْطَى عَلِيًّا فَنَحَرَ ما غَبَرَ وَأَشْرَكَهُ في هَدْيِهِ ثُمَّ أَمَرَ من كل بَدَنَةٍ بِبَضْعَةٍ فَجُعِلَتْ في قِدْرٍ فَطُبِخَتْ فَأَكَلَا من لَحْمِهَا وَشَرِبَا من مَرَقِهَا ثُمَّ رَكِبَ رسول اللَّهِ ﷺ فَأَفَاضَ إلى الْبَيْتِ فَصَلَّى بِمَكَّةَ الظُّهْرَ فَأَتَى بَنِي عبد الْمُطَّلِبِ يَسْقُونَ على زَمْزَمَ فقال انْزِعُوا بَنِي عبد الْمُطَّلِبِ فَلَوْلَا أَنْ يَغْلِبَكُمْ الناس على سِقَايَتِكُمْ لَنَزَعْتُ مَعَكُمْ فَنَاوَلُوهُ دَلْوًا فَشَرِبَ منه).

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نۆ ساڵ مایەوە ـ لە مەدینە ـ حەجی نەکرد، پاشان لە ساڵی دەیەمدا لەناو خەڵکیدا جاڕی دا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ساڵ حەج دەکات بۆیە خەڵکێکی زۆر هاتن بۆ مەدینەو هەموویان دەیانویست چاو لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن و وەك ئەو بکەن، جا لەگەڵی ڕۆشتن تا گەیشتنە (ذو الحليفة) لەوێ ئەسمائی کچی عومەیس موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری بوو، کەسێکی نارد بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ کەچی بکەم؟! فەرمووی: خۆت بشۆو بە پەڕۆیەك خۆت قایم بکەو ئیحرام ببەستە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتەکەدا نوێژی کردو سواری وشترەکەی بوو، کە قەصوای ناو بوو جا کاتی بە سوار وشترەکەی گە یشتە بەیداء ـ دەشت ـ تەماشای بەردەمیم کرد هەتا چاو بڕ دەکات لە سوارو پیادە هەبوو، هەروەها لای ڕاستەو لای چەپو لە پشتەوە بە هەمان شێوە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوانماندا بوو قورئانی بۆ دادەبەزی ئەویش مەبەستەکەی دەزانی، ئەو هەرچییەکی دەکرد ئێمەش دەمانکرد ئیحرامی بەست لەگەڵ وتنی: (لَبَّيْكَ اللهم لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لك لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لك وَالْمُلْكَ لَا شَرِيكَ لك) خەڵکیش هەموو ئیحرامیان بەست لەگەڵ وتنی ئەو وشانەدا.

پێغەمبەریش ﷺ پێی نەبڕین، بەڵکو بەردەوام بوو لەسەری.. جابیر دەڵێ: ئێمە نیەتمان تەنیا حەج بوو، عومرەمان نەدەزانی، ڕۆشتین هەتا لە خزمەتیا گەشتینە ماڵی خوا ـ کەعبە ـ ئەنجا دەستی دا لە بەردە ڕەشەکەو سێ جار بە خێرایی‌و چوار جاریشیان بە ڕۆشتنی ئاسایی تەوافی

کرد، ئینجا چوو لای (مقام ابراهیم) سەلامی خوای لێ بێ ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴾ البقرة: ١٢٥ ئینجا مقام ابراهیمی خستە نێوان خۆیو بەیتەوە دوو رکات نوێژی دابەست، لە رکاتی یەکەمدا (قل هو الله احد)ی خوێندو لە رکاتی دووەمدا (قل یاأیها الکافرون)ی خوێند، پاشان گەڕایەوە بۆ لای بەردە رەشەکەو دەستی لێداو دوای لە دەرگاکەوە بەرو صەفا رۆشت کە لێی نزیك بوویەوە (إن الصفا والمروه من شعائر الله) خوێند و فەرمووی: (لا اله الا الله وحده لاشریك له، له الملك وله الحمد وهو علی کل شئ قدیر لا اله الا الله وحده انجز وعده ونصر عبده وهزم الاحزاب وحده) سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە لە نێوانیشیاندا دوعای دەکرد پاشان بەرەو مەروە هاتەخوار هەتا گەیشتە قوڵایی دۆڵەکە، ئەوسا کەوتە ڕاکردن تا سەرکەوت ئینجا دەکەوتە رۆیشتن تا گەیشتەوە مەروە لەسەر مەروەش ئەوەی کرد لەسەر صەفاکردی تا لە دواهەمین تەوافدا لەسەر مەروە فەرمووی (ئەگەر ئەوەی تێپەری بۆم بێتەوە پێش قوربانی لەگەڵ خۆم ناهێنم و ئەمەیان دەکەمە عومرە جا هەر کامێکتان قوربانی نەهێناوە با ئیحرام بشکێنێ و ئەم تەوافە و سەعییە بکاتە عومرە). سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوم (رەزای خوای لێبێ) هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر بۆ ئەم ساڵمان یا بۆ هەمیشەیە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەنجەکانی هەردوو دەستی کرد بەناو یەکتریداو دوو جار فەرمووی: (عومرە چووە ناو حەجەوە) وە فەرمووی (نەخێر بەڵکو بۆ هەتا هەتایە).

عەلی ـ رەزای خوای لێ بێت ـ کە لەیەمەنەوە هاتبۆوە بەووشترەکانی پێغەمبەری خواوە جا بینی فاتیمە لەوانەیە ئیحرامیان شکاندوە پۆشاکی رەنگاوڕەنگی لەبەر کردووەو چاوی رشتووە، ئەویش نارەزایی دەربڕی فاتیمە ووتی: باوکم فەرمانی پێکردوم بەمە، جا عەلی لەعێراق دەیووت: ئەنجا منیش چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نارەزاییم دەربڕی دەربارەی ئەوەی فاتیمە کردبووی داوای رای پێغەمبەری خوام (ﷺ) کردکە ئەو ووتی دەربارەی، ووتم من نارەزاییم دەربڕیوە لەوەی ئەو کردبووی ئەویش فەرمووی: (راست دەکات، راست دەکات ئەو کاتەی ئیحرامت بەحەج بەست چیت ووت؟) عەلی ووتی: ئەی خوایە ئیحرام دەبەستم بەوەی پێغەمبەرەکەت ئیحرامی بۆ بەستووە، پێغەمبەریش فەرمووی: (دەی من قوربانیم هێناوە تۆش

ئیحرام مەشکێنە) جا کۆی ئەو قوربانیانەی کە عەلی لەیەمەنەوە هێنابووی لەگەڵ ئەوانەی پێغەمبەر (ﷺ) هێنابووی سەد سەر بوون. ئینجا هەموو خەڵکەکە ئیحرامیان شکاندو سەریان کورت کردەوە جگە لەپێغەمبەر (ﷺ) و ئەوانەی کە قوربانیان پێ بوو. ئینجا لەرۆژی تەرویەدا روویان کردە میناو ئیحرامیان بەحەج بەست پێغەمبەری خواش سواربوو، نوێژەکانی نیوەڕۆو عەسرو ئێوارە و عیشاو بەیانی لەوێ ـ مینا ـ کرد ئینجا کەمێك مایەوە هەتا خۆر هەڵهات فەرمانی کرد کە دەوارێکی مووی بۆ هەڵبدرێ لە نەمیرە، ئینجا کەوتەرێ، قورەیشییەکان دڵنیابوون کە لە (المشعر الحرام) دەوەستێ وەك چۆن قورەیش لە سەردەمی نەفامیدا دەیکرد، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ئەوێی بەجێ هێشتو رۆشت هەتا گەشتە عەرەفە بینی لە نەمیرە دەوارەکەی بۆ هەڵدراوە لەوێ لایداو دابەزی. هەتا کاتێ خۆر لەناوەراستی ئاسمان لایدا. ئینجا فەرمانی کرد ووشترەکەی ـ کە ناوی قەصواو بوو ـ بۆ ئامادەکرا هەتا هاتە لای دۆڵی عورەنە لەوێ ووتارێکی دا بۆ خەڵکیو فەرمووی: (بێگومان خوێنو سامانتان لە یەکتری حەرامە وەك حەرامی ئەم رۆژەتان لەم مانگەتانو لەم شارەتاندا، ئاگاداربن هەموو شتێکی نەفامیم خستووەتە ژێر پێمەوە، خوێنەکانی سەردەمی نەفامێتی بە فەوتاو دادەنرێن وە یەکەمین خوێن کە بەزایە چووی دادەنێم لەخوێنەکانمان خوێنی ئیبن رەبیعەی کوڕی حاریسە کە لەناو تیرەی بەنی سەعددا بەدایەن درابوو تیرەی هوزەیل کوشتیان. هەروەها سوی سەردەمی نەفامێتی بەفەوتاو دادەنێم وە یەکەمین سوو کە بەزایە چووی دادەنێم سووی خۆمانە: سووی عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیبە ئەوە هەموو لابرا (هیچ کەس بۆی نییە داوای ئەو جۆرە خوێنو سووانە بکاتەوە).

دەربارەی ئافرەتان لەخوا بترسن، چونکە ئەوان سپاردەی خوان لاتان بەوشەی خوا حەڵاڵ بوون بۆتان، مافی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە کەسێك نەهێننەماڵتان کە پێتان ناخۆش بێت، ئەگەر ئەمەیان کرد ئەوە بۆ تەمێ کردنیان بەلێدانێکی سوك لێیان بدەن، وە مافی ئەوانیشە لەسەر ئێوە کە بژێوی و پۆشاکیان بەچاکەو بەگوێرەی باو بۆ دابین بکەن، بێگومان شتێکم لەناوتاندا بەجێ هێشتووە ئەگەر بەچاکی دەستی پێوە بگرن هەرگیز گومڕا نابن ئەویش کتێبی خوایە ـ قورئانە ـ وە ئێوەش دەربارەی من پرسیارتان لێ دەکرێ جا ئێوە چی دەڵێن؟ ووتیان شایەتی

دەدەین بێگومان تۆ پەیامەکەت پێڕاگەیاندین‌و جێبەجێت کرد و دڵسۆزی‌و خەمخۆریت نواند ئەویش بەپەنجەی شایەتومانی ئاماژەی بەرەو ئاسمان کردو بەرزی کردەوە رووی پێکردە خەڵکەکەو فەرمووی: (ئەی خوایە شایەت بە، ئەی خوایە شایەت بە.) سێ جار دووبارەی کردەوە ئینجا بانگیداو قامەت کراو نوێژی نیوەڕۆی کرد پاشان قامەت کراو نوێژی عەسریشی کرد لەنێوانیاندا هیچ نوێژی نەکرد، پاشان سوار ووشترەکەی بوو هەتا گەیشتە شوێنی راوەستان ـ لە عەرەفات ـ رووی کردە قیبلەو سکی وشترەکەی کردە بەردەکان رێگاو ئاپۆرای خەڵکەکەی خستە بەردەمی خۆی ئینجا هەر ئاوا بەراوەستاوی مایەوە (دوعاو نزای کرد) هەتا رۆژ ئاوابوو زەردەش دوای تۆزێك نەما قورسی خۆر وون بوو. ئینجا ئوسامەی خستە پاشکۆی خۆی بەرەومەوزدەلیفە دەرۆشت، لەکاتێکدا ئەوەندە جڵەوی قەصوای توند کردبوو هەتا سەری دەیدا لەپێشەوەی کۆپانەکەی، بەردەوام بەدەستی راستی ئاماژەی دەکردو دەیفەرموو: (ئەی خەڵکینە ئارامی ئارامی) هەرکات دەگەشتنە گردێك لە گردۆڵکەکان تۆزێك جڵەوی بۆ شل دەکرد هەتا لێی سەردەکەوت تا هاتە موزدەلیفە، جا لەوێ نوێژی مەغریب‌و عیشای کرد بەبانگێك دوو قامەت، وەهیچ نوێژی سوننەتی لەنێوانیاندا نەکرد، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەتا سپێدەی بەیانی راکشاو خەوت وەکاتێ بەیانی لێ رۆشن بۆوە بەبانگ‌و قامەتێك نوێژی بەیانی کرد پاشان سواری قەصوا بوو هەتا هاتە مەشعەری حرام، جا لەوێ روو بەقیبلە راوەستاو لەخوا پارایەوە (الله أکبر ولا اله الا الله وحده)ی ووت هەروا بەراوەستاوی مایەوە هەتا تەواو دنیا رووناك بۆوە ئینجا پێش ئەوەی رۆژ هەڵبێ کەوتەڕێ، وە فەزڵی کوڕی عەبباسی لەپاشکۆی خۆیەوە سوار کرد کە پیاوێکی قژ جوان سپی پێست‌و بەرچاو بوو، جا کاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتەڕێ کۆمەڵە ئافرەتێك کە دەرۆیشتن بەلایدا تێپەڕین فەزڵیش دەستی کرد بەسەیر کردنیان پێغەمبەریش (ﷺ) دەستی گرت بەدەم‌و چاوی فەزڵەوە، فەزڵیش رووی وەرچەرخان بەلایەکی ترداو هەر تەماشای دەکردن دووبارە پێغەمبەر ﷺ دەستی گرت بەدەم‌و چاویەوە بەلاکەی تریشدا فەزڵ رووی لەلاکەی تریش وەرچەرخان، چونکە هەر تەماشای ئافرەتەکانی دەکردهەتا گەشتنە دۆڵی موحەسسیر پێغەمبەر (ﷺ) تۆزێك ووشترەکەی خێراکرد، پاشان ئەو رێگای ناوەڕاستی گرت کە بەرەو جەمرەی گەورە دەچێ هەتا هاتە لای ئەو جەمرەی کە لەلای

درەختەکەیەو حەوت بەردۆچکەی تێگرت کە وەك بەردۆچکەی بەلەپیتکە بوون وە لەگەڵ هەر بەردۆچکەیەکدا ـ دەیگرت ـ (الله أکبر)ی دەکرد کە لەناوەڕاستی شیوەکەوە بەردەکانی تێگرت پاشان بەرەو شوێنی سەربڕینی قوربانی چوو جا شەستو سێ سەر ووشتری بەدەستی خۆی سەربڕی پاشان ـ چەقۆکەی ـ دایە عەلی ئەویش ئەوەی مابوو سەری بڕیو لەقوربانییەکانی خۆیدا بەشداری کرد پاشان فەرمانی کرد لەهەر ووشترێك پارچەیەکی لێ کرایەوەو لەمەنجەڵێکدا کولێنرا هەردووکیان لە گۆشتەکەیان خوارد لە گۆشتاوەکەیان خواردەوە، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) سوار وشترەکەی بوو و بەرەو کەعبە ڕۆشتو تەوافی کرد، نوێژی نیوەڕۆی لە مەککە کرد. جا هات بۆ لای (بنی عبدالمطلب) کە لەزەمزەم ئاویان دەدا بەخەڵکی فەرمووی: (ئەی وەچەی عەبدولموتەلیب ئاو هەڵگۆزن ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە خەڵکی ئەو ئاو پێدانەتان لێ بسەنن منیش لەگەڵتاندا هەڵم دەگۆزی پاشان دۆڵچەیەکیان دایە لێی خواردەوە).[1]

ئیمامی نەوەوی دەڵێ: (ئەمە فەرموودەیەکی گەورەیە چەند سودو کەڵکێکی لەخۆ گرتووە وەچەند بنەمای نایابی تێدایە. (قاضي عیاض) دەڵێ: زانایان دەربارەی ئەو بابەتە فیقهیانەی تێیدایە قسەیان کردووە زۆریشیان ووتووە ئەبو بەکری کوڕی مونزیر جزمێکی گەورەی لەبارەی ئەم فەرمودەیەوە نووسیوە زیاتر لە (١٥٠) سەدو پەنجا حوکمی فیقهی لێ دەرهێناوە)[2].

### دەیەم: ئیحرام بەستن

**ئیحرام بەستن:** نیەت-هێنانە بۆ دەست کردن بەحەج یا عومرە یا هەردوکیان پێکەوە

**١ـ خۆشۆردن لەکاتی ئیحرام بەستندا:** (عن زَيْدِ بن ثَابِتٍ أَنَّهُ رَأَى النبي ﷺ تَجَرَّدَ لِإِهْلَالِهِ وَاغْتَسَلَ)[3] زەید کوڕی سابت ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: (کە پێغەمبەری (ﷺ)ی دیوە خۆی رووت کردۆتەوە بۆ ئیحرام بەستنو خۆی شۆری).

---

١) رواه مسلم (١٢١٨) و ابو داود (١٩٠٥، ١٩٠٧، ١٩٠٨، ١٩٠٩) و الترمذي (٨٥٦) و النسائي (٢٩٣٩)

٢) شرح النووي على صحيح مسلم (٥/ ٩١)

٣) رواه الترمذي (٨٣١) فەرموودەیەکی صەحیحە

**٢ـ بۆنی خۆش لەخۆدان پێش ئیحرام بەستن:** (عن عَائِشَةَ رضي الله عنها زَوْجِ النبي ﷺ قالت كنت أُطَيِّبُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِإِحْرَامِهِ حين يُحْرِمُ وَلِحِلِّهِ قبل أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ)[١] عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بیویستایە ئیحرم ببەستێ بۆنی خۆشم لێدەدا وە کە ئیحرامیش دەشکاند پێش تەواف کردنی بەدەوری بەیتدا بۆنی خۆشم لێدەدا)

**٣ـ لە ئیحرام بەستندا پشتەماڵەو سەرشانی سپی بپێچێت بەخۆیەوە:** (عن عبد اللَّهِ بن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال انْطَلَقَ النبي ﷺ من الْمَدِينَةِ بَعْدَ ما تَرَجَّلَ وَادَّهَنَ وَلَبِسَ إِزَارَهُ وَرِدَاءَهُ هو وَأَصْحَابُهُ) عەبدوڵڵای کوڕی عەباس رەزای خوایان لێبێ دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) سەری داهێناو چەوری کرد پشتەماڵ و سەرشانەکەی ئاڵاند لەخۆیەوە خۆی و هاوەڵانی لە مەدینە دەرچوو - بەرەو مەککە-)[٢]

بەڵام بەڵگەی سپی بوونی ئەوەی لە ئیحرامدا دەبەسرێت: (عن ابن عَبَّاسٍ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ الْبَسُوا من ثِيَابِكُمْ الْبَيَاضَ فَإِنَّهَا من خَيْرِ ثِيَابِكُمْ وَكَفِّنُوا فيها مَوْتَاكُمْ)[٣] عەبدوڵڵای کوڕی عەباس رەزای خوایان لێبێ دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (لی پۆشاکتاندا سپی لەبەر بکەن لە چاکترین پۆشاکتانە بیشیکەنە کفنی مردووەکانتان)

**٤ـ پیاو نابێ شتی دوراو بپۆشێ:**

ئەمە واجبە کە نابێ نە قوماشی ئیحرام و نەنەعل و هیچ شتێکی حاجی لەکاتی ئیحرامدا دوراو تەقەڵی پێوەبێت بەڵکو دوو پارچە قوماش بەکار دێنێ کە دوراو نین و سوننەتە سپی بن ئەمە بۆ پیاو، بەڵام ئافرت ئەمە بۆی واجب نییە تەنها دەموچاو دەستەکانی بەدەرەوە بن واجب لەسەری و بەس، (قال ﷺ: ولا تلثم المراة ولا تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (ئافرەت -لەکاتی ئیحرامدا- دەمو چاوی دانەپۆشێ و دەستەکیش لە دەستەکانی نەکات)[٤] کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمی فەرموو هەندێ لە هاوەڵانی پرسیاریان لێ کرد

---

١) رواه البخاري (١٥٣٩) و مسلم (١١٨٩)

٢) رواه البخاري (١٥٤٥)

٣) رواه الترمذي (٩٩٩) و ابو داود (٣٨٦٠)

٤) رواه البخاري (١٨٣٨) و احمد ٢ / ١١٩

ئافرەت واجبە چی لەبەر بکات لەکاتی ئیحرامی حەجدا، هەروەها سوننەتە ئافرەت هەردوو دەستەکانی بگرێتە خەنە پیش ئیحرام بەستن چونکە پێویستە بەدەرەوەبن.

**٥- دوو ڕکات نوێژ بکات کە ئیحرامی بەست:**

ئەمە سوننەتە بە نیەتی سوننەتی ئیحرام بەستن بیکات.

**٦- دەنگ بەرزکردنەوە بە سرودی حەج:**

(لَبَّيْكَ اللهم لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لك لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لك وَالْمُلْكَ لَا شَرِيكَ لك).

(عن خَلَّادِ بن السَّائِبِ الْأَنْصَارِيِّ عن أبيه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال أَتَانِي جِبْرِيلُ ﷺ فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي وَمَنْ مَعِي أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالْإِهْلَالِ أو بِالتَّلْبِيَةِ) [1] سائیبی کوڕی خەللاد (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرمووی : (جبریل هات بۆ لام و فەرمانی پێکردم کە فەرمان بە هاوەڵانم بکەم دەنگیان بە (لبيك اللهم لبيك لبيك لا شريك لك لبيك ان الحمد و النعمه لك و الملك لاشريك لك) بەرزبکەنەوە).

**یازدەیەم : ئەو شتانەی لەکاتی ئیحرامدا حەرامن**

ئەو شتانەی کە لەماوەی ئیحرامدا لە حاجی و عومرەکەر قەدەغەن ئەمانەی خوارەوەن:

**١- نەپۆشینی پۆشاکی ئاسایی:** کە بە تەقەڵ و درووماں دورابێ، (عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَجُلًا قال يا رَسُولَ اللَّهِ ما يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ من الثِّيَابِ قال رسول اللَّهِ ﷺ لَا يَلْبَسُ الْقُمُصَ ولا الْعَمَائِمَ ولا السَّرَاوِيلَاتِ ولا الْبَرَانِسَ ولا الْخِفَافَ إلا أَحَدٌ لَا يَجِدُ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ من الْكَعْبَيْنِ ولا تَلْبَسُوا من الثِّيَابِ شيئا مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ أو وَرْسٌ) [2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێبێ دەڵێ: پیاوێك ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی لە ئیحرامدایە چ پۆشاکێك لەبەر بکات ؟ پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: (نابێ نەکراسان لەبەر بکات نە مێزەران لەسەر بکات نە شەرواڵان لەپێ بکات نە کڵاوان لەسەر نێ نە خوفف و پێڵاوان لەپێ بکات مەگەر کەسێك نەعلی نەبن ئەو با دوو خوفف (پێڵاو)ان لە

---

١) رواه الترمذي (٨٣٠) و ابو داود (١١٩٧) و ان ماجه (٢٩٢٢)

٢) رواه البخاري (١٥٤٢) و مسلم (١/ ١١٧٧)

پێ بکات لە خوارووی قولەپێکانەوە بیانبڕێ هەروەها هیچ بەرگێك لەبەر مەکەن کە زەعفەران یا وەرسی[١] لێ کەوتبێ).

**٢- نابێ ئافرەت پەچە بکات و نابێ دەست کێش لەدەست بکات:** (عن ابن عمر أن النبي ﷺ قال: ولا تَنْتَقِبُ الْمَرْأَةُ الْمحرَمة ولا تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ) عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێبێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئافرەت لە ئیحرامدا پەچە نەکات و دەست کێشیش لە دەست نەکات)[٢]

**٣- بۆنی خۆش لەخۆدان لەسەرەتاوە:**

نابێ حاجی پیاو یا ئافرەت بۆنی خۆش لەخۆیان بدەن وە نابێ پۆشاکی بۆنی خۆشی لێ درابێ لەبەری بکەن لە بەشێکی فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەردا ڕەزای خوایان لێبێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لَا يَلْبَسُ ثَوْبًا مَسَّهُ الْوَرْسُ أو الزَّعْفَرَانُ)[٣] ( .... وە هیچ بەرگ و پۆشاکێك لەبەر مەکەن کە زەعفەران یا وەرسی لێ کەوتبێ)

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عَنْهُمْ أَنَّ رَجُلًا وَقَصَهُ بَعِيرُهُ وَنَحْنُ مع النبي ﷺ وهو مُحْرِمٌ فقال النبي ﷺ اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَكَفِّنُوهُ في ثَوْبَيْنِ ولا تُمِسُّوهُ طِيبًا ولا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ فإن اللَّهَ يَبْعَثُهُ يوم الْقِيَامَةِ ملبيا )[٤] عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ڕەزای خوایان لێبێ دەڵێ: پیاوێك وشترەکەی ملی شکاند و ئێمەش لەگەڵ پێغەمبەری خوا بوین (ﷺ) جا ئەویش ئیحرامی بەست بوو ئەنجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بە ئاو سیدر بیشۆرن و کفنی بکەن لە دوو پۆشاکدا بۆنی خۆشی لێ مەدەن و سەری دامەپۆشن، چونکە لەرۆژی دواییدا بە ئیحرامەوە بەدەم وتنی (لبيك الله اللهم لبيك لا شريك لك لبيك) ەوە زیندووی دەکاتەوە).

بەڵام دروستە پێش ئیحرام بەستن بۆنی خۆش لەخۆی بدات: (عن عَائِشَةَ رضي الله عنها زَوْجِ النبي ﷺ قالت كنت أُطَيِّبُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِإِحْرَامِهِ حين يُحْرِمُ وَلِحِلِّهِ قبل أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ).[٥]

---

١) زەعفەران و وەرس دوو جۆرە گیاو گوڵی بۆنخۆشن (المعجم الوسيط ٣٩٤ و ١٠٢٥)

٢) رواه البخاري (١٨٣٨) و الترمذي (٨٣٣) و ابو داو (١٨٢٥) و احمد (٢ / ١١٩)

٣) رواه البخاري (١٥٤٢) و مسلم (١/ ١١٧٧)

٤) رواه البخاري (١٢٦٧) و مسلم (١٢٠٦)

٥) رواه البخاري (١٥٣٩) و مسلم (٣٣/ ١١٨٩)

عائیشه (ڕەزای خوای لێبێ)دەڵێ: من پێغەمبەرم (ﷺ) بۆن خۆش دەکرد کە دەیویست ئیحرام ببەستێ، کە ئیحرامیشی دەشکاند بۆن خۆشم دەکرد پێش ئەوەی تەوافی ماڵی خوا بکات).

**٤ـ نینۆك کردن:** نابێ حاجی نینۆکی بکات، ئیبن مونذر دەڵێ : زانایان یەك دەنگن لەسەر حەرامی نینۆك کردن بۆ ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە ژن بێت یا پیاو.

**٥ـ لابردنی موو بە تاشین بێت یان هەڵکەندن:** **البقرة: ١٩٦** خوای گەورە دەفەرمووێ :

﴿ وَلَا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ ﴾ **البقرة: ١٩٦** واتە سەریشتان مەتاشن هەتا قوربانیەکانتان دەگاتە شوێنی خۆی - سەریان دەبڕن-) بەڵام ئەگەر کەسێك قژ نەتاشینی زیانی لێ بدات ئەوە دروستە بیتاشێ و فیدیە بدات خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ﴾ **البقرة: ١٩٦** واتە: جا ئەگەر کەسێکتان نەخۆش بوو یان ئازارێك لەسەریدا بوو - ئەسپێ و رشکی پێوەبوو - ئەگەر سەری تاشی بریتییەك بدات کە ڕۆژوو (ی سێ ڕۆژە) یا خێرێك یا قوربانیەك بکات.

(عن كَعْبِ بن عُجْرَةَ قال: حُمِلْتُ إلى رسول اللَّهِ ﷺ وَالْقَمْلُ يَتَنَاثَرُ على وَجْهِي فقال: ما كنت أُرَى الْوَجَعَ بَلَغَ بِكَ ما أَرَى أَتجدُ شَاةً؟ قلت: لا قال: فَصُمْ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ أو أَطْعِمْ ستة مِسْكِينًا كُلُّ مِسْكِينٍ نِصْفُ صَاعِ حِنْطَةً) [1] کەعبی کوڕی عوجرە (ڕەزای خوای لێبێ)دەڵێ: بەسواری وڵاخێك هێنامیان بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەسپێ بەدەم و چاوم دا دەهاتە خوارەوە فەرمووی: (وام نەزانی ئازارەکەت بەم شێوەیە کە ئێستا دەیبینم ئایا مەڕێکت هەیە بیدەیت لە فیدەیەدا وتم نەخێر فەرمووی: (دەی سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بە یاخواردنی شەش هەژار بدە بۆ هەر هەژارە نیو مەنی بدەرێ).

**٦- هەر قسەو کردەوەیەکی خراپ:** وەك شەڕە قسە و دەمەدەمەکردن و جنێودان و گوناحکردن و قسەو باسی جنسی و دەست بازی لەگەڵ هاوسەری خۆیدا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي الْحَجِّ ﴾ **البقرة: ١٩٧** واتە : نابێ لە

١) رواه البخاري (١٥٢١) مسلم (١٣٥٠/٤٣٨)

ئیحرامدا جیماعو دەست بازی بکات و نابێ کردارو گرفتاری خراپ بکات و نابێ دەمەقاڵێ و شەڕە قسە بکات لە حەجدا.

(عن أبي هريرة قال سمعت عن النبي ﷺ قال من حج و لم يرفث و لم يفسق رجع كيوم ولدته أمه) [1] ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێبێ)دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست دەیفەرموو: (ئەوەی حەج بکات رەفتارو گوفتاری نابەجێ - یا جیماع دەستبازی- نەکات وە گوناح و تاوان ئەنجام نەدات ئەو رۆژی دایکی بوویەتی لە گوناحەکانی پاك دەبێتەوە).

مونذیری دەڵێ: ووشەی (الرفث) بە جیماع دەوترێت وە بە قسەو کرداری ناشرین دەوترێت وە بەقسەی جنسی نێوان پیاو هاوسەری دەوترێت، وە زانایان بەهەریەك لەم مانایانە لێکیان داوەتەوە بۆیە منیش دەڵێم هەموویان حەرامن بۆ حاجی و ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە.

ئیمامی مالیك دەڵێ (الرفث) واتە جیماع و سەرجێ لەگەڵ هاوسەردا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ﴾ البقرة: ١٨٧ واتە لە شەوانی رۆژو-ی رەمەزان دا دروست بوون - جیماع کردن - لەگەڵ ژنەکانتاندا حەڵاڵ کراوە بۆتان.

(الفسوق) بریتییە لە سەر بڕینی ئاژەڵ بۆ بتەکان خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ﴾ الأنعام: ١٤٥ واتە - لەوانەی حەرام کراوە لێتان - یا سەر بڕاوێك بێت (کاتی سەر بڕین) ناوی غەیری خوای لێ هێنرابێ.

وە (الجدال في الحج) قورەیشیەکان لە موزدەلیفە لە مشعەری حەرام لە موزدەلیفە دەوەستان عەرەبەکانی تر جگە لە قورەیش لە عەرەفە دوەستان موجادەلەیان دەکرد قورەیش دەیوویت ئەمەی ئێمە راستە ئەوانی تر دەیان ووت ئێمە راستین جا خوای گەورە فەرموو: ﴿ لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ ۖ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِى ٱلْأَمْرِ ۚ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴾ الحج: ٦٧ واتە بۆ هەموو ئومەتێك شەریعەت و بەرنامەیەکمان داناوە کە ئەوان

---

١) رواه البخاري (١٥٢١) و مسلم (٤٣٨/ ١٣٥٠)

کار پێ دەکەن و لەسەری دەڕۆن کەواتە نابێ (خاوەن ئاینەکانی تر) لە کاری ئاینی دا کێشە و ئاژاوەت لەگەڵدا دروست بکەن.

**٧- مارەکردن و خوازبێنی:** دروست نییە ئەوەی لە ئیحرامدایە ئافرەت مارە بکات یا خوازبێنی ئافرەت بکات بە هەمان شێوە بۆ ئافرەتیش دروست نییە نەمارە بکرێت و نە خوازبێنی، (عن عُثْمَانَ بن عَفَّانَ يقول قال رسول اللَّهِ ﷺ لَا يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ ولا يُنْكَحُ ولا يَخْطُبُ). [١] عوسمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خوای لێبێ)دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (ئەوەی لە ئیحرامدایە نە ژن مارە دەکات نە لە خەڵکی مارە دەبڕێ نە خوازبێنی دەکات ) وە ئەو فەرموودەی (عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أَنَّ النبي ﷺ تَزَوَّجَ مَيْمُونَةَ وهو مُحْرِمٌ) عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ڕەزای خوایان لێبێ کە دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) مەیمونەی مارە کرد لە کاتێکدا لە ئیحرامدا بوو) ئەوە فەرمودەی مەیمونە پێچەوانەی دەکات کە دەڵێ (عن مَيْمُونَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ ان رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَزَوَّجَهَا وهو حَلَالٌ) [٢] (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) مارەی کرد لە ئیحرامدا نەبوو) وە فەرمودەکەی مەیمونە گێڕاویەتیەوە تەرجیح دەدرێت، چونکە ئەوخۆی خاوەن ڕوداوەکەیە لەلایەك وە لەلایەکی تریشەوە فەرمودەکەی کە عشمان گێڕاویەتیەوە پاڵپشتی فەرمودەکەی مەیمونە دەکات کەواتە لە ئیحرامدا ئافرەت مارە ناکرێت.

**٨- سەرداپۆشین بۆ پیاو:** دروست نییە پیاو لە ئیحرامدا بێت شتی لەسەردا بێت یا سەر داپۆشێت، بەڵکو دەبێ سەری ڕووت بێ عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پیاوێك وشترەکەی ملی شکاند و مرد لە کاتێکدا کە لە ئیحرامدابوو جا (عن بن عَبَّاسٍ رضي الله عَنْهُمْ أَنَّ رَجُلًا وَقَصَهُ بَعِيرُهُ وَنَحْنُ مع النبي ﷺ وهو مُحْرِمٌ فقال النبي ﷺ اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَكَفِّنُوهُ في ثَوْبَيْنِ ولا تُمِسُّوهُ طِيبًا ولا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ فإن اللَّهَ يَبْعَثُهُ يوم الْقِيَامَةِ ملبيا). [٣] پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (بە ئاو سیدر بیشۆن و بە دوو پارچەی قوماشی ئیحرامەکەی

---

١) رواه البخاري (١٨٣٧) و مسلم (٤٧ / ١٤٠٤)

٢) رواه مسلم (٤٨ / ١٤١١)

٣) رواه البخاري (١٨٥١ ، ١٢٦٧) و مسلم (٩٩ / ١٢٠٦ و ١٠٠/ ١٢٠٦) و احمد (١ / ٣٢٨)

کفنی بکەن سەری دامەپۆشن، چونکە لە رۆژی قیامەت دا خوای گەورە بەدەم ( لبیك اللهم لبیك) ووتنەوە زیندوی دەکاتەوە).

**٩- راوو وشکار:** نابێ ئەوەی لە ئیحرامدایە راوشکار بکات لە وشکانیدا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ ﴾ المائدة: ٩٥ واتە ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە نێچیر مەکوژن لە کاتێکدا ئێوە لە ئیحرامدان وە دەفەرمووێ: ﴿ وَحُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَرِّ مَا دُمۡتُمۡ حُرُمٗاۗ ﴾ المائدة: ٩٦ واتە : راوکردنتان لە ووشکانی دا لێ قەدەغەکراوە هەتا لە ئیحرامدابن

**تۆڵەی نێچیر کوشتن :**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴾ المائدة: ٩٥ واتە هەر کەسێکتان بەدەستی ئەنقسەت -نێچیر- بکوژێ ئەوە لەسەریەتی وێنەی ئەو نێچیرەی کوشتویەتی لە ئاژەڵ و ماڵات سەر ببڕێ ، دوو پیاوی موسڵمانی چاك لەخۆتان ئەو بڕیارە بدەن (نێچیرەکە لەبەرانبەر چ ئاژەڵێکدایە) بە شێوەی قوربانی بگاتە کەعبە (لەوێ بیکاتە قوربانی) یا بەندازەی نرخی قوربانیەکە خۆراك بدات بە چەند هەژارێك یا بە یەقەدەر ئەو خۆراك دانە رۆژوو بگرێت بۆ ئەوەی ئۆباڵی کارەکەی بچەژێ خوا لەوە رابرورد خۆش بووە بەڵام هەرکەس بگرێتەوە (بۆ ئەو کردەوەیە) ئەوە خوا تۆڵەی بە تینی لێ دەسەنێ وە خوا زاڵی خاوەنی تۆڵەی بەتینە.

**١٠- ئەوەی لەئیحرامدایە لەنیچیرێ نەخوات کەسێکی تر بۆ ئەوی کوشتووە:**

(عن الصَّعْبِ بن جَثَّامَةَ اللَّيْثِيِّ أَنَّهُ أَهْدَى لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِمَارًا وَحْشِيًّا وهو بِالْأَبْوَاءِ أو بِوَدَّانَ فَرَدَّهُ عليه فلما رَأَى ما في وَجْهِهِ قال إِنَّا لم نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إلا أَنَّا حُرُمٌ).[1] صەعبی کوڕی جوسامەی

١) رواه البخاري (١٨٢٥) و مسلم (١١٩٣)

لەیسی ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: پێغەمبەری خوا لەوە ددان یا ئەبوائدا بوو کەرێکی وەحشی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وەری نەگرت، ئەنجا کە بینی دەموچاوی تێکچوو فەرمووی: (ئێمە بۆیە لێمان وەرنەگرتی لەبەرئەوەی لەئیحرامداین).

* بەڵام ئەگەر ڕاوکەرەکە لەئیحرامدا نەبوو وە بۆ ئەوەشی ڕاونەکردبوو کە لەئیحرام دایە ئەو دروستە ئەوەی لەئیحرام دایە لەنێچیرەکە بخوات بەم بەڵگەیە:

(عَن أبي قَتَادَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ حَاجًّا فَخَرَجُوا معه فَصَرَفَ طَائِفَةً منهم فِيهِمْ أبو قَتَادَةَ فقال خُذُوا سَاحِلَ الْبَحْرِ حتى نَلْتَقِيَ فَأَخَذُوا سَاحِلَ الْبَحْرِ فلما انْصَرَفُوا أَحْرَمُوا كلهم إلا أبا قَتَادَةَ لم يُحْرِمْ فَبَيْنَمَا هُمْ يَسِيرُونَ إِذْ رَأَوْا حُمُرَ وَحْشٍ فَحَمَلَ أبو قَتَادَةَ على الْحُمُرِ فَعَقَرَ منها أَتَانًا فَنَزَلُوا فَأَكَلُوا من لَحْمِهَا وَقَالُوا أَنَأْكُلُ لَحْمَ صَيْدٍ وَنَحْنُ مُحْرِمُونَ فَحَمَلْنَا ما بَقِيَ من لَحْمِ الْأَتَانِ فلما أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قالوا يا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كنا أَحْرَمْنَا وقد كان أبو قَتَادَةَ لم يُحْرِمْ فَرَأَيْنَا حُمُرَ وَحْشٍ فَحَمَلَ عليها أبو قَتَادَةَ فَعَقَرَ منها أَتَانًا فَنَزَلْنَا فَأَكَلْنَا من لَحْمِهَا ثُمَّ قُلْنَا أَنَأْكُلُ لَحْمَ صَيْدٍ وَنَحْنُ مُحْرِمُونَ فَحَمَلْنَا ما بَقِيَ من لَحْمِهَا قال أَمِنْكُمْ أَحَدٌ أَمَرَهُ أَنْ يَحْمِلَ عليها أو أَشَارَ إِلَيْهَا قالوا لَا قال فَكُلُوا ما بَقِيَ من لَحْمِهَا).[1] ئەبو قەتادە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوو بۆ حەج موسوڵمانانیش لەگەڵیدا ڕۆیشتن کۆمەڵێکیان لایاندا کە ئەبوقەتادەیان تێدا بوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێیان: (بەکەناری دەریادا بڕۆن تا دەگەینەوە بەیەکتری) جا ئەوانیش کەناری دەریایان گرت کە گەڕانەوە هەموویان ئیحرامیان بەست ئەبوقەتادە نەبێت. جا لەکاتێکدا دەڕۆشتن لەپڕ کۆمەڵێ کەرە وەحشیان بینی، ئەبو قەتادە پەلاماری دان ماکەرێکیانی کوشت - سەری بڕی- جا ئەوانیش لایادا لەگۆشتی کەرە وەحشیەکەیان خواردو ووتیان: چۆن گۆشتی نێچیر بخۆین کە لەئیحرامداین؟ئەنجا ئەوەی لەگۆشتی کەرە مایەوە لەگەڵ خۆمان هەڵمان گرت جا کە هاتنەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئیحرامان بەست بەڵام ئەبوقەتادە ئیحرامی نەبەست، کۆمەڵێ کەرە وەحشیمان بینی، ئەبو قەتادە هێرشی بۆ بردن ماکەرێکی لێ کوشت جا لاماندا و لەگۆشتەکەیمان خوارد پاشان ووتمان: چۆن گۆشتی نێچیر بخۆین کە ئێمە لەئیحرامداین؟ وە ئەوەی

---

١) رواه البخاري (١٨٢١) مسلم (١١٩٦)

لەگۆشتەکەی مایەوە لەگەڵ خۆمان هەڵمان گرت فەرمووی: (کەس لەئێوە فەرمانی پێکرد راوی بکات یا ئاماژەی پیێ کرد؟) ووتیان: نەخێر فەرمووی: (دەی ئەوەش ماوە لە گۆشتەکەی بیخۆن).

**١١- درەختی حەرەم نابردرێت جگە لە (الإذخر):**

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال قال رسول اللَّهِ ﷺ يوم فَتْحِ مَكَّةَ لَا هِجْرَةَ بعد الفتح وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ وإذا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا وقال يوم فَتْحِ مَكَّةَ إِنَّ هذا الْبَلَدَ حَرَّمَهُ الله يوم خَلَقَ السماوات وَالْأَرْضَ فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ إلى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَإِنَّهُ لم يَحِلَّ الْقِتَالُ فيه لِأَحَدٍ قَبْلِي و لم يَحِلَّ لي إلا سَاعَةً من نَهَارٍ فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ إلى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا يُعْضَدُ شَوْكُهُ ولا يُنَفَّرُ صَيْدُهُ ولا يَلْتَقِطُ لُقَطَتَهُ إلا من عَرَّفَهَا ولا يُخْتَلَى خَلَاهُ فقال الْعَبَّاسُ يا رَسُولَ اللَّهِ إلا الْإِذْخِرَ فإنه لِقَيْنِهِمْ وَلِبُيُوتِهِمْ قال إلا الأذخر).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رەزای خوایان لیێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەرۆژی ئازاد کردنی مەککەدا فەرمووی: (دوای ئازاد کردنی مەککە کۆچ کردن نەما بەڵام جیهادو نیە جیهاد هەر ماوە وە ئەگەر داواتان لیێ کرا دەربچن بۆ غەزاو جیهاد دەرچنو برۆن)و لەرۆژی ئازاد کردنی مەککەدا فەرمووی: (بێگومان ئەم شارە خوای گەورە رێزداری کردووە لەو رۆژەوەی ئاسمانەکانو زەوی بەدیهێناوە جا ئەو شارە بەو رێزدار کردنەی خوا رێزدارکراوە تا رۆژی قیامەت وەپێش من جەنگ کردن تێیدا بۆ کەس حەڵاڵ نەبووە وە بۆ منیش حەڵاڵ نەبووە تەنیا ساتێك نەبێت لەرۆژێکدا جا ئەوە حەرام بوو بەوحەرام کردنەی خوا تا رۆژی قیامەت، دڕکی نابڕدرێت نێچیر راونانرێت وە دۆزراوەی هەڵناگیرێت مەگەر کەسیێ جاڕی بۆ بدات وەگیاو رووەکیش هەڵناگێشرێ) ئەنجا عەبباس ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جگە لە (اذخر)، چونکە بۆ ئاگری- ئاسنگەرو- سەرگرتنی- ماڵەکانیان بەکاری دێنن، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی جگە لە (اذخر)).

---

١) رواه البخاري (٣١٨٩، ٢٧٨٣، ٢٨٢٥، ١٥٨٧) و مسلم (١٣٥٣)

**١٢- پێنج گیاندارە زیانبەخشەکە دەکوژرێن:**

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال خَمْسٌ من الدَّوَابِّ كُلُّهُنَّ فَاسِقٌ يقتلن في الْحَرَمِ الْغُرَابُ وَالْحِدَأَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْفَأْرَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ) [١] عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (پێنج جانەوەری زیانبەخش هەیە لەمەککەو سنوری دەوروبەری مەککە دەکوژرێن: قەلەرەشی بازۆو، کۆلارە و، دووپشك و مشك، سەگی هار).

**١٣- ڕاو کردن لە حەرەمی مەدینە و بڕینی درەختی وە هی مەککە وایە:**

(عن عَبَّادِ بن تَمِيمٍ عن عَمِّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال إِنَّ إبراهيم حَرَّمَ مَكَّةَ وَدَعَا لِأَهْلِهَا وَإِنِّي حَرَّمْتُ الْمَدِينَةَ كما حَرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ) [٢] عوبادی کوڕی تەمیم لەمامەیەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان ئیبراهیم شەڕو ئاشوبی لەمەککەدا حەرام کردودوعای بۆ کرد بێگومان منیش جەنگ و ئاشوب لە مەدینەدا حەرام دەکەم وەك چۆن ئیبراهیم لە مەککە حەرامی کرد)

(عن علي رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ الْمَدِينَةُ حَرَامٌ ما بين عَائِرٍ إلى ثَوْرٍ) عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (مەدینە حەرەمە - ڕێزدار - لە عەیرەوە بۆ ثەور) [٣] دوو چیان لەم لاو ئەولای مەدینەوە.

(عن جَابِرٍ قال قال رسول الله ﷺ ان إبراهيم حَرَّمَ مَكَّةَ وَإِنِّي حَرَّمْتُ الْمَدِينَةَ ما بين لَابَتَيْهَا لَا يُقْطَعُ عِضَاهُهَا ولا يُصَادُ صَيْدُهَا) جابیر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان ئیبراهیم مەککەی کردە حەرەم بێگومان منیش مەدینەم کردە حەرەم لەم سەر بۆ ئەو سەری درەختەکانی نابڕدرێت و نێچیرەکانیش ڕاوناکرێت) [٤]

---

١) رواه البخاري (١٨٢٩ و ٣٣١٤) و مسلم (٧١/ ١١٩٨و ٦٧/ ١١٩٨)

٢) رواه البخاري (٢١٢٩) و مسلم (١٣٦٠)

٣) رواه البخاري (١٨٧٠) و مسلم (١٣٧٠)

٤) رواه مسلم (٤٥٨ / ١٣٦٢)

**١٤ - هەر کەس درەختی مەدینە ببڕێت یا گەڵای بو ڕێنێت لێی دەسەنرێت:**

(عن عَامِرِ بن سَعْدٍ أَنَّ سَعْدًا رَكِبَ إلى قَصْرِهِ بِالْعَقِيقِ فَوَجَدَ عَبْدًا يَقْطَعُ شَجَرًا أو يَخْبِطُهُ فَسَلَبَهُ فلما رَجَعَ سَعْدٌ جَاءَهُ أَهْلُ الْعَبْدِ فَكَلَّمُوهُ أَنْ يَرُدَّ على غُلَامِهِمْ أو عليهم ما أَخَذَ من غُلَامِهِمْ فقال مَعَاذَ اللَّهِ أَنْ أَرُدَّ شيئا نَفَّلَنِيهِ رسول اللَّهِ ﷺ وَأَبَى أَنْ يَرُدَّ عليهم)[1] عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: سەعد سوار ولاخەکەی بوو ڕۆشت بۆ کۆشکەکەی لە عەقیق بینی کویلەیەك درەختێك دەبڕێ یا گەڵای لێدەکاتەوە سەعدیش لێ سەند جا کە سەعد گەڕایەوە خاوەنی کویلەکە هاتن بۆ لای سەعد لەگەڵیدا قسەیان کرد ئەوەی لە کۆیلەکەیانی سەندوە و بیداتەوە بە کویلەکان یا بیداتەوە بە خۆیان —خاوەن کۆیلەکە- سەعدیش وتی پەنا بە خوا شتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە دەسکەوت پێی داوم بیگێرمەوە بۆیە پێی نەدانەوە)

**دوازدەیەم: جۆرەکانی حەج**

حەج بەپێی نیەتە سێ جۆرە: تمتع و قران و افراد، جا هەر یەك لەم سێ جۆرە باس دەکین لەگەڵ بەڵگەکەیاندا:

**١- التمتع:** ئەوەیە کە کەسێك خەڵکی دەرەوەی مەککە بێت لە مانگەکانی حەجدا ئیحرام بۆ عومرە دەبەستێت ، وە لە سەرەتادا عومرە دەکات پاشان ئیحرام دەشکێنێ و هەموو شتێکی (کە لە ئیحرامدا بوی دروست نەبوو) بۆی حەڵاڵ دەبێت، هەتا لەگەڵ خەڵکیدا لە ڕۆژی تەرویەدا، ئیحرام بە حەج دەبەستێتەوە، بەڵام دەبێت مەڕێك سەر ببڕێ.

(عن عبدالله ابن عُمَرَ رضي الله عنهما قال تَمَتَّعَ رسول اللَّهِ ﷺ في حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِالْعُمْرَةِ إلى الْحَجِّ وَأَهْدَى فَسَاقَ معه الْهَدْيَ من ذِي الْحُلَيْفَةِ....)[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان

١) رواه مسلم (١٣٦٤

٢) رواه البخاري ١٦٩١ ومسلم ١٧٤/ ١٢٢٧.

لێبێ) دەڵێ: (لە حەجیماڵئاواییدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەهەرمەندبوو بە بەجێهێنانی عومرە تا کاتی حەج[1] ئاژەڵی دیاری کەعبەیشی لە ذولحولیفەوە لەگەڵ خۆی برد ...).

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ: ﴿فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلۡعُمۡرَةِ إِلَى ٱلۡحَجِّ فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِۚ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖ فِي ٱلۡحَجِّ وَسَبۡعَةٍ إِذَا رَجَعۡتُمۡۗ تِلۡكَ عَشَرَةٞ كَامِلَةٞۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمۡ يَكُنۡ أَهۡلُهُۥ حَاضِرِي ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ﴾ البقرة: ١٩٦ واتە: ئینجا ئەو کەسەی بەهرەمەندبوو بە بەجێهێنانی عومرە تا کاتی حەج ئەو چی بۆ هەڵسوڕا لە قوربانی (بیکات) وە ئەگەر یەکەسێك نەیبووو با سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت لەکاتی حەجدا و حەوت ڕۆژیش کاتی گەڕانەوە ئەمە دەبێتە دە ڕۆژی تەواو ئەمە بۆ کەسێکە کە (خۆی) و کەسی کاری دانیشتووی دەوروبەری (مسجد الحرام) نەبێت.

**٢- القران:** ئەمە کەسێك کە خەڵکی دەرەوەی مەککە بێت لە مانگەکانی حەجدا ئیحرام بە حەج و عومرە پێکەوە ببەستێ ، پاشان بڕواتە مەککە بە ئیحرامەوە بمێنێتەوە هەتا لە کردەوەکانی حەج تەواو دەکات بەڵام یەك تەواف و یەك سەعیش دەکات بۆ حەج و عومرەکەی.

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها أنها قالت خَرَجْنَا مع رسول اللَّهِ ﷺ عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ فَمِنَّا من أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ وَمِنَّا من أَهَلَّ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ وَمِنَّا من أَهَلَّ بِالْحَجِّ وَأَهَلَّ رسول اللَّهِ ﷺ بِالْحَجِّ فَأَمَّا من أَهَلَّ بِالْحَجِّ أو جَمَعَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لم يَحِلُّوا حتى كان يَوْمُ النَّحْرِ)[2] عائیشە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووینە حەج، هەندێکمان ئیحرامی تەنها بە عومرە بەست بوو، وەهەندێکمان ئیحرامی بە حەج و عومرە پێکەوە بەستبوو وە هەندێکمان ئیحرامی بە حەج بەستبوو جا ئەوانەی ئیحرامیان بە حەج بەست یا بە حەج و عومرە ئیحرامیان نەشکاند هەتا ڕۆژی جەژنی قوربان).

(عن عُبَيْدِ اللَّهِ بن عُمَرَ قال: قال رسول اللَّهِ ﷺ من أَحْرَمَ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ أَجْزَأَهُ طَوَافٌ وَاحِدٌ وَسَعْيٌ وَاحِدٌ عنهما حتى يَحِلَّ مِنْهُمَا جميعا)[3] عەبدوڵڵای کوری عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ)

---

١) واتە نیەتی عومرەی هێنا لە پێشدا کە تتواوی کرد هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ بوو تا کاتی ئیحرام بەستن بە حەج

٢) رواه البخاري (١٥٢٦) و مسلم (١١٨/ ١٢١١)

٣) رواه الترمذي (٩٥٨) و ابن ماجه (٢٩٧٥) صحيحة

دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر كەس ئیحرامی بە حەج و عومرە بەست بەك تەواف و یەك سەعی بەسە بۆ هەردووكیان هەتا ئیحرامی هەردووكیان دەشكێنێ).

**٣- الافراد:** ئەوە بەتەنها ئیحرام بە حەج دەبەستێت نابێ ئیحرام بشكێنێ تا رەجمی شەیتانی گەورە دەكات، بەڵگەی ئەمەشیان (قالت عَائِشَةَ رضي الله عنها:( من أَهَلَّ بِالْحَجِّ أو جَمَعَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لم يَحِلُّوا حتى كان يَوْمُ النَّحْرِ)).[1] فەرموودەكەی عائیشە دەڵێ: (هەر كەس ئیحرامی بە حەج بەست یان بە حەج و عومرە نابێ ئیحرام بشكێنێ تا رۆژی جەژنی قوربان).

**حەجی تەمتوع لەهەموو جۆرەكانی گەورە**

(عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ رضي الله عنهما قال أَهْلَلْنَا مع رسول اللَّهِ ﷺ بِالْحَجِّ فلما قَدِمْنَا مَكَّةَ أَمَرَنَا أَنْ نَحِلَّ وَنَجْعَلَهَا عُمْرَةً فَكَبُرَ ذلك عَلَيْنَا وَضَاقَتْ بِهِ صُدُورُنَا فَبَلَغَ ذلك النبي ﷺ فما نَدْرِي أَشَيْءٌ بَلَغَهُ من السَّمَاءِ أَمْ شَيْءٌ من قِبَلِ الناس فقال أَيُّهَا الناس أَحِلُّوا فَلَوْلَا الْهَدْيُ الذي مَعِي فَعَلْتُ كما فَعَلْتُمْ قال فَأَحْلَلْنَا حتى وَطِئْنَا النِّسَاءَ وَفَعَلْنَا ما يَفْعَلُ الْحَلَالُ حتى إذا كان يَوْمُ التَّرْوِيَةِ وَجَعَلْنَا مَكَّةَ بِظَهْرٍ أَهْلَلْنَا بِالْحَجِّ)[2] جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێبێ)دەڵێ: (لەگەڵ پێغەرمبەردا ئیحرامان بە حەج بەست ئەنجا كە گەیشتینە مەككە فەرمانی پێكردین ئیحرامەكەمان بشكێنین و بە عومرە ئیحرام ببەستین ئەمە گران بوو بەلامانەوە و قورس بوو لەسەر دڵمان جا ئەمە گەیشتەوە پێغەمبەر (ﷺ) جا نازانین ئەمە شتێك بوو لە ئاسمانەوە پێی گەیشت یان لەلایەن خەڵكەوە پێی گەیشت فەرمووی (ئەی خەڵكینە ئیحرام بشكێنن ئەگەر لەبەر ئەو ئاژەڵی قوربانیان نەبوایە كە لەگەڵ خۆم هێناومە منیش وەك ئێوەم دەكرد) جابیر دەڵێ: جا ئێمەش ئیحرامان شكاند هەتا رەفاقەتی هاوسەرەكانیشمان كرد كەسێ لە ئیحرام دا نابێ چی دەكات ئێمەش كردمان تا رۆژی تەرویە مەككەمان خستە پشتمانەوە ئیحرامان بە حەج بەست)

---

١) رواه البخاری (١٥٦٢) و مسلم (١١٨/ ١٢١١)

٢) رواه البخاري (١٥٢٦) و مسلم (١١ / ١١٨١)

**سیانزەیەم : ئەو شتانەی لەکاتی ڕۆشتنە ناو شاری مەککەدا سوننەتن**

ئەگەر حاجی نزیك بوویە لە ڕۆشتنە ناو شاری مەککە سوننەتە پابەندبێ بەم ئادابانەوە.

١ـ پێش وەستانی عەرەفە بڕواتە مەککە پاشان لە مککەوە بڕوات بۆ عەرەفە.

٢ـ لەبیری (ذي طوى) پێغەمبەر (ﷺ) کە دڕۆشتە مەککە هەمیشە لە ئاوی ئەو بیرە خۆی دەشۆری حاجی لە ئاوی ئەو بیرە خۆی بشوات.

٣ـ لە گەردەنەی کە دائەوە - کە لەسەروی مەککەوەیە - بڕواتە ناو شاری مەککە.

٤ـ هەر کە ڕۆشتە ناو شاری مەککە دەستبەجێ بەرەو بەیت بڕوا بەمەبەستی تەوافی قدوم کە سلام کردنە لە کەعبە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هەمیشە وای دەکرد.

٥ـ لەدەرگای بەنی شیبەوە بڕواتە ژورەوە بۆ مزگەوتی حەرام جا کە چاوی کەوت بە کەعبەی پیرۆز وهەردوو دەستی بەرزبکاتەوە و ئەم دوعایە بڵێ: (اللهم زد هذا البيت تشريفا وتعظيما وتكريما ومهابة، وزد من شرفه وعظمه ممن حجه او اعتمره تشريفا وتعظيما وتكريما وبرا، اللهم انت السلام ومنك السلام فحيينا ربنا بالسلام). واتە: ئەی خوایە شەرەف و گەروەیی و ڕێز و سامی ئەم ماڵە زیاکەیت وە شەرەف و ڕێز و گەورەیی ئەو کەسەش زیاد کەیت کە حەج یا عومرە ئەم ماڵە دەکات لەبەر شەرەف و گەورەیی و ڕێزو چاکە ئەم ماڵە خودایە تۆ خاوەنی ئاشتیت و ئاشتیش لە تۆوەیە دەی پەروەردگارمان بە ئاشتی و بێوەیی بمانژێنە.

**چواردەیەم: سوننەتەکانی تەواف**

**١ـ تەوافی القدوم:** تەوافی چوونە مەککە بەدەست نوێژەوە: (عن عائشة رضي الله عنها: أنه أول شيء بدأ به حين قدم مكة أنه توضأ ثم طاف بالبيت).[١] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (یەکەم شتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) دەچووە مەککە دەستی پێدەکرد دەست نوێژی دەگرت پاشان تەوافی بەیتی دەکرد).

**٢ـ چۆن تەوافی چوونە مەککە دەکرێت؟** تەوافی چوونە مەککە حەوت سوڕانەوەیە سیانی یەکەمی بە نیوە ڕاکردن دەکات چوارەکەش بە ڕۆشتنی ئاسایی دەیکات، (عن عبدالله بن عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كان إذا طَافَ بالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ أَوَّلَ ما يَقْدَمُ فإنه يَسْعَى ثَلَاثَةَ أَطْوَافٍ، وَيَمْشِي

---

١) رواه البخاري (١٦٤١) ومسلم (١٩٠ / ١٢٣٥)

أَرْبَعاً، ثُمَّ يُصَلِّي سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ يَطُوفُ بين الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ) [١] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر یەکەم جار کە دەچووە مەککە کاتی تەوافی بە حەج‌و عومرە بکردایە سێ تەوافی خێرا دەڕۆشت چواریشان ئاسایی دەڕۆشت پاشان دوو ڕکات نوێژی دەرکرد پاشان هاتوچۆی نێوان صەفا و مەروەی دەکرد).

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال: أَمَرَهُمْ النبي ﷺ أَنْ يَرْمُلُوا ثَلَاثَةَ أَشْوَاطٍ وَيَمْشُوا أربَعاً ما بين الرُّكْنَيْنِ) عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردین کە سێ سوڕانەوەی یەکەم بە نیوە ڕاکردن بکەن چواریشیان بە ئاسایی بڕۆن لە نێوان سوچی یەمانی و ئەسوەددا). [٢]

**٣ـ ماچکردنی (حجر الاسود):** (عن عُمَرَ رضي الله عنه أَنَّهُ كان يقبل الْحَجَرِ فقال: إِني أَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لَا تَضُرُّ ولا تَنْفَعُ وَلَوْلَا أَنِّي رأيت النبي ﷺ يُقَبِّلُكَ ما قَبَّلْتُكَ). عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) حەجەری ئەلسوەدی ماچ دەکرد و دەیوت (دڵنیام و بێگومان لەوەی تۆ - حەجەر ئەلسوەد - بەردێکی نە زیان نە سود ناگەیەنێ و ئەگەر پێغەمبەرم (ﷺ) نەدیبایە ماچی کردوی ماچم نەدەکردی) [٣]

**٤ـ یان گۆچانەکەی بینێ بە (حجر الاسود)دا و گوچانەکەی ماچ کات:** (عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال: طَافَ النبي ﷺ في حَجَّةِ الْوَدَاعِ على بَعِيرٍ يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنٍ) [٤] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە حەجی ماڵئاواییدا بەسەر وشترێکەوە تەوافی کرد گۆچانەکەی هێنا بە سووچەکەی حەجەر ئەلسوەدی تێدایە)

**٥ـ دەست دان لە سوچی یەمانی:** (عن عبد الله بن عمر رضي الله عنهما قال: لم أر رسول الله ﷺ يمس إلا اليمانيين) [٥] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوام (ﷺ) نەدیوە دەستی جگە لە دوو گۆشەی یەمانیەکە دابێت).

---

١) رواه البخاري (١٦١٦) و مسلم (٢٣١ / ١٢٦١)

٢) رواه البخاري (١٦١٦) و مسلم (٢٣١/ ١٢٦١)

٣) رواه البخاري (١٥٦٧) و مسلم (١٢٧٠)

٤) رواه البخاري (١٦٠٧) و مسلم (١٢٧٢)

٥) رواه البخاري (١٦٦) و مسلم (١١٨٧)

**٦ـ ئەو کەسەی ئیحرامی بە حەج و عومرە بەستووە بۆ هەردوکیان یەك تەواف و یەك صەفاو مەروە دەکات:**

(عن عُبَيْدِ اللَّهِ بن عُمَرَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من أَحْرَمَ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ أَجْزَأَهُ طَوَافٌ وَاحِدٌ وَسَعْيٌ وَاحِدٌ عنهما حتى يَحِلَّ مِنْهُمَا جميعا) [١] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس ئیحرامی بە حەج وعومرە ببەستێ یەك تەواف و یە صەفا و مەروە بۆ هەردوکیان بەسە هەتا ئیحرامی هەردوکیان دەشکێنێ)

**٧ـ حەیزدار چی حاجی دەیکات ئەویش دەیکات جگە لە تەوافی بەیت:**

(عَنْ عَائِشَةَ – رضى الله عنها – قَالَتْ خَرَجْنَا مَعَ النَّبِىِّ ﷺ وَلاَ نُرَى إِلاَّ الْحَجَّ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِسَرِفَ أَوْ قَرِيبًا مِنْهَا حِضْتُ فَدَخَلَ عَلَىَّ النَّبِىُّ ﷺ وَأَنَا أَبْكِى فَقَالَ « أَنُفِسْتِ ». – قَالَتْ – قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: « إِنَّ هَذَا شَىْءٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ فَاقْضِى مَا يَقْضِى الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفِى بِالْبَيْتِ حَتَّى تَغْتَسِلِى ». قَالَتْ وَضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نِسَائِهِ بِالْبَقَرِ). [٢] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ)دەڵێ : (لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) لە مەدینە دەرچووین مەبەستمان تەنیا حەجکردن بوو هەتا گەیشتنە سەرەف یا نزیکی سەرەف کەوتمە بێ نوێژی، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆلام لەوکاتەدا دەگریام فەرمووی: (کەوتوویتە بێ نوێژی؟) منیش ووتم: بەڵێ فەرمووی: ئەمە شتێکە خوا لەسەر کچانی ئادەمی نووسیوە جا حاجی چی دەکات تۆش بیکە قەینا طەواف مەکە بەدەوری بەیتا هەتا خۆت دەشۆری – دوای پاکبوونەوەت لەحەیز- عائیشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) مانگای کردە قوربانی بۆ خێزانەکانی)

**٨- لەکاتی تەوافدا ئەم دوعایە سوننەتە:** (عن عبد الله بن السائب يقول: سمعت رسول الله ﷺ يقول بين الركنين: ربنا آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار) [٣] عەبدوڵڵای کوڕی سائیب (ڕەزای خوای لێبێ)دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست لەنێوان گوشەکانی یەمانیدا دەیفەرموو: (ربنا آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار).

---

١) رواه الترمذي (٩٨٤) و ابن ماجه (٢٩٧٥) صحيحه

٢) رواه البخاري (٣٠٥) و مسلم (١٢١١/١١٩)

٣) رواه احمد ٣/ ٤١١ و ابو داود (١٨٩٣) حديث حسن

**٩- دوو رکات نوێژ بکات لە (مقام)ی ئیبراهیم دا:** دوا تەواو بوونی لەتەوافی بەیت پاشان بگەڕێتەوە بۆ بەردە رەشەکە وە دەستی لێ بدات - ئەگەر توانی-.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵای (رەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ گەیشتە لای (مقام)ی ئیبراهیم ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلًّىۖ﴾ البقرة: ١٢٥ جا مەقامی خستە نێوان خۆی کەعبەوە.

(فَكَانَ أَبِي يَقُولُ وَلاَ أَعْلَمُهُ ذَكَرَهُ إِلاَّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) وَ (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الرُّكْنِ فَاسْتَلَمَهُ)[١] ئوبەی دەڵێ: وا دەزانم ئەمەش لە پێغەمبەرەوە گێڕایەوە کە لەو دوو رکاتەدا -کە لەلای مەقامی ئیبراهیم دا دەیکرد- سورەتی (قل هو الله أحد) و (قل یا أیها الکافرون)ی دەخوێند پاشان دەگەڕایەوە بۆ گۆشەی بەردە رەشەکەو دەستی لێ دەدا.

**پانزەیەم: سوننەتەکانی هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە:**

١- سوننەتە کە هاتوچۆی کرد دوای تەواف لەدوای تەوافێکی تردا دووبارەی نەکاتەوە، کەواتە ئەگەر صەفاو مروەی کرد پاش تەوافی رۆشتە مەککە کە ئەم تەوافە سوننەتە، نا پەسەندە صەفاو مەروە دووبارە بکاتەوە دوای تەوافی (إفاضة) کە پایەو روکنە لەحەجدا.

٢- سوننەتە لەیەکەم جاردا کە لەصەفاوە دەست پێ دەکات ئەوەندە بڕواتە سەرەوە چاوی بە کەعبە بکەوێت ئەگەر هیچ بەربەستێك نەبێت، پاشان روو بکاتە کەعبەو بڵێ: (الله أكبر الله أكبر الله أكبر ولله الحمد الله أكبر على ماهدانا والحمد لله على ما أولانا لا اله الا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد يحيى ويميت بيده الخير وهو على كل شيء قدير). جا کە گەشتە مەروە دوا صەفا سەرکەوێ پیایدا هەمان شت دووبارە بکاتەوە.

٣- بەپیادە هاتوچۆی صەفاو مەروە بکات هەتا دەتوانێ کە گەشتە نێوان دوو نیشانە سەوزەکە سوننەتە خێرا بڕوات بەنیوە راکردن لەو کاتەدا وە لەکاتی سەرکەوتنی بۆ صەفاو مەروەدا دوعا بکات بۆ خۆی برایانیو ئیمانداران بەهەر دوعایەك پێی خۆشە.

---

١) رواه مسلم (١٤٧ / ١٢١٨)

**ڕوونکردنەوە:**

أـ لەصەفاوە بۆ مەروە بەیەك جار دادەنرێت لەمەروەوە بۆ صەفاش یەك جارە:

شەوكانی دەڵێ: (ئەمە ڕاستە هەر كەس پێچەوانەی ئەوە بكات ئەوە بەهەڵەی ئاشكرادا چووە پێشنیانو پاشینانی ئوممەتی ئیسلام لەسەر ئەم ڕایەن) [١].

(وقد ثبت عنه ﷺ أنه بدأ بالصفا كما في حديث جابر: أَنَّ النَّبِىَّ ﷺ لَمَّا دَنَا مِنَ الصَّفَا قَرَأَ (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ) « أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ ». فَبَدَأَ بِالصَّفَا)[٢]. لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە كە لە صەفاوە دەستی پێ كردووە وەك فەرموودەكەی جابیردا هاتووە دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) كاتێ لە صەفا نزیك بوویەوە ئەم ئایەتەی خوێند (إن الصفا والمروه الله من شعائر الله) البقرە/ ١٥٨، فەرمووی: (خوا بەچی دەستی پێ كردووە منیش لەوێوە دەست پێ دەكەم) بۆیە لەصەفاوە دەستی پێ كرد).

(وثبت عنه ﷺ من حدبث جابر: ... "حَتَّى إِذَا كَانَ آخِرُ طَوَافِهِ عَلَى الْمَرْوَةِ" وفي رواية: فلما كان السابع عند المروة قَالَ « لَوْ أَنِّى اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِى مَا اسْتَدْبَرْتُ لَمْ أَسُقِ الْهَدْىَ وَجَعَلْتُهَا عُمْرَةً فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ لَيْسَ مَعَهُ هَدْىٌ فَلْيَحِلَّ وَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً»)[٣] لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە لەفەرموودەی جابیرەوە (... هەتا كۆتا گەڕانەوەی بۆ مەروە) لەریوایەتێكدا (جا كاتێ حەوتەم جار لەلای مەروەدا بوو) فەرمووی: (ئەگەر ئەوەی ڕابورد لەكاری من بۆم بگەڕایەتەوە ئاژەڵی قوربانیم لەگەڵ خۆم نەدەهێناو ئیحرامەكەم دەكرد بەعومرە. جا هەر كام لەئێوە قوربانی لەگەڵ خۆی نەهێناوە با ئیحرامەكەی بشكێنێو بیكات بەعومرە).

ب- ئەوەی ئیحرامی بە(تمتع) بەستووە دوای هاتوچۆی صەفاو مەروە حەڵاڵ دەبێتو ئیحرام دەشكێنێ:

(عن جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ – رضى الله عنهما – أَنَّهُ حَجَّ مَعَ النَّبِىِّ ﷺ يَوْمَ سَاقَ الْبُدْنَ مَعَهُ ، وَقَدْ أَهَلُّوا بِالْحَجِّ مُفْرَدًا ، فَقَالَ لَهُمْ « أَحِلُّوا مِنْ إِحْرَامِكُمْ بِطَوَافِ الْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ ،

---

١) بروانە (السيل الجرار للشوكاني: ٢/١٦٠)

٢) رواه مسلم (٨٤/١٧٨٠)

٣) رواه مسلم (١٤٧/ ١٢١٨)

وَقَصِّرُوا ثُمَّ أَقِيمُوا حَلاَلاً ، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ فَأَهِلُّوا بِالْحَجِّ ، وَاجْعَلُوا الَّتِى قَدِمْتُمْ بِهَا مُتْعَةً » . فَقَالُوا كَيْفَ نَجْعَلُهَا مُتْعَةً وَقَدْ سَمَّيْنَا الْحَجَّ فَقَالَ « افْعَلُوا مَا أَمَرْتُكُمْ ، فَلَوْلاَ أَنِّى سُقْتُ الْهَدْىَ لَفَعَلْتُ مِثْلَ الَّذِى أَمَرْتُكُمْ ، وَلَكِنْ لاَ يَحِلُّ مِنِّى حَرَامٌ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْىُ مَحِلَّهُ »)[1]

جابیری (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: حەجی کرد لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ئەو ڕۆژەی گاو وشتری قوربانی لەگەڵ خۆیدا بردبوو و ئیحرامیان تەنیا بەحەج بەستبوو جا فەرمووی پێیان: (بەتەوافی کەعبە هاتوچۆی صەفاو مەروە ئیحرامەکەتان بشکێننو سەرتان کورت بکەنەوە پاشان بەبێ ئیحرام بەستن بمێننەوە تا ڕۆژی تەروییە ئیحرام ببەستن بەحەج ئەوەی کە کردتان بیکەنە بەهرەی عومرە) ئەوانیش ووتیان: چۆن بیکەینە بەهرەی عومرە لەکاتێکدا ئێمە نیتی حەجمان هێناوە؟ فەرمووی: (فەرمانی چیم پێ کردوون بیکەن، من لەبەرئەوە نەبوایە ئاژەڵی قوربانیم لەگەڵ خۆم هێناوە چ فەرمانێکم بەئێوە کردووە خۆشم وام دەکرد، بەڵام من ئەوەی لێم حەرامە بۆم حەڵاڵ نابێت هەتا قوربانییەکان نەگاتە شوێنی - سەربڕینی- خۆی) ئیتر ئەوانیش ئەوەی فەرمووی کردیان.

**شانزەیەم: سوننەتەکانی ڕۆشتن بۆ مینا:**

١- لەشوێنی خۆی یا ماڵی خۆی ئیحرام بەحەج دەبەستێ.

٢- نوێژی نیوەڕۆو عەسر هەروەها مەغریبو عیشا لەمینا دەکرێت لەڕۆژی تەروییەدا وە شەو مانەوە لەمینا هەتا نوێژی بەیانی دەکرێتو خۆر هەڵدێت.

٣- نوێژی نیوەڕۆو عەسر بەقەسرو جەمع دەکرێت لەنەمیرە لەعەرەفە.

٤- لەعەرەفە نەڕوات تا خۆر ئاوا دەبێت.

**حەڤدەیەم: کردارەکانی حەج (چۆنیەتی حەج)**

**١- نیەت هێنان:** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴾ البينة: ٥ واتە: وە فەرمانیان پێ

---

١) رواه البخاري (١٥٦٨) و مسلم (١٤٣ / ١٢١٦)

نەدرابوو تەنیا بەبەندایەتی کردن نەبێ بەدڵسۆزی ملکەچی بۆ بکەن‌و خۆیان بەدوور بگرن لەهەموو بیرو باوەڕێکی ناراست.

(قال رسول الله ﷺ: إِنَّمَا الآعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ)[1] پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەفەرموێ: (بێگومان کردەوەکان بەنیەتەوە بەندە).

**٢- وەستان لەعەرەفەدا:** (عن عبد الرحمن بن يَعْمَرَ الدِّيلِيِّ قال أَتَيْتُ النبي ﷺ وهو بِعَرَفَةَ فَجَاءَ نَاسٌ أو نَفَرٌ من أَهْلِ نَجْدٍ فَأَمَرُوا رَجُلًا فَنَادَى رسول اللَّهِ ﷺ كَيْفَ الْحَجُّ فَأَمَرَ رسول اللَّهِ ﷺ رَجُلًا فَنَادَى الْحَجُّ الْحَجُّ يَوْمُ عَرَفَةَ من جاء قبل صَلَاةِ الصُّبْحِ من لَيْلَةِ جَمْعٍ فَتَمَّ حَجُّهُ أَيَّامُ مِنًى ثَلَاثَةٌ فَمَنْ تَعَجَّلَ في يَوْمَيْنِ فلا إِثْمَ عليه وَمَنْ تَأَخَّرَ فلا إِثْمَ عليه).[2] عەبدولڕەحمانی کوڕی یەعمەر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد جاڕدەرێك جاڕ بدات حەج عەرەفاتە، هەر کەسێك پێش نوێژی بەیانی هات لەشەوی مانەوە لەموزدەلیفە. ئەوە حەجەکەی تەواوە وە ڕۆژانی مینا سێ ڕۆژە جا هەرکەس پەلە بکات لەدوو ڕۆژدا تەواوی بکات ئەوە تاوانی لەسەر نییە وە هەر کەسێك دوای بخات بەسێ ڕۆژ تەواوی بکات ئەویش تاوانی لەسەر نییە).

(عن عُرْوَةَ الطَّائِيِّ قال أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِالْمُزْدَلِفَةِ حين خَرَجَ إلى الصَّلَاةِ فقلت يا رَسُولَ اللَّهِ إِنِي جِئْتُ من جَبَلَيْ طيء أَكْلَلْتُ رَاحِلَتِي وَأَتْعَبْتُ نَفْسِي والله ما تَرَكْتُ من حَبْلٍ إلا وَقَفْتُ عليه فَهَلْ لي من حَجٍّ فقال رسول اللَّهِ ﷺ من شَهِدَ صَلَاتَنَا هذه وَوَقَفَ مَعَنَا حتى نَدْفَعَ وقد وَقَفَ بِعَرَفَةَ قبل ذلك لَيْلًا أو نَهَارًا فَقَدْ أَتَمَّ حَجَّهُ).[3] عوروەی تائی (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە موزدەلیفە کاتێ ڕۆشت بۆ نوێژ،ووتم ئەی پێغەمبەری خوا من لەووڵاتی طیەوە هاتووم، وشترەکەم خاوەخاوی پێکردم خۆشم ماندوو کرد سوێند بەخوا هیچ کێوێکم بەجێ نەهێشتووە ئیللا لەسەر ڕاوەستاوم ئایا حەجەکەم دروستە. پێغەمبەری

١) رواه البخاري (١) و مسلم (١٩٠٧)

٢) رواه ابوداود (١٩٤٩) و الترمذي (٨٩٠) و النسائي (٢٦٤/٥) و ابن ماجه (٣٠١٥)

٣) رواه ابوداود (١٩٥٠) و الترمذي (٨٩٢) و ابن ماجه (٣٠١٦)

خواش (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس ئامادەی ئەم نوێژ-ی بەیانی-ە بێت لەگەڵمان وە لەپێشیشدا لەعەرەفەدا راوەستابێت لەشەودا یا لەرۆژدا). ئەوە حەجەکەی دروستە

**٣- رۆشتن لەعەرەفاتەوە بۆ موزدەلیفە:** وە نوێژی مەغریبو عیشا پێکەوەو لەکاتی عیشادا بیانکات لەموزدەلیفە. (عن عبد الله بن عمر رضي الله عنهما قال: جمع رسول الله ﷺ بين المغرب والعشاء بجمع ليس بينهما سجدة، أي نافلة، وصلى المغرب ثلاث ركعات وصلى العشاء ركعتين)[1] عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی مەغریبو عیشا پێکەوە کرد لەکاتی عیشادا لەموزدەلیفە نوێژی سوننەتیشی لەنێوانیاندا نەکرد وە سێ رکات نوێژی مەغریبیشی کردو دوو رکاتی عیشای کرد).

**٤- شەو مانەوە لەموزدەلیفە:** دەبێت کە رۆشت بۆ موزدەلیفە شەو لەوێ بمێنێتەوە وە نوێژی بەیانی لەموزدەلیفە بکاتو پێش خۆرهەڵهاتن لەموزدەلیفە وە بڕوا بۆ مەشعەری حەرام.

(و قال جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: ... ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حتى أتى الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَدَعَاهُ وَكَبَّرَهُ وَهَلَّلَهُ وَوَحَّدَهُ فلم يَزَلْ وَاقِفًا حتى أَسْفَرَ جِدًّا فدفع قبل أن تطلع الشمس)[2] جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: (... وە کاتێ سپێدە دەرکەوت نوێژی بەیانی کردو بەبانگو قیامەتێك پاشان سوار قەسوا بوو تا رۆشتە مەشعەری حەرام جا رووی کردە قیبلەو دوعاو الله أکبرو لا اله الا الله ی کرد جا هەر بەراوەستاوی مایەوەو هەتا دونیا تەواو رووناك بوویەوە جا پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت رۆشت...).

فقال عُمَرَ رضي الله عنه (إِنَّ الْمُشْرِكِينَ كَانُوا لَا يُفِيضُونَ حتى تَطْلُعَ الشَّمْسُ وَيَقُولُونَ أَشْرِقْ ثَبِيرُ وَأَنَّ النبي ﷺ خَالَفَهُمْ ثُمَّ أَفَاضَ قبل أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ)

عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: (جاران هاوبەسپەیدا کەرەکان تا خۆر هەڵنەهاتایە لەموزدەلیفە نەدەرۆشتن بۆ مینا وە دەیانووت با خۆر لەچیای ثبیر گزنگ بدات ئەوسا دەرۆین بۆ مینا- بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) پێچەوانەی ئەوانی دەکرد و لەپێش خۆرهەڵهاتندا دەرۆشت بۆ مینا)[3]

---

١) رواه البخاري (١٦٧٣) و مسلم (٢٨٧ / ١٢٨٨)

٢) رواه مسلم (١٤٧/ ١٢١٨)

٣) رواه البخاري (١٦٨٤)

**٥ـ وەستان لەمەشعەری حەرام و یادی خوا کردن:** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَاذْكُرُوا اللَّهَ عِندَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ ﴾ البقرة: ١٩٨ واتە: یادی خوا بکە لای مەشعەری حەرامدا لە فەرموودەکەی جابیر هاتووە (... ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حتى أتى الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَدَعَاهُ وَكَبَّرَهُ وَهَلَّلَهُ وَوَحَّدَهُ فلم يَزَلْ وَاقِفًا حتى أَسْفَرَ جِدًّا).[1] (... پاشان پێغەمبەر (ﷺ) سواری وشترەکەی بوو هەتا هاتە مەشعەری حەرام جا ڕووی کردە قیبلەو دوعای کردو (الله أكبر و لااله الا الله وحده لاشريك له) ی کرد جا بەراوەستاوی مایەوە هەتا زۆر دونیا ڕووناك بوویەوە.[2]

**٦ـ ڕەجمی شەیتانی گەورە دوای خۆرهەڵهاتن:** (و جاء في حديث جَابِرُ الطويل: (.. حتى أتى بَطْنَ مُحَسِّرٍ فَحَرَّكَ قَلِيلًا ثُمَّ سَلَكَ الطَّرِيقَ الْوُسْطَى التي تَخْرُجُ على الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى حتى أتى الْجَمْرَةَ التي عِنْدَ الشَّجَرَةِ فَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مع كل حَصَاةٍ منها مِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ....)[3] هەر لەفەرموودەکەی جابیردا هاتووە (... هەتا هاتە شیوی موحەسسیر جا کەمێ ڕۆشت جا ملی ڕێگای ناوەڕاستی گرت کە دەڕواتە لای بەردە گەورەکە -یا شەیتانی گەورە- ڕۆشت تا گەیشتە لای ئەو بەردە کە لای درەختەکەدایە، جا حەوت بەردی بچووکی تێگرت لەگەڵ هەموو بەردێکیشدا (الله أكبر)ی دەرکرد).

(عن عبد اللَّهِ رضي الله عنه أَنَّهُ انْتَهَى إلى الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى جَعَلَ الْبَيْتَ عن يَسَارِهِ وَمِنًى عن يَمِينِهِ وَرَمَى بِسَبْعٍ وقال هَكَذَا رَمَى الذي أُنْزِلَتْ عليه سُورَةُ الْبَقَرَةِ ﷺ).[4] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (جا پێغەمبەر (ﷺ) گەشتە لای بەردە گەورەکە -جەمرەی عەقەبە- کەعبەی خستە لای چەپی‌و مینای خستە لای ڕاستی‌و حەوت بەردی گرتە شەیتان) عەبدوڵڵا وتی: (ئاوا بەردەکانی تێگرت ئەو کەسەی سورەتی بەقەرەی بۆ دابەزی- کە پێغەمبەرە (ﷺ).

---

١) رواه مسلم (١٤٧/ ١٢١٨)

٢) رواه مسلم (١٤٧/ ١٢١٨)

٣) پێشتر باسکرا

٤) رواه البخاري (١٧٤٨) و مسلم (٣٠٧ / ١٣٠٢)

**٧- ئەوانەی لاوازن رێگەیان پێدراوە لەنیوەشەو بەدواوە رەجمی شەیتان بکەن:** ئەو کەسانەی لاوازن وەك ئافرەت و پیرو پەککەوتە دەتوانن لەنیوەی شەو بەدواوە رەجمی شەیتان بکەن.

(عن عَائِشَةَ أَنَّها قالت أستأذنت سَوْدَةُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ الْمُزْدَلِفَةِ تَدْفَعُ قَبْلَهُ وَقَبْلَ حَطْمَةِ الناس وَكَانَتْ امْرَأَةً ثَبِطَةً قال فَأَذِنَ لها فَخَرَجَتْ قبل دَفْعِهِ وَحَبَسَنَا حتى أَصْبَحْنَا فَدَفَعْنَا بِدَفْعِهِ).[1] عائیشە (رەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: (سەودە لەشەوی موزدەلیفەدا مۆڵەتی لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) وەرگرت کە پێش پێغەمبەرو (ﷺ) قەرەباڵغی خەڵك بکەوێتە رێ، چونکە سەودە ئافرەتێکی قورس بوو پێغەمبەریش (ﷺ) مۆڵەتیدا جا پێش پێغەمبەر (ﷺ) رۆشت - بۆ رەجمی شەیتان لەشەوەوە-، بەڵام رێگەی بەئێمە نەدا هەتا رۆژمان لێ بوویەوە، جا پێغەمبەر (ﷺ) کەوتە رێ و ئێمەش کەوتینە رێ).

**٨- سەرتاشین یا کورتکردنەوەی:** (عن أنس بن مالك، أن رسول الله ﷺ أتى منى فأتى الجمرة فرماها، ثم أتى منزله بمنى ونحر ثم قال للحلاق خذ وأشار إلى جانبه الأيمن ثم الأيسر ثم جعل يعطيه الناس).[2] ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ مینا جا هات شەیتانی رەجم کرد پاشان هاتەوە بۆ شوێنەکەی لەمینا قوربانی سەربڕیو پاشان بە سەرتاشەکەی فەرموو: (بیتاشەو لێی کەرەوە) لەپێشدا ئاماژەی بۆ لای راستی کرد، پاشان ئاماژەی بۆ لای چەپی سەری کرد، پاشان دەستی کرد بەدابەشکردنی مووی تاشراوی سەری بەسەر خەڵکیدا.

**ـ سەرتاشین چاکترە بۆ پیاوان:**

چونکە پێغەمبەر (ﷺ) سەری تاشیوە وەك باسکراوە (عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ اللهم اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ قالوا يا رَسُولَ اللَّهِ وَلِلْمُقَصِّرِينَ قال اللهم أغفر لِلْمُحَلِّقِينَ قالوا يا رَسُولَ اللَّهِ وَلِلْمُقَصِّرِينَ قال اللهم اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ قالوا يا رَسُولَ اللَّهِ وَلِلْمُقَصِّرِينَ قال وَلِلْمُقَصِّرِينَ).[3] پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (خوایە لەوانە خۆش ببە سەریان تاشی) وتیان: ئەی پێغەمبەر

---

١) رواه البخاري (١٦٨١) و مسلم (٢٩٣ / ١٢٩٠)

٢) رواه البخاري (١٧١) و مسلم ( ١٣٠٥)

٣) رواه البخاري (١٧٢٨) و مسلم (١٣٠٢)

(ﷺ) لەوانەش سەریان کورت کردۆتەوە؟ فەرمووی: (خوایە لەوانە خۆش ببە سەریان تاشی).
وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوانەش سەریان کورت کردۆتەوە، فەرمووی: (خوایە لەوانە خۆش بە سەریان تاشی) وتیان: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانەش سەریان کورت کردۆتەوە؟ فەرمووی: (لەوانەش سەریان کورت کردەوە خۆش بە).

**ـ سەر کورت کردنەوە چاکترە بۆ ئافرەتان لە تاشینی:**

(عن ابن عَبَّاسٍ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ ليس على النِّسَاءِ حَلْقٌ إنما على النِّسَاءِ التَّقْصِيرُ).[١]
عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لەسەر ئافرەتان پێویست نییە سەرتاشین بەڵکو تەنیا کورت کردنەوەیان لەسەرە).

**٩- هەر کەس ڕەجمی شەیتانی گەورە (جمرة العقبة)ی کرد هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ دەبێت جگە لەئافرەت:**

(عن ابن عباس قال إذا رمى الجمرة فقد حل له كل شيء إلا النساء قيل له والطيب قال أما أنا فقد رأيت رسول الله ﷺ يتضمخ بالمسك أفطيب هو)[٢]. عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (کە حاجی جەمرەی عەقەبەی ڕەجم کرد هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ دەبێت جگە لەئافرەت) وترا: بۆنی خۆشیش حەڵاڵ دەبێ بۆی، عەبدوڵڵا ووتی: (بێگومان من پێغەمبەرم بینیوە - پاش ئەوەی ڕەجمی جەمەرە عەقەبەی کردوە- میسکی لەخۆی دا ئایا میسك بۆنی خۆش نییە؟).

**١٠- هەر کەس سەری تاشی یا قوربانی سەربڕی یا تەوافی (إفاضة)ی کرد پێش ڕەجمی شەیتان قەیناکات:** (عن عبد اللَّهِ بن عَمْرِو بن الْعَاصِ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَقَفَ في حَجَّةِ الْوَدَاعِ فجعلوا يَسْأَلُونَهُ فَقَالَ رَجُلٌ: لم أَشْعُرْ فَحَلَقْتُ قبل أَنْ أَذْبَحَ. فقال: اذْبَحْ ولا حَرَجَ. فَجَاءَ آخَرُ فقال: لم أَشْعُرْ فَنَحَرْتُ قبل أَنْ أَرْمِيَ. قال: ارْمِ ولا حَرَجَ. فما سُئِلَ النبي ﷺ عن شَيْءٍ قُدِّمَ ولا أُخِّرَ إلا قال افْعَلْ ولا حَرَجَ).[٣] عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای

---

١) رواه ابوداود (١٩٨٤ ، ١٩٨٥)
٢) رواه النسائي (٥/٢٧٧) و ابن ماجه (٣٠٤١)
٣) رواه البخاري (١٧٣٦) و مسلم (١٣٠٦)

خوایان لێبێ)دەڵێ: (لەحەجیماڵئاواییدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) راوەستابوو خەڵکی پرسیاریان لێ دەکرد، پیاوێك ووتی: نەمزانی سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانییەکەم سەرببڕم، فەرمووی: (ڕەجمەکەت بکەو قەیناکات) پیاوێکی تر هات و ووتی (نەمزانی قوربانیەکەم سەربڕی پێش ئەوەی ڕەجم بکەم فەرمووی (ڕەجمەکەت بکە و قەیناکات)) جا ئەو رۆژە پرسیاری هەرشتێك دەکرا دەربارەی پێشخستن یا دواخستن دەیفەرموو: (بیکەو قەیناکات).

**١١- مانەوەی سێ شەوی دوارۆژی جەژن لە مینا:** سێ رۆژی دوا جەژن پێی دەڵێن (أيام التشريق)، چونکە لەورۆژانەدا گۆشتی قوربانییەکان دەدرێتە بەر تیشکی خۆر تا ووشك ببێتەوە ناوەکەی لەوەوە هاتووە.

(عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما قال اسْتَأْذَنَ الْعَبَّاسُ بن عبد الْمُطَّلِبِ رضي الله عنه رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنًى من أَجْلِ سِقَايَتِهِ فَأَذِنَ له).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد لە شەوانی مانەوەی مینا لە مەککە بمێنێتەوە لەبەر ئاودانی بەحاجیان پێغەمبەریش (ﷺ) مۆڵەتی دا).

ئەم فەرموودە لێی وەردەگیرێ کە مانەوەی شەوانی تەشریق لەمینا سوننەتە وە دروستە بۆ کەسێ بیانویەکی هەبێت شەو لە مینا نەمێنێتەوە.

**- دروستە بۆ کەسێك عوزرێکی هەبێت ڕەجمی دوو رۆژ لەیەك رۆژدا بکات:**

(عن عَاصِمِ بن عدي أخبره ان رَسُولَ اللهِ ﷺ رخص لِرِعَاءِ الإِبِلِ فِي الْبَيْتُوتَةِ خارجين عن مِنًى يَرْمُونَ يوم النَّحْرِ ثُمَّ يَرْمُونَ الْغَدَ وَمِنْ بَعْدِ الْغَدِ لِيَوْمَيْنِ ثُمَّ يَرْمُونَ يوم النَّفْرِ).[2] عاصیمی کوڕی عەدی (ڕەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگەی دا بەوانەی ووشترەوانن شەو لەدەرەوەی مینا بمێننەوەو ڕەجمی شەیتان بکەن لەرۆژی جەژندا پاش جەژن ڕەجمی دوو رۆژ بکەن لەرۆژێکدا - کە رۆژی دوانزەی ذی الحجة دەکات- رۆژی گەڕانەوە لەميناش ڕەجم دەکەن).

---

١) رواه البخاري (١٦٣٤) و مسلم (١٣١٥)

٢) رواه ابو داود (١٩٧٥) و الترمذي (٩٥٤) صحيحة

دروستە بۆ حاجی سەردانو تەوافی کەعبە بکات لەشەوانی مانەوەی میناداً، (عن ابن عباس رضي الله عنه أن نبي الله ﷺ كان يزور البيت كل ليلة ما دام بمنى).[١] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەتا لەمینا بوو هەموو شەوێ سەردانی کەعبەی دەکرد).

**١٢- هەموو ڕۆژێ هەرسێ میلەکە بەحەوت بەرد ڕەجم دەکات بە ڕیز:** (عن سَالِمٍ عن بن عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّهُ كان يَرْمِي الْجَمْرَةَ الدُّنْيَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ على إِثْرِ كل حَصَاةٍ ثُمَّ يَتَقَدَّمُ حتى يُسْهِلَ فَيَقُومَ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ فَيَقُومُ طَوِيلًا وَيَدْعُو وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ ثُمَّ يَرْمِي الْوُسْطَى ثُمَّ يَأْخُذُ ذَاتَ الشِّمَالِ فيسهل وَيَقُومُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ فَيَقُومُ طَوِيلًا وَيَدْعُو وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ وَيَقُومُ طَوِيلًا ثُمَّ يَرْمِي جَمْرَةَ ذَاتِ الْعَقَبَةِ من بَطْنِ الْوَادِي ولا يَقِفُ عِنْدَهَا ثُمَّ يَنْصَرِفُ فيقول هَكَذَا رأيت النبي ﷺ يَفْعَلُ).[٢] سالیمی کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) میلە نزیکەکەی بەحەوت بەرد ڕەجم دەکرد دوا هەموو بەردێکی (الله أكبر)ی دەکرد پاشان کەمێ دەڕۆشتە پێشەوە بۆ تەختاییەکە جا ڕوو بەقیبلە زۆر دەوەستا دوعای دەکردو دەستەکانی بەرز دەکردەوە پاشان میلی ناوەڕاستی ڕەجم دەکرد بەهەمان شێوە پاشان بەلای چەپدا بەرەو تەختاییەکە دەڕۆشت ڕوو بەقیبلە زۆر ڕادەوەستاو دەستەکانی بەرز دەکردەوەو دەپاڕایەوە زۆر ڕادەوەستا پاشان میلی عەقەبەی ڕەجم دەکرد لەقوڵایی شیوەکەداو ڕانەدەوەستا، پاشان دەگەڕایەوەو دەیووت بەم شێوەیە پێغەمبەرم دی ئاوای دەکرد).

**١٣- ووتاردان لەڕۆژی جەژنی قوربانا سوننەتە:** (عَنْ أَبِى بَكْرَةَ رضى الله عنه قَالَ خَطَبَنَا النَّبِىُّ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ، قَالَ « أَتَدْرُونَ أَىُّ يَوْمٍ هَذَا » . قُلْنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ . فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ . قَالَ « أَلَيْسَ يَوْمَ النَّحْرِ » . قُلْنَا بَلَى . قَالَ « أَىُّ شَهْرٍ هَذَا » . قُلْنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ . فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ . فَقَالَ « أَلَيْسَ ذُو الْحَجَّةِ » . قُلْنَا بَلَى . قَالَ « أَىُّ بَلَدٍ هَذَا » . قُلْنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ . فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ. قَالَ « أَلَيْسَتْ بِالْبَلْدَةِ الْحَرَامِ » . قُلْنَا بَلَى . قَالَ «فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِى شَهْرِكُمْ هَذَا ، فِى بَلَدِكُمْ هَذَا، إِلَى يَوْمِ تَلْقَوْنَ رَبَّكُمْ. أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ».

---

١) رواه البيهقي في السنن الكبرى (٥/ ١٤٦) و الطحاوي في مشكل الاثار ١/ ٤٩١

٢) رواه البخاري (١٧٥٢)

قَالُوا نَعَمْ . قَالَ « اللَّهُمَّ اشْهَدْ، فَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ، فَلاَ تَرْجِعُوا بَعْدِى كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ »)[1] ئەبوبەکرە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (لەرۆژی جەژنی قورباندا پێغەمبەر (ﷺ) ووتاری بۆداین‌و فەرمووی: (ئایا دەزانن ئەمرۆ چ رۆژێکە؟) ووتمان خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەزانن، جا بێدەنگ بوو هەتا وامان دەزانی بەناوێکی تر جگە لەناوەکەی خۆی ناوی دەبات فەرمووی: (رۆژی جەژنی قوربان نییە؟) ووتمان بەڵێ وایەی فەرمووی: (ئەم مانگە چ مانگێکە؟) ووتمان خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەزانن. جا بێدەنگ بوو هەر وامان دەزانی بەناوێکی تر جگە لەناوەکەی خۆی ناوی دەبات، فەرمووی: (ئەم مانگە ذوالحجة نییە؟) ووتمان بەڵێ (ذوالحجة)یە فەرمووی: (ئەم شارە چ شارێکە؟) ووتمان خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەزانن، جا بێدەنگ بو هەروامان دەزانی بەناوێکی تر جگە لەناوەکەی خۆی ناوی دەبات فەرمووی: (ئەم شارە -جەنگ تێیدا- حەرام کراو نییە؟) ووتمان بەڵێ فەرمووی: (دەسا دڵنیابن کە خوێنتان‌و سامانتان لەسەر یەکتر حەرامە وەك حەرامی ئەم رۆژەتان لەم مانگەتاندا لەم شارەتاندا تا ئەو رۆژەی دەگەنە خزمەتی پەروەردگارتان ئاگاداربن ئایا پێم ڕاگەیاندن؟ ووتیان بەڵێ فەرمووی: (دەی خوایە تۆ شاهیدبە جا بائەوەی ئامادەیە بەوانەی ڕابگەیەنن لێرە نین چونکە زۆر پێ ڕاگەیەنراو هەیە لەبیسەرەکە چاکتر تێدەگات دوای من کافر مەبنەوە هەندێکتان لەگەردنی هەندێکتان بدەن)

**١٤ـ ووتاردان لەرۆژی دوانزەی (ذوالحجة)دا سوننەتە:** (عَنْ رَجُلَيْنِ مِنْ بَنِى بَكْرٍ قَالاَ رَأَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ بَيْنَ أَوْسَطِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ وَنَحْنُ عِنْدَ رَاحِلَتِهِ وَهِىَ خُطْبَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّتِى خَطَبَ بِمِنًى).[2] دوو پیاو لەبەنی بەکر دەڵێن: (پێغەمبەرمان (ﷺ) بینی لەناوەڕاستی رۆژانی تەشریقدا ووتاری دەدا وە ئێمە لە نزیکی ولاَخەکەیدا بووین وە ئەو ووتارە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مینا دای).

---

١) رواه البخاري (١٧١٤)

٢) رواه ابو داود (١٩٥٢)

**١٥- تەوافیماڵئاوایی کردن:** (عن ابن عَبَّاسٍ قال كان الناس يَنْصَرِفُونَ في كل وَجْهٍ فقال رسول اللَّهِ ﷺ لَا يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ حتى يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ)[1] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ﷺ) دەڵێ: (خەڵك لەهەموو لایەکەوە دەگەڕایەوە جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هیچ کەس نەگەڕێتەوە هەتا کۆتا جار تەوافی کەعبە نەکات).

**ئاگاداری: ئافرەتی حەیزدار تەوافی ماڵئاوایی لەسەر نییە،** (عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال أُمِرَ الناس أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ إلا أَنَّهُ خُفِّفَ عن الْحَائِضِ)[2] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بەخەڵکی کۆتا جار تەوافی بەیت بکەن بەڵام ئەوەندە هەیە ئەمەی لەسەر ئافرەتی حەیزدار سووك کردو لابرد).

## هەژدەیەم: قوربانی

قوربانی ئەو ئاژەڵو ماڵەتەیە کە دەبرێن بۆ ماڵی خوا وەك دیاری لەوێ سەر دەبڕدرێت.

وەك خۆراك بدرێتە زیارەتکارانو نزیکانی کەعبە لە هەژارانو کەم دەستان وە ئەم قوربانی کردنە لەو کارانەیە خاوەنەکەی لەخوا نزیك دەخاتەوە چونکە ماڵ بەخشین لە پەرستشە گەورەکانە نەخۆزەلا لەشوێنێکی پیرۆزی وەك کەعبەدا وە بەکەسانێ بدرێت کە خۆیان یەکلایی کردۆتەوە بۆ بەندایەتی خوای گەورە.

**١- جۆرەکانی قوربانی:**

أ- ووشتر: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ ﴾ الحج:٣٦

واتە ئەو ووشترانە-ی دەبرێن بۆ ماڵی خوا لەوێ سەردەبڕێن- ئێمە کردومانەتە دروشمی ئاینی خوا بۆ ئێوە.

ب - ڕەشەووڵاخ.

ج - مەڕو بزن.

---

١) رواه مسلم (١٣٢٧)

٢) رواه البخاري (١٧٥٥) و مسلم (١٣٢٨)

**٢- ووشترو ڕەشەوڵاخ بۆ حەوت كەس سەردەبڕدرێت:**(عَنْ جَابِرٍ رضى الله عنه قَالَ خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُهِلِّينَ بِالْحَجِّ فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَشْتَرِكَ فِى الإِبِلِ وَالْبَقَرِ كُلُّ سَبْعَةٍ مِنَّا فِى بَدَنَةٍ)[1]. جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ڕۆشتین ئیحراممان بەحەج بەستبوو جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێ كردین كە هەر حەوت كەسمان لەووشترو مانگایەكدا بەشدار بین).

**٣- دروستە بۆ حاجی لەگۆشتی قوربانییەكەی بخوات:** (عن عَائِشَةَ رضي الله عنها تَقُولُ خَرَجْنَا مع رسول اللَّهِ ﷺ لِخَمْسٍ بَقِينَ من ذِي الْقَعْدَةِ لَا نُرَى إلا الْحَجَّ فلما دَنَوْنَا من مَكَّةَ أَمَرَ رسول اللَّهِ ﷺ من لم يَكُنْ معه هَدْيٌ إذا طَافَ وَسَعَى بين الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ أَنْ يَحِلَّ قالت فَدُخِلَ عَلَيْنَا يوم النَّحْرِ بِلَحْمِ بَقَرٍ فقلت ما هذا قال نَحَرَ رسول اللَّهِ ﷺ عن أَزْوَاجِهِ)[2] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (مانگی (ذي القعدة) پێنج ڕۆژی مابوو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ڕۆشتین نیەتمان تەنیا حەج بوو جا كاتێ نزیك بووینەوە لەمەككە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی كرد ئەوەی قوربانی لەگەڵ خۆیدا نەهێناوە كە تەواف و كردو صەفاو مەروەی كرد ئیحرام بشكێنێ) عائیشە دەڵێ: (ڕۆژی جەژن گۆشتی مانگایان بۆ هێناین منیش ووتم ئەمە چییە؟ ووتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) قوربانی بۆ خێزانەكانی كردووە).

**٤- دیاری كردنی قوربانیو شت لەمل كردنی:** (عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت: فَتَلْتُ قَلَائِدَ هَدْيِ النبي ﷺ بيدي، ثُمَّ أَشْعَرَهَا وَقَلَّدَهَا أو قَلَّدْتُهَا ثُمَّ بَعَثَ بها إلى الْبَيْتِ وَأَقَامَ بِالْمَدِينَةِ فما حَرُمَ عليه شَيْءٌ كان له حِلاًّ)[3] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: چەند گوڵەنگم بۆ ملی قوربانییەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەدەستی خۆم بامداوە، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) قوربانییەكانی دیاری كرد -پشت بریندار كرد تا خوێنی لێ بێ- گوڵەنگی كردە ملیان یان من كردمە ملیان پاشان قوربانییەكانی نارد بۆ بەیتو خۆی لەمەدینە مایەوە جا هیچ شتێكی لێ حەرام نەبوو كە بۆی حەڵاڵ بوو).

---

١) رواه مسلم (٣٥١ / ١٣١٨)

٢) رواه البخاري (١٧٠٩) و مسلم (١٢١١)

٣) رواه البخاري (١٦٩٩) و مسلم (١٣٢١)

**٥- شێوەی سەربڕینی قوربانی:** سوننەتە ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزنو ئاژەڵی تر جگە لە وشتر بەپاڵ خستنەوە لەسەر لای چەپیان روو بەقیبلە سەربڕێن سەربڕینەکەشیان بەبڕینی قورگیان -گەرویان- دەبێت، بەڵام ووشتر بەپێوە سەردەبڕدرێت دەستی چەپی دەبەسترێتەوە شوێنی سەربڕینی ملو گەردنیەتی.

(عن زِيَادِ بن جُبَيْرٍ قال رأيت ابن عُمَرَ رضي الله عنهما أتى على رَجُلٍ قد أَنَاخَ بَدَنَتَهُ يَنْحَرُهَا قال ابْعَثْهَا قِيَامًا مُقَيَّدَةً سُنَّةَ مُحَمَّدٍ ﷺ).[1] زیادی کوڕی جوبەیر وتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم (ڕەزای خوایان لێبێ)بینی ڕۆشت بەلای پیاوێکدا ووشترەکەی یەخ دابوو — لە زەوی دا داینیشاندبوو- سەری دەبڕی عەبدوڵڵا ووتی: (هەڵیسێنەوە سەرپێ بەدەست بەستراوەیی —سەری ببڕە- سوننەتی موحەممەد (ﷺ) وایە).

**٦- حوکمی ئەو کەسەی قوربانیەکەی دەنێری:** (عن عَمْرَةَ بِنْتِ عبد الرحمن أَنها أَخْبَرَتْهُ أَنَّ زِيَادَ بن أبي سُفْيَانَ كَتَبَ إلى عَائِشَةَ رضي الله عنها إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال من أَهْدَى هَدْيًا حَرُمَ عليه ما يَحْرُمُ على الْحَاجِّ حتى يُنْحَرَ هَدْيُهُ قالت عَمْرَةُ فقالت عَائِشَةُ رضي الله عنها ليس كما قال ابن عَبَّاسٍ أنا فَتَلْتُ قَلَائِدَ هَدْيِ رسول اللَّهِ ﷺ بِيَدَيَّ ثُمَّ قَلَّدَهَا رسول اللَّهِ ﷺ بِيَدَيْهِ ثُمَّ بَعَثَ بها مع أبي فلم يَحْرُمْ على رسول اللَّهِ ﷺ شَيْءٌ أَحَلَّهُ الله حتى نُحِرَ الْهَدْيُ)[2] عومرەی کچی عەبدولڕەحمان دەڵێ: زیادی کوڕی ئەبو سەفیان نامەیەکی نووسی بۆ عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (هەر کەسێ قوربانی بنێرێت بۆ ماڵی خوا چی لەسەر حاجی حەرامە لەسەر ئەو کەسەش حەرام دەبێت تا قوربانییەکەی سەر دەبڕێ) عەمرە ووتی: عائیشەش (ڕەزای خوایان لێبێ) لەوەڵامدا ووتی: وانیە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ووتویەتی، من خۆم چەندین گوڵەنگی ملی قوربانییەکانی پێغەمبەرم (ﷺ) باداوە بەدەستی خۆم پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بەدەستی خۆی کردیە ملیان پاشان بەباوکمدا قوربانییەکانی نارد - بۆ مەککە- هیچ شتێك لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) حەرام نەبوو هەتا قوربانییەکانی سەربڕان - بەهۆی ناردنی قوربانیەکانەوە- کە خوا بۆی حەڵاڵ کردبوو)

---

١) رواه البخاري (١٧١٣) و مسلم (١٣٢٠)

٢) رواه البخاري (١٧٠٠) و مسلم (١٣٢١)

**٧- سواربوون و دۆشینی قوربانی لەكاتی پێویستدا دروستە گەر زیانی پێ نەگات:** (عَنْ أَبِی هُرَیْرَةَ رضی الله عنه أَنَّ نَبِیَّ اللَّهِ ﷺ رَأَى رَجُلاً یَسُوقُ بَدَنَةً ، قَالَ « ارْكَبْهَا ». قَالَ إِنَّهَا بَدَنَةٌ. قَالَ « ارْكَبْهَا ». قَالَ فَرَأَیْتُهُ رَاكِبَهَا یُسَایِرُ النَّبِیَّ ﷺ وَالنَّعْلُ فِی عُنُقِهَا).[1] وفي لفظ: (قَالَ فِی الثَّانِیَةِ أَوِ الثَّالِثَةِ «ارْكَبْهَا، وَیْلَكَ، أَوْ وَیْحَكَ »)[2] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێكی بینی ووشترێكی دابوویە بەر فەرمووی (سواری بە) ووتی: وشتری قوربانییە فەرمووی: (سواری بە) جا دیم پیاوەكە بەسواریەو لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) دەڕۆشت نەعلەكەش لەمل قوربانیەكەدا بوو). لەگێڕانەوەیەكی تردا دەڵێ: (لەدووەم یا سییەم جاردا فەرمووی سواری ببە داماو).

بەمەرجێ دروستە سوار بوون و دۆشینی ئاژەڵی قوربانی پێویست بێ و زیانیش بەئاژەڵەكە نەگەیەنێت. (عن جَابِرَ بن عبد اللَّهِ سمعت النبي ﷺ یقول: ارْكَبْهَا بِالْمَعْرُوفِ إِذا أُلْجِئْتَ إِلَیْهَا حتی تَجدَ ظَهْرًا)[3] جابیر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (لەپێغەمبەرم (ﷺ) بیست دەیفەرموو: (ئەگەر ناچار بوویت بەبێ ماندوو كردن و هیلاك كردن سواری ببە تا وڵاغێكی ترت دەست دەكەوێت).

**نۆزدەیەم: عومرە كردن بەتەنیا**

عومرە لەپەرستشە گەورەكانە وە لەوكردەوانەیە بەندە لەخوا نزیك دەخاتەوەو چەندین پلە خوا بەرزی دەكاتەوەو گوناهەكانی پێ هەڵدەوەرێ وە پێغەمبەریش (ﷺ) بەكردارو گوفتار هانی هانی موسوڵمانی دەدات بۆ عومرە كردن (عن أَبِي هُرَیْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال: الْعُمْرَةُ إِلى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَیْنَهُمَا وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لیس له جَزَاءٌ إلا الْجَنَّةُ)[4] دەفەرموێ: (عومرەیەك یا عومرەیەكی تر كەفارەتی گوناهەكانی نێوانیانن حەجی ڕێك و پێكیش پاداشتی هیچ نیە بەهەشت نەبێ).

**أ- پایەكانی عومرە:**

**١- ئیحرام بەستن:** واتە نیەت هێنان بۆ عومرە كردن لەكاتی ئیحرامدا (قال رسول الله ﷺ إنما الْأَعْمَالُ بِالنِّیَّاتِ)[5] پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (كردەوەكان بەنیەتەوە بەندن).

---

١) رواه مسلم (١٧٠٦)

٢) رواه البخاري (٢٧٥٥، ٦١٦٠) و مسلم (١٣٢٢)

٣) رواه مسلم (٣٧٥ /١٣٢٤ ) و احمد (٣ / ٣١٧)

٤) رواه البخاري (١٧٧٣) و مسلم (١٣٤٩)

٥) پێشتر باسكرا

**٢ـ تەواف کردن:** خوا دەفەرموێ ﴿ وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ ﴾ الحج: ٢٩ واتە: با تەواف بکەن بەدەوری ماڵی دێرینندا -کەعبە- .

**٣- هاتوچۆی صەفاو مەروە:** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴾ البقرة: ١٥٨، واتە بێگومان -هاتووچۆی- صەفاو مەروە لەدروشمەکانی -ئاینی- خوان.

**٤- سەرتاشین یا کورتکردنەوەی:** (عن عَبْدِ اللَّهِ ابْنَ عُمَرَ رضى الله عنهما قَالَ أنّ النَّبِىُّ ﷺ قَالَ وَمَنْ لَمْ يَكُنْ فَلْيَطُفْ بِالْبَيْتِ ، وَ بين بِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ ، وَلْيُقَصِّرْ، وَلْيَحْلِلْ)[١] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەو کەسەی قوربانی پێ نییە با گەوافی دەوری بەیتو صەفاو مەروە بکاتو سەری کورت بکاتەوەو ئیحرام بشکێنێ).

**ب- واجباتەکانی عومرە:**

ئەو کەسەی دەیەوێت عومرە بکات پێویستە لەشوێنی دیاری کراو بۆ ئیحرام بەستن ئیحرام بەعومرە ببەستێ ئەگەر ماڵی لەنێوان مەککە یەکێك لە میقاتەکاندا نەبوو وە ئەگەر وابوو ئەوە لەماڵی خۆیەوە ئیحرام ببەستێ وە ئەو کەسەش دانیشتووی شاری مەککەیە ئەوە دەبێت بچێتە دەرەوەی حەرەم لەوێوە ئیحرام ببەستێ، چونکە (لأمره ﷺ عَائِشَةَ أن تحرم من التَّنْعِيمِ)[٢] (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بەعائیشە -کە لەلامەککەدا بوو- بڕوات لەتەنعیم ئیحرام ببەستێت).

**ج- کاتی عومرە کردن:**

هەموو ڕۆژەکانی ساڵ کاتە بۆ عومرە کردن، بەڵام لەرەمەزاندا پاداشتی زۆرترەو چاکترە بکرێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو بارەیەوە دەفەرموێ: (عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ تَعْدِلُ حَجَّةً)[٣] (عومرەیەك لە ڕەمەزاندا وەك حەجێك وایە).

---

١) رواه البخاري (١٦٩١) و مسلم (١٢٢٧)

٢) رواه البخاري (١٧٨٤) و مسلم (١٢١٢)

٣) رواه البخاري (١٧٨٢) و مسلم (١٢٥٦)

# کتێبی باری کەسێتی

## یەکەم: ژن مارە کردن (النكاح)

**١- پێناسەی (النكاح) لەزمانەوانی و شەرعدا:**

**لەزمانەوانیدا:** بەمانای خستنە پاڵ یەكو كۆكردنەوە دێت.

**لە شەرعدا:** مامەڵەیەكە حەڵاڵ بوونی لەزەت بردنی هەریەك لەپیاو و ئافرەت لەیەكتری لەخۆ دەگرێت بەرێگەیەكی حەڵاڵو رێگە پێدراو.

**٢- ژن مارەكردن لە ئیسلامدا:**

ئیسلام ژن هێنانو بەشودانی داناوە، یاسایەكی نەگۆڕاوی بۆ دارێژاوە لەسەر بەهێزترینو پارێزگارترین بنەما بۆ پاراستنی كۆمەڵگاو بەختەوەریو ئاسودەیی خێزان، وە بۆ بڵاوكردنەوەی ئاكاری جوانو پارێزگاری كردن لەرەوشتو مانەوەی رەگەزی ئادەمیزاد لەسەر زەوی.

**٣- بەڵگەی ژن مارەكردن:**

لەهەر كام لەقورئانو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)و یەك دەنگی زانایانی ئیسلامدا بەڵگەمان هەیە لەسەر دروستو رەوابوونی ژن هێنانو مارەكردنی ئافرەتان.

لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ﴾ النساء: ٣ واتە لەو ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆتان دووانو سیانو چوار مارەبكەنو خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ ﴾ النور:٣٢ واتە: ژن مارەبڕن بۆ پیاوانی بێ ژنو ئافرەتانی بێ مێردیش بدەن بەشوو، هەروەها ئەوانەی ئیماندارو چاكن لەكۆیلەكان -ژنیان بۆ بێنن- و كەنیزەكان-یش بدەن بەشوو.

لەسوننەتی پێغەمبەریشدا (ﷺ) فەرمودەی زۆر لەو بارەیەوە هەیە لەوانە:

(عن عبد اللَّهِ بن مسعود قال: كنا مع النبي ﷺ شَبَابًا لَا نَجِدُ شيئا فقال لنا رسول اللَّهِ ﷺ: يا مَعْشَرَ الشَّبَابِ من اسْتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فإنه أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ وَمَنْ لم يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فإنه له وِجَاءٌ).[1] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ئێمە گەنجو لاو بووین لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) پارەو پوڵمان نەبوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێمان: (ئەی گەنجان هەرکەس لەئێوە توانای هەیە باژن بێنێ، چونکە ژن هێنان باشترین هۆکارە بۆ چاوپارێزیو داوێن پارێزی، هەرکەسێکیش ناتوانێ -ژن بێنێ- ڕۆژوو بگرێت چونکە بۆی دەبێتە قەڵغان).

**٤ـ حوکمی ژن مارەکردن:**

ژن هێنانو مارەکردنی یەك حوکمی نییە بەڵکو چەند حوکمێکی هەیە هەر حوکمێکیان پەیوەندە بەحاڵەتی کەسی ژن هێنەرەوە کە بەم جۆرەیە:

**أـ سوننەتە:** کاتێ پیاو پێویستی بەو ژن هێنانە بێتو حەزی لێ بکاتو توانای دارایی ژن هێنانو خەرجی خۆیو ئافرەتەکەی هەبێت، ترسیشی نەبێت ئەگەر ژن نەهێنێ تووشی داوێن پیسی ببێت ئابۆ ئەم جۆرە کەسە سوننەتە ژن هێنان چونکە ژن هێنان هۆکارە بۆ بەردەوام بوونی مرۆڤ لەسەر زەویداو سوننەتێکی ژیانیشە ئەنجامی دەدات، وە فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بەڵگەیە بۆ ئەم خاڵەی باسمان کرد، وە لەم حاڵەتەدا ژن هێنان چاکترە لەخۆ تەرخان کردن بۆ بەندایەتیو پەرستش بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە:

(عن أَنَسٍ رضي الله عنه أَنَّ نَفَرًا من أَصْحَابِ النبي ﷺ سَأَلُوا أَزْوَاجَ النبي ﷺ عن عَمَلِهِ في السِّرِّ فقال بَعْضُهُمْ لَا أَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ وقال بَعْضُهُمْ لَا آكُلُ اللَّحْمَ وقال بَعْضُهُمْ لَا أَنَامُ على فِرَاشٍ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عليه فقال ما بَالُ أَقْوَامٍ قالوا كَذَا وَكَذَا لَكِنِّي أُصَلِّي وَأَنَامُ وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ فَمَنْ رَغِبَ عن سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي)[2] ئەنەس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری کردەوەو -بەندایەتی- پێغەمبەریان (ﷺ) لەخێزانەکانی کرد کە پەنهانەو خەڵکی نایبینێ، جا یەکێکیان ووتی: من ژن ناهێنمو یەکێکی تریان ووتی:

---

١) رواه البخاري (٤٧٧٩) و مسلم (١٤٠٠)

٢) رواه مسلم (١٤٠١)

گۆشت ناخۆم، یەکێکی تریان وتی: لەناو پێخەفدا ناخەوم، جا پێغەمبەر (ﷺ) سوپاس‌و ستایشی خوای کردو فەرمووی: (ئەو خەڵکانە چییانە کە واووا دەڵێن، بەڵام من شەو نوێژ دەکەم‌و دەشخەوم، هەندێ جار بەرۆژو دەبم‌و هەندێ جار بەرۆژوو نابم وە ژنیش دەهێنم، جا هەر کەسیش پشت بکاتە سوننەتی من ئەوە لەمن نییە).

ئافرەتیش لەم بڕگەیەدا وەك پیاو وایە ئەگەر پێویستی بەشوو کردن هەبێت بۆئەوەی خۆی بپارێزێ‌و ئایینی پارێزراو بێت‌و کەسێك خەرج‌و مەسرەفی بکات ئەوە شوو کردن بۆی سوننەتە.

**ب- نەکردنی سوننەتە (مستحب ترکە):** ئەمەش کاتێکە پێویستی بەژن هێنان هەبێت، بەڵام خەرج‌و تێچوونی ژن هێنانی نییە لەم کاتەدا دەبێت خۆی بگرێ‌و خۆی بەرۆژوو و پەرستشەوە سەرقاڵ بکات تا خوای گەورە دەروی لێ دەکاتەوەو توانای دارایی دەبێت ژن بهێنێت. خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴾ النور: ٣٣

واتە: دەبێت ئەوانەی کە توانای ژن هێنانیان نییە بەپاکی خۆیان ڕاگرن هەتا خوا لەبەهرەو ڕۆزی خۆی بێ نیازیان دەکات.

وە ئەم حوکمەی لەم فەرموودەیەشەوە وەردەگیرێ کە دەفەرموێ: (من اسْتَطَاعَ منكم الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ) (هەر کەستان توانای ژن هێنانی هەبوو با ژن بێنێ ) کەواتە ئەگەر توانای نەبوو چاکتر وایە ژن نەهێنێ.

**ج ـ ناپەسەندە:** ئەمەش کاتێکە پێویستی بەژن هێنان نەبێت جا وەك ئەوەی حەزی لێی نەبێت بەسروشت یا لەبەر نەخۆشی یا هەر شتێکی تر وە خەرج‌و تێچوونی ژن هێنانیشی نەبێت لەم کاتەدا ناپەسەندە ژن بهێنێ.

**دـ نەکردنی چاکترە:** ئەمە بۆ کەسێکە خەرج‌و تێچوونی ژن هێنانی هەبێت، بەڵام پێویستی پێ نییە چونکە زۆر حەزی لێ ناکات‌و سەرقاڵی بەندایەتییە یا یەکلا بۆتەوە بۆ زانیاری‌و زانست‌و خوێندن، لەم حاڵەتەدا خۆ تەرخان کردن بۆ بەندایەتی‌و زانست و خوێندن لەژن هێنان چاکترە چونکە ژن هێنان لەو کارانەی دەخات.

**هـ ـ کردنی چاکترە:** ئەمە بۆ کەسێکە سەرقاڵی بەندایەتی نەبێت‌و یەکلا نەبوبێتەوە بۆ زانست‌و خوێندن وە خەرج‌و تێچوونی ژن هێنانیشی هەیە، بەڵام پێویستی پێی نییە لەم کاتەدا

ژن هێنان چاکترە بۆئەوەی بێ نیشیو دەست بەتاڵی توشیو خراپەو داوێن پیسی نەکات وە بەژن هێنانەکەی چەند بەرژەوەندی بەدی دێتو منداڵی دەبێتو ژمارەی مرۆڤو موسوڵمان زیاد دەبێت.

**٥ـ ئەو ئافرەتانەی مارەکردنیان حەرامە:**

ئەو ئافرەتانەی مارەکردنیان حەرامە دوو بەشن: بەشێکیان بەهەتا هەتایی مارەکردنیان حەرامە، بەشێکی تریان بەکاتی مارەکردنیان حەرامە:

**یەکەم: ئەو ئافرەتانەی بەهەتا هەتایی مارەکردنیان حەرامە:**

**أ- ئەو ئافرەتانەی بەهۆی نەسەبو خزماتییەوە مارەکردنیان حەرامە حەوتن کە ئەمانەن:**

١- دایکەکانو دایکی دایك بۆ سەرەوە.

٢- کچەکانو کچە کچەکان بۆ خوارەوە.

٣- خوشکەکان دایكو باوکی بن یا باوکی یا دایکی بن.

٤- پورەکان (خوشکی باوك).

٥- پورەکان (خوشکی دایك).

٦- کچانی برا.

٧- کچانی خوشك

بەبەلگەی ئەم ئایەتە پیرۆزە ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ ﴾ النساء: ٢٣ واتە: حەرام کراوە لەسەرتان دایکەکانتانو کچەکانتانو خوشکەکانتانو خوشکەکانی دایكو باوکتان وە کچانی براکانتانو کچانی خوشکەکانتان، وە ئەو ئافرەتانەش هاوشێوەی ئەمانەن لەشیر خواردنەوە حەرام دەبن بەبەلگەی ئەم فەرموودەیە: (يَحْرُمُ من الرَّضَاعِ ما يَحْرُمُ من النَّسَبِ)[1] (ئەو ئافرەتانەی بەهۆی خزمایەتیەوە حەرام دەبن بەهۆی شیرخواردنیشەوە حەرام دەبن).

١) رواه البخاري (٢٦٤٥) مسلم (١٤٤٧)

**ب- ئەو ئافرەتانەی بەهۆی ژنو ژنخوازییەوە حەرامن چوارن:**

١- دایکی هاوسەرو دایکی دایکیو دایکی باوکی بۆ سەرەوە بەبەڵگەی ﴿وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمۡ﴾ النساء: ٢٣، واتە: وە دایکی هاوسەرەکانتان -مارەکردنیان حەرامە بۆتان- .

٢-کچی هاوسەر لەمێردێکی تری بەمەرجێ چوویێتە لای هاوسەرەکەی بەبەڵگەی ﴿وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِي دَخَلۡتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمۡ تَكُونُواْ دَخَلۡتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ﴾ النساء: ٢٣، واتە: حەرام کراوە لێتان مارەکردنی -کچانی ژنانتان کە لەمێردی تریان بن ئەوانەی کە لەماڵی ئێوەدا دەژین لەو ژنانەتانن کە چوونەتە لایان بەڵام ئەگەر نەچوویونە لایان ئەوە هیچ گوناهتان لەسەر نییە -لەمارەکردنی کچەکانیاندا-.

٣- هاوسەری باوكو باپیرو بۆ سەرەوە: بەبەڵگەی ﴿وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَمَقۡتٗا وَسَآءَ سَبِيلًا﴾ النساء:٢٢ واتە: وە ئەو ئافرەتانە مارە مەکەن کە باوکتان مارەیان کردوون مەگەر ئەوەی پێش لەم -حەرام کردنە- کرابێت بەراستی ئەو مارەکردنە کردەوەیەکی زۆر پیسو چەپەڵەو زۆر بێزراوە وە رێبازێکی زۆر خراپو بەدە -کە گیراوەتە بەر-.

٤- هاوسەری کوڕ وە کوڕی کوڕ بەبەڵگەی ﴿وَحَلَٰٓئِلُ أَبۡنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنۡ أَصۡلَٰبِكُمۡ﴾ النساء: ٢٣، واتە: حەرامە بۆتان هاوسەری کوڕەکانتان ئەوانەی کە لەپشتی خۆتانن، وە ئەو ئافرەتانەش کە هاوشێوەی ئەم چوارەن لەشیر خواردنەوەی هەمان حوکمیان هەیەو مارەکردنیان دروست نیە.

**دووەم: ئەو ئافرەتانەی بە کاتیی مارەکردنیان حەرامە ئەمانەن:**

خوشکی هاوسەرو خوشکی دایکی هاوسەر، ژنی پێنجەم بۆ کەسێ چوار ژنی هەبێت، ئافرەتی زیناکەر هەتا تەوبە دەکات، ئافرەتێك تەلاقی سێیەم درابێت تا شویەکی تر نەکاتو بەمردن یا تەلاقی لێی جیانەبێتەوە مارەکردنی دروست نییە. ئافرەتێك لە ئیحرامدا بێت تا ئیحرام دەشکێنێ، ئافرەتێ لەعیددەدا بێت تا عید

دەکەی تەواو دەبێت بۆیە جگە لەپیاوەکەی خۆی کە دەتوانێ لەعیددەدا بیباتەوە ئەگەر تەلاقەکە - رجعی- بوو یا مارەی کاتەوە ئەگەر تەلاقەکە بائن بوو. جگە لەم ئافرەتانە کە لەخالی یەکەمو دووەمدا باسمان کردن مارەکردنیان حەلالە خوای گەورە دوای باسکردنی حەرام کراوەکان دەفەرموێ: ﴿ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ ﴾ النساء: ٢٤ واتە: جگە لەوانەی باسکران هەموو حەلالە بۆتان تا چوار.

(عن أُمَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ أَبِي سُفْيَانَ أَنَّهَا قالت: يا رَسُولَ اللَّهِ انْكِحْ أُخْتِي بِنْتَ أَبِي سُفْيَانَ فقال أو تحبين ذَلِكِ فقلت نعم لَسْتُ لك بِمُخْلِيَةٍ وَأَحَبُّ من شَارَكَنِي في خَيْرٍ أُخْتِي فقال النبي ﷺ إِنَّ ذَلِكِ لَا يَحِلُّ لِي قلت فَإِنَّا نُحَدَّثُ أَنَّكَ تُرِيدُ أَنْ تَنْكِحَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ قال بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ قلت نعم فقال لو أَنَّهَا لم تَكُنْ رَبِيبَتِي في حَجْرِي ما حَلَّتْ لي إِنَّهَا لَابْنَةُ أَخِي من الرَّضَاعَةِ أَرْضَعَتْنِي وَأَبَا سَلَمَةَ ثُوَيْبَةُ فلا تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ ولا أَخَوَاتِكُنَّ).[1] ئومو حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان (ڕەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: ووتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کچی ئەبو سوفیانی خوشکم مارەبکە ئەویش فەرمووی: (ئەوەت پێ خۆشە؟) ووتم: بەڵێ، من دەسبەردارت نابم کەسێکیش حەز دەکەم لەخێرو چاکەدا بەشداریم بکات خوشکەکەمە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (بێ گومان ئەو -کارە- حەلاڵ نییە بۆ من) ئومو حەبیبەش ووتی: ئێمە لەناو خۆماندا دەڵێین تۆ دەتەوێ کچی ئەبو سەلەمە مارەبکەیت فەرمووی: (کچی ئومو سەلەمە؟) ووتم: بەڵێ فەرمووی: (بێگومان ئەو ئەگەر کچی خێزانەکەشم -ئومو سەلەمە- نەبوایە، و لەماڵی مندا هەر حەلاڵ

---

١) رواه البخاري (٥١٠٧، ٥١٠٦، ٥١٢٣) و مسلم (١٤٤٩)

نەبوو بۆم چونکە ئەو کچە کچی برای شیری من، ثوێبە شیری داوە بەمن و بەئەبوسەلەمە، ئیتر لەمەولا کچ و خوشکەکانتان پێشنیار مەکەن بۆ من -مارەیان بکەم-).

لەم فەرموودەدا ئەم حوکمانەی تێدایە:

١- خوشکە هاوسەر مارەکردنی دروست نییە.

٢- کچی هاوسەر کە پیاوەکە چووبێتە لای مارەکردنی دروست نییە.

٣- کچی برای شیری مارەکردنی دروست نییە.

(عن أبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال لَا يُجْمَعُ بين الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا ولا بين الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا).[1] ئەبو هورەیرە (رەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (دروست نییە ئافرەت لەگەڵ خوشکی باوکیدا یان لەگەڵ خوشکی دایکیدا پێکەوە هاوسەری پیاوێك بن).

١) رواه البخاري (٥١٠٩، ٥١١٠) و مسلم (١٤٠٨)

## دووەم: خوازبێنی (ژن داواکردن)

**١ـ چ ئافرەتێك چاكە خوازبێنی بكرێت؟**

**أـ ئافرەتێك دیندار بێت:** بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە كە ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: (عن النبي ﷺ قال تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ).[1] پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئافرەت لەبەر چوار شت مارە دەكرێت: لەبەر ماڵو سامانەكەی وە لەبەر بنەماڵەی وە لەبەر جوانییەكەی وە لەبەر ئاینەكەی، جا ئەوەی دیندارە بیخوازە هەردوو دەستت خۆڵاوی بێت).

**ب ـ ئافرەتێك كچ بێت، مەگەر بەرژەوەندیەك لەخوازبێنی بێوەژندا هەبێت:** (قال جَابِرُ بن عبد اللَّهِ قال: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً في عَهْدِ رسول اللَّهِ ﷺ فَلَقِيتُ النبي ﷺ فقال يا جَابِرُ تَزَوَّجْتَ قلت نعم قال بِكْرٌ أَمْ ثَيِّبٌ قلت ثَيِّبٌ قال فَهَلَّا بِكْرًا تُلَاعِبُهَا قلت يا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لي أَخَوَاتٍ فَخَشِيتُ أَنْ تَدْخُلَ بَيْنِي وَبَيْنَهُنَّ قال فَذَاكَ أذن...).[2] جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ئافرەتێكم مارە كرد جا بەپێغەمبەر (ﷺ) گەیشتمو فەرمووی: (جابیر ژنت هێنا؟) ووتم: بەڵێ، فەرمووی: (كچە یا بێوەژنە؟) ووتم بێوەژنە، فەرمووی: (بۆچی كچێكت نەهێنا یاریو دەستبازی لەگەڵدا بكەیت؟) وتم: ئەی پێغەمبەر خوا (ﷺ) چەند خوشكێكم هەیە ترسام ئەگەر كچ بێنم نێوان منو خوشكەكانم تێك بدات فەرمووی كەواتە ئەوە -ڕاستە و چاكە-..).

**ج ـ ئافرەتێك بێت منداڵی ببێت:** (قال أَنس رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ الْأُمَمَ)[3] ئەنەس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (ئافرەتی بەسۆزو منداڵ بوو بخوازن، چونكە من لەرۆژی دواییدا بەزۆری ئێوەوە شانازی دەكەم بەسەر ئوممەتەكانی تردا).

---

١) رواه البخاري (٥٠٩٠) و مسلم (١٤٦٦)

٢) رواه البخاري (٥٠٧٩) و مسلم (٧١٥)

٣) رواه ابو داود (٢٠٣٥) حديث صحيح.

**٢- چ كوڕێ چاكە ژنی پێبدەیت؟**

ئەگەر پیاو دەگەڕێ بەشوێن ئافرەتێكدا ئەو خاڵانەی تێدا بێت باسمان كرد بەهەمان شێوە پێویستە لەسەر بەشوودەر ئافرەت پیاوی چاك بكاتە هاوسەری كچەكەیو بەشوێن كوڕو پیاوی چاكو دینداردا بگەڕێت ببێتە مێردی كچەكەی. (عن أبي حَاتِمٍ الْمُزَنِيِّ قال: قال رسول اللَّهِ ﷺ: إذا جَاءَكُمْ من تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ إلا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ في الأرض وَفَسَادٌ كَبِيرٌ)[1] ئەبو حاتیمی موزەنی (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر پیاوێك هات -خوازبێنی كچ یا خوشكتانی لێ كردن- لەئاینو ڕەوشتی رازی بوون ئەوە لێی مارە بكەنو پێی بدەن ئەگەر وا نەكەن لەزەویدا بەڵاو خراپەو داوێن زۆر دەبێت).

**٣- خوازبێنی (الخطبة) بەچی دەووترێت؟**

**خوازبێنی:** بریتییە لەداواكردن لەئافرەت كە شوو بەكەسێكی دیاری كراو بكات بەو شێوازەی لەناو خەڵكدا باوە، جا كە كاتێ ڕەزامەندی لەلایەن ئافرەتەكەو كەسو كارییەوە دەربڕا ئەوە بەڵێنی شوو پێكردنەو هیچی تر، هیچ شتێكی ئافرەتەكە حەڵاڵ ناكات بۆ خوازبێنی كر بەڵكو هەتا مارە نەبڕدرێت بەئافرەتێكی بێگانە لەپیاوەكە دادەنرێت.

**أ- ئافرەتی گەورە بێوەژن بێت یا كچ خوازبێنی لەخۆی دەكرێت:**

ئەگەر ئافرەت باڵغو عاقڵ بێت رای خۆی بەهەند وەردەگیرێ، بەڵكو دەقی پێغەمبەر (ﷺ) رایدەگەیەنێت كە نابێو دروست نییە بەبێ ڕەزامەندی خۆی مارە بكرێت ئەگەر كچ بوو، خۆ ئەگەر بێوەژن بوو ئەوە خوازبێنی دەبێت لەخۆی بكرێت، نەك بەشوودەرەكە، (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ « الثَّيِّبُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا وَالْبِكْرُ تُسْتَأْمَرُ وَإِذْنُهَا سُكُوتُهَا »)[2] پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (بێوەژن خۆی شیاوترە لەبەشوودەرەكەی -بۆ شوكردن- كچیش مۆڵەتی لێ وەردەگیرێ دەربارەی ـ شوكردنی ـ خۆی مۆڵەتەكەشی بێ دەنگ بونیەتی).

---

١) رواه الترمذي (١٠٩١) وهو حديث حسن

٢) رواه مسلم (١٤٢١) و احمد (٢٤١/١ ، ٢٤٢)

**ب ـ بەشودەر دەبێت رای کچەکەی وەربگرێت، ئەگەرنا گوناهبار دەبێت ئەگەر زۆری لێ بکات.**

(عن خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ الْأَنْصَارِيَّةِ أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهْيَ ثَيِّبٌ فَكَرِهَتْ ذلك فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَرَدَّ نِكَاحَهُ)[١] خەنسائی کچی خیزام (رەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (بێوەژن بوو باوکی دای بەشوو ئەمیش حەزی لێ نەبوو، جا هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش مارەکردنەکەی هەڵوەشاندەوە).

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ قال: قال رسول اللَّهِ ﷺ: تُسْتَأْمَرُ الْيَتِيمَةُ فِي نَفْسِهَا فَإِنْ سَكَتَتْ فَهُوَ إِذْنُهَا وَإِنْ أَبَتْ فلا جَوَازَ عليها)[٢]. ئەبوهورەیرە (رەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (کچی هەتیو ـ بێ باوك ـ مۆڵەتی لێ وەردەگیرێ دەربارەی ـ شوکردنی ـ خۆی جا ئەگەر بێ دەنگ بوو ئەوە مۆڵەت دانێتی وە ئەگەر رازی نەبوو ئەوە دروست نییە مارەکردنی).

**ج ـ ئەوەی بۆ بەشودەر دروستە: دروستە کچەکەی پێشنیار بکات بۆ پیاوێك چاکیو دینداری تێدا بەدی دەکرێت ئەمەش بێ رێزی نییە نەبەخۆی نەبەکچەکەی.**

(عَبْدَ اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما يحدث أَنَّ عُمَرَ بن الْخَطَّابِ حين تَأَيَّمَتْ حَفْصَةُ بِنْتُ عُمَرَ من خُنَيْسِ بن حُذَافَةَ السَّهْمِيِّ وكان من أَصْحَابِ رسول اللَّهِ ﷺ فَتُوُفِّيَ بِالْمَدِينَةِ فقال عُمَرُ بن الْخَطَّابِ أَتَيْتُ عُثْمَانَ بن عَفَّانَ فَعَرَضْتُ عليه حَفْصَةَ فقال سَأَنْظُرُ في أَمْرِي فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ ثُمَّ لَقِيَنِي فقال قد بَدَا لي أَنْ لَا أَتَزَوَّجَ يَوْمِي هذا قال عُمَرُ فَلَقِيتُ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ فقلت إن شِئْتَ زَوَّجْتُكَ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمَرَ فَصَمَتَ أبو بَكْرٍ فلم يَرْجِعْ إِلَيَّ شيئا وَكُنْتُ أَوْجَدَ عليه مِنِّي على عُثْمَانَ فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ ثُمَّ خَطَبَهَا رسول اللَّهِ ﷺ فَأَنْكَحْتُهَا إِيَّاهُ فَلَقِيَنِي أبو بَكْرٍ فقال لَعَلَّكَ وَجَدْتَ عَلَيَّ حين عَرَضْتَ عَلَيَّ حَفْصَةَ فلم أَرْجِعْ إِلَيْكَ شيئا قال عُمَرُ قلت نعم قال أبو بَكْرٍ فإنه لم يَمْنَعْنِي أَنْ أَرْجِعَ إِلَيْكَ فِيمَا عَرَضْتَ عَلَيَّ إلا أَنِّي كنت عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قد ذَكَرَهَا فلم أَكُنْ لِأُفْشِيَ سِرَّ رسول اللَّهِ ﷺ وَلَوْ تَرَكَهَا رسول اللَّهِ ﷺ قَبِلْتُهَا).[٣] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: کاتێ حەفصەی کچی عومەر ـ کە خێزانی خونەیسی کوڕی

---

١) رواه النسائي (٣٢٦٨) و ابن ماجه (١٨٧٣) وهو حديث صحيح

٢) رواه النسائي (٣٢٧٠) وهو حديث حسن

٣) رواه البخاري (٥١٢٢)

حوذافەی سەهمی بوو، بێوەژن کەوت مێردەکەی کە هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو لەمەدینە وەفاتی کرد عومەری کوڕی خەتتاب ووتی: چوومە لای عوسمانی کوڕی عەففان حەفصەی کچم پێشنیار کرد بۆی -مارەی بکات- ئەویش ووتی بیرێکی لێ دەکەمەوە منیش چەند رۆژێ چاوەڕوان بووم پاشان پێم گەشتو ووتی: رام وایە لەم کات و رۆژگارەدا ژن نەهێنم، عومەر دەڵێ: جا گەشتم بەئەبو بەکری صدیق ووتم: ئەگەر دەتەوێ حەفصەی کچی عومەرت لێ مارە دەکەم، ئەبو بەکر بێ دەنگ بوو هیچ وەڵامێکی لێ نەگێڕامەوە بەرانبەر ئەبوبەکر زیاتر دڵی گرتم لە عثمان پاشان چەند شەوو رۆژێکی پێ چوو، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوازبێنی کردو منیش بۆم مارەکرد جا ئەبو بەکر بەمن گەشت ووتی لەوانەیە لەدڵتدا شت دروست بووبێت کاتێك حەفصەت بۆ پێشنیار کردمو منیش هیچ وەڵامم نەدایتەوە عومەر ووتی: بەڵێ وابوو، ئەبو بەکر ووتی: ئەوەی بەرگری لەمن کرد وەڵامت نەدەمەوە کاتێ بۆت پێشنیار کردم لەبەرئەوە بوو بێگومان من زانیبووم پێغەمبەر (ﷺ) باسی حەفصەی کردبوو منیش نەدەکرا نهێنی پێغەمبەر (ﷺ) ئاشکرا بکەم ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) وازی لێ بهێنایە من ڕازی بووم پێی).

**د- کچۆڵە لە بەشودەرەکە خوازبێنی دەکرێت:**

ئەگەر کچێك تەمەنی کەم بێتو باڵغ نەبووبێ ئەوە لە بەشودەرەکەی خوازبێنی دەکرێت.

(عن عُرْوَةَ أَنَّ النبي ﷺ خَطَبَ عَائِشَةَ إلى أبي بَكْرٍ فقال له أبو بَكْرٍ إنما أنا أَخُوكَ فقال أنت أَخِي في دِينِ اللَّهِ وَكِتَابِهِ وَهِيَ لي حَلَالٌ).[1] عورْوه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) خوازبێنی عائیشەی لە ئەبوبەکر - ی باوکی - کرد ئەبو بەکریش پێی ووت: من برای تۆم پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێی: (تۆ لەئاینو کتێبە خوادا برای منیو عائیشە بۆمن حەڵاڵە).

**هـ - خوازبێنی بەسەر خوازبێنی دا حەرامە:**

ئەگەر وەڵامی خوازبێنی کەری یەکەمی بەبەڵێ دابێتەوە ئەوە حەرامە مەگەر ئەو کەسەی خۆی رێگەی کەسی دووەم بدات، بەڵام ئەگەر بەڵی بۆ خوازبێنی کەری یەکەم نەکرابوو وە جوابیش نەکرابوو ئەوە بۆ خوازبێنی کەری دووەم حەرام نییە خوازبێنی بکات، بەبەڵگەی فەرموودەی

---

١) رواه احمد ١٥٣/٢ و البخاري (٥١٤٢)

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (قال النبي ﷺ: لا يَخْطُبَ الرَّجُلُ على خِطْبَةِ أَخِيهِ حتى يَتْرُكَ الْخَاطِبُ قَبْلَهُ أو يَأْذَنَ له الْخَاطِبُ).[1] پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هیچ پیاوێ خوازبێنی نەکات بەسەر خوازبێنی براکەیدا هەتا خوازبێنی کەری یەکەم پێش ئەم وازی لێ دێنێ یا مۆڵەتی دەدات).

**٤ـ خوازبێنی حەڵاڵ و خوازبێنی حەرام:**

**أـ خوازبێنی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ دروستە:** کاتێ ئافرەتە داخوازی کراوەکە مارە نەبڕابێ و لەعیددەدا نەبێ هیچ کام لەهۆیەکانی حەرامی بوونی مارەکردنی تێدا نەبێت کە پێشتر باسمان کردن.

**ب ـ خوازبێنی ناڕاستەوخۆ دروستە ڕاستەوخۆ دروست نییە:** کاتێ ئافرەتەکە لەعیددەدا بێت بەهۆی مردنی مێردەکەیەوە یا بەهۆی تەڵاقی (بائن)[2] ەوە بێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٣٥ واتە: گوناهتان ناگات لەخوازبێنی ژنانی ـ مێرد مردوو ـ بەناڕاستەوخۆ پێیان بڵێن یان لەدڵی خۆتاندا ـ بڕیاربدەن ـ دەیانخوازن، خوای گەورە دەزانێ کە بێگومان ئێوە لەمەودوا ناویان دەبەن، بەڵام بەنهێنی بەڵێنیان پێ مەدەن مەگەر قسەیەك کە باش بێت وە بڕیاری مارەکردنیان مەدەن تا عیددەکەیان تەواو دەبێت و بزانن کە خوا دەزانێت بەوەی لەدڵتاندایە کەواتە خۆتان بپارێزن وە بزانن و دڵنیابن کەخوا لێ خۆشبووی لەسەرخۆیە.

---

١) رواه البخاري (٤٨٤٨) و مسلم (١٤١٢)

٢) تەلاقی بائین دوو جۆرە (بائن) ی گەورە کە تەلاقی سێیەمی دراوە و جارێکی تر بۆ تەلاق دەرەکە حەڵاڵ نابێت مەگەر شوو بکات و پاشان مێردەکەی بمرێ یا بە ویستی خۆی تەلاقی بدات بێ فێڵ بۆ جارێکی تر مێردی یەکەمی مارەی کاتەوە، (بائن) بچووك ئەو تەلاقەیە یەك تەلاق یا دوو تەلاقی ئافرەتەکە درابێ لەسەر پارە تەلاق درابێ ئەویش بەتەواوی پیاو و ئافرەتەکە جیا دەبنەوە بە مارەبڕیکی تر نەبێت نابنەوە بە هاوسەری یەکتری .

ج ـ **خوازبێنی حەرامە بەڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ:** بێجگە لەو حاڵەتانەی کە لەبڕگەی (أ و ب)دا باسکران، کەواتە ئافرەتێ مێردی هەبێت یا لەو ئافرەتانە بێت مارەکردنیان حەرامە بەهەمیشەیی یان بەکاتی دروست نییە خوازبێنی بکرێن هەروەها حەرامە خوازبێنی ئافرەتی تەڵاق دراوی تەڵاقی (رجعي)، جا بەڕاستەوخۆ بێت خوازبێنی کردنی یا ناڕاستەوخۆ، چونکە خێزانی پیاوێکەو مێردی هەیە چونکە مێردەکەی مافی ئەوەی هەیە بیگەڕێنێتەوە بۆ لای خۆی، خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓا۟ إِصْلَٰحًا ﴾ البقرة: ٢٢٨ واتە: مێرد ـ ی تەڵاق دراوە رجعییەکان ـ شیاوترن بیانگێڕنەوە بۆ لای خۆیان ئەگەر بیانەوێ نێوانیان چاك بکەنەوە.

**مانای خوازبێنی راستەوخۆ:** هەر ووشەیەك بەروونی خوازبێنی بگەیەنێت راستەوخۆیە، وەك بڵێت ئەمەوێ مارەت بکەم یا ئەگەر عیددەت تەواو بوو مارەت دەکەم یا دەتهێنم.

**مانای خوازبێنی ناڕاستەوخۆ:** بەکارهێنانی هەر ووشەیەکە بۆ خوازبێنیو مانای تریش بەکاربێت وەك ئەوەی بەئافرەتێك کە لەعیددەدا بێت بڵێت تۆ جوانیت یا زۆر حەز دەکات تۆ مارەکات یا کێ ئافرەتی وەك تۆی دەست دەکەوێت.

**٥ـ حەرامە خوازبێنی ئافرەت کە لەعیددەی مردنی مێردەکەیدا بێت یان لە عیددەی تەڵاقی (بائن) یا (رجعی)دا بێت:**

(عن فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ قالت: إِنَّ زَوْجَهَا طَلَّقَهَا ثَلاَثًا فَلَمْ يَجْعَلْ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةً قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ« إِذَا حَلَلْتِ فَآذِنِينِي». فَآذَنْتُهُ فَخَطَبَهَا مُعَاوِيَةُ وَأَبُو جَهْمٍ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « أَمَّا مُعَاوِيَةُ فَرَجُلٌ تَرِبٌ لاَ مَالَ لَهُ وَأَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَرَجُلٌ ضَرَّابٌ لِلنِّسَاءِ وَلَكِنْ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ». فَقَالَتْ بِيَدِهَا هَكَذَا أُسَامَةُ أُسَامَةُ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ« طَاعَةُ اللَّهِ وَطَاعَةُ رَسُولِهِ خَيْرٌ لَكِ ». قَالَتْ فَتَزَوَّجْتُهُ فَاغْتَبَطْتُ).[1] فاتیمەی کچی قەیس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: مێردەکەی تەڵاقی سێهەمی دا، جا پێغەمبەر (ﷺ) شوێن مانەوەو خەرجو مەسرەفی بۆ دانەنا ـ لەسەر مێردەکەی پێی بدات ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی

---

١) رواه احمد ٦/ ٤١٢ و مسلم (١٤٨٠)

ووتم: (کەی عیددەت تەواو بوو حەڵاڵ بووی ئاگادارم بکە) منیش ـ کە عیددەم تەواو بوو ـ ئاگادارم کرد جا موعاوییەو ئەبوجەهمو ئوسامەی کوڕی زید خوازبێنیان کرد پێغەمبەریش فەرمووی: (موعاوییە پیاوێکی هەژارەو سامانی نییە، ئەبوجەهمیش زۆر لەئافرەت دەدات، بەڵام ئوسامە باشە ـ و شوی پێ بکە جا فاتیمە بەدەستی دوو جار ئاماژەی کرد بۆ ئوسامە، پێغەمبەریش فەرموو پێی: (ئەمە گوێڕایەڵییە بۆ خواو گوێڕایەڵییە بۆ پێغەمبەرەکەی) فاتیمە دەڵێ: منیش شووم پێ کردو ئاواتم پێ دەخوازرا ـ لەچاکی ئەو شوەی کردم ـ).

**٦ـ دروستە ناراستەوخۆ خوازبێنی ئافرەت بکرێت کە لەعیدەدا بێت بەهۆی مردنی مێردەکەیەوە یان بەهۆی تەڵاقی (بائن)ەوە**

بەبەڵگەی ئەم ئایەتە ﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٣٥ لەبڕگەی (٤)دا تەفسیرمان کرد.

**٧ـ سوننەتەکانی خوازبێنی:**

سوننەتە خوازبێنی کەر یان ئەو کەسەی خوازبێنیەکە دەکات لەجیاتی ئەو ووتارێك بدات پێش خوازبێنیەکەو پێش مارەکردنەکە بەسوپاسو ستایشی خوای گەورە دەست پێ بکات صەڵاتو سەلامیش لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدات، (عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللّهِ ﷺ كُلُّ أَمْرٍ ذِي بَالٍ لَا يُبْدَأُ فيه بِالْحَمْدِ أبتَر). [1] چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (هەر کارێکی گرنگ بەسوپاسو ستایشی خوای گەورە دەست پێ نەکات ئەوە دوابڕاو دەبێت).

پاشان وەصیەت بکات بەتەقوای خوای گەورە، پاشان داخوازییەکەی بکات بڵێت من هاتومەتە خزمەتتان خوازبێنی کچەکەتان لێ دەکەم. وە سوننەتە بۆ بەشودەری کچەکەش ووتارێك بدات پێش وەڵامدانەوەی خوازبێنیەکە چونکە ئەمە پێشینە چاکەکانەوە ریوایەت کراوە (ڕەزای خوایان لێبێ) پێشەوایان بەپیرۆزی دەزانن بۆ ووتاری خوازبێنی ئەم ووتارە بدرێت، کە

١) رواه ابن ماجه (١٨٩٤)

بەفەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)و بەووتەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیش گێڕدراوەتەوە کە دەڵێ: ئەگەر کەسێکتان ویستی ووتاری بدات بۆ مارەکردن یا هەر شتێکی تر بدات بابڵێت (عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود رضي اله عنه موقوفا ومرفوعا قَالَ: إذا أراد أحدكم ان يخطب لِحَاجَةٍ من نكاح وغيره فليقل: « إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِىَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ آل عمران: ١٠٢. ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ النساء: ١. ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ الأحزاب:٧٠– ٧١.

**٨ـ دروستە سەیر کردنی ئەو ئافرەتەی نیازی خوازبێنی کردنی هەیە:**

(عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ قال: قال رسول اللَّهِ ﷺ إذا خَطَبَ أحدكم الْمَرْأَةَ فَإِنْ اسْتَطَاعَ أَنْ يَنْظُرَ إلى ما يَدْعُوهُ إلى نِكَاحِهَا فَلْيَفْعَلْ)[١] جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێك لەئێوە داوای ئافرەتێکی کردو توانی ئەوەندە سەیری بکات کە پاڵی پێوە ئەنێت بۆ هێنانیو مارەکردنی با بیکات).

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أنّ النبي ﷺ قال لرَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً: أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا؟ قال: لَا قال: فَاذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا)[٢] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەپیاوێکی فەرموو کە ئافرەتێکی مارە کردبوو (بینیوتە؟) ووتی: نەخێر، فەرمووی: (بڕۆ سەیری بکە).

١) رواه احمد ٣/ ٣٣٤ و ابوداود (٢٠٨٢) وهو حديث حسن

٢) رواه مسلم ١٥/ ١٤٢٤ و النسائي ٦ / ٦٩ - ٧٠

**٩ـ بەشودەر (ولي) بۆ دروستی مارەکردن مەرجە:**

(عن أبي بُرْدَةَ بن أبي مُوسَى عن أبيه رضي الله عنها قال: قال رسول الله ﷺ لَا نِكَاحَ إلا بِوَلِيٍّ).[1] ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو موسا لەئەبو موسای باوکیەوە (ڕەزای خوایان لێبێ)دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (مارەبڕین دروست نییە بەبێ وەلیو بەشودەر) واتە: مەرجە بەشودەر ببێت بۆ مارەبڕینی کچەکەی یان خوشکەکەی.. هتد.

١) رواه احمد ٣/ ٣٩٤، ٤١٣ و ابوداود (٢٠٨٥) وهو حديث حسن بشواهده

## سێیەم: پایەکانی مارەبڕین (ژن هێنان)

**پایەی یەکەم: ئەو ڕستەو ووتانەی مارەبڕینی پێ دەکرێت:**

بەشودەر دەڵێت: (زوجتك أو أنكحتك أبنتي) واتە لێم مارەکردیت یا کچەم لێت مارەکردیت. وە کوڕەکەش کە ئافرەتەکەی لێ مارە دەکرێت لەبەرانبەردا بڵێت: مارەم کرد یا کچەکەتم مارەکرد وە دروستە لەپێشدا کوڕەکە بیڵێت دوای ئەوە بەشوودەر.

**١- دەبێت ووشەی (الزواج) و (النکاح) لەلایەن بەشوودەرو مێردەوە بەکاربهێنرێت** کەواتە ئەگەر بەشوودەر بڵێت (زوجتك أبنتي) مێردەکە بڵێت (قَبِلتُ) دانامەزرێتو دروست نییە، چونکە ووشەی (الزواج) یا (النکاح)یان بەکارنەهێناوە، بەڵکو تەنیا یەکێکیان بەکاری هێناوە.

**٢- قسەی بەشودەر لەگەڵ مێردەکەدا پەیوەست بن‌و نێوانیان نەکەوێت ئەگەر بەشوودەر ووتی:** (کچەکەم لێ مارەکردی مێردەکە ماوەیەکی زۆر بێ دەنگ بوو پاشان ووتی: کچەکەتم مارە کرد ئەوە دروست نیەو دانامەزرێت، بەڵام نێوان کەوتنی کەم زیانی نییە وەك هەناسەدان یا پژمین‌و شتی لەو جۆرە.

**٣- دەبێ تا مارەبڕینەکە تەواو دەبێت بەشوودەرو مێرد - ئیسلامەتی‌و باڵغی‌و عاقڵیان بمێنێ -** ئەگەر هەرکامیان لەکاتی مارەبڕینەکەدا شێت بوون یا لەهۆش خۆیان چوون مارەبڕینەکە دروست نییە.

**٤- دەبێ ووتەکانیان بەکاری دێنن بۆ دامەزراندنی مارەبڕین بێت:** کەواتە ئەگەر بەڵێن بوو بۆ داهاتوو ئەوە مارە بڕینەکە دروست نییەو حەڵاڵ نابێت بۆ یەکتری، هەروەهائەگەر پەیوەست بکرێت بەمەرجێك هەر دروست نییە بۆ نمونە: ئەگەر بەشودەر بڵێت: ئەگەر مانگی ڕەمەزان هات کچەکەم لێ مارەکردوویت، مێردەکەش بڵێت: مارەم کرد دروست نییە. هەروەها ئەگەر بڵێت: ئەگەر کچەکەم لەتاقیکردنەوە دەرچوو ئەوە لێم مارەکردیت مێردەکەش بڵێت: مارەکردنیم قبوڵ کرد هەر دروست نییە، چونکە مارەبڕین دەبێت لەکاتی مارەبڕینەکەدا بۆ دامەزراندن بێت نەبەسترێت بەشتی داهاتوو یا مەرجێك کە دواتر پەیدا دەبێت.

**٥- دەبێت مارەبڕینەکە بەووتەیەك بێت بۆ هەمیشەیی بێت:** نابێ مارەبڕینەکە بۆکاتی بێت بۆ ماوەیەکی دیاری کراو وەك مانگێك یا ساڵێك هەروەها نابێت بۆماوەیەکی نادیار بێت وەك هاتنەوەی کەسێكو گەڕانەوەی کە نازانرێ کەی دەگەڕێتەوە کەواتە ئەگەر بەشودەر بڵێت: کچەکەم مارەکرد لێت بۆ مانگێك یا ساڵێك یا تا فلان کەس دەگەڕێتەوە مێردەکەش ووتی: مارەکردنەکەیم قبوڵ کرد لەهیچ کام لەم شێوانەدا مارەبڕینەکە دانامەزرێتو دروست نییە. چونکە لەوانەی باسکرا لەجۆری مارەکردنی کاتین (نکاح المتعه) کە ئەویش حەرامەو دروست نییە. بەبەڵگەی سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)(عن سَبْرَةَ الْجُهَنِيُّ أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ « يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي قَدْ كُنْتُ أَذِنْتُ لَكُمْ فِي الاِسْتِمْتَاعِ مِنَ النِّسَاءِ وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ ذَلِكَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهُنَّ شَىْءٌ فَلْيُخَلِّ سَبِيلَهُ وَلاَ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا.)[1] سەبرەی جوهەنی (ڕەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بوو (ﷺ) فەرمووی: (ئەی خەڵکینە من پێشتر ڕێگەی ژن هێنانی کاتیم بەئێوە دابوو وە بەڕاستی -لەمڕۆ بەدواوە- خوای گەورە تا ڕۆژی دوایی حەرامی کردووە، جا هەرکەسێ لەوانەلایە بادەست لەوانەی لایە بێتو هەرچیتان پێ داون لێیان مەسێننەوە).

**پایەی دووەم: ئەو ئافرەتەی مارەدەکرێ مەرجی ئافرەتەکە تا حەڵاڵ بێت مارە ببڕدرێت ئەمانەیە:**

١- ئەو شتانەی تێدا نەبێت کە ڕێگرن لەمارەکردنی: کە لەباسی خوازبێنی دا باسمان کردن.

٢- ئافرەتەکە دەبێت دیاری کراو بێت، ئەگەر بەشودەر بڵێت یەکێ لەکچەکانم لێ مارەکردیت دروست نییە چونکە نازانرێ کام کچەیانە لێی مارەکردووە.

٣- ئافرەتەکە لەئیحرامدا نەبێت بەحەج بێت یان عومرە: (عن عُثْمَانَ بن عَفَّانَ رضي الله عنه قال: رسول اللَّهِ ﷺ لَا يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ ولا يُنْكَحُ ولا يَخْطُبُ).[2] عوسمان (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەو کەسەی لەئیحرامدایە نابێت ژن مارە ببڕێتو نابێ بۆشی مارە ببڕدرێتو نابێ خوازبێنی بکات). فەرموودەکە باسی پیاو دەکات ئافرەتیش

---

١) رواه مسلم (١٤٠٦)

٢) رواه مسلم (١٤٠٩)

هەمان حوکمی هەیە نابێ لەکاتی ئیحرامدا مارەبکرێت لەلایەن بەشودەریەوە یا وەکیلیەوەو نابێ خوازبێنی بکرێت.

**پایەی سێهەم: مێرد ئەو پیاوەی ئافرەتەکەی بۆ مارەدەکرێت دەبێت ئەم مەرجانەی تێدا بێت:**

١- لەو کەسانە بێت کە دروست بێت بۆ ئافرەتەکە شوی پێ بکات، کەواتە نابێ مەحرەمی ئافرەتەکە بێت.

٢-دەبێ پیاوەکە دیاری بێت.ئەگەر بەشودەرەکە بلێت کچەکەم مارەکرد لەیەکێکتان دروست نییە.

٣- دەبێ پیاوەکە لەئیحرامدا نەبێت. بەبەڵگەی فەرمودەکەی عثمان کە پێشتر باسمان کرد.

**پایەی چوارەم: بەشودەر (الولي):**

(عن أبي بُرْدَةَ بن أبي مُوسَى عن أبيه رضي الله عنها قال: قال رسول الله ﷺ لَا نِكَاحَ إلا بِوَلِيٍّ). ئەبو بوردە لە ئەبو موسای باوکیەوە (رەزای خوایان لێبێ) ئەویش لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (مارەبڕین دروست نییە بەبێ وەلیو بەشودەر)[1]

(عن عَائِشَةَ قالت قال رسول اللَّهِ ﷺ أَيُّمَا امْرَأَةٍ نَكَحَتْ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهَا فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ فَإِنْ دخل بها فَالْمَهْرُ لها بِمَا أَصَابَ منها فَإِنْ تَشَاجَرُوا فَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ من لَا وَلِيَّ له)[2] عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر ئافرەتێك بەبێ پرسی بەشودەرەکەی مارەبڕا ئەوە مارەبڕینەکەی بەتاڵو دروست نییە، سێ جار ئەم ووتەی دووبارە کردەوە جا ئەگەر چووە لای ئافرەتەکە ئەوە مارەیی دەکەوێ بەوەی چووەتەلای، جا ئەگەر بۆیە کیشەیان ئەو حاکمو کاربەدەست وەلی ئەوە کەسەیە کە وەلی نییە).

**پایەی پێنجەم: دوو شایەت کە مەرجە بۆ دروستی مارەبڕین:**

(عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لا نِكَاحَ إِلا بِوَلِيٍّ وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ فَإِنْ تَشَاجَرُوا فَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لا وَلِيَّ لَهُ)[3] عائیشە (رەزای خوایان لێبێ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

---

١) رواه احمد ٣/ ٣٩٤، ٤١٣ و ابوداود (٢٠٨٥) وهو حديث حسن بشواهده

٢) رواه ابو داود (٢٠٨٣) و الترمذي (١١٠٢) وهو حديث صحيح

٣) رواه الدار قطني ٣/ ٢٢٥ (٢٣) و البهيقي ١٢٥/٧ وهو حديث صحيح بشواهده

(مارەبڕین دروست نییە بەوەلی‌و دوو شایەتی عادل نەبێت، جا ئەگەر کێشەیان بوو لەنێوان خۆیاندا ئەو گەورەو کاربەدەست وەلی ئەو کەسەیە کە وەلی نییە).

**- ڕوونکردنەوەیەك: هاندان بۆ مۆڵەت وەرگرتن لەکچ کاتێ بەشوو دەدرێت:**

(عن أَبي هُرَيْرَةَ أَنَّ النبي ﷺ قال: لَا تُنْكَحُ الْأَيِّمُ حتى تُسْتَأْمَرَ ولا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حتى تُسْتَأْذَنَ قالوا يا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ إِذْنُهَا قال أَنْ تَسْكُتَ)[1] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێوەژن مارە نابڕدرێت تا فەرمان نەدات - بەوەلییەکەی کە بەشوی بدات‌و مارە ببڕێت - وە کچیش مارەی نابڕدرێت تا مۆڵەتی لێ وەرنەگیرێت) عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا: مۆڵەتی کچ چۆنە؟ فەرمووی: ئەوەیە بێ دەنگ بێ کاتی پرسی پێ دەکەیت شوودەکەیت بەفلانە کەس).

---

١) رواه البخاري (٥١٣٦) و مسلم (١٤١٩)

## چوارەم: مارەیی

### ١ـ مارەیی بەچی دەووترێت:

ئەو بەرانبەرەیە لەکاتی مارەبڕیندا یا دوای مارەبڕین دەدرێتە ئافرەتەکە لەبەرانبەر حەڵاڵ بوونی ئافرەتەکە بۆ مێردەکەی، پارە بێت یا ئاڵتونو یا کەلوپەل قەرز بێت یا حازر.

مارەیی لەئیسلامدا دروستەو رێگە پێدراوە:

لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ نِحْلَةً﴾ النساء: ٤. واتە: ئافرەتان مارەییەکەیانیان پێ بدەن وەك بەخشین (نەك وەك کرێ)و چەندین ئایەتی تر لەم بارەیەوە باسی دەکاتو لەمارەیی ئافرەت دەدوێ.

لەسوننەتیشدا فەرموودە زۆرن لەوبارەیەوە لەوانە (فقال ﷺ: الْتَمِسْ وَلَوْ خَاتَمًا من حَدِيدٍ)[١] پێغەمبەر (ﷺ) بەیەکێك لە هاوەڵانی دەفەرموێ کە دەیەوێ ئافرەتێك مارە بکات: (شتێك پەیداکە ـ بۆ مارەییەکەی ـ ما ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێت).

### ٢ـ حوکمی مارەیی:

بەتەواو کردنی مارەبڕینەکە مارەیی ناوبراو بۆ ئافرەتەکە واجب دەبێت لەسەر مێردەکەی، جا ناوبراو بێت لەکاتی مارە بڕینەکەدا یا ناوبراو نەبێ، ئەندازەکەی دیاری کرابێ یا دیاری نەکرابێ هەر پێویستە لەسەر مێردەکەو دەبێ بیدات بەئافرەتەکە.

### ٣ـ ناوبردنی مارەیی لەکاتی مارەبڕینەکەدا:

سوننەتە ئەو ئەندازە ماڵەی بەمارەیی دانراوە بۆ ئافرەتەکە لەکاتی مارەبڕینەکەیدا ناو ببرێتو باس بکرێت، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) مارەبڕینی نەکردووە بەبێ ناوبردنی مارەییو باسکردنی. وە ناوبردنی مارەیی لەکاتی مارەبڕینەکەدا رێگر دەبێت لەدروست بوونی کێشە لەو بارەیەوە لەنێوان ژنو مێردەکەدا.

---

١) رواه البخاري (٥٣١٠)

**٤ـ ئافرەت خاوەنی مارەییە:**

مارەیی تەنها هی ئافرەتە بەشوودراوەکەیە هیچ کام لەکەس‌و کاری خاوەنی هیچێك لەمارەیی ئافرەتەکە نین تا مافی وەرگرتنی مارەییەکەیان هەبێت، بەڵام بۆ ئافرەتەکەی وەردەگرن. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا﴾ النساء:٢٠ واتە: ئەی ئەوانەی کەس‌و کاری ئافرەتی بەشودراون ـ هیچ لەو مارەییە مەبەن بۆ خۆتان بەدرۆو نارەوا گوناهباری ئاشکرا ـ چونکە هەمووی هی ئافرەتەکەیە، وە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَّرِيئًا﴾ النساء: ٤، واتە: ـ پیاوەکان ـ ئەگەر خێزانەکانتان بەدڵ ڕازیبن هەندێ لەمارەییەکانیان بدەن بەئێوە ئێوەش بیخۆن بەخۆشی‌و حەڵاڵی نۆشی گیانتان بێت.

**٥ـ سوننەتە مارەیی زۆر نەبێت:**

(عن سهل بن سعد رضي الله عنه قال زوج رسول الله ﷺ رجلا امرأة بخاتم من حديد). [١]

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتێکی مارەکرد بۆ پیاوێك لەسەر ئەنگوستیلەیەکی ئاسن).

عن عُقْبَةَ بن عَامِرٍ أَنَّ النبي ﷺ قال:(خَيْرُ النِّكَاحِ أَيْسَرُهُ...) [٢]

عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

(چاکترینی مارەیی ئاسانترینێتی) واتە: سوکترین‌و کەمترین ئەندازەی مارەیی.

**٦ـ سوننەتە مارەیی زوو بدرێت:**

(عن ابن عَبَّاسٍ أَنَّ عَلِيًّا قال تَزَوَّجْتُ فَاطِمَةَ رضي الله عنها فقلت يا رَسُولَ اللَّهِ بن بِي قال أَعْطِهَا شيئا قلت ما عِنْدِي من شَيْءٍ قال فَأَيْنَ دِرْعُكَ الْحُطَمِيَّةُ) [٣] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: کاتێ عەلی فاتیمەی کچی پێغەمبەری (ﷺ) مارەکرد پێغەمبەر

---

١) رواه البخاري (٥٣١٠)

٢) رواه ابو داود (٢١١٧) وهو حديث صحيح

٣) رواه ابو داود (٢١١٧) و النسائي (٣٣٧٥) وهو حديث صحيح

(ﷺ) بەعەلی فەرموو: (شتێکی پێبدە) عەلی ووتی: هیچم نییە، فەرمووی: (زرێ پۆشی حوتەمێکەت کواو لەکوێیە؟).

**٧ـ مارەیی ئافرەتێك کە مارەیی بۆ دانەنرابێت:**

(عَنْ عَلْقَمَةَ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقًا وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا حَتَّى مَاتَ. فَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ لَهَا مِثْلُ صَدَاقِ نِسَائِهَا لاَ وَكْسَ وَلاَ شَطَطَ وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ وَلَهَا الْمِيرَاثُ. فَقَامَ مَعْقِلُ بْنُ سِنَانٍ الأَشْجَعِيُّ فَقَالَ قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بِرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ امْرَأَةٍ مِنَّا مِثْلَ الَّذِي قَضَيْتَ . فَفَرِحَ بِهَا ابْنُ مَسْعُودٍ.)[1] عەلقەمە دەڵێ: پرسیار لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود کرا (رەزای خوای لێبێ) دەربارەی پیاوێك ئافرەتێکی مارە کردو مارەیی بۆ دانەناو نەچووە لای تا مرد، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ووتی: مارەیی هاوشێوەی خۆی لەئافرەتان دەکەوێت بێ کەمو زیادو عیددەشی لەسەرەو میراتیشی دەکەوێ، جا مەعقەلی کوڕی سەنانی ئەشجەعی هەڵساو ووتی: ( پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی بەروەعی کچی واشیق ـ کە ئافرەتێکی خزمی ئێمە بووـ بەوێنەی ئەم بڕیارەی تۆی بۆدا، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود بەقسەکەی مەعقەل دڵخۆش بوو).

**٨ـ دوعا کردن بۆ ئەو کەسەی ژنی هێناوە:**

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النبي ﷺ كان إذا رَفَّأَ الْإِنْسَانَ إذا تَزَوَّجَ قال بَارَكَ الله لك وَبَارَكَ عَلَيْكَ وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا في خَيْرٍ).[2] ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ پیرۆزبایی بکردایە لەکەسێك کە ژنی بهێنایە دەیفەرموو: (بارك الله لك وبارك عليك وجمع بينكما في خير).

---

١) رواه احمد ٤/ ٢٧٩ و ابو داود (٢١١٥) و النسائي (٦/ ١٢١ - ١٢٢) و الترمذي (١١٤٥) و ابن ماجه (١٨٩١) وهو حديث صحيح

٢) رواه احمد ٢/ ٣٨١ و ابو داود (٢١٣٠) و الترمذي (١٠١٩) و النسائي (١/ ١٠٠٨٩) و ابن ماجه (١٩٠٥) وهو حديث صحيح

**٩- ژن هێنان و ئەو ئەنجامانەی لێی پەیدا دەبێت:**

**١- جۆرەکانی ژن هێنان:**

**أ- ژن هێنانی بەتاڵ:**

ئەو ژن هێنانو مارەکردنەیە کە پایەیەك لەپایەکانی نەبێت یان مەرجێ لەمەرجەکانی دروستی مارەکردن. ئەم جۆرە لەمارەکردنو ژن هێنان حەرامە هیچ ئەنجامێکی ژن هێنانی لێی پەیدا نابێت جگە لەوەی ئافرەتەکە مارەیی هاوشێوەی خۆی دەکەوێت ئەگەر پیاوەکە چووبوبە لای نموونەی ئەم جۆرە مارەبڕینە بەتاڵەش وەك مارەکردنی ئافرەت بەبێ وەلیو چوونە لای. (قال رسول اللّهِ ﷺ أَيُّمَا امْرَأَةٍ نَكَحَتْ بِغَيْرِ إِذْنِ وَلِيهَا فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ ثَلَاثًا)[1] پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (هەر ئافرەتێك بەبێ مۆڵەتی بەشودەر مارەکرا ئەوە مارەبڕینەکەی بەتاڵە، ئەو مارەبڕینەکەی بەتاڵە، ئەوە مارەبڕینەکەی بەتاڵە).

**ب- ژن مارەکردنی ڕاستو دروست:**

ئەگەر مارەبڕینەکە دروست بوو ئەوە هەموو ئەرکو ماف و ئەنجامەکانی لێ پەیدا دەبێت کە ئەمانەن:

**١- پیاو ئافرەتەکە بۆ یەکتری حەلاڵ دەبن:** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ﴾ البقرة: ٢٢٣ واتە: ژنەکانتان کێڵگەی خۆتانن جا تۆو بڕشێننە ناو کێڵگەکەتانەوە لەهەر کوێوە دەتانەوێ ـ جگە لە کۆم ـ.

**٢- پێویستە ئافرەت گوێڕایەڵی پیاوەکەی بێت ڕێگەی بدات بچێتە لایو پارێزگاری ماڵەوەی بکات.**

عن أَبِي هُرَيْرَةَ عن النبي ﷺ قال:( إذا بَاتَتْ الْمَرْأَةُ هَاجِرَةً فِرَاشَ زَوْجِهَا لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حتى تُصْبِحَ)[2] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر ئافرەت شەو لەگەڵ مێردەکەیدا نەخەوت فریشتەکان نەفرینی لێ دەکەن تا ڕۆژ دەبێتەوە)

---

١) پێشتر باسکرا

٢) رواه مسلم (١٤٣٦) و البخاري (٤٨٩٧)

**٣ـ مارەیی:** مافی ئافرەتەكەیە بەسەر پیاوەكەیەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ نِحْلَةً ﴾ النساء: ٤ واتە: ئافرەتان مارەییەكانیان پێ بدە وەك بەخشین.

**٤ـ نەفەقەو خەرجی:** بەیەك دەنگی زانایان نەفەقەی ژن لەسەر مێردەكەیەتی خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ البقرة: ٢٣٣، واتە: لەسەر باوكەكەیە بژێوی‌و كاڵای دایكەكان بەباشی. وە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟ عَلَيْهِنَّ ﴾ الطلاق: ٦، واتە: لەو ماڵ‌و جێگەی خۆتان دادەنیشن ژنەكانتان ـ كە تەڵاق دراون ـ دایان بنێن بەپێی تواناتان وە زیانیان پێ مەگەیەنن بۆئەوەی تەنگیان پێ هەڵنچنن.

(قال رسول الله ﷺ في خطبة حجة الوداع: ولهن عليكم رزقهن وكسوتهن بالمعروف).[١]

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە وتاری حەجی ماڵئاواییدا فەرمووی: (خێزانەكانتان مافی بژێوی‌و كاڵاو پۆشاكیان بەباشی لەسەر ئێوەیە ـ مێردەكان ـ).

نەفەقە خواردن‌و خواردنەوەو پۆشاك‌و ماڵ‌و خانوو دەگرێتەوە، كە دەبێت پیاو بۆ هاوسەری دابین بكات.

**٥ـ ئەگەر زیاد لەخێزانێكی هەبوو دەبێت كاتی مانەوە لەنێوانیاندا بەش بكات:** بۆ نموونە ئەگەر پیاوێك دوو خێزانی هەبوو دەبێت وەك یەك لەلایان بمێنێتەوە ئەگەر شەوو رۆژێك لای یەكێكیان مایەوە دەبێت لای خێزانەكەی تریش شەوو رۆژێك بمێنێتەوە بەهەمان شێوە ئەگەر ماوەكەی زیاتر بێت دەبێ یەكسان بن.

**٦ـ نەژادو رەچەڵەك (النسب):** بەمارەكردن‌و چوونە لای ئافرەتەكە ئەگەر ئافرەتەكە منداڵی بوو ئەوە دەدرێتە پاڵ پیاوەكەی‌و بەمنداڵی مێردەكەی دادەنرێن ئەگەر لەماوەی ئاسایی منداڵ بووندا منداڵی بوو. (قال رسول الله ﷺ: الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ)[٢] پێغەمبەری خوا

---

١) رواه مسلم (١٢١٨)

٢) رواه مسلم (١٤٥٧)

(ﷺ) دەفەرموێ: (منداڵ ڕۆڵەی تێکەڵی باوکو دایکە بۆ داوێن پیسیو زیناکاریش جگە لە ڕەنج خەساری هیچی بۆ نییە).

**٧ـ ژنو مێرد میرات لەیەکتری دەبەن:** ئەگەر ژنو مێرد هەرکامیان بمرێت ئەوی کەیان میراتی لێ دەبات ئەگەر مەرجەکانی میرات بردن بنو ڕێگرەکانیش نەبن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾ النساء: ١٢

واتە: لەو (میراتە)ی ژنەکانتان بەجێیان هێشتووە نیوەی بۆ ئێوەیە، ئەگەر منداڵیان نەبوو، بەڵام ئەگەر منداڵیان هەبوو ئەوە چواریەکی بۆ ئێوەیە لەوەی بەجێیان هێشتووە -لەپاش- دەرکردنی ـ وەسیەتێك کە کردبێتیان یا قەرزێك ـ کە لەلایان بێت_ وە ژنەکانتان چواریەکیان دەکەوێ لەو (میراتە)ی کە ئێوە بەجێتان هێشتووە ئەگەر ئێوە منداڵتان نەبوو، بەڵام ئەگەر منداڵتان هەبوو ئەوە هەشت یەکیان دەکەوێ لەوەی بەجێتان هشتووە لەپاش ـ دەرکردنی وەسیەتێك کە کردبێتتان یان دانەوەی قەرزێك کە لاتان بێت.

## پێنجەم: نانی شایی‌و زەماوەند

**١- (وەلیمە):**

بەو خواردن‌و نان دروست کردنە دەووترێت بەبۆنەی ژن هێنانەوە دروست دەکرێ خەڵکی بۆ بانگ دەکرێ‌و لەماڵی زاوا ساز دەکرێت.

**٢- حوکمی ئەو خواردن دروستکردنە:**

ئەو خواردن دروست کردنە بەبۆنەی بەبۆنەی گواستنەوەی هاوسەرەوە سوننەتی پێغەمبەرە (ﷺ) بەکرداری‌و بە گوفتاری. (عن أَنَسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى عَبْدَ الرحمن بن عَوْفٍ وَعَلَيْهِ رَدْعُ زَعْفَرَانٍ فقال النبي ﷺ مَهْيَمْ فقال يا رَسُولَ اللَّهِ تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً قال ما أَصْدَقْتَهَا قال وَزْنَ نَوَاةٍ من ذَهَبٍ قال أو لم وَلَوْ بِشَاةٍ)[١] ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفی بینی ڕەنگی زەردی زەعفەرانی پێوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەمە چییە؟) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئافرەتێکم مارەکردووە، فەرمووی: (چەند مارەییت پێداوە؟) ووتی: گۆیەکی ئاڵتون، فەرمووی: (خواردن دروست بکە با بە مەڕێکیش بێت).

(وجاء أنّ النبي ﷺ أَوْلَمَ عَلَى زَيْنَبَ بخبز ولحم)[٢] هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) بۆ زەماوەندی زەینەب -ی خێزانی- گۆشت‌و نانی دروست کرد).

**٣- ئەندازەی خواردنی شایی:**

کەمترینی نان خواردنی شایی بۆ کەسێ هەیبێ مەڕێك یان بزنێکە لای سرویشی دیاری نەکراوە، بەڵام بۆ کەسێ دەسەڵاتی نەبێ چەند ئەتوانێ‌و چی دەتوانێ ئەوە بکات با خواردنێکی سادەش بێت هەر سوننەتە بکرێت.

---

١) رواه البخاري (٢٠٤٩، ٣٧٨١) ومسلم (١٤٢٧)

٢) رواه مسلم (١٤٢٨)

**٤ـ حوكمی بەدەمەوە چوونی دەعوەتی خواردنی شایی:**

بەدەمەچوونی دەعوەتی خواردنی شایی ئەگەر كەسێك دەعوەت كرا واجبە بڕوات مەگەر ناشەرعی لەشاییو زەماوەندەكەدا ببێت ئەو كاتە دروستە نیە بڕوات مەگەر چوونەكەی بۆ ئەوە بێت ڕێگری بكات لەو ناشەرعیەتە كە دەكرێت.

(عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال إذا دُعِيَ أحدكم إلى الْوَلِيمَةِ فَلْيَأْتِهَا)[١] عەبدوڵڵای كوڕی عومەری كوڕی خەتتاب (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر كەسێكتان دەعوەتی خواردنی شایی كرا بابڕوات بۆی).

---

١) رواه البخاري (٤٨٧٨) و مسلم (١٤٢٩)

## شەشەم: نوبەتی شەو مانەوە (القَسْم)

**١- (القسم)** واتە: بەش وە مەبەست پێی ئەوەیە ئەگەر پیاوێ لەخێزانێ زیاتری هەبوو هەریەکەیان چەند شەو مایەوە دەبێت لای ئەوانی تریش ئەوەندە بمێنێتەوە.

**٢- واجبە دادگەر بێت لەمانەوەی شەو لەنێوان خێزانەکانیدا:** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ﴾ النساء: ٣ واتە: ئەگەر ترسان دادگەر نەبن لەنێوان خێزانەکانتاندا - لەشەو مانەوەو شتی تردا- ئەوە یەك ژن بێنن یا ئەو کەنیزەکانەی کە هی خۆتانن.

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال من كانت له امْرَأَتَانِ فَمَالَ إلى إحْدَاهُمَا جاء يوم الْقِيَامَةِ وَشِقُّهُ مَائِلٌ)[1] ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر پیاوێ دوو خێزانی هەبێت بە زۆری لای یەکێکیان بێت لەرۆژی دواییدا کە دێت شانی خواربووە) ئەم سزایە تەنها لەبەرنەکردنی واجبێکە.

**٣- ئەگەر بێوەژن مارەکات بەسەر کچدا یان بەپێچەوانەوە:**

(قال انس رضي الله عنه من السنة إِذَا تَزَوَّجَ الْبِكْرَ عَلَى الثَّيِّبِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعًا ثُمَّ قَسَمَ وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ عَلَى الْبِكْرِ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلَاثًا ثُمَّ قَسَمَ).[2] ئەنەس (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (لە سوننەتە ئەگەر کچ مارەکات بەسەر بێوەژندا حەوت شەو لای دەمێنێتەوە پاشان دەیکاتە نۆرە بۆیان، بەڵام ئەگەر بێوەژن مارەکات ـ بەسەر کچدا- سێ شەو لای دەمێنێتەوە پاشان دەیکاتە نۆرە بۆیان).

(عن أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها قالت: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ« لِلْبِكْرِ سَبْعٌ وَلِلثَّيِّبِ ثَلَاثٌ ».) ئوممو سەلەمە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بۆ کچ حەوت شەوە ـ مێردەکەی لای بمێنێتەوە ـ بۆ بێوەژن سێ شەوە)[3]

---

١) رواه ابو داود (٢١٣٣) و الترمذي (١١٤١) وهو حديث صحيح

٢) رواه البخاري (٥٢١٤) و مسلم (١٤١٦)

٣) رواه مسلم (١٤٦٠)

**٤- دروستە ژن دەست لەنۆرەی خۆی هەڵگرێت:**

(عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ مَا رَأَيْتُ امْرَأَةً أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَكُونَ فِي مِسْلاَخِهَا مِنْ سَوْدَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ مِـــنِ امْرَأَةٍ فِيهَا حِدَّةٌ قَالَتْ فَلَمَّا كَبِرَتْ جَعَلَتْ يَوْمَهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِعَائِشَةَ قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ جَعَلْتُ يَوْمِي مِنْكَ لِعَائِشَةَ. فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْسِمُ لِعَائِشَةَ يَوْمَيْنِ يَوْمَهَا وَيَوْمَ سَوْدَةَ).[1]

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (هیچ ژنێکم نەدیوە بەدڵ حەز بکەم وەك ئەو وابم بەئەندازەی سەودەی کچی زەمعە ژنێکی ئازاو دەرون بەهێز بوو، کە چوو بەساڵدا نۆرەکەی خۆی -کە پێغەمبەر (ﷺ) لای دەبوو- بەخشی بە عائیشە ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئەو شەوو ڕۆژەی هەمە لەگەڵ تۆ بەخشیم بەعائیشە دوای ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو شەو لای عائیشە دەمایەوە، شەوەکەی خۆی‌و شەوەکەی سەودەش).

**٥- دروستە پیاو بڕوات بۆ ماڵی ئەو خێزانەی نۆرەی نییە:**

دروستە پیاو سەردانی خێزانەکانی تری بکات با نۆرەی شەو مانەوەشیان نەبێت، بەڵام دەبێت شەو لەماڵی ئەو خێزانەیان بێت کە نۆرەیەتی پیاوەکە لەوێ بێت. (عن عُرْوَةَ قال قالت عَائِشَةُ يا بن أُخْتِي كان رسول اللَّهِ ﷺ لَا يُفَضِّلُ بَعْضَنَا على بَعْضٍ في الْقَسْمِ من مُكْثِهِ عِنْدَنَا وكان قَلَّ يَوْمٌ إلا وهو يَطُوفُ عَلَيْنَا جميعا فَيَدْنُو من كل امْرَأَةٍ من غَيْرِ مَسِيسٍ حتى يَبْلُغَ إلى التي هو يَوْمُهَا فَيَبِيتَ عِنْدَهَا).[2] عوروە (ڕەزای خوای لێبێ)دەڵێ: عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) ووتی: ئەی خوشکەزای خۆم پێغەمبەری خوا (ﷺ) باوی هەندێکمانی نەدەدا بەسەر هەندێکماندا لەنۆرەی شەو لامانەوە لامان کەم ڕۆژ هەبوو بەسەر هەموومانیدا نەگەڕێ لەهەموو خێزانێکی نزیك دەبوویەوە بێ ئەوەی لەگەڵی جووت بێت، هەتا دەگەشتە ئەوەیان ئەو ڕۆژە سەرەی بوو شەو لای دەمایەوە).

١) رواه البخاري (٤٩١٤) و مسلم (١٤٦١)

٢) رواه ابو داود (٢١٣٥)

**٦- ئەگەر پیاو ڕۆشت بۆ سەفەر قورعە بكات لەنێوان خێزانەكانیدا، بۆ هەر خێزانێكی دەرچوو لەگەڵ خۆیدا دەیبات:** (عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت كان رسول اللَّهِ ﷺ إذا أَرَادَ سَفَرًا أَقْرَعَ بين نِسَائِهِ فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بها معه).[1] **عائیشە** (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (هەمیشە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیویستایە سەفەر بكات قورعە كێشی دەكرد لەنێوان خێزانەكانیدا بۆهەر خێزانێكی دەرچوایە لەگەڵ خۆی دەیبرد).

---

١) رواه البخاري (٢٥٩٣) و مسلم (٢٧٧٠)

## حەوتەم: مافەکانی هەریەك لە ژن و مێرد

**أ- مافەکانی ژن بەسەر مێردەوە:**

**١- پێدانی ئەو مارەییەی لەسەری ڕێکەوتوون:** - پێشتر بەدرێژی باسمان کرد-، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحْلَةً ﴾ النساء: ٤ واتە ئافرەتان مارەییەکانیان پێ بدەن وەك بەخشین.

**٢- نەفەقەو خەرجی کێشانی ژن و منداڵەکانی:** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ البقرة: ٢٣٣ واتە: لەسەر باوکەکەیە بژێوی و پۆشاکی دایکەکە بەباشی. (قال إن رسول الله ﷺ: ولهن عليكم رزقهن وكسوتهن بالمعروف).[1] پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ: (مافی ژنەکانتانە بەسەرتانەوە رسق و بژێوی و پۆشاکیان بەباشی).

**٣- بەچاکی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵیدا:** خوای گەورە بەپیاوان دەفەرموێ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ النساء: ١٩ واتە: پیاوەکان بەچاکی هەڵس و کەوت لەگەڵ هاوسەرەکانتاندا بکەن.

**٤- پیاو دەبێت یارمەتیدەربێت بۆ هاوسەرەکەی لەسەر گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر (ﷺ):** فێری ئیمان و خوا بەتەنیا ناسین و بەندایەتی و ئاکاری ئیسلامی بکات، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ﴾ التحريم: ٦ واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە خۆتان و ماڵ و منداڵتان بپارێزن لەئاگرێك کە سوتەمەنییەکەی مرۆڤ و بەردە کە بۆ کافران ئامادە کراوە.

**٥- فەرمانی پێنەدا بەتاوان کردن:** نابێ پیاو فەرمانی سەرپێچی و تاوان بە خێزانی بکات، ئەگەر فەرمانی وای پێدا ئەوە نابێ گوێڕایەڵی بێت، بەڵکو گوناهبارە گەر گوێڕایەڵی بێت لەوکاتەدا. (عن عَائِشَةَ أَنَّ امْرَأَةً من الْأَنْصَارِ زَوَّجَتْ ابْنَتَهَا فَتَمَعَّطَ شَعَرُ رَأْسِهَا فَجَاءَتْ إلى النبي

---

١) رواه مسلم (١٢١٨)

ﷺ فَذَكَرَتْ ذلك له فقالت إِنَّ زَوْجَهَا أَمَرَنِي أَنْ أَصِلَ فِي شَعَرِهَا فقال لَا إنه قد لُعِنَ الْمُوصِلَاتُ)[١] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ئافرەتێکی ئەنصاری هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) کچێکی دابوو بەشوو قژی سەری وەریبوو، هاتبوویە خزمەتیو ئەوەی بۆ باسکردو ووتی: مێردەکەی داوا دەکات قژ بکەم بەسەریەوە فەرمووی: (نابێ، بێگومان نەفرین کراوە لەو ئافرەتانەی قژ دەبەستن بەسەرو قژی ئافرەتەوە).

(عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما عن النبي ﷺ قال السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ حَقٌّ ما لم يُؤْمَرْ بِالْمَعْصِيَةِ فإذا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فلا سَمْعَ ولا طَاعَةَ)[٢] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ)دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (مرۆڤی موسوڵمان پێویستە گوێڕایەڵو فەرمانبەدار بێت لەوەی پێی خۆشەو لەوەش پێی ناخۆشە هەتا فەرمانی سەرپێچی پێ نەکرێ جا ئەگەر فەرمانی پێکرا بەسەرپێچی ئەوە گوێڕایەڵیو فەرمانبەردار نەبێت).

**ب- مافەکانی مێرد بەسەر ژنەوە:**

**١- گوێڕایەڵی کردنی لەتاواندا نەبێت:** خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ﴾ النساء: ٣٤ واتە: پیاوان سەرپەرشتیارو گەورەن بەسەر ئافرەتانەوە، کەواتە دەبێت گوێڕایەڵیان بکەن چونکە گەورەیانن وە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا ﴾ النساء: ٣٤. واتە: ـ پیاوەکان ـ ئەگەر گوێڕایەڵیان کردن ئەوە ئیتر هیچ ڕێگەیەك لەدژیان مەگرنە بەر.

**٢- نابێ هیچ کەس بباتە ماڵی مێردەکەی بەبێ پرسو ڕەزامەندی ئەو:** (أن النبي ﷺ قال: ولكم عليهن أن لا يوطئن فرشكم أحدا تكرهونه).[٣] پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (مافی ئێوەیە بەسەر خێزانەکانتانەوە کەسێ نەبەنە ماڵو شوێنی ئێوە کە دەیانبوغزێننو پێتان ناخۆشە).

---

١) رواه البخاري (٥٢٠٢) و مسلم (٢١٢٣)

٢) رواه البخاري (٧١٤٤) و مسلم (١٨٣٩)

٣) رواه مسلم (١٢١٨)

(عن عُقْبَةَ بن عَامِرٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ على النِّسَاءِ فقال رَجُلٌ من الْأَنْصَارِ يا رَسُولَ اللَّهِ أفرأيت الْحَمْوَ قال الْحَمْوُ الْمَوْتُ).[1] عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (وریا بن تەنیا مەکەون لەگەڵ ئافرەتدا) پیاوێکی ئەنصاری ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەگەر شوبرا یا خزمی مێردەکەی بوو؟ فەرمووی: (شوبرا مردنە) لەبەرئەوە وای فەرموو چونکە بەهۆی نزیکییەوە لەوانەیە خراپە ڕوویدات لەنێوانیاندا.

**٣ـ نابێ ئافرەت بەبێ پرس و مۆڵەتی مێردەکەی لەماڵی مێردەکەی بڕواتە دەرەوە:**

ئەگەر ڕۆشتە دەرەوە بەبێ پرس ئەوە تاوانبارەو سزا دەدرێت لەسەری. (عن معاذ بن جبل رضي الله عنه عن رسول الله ﷺ قال لا يحل لامرأة تؤمن بالله واليوم الآخر أن تأذن في بيت زوجها وهو كاره ولا تخرج وهو كاره ولا تطيع فيه أحدا ولا تخشن بصدره ولا تعتزل فراشه ولا تضربه فإن كان هو أظلم فلتأته حتى ترضيه فإن كان هو قبل فبها ونعمت وقبل الله عذرها وأفلح حجتها ولا إثم عليه وإن هو أبي برضاها عنها فقد أبلغت عند الله عذرها).[2] موعازی کوڕی جەبەل (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (دروست نییە بۆ ئافرەتێك بڕوای بەخوا و بەرۆژی دوایی بێت مۆڵەت بەکەسێك بدات بێتە ماڵەوە کە مێردەکەی پێی ناخۆشە، وە نابێ بڕواتە دەرەوە لەماڵەوە ئەگەر مێردەکەی پێی ناخۆش بوو، وە گوێڕایەڵی کەس نەکات لەبەرانبەر مێردەکەیدا، دڵی مەئێشێنەو تۆرەی مەکە، جێگای لێ جیامەکەرەوەو لێی مەدە، ئەگەر ئەو (پیاوەکە) زوڵمو ستەمی کردو نارێك بوو ئەوە تۆ بڕۆ بۆ لای تا ڕازی دەکەیتو دڵی چاك دەکەیتەوە، جا ئەگەر قبوڵی کرد ئەوە زۆر باشە وە خواش عوزرو بەهانەی ئافرەتەکە وەردەگرێ بەڵگەی سەردەکەوێو تاوانی لەسەر نییە، بەڵام ئەگەر پیاوەکە لێی ڕازی نەبوو ئەوە ئافرەتەکە لای خوای بەهانەی بەسەر خۆیەوە نەهێڵاوە).

---

١) رواه البخاري (٥٢٣٢) و مسلم (٢١٧٢)

٢) رواه الحاكم ٢/ ٢٠٦ (٢٧٧٠) و البيهقي في السنن الكبرى (١٤٤٩٢) وهو حديث حسن لغيره

**٤ـ پارێزگاری لەماڵو سامانی مێردەکەی بکات:**

نابێ هیچ جۆرە دەستکارییەکی سامانی مێردەکەی بکات بەبێ ڕەزامەندی ئەو، وە نابێ خەرجو مەسرەفی لێ بکات بەگوێرەی مۆڵەتو ڕەزامەندی مێردەکەی نەبێت. (عن أَبِي أُمَامَةَ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِى حَقٍّ حَقَّهُ فَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ وَلاَ تُنْفِقُ الْمَرْأَةُ شَيْئًا مِنْ بَيْتِهَا إِلاَّ بِإِذْنِ زَوْجِهَا ». فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ الطَّعَامَ قَالَ « ذَاكَ أَفْضَلُ أَمْوَالِنَا ».)[١] ئەبو ئومامە (ڕەزای خوای لێبێ)دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام بیست (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان خوای گەورە مافی هەموو مافدارێکی داوە کەواتە وەسیکردن بۆ میراتگر دروست نییە، وە ئافرەت نابێ هیچ لەماڵی خۆی خەرج بکاتو سەرف کات بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی) عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا خواردنیش: فەرمووی: (خواردن باشترینی ماڵو سامانمانە).

**٥ـ نابێ ڕۆژووی سوننەت بگرێ بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی:**

ئەگەر پیاوەکە لەماڵەوە بوو دروست نییە خێزانی ڕۆژووی سوننەت بگرێت بەبێ پرسی مێردەکەی. (عن أَبِي هُرَيْرَةَ عن النبي ﷺ لَا تَصُومُ الْمَرْأَةُ وَبَعْلُهَا شَاهِدٌ إلا بِإِذْنِهِ).[٢] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (نابێ ئافرەت ڕۆژوو ـ ی سوننەت ـ بگرێت ئەگەر مێردەکەی لەماڵەوە بێت بەمۆڵەتی ئەو نەبێ).

---

١) رواه ابو داود (٣٥٦٥) و الترمذي (٦٧٠) و ابن ماجه (٢٧١٣) وهو حديث صحيح

٢) رواه البخاري (٥١٩٢) و مسلم (٨٤ / ١٠٦٢)

## هەشتەم: تەلاق

**١- تەلاق چییە:** تەلاق لەزمانی عەرەبی دا یانی کردنەوەی گرێو بەرەڵلا کردنو واز لێ هێنان.
لە شەرعیشدا: یانی کردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی ژنو مێردایەتی.
ئیمامی حەرەمەین دەڵێ: تەلاق ووشەیەکە عەرەبەکانە پێش ئیسلام بەکاریان هێناو ئیسلام هێلاویەتیەوەو بەکاری هێناوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ ﴾ البقرة: ٢٢٩، واتە: تەلاقدان دوو جارە - کە پیاوەکە بتوانێ خێزانەکەی بباتەوە لای خۆی-.

**٢- بەڵگەی دانان و دروستی تەلاق:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴾ الطلاق: ١
واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) - بەئوممەتەکەت بڵێ - هەر کاتێ ویستتان خێزانەکانتان تەلاق بدەن با لەکاتی عیددەیاندا -کاتێ پاك بوونەتەوەو نەچوونەتە لایان- تەلاقیان بدەن.

**٣- حیکمەتی ڕێگە پێدانی تەلاق:**

لەبنەڕەتدا ژنو مێردایەتی بۆ ئەوەیە تا سەر پێکەوە بژین، وەخوای گەورە کۆمەڵێ حوکمو ئادابی داناوە بۆ ژنو مێردایەتی بۆ بەردەوام بوونیو لەدەست نەچوونی وە بەهێزکردنو پتەوکردنی پەیوەندی نێوان ژنو مێرد، بەڵام ئەم حوکمو ئادابانە هەندێ جار لەلایەن ژنو مێردەوە یان یەکێکیانەوە پارێزگاری لێ ناکرێو جێ بەجێ ناکرێ. بۆ نموونە پیاوەکە گوێ بەوەنادات ئافرەتێکی چاكو ئیماندار هەڵبژێرێت ببێتە هاوسەری یان هەردووکیان یا یەکێکیان پارێزگاری ئادابەکانی چونیەتی هەڵسو کەوت لەگەڵ یەکتری ناکەن کە ئیسلام دیاری کردووە. بەهۆیەوە نەگونجان دروست دەبێ وردە وردە پەیوەندی نێوانیان خراپ دەبێ تا وای لێ دێ چاککردنەوەی ناکرێو ڕێگەیەك نامێنێ بۆ لێك تێگەیشتن لەنێوانیاندا، ئالەم کاتەدا دەبێت یاسایەك هەبێت پەنای بۆ ببرێت بۆ کۆتایی هێنان بەپەیوەندی ژنو مێردایەتی نێوانیان بەجۆرێ مافی هیچ کام لەژنو پیاوەکە پێشێل نەکرێ. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغۡنِ ٱللَّهُ كُلّٗا مِّن سَعَتِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمٗا ﴾ النساء: ١٣٠ واتە: وە ئەگەر (ژنو پیاو) لێك

جیابوونەوە پەروەردگار هەریەکەیان (لەوی تر) بێ نیاز دەکات بەرەحمو بەزەیی خۆی وە خوا هەمیشە بەهرە فراوانو کار بەجێیە.

جا ئەگەر پیاو وەك کۆتا چارەسەر بەکاری هێنا لەو حاڵەتەدا باسمان کرد ئەوە چارەسەرێکی پێویستە جگە لەوە رێگە چارەیەکی ترنیە با زۆر جار تاڵو ناخۆشیشە، بەڵام ئەگەر تەڵاقی بەکار هێنا بۆ بەجێ هێنانی هەواو ئارەزووەکانی لەو کاتە بوعزێنراوترین حەڵاڵە بەلای خوای گەورەوە.

**٤ـ جۆرەکانی تەڵاق لەڕووی حاڵەتی تەڵاق دراوەکەوە: لەو رووەوە تەڵاق دوو جۆرە:**

**أـ تەڵاقی سوننی:** لەکاتێکدایە ئافرەتەکە پاك بوویێتەوە لەبێ نوێژیو مێردەکەی نەچوویێتە لای لەو پاکێتیەدا لەم کاتەدا تەڵاق دانی دروستەو دەکەوێ‌و ئەم شێوەی رێكو گونجاوە لەگەڵ رێنماییەکانی شەریعەتدا بۆ تەڵاق دان.

**ب ـ تەڵاقی بیدعی:** لەکاتێکدایە لەبێ نوێژیدا بێت یا خوێنی دوا منداڵ بوونی هەبێت یا پاك بێ بەڵام مێردەکەی چوویێتە لای لەپاکێتیەدا.

(عن عبد اللّهِ بن عمر رضي الله عنهما: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ فذكر ذلك عُمَرُ لِرَسُولِ اللّهِ ﷺ فَتَغَيَّظَ منه رسول اللّهِ ﷺ ثُمَّ قال: مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حتى تَطْهُرَ ثُمَّ تَحِيضَ فَتَطْهُرَ ثُمَّ إن شَاءَ طَلَّقَهَا طَاهِرًا قبل أَنْ يَمَسَّ فَذَلِكَ الطَّلَاقُ لِلْعِدَّةِ كما أَمَرَ الله عز وجل)[1]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: خێزانی تەڵاقدا لەکاتێکدا لەبێ نوێژیدا بوو عومەر ـ باوکی ـ ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) باس کرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو کارە رقی هەستاو پاشان فەرمووی: (بابیگێڕێتەوە پاشان لای بمێنێتەوە تا پاك دەبێتەوە پاشان دەکەوێتەوە بێ نوێژی ئەنجا پاك دەبێتەوە ئینجا ئەگەر بیەوێ تەڵاقی بدات پێش ئەوەی بچێتەلای ئەوە ئەو عیددەیە کە خوا فەرمانی داوە ئافرەتی تێدا تەڵاق بدرێ).

**ج ـ ئەو تەڵاقەی پێی ناووترێ سوننی یا بیدعی:** لەکاتێکدایە ئافرەتەکە منداڵ بێت لەبەر منداڵی‌و کەم تەمەنی نەکەوتبێتە بێ نوێژی یا لەبەر تەمەنی گەورەیی نەکەوێتە بێ نوێژی، یان دوو گیانو سك پڕ بێ یا مارەکرابێ، بەڵام مێردەکەی نەچوویێتە لای یا ئافرەتێك بێت داوای

---

١) رواه مسلم ٤/ ١٢٧١.

خولع[١] بکات لەمێردەکەی لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا تەڵاقەکە دەکەوێو حەرامیش نییە چونکە هیچ زیانێك بەئافرەتەکە ناگات لەم حاڵەتانەدا.

**٥- جۆرەکانی تەڵاق:** تەڵاق سێ جۆری هەیە هەریەکەی لەڕوویەکەوە:

**جۆری یەکەم: وشەکانی بەکارهێنراو بۆ تەڵاق:**

**أ- وشەی ئاشکرای تەڵاق:** ئەوەیە ووشەکە جگە لەتەڵاق مانایەکی دیکە ناگەیەنێ کە سێ وشەن (الطلاق والسراح والفراق) خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴾ الطلاق: ١ واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەئوممەتەکەت بڵێ هەرکات ویستتان خێزانەکانتان تەڵاق بدەن با لەکاتی عیددەیاندا تەڵاقیان بدەن -ئەو کاتەی پاك بوونەتەوە لە بێ نوێژیو نەچوونەتە لای- وە دەفەرموێ: ﴿ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴾ الأحزاب: ٢٨ واتە: وە تەڵاقتان بدەم بەتەڵاقێکی جوانو بێ زیان، وە دەفەرموێ: ﴿ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ ﴾ الطلاق: ٢ واتە: یان لێیان جیا ببنەوە بەچاکی -بێ زیان پێ گەیاندن-.

**ب - وشەی نائاشکرای تەڵاق:** هەر وشەیەکە تەڵاقو غەیری تەڵاقیش دەگەیەنێ، وشەکانیشی زۆرن وەك: (تۆ جیای لە من بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوکت، تۆ سەربەستیو کارت بەدەست خۆتە، لەم جۆرە وشانە).

**بەڵگەیان:** (عن عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّ ابْنَةَ الْجَوْنِ لَمَّا أُدْخِلَتْ على رسول اللَّهِ ﷺ وَدَنَا منها قالت أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ فقال لها لقد عُذْتِ بِعَظِيمٍ الْحَقِي بِأَهْلِكِ)[٢] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: کاتێ کچی جونیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بردیانە ژوورەوە بۆیو پێغەمبەر (ﷺ) لێی نزیك بوویەوە وتی: پەنانەگرم بەخوا لێتان، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان پەنان بەزاتێکی گەورە گرت، بڕۆرەوە بۆ لای کەسو کارت).

---

١) خولع : ئەوەیە ئافرەتەکە داوای جیابونەوە لە مێردەکەی دەکات بە دەست هەڵگرتن بێت لە مارەییەکەی یا مێردەی پارەی پێوە نەبەستێ و ئافرەتەکەش ڕازی یە و دەبیداتێ دواتر باسی خولع دەکەین.

٢) رواه البخاري (٤٩٥٥)

**ج ـ حوکمی تەڵاقدان بەوشەی نائاشکرای تەڵاق:** ئەگەر بەیەکێ لەو ووشانەی نائاشکران لەتەڵاقدا تەڵاقی خێزانیدا تەڵاقەکە دەکەوێت ئەگەر نیەتو مەبەستی پێی تەڵاق بوو بەبەڵگەی فەرموودەکەی پێشوو، بەڵام ئەگەر مەبەستی پێی تەڵاق نەبوو ئەوە تەڵاقی پێ ناکەوێ.

د۔ ئەگەر پیاو خێزانەکەی سەرپشك کرد لەنێوان مانەوەو تەڵاقدا ئەویش تەڵاقی هەڵبژارد تەڵاقەکە دەکەوێت:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ الأحزاب: ٢٨ – ٢٩ واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەخێزانەکانت بڵێ ئەگەر ئێوە ژیانی دونیاو رازاوەی ئەوتان دەوێ دەی هەمووتان وەرن موتعەتان[1] پێ بدەم وە تەڵاقتان بدەم بەتەڵاقدانێکی جوانو بێ زیان وە ئەگەر ئێوە خواو پێغەمبەرکەیو پاداشتی رۆژی دواییتان دەوێ ئەوە بێگومان خوا پاداشتێکی گەورەی ئامادە کردووە بۆ چاکەکاران.

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت خَيَّرَنَا رسول اللَّهِ ﷺ فَاخْتَرْنَا اللَّهَ وَرَسُولَهُ فلم يَعُدَّ ذلك عَلَيْنَا شيئا)[2] عائیشە (رەزای خوای لیبێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرپشکی کردین ـ لەنێوان جیابوونەوەو مانەوەدا۔ ئێمەش خواو پێغەمبەرمان (ﷺ) هەڵبژارد ئەمەش بەهیچ دانەنرا بۆمان) واتە: بەتەڵاق دانەنرا، چونکە ئەوان تەڵاقیان هەڵنەبژارد، بەڵکو مانەوەیان هەڵبژارد.

**جۆری دووەم: تەڵاق لەرووی پەیوەست کردنو جێ بەجێ کردنەوە:**

ئەو وشەو رستانەی بۆ تەڵاق بەکاردەهێنرێن یا دەستبەجێ تەڵاقەکەی پێ دەکەوێ یان پەیوەست کراون بەشتێکەوە کەی هاتەدی تەڵاقەکە دەکەوێت.

---

١) موتعە: پارەو شتومەکێکە دەدرێتە نافرەتانی تەڵاق دراو.

٢) رواه البخاري (٥٢٦٢) و مسلم (١٤٧٧)

**أ- تەڵاقی دەستبەجێ کەوتوو:** ئەو تەڵاقەیە تەڵاقدەرەکە دەیڵێ مەبەستی کەوتنی تەڵاقەکەیە دەستبەجێو بێ دواکەوتن بۆ نمونە بەخێزانەکەی بڵێ تەڵاقت کەوتبێ.

حوکمی ئەم جۆرە تەڵاقە یەکسەر دەکەوێ ئەگەر تەڵاقدەرو تەڵاقدراو خاوەن بەرپرسیارێتی تەواو بن.

**ب - تەڵاقی پەیوەست کراو:** ئەو تەڵاقەیە تەڵاقدەر کەوتنی تەڵاقەکەی پەیوەست کردووە بەمەرجێکەوە بۆ نموونە بەخێزانەکەی بڵێت: ئەگەر بڕۆیت بۆ فلان شوێن تەڵاقت کەوتبێت.

**حوکمی ئەم جۆرە تەڵاقە:** ئەگەر مەبەستی کەوتنی تەڵاقەکە بێت بەهاتنەدی مەرجەکە، ئەوە تەڵاقەکە دەکەوێت کەی مەرجەکە بەدی هات، بەڵام ئەگەر مەبەستی هاندان یا بەرگری کردنو ئەو جۆرانە بوو ئەوە سوێندە، جا ئەگەر نەکەوت ئەوە هیچی لەسەر نییە وە ئەگەر کەوت ئەوە کەفارەتی سوێندێکی لەسەرە.

**جۆری سێهەم: زۆر لێکراو تەڵاقی ناکەوێ:**

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ «لاَ طَلاَقَ وَلاَ عِتَاقَ فِي إِغْلاَقٍ ».)[1] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: لەپێغەمبەری خوام بیست (ﷺ) فەرمووی: (تەڵاقو ئازادکردنی کۆیلە لەکاتی زۆر لێکردندا[2] دروست نییە).

## * تەڵاق خواردن بەگاڵتەوە دەکەوێ:

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال ثَلَاثٌ جَدُّهُنَّ جَدٌّ وَهَزْلُهُنَّ جَدٌّ النِّكَاحُ وَالطَّلَاقُ وَالرَّجْعَةُ).[3] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (سێ شت ڕاستو گاڵتەیان هەر ڕاستە مارەکرنو تەڵاقدان و هێنانەوەی ئافرەت دوای تەڵاق).

---

١) رواه احمد (٦/ ٢٧٦) و ابو داود (٢١٩٣) و ابن ماجه (٢٠٤٦) و البيهقي (٣٥٧/٧) و الحاكم (٢/ ١٩٨) وهو حديث حن بطرقه

٢) ووشەی (اغلاق) زۆربەی زانایان ماناکەری فەرمودە بەو جۆرە مانایان کردوە وەك (ابن قتيبة و الخطابي و ابن السيد) بڕوانە عون المعبود شرح سنن ابي داود ٦/ ١٣٠

٣) رواه ابو داود (٢١٩٤)و الترمذي (١١٨٤) و ابن ماجه (٢٠٣٩) و الحاكم (٢/ ١٩٧، ١٩٨) وهوحديث حسن

**٧- تەڵاقی سێ بەسێ لەیەک کاتدا یەک تەڵاقی پێ دەکەوێ:**

(عن ابن عَبَّاسٍ قال كان الطَّلَاقُ على عَهْدِ رسول اللَّهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَسَنَتَيْنِ من خِلَافَةِ عُمَرَ طَلَاقُ الثَّلَاثِ وَاحِدَةً فقال عُمَرُ بن الْخَطَّابِ إِنَّ الناس قد اسْتَعْجَلُوا في أَمْرٍ قد كانت لهم فيه أَنَاةٌ فَلَوْ أَمْضَيْنَاهُ عليهم فَأَمْضَاهُ عليهم)[١] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەری خواو (ﷺ) ئەبوبەکرو دوو ساڵیش لەجێنشینی عومەردا (ڕەزای خوایان لێبێ) تەڵاقی سێ بەسێ یەك تەڵاق بوو، جا عومەر ووتی: بێگومان خەڵکی پەلەیان کرد لەکارێکدا کە دەبوو خۆگر بوونایە تێیدا - دەڵێن چی - جێ بەجێی بکەین بەسەریاندا ئەنجا جێ بەجێی کرد بەسەریاندا) واتە: بڕیاری دا تەڵاقی سێ بەسێ هەرسێ تەڵاقەکەی پێ بکەوێ، بەڵام وەك لەفەرموودەکەو بەروونی دیارە لەسەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ) تا دوو ساڵی جێنشینی عومەریش هەریەك تەڵاقی پێ خراوە.

**٨- تەڵاق لە ڕووی گێڕانەوەو نەگێڕانەوەوە**

**تەڵاقی لەم بارەیەوە دوو جۆرە: تەڵاقی (رجعي) و تەڵاقی (بائن)**

**تەڵاقی گەڕاندنەوە (رجعي):** تەڵاقدانی ئافرەتێکە مێردەکەی چوبێتە لای و پارەی پێوە نەبستراوە و یەکەم تەڵاق یان دووەم تەڵاقی بێت عیددەشی نەبوو بێت، بەم چوار مەرجە تەڵاقەکە (رجعي) پێ دەوترێت.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ ﴾ البقرة: ٢٢٩

واتە : تەڵاق- یێك بردنەوەی لە دواوەبێ دوو جارە دوا ئەوە ڕاگرتنە بە چاکی یا تەڵاقدانە بەباشی .

ئەو ئافرەتەی تەڵاقەکەی (رجعي) یە بە هاوسەری مێردەکەی دادەنرێت تا لە عیددەدا بێت وە مێردەکەی مافی گێڕانەوەی هەیە بۆ لای خۆی تا عیددەی تەواو نەبێت هەر کات بیەوێ وە ڕەزامەندی ئافرەتەکە و مۆڵەتی بەشودەرەکەی پێویست نیە چونکە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكۡتُمۡنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِيٓ

١) رواه مسلم (٤٩٧١)

أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِى ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓا۟ إِصْلَٰحًا ﴾ **البقرة:٢٢٨** واتە: ژنە تەڵاقدراوەکان تا سێ حەیز چاوەڕوان دەکەن و دروست نییە بۆیان ئەوەی خوا لە منداڵدانیاندا دروستی کردووە - لەحەیز یا منداڵ - بیشارنەوە ئەگەر بڕوایان هەیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی و مێردەکانیان شیاوترن بە گێرانەوەیان - بۆ لای خۆیان - لە عیددەدا ئەگەر چاکسازییان بوێ.

- **تەڵاقی (بائن) ئەویش دوو جۆرە:** جیابوونەوەی بچووك و جیابوونەوەی گەورە.

- **جیابوونەوەی گەورە:** تەڵاقی سێیەمە پارەی پێوە ببەسترێ یانا پێش چونە لای ئافرەتەکە بێت یا دوای چوونەلای ئەم تەڵاقە جارێکی تر ئافرەتەکە حەڵاڵ نابێتەوە بۆ مێردەکە مەگەر شوو بکات دواتر مێردەکەی بمرێ یا تەڵاقی بدات بە وستی خۆی

- **جیابوونەوەی بچووك:** جگە لە تەڵاقی سێ بەسێ ئەوانی تر پێیان دەوترێت جیابوونەوەی بچووك ئەم تەڵاقەیان دروستە ئافرەتەکە بە مارە بڕینێکی تازە بۆ مێردەکەی مارە بکرێتەوە.

## نۆیەم : تەڵاقدانی بە پارە ( الخلع )

**١ـ تەڵاقدانی بە پارە لە قورئان و سوننەتدا:**

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ ﴾ البقرة: ٢٢٩ واتە: جا ئەگەر ترسان لەوەی سنووری خوا رانەگرن ، ئەوە پیاو و ئافرەتەکە گوناهیان ناگات بەوەی کە ئافرەتەکە لە بریتی خۆیدا بیدات. (عن ابن عَبَّاسٍ أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بن قَيْسٍ أَتَتْ النبي ﷺ فقالت يا رَسُولَ اللَّهِ ثَابِتُ بن قَيْسٍ ما أَعْتِبُ عليه في خُلُقٍ ولا دِينٍ وَلَكِنِّي أَكْرَهُ الْكُفْرَ في الْإِسْلَامِ فقال رسول اللَّهِ ﷺ أَتَرُدِّينَ عليه حَدِيقَتَهُ قالت نعم قال رسول اللَّهِ ﷺ أقبل الْحَدِيقَةَ وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَةً)[١] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بی)خێزانی پابتی کوڕی قەیس هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا هیچ ڕەخنەم لە ڕەوشت و ئایینی سابیت نیە بەڵام دەترسم تووشی بێ دینی ببم — بۆیە دەمەوێ لێی جیاببمەوە - فەرمووی: باغەکەی بۆ دەگێڕیتەوە؟ - کە لە مارەییدا لێت وەرگرتووە - ووتی بەڵێ ، فەرمووی : سابیت باغەکەی لێ وەربگرە و یەك تەڵاقی بدە).

**٢ـ خولع بەرەزامەنی ژن و پیاوەکە یان بە پابەندکردنی دادوەر دەبێت:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ ﴾ النساء: ١٢٨ واتە: ئەوە ژن و پیاوە گوناهیان لسەر نییە کە ڕێکەوتنێکی چاك بکەن لە نێوان خۆیاندا، هەر ڕێکەوتن و ئاشتەوای چاکترە، ئەم ئایەتەو ئەو ئایەتەی بڕگەی پێشوو بەڵگەن لەسەر دروستی خولع بەرەزامەندی ژن و پیاوەکە، وە بەڵگە پابەندکردنی دادوەرو کاربەست بە بەڵگەی ئەوەی سابیت و خێزانەکەی کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)وە سابیتی پابەند کرد باغەکەی وەربگرێتەوەو یەك تەڵاقی بدات وەك لە خاڵی پێشوو باسمان کرد.

---

١) رواه البخاري (٤٩٧١)

**٣ـ خولع هەڵوەشاندنەوەیە نەك تەڵاق دان:**

(عن رُبَيِّعَ بِنْتِ مُعَوِّذٍ قالت اخْتَلَعْتُ من زَوْجِي ثُمَّ جِئْتُ عُثْمَانَ فَسَأَلْتُهُ مَاذَا عَلَيَّ من الْعِدَّةِ فقال لَا عِدَّةَ عَلَيْكِ إلا أَنْ تَكُونِي حَدِيثَةَ عَهْدٍ بِهِ فَتَمْكُثِي حتى تَحِيضِي حَيْضَةً قال وأنا مُتَّبِعٌ في ذلك قَضَاءَ رسول اللَّهِ ﷺ في مَرْيَمَ الْمَغَالِيَّةِ كانت تَحْتَ ثَابِتِ بن قَيْسِ بن شَمَّاسٍ فَاخْتَلَعَتْ منه).[١] ڕوبەیعی کچی موعەویذ دەڵی لەگەڵ مێردەکەمدا بە خولع لیّ ی جیابوومەوە پاشان چووم بۆ لای عوسمان و پرسیارم لێم کرد من چ عیددەیەکم لەسەرە ووتی عیددەت لەسەر نییە مەگەر تازە لەگەڵت جووت بوویێ جا ئەگەر وابوو ئەوا دەبێ یەك حەیزن بەسەردا بڕوات وە عوسمان وتی من لەم بڕیارمدا بە شوێن بڕیاری پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەڕۆم کە دەربارەی مەریەم موغالی یەی خێزانی سابیتی کوڕی قەیس کوڕی شوماس دای کە بە خولع خۆی لە مێردەکەی جیاکردەوە).

**٤ـ عیددەی ئافرەتی خولع لە گەڵاکراو یەك حەیزە:**

(عن ابن عَبَّاسٍ أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بن قَيْسٍ اخْتَلَعَتْ منه فَجَعَلَ النبي ﷺ عِدَّتَهَا حَيْضَةً)[٢] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لیّ بی)دەڵیّ: (خێزانی سابیتی کوڕی قەیس خولعی کرد لەگەڵ سابیتدا جا پێغەمبەر (ﷺ) یەك حەیز دانا بۆ عیددەی).

---

١) رواه الترمذي (١١٨٥) و النسائي (٣٤٩٨) و ابن ماجه (٢٠٥٨) وهو حديث حسن

٢) رواه ابو داود (٢٢٢٩) و الترمذي (١١٨٥) وهو حديث صحيح

## دەیەم: سوێند خواردن لە نەچوونە لای هاوسەر (ایلاء)

**١ـ (ایلاء) ئەوەیە:** کە پیاو سوێند بخوات کە نەچێتە لای ژنەکەی بە یەکجاری یان بۆ زیاتر لە چوار مانگ.

**٢ـ حوکمی (ایلاء):** ئەگەر پیاوێك سوێندی خوارد نەچێتە لای بە هەمیشەیی یان زیاتر لە چوار مانگ ئەوە ئەم حوکمە شەرعییانەی لێ پەیدا دەبێت:

حاکم لە رۆژی سوێندخواردنەکەیەوە چوار مانگ مۆڵەتی دەدات بۆ ئەوەی پەشیمان بێتەوە لە سوێندەکەی و کەفارەتی بدات یان تەلاقی بدات ئەگەر پەشیمان نابێتەوە و کەفارەت نادات.

جا ئەگەر چوار مانگەکە تەواو بوو و هەر لەسەر سوێندەکەی بەردەوام بوو ئەوەکاتە زیان بە هاوسەرەکەی دەگەیەنێ، جا حاکم لەسەر داوای خێزانەکەی پابەندی دەکات بەیەکێ لەم دووانە: یەکەم: پەشیمان بوونەوە لە سوێندەکەی. دووەم: تەلاقدانی خێزانەکەی ئەگەر دەسبەرداری سوێندەکەی نەدەبوو.

سەبارەت بە پەشیمان بوونەوەی لە سوێندەکەی بچێتە لای خێزانی و کەفارەت سوێندەکەی بدات ئەگەر سوێندی بە خواو بە سیفاتەکانی خواردبوو یا سوێندی خواردبوو کارێك بکات یا نەیکات ئەمە ئەگەر پەشیمان بوویەوە، بەڵام ئەگەر پەشیمان نەبوویەوە لە سوێندەکەی دەبێت تەلاقی بدات: ئەمە کاتێکە دەستبەرداری سوێندەکەی نابێت تەلاقیشی نادات لەم کاتەدا حاکم بە زۆر پێی تەلاقدەدات و یەك تەلاقی ژنکە دەدات ئەمەش کاتێك دەبێ هیچ رێگرێك لەبەردەم پیاوەکە دا نەبێت بۆ چوونە لای خێزانەکەی بەڵام ئەگەر عوزرێك هەبوو وەك نەخۆشی یا شتێك لەو جۆرە ئەوە داوای لێ دەکرێ بە قسە لە (ایلاء) کە پەشیمان بێتەوە بەم جۆرە بڵێت : ئەگەر توانام هەبوو ـ بچمە لای خێزانەکەم ـ ئەوە پەشیمانم و سوێندەکەم واز لێ دێنم.

**٣ـ بەڵگەی (ایلاء):** بەڵگەی ئەو حوکمانەی (ایلاء) هەیبوو کە باسمان کرد ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٧﴾ ﴾ البقرة: ٢٢٦ - ٢٢٧ واتە: بۆ ئەوانەی سوێند دەخۆن لەگەڵ خێزانەکانیان جووت نەبن دەبێت چوار مانگ چاوەڕوانی بکەن ، جا ئەگەر - لەو

ماوەیەدا - گەڕانەوە بۆ لای خێزانەکانیان ئەوە خوا لێخۆشبووی میهرەبانە ، ئەگەر بڕیاری تەڵاقدانیان دا ئەوە خوا بیسەری زانایە.

## یازدەهەم: تۆ وەك پشتی دایکمی (ظهار)

**١- پێناسەی (ظهار) لە زمانەوانی و شەرعدا:**

**(ظهار) لە زمانەوانیدا:** لەپشتەوە وەرگیراوە، چونکە شێوەکەی لە بنەڕەتدا ئەوەیە پیاو بە هاوسەرەکەی بڵێ: تۆ بۆ من وەك پشتی دایکم وایت .

**(ظهار) لە شەرعدا:** ئەوەیە پیاو هاوسەرەکەی بچوێنێ لە یەکێ لە مەحرەمەکانی وەك دایك و خوشکی لە حرامیدا - دروست نەبوونی مارەکردنیدا-.

عەرەبەکانی لەسەردەمی نەفامیدا (ظهار) یان بە جۆرێك لە تەڵاق دا دەنا بەڵام شەرعیەتی ئیسلام بە جۆرێکی تری داناو وە کۆمەڵە حوکمێکی بۆ دانا جیاوز لە حوکمەکانی تەڵاق.

**٢- کەفارەتی (ظهار):**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُظَـٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۗ وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾ المجادلة: ٣ – ٤ واتە : ئەوانەی (ظهار) دەکەن لەگەڵ هاوسەرە کانیاندا پاشان پەشیمان دەبنەوە لەوەی کە ووتوویانە ئەو پێو یستە کۆیلەیەك ئازاد بکەن پێش ئەوەی لەگەڵ هاوسەرانیان جووت بن بەم (کەفارەتە) ئامۆژگاری دەکرێن، وە خوا شارەزایە بەوەی کە دەیکەن ئینجا ئەگەر کۆیلەی نەبوو ئەو دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژوو بێت پێش ئەوەی لەگەڵ هاوسەرانیان جووت بن ئەگەر ئەوەشی نەتوانی ئەو نانی شەست هەژار بدات، ئەوەی باسکرا ـ بۆ ئەوەیە باوەڕ بکەن بە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و ئەوانە سنوورەکانی خودان وە بۆ بێ باوەڕان سزای سەخت هەیە.

**٣- هاوکاری کردنی پێشەوا بۆ ئەو پیاوەی (ظهار)ی کردووە:**

( عن سَلَمَةَ بن صَخْرٍ الْبَيَاضِيِّ قال كنت امْرَأً أَسْتَكْثِرُ من النِّسَاءِ لَا أَرَى رَجُلًا كان يُصِيبُ من ذلك ما أُصِيبُ فلما دخل رَمَضَانُ ظَاهَرْتُ من امْرَأَتِي حتى يَنْسَلِخَ رَمَضَانُ فَبَيْنَمَا هِيَ تُحَدِّثُنِي ذَاتَ لَيْلَةٍ انْكَشَفَ لي منها شَيْءٌ فَوَثَبْتُ عليها فَوَاقَعْتُهَا فلما أَصْبَحْتُ غَدَوْتُ على قَوْمِي فَأَخْبَرْتُهُمْ خَبَرِي وَقُلْتُ لهم سَلُوا لي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا ما كنا نَفْعَلُ إِذًا يُنْزِلَ الله فِينَا كِتَابًا أو يَكُونَ فِينَا من رسول اللَّهِ ﷺ قَوْلٌ فَيَبْقَى عَلَيْنَا عَارُهُ وَلَكِنْ سَوْفَ نُسَلِّمُكَ بِجريرتك اذْهَبْ أنت فَاذْكُرْ شَأْنَكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ قال فَخَرَجْتُ حتى جِئْتُهُ فَأَخْبَرْتُهُ الْخَبَرَ فقال رسول اللَّهِ ﷺ أنت بِذَاكَ فقلت أنا بِذَاكَ وَهَا أنا يا رَسُولَ اللَّهِ صَابِرٌ لِحُكْمِ اللَّهِ عَلَيَّ قال فَأَعْتِقْ رَقَبَةً قال قلت وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ ما أَصْبَحْتُ أَمْلِكُ إلا رَقَبَتِي هذه قال فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ قال قلت يا رَسُولَ اللَّهِ وَهَلْ دخل عَلَيَّ ما دخل من الْبَلَاءِ إلا بِالصَّوْمِ قال فَتَصَدَّقْ أو أَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا قال قلت وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لقد بِتْنَا لَيْلَتَنَا هذه مالنا عَشَاءٌ قال فَاذْهَبْ إلى صَاحِبِ صَدَقَةِ بَنِي زُرَيْقٍ فَقُلْ له فَلْيَدْفَعْهَا إِلَيْكَ وَأَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا وَانْتَفِعْ بِبَقِيَّتِهَا).[1] سەلەمەی کوڕی سەخر دەڵێ: ئیبن عەلای بەیاضی دەڵێ من پیاوێك بووم لە خەڵکانی تر زیاتر لەگەڵ خێزانمدا جوت دەبووم جا کاتێ مانگی رەمەزان هات (ظهار)م لەگەڵ خێزانمدا کرد تا رەمەزان تەواو دەبێت شەوێکیان خێزانم قسەی دەکرد لەگەڵمدا و شوێنێکیم بۆ دەرکەوت جا خۆمم پێ نەگیرا لەگەڵیدا جووت بووم کاتێك رۆژ بوویەوە رۆشتم بۆ لای هۆزەکەم هەواڵی خومم پێ راگەیاندن و پێم ووتن: پرسیارم بۆ بکەن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوانیش وتیان: ئێمە شتی وا ناکەین ، دوای خوای گەورە نوسراوێکمان لە بارەوە دادەبەزێنێت یا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەمانەوە فەرمودەیەك دەفەرموێ دەبێتە ئابڕوچوون بۆمان، بەڵام ئێمەی کاری خۆت دەدەینە دەستی خۆت، خۆت برۆ باسی حاڵی خۆت بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکە ووتی : جا منیش رۆشتم تا گەیشتمە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و هەواڵەکەم پێ راگەیاند ئەویش فەرمووی: (تۆ خۆت ئەو کارەت کردووە؟) ووتم: من کردوومە ئامادەشم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و رازیم بۆ بڕیاری خوا وە خوا چیت پێ دەڵێ بیدە بەسەرمدا فەرمووی: (کۆیلەیەك ئازاد بکە) ووتم سوێند بەو

---

١) رواه ابو داود (٢٢١٣) و الترمذي (١٢٠٠) و ابن ماجه (٢٠٦٢) وهو حديث حسن

خوایەی بە ڕاستی تۆی ناردووە تەنها خاوەنی ئەم گەردەنەی خۆمم و فەرمووی (دەی دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژووبە) ووتم مەگەر ئەوەی تووشم بوو تەنها بە هۆی ڕۆژووەوە نەبوو؟ فەرمووی: (دە خواردنی شەست هەژار بدە) ووتم سوێند بەو خوایەی بەڕاستی تۆی ناردووە، ئەمەشەومان بەبێ خواردن بردۆتە سەر فەرمووی (دەبڕۆ بۆ لای خاوەن زەکاتی بەنی زورەیق و پێی بڵێ با بداتێ و خواردنی شەست هەژاری لێ بدە ئەوەشی مایەوە خۆت و ماڵ و منداڵت بیخۆن).

**٤ـ کەفارەتی (ظهار) بێ دواکەوتن دەدرێت:**

پیاو دەبێ یەکسەر بێ دواکەوتن کەفارەی (ظهار)ەکەی بدات، واتە پێش جووت بوون لەگەڵ خێزانیدا دەبێت کەفارەتەکەی بدات، ئەگەر پێش کەفارەت دانەکە لەگەڵ خێزانیدا جووت بوو ئەوە گوناهبارە وە دەبێت کەفارەتەکەی هەر بدات چونکە جووت بوونی پێش کەفارەت دان حەرامە چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا﴾ المجادلة: ٣ ـ کەفارەتەکە بدات ـ پێش ئەوەی لەگەڵی دا جووت ببێ.

(عن ابن عَبَّاسٍ أَنَّ رَجُلًا أتى النبي ﷺ قد ظَاهَرَ من امْرَأَتِهِ فَوَقَعَ عليها فقال يا رَسُولَ اللَّهِ إني قد ظَاهَرْتُ من زَوْجَتِي فَوَقَعْتُ عليها قبل أَنْ اكفر فقال وما حَمَلَكَ على ذلك يَرْحَمُكَ الله قال رأيت خَلْخَالَهَا في ضَوْءِ الْقَمَرِ قال فلا تَقْرَبْهَا حتى تَفْعَلَ ما أَمَرَكَ الله بِهِ).[1] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێ ) دەڵێ: (پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) کە (ظهار)ی کرد بوو لەگەڵ خێزانەکەیدا جا لەگەڵیدا جووت بوو بوو ئەنجا ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا () من (ڤهار)م کرد لەگەڵ خێزانەکەمدا لەگەڵیدا دروست بووم پێش ئەوەی کەفارەتی (ظهار)ەکەم بدەم، فەرمووی: (چی وای لێکردی وا بکەیت ڕەحمەتی خوات لێ بێ ..؟) ووتی لەمانگەشەودا خڕخاڵەکانیم بینی ـ خۆم پێ نەگیراو چوومە لای ـ فەرمووی (نزیکی نەبیتەوە تا ئەوەی خوا لە قورئاندا فەرمانی پێکردووی نەیکەیت).

---

١) رواه الترمذي (١١٩٩) و ابن ماجه (٢٠٦٥) وهوحديث حسن

## دوازدەیەم: نەفرین کردن لەیەکتری ( اللعان )

### ١ـ پێناسەی (اللعان) لە زمانەوانی و شەرعدا

**لە زمانەوانیدا:** (اللعان) لە (لعن) ەوە هاتووە بەمانای دەرکردن و دوورخستنەوە.

**لە شەرعدا:** ئەوەیە لەکاتێکدا پیاو زیناکردنی دایە پاڵ هاوسەرەکەی دەبێت چوار جار سوێند بخوات کە راست دەکات وە لە جاری پێنجەم دا بڵێت نەفرینی خوام لێبێ ئەگەر درۆبکەم، وە ژنەکەش کاتێ بیوەێ پیاوەکەی بە درۆبخاتەوە، چوارجار سوێند بخوات کە پیاوەکەی درۆدەکات ، جاری پێنجەم بڵێت خوا غەزەبم لێ بگرێت ئەگەر ئەوە پیاوە راست بکات.

### ٢ـ بەڵگەی نەفرین کردن لە یەکتری:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ النور: ٦ – ٩ واتە ئەو پیاوانەی تاوانی زیناکردن دەدەنە پاڵ ژنەکانیان و شایەتیان نییە لە خۆیان زیاتر دەبێ هەرکەسەیان لەبەردەم دادوەردا - چوار جار سوێند بخوات و بڵێت بێگومان ئەو لەراست گۆیانە (کە دەڵێ خێزانی زیناکردووە ) وەلە پێنجەم جاردا بڵێ نەفرینی خوا لەسەر ئەو بێ ئەگەر درۆزن بێ ، ئەو ئافرەتەش کە بە زینا تاوانبار کراوە لەلایەن مێردەکەیەوە سزای ( زینا) لەسەر لادەبات بەمەی کە چوار جار سوێند بخوا بە خوا کە بێگومان مێردەکەی لە درۆزنانەو لە پێنجەم جاردا - بڵێت- خەشمی خوای لەسەر بێ ئەگەر مێردەکەی لە راست گۆیان بێت.

(عن ابن عباس رضي الله عنهما أن هلال بن أمية قذف امرأته عند النبي ﷺ بشريك بن سحماء فقال النبي ﷺ " البينة أو حد في ظهرك " فقال يارسول الله إذا رأى أحدنا رجلا على امرأته يلتمس البينة ؟ فجعل النبي ﷺ يقول " البينة وإلا فحد في ظهرك " فقال هلال والذي بعثك بالحق إني لصادق ولينزلن الله في أمري ما يبرىء به ظهري من الحد فنزلت { والذين

يرمون أزواجهم و لم يكن لهم شهداء إلا أنفسهم } فقرأ حتى بلغ { من الصادقين } فانصرف النبي ﷺ فأرسل إليهما فجاءا فقام هلال بن أمية فشهد والنبي ﷺ يقول "إن الله يعلم أن أحدكما كاذب فهل منكما من تائب ؟ " ثم قامت فشهدت فلما كان عند الخامسة { أن غضب الله عليها إن كان من الصادقين } وقالوا لها إنها موجبة قال ابن عباس فتلكأت ونكصت حتى ظننا أنها سترجع فقالت لا أفضح قومي سائر اليوم فمضت فقال النبي ﷺ " أبصروها فإن جاءت به أكحل العينين سابغ الأليتين ( أي تامها وعظيمها ) خدلج الساقين فهو لشريك بن سحماء " فجاءت به كذلك فقال النبي ﷺ" لولا ما مضى من كتاب الله لكان لي ولها شأن")[1]. عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: هیلالی کوڕی ئومەی یە لە خزمەت پێغەمبەردا تاوانی داوێن پیسی دایە پاڵ ژنەکەی خۆی بە زیناکردن لەگەڵ شورەیکی کوڕی سەحما و پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (شایەت بێنە یاداری تۆڵە دەدرێ لە پشتت) هیلال ووتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەسێکمان پیاوی بەسەر خێوزانەکەیەوە ببینێت بڕوات بەدوای شایەت دا بگەڕێت ؟! پێغەمبەر (ﷺ) ووتەکەی پێشووی دووبارە کردەوە - جا هیلال ووتی سوێند بەو زاتەی تۆی بەراستی ناردووە ڕاست دەکەم وە خوا ئایەت دەنێرێتە خوارەوە کە پشتم لە داری تۆڵە بپارێزێ ئەنجا جبریل دابەزی ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هێنایە خوارەوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ النور: ٦ - ٩[2] ئیتر پێغەمبەر وازی ـ لە هیلال ـ هێنا و ناردی بەوشوێن خێزانەکەیدا جا هیلال هات شایەتەکەی دا پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ( بێگومان خوا دەزانێ یەکێکتان درۆزنە دەی کامتان پەشیمان دەبنەوە؟ پاشان ئافرەتەکە هەڵساو چوار جار شایەتی دا بەڵام کاتێ گەیشتە شایەتی پێنجەم رایان وەستان ووتیان ئەم

---

١) رواه البخاري (٤٧٤٧) و احمد ٢٣٩/١ و ابو داود (٢٢٥٤) و الترمذي (٣١٧٩) و ابن ماجه (٢٠٦٧)

٢) پێشتر تەفسیری ئەم ئایەتەمان کرد.

شایەتی پێنجەم سزاو تۆڵە خوا مسۆگەر دەكات ئـەنجا ئافرەتەكـە هەڵوێستەیەكی كـردو ڕامـا هەتا ئێمە گومانمان برد پەشیمان دەبێتەوە، پاشان وتی: هۆزو خزمانم سەرشـۆڕو بەنـدناو ناكـەم هەتا هەتایە جا بەردەوام بوو ـ شایەتی پێنجەمیـشی دا ـ ئـەنجا پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: (سەیری كەن ئەگەر ئەم ئافرەتە منداڵێكی چاو ڕەش چاوگەورەی سمت گـەورەی قـۆڵ ئەسـتۆری بوو ئەوە لەشورەیكی كوڕی سەحمایە) پاشان كە منداڵەكـە بـوو بـەو شـێوە بـوو كـە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبوایـە بڕیـاردراوە لـە قورئاندا ئەوە من لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بڕیارو هەڵوێستم بە جۆرێكی تر دەبوو).

**٣ـ مەرجەكانی نەفرین كردن لەیەكتری :**

بۆ ئەوەی نەفرین كردنی نێوان پیاو و ژنەكەی دروست بێ دەبێ ئەم مەرجانە هەبن.

أ ـ زینا دانە پاڵ ژنەكە پێش نەفرین كردنەكە بێت.

ب ـ لەنەفرین كردنەكەدا پیاوەكە پێش ژنەكەی كەوێت پاشان ژنەكە.

ج ـ دەبێت پیاو و ژنەكە ئەو ووشەو ڕستانە بڵێن كە لە قورئاندا هاتووە و نابێ ووشەی تر بەكار بێنن.

د ـ دەبێ ئەو پێنج شایەتی یەی پیاو و ژنەكە دەیڵێن بە شوێن یەكتریدا بێن و نێوانیان نەكەوێت.

هـ ـ پێویستە لەسەر حاكم و كاربەدەست هەریەك لە پیاو و ژنەكە ئامۆژگاری بكات و بیانترسێنێ لە ئەنجامی خراپی درۆ و پێیان بڵێت خوا لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەكات یەكێكتان درۆدەكەن كامتان پەشیمان دەبنەوە.

**٤ـ ئەو حوكمانەی لەئەنجامی نەفرین كردن پەیدا دەبن:**

أـ داری حەدد نادرێت لەمێردەكە بەهۆی زینا دانە پاڵ خێزانەكەیەوە.

ب ـ داری حەدد دەدرێت لەخێزانەكەی مەگەر ئەویش نەفرین بكات ئەو كات لێی نادرێت.

ج ـ ئەو منداڵەی پەیدا دەبێ بە منداڵی پیاوەكە دانانرێت، بەڵكو بەمنداڵی ژنەكە دادەنرێت.

دـ ئەو ژنو پیاوە بۆ هەتا هەتایە لەیەكتری حەرام دەبن. (عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَجُلًا رَمَى امْرَأَتَهُ فَانْتَفَى من وَلَدِهَا فِي زَمَانِ رسول اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَهُمَا رسول اللَّهِ ﷺ فَتَلَاعَنَا كما

قال الله ثُمَّ قَضَى بِالْوَلَدِ لِلْمَرْأَةِ وَفَرَّقَ بين الْمُتَلَاعِنَيْنِ).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بی)دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێك داوێن پیسی دایە پاڵ خێزانەکەی ووتی: ئەو منداڵەی لەمن نییە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردن _نەفرینی یەکتری بکەن_ ئەوانیش نەفرینی یەکترییان کرد بەو شێوەیەی خوا لەقورئاندا فەرموویەتی پاشان بڕیاریدا منداڵەکە بۆ ئافرەتەکە بێتو جیای کردنەوە لەیەکتری).

هـ ـ ئافرەتەکە هەموو مارەییەکەی دەکەوێت:

(عن سَعِيدَ بن جُبَيْرٍ قال: سَأَلْتُ ابن عُمَرَ رضي الله عنه عن الْمُتَلَاعِنَيْنِ فقال: قال النبي ﷺ لِلْمُتَلَاعِنَيْنِ: حِسَابُكُمَا على اللَّهِ أَحَدُكُمَا كَاذِبٌ لَا سَبِيلَ لك عليها، قال: مَالِي قال: لَا مَالَ لك إن كُنْتَ صَدَقْتَ عليها فَهُوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ من فَرْجِهَا وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عليها فَذَاكَ أَبْعَدُ لك)[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بی) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بەو ژنو پیاوەی نەفرینی یەکتریان کرد: (ئێوە لێپرسینەوەتان لای خوایە، یەکێکتان درۆ دەکەن نابێتەوە بە خێزانت) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ماڵەکەم؟ فەرمووی: (ماڵت نییە، چونکە ئەگەر ڕاست بکەی بەرانبەری ـ کە دەڵێی زینای کردووەـ ئەوە لەبەرانبەری ئەوەی ئەو ئافرەتەت بۆ خۆت حەڵاڵ کردووە مارەییەکەی دەکەوێت، خۆ ئەگەر درۆت بۆ هەڵبەستبێ ئەوە زیاتر لێی دووریت هیچت ناکەوێ).

---

١) رواه البخاري (٥٣١٥) و مسلم (١٤٩٤)

٢) رواه مسلم (١٤٩٣/٥) و النسائي (٦/ ١٧٧) و ابو داود (٢٢٥٨)

## سیانزەیەم: عیددە

**١ـ پێناسەی عیددە لەزمانەوانیو شەرعدا:**

**ـ عیددە لەزمانەوانیدا:** لە (عدّ) و (احصاء)ەوە وەرگیراوە واتە ئەو ڕۆژانەی کە ئافرەت ئەیان ژمێرێ لەرۆژانی بێ نوێژیو پاکێتی.

**ـ لە شەرعدا:** بریتییە لەو ماوەیەی خواو پێغەمبەر (ﷺ) دیارییان کردووە پاش تەڵاقدانی ئافرەت یامردنی مێردەکەی پێویستە ئافرەتەکە چاوەڕوانی بکات تا تەواو دەبێ شوو نەکات.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾ البقرة: ٢٢٨واتە: ئافرەتە تەڵاق دراوەکان دان بەخۆیاندا بگرن ـ چاوەڕوانی دەکەن ـ سێ حەیز.

**٢ـ جۆرەکانی عیددە:**

جۆرەکانی عیددە کە پێویستە ئافرەت چاوەڕوانی تێدا بکات دوانن، ئەوانیش عیددە بەهۆی مردنی پیاوەکەوە، عیددە بەهۆی جیابوونەوە لەمێردەکەی.

**یەکەم: عیددەی مردنی پیاوەکەی:**

ئەگەر ئافرەت مێردەکەی بمرێت پێویستە ئەم ئافرەتە عیددە بکێشێ جا ئافرەتەکە دوو حاڵەتی هەیە:

**أـ ئەگەر دوو گیان ـ سك پڕ ـ بوو لەمێردەکەی،** ئەوە عیددەکە بەلەدایك بوونی منداڵەکەی تەواو دەبێ ماوەکە کورت بێت یان درێژ. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ﴾ الطلاق: ٤ واتە: ئافرەتی سك پڕ ـ دوو گیان ـ عیددەیان ئەوکاتەیە کە سکەکەیان دابنێن.

(عن الْمِسْوَرِ بن مَخْرَمَةَ أَنَّ سُبَيْعَةَ الْأَسْلَمِيَّةَ نُفِسَتْ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِلَيَالٍ فَجَاءَتْ النبي ﷺ فَاسْتَأْذَنَتْهُ أَنْ تَنْكِحَ فَأَذِنَ لها فَنَكَحَتْ).[1] میسورەی کوڕی مەخزمە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: سوبەیعەی ئەسلەمی (ڕەزای خوای لێبێ) دوای مردنی مێردەکەی بە چەند شەوێك منداڵی بوو

١) رواه البخاري (٥٠١٤)

هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتی خواست کە شوو بکات پێغەمبەریش (ﷺ) مۆڵەتی دا ئەویش شووی کرد).

**ب ـ ئەگەر ئافرەتە ـ کە مێردی مردووە ـ سك پڕ نەبوو** ئەوە عیددەکەی چوار مانگو دە رۆژە ـ چووبێتە لای یا نەچوو بێت ـ هەر دەبێ ئەو ماوە چاوەڕوانی بکات. دوای ئەوە دەتوانێ شوو بکات. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ **البقرة: ٢٣٤** واتە: ئەو پیاوانەی کە دەمرن لەئێوەو هاوسەرەکانیان بەجێ دەهێڵن هاوسەرەکانیان چوار مانگو دە رۆژ چاوەڕوانی دەکەن.

**دووەم: عیددەی جیابوونەوە:**

ئەو عیددەیەیە کە ئافرەت لەمێردەکەی جیابووەتەوە بەهۆی تەڵاق دانەوە یان بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکەوە ـ بەمەرجێ پیاوەکە چووبێە لای ژنەکە ـ جا لەم کاتەشدا دوو حاڵەتە:

**أـ ئەگەر سك پڕ ـ حامیلە ـ بوو** ئەوە عیددەکەی بەبوونی منداڵە تەواو دەبێت، کە لەبڕگەی پێشوودا بەڵگەی قورئانو سوننەتمان لەسەری باس کرد.

ب ـ ئەگەر سك پڕو دوو گیان نەبوو لەو ئافرەتانە بوو دەکەوتە بێ نوێژی ئەوە عیددەکەی بەسێ پاکێتییە. خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ﴾ **البقرة:٢٢٨** واتە: ئافرەتانی تەڵاق دراو سێ پاکێتی چاوەڕوانی دەکەن.

ج ـ بەڵام ئەگەر لەو ئافرەتانە بوو حەیزی نەبوو: لەبەر منداڵی نەکەوتبووە حەیزەوە یان لەبەر تەمەن گەورەیی و پیری نەدەکەوتە حەیزەوە ئەوانە عیددەیان سێ مانگە دوای جیابوونەوەیان. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمْ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشْهُرٍ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمْ يَحِضْنَ﴾ **الطلاق: ٤** واتە: ئەوانەی کە بێ هیوادەبن لە کەوتنە حەیزەوە لەهاوسەرەکانتان ئەگەر (لەعیددەیان) دوودڵ بوون ئەوە عیددەیان سێ مانگە هەروەها ئەوانەش کە (لەبەرمنداڵی) هێشتا نەکەوتوونەتە حەیزەوە (عیددەیان سێ مانگە).

ئاگاداری: ئافرەتی تەڵاق دراو کە مێردەکەی نەچووبێتە لای:

ئەگەر ئافرەت تەڵاق بدرێت پێش ئەوەی مێردەكەی بچێتەلای یان مارە بڕینەكەی هەڵبوەشێتەوە پێش چوونەلای ئەوە عیددەی نییەو پێویست بەچاوەڕوانی ناكات بۆ شوو كردن. بەبەڵگەی ئەم ئایەتە پیرۆزە كە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحۡتُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمۡ عَلَيۡهِنَّ مِنۡ عِدَّةٖ تَعۡتَدُّونَهَاۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا﴾ الأحزاب: ٤٩ واتە: ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان هێناوە ئەگەر ئافرەتی ئیماندارتان مارەكرد پاشان پێش ئەوەی بچنە لایان تەڵاقتان دان ئەوە لەسەریان پێویست نییە هیچ عیددەیەك هەڵ ژمێرن. كەواتە موتعەیان بدەنێو تەڵاقیان بدەن بەتەڵاق دانێكی جوانو پیاوانە.

**٣ـ حوكمەكانی عیددەو ئەنجامەكانی:**

عیددە كۆمەڵێك حوكمو ئەنجامی لێ دەكەوێتەوە كە ئەمانەن:

**یەكەم: عیددەی تەڵاق دان:** ئەگەر ئافرەتێك لەعیددەی تەڵاق داندا بێت ئەوە تەڵاقەكەی (رجعي)ە یا (بائن)ە.

**١ـ عیددەی تەڵاقدانی رجعي:** ئەگەر تەڵاقدانی ئافرەتەكە تەڵاقی رجعي بوو ئەوە عیددەكەی ئەم حوكمانەی هەیە:

أـ پێویستە لەسەر مێردەكەی شوێنی نیشتەجێ بوونی بۆ دابین بكات چاكتر وایە لەو جێگایەدا بێت كە پێش تەڵاقدانی تێیدا بووە، ئەگەر شیاو بوو وەرێگری شەرعی نەبوو.

ب ـ خەرجو مەسرەفی لەسەر مێردەكەیە، لەخواردنو پۆشاكو هەرچی كە بەعادەت دەكرێت بۆ ماڵو خێزان جا چ سك پڕ بێت یا نا چونكە هەر خێزانی مێردەكەیەتیو دەتوانێ تا لە عیددەدا بێت بیگێڕێتەوە بۆلای خۆی.

ج ـ پێویستە ئافرەتەكە بۆ كاری زۆر پێویست نەبێت ماڵو شوێنی نیشتەجێ بوونی جێنەهێڵێ بەڵگەی ئەم سێ حوكمە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: ﴿أَسۡكِنُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ سَكَنتُم مِّن وُجۡدِكُمۡ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُواْ عَلَيۡهِنَّۚ وَإِن كُنَّ أُوْلَٰتِ حَمۡلٖ فَأَنفِقُواْ عَلَيۡهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّ﴾ الطلاق: ٦، واتە: ئافرەتانی تەڵاقدراو دابنێن لەو شوێنەی خۆتان دادەنیشن بەپێی تواناتان وە زیانیان پێ

مەگەیەنن تا تەنگیان پێ هەڵنەچنن وە ئەگەر دووگیان بوون ئەوە خەرجیان بکێشن تا سکەکەیان دائەنێن.

لەگەڵ ئەم ئایەتەش ﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾ الطلاق: ١ واتە: ئەو ئافرەتە (تەڵاق دراو)انە لەخانووەکانی خۆیان دەریان مەکەن خۆشیان دەرنەچن (تاعیددەیان تەواو دەبێ) مەگەر کارێکی خراپی ئاشکرا بکەن.

د- حەرامە بۆ ئافرەتەکە خۆی پێشنیار بکات پیاوان خوازبێنی بکەن، چونکە ئەو هێشتا مافی مێردەکەی بەسەرەوەیەو ئەو لەپێشترە لەپیاوانی تر ئەگەر بیەوێ دەتوانێ لەکاتی عیددەکەیدا بیباتەوەلای خۆی بەبێ مارەکردنەوەی تازە. خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓاْ إِصْلَٰحًا﴾ البقرة: ٢٢٨ واتە: مێردەکانیان شیاوترن بەگێڕانەوەیان لەعیددەدا ئەگەر بیانەوێ بەباشی بژین.

**٢- عیددەی تەڵاقی بائن:**

ئەگەر ئافرەت بەتەڵاقدانی (بائن) لەمێردەکەی جیابوویەوە جا ئەوکاتە یا سکی پڕ یان نا.

**یەکەم: ئەگەر سکی پڕ بوو ئەم حوکمانەی هەیە:**

أ- پێویستە مێردەکەی شوێنی نیشتەجێ بوونی بۆ دابین بکات بەبەڵگەی ئەم ئایەتە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُواْ ٱلْعِدَّةَ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾ الطلاق: ١، ئەم ئایەتە ماناکەی گشتییە بۆ ئافرەتانی تەڵاق دراوی (رجعی و بائن) مانای ئایەتەکە ئەمەیە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەئوممەتەکەت بڵێ ئەگەر ویستتان ژنانتان تەڵاق بدەن ئەوە لەکاتی عیددەیاندا (کە لەحەیز پاك بوونەتەوەو نەچوونەتە لایان) تەڵاقیان بدەن وە عیددەیان بەوردی بژمێرن وە لەخوا بترسن کە پەروەردگارتانە وە لەماڵەکانی خۆیان دەریان مەکەنو خۆشیان دەرنەچن مەگەر کارێکی خراپی ئاشکرا بکەن.

ب ـ خەرجو مەسرەفی ئافرەتەكە بەهەموو جۆرەكانی لەسەر مێردەكەیە بەبەڵگەی ﴿ وَإِن كُنَّ أُوْلَٰتِ حَمْلٖ فَأَنفِقُواْ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ﴾ الطلاق: ٦، واتە: ئەگەر ئافرەتە تەڵاقدراوەكان سك پڕو دووگیان بوون ئەوە خەرجو مەسرەفیان بكێشن تا منداڵەكەیان دائەنێنو لەدایك دەبێ.

ج ـ بۆ كاری زۆر پێویست نەبێت نەڕواتە دەرەوە وەك كڕینی پێویستی یا ئەگەر پێویستی بەكڕینو فرۆشتن هەبوو كەسیش نەبوو بۆی بكات یا دەوامو دائیرەی هەبێتو مۆڵەتی نەدەن دەوام نەكات بەڵگەی دەرنەچوونی بۆ پێویستی نەبێت ئەم ئایەتەیە ﴿ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ ﴾ الطلاق: ١، واتە: لەماڵەكانیان دەریان مەكەن خۆشیان نەچنە دەرەوە.

بەڵگەی رۆشتنە دەرەوە بۆ پێویستی، (يقول جَابِر بن عبد اللَّهِ طُلِّقَتْ خَالَتِي فَأَرَادَتْ أَنْ تَجُدَّ نَخْلَهَا فَزَجَرَهَا رَجُلٌ أَنْ تَخْرُجَ فَأَتَتْ النبي ﷺ فقال بَلَى فَجُدِّي نَخْلَكِ فَإِنَّكِ عَسَى أَنْ تَصَدَّقِي أو تَفْعَلِي مَعْرُوفًا)[1] جابیر (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پورم تەڵاقدرا ویستی بڕوات بەری دار خورماكەی بچنێتەوە، كابرایەك پیایدا هەڵشاخا كە نەچێتە دەرەوە پوریشم رۆشتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و پرسیاری لێ كرد فەرمووی: (بەڵێ برۆ بەری دارخورماكەت بچنەوە سا بەڵكو صەدەقەو خێریشی لێ بكەی).

**دووەم:** ئەگەر ئافرەتەكە سكی نەبوو ئەوە ئەو حوكمانەی بۆ سك پڕ باسمان كرد هەموو بۆ ئەمیش هەیە جگە لەخەرجو مەسرەف واتە: دابین كردنی شوێن بۆیو دەرنەچوونی لەماڵ پێویستە.

**سێیەم: عیددەی ئافرەتێ مێردەكەی مردبێ:** ئەوە ئەم حوكمانەی هەیە:

* **تەعزیە باریو ماتەمینی:** ئەو ئافرەتەی مێردی مردووە نابێ خۆی برازێنێتەوەو بۆنی خۆش لەخۆی بداتو چاوبرێژیو دەرمان بەكار بهێنێتو ئاڵتونو شتی خۆڕازاندنەوە بەكاربێنێ هەركام لەم كارانە بكات حەرامەو گوناهبار دەبێت. (قال النبي ﷺ: لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ

---

[1] رواه مسلم (١٤٨٣)

الْآخِرِ أَنْ تُحِدَّ على مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ إلا على زَوْجٍ فَإِنَّهَا تُحِدُّ عليه أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا)[١]
پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (دروست نییە بۆ هیچ ئافرەتێك باوەڕی بەخواو بەرۆژی دوایی هەبێت زیاتر لەسێ رۆژ ماتەمینی بگێڕێت بۆ مردوو مەگەر بۆ مێردی کە چوار مانگو دە رۆژە- دروستە ماتەمینی بگێرێت-).

ئەم فەرمودەیە دەیگەیەنێ حەرامە ئافرەت لەسێ رۆژ زیاتر ماتەمینی بۆ مردوو بگێڕێ جگە لەمێرد، بەڵام بۆ مێردی کە بمرێ دروستە چوارمانگو دە رۆژ ماتەمینی بگێڕی، وە پێغەمبەر (ﷺ) تا سێ رۆژ رێگەی داوە تەعزیەو ماتەمینی بگێڕدرێت بۆ مردوو، چونکە مرۆڤ خۆی پێ ناگیرێو ناتوانێ خەمو پەژارەی بشارێتەوە لەو مادەیەدا.

(عن أُمِّ عَطِيَّةَ عن النبي ﷺ قالت كنا نُنْهَى أَنْ نُحِدَّ على مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ إلا على زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ولا نَكْتَحِلَ ولا نَتَطَيَّبَ ولا نَلْبَسَ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إلا ثَوْبَ عَصْبٍ وقد رُخِّصَ لنا عِنْدَ الطُّهْرِ إذا اغْتَسَلَتْ إِحْدَانَا من مَحِيضِهَا في نُبْذَةٍ من كُسْتِ أَظْفَارٍ وَكُنَّا نُنهى عن اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ).[٢] ئومە عەتیەی ئەنصاری (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: ئێمە رێگریمان لێ دەکرا زیاتر لەسێ رۆژ تەعزیەبار بین مەگەر بۆ مێردی ئافرەتەکە چوار مانگو دە رۆژ تەعزیە بار دەبووین، چاومان نەدەرشتو بۆنی خۆشمان لەخۆمان نەدەدا و پۆشاکی رەنگاو رەنگمان نەدەپۆشی جگە لەبەرۆی خۆبەستن، بەڵام لەکاتی پاك بوونەوە لەحەیز رێگەمان پێ درابوو ئەگەر یەکێکمان خۆی شۆرد کاتی پاك بوونەوەی لەحەیز کەمێك بۆنی کوستی (أظفار)[٣] لەخۆی بداتو ئێمە رێگریمان لێ کرا شوێن تەرمو جەنازە بکەوین).

---

١) رواه البخاري (٥٠٢٤) و مسلم (١٤٨٦ - ١٤٨٩)

٢) رواه البخاري (٣١٣) و مسلم (٩٣٨)

٣) كست اظفار جۆرە بۆنێکە بووە لەو سەردەمەدا بەکارهاتووە

## چواردەیەم: خەرجییەکان (النفقات)

**١- پێناسە:** (نفقات) کۆی (نفقة)یە، هەموو شتێك دەگرێتەوە کە مرۆڤ پێویستیەتی لەخواردنو خواردنەوەو پۆشاكو شوێنو جێگای حەوانەوە، بۆیە پێی دەووترێت خەرجی (نفقة) چونکە خەرج دەبێتو دەڕواو تەواو دەبێت لەپێناوی دابین کردنی ئەو پێویستیانەدا کە باسکران.

**٢- جۆری خەرجییەکان:** خەرجییەکان پێنج جۆرن کە ئەمانەن:

أ- خەرجی خودی مرۆڤ.

ب - خەرجی منداڵ لەسەر باوكو باپیرە.

ج - خەرجی باوكو باپیر لەسەر منداڵە.

د- خەرجی ژن لەسەر مێردەکەیەتی.

ئێستاش هەریەك لەم جۆرانە باس دەکەین:

**أ- خەرجی خودی مرۆڤ بۆ خۆی:** لای خوارووی خەرجی دەبێت مرۆڤ لەخۆیەوە دەست پێ بکات چونکە خۆی لەهەموو کەس لەپێشترە، ئەم خەرج کردنەش هەموو شتێك دەگرێتەوە کە مرۆڤ پێویستیەتی لەخواردنو خواردنەوەو پۆشاكو جێگاو ماڵ، وە خەرجی مرۆڤ لەماڵو سامانی دەکرێت ئەگەر هەیبوو بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە (عن جابر قال أعتق رجل من بني عذرة عبدا له عن دبر فبلغ ذلك رسول الله ﷺ فقال: ألك مال غيره قال لا فقال رسول الله ﷺ من يشتريه مني فاشتراه نعيم بن عبد الله العدوي بثمانمائة درهم فجاء بها رسول الله ﷺ فدفعها إليه ثم قال ابدأ بنفسك فتصدق عليها فإن فضل شيء فلأهلك فإن فضل من أهلك شيء فلذي قرابتك فإن فضل من ذي قرابتك شيء فهكذا وهكذا).[١] جابیر (ڕەزای خوای لێ بی) دەڵێ: پیاوێك لەهۆزی بەنی عوزرە بەمەرجی دوا مردنی خۆی کۆیلەیەکی ئازاد کرد، هەواڵەکەی گەیشتەوە بەپێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بەکابرا: (تۆ ماڵی ترت هەیە؟) ووتی نەخێر هەر ئەو کۆیلەیەم هەیە جا فەرمووی: (کێ لێم دەکڕێتەوە؟) نوعەمی کوڕی عەبدوڵڵای عەدەوی بەهەشت سەد درهەم کڕییەوە، پێغەمبەر (ﷺ) پارەکەی دایە دەست پیاوەکەو فەرمووی:

---

١) رواه البخاري (٦٧٦٣) و مسلم (٩٩٧)

(لەخۆتەوە دەست پێ بکەو چاکە لەگەڵ خۆتدا بکە، جا ئەگەر شتێك زیاد بوو بیدەن بەژنو منداڵەکەت چی لەوانیش زیاد بوو بیدە بەخزمانت چی لەوانیش زیاد بوو ئاوا ئاوا بیبەخشە).

**ب- خەرجی منداڵ لەسەر باوکو باپیرە:**

باوکو باپیرو سەروتر پێویستە خەرجی منداڵی خۆیان یا منداڵی کوڕو کچەکانیان بکێشن، بەپلەی یەکەم لەسەر باوکە خەرجی منداڵەکانی بکێشێ ئەگەر باوك مرد ئەوە لەسەر باپیرەیە خەرجیان بکێشێ بەبەڵگەی ئەم ئایەتە پیرۆزە:﴿ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ﴾ الطلاق:٦ واتە: ئەگەر (ئەو هاوسەرانەی تەڵاق دراون) شیریان دا بەمنداڵەکەتان ئەوە ئێوەش کرێ کەیان بدەنێ. واجب بوونی کرێی شیر پێدانی منداڵەکان لەسەر باوکیان ئەوە دەگەیەنێ خەرجو مەسرەفیان بەگشتی لەسەر باوکیانەو دەبێت بەخێویان بکات.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویێ: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ البقرة: ٢٣٣ واتە: دایکان دووساڵی تەواو شیر دەدەن بەمنداڵەکانیان ئەوەیان کە بیەوێ شیری تەواو بدات وە بژێوی‌و پۆشاکی دایکەکان لەسەر باوکەکەیە بەباشی.

لەم دوو ئایەتەوە بۆمان دەرکەوت کە بەخێوکردنو خەرجی منداڵ لەسەر باوکیەتی، وە لەسوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) لەم بارەیەوە هاتووە (عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت هِنْدٌ أُمُّ مُعَاوِيَةَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ أن أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ أَنْ آخُذَ من مَالِهِ سِرًّا قال خُذِي أَنْتِ وَبَنُوكِ ما يَكْفِيكِ بِالْمَعْرُوفِ)[1] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بی) دەڵێ: هیندی کچی عوتبە ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبو سوفیان _کە مێردی بوو_ پیاوێکی ڕەزیلو ڕژدەیە ئەوەندەم ناداتێ بەشی خۆمو منداڵەکەم بکات، جگە لەوەی لێی دەدزمو ئەو نازانێ فەرمووی: (ئەوەندە ببە بەشی خۆتو منداڵەکەت بکات بەباشی).

مەرجەکانی پێویست بوونی خەرجی منداڵ لەسەر باوك:

---

١) رواه البخاري (٥٠٤٩) و مسلم (١٧١٤)

أـ دەبێ باوك یا باپیر ـ گەر باوك نەبوو ـ زیاد لەپێویستی خۆیو خێزانیماڵو سامانی هەبێت بۆ شەو و رۆژی ئەگەر هەر ئەوەندەی هەبوو بەشی خۆی یان خۆیو خێزانەكەی بكات ئەوە خەرجی منداڵەكانی پێویست نییە لەسەری بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە كە پێغەمبەر بەكابرایەكی فەرموو (ابدأ بنفسك...) [١] (لەخۆتەوە دەست پێ بكە).

ب ـ دەبێ منداڵەكە هەژار بێت، ئەگەر خۆی دەوڵەمەند بوو لەسەر باوكی پێویست نییە بەخێوی بكات.

٣ـ خەرجی باوكو دایك لەسەر منداڵەكانیانە:

هەرچۆنێ خەرجی منداڵ لەسەر باوكو باپیر پێویستە بەو مەرجانەی باسكران خەرجی باوكو دایكو باپیرەو نەنك لەسەر منداڵەكانیان یا منداڵی منداڵەكانیان پێویستە ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ﴾ لقمان: ١٥ واتە: لەدنیادا لەگەڵ دایكو باوكتدا بەباشی هەڵسو كەوت بكە، وە دەفەرموێ: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴾ الإسراء: ٢٣ واتە: پەروەردگارت بڕیاری داوە جگە لەخۆی هیچی تر نەپەرستن وە لەگەڵ دایكو باوكتاندا ئەوپەڕی چاكەیان لەگەڵدا بكە ئەو چاكە كردنو لەگەڵدا چاك بوونەی ئەم ئایەتانە داوای دەكەن منداڵ لەگەڵ دایكو باوكیدا بیكات بەشێك ئەوەیە خەرجو مەسرەفیان بكێشێو بەخێویان بكات ئەگەر هەژار بوون منداڵەش ماڵو سامانی زیاد لەخۆی هەبوو.

(عن عَائِشَةَ قالت قال رسول اللَّهِ ﷺ إِنَّ أَطْيَبَ ما أَكَلَ الرَّجُلُ من كَسْبِهِ وَإِنَّ وَلَدَ الرَّجُلِ من كَسْبِهِ) [٢] عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (پاكترینو حەڵاڵ ترین ماڵی مرۆڤ بیخوات ئەو ماڵەیە بەرەنجی خۆی پەیدای كردبێت، بێگومان منداڵی پیاو لەبەری رەنجی خۆیەتی) واتە ماڵو سامانی منداڵو منداڵەكەش هی باوكیەتی.

١) رواه مسلم (٩٩٧)

٢) رواه ابو داود (٣٥٢٨) و الترمذي (١٣٥٨) و النسائي (٧/ ٢٤٠) و ابن ماجه (٢٢٩٠) وهوحديث صحيح

**٤ـ خەرجی ژن لەسەر مێردەکەیەتی:**

**أـ بەبێ جیاوازی لەنێوان زانایاندا خەرجی ژن لەسەر مێردەکەیەتی:**

(عن حَكِيمِ بن مُعَاوِيَةَ الْقُشَيْرِيِّ عن أبيه قال قلت يا رَسُولَ اللَّهِ ما حَقُّ زَوْجَةِ أَحَدِنَا عليه قال أَنْ تُطْعِمَهَا إذا طَعِمْتَ وَتَكْسُوَهَا إذا اكْتَسَيْتَ ولا تَضْرِبْ الْوَجْهَ ولا تُقَبِّحْ ولا تَهْجُرْ إلا في الْبَيْتِ)[1] حەکیمی کوڕی موعاوییەی قوشەیری لەباوکیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مافی هاوسەری هەریەك لەئێمە چییە لەسەری؟ فەرمووی: (ئەوەیە خواردنی پێ بدەیت کاتێ خۆت خواردنت خوارد وە پۆشاکی بۆ بکەیت کاتێ خۆت پۆشاکت کرد لەدەموچاوی مەدە (ئەگەر لێتدا)و قسەی ناشیرینی پێ مەڵێ نابێ خۆی لەهاوسەری جیاکاتەوە مەگەر لەماڵدا (لەگەڵیدا نەخەوێ بۆ تەمێ کردنی ئەگەر لاسار بوو) وە فەرموودەکەی هیند کە پرسیاری کرد لەپێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی خەرجی خۆیو منداڵەکەیەوە کە پێشتر باسمان کرد. بەڵگەیە لەسەر خەرجی کێشان هاوسەرو خێزان لەلایەن مێرد.

**ب ـ ئافرەتی تەڵاق دراو بەتەڵاقی رجعی خەرجی لەسەر مێردەکەیەتی:**

(عن فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ قالت أَتَيْتُ النبي ﷺ فقلت أنا بِنْتُ آلِ خَالِدٍ وَإِنَّ زَوْجِي فُلَانًا أَرْسَلَ إلي بِطَلَاقِي وَإِنِّي سَأَلْتُ أَهْلَهُ النَّفَقَةَ وَالسُّكْنَى فَأَبَوْا عَلَيَّ قالوا يا رَسُولَ اللَّهِ إنه قد أَرْسَلَ إِلَيْهَا بِثَلَاثِ تَطْلِيقَاتٍ قالت فقال رسول اللَّهِ ﷺ إنما النَّفَقَةُ وَالسُّكْنَى لِلْمَرْأَةِ إذا كان لِزَوْجِهَا عليها الرَّجْعَةُ).[2] فاتیمەی کچی قەیس (ڕەزای خوای لێ بی) دەڵێ: ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ووتم: من کچی ئالی خالیدم، فڵان کەسی مێردم تەڵاقدانی خۆمی بۆ ناردم، منیش داوای خەرجیو جێ ی نیشتەجێ بوونم لەکەسو کاری کرد، بەڵام ئەوان پێیان نەدام ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چونکە مێردەکەی سێ تەڵاقەی داوەو بۆی ناردووە، فاتیمە ووتی: پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان کاتێ ئافرەت خەرجو جێ ی نیشتەجێ بوونی دەکەوێ مێردەکەی مافی گێڕانەوەی ئافرەتەکەی هەبێ بۆ لای خۆی)

لە قورئاندا ئافرەتی تەڵاقدراوی رجعی مافی نیشتەجێ بوونی هەیە وەك دەفەرموێ:

---

١) رواه ابو داو (٢١٤٢) و ابن ماجه (١٨٥٠) و الحاكم ٢/ ١٨٧ – ١٨٨ وهو حديث صحيح

٢) رواه احمد ٦/ ٤١٦ و النسائي ٦/ ١٤٤ وهو حديث صحيح

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ ﴾ الطلاق: ١ واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر ئافرەتانتان تەڵاقدا ئەوە لەكاتی عیددەی خۆیاندا (پاك ببنەوەو نەچووبنە لایان) تەڵاقیان بدەن وە عیددەكەیان بژمێرن وە لەخوا بترسن لەماڵەكانی خۆیان دەریان مەكەن. ئەگەر دروست نەبێت لەماڵەكانیان دەریان كەن كەواتە نیشتەجێ بوونیان پێویستە لەسەر مێردیان وە بەڵگەی خەرجی ئەو ئافرەتانەی تەڵاقی رەجعی دراوون ئەم ئایەتەیە كە دەفەرموێ: ﴿ وَلِلۡمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ البقرة: ٢٤١ واتە: بۆ ئافرەتانی تەڵاق دراو هەیە - بەشی خۆیان بەباشی ئەمە پێویستە لەسەر پارێزكاران.

**ج ـ ئافرەتێ سێ تەڵاق درابێ خەرجی ناكەوێ مەگەر سكی هەبێ:**

( ان أَبابكر بن حَفْصِ بن الْمُغِيرَةِ خَرَجَ مع علي بن أبي طَالِبٍ إلى الْيَمَنِ فَأَرْسَلَ إلى فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ بِتَطْلِيقَةٍ كانت بَقِيَتْ من طَلاَقِهَا وَأَمَرَ لها الحرث بن هِشَامٍ وَعَيَّاشَ بن أبي رَبِيعَةَ بِنَفَقَةٍ فَقَالاَ لها والله ما لَكِ من نَفَقَةٍ الا أَنْ تكوني حَامِلاً فَأَتَتِ النبي ﷺ فَذَكَرَتْ ذلك له قَوْلَهُمَا فقال لاَ نفقة لك)[1] ئەبوبەكر كوڕی حەفص كوڕی موغیرە لەگەڵ عەلی كوڕی ئەبوتالیبدا رۆشت بۆ یەمەن یەك تەڵاقی مابوو ناردی بۆ خێزانەكەی كە فاتمەی كچی قەیس بوو. وە فەرمانی كرد بەحاریسی كوڕی هیشامو عەیاشی كوڕی ئەبو رەبیعە كە خەرجی ئافرەتەكە بدەن، بەڵام هەردووكیان بەفاتیمەیان ووت: وەڵڵاهی خەرجو مەسرەفت ناكەوێ مەگەر سكت هەبێ فاتیمەش رۆشت بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ووتەی ئەو دوو پیاوەی بۆ باس كرد پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (خەرجو مەسرەفت ناكەوێ)

د- خەرجی كێشانی خزمان سوننەتە لەبەر پەیوەندی خزمایەتی: (عن أَنَسُ بن مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من أَحَبَّ أَنْ يُبْسَطَ له في رِزْقِهِ وَيُنْسَأَ له في أَثَرِهِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ).[2] ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەركەس حەز دەكات رزقو رۆزی بۆ زیاد

---

١) رواه مسلم ٤١/ ١٤٨٠ و احمد ٦/٤١٤ -٤١٥

٢) رواه البخاري (٥٩٨٦) و مسلم (٢٥٥٧)

بکرێت تەمەنی درێژ کرێتەوە دەبا پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنێت). بەشێکی بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی خەرج و مەسرەف کردنە بۆیان.

## پازدەیەم: بەخێوکردنو سەرپەرشتی کردن (الحضانة)

### ١ـ مانای (حضانة) لەزمانی عەرەبیو شەرعدا:

**(حضانة)** لەزمانەوانیدا لە (حضن)ەوە وەرگیراوە کە بەباوەش دەوترێت چونکە ئافرەتەکە منداڵەکە دەخاتە باوەشی.

**لەشەرعدا:** پاراستنو پەروەردەکردنی ئەو کەسەیە کە سەربەخۆ نیە وەك منداڵو شێت.

**حیکمەتی بەخێوکردن چییە؟**

حیکمەتی بەخێوکردن ڕێکخستنی بەرپرسیاریەکانە کە پەیوەندی بەسەرپەرشتی کردن و پەروەردە کردنی منداڵەوە هەیە، چونکە لەوانە ژنو پیاو لەیەکتری جیاببنەوە یا ڕایان جیا بێت دەربارەی چۆنیەتی پەروەردە کردنو بەخێوکردنی منداڵ، ئەگەر یاسا بۆ ئەم بابەتە دانەنرێت ناگەنە ئەنجام یان کامیان دەسەڵاتی هەیە بڕیاری ئەوەیان دەچەسپێ ئەمە ستەمێکی گەورەیە لەمنداڵەکان دەکرێت بەرژەوەندیان لەناودەچێ وە لەوانەیە ئەمە سەریکێشێ بۆ دروست بوونی ناکۆکیو ئاژاوە لەنێوان ژنو پیاوەکەیدا لەبەرئەوە یاسای بۆ دانراوەو دیاری کراوە کێ شیاوترە بەو کارەو پلە بەندی کراوە لەکەسەکاندا کە بەخێوکردنی منداڵ ئەگرنە ئەستۆ بەجۆرێ منداڵان دووچاری زیان نەیەن.

### ٢ـ کێ لەپێشترە بۆ بەخێوکردنی منداڵ:

ئەگەر پیاو لەهاوسەری جیابویەوەو منداڵی لەئافرەتەکە هەبوو کچ بێت یان کوڕو تەمەنی کەم بوو ئەوە دایکەکە لەپێشترە بۆ بەخێوکردنو سەرپەرشتی کردنی لەباوکەکە.

هۆیەکەی ئەوەیە: بەسۆزترە بۆ منداڵەکە لەباوکیو دەتوانێ ئیشو کاری منداڵکە بکاتو ئارام گرتر بێت لەگەڵیداو شیری پێبداتو سەرپەرشتی بکات.

**٣ـ دایك پێشتر بەخێوکردن تا شوونەکاتەوە:**

(عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده عبد الله بن عمرو أن امرأة قالت يارسول الله إن ابـــني هذا كان بطني له وعاء وثديي له سقاء وحجري له حواء وإن أباه طلقني وأراد أن ينتزعه مـــني فقال لها رسول الله ﷺ " أنت أحق به مـــا لم تنكحـــي"). [1] **عـەمری کـوڕی شـوعەیب لـە باوکیەوەو لە باپیریەوە کە عەبدوڵڵای کوڕەم عەمرە (ڕەزای خوای لێ بی) دەڵێ: ئافرەتێك ووتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم کوڕمە بەسك هەڵم گرتبوو مەمکەکانم ئاودەری بـوونو کۆشـم شوێن حەوانەی بوو جا باوکی منی تـەڵاق داوەو دەیـەوێ لـێم بـستێنێتەوە پێغەمبـەری خـواش (ﷺ) فەرمووی پێی: (تۆ شیاوتریت لات بێت تا شوو نەکەیت).**

**ئیبن مونزیر دەڵێ: زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی ئەگەر ئافرەت شوو بکات مافی بەخێوکردنی منداڵی بچوکی نامێنێتو لێی دەسەنرێتەوە.** [2]

**٤ـ دوای دایك پور لەپێشترە بۆ بەخێوکردنی منداڵ**

(عن البراء بن عازب رضي الله عنهما قال: فخرج النبي ﷺ فتبعتهم ابنة حمزة، يا عم، يا عم فتناولها علي فأخذ بيدها وقال لفاطمة: دونك ابنة عمك احمليها، فاختصم فيها علي وزيد وجعفر، فقال علي: أنا أحق بها وهي ابنة عمي، وقال جعفر ابنة عمي وخالتها تحتي، وقال زيد ابنة أخي، فقضى بها النبي ﷺ لخالتها وقال: الخالة بمنزلة الأم وقال لعلي: أنت مني وأنا منك، وقال لجعفر: أشبهت خَلقي وخُلقي، وقال لزيد: أنت أخونا ومولانا). [3] **بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: جا کەپێغەمبەر (ﷺ) لەمەککە -دەرچوو کچەکەی حەمزە بەمامە مامە شوێنیان کەوت جا عەلی هێنای و دەستی گرت بەفاتیمەی -خێزانی- ووت بیگرە کچی مامتە هەڵیگرە جا عەلیو زەیدو جەعفەر بوویە دەمەقاڵەیان لەسەر، عەلی ووتی: من لەپێشترم بۆی چونکە کچی مامە جەعفەریش ووتی: کچی مامەو پوریشی خێزانمە زەیدیش ووتی: کچی برامە، جا پێغەرمبەری خوا (ﷺ) دای بەپوریو فەرمووی: (پور لەجێگەی**

---

١) رواه ابوداود (٢٢٧٦) و احمد ١٨٢/٢ و البهيقي ٨ / ٤ -٥ وهو حديث صحيح

٢) بروانە (الاجماع ل ٩٩) ژمارە ٣٩٢ و ٣٩٣

٣) رواه البخاري (٢٦٩٩) و الترمذي (٩٠٤)

دایکە) وە بەعەلی فەرموو: (تۆ لەمنیو منیش لەتۆم) وە بەجەعفەری فەرموو: (تۆ لەشێوەو ڕەوشتیشدا لەمن دەچیت) وە بەزەیدی فەرموو: (تۆ براو پاڵپشتی ئێمەی).

**٥ـ پاش دایكو پور باوکە بۆ سەرپەرشتیو بەخێوکردنی منداڵ:**

فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر دەیگەیەنێت کە دایکی منداڵەکە لەپێش هەموانەوەیە بۆ سەرپەرشتی منداڵەکەی تا شوونەکات وە فەرموودەکەی بەڕائی کوڕی عازیب دەیگەیەنێت کە پور وەك دایك وایە بۆ منداڵەکە کە بەخێوی بکاتو سەرپەرشتی بکات لەم دوو فەرمودەوە ئەوە دەسەلمێ لەبنەڕەتدا سەرپەرشتیو بەخێوکردنی منداڵ هی باوکە پاش دایكو پوری منداڵەکە.

**٦ـ سەرپەرشتیو بەخێوکردنی پیاو بۆ منداڵ:**

ووتمان دایك یا پور لەپێشترن کە منداڵەکەیان لابێ بۆ بەخێوکردنو سەرپەرشتی کردنی، بەڵام ئەگەر ئافرەتێکی نزیك بەمنداڵەکە نەبوو یان هەبوو، بەڵام ئامادە نەبوو منداڵەکەی لابێ، لەم کاتەدا بەخێوکردنی منداڵەکە بەپیاو دەسپێردرێت پیاوانیش لەپلە بەندیدا وەك پلەی میرات گرتن دەبن جگە لەباپیرە کە پێش دەخرێت بەسەر برادا، بەم جۆرە باوك پاشان باپیرەو بۆ سەرەوە پاشان برای دایكو باوکی دواتر برای باوکی ئەنجا کوڕی برای دایكو باوکی پاشان کوڕی برای باوکی پاشان مامەیە کە دایكو باوکی دواتر مامەی باوکی.

**٧ـ منداڵ لەنێوان دایكو باوکی دا سەرپشك دەکرێ:**

کاتێ منداڵ گەورە بوو کچ بێت یا کوڕ وە گەشتە ڕادەی سەربەخۆییو پێویستی بە بەخێوکردن نەما لەو کاتەدا لەنێوان دایكو باوکی دا سەرپشك دەکرێ هەرکامیان هەڵبژارد دەدرێت بەوەیان.

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ النبي ﷺ خَيَّرَ غُلَامًا بين أبيه وَأُمِّهِ هذا أَبُوكَ وَهَذِهِ أُمُّكَ فَخُذْ بِيَدِ أَيِّهِمَا شِئْتَ فَأَخَذَ بِيَدِ أُمِّهِ فَانْطَلَقَتْ بِهِ).[1] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بی)دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەکوڕێکی فەرموو: (ئەمە باوکتەو ئەمەش دایکتە کامەیانت پێ خۆشە دەستی بگرە، جا منداڵەکەش دەستی دایکی گرتو دایکەکە لەگەڵ خۆیدا بردی).

---

١) رواه احمد (٧٣٤٦) و الترمذي (١٣٥٧) و ابن ماجه (٢٣٥١) وهو حديث صحيح

(وفي لفظ: أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ فقالت يا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ زَوْجِي يُرِيدُ أَنْ يَذْهَبَ بِابْنِي وقد سَقَانِي من بِئْرِ أَبِي عِنَبَةَ وقد نَفَعَنِي فقال رسول اللَّهِ ﷺ اسْتَهِمِي عليه فقال زَوْجُهَا من يُحَاقُّنِي في وَلَدِي فقال النبي ﷺ).[1]

له ریوایەتێکی تردا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ)دەڵێ: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوەکەم دەیەوێت کوڕەکەم ببات بۆ خۆی کە ـ کوڕەکەم ـ لەبیری ئەبی عینەبە ئاوم بۆ دێنێ‌و بەراستی سودم پێ دەگەیەنێ پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: (ئەمە باوکتەو ئەمەش دایکتە کامەیانت پێ خۆشە دەستی بگرە جا منداڵەکەش دەستی دایکی گرت‌و دایکەکە لەگەڵ خۆیدا بردی)

١) رواه ابو داود (٢٢٧٧) و النسائي (٣٤٩٦)

## شازدەیەم: شیردان ( الرضاع )

**١ـ پێناسەی (رضاع) لەزمانەوانیو شەرعدا:**

(رضاع) لەزمانەوانیدا: ناوە بۆ مژینی مەمكو خواردنەوەی شیرەكەی.

و لەشەرع دا: ناوە بۆ پەیدابوونی شیری ئافرەت یا ناوە بۆ ئەو شیرەی دەچێتە سك منداڵ شیرە خۆرەكە.

**٢ـ بەڵگەی شیرپێدان:**

خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرمویَ: ﴿ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴾ الطلاق: ٦ واتە: ئەگەر پێكنەهاتن ـ لەگەڵ ژنە تەڵاقدراوەكەدا بۆ شیردان بەمنداڵەكە ئەوە با ئافرەتێكی تر شیری بداتیَ.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویَ: ﴿ وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ ﴾ البقرة: ٢٣٣ واتە: وە ئەگەر ویستتان دایەن بگرن بۆ منداڵەكانتان ئەوە گوناهتان ناگات.

**٣ـ شیردان بەمنداڵ مافی دایكێتی نەك واجب بێت لەسەری:**

بەڵگەی شیردان مافی دایكە نەك واجب ئەم ئایەتانەیە: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَـٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾ البقرة: ٢٣٣ واتە: دایكەكان شیر ئەدەن بەمنداڵەكانیان بۆماوەی دوو ساڵی تەواو (ئەمە) بۆ كەسێك كە بیەوێت شیری تەواوەتی بدات بەمنداڵەكەی.

وە خوای گەورە دەفەرمویَ ﴿ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴾ الطلاق: ٦، واتە: ئەگەر پێكنەهاتن (لەگەڵ دایكدا) ئەوە بائافرەتێكی تر شیری بداتیَ. كەواتە واجب نیە لەسەری دایكەكە.

**٤ـ كە شیرپێدان مافی دایكەكە بێتو واجب نەبێت لەسەری چ ئەنجامێكی لیَ دەكەوێتەوە:**

أ- پیاوەكە ناتوانێت ژنەكەی ناچار بكات بۆ شیردان بەمنداڵەكەی، ئەگەر ناچاریشی كرد ژنەكەی بەگوێی نەكرد ئەوە گوناهبار نییەو بەسەرپێچی كەر دانانرێت.

تەنیا لەیەك حاڵەتدا نەبێت کاتیٚ کەس نەبێت جگە لەدایك منداڵکە بگونجێت شیر بدات بەمنداڵەکە یا هەر دەست نەکەوێت لەو کاتەدا بۆ پارێزگاری لەسەر گیانی منداڵەکە دەبێت شیری بداتیٚ.

ب- دەبیٚ پیاوە بەپێی عورفو عادەت کرێی شیرپێدان بدات بەژنەکەی ئەگەر داوای کرێی کرد لەسەر شیردانەکەی بەمنداڵەکە، بەلاّم ئەگەر داوای نەکرد (وەك ئێستا وا باوە) ئەوە پیاوەکە پێویست نییە لەسەری کرێی بداتیٚو ئافرەتەکەش لەو کاتەدا مافی داواکردنی کرێی نامێنیٚ ئەگەر بەخۆبەخشانە کردیو بۆ پیاوەکەی دەرخست کە حەزی لەوەرگرتنی کرێی شیردان نییە.

**٥ـ شیرپێدانو خزمایەتی دروست بوون:**

ئەگەر ژنێك منداڵێکی بێگانە شیری بخوات، ئەو منداڵە کوڕبێت یا کچ دەبێتە منداڵی شیری ئەو ژنە وە مێردەکەش دەبێتە باوکی شیری منداڵەکەو ئەم ئەنجامانەش لەشیر پێدانەکە دەکەوێتەوە:

أـ کوڕە شیرخۆرەکە شیردەرەکە دەبێتە مەحرەمی دروست نییە مارەی بکات چونکە دایکی شیرییەتی، هەروەها ئەو ئافرەتانی لیٚ حەرام دەبێت کە خزمی شیردەرەکەن ئەگەر شیردەرەکە بخاتە شوێنی دایکی خۆی ئافرەتێکی خزمی دایکی خۆی لیٚ حەرامە. وەك خوشكو پورو خوشکەزاو برازا ئەمانە چۆن لەنەسەبو پشتەوە مەحرەمن مارەکردنیان دروست نییە بەهۆی شیرخوادنیشەوە هەمان حوکمیان هەیە.

ب ـ ئافرەتە شیردەرەکە خۆی و ئەو ئافرەتانەی خزمی کە وەك مەحرەمن بۆ شیرخۆرەکە دروست نییە مارەکردنیان بۆ منداڵە شیرە خۆرەکە وە دروست نین بۆ کوڕیو کوڕەزاو تا بڕواتە خوارەوە وەك پێشتر ووتمان دەبێت ئێمە ئافرەتە شیردەرەکە وەك دایکی شیرخۆرەکە دابنێین جا چ ئافرەتێك مەحرەمەو مارەکردنی دروست نییە بۆ منداڵەکەوە منداڵەکانیشی بەهەمان شێوە لەرێگەی ئافرەتە شیردەرەکەشەوە حەرام دەبن وەك مەحرەمە نەسبییەکانی دادەنرێن. بۆ نموونە کوڕە شیرخۆرەکە کچی ئافرەتە شیردەرەکە خوشکی شیرییەتیو دروست نییە مارەی بکات هەروەها دروست نییە بۆ کوڕی شیر خۆرەکەش مارەی بکات چونکە پوری شیرییەتی.

ج ـ دروستە ئافرەتە شیردەرەکەو ئافرەتانی خزمی شووبکەن بەخزمو کەسو کاری کوڕە شیرخۆرەکە جگە لەمندالّی شیرخۆرەکە، وەك براو باوكو مامەی چونکە ئەم پیاوانە بێگانەن لەشیردەرەکە هیچ پەیوەندییەکیان نیە لەگەلّیدا وە لەگەلّ ئافرەتانی خزمی وەك کچو پورو برازاو خوشکەزای هیچ مەحرەمێك نیە لە نێوانیاندا..

**بەڵگەی بەخزم بوون بەهۆی شیرپێدانەوە:**

وەك باسمان کرد شیرپێدانو شیرخواردن خزمایەتی دروست دەکات لەنێوان شیردەرو شیرخۆرداو دەیانکاتە مەحرەمی یەکتری بەوێنەی مەحرەمی پشتو نەسەب.

خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَأُمَّهَـٰتُكُمُ ٱلَّـٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَـٰعَةِ﴾ النساء: ٢٣ واتە: ـ حەرام کراوە لێتان ـ ئەو دایکانەتان کە شیریان پێداون وە خوشکەکانتان لەشیرخواردنەوە، وە لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) (عَن عائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قالت: قَالَ رَسُولَ اللهِ ﷺ إنَّ الرَّضَاعَةَ تُحَرِّمُ مَا يَحرُمُ مِنَ الْولادَةُ)[1] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان هەرچی لە ڕێگەی لەدایك بوونەوە ببێتە مەحرەم لەشیرخوادنیشەوە دەبێتە مەحرەم).

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال قال النبي ﷺ في بِنْتِ حَمْزَةَ لَا تَحِلُّ لِي يَحْرُمُ من الرَّضَاعِ ما يَحْرُمُ من النَّسَبِ هِيَ بِنْتُ أَخِي من الرَّضَاعَةِ)[2] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری (ﷺ) لەبارەی کچی حەمزەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (کچەکەی حەمزە بۆمن ناشێت ئەوەی لە نەسەبەوە حەرامە لە شیرخواردنیشەوە حەرامە وە ئەو کچە بۆ من حەڵاڵ نییە چونکە برازای شیریمە)

---

١) رواه البخاري (٢٦٤٦ ، ٥٠٩٩) و مسلم (١٤٤٤)

٢) رواه البخاري (٢٦٤٥ ، ٥١٠٠) و مسلم (١٣/ ١٤٤٧)

# مامەڵەکردن ( معاملات )

## کڕین و فرۆشتن (البیع)

**یەکەم : پێناسەی (بیع) لە زمانەوانی و شەرعدا**

**لە زمانەوانیدا** (بیع) ئاڵوگۆڕکردنە بە گشتی.

**وە لە شەرعدا :** گۆڕینەوەی ماڵە بە ماڵ بە ڕەزامەندی هەردوولا، یا گواستنەوەی موڵکێکە لەبەرانبەر بریتییەك لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بەو شێوەی کە ڕێگە پێدراوە.

***دووەم : بەڵگەی دروستی کڕین و فرۆشتن***

خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ﴾ البقرة: ٢٧٥ واتە : خوای گەورە کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە و ریباو سوودی حەرام کردووە.

وە دەفەرمووێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ﴾ النساء: ٢٩ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە لە نێوان خۆتاندا سامانی یەکتری مەخۆن بە ناڕەوا مەگەر بازراگانێك بێت بە ڕەزامەندی لە نێوان خۆتاندا بیکەن.

(عن حَكِيمِ بن حِزَامٍ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ ما لم يَتَفَرَّقَا)[١] حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خوای لێ بێ)دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن مامەڵەکە هەڵوەشێننەوە هەتا لەیەکتری جیا نەبنەوە ..).

---

١) رواه البخاري (٢١١٠) و مسلم (١٥٣٢)

زانایانی ئیسلامیش یەك دەنگن لەسەر دروستی کڕین و فرۆشتن چونکە خەڵك پێویستیانەو ژیانیان ناڕوات بەبێ کڕین و فرۆشتن.[1]

**سێیەم: هاندان بۆ کەسابەت کردن**

(عن الْمِقْدَامِ بن معديكرب رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: ما أَكَلَ أَحَدٌ طَعَامًا قَطُّ خَيْرًا من أَنْ يَأْكُلَ من عَمَلِ يَدِهِ وَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ دَاوُدَ عليه السَّلَام كان يَأْكُلُ من عَمَلِ يَدِهِ)[2] میقدادی کوڕی مەعد یەکریب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هیچ کەس قەد خواردنێك ناخوات چاکتر و پاکتر بێت لەوەی کە بەدەستی خۆی پەیدا کردوە، بێگومان پێغەمبەری خوا (داوود) علیه الصلاة و السلام هەمیشە لەوەی دەخوارد بەدەستی خۆی پەیدای کردبوو)

(عَنِ الزُّبَيْرِ بن العوام رضي الله عنه قال: قال رسول اللَّهِ ﷺ لأَنْ يَأْخُذَ أحدكم أَحْبُلَهُ فيأتي الْجَبَلَ فيجئ بِحُزْمَةٍ من حَطَبٍ على ظَهْرِهِ فَيَبِيعَهَا فيستغني بِثَمَنِهَا خَيْرٌ له من أَنْ يَسْأَلَ الناس أَعْطَوْهُ أو مَنَعُوهُ).[3] زوبێری کوڕی عەوام (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر یەکێکتان گوریسەکەی هەڵبگرێ ـ بڕوا بۆ کێو و دارستان ـ کۆڵێ دار بێنێ و بیفرۆشێ بە نرخەکەی خۆی بێنیازی بکات لە خەڵك لەو چاکترە داوا لە خەڵکی بکات بیدەنێ یان نەیدەنێ).

**چوارەم: ئاداب و سوننەتەکانی کاسبی کردن:**

**١ـ بەیانیان زوو ڕۆشتن بەدەم کاسبیەوە:**

(عن صَخْرُ بن وَدَاعَةَ الْغَامِدِيِّ عن النبي ﷺ قال اللهم بَارِكْ لِأُمَّتِي في بُكُورِهَا وكان إذا بَعَثَ سَرِيَّةً أو جَيْشًا بَعَثَهُمْ في أَوَّلِ النَّهَارِ وكان صَخْرٌ رَجُلًا تَاجِرًا وكان يَبْعَثُ تِجَارَتَهُ من أَوَّلِ النَّهَارِ فَأَثْرَى وَكَثُرَ مَالُهُ)[4] صەخری کوڕی وەداعەی غامیدی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی

١) بڕوانە فتح الباری (٤ / ٢٧٨)

٢) رواه البخاري (٢٠٧٢)

٣) رواه البخاري (١٤٧١)

٤) رواه الترمذي (١٢١٢) و ابو داود (٢٦٠٦) و ابن ماجه (٢٢٣٦) وهو حديث صحيح

(خوایە خێرو پیت بخەرە ـ کارو کەسابەتی ـ ئومەتەکەم لەبەیانیان زووەکانیاندا) وە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر سرێ یە یا سوپایەکی بناردایە لەسەرەتای رۆژەوە دەیناردن، صەخریش بازرگان بوو لەسەرەتای رۆژەوە کەلو پەلی بازرگانیەکانی دەنارد بۆیە سامانی زۆر بوو دەولەمەند بوو).

**٢ـ میانڕەوی لەگەڕان بەدوای رسق و کەسابەت کردن دا:**

(عن عبد اللَّهِ بن سَرْجِسَ الْمُزَنِيِّ أَنَّ النبي ﷺ قال: السَّمْتُ الْحَسَنُ وَالتُّؤَدَةُ وَالِاقْتِصَادُ جُزْءٌ من أَرْبَعَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا من النُّبُوَّةِ)[1] عەبدوللای کوڕی سەرجیس (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (رێك و پێکی و لەسەور خۆیی و مام ناوەندێتی، بەشێکە لە بیست و چوار بەشی پێغەمبەرایەتی).

(عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لا تَسْتَبْطِئُوا الرِّزْقَ فَإِنَّهُ لَنْ يَمُوتَ الْعَبْدُ حَتَّى يَبْلُغَهُ آخِرُ رِزْقٍ هُوَ لَهُ فَأَجْمِلُوا فِي الطَّلَبِ أَخْذِ الْحَلالِ وَتَرْكِ الْحَرَامِ)[2] جابیری کوڕی عەبدوللا (رەزای خوای لێ بێ)دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (پەلەمەکەن لەدەست خستنی رسق و رۆزی چونکە دلنیا بن هیچ کەس نابێ بمرێت هەتا ئاخر بەشی رسقی خۆی بەدەست نەهێنێ و نەیگاتێ کەواتە بە چاکیو جوانی بەشوێن رزق و رۆزیدا بگەڕێن کە بریتی یە لە بەدەستهێنانی حەلاڵ و وازهێنان لە حەرام).

**٣ـ ئاسان کاری لە کڕین و فرۆشتندا:**

(عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال رَحِمَ الله رَجُلًا سَمْحًا إذا بَاعَ وإذا اشْتَرَى وإذا اقْتَضَى)[3] جابیری کوڕی عەبدوللا (رەزای خوای لێ بێ)دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (رەحمەتی خوا لەو کەسە بێت ئاسان کارە کە شت دەفرۆشێت و کە دەیکڕێ و کە داوا قەرزو مافی دەکات لە خەلکی).

---

١) رواه ابو داوود ( ٤٧٧٦) و الترمذي (٢٠١٠) وهو حديث حسن

٢) رواه ابن حبان (٣٢٢٧) و الحاكم (٤/٢) وهو حديث صحيح

٣) روان البخاری (٢٠٧٦) و ابن ماجه (٢٢٣٠)

**٤ـ ڕاستکردن وسوێند نەخواردن:**

(عن حَكِيمِ بن حِزَامٍ عن النبي ﷺ قال الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ ما لم يَتَفَرَّقَا فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا وَإِنْ كَذَبَا وَكَتَمَا محقت بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا).[١] حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن ـ پەشیمان ببنەوە ـ هەتا لەیەکتری جیا دەبنەوە، جا ئەگەر لەگەڵ یەکتری ڕاستیان کرد و عەیبەکانیان باس کرد بەرەکەت و خەیر دەکەوێتە کڕین و فرۆشتنەکەیان بەڵام ئەگەر درۆیان لەگەڵ یەکتری کردو عەیبەکانیان شاردەوە ئەو خێرو بەرەکەت لە کڕین و فرۆشتنەکەیاندا نامێنێت).

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال سمعت عن النبي ﷺ قال الْحَلِفُ مُنَفِّقَةٌ لِلسِّلْعَةِ مُمْحِقَةٌ لِلْكَسْبِ).[٢] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست فەرمووی: (سوێندخواردن فرۆش و بازاڕ بۆ کەل و پەل پەیدا دەکات، بەڵام خێرو بەرەکەتی ماڵە پەیدا کراوەکە ناهێڵێ).

**٥ـ کێشانەو پێوانەکردن بە ڕێك و پێکی:**

(عن ابن عَبَّاسٍ قال لَمَّا قَدِمَ النبي ﷺ الْمَدِينَةَ كَانُوا من أَخْبَثِ الناس كَيْلًا فَأَنْزَلَ الله سُبْحَانَهُ (وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ) فَأَحْسَنُوا الْكَيْلَ بَعْدَ ذلك)[٣] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆشت بۆ مەدینە لە پێوانە کردندا لە هەموو کەس خراپتر بوون ئەنجا خوای گەورە: ﴿ وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴾ المطففين: ١ بۆ دابەزاندن ئیتر دوا ئەوە پێوانەیان بە چاکی و ڕێك دەپێوا).

**٦ـ ئامۆژگاری کردن لە کڕین و فرۆشتن دا و غەش نەکردن:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلَاحَ فَلَيْسَ مِنَّا وَمَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا).[٤] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:

---

١) رواه البخاري (٢٠٧٩) و مسلم (١٥٣٤)

٢) رواه البخاري (٢٠٨٧) و مسلم (١٦٠٦)

٣) رواه ابن ماجه (٢٢٢٣) و ابن حبان (٤٨٩٨) وهو حديث حسن

٤) رواه ابن ماجه (٢٢٢٣) و ابن حبان (٤٨٩٨) وهو حديث حسن

(ئەوەی لە دژمان چەك هەڵگرێ لە ئێمە نییە، ئەو کەسەش غەشمان لێ بکات لە ئێمە نییە).

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ على صُبْرَةِ طَعَامٍ فَأَدْخَلَ يَدَهُ فيها فَنَالَتْ أَصَابِعُهُ بَلَلًا فقال ما هذا يا صَاحِبَ الطَّعَامِ؟ قال: أَصَابَتْهُ السَّمَاءُ يا رَسُولَ اللَّهِ قال: أَفَلَا جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ كَيْ يَرَاهُ الناس من غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي).[1] ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە لای کۆمایە خواردەمەنیدا ـ گەنم یا جۆدا ـ تێپەری دەستی کرد بە ناوەیدا و پەنجەکانی تەڕبوون جا فەرمووی: (ئەمە چییە خاوەنی خۆراك) ئەویش وتی: باران لێیداوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (ئەی بۆ تەڕەبووەکەت نەخستۆتە سەرەوە تا خەڵك بیبینێ؟ ئەوەی غەش بکات لە ئێمە نییە).

**٧ـ پەلە نەکردن لە قەرزاری نەبوو:**

(عن هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال كان تَاجِرٌ يُدَايِنُ الناس فإذا رَأَى مُعْسِرًا قال لِفِتْيَانِهِ تَجَاوَزُوا عنه لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَتَجَاوَزَ عَنَّا فَتَجَاوَزَ الله عنه)[2] ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ـ لە گەلانی پێشوودا ـ بازرگانێك هەبوو قەرزی دەدا بە خەڵك، ئەگەر بیزانیایە کەسێ نیەتی بە بەردەستەکانی دەوت چاوپۆشی لەم کەسە بکە بەڵکو خواش چاوپۆشی لە ئێمە بکات، بۆیە خوای گەورە چاوپۆشی لێ کردو لێی خۆش بوو).

**٨ـ دوعای رۆشتنە بازاڕ:**

(عن سَالِمِ بن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ عن أبيه عن جَدِّهِ قال قال: رسول اللَّهِ ﷺ من قال حين يَدْخُلُ السُّوقَ لَا إِلَهَ إلا الله وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ له له الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وهو حَيٌّ لَا يَمُوتُ بيده الْخَيْرُ كُلُّهُ وهو على كل شَيْءٍ قَدِيرٌ كَتَبَ الله له أَلْفَ أَلْفِ حَسَنَةٍ وَمَحَا عنه أَلْفَ أَلْفِ سَيِّئَةٍ وبني له بَيْتًا في الْجَنَّةِ).[3] سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) لە باوکیەوە و لەباپیرەیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس کاتێ دەڕواتە بازار بڵێ هیچ پەرستراوێکی راست نییە جگە لە خوای تاك و تەنیا کە هاوبەشی

---

١) رواه مسلم (١٠١)

٢) رواه مسلم (١٠٢) و ابن ماجه (٢٢٢٤) و الترمذي (١٣١٥) وهو حديث صحيح

٣) رواه ابن ماجه (٢٢٣٥) وهو حديث حسن

نیە هەموو موڵك و سوپاس بۆ ئەوە دەژێنی و دەمرێنێ و خۆشی زیندوی نەمرە هەموو چاکەو خێر بە دەستی ئەوە توانا و دەسەلات بەسەر هەموو شتێکدا هەیە خوای گەورە ملیۆنێك چاکەی بۆ دەنوسێ و ملیونێك خراپەی لێ دەسڕێتەوە وەلە بەهەشت دا کۆشێکی بۆ دروست دەکات -دەیباتە بەهەشتەوە ـ).

**پێنجەم: پایەکانی کڕین و فرۆشتن**

**پایەی یەکەم: کڕیارو فرۆشیار:** ئەو دوو کەسەن کە مامەڵەی کڕینو فرۆشتنەکە بە ویستو ڕەزامەندی ئەوان دادەمەزرێت، هەریەکەیان دەبێت ئەم مەرجانەیان تێدا بێت:

**أـ باڵغی عاقڵی ڕەشید بێ:** بە چاکی بزانێت مامەڵەو کڕین و فرۆشتن بکات کەوا بوو کڕینو فرۆشتنی منداڵ و شێت و ئەو کەسەی ڕێگری لێ کراوە لە کڕین و فرۆشتن چونکە نەزانەنانە ماڵەکەی مامەڵە پێوە دەکات، وەك خەرجکردنی لە کڕینی شتی حەرام دا یا لە ناودانی بەشتی حەڵاڵ یا بێ ئاگای و شارەزانەبوون لە مامەڵەدا ئەم ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیە لەسەر ئەم بڕگەیە:

﴿ وَٱبْتَلُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُوا۟ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ ﴾ النساء: ٦

واتە : هەتیوان تاقی بکەنەوە هەر کاتێ گەیشتنە ( تەمەنی ) ژنهێنان و شوو کردن ئینجا ئەگەر هەستان بە ژیری (پێگەیشتن ) کرد تێیاندا ئەوسا ماڵ و سامانەکانیان پێ بدەنەوە.

**ب ـ بەویست و ڕەزامەندی خۆی کڕینو فرۆشتنەکە بکات:** خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ﴾ النساء: ٢٩ واتە ماڵی یەکتری مەخۆن جگە لە ماڵی (بازرگانێك بە ڕەزامەندی بێت لە نێوان خۆتاندا ) ئەوە دروستەو حەڵاڵە.

(قال رسول الله ﷺ إنما البيع عن تراض)[١] پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (بێگومان کڕین و فرۆشتنی ڕاست ئەوە بەرزامەندی بێت) لەنێوان کڕیاو فرۆشیاردا.

**ج ـ کڕیار و فرۆشیار یەك کەس نەبێت:** چونکە بەرژەوەندی کڕیار دژ بە بەرژەوەندی فرۆشیارە فرۆشیاری دەیەوێ بە نرخی زۆر و بە مەرجی کەم شتەکە بفرۆشێت بەڵام کڕیار دەیەوێ بە نرخی کەم و بە مەرج بیکڕێ هەروەها پێدان وەرگرتنی شتە فرۆشراوەکە و نرخەکەی هەموو

---

١) رواه ابن ماجه (٢١٨٥)

ئەمانە بەرپرسیاریەتی تێدایە ناگونجێ یەك کەس هەردوولا بگرێتە ئەستۆی خۆی کڕیارو فرۆشیار هەر خۆی بێت.

د ـ **بینین:** نابێ کڕیار یا فرۆشیار کوێر بێت چونکە تووشی خەڵتان دەبێت و نازانێ وەك پێویست مامەڵە بکات بۆیە دەبێ کەسێك بکات بە بریکاری خۆی کڕین و فرۆشتنی بۆ بکات

**پایەی دووەم : ئەو ووشانەی کڕین و فرۆشتنی پێ دەکرێ: (الایجاب و القبول)**

مەبەست لەم پایە ئەو ووشە و ڕستانە کە کڕیارو فرۆشیار بەکاری دێنن بۆ کڕین و فرۆشتن و ڕازی بوونیان لەسەری ، فرۆشیار دەڵێ پێم فرۆشتی یا پێمدای، کریارێش دەڵێ وەرم گرت یا قبوڵم کرد.

**مەرجەکانی پێفرۆشتن و کڕین (شروط الایجاب و القبول):**

أ ـ وتەکانیان بەینی زۆر نەبێت ، ئەگەر فرۆشیار وتی پێم فرۆشتی ماوەیەکی زۆری پێچوو پاشان کڕیار ووتی کڕیم ئەو دروست نییە یان قسەیەك کە پەیوەندی بە کڕین و فرۆشتنەکەو نەبوو کرا پاشان وتی لێم کڕیت ئەوە دروست نیە با قسەکە کەمیش بێت.

ب ـ دەبێ قسەی کڕیار لەگەڵ قسەی فرۆشیاردا وەك یەك بن لەهەموو ڕوویەکەوە، ئەگەر فرۆشیار وتی پێم فرۆشتی بەسەد دینار، کڕیاریش وتی لێم کڕیت بە پەنجا دینار یا ووتی ئەم خانووەم پێ فرۆشتی بە هەزار دینار ئەویش بڵێ نیوەی ئەم خانووەم لێ کڕیت بە پێنج سەد دینار، مامەڵەکە دانامەزرێت و دروست نییە چونکە قسەی کڕیارو فرۆشیار جیاوازن لەیەك و وەك یەك نین.

ج ـ مەرج و کاتی بۆ دیاری نەکرێت. بەڵکو دەبێت مامەڵەکەیان بۆ جێبەجێ کردن بێت دەست بەجێ بۆ یەکجاری بێت، بۆ نمونە بڵێ ئەم خانوەم پێ فرۆشتی ئەگەر فلان کەس هات یا ئەم خانوەم پێ فرۆشتی کاتێ مانگی ڕەمەزان هات ئەویش ووتی لێم کڕیت، دروست نیە و دانامەزرێت لەبەربوونی ئەو مەرجەکەوا دەگەیەنێت خاوەنەکەی مەبەستی فرۆشتن و ڕازی بوون نیە بەو قسەی دەیکات.

**پایەی سێیەم: فرۆشراو و نرخەکەی:** واتە ئەو شتەی مامەڵەکەی لەسەر دەکرێ و دەفرۆشرێت لەگەڵ ئەوەی لە بەرانبەریدا وەردەگیرێ کە نرخەکەیەتی ، چەند مەرجێك پێویستە لە نرخ‌و فرۆشراودا هەبێ کە ئەمانەن:

أ ـ فرۆشراوەکە لە کاتی کڕین‌و فرۆشتنەکەدا هەبێت، نابێ شتێ بفرۆشێت کە نەبێت.

ب ـ (عن حَكِيمِ بن حِزَامٍ قال يا رَسُولَ اللَّهِ يَأْتِينِي الرَّجُلُ فَيُرِيدُ مِنِّي الْبَيْعَ ليس عِنْدِي أَفَأَبْتَاعُهُ له من السُّوقِ فقال لَا تَبِعْ ما ليس عِنْدَكَ)[١] حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جاری وا هەیە پیاوێك دێت بۆ لام داوای شتێك دەکات پێی بفرۆشم کە لەو کاتەدا ئەو شتەم نیە پێی بفروشم ئایا لە بازار بۆی بکڕم - دروستە پێی بفرۆشم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەو شتەی لەدەستدا نییە مەیفرۆشە).

هەروەها ئەم جۆرە شت فرۆشتنە خەڵەتاندنی تێدایە، (عن أبي هُرَيْرَةَ قال نهى رسول اللَّهِ ﷺ عن بَيْعِ الْحَصَاةِ وَعَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ)[٢] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردووە لە کڕین‌و فرۆشتنی بەردهاوێژی[٣] فریودان و خەڵەتاندان).

**ج ـ فرۆشراو نرخ ماڵێك بن لە شەرعدا بەهایان هەبێ:**

**بەپێ ی ئەم مەرجە ئەو شتانە کە پیسن یا حەرامن دروست نییە کڕین و فرۆشتنیان پێو بکرێت، وەك عارەق و مردارۆبوو خوێن و سەگ و زبڵ و پاشەڕۆی ئاژەڵ.**

(عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ رضي الله عنهما أَنَّهُ سمع رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول عَامَ الْفَتْحِ وهو بِمَكَّةَ إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالْأَصْنَامِ فَقِيلَ يا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ فَإِنَّهَا يُطْلَى بها السُّفُنُ وَيُدْهَنُ بها الْجُلُودُ وَيَسْتَصْبِحُ بها الناس فقال لَا هو حَرَامٌ ثُمَّ قال رسول اللَّهِ ﷺ عِنْدَ ذلك قَاتَلَ الله الْيَهُودَ إِنَّ اللَّهَ لَمَّا حَرَّمَ شُحُومَهَا جَمَلُوهُ ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ)[٤] جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ)دەڵێ: لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیست فەرمووی:

---

١) رواه ابو داود (٣٥٠٣)

٢) رواه مسلم (١٥١٣)

٣) بەرهاوێژی : ئەوەیە کڕیار بەردێك بهاوێژی و کۆمەڵە شتێك بڵێ کەوتە سەر کامیان بەم نرخە پێم بفرۆشە.

٤) رواه البخاري (٢١٢١) و مسلم (١٥٨١)

(بەراستی خۆاو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فرۆشتنی عارەق و مرداربۆوو و بەراز و بتیان حەرام کردووە) جا ووترا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) رات چییە لەبارەی پیوی مرادارۆبوو کە دیواری کەشتی پێ سواغ دەدریت پێستەی پێ چەو دەکرێت خەڵکی بۆ چرا – وەك نەوت – بەکاری دێنن؟ فەرمووی (نەخێر ئەوە حەرامە) پاشان لەوێ دا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (خوا جولەکەکان لەناویات لە کاتێکدا خوا پیوی مرداۆبووی لێ حەرام کردبوون ئەوان دەیانتوانەوە و پاشان دەیانفرۆشتو پارەکەیان دەخوارد).

**جـ ـ دەبێت فرۆشراوو و نرخ کەڵك و سودیان هەبێت بەپێی شەرع و عورف و عادەت:**

کەواتە مێروو گیانداری زیان بەخش کە سودی لێ نەبینرێت یان بە عادەت سود لێ نابینرێت فرۆشتنی و کڕینی دروست نییە، هەروەها ئامێری موسیقاو قومار کە لە شەرع دا رێگەی پێ نادرێ حەرامە کڕین و فرۆشتنی پێوە بکرێت چونکە ماڵ بە فیرۆدانە لەبەرانبەری شتێکدا کە سوودی نییە بەلای شەرعەوە (وقد نهى النبي ﷺ عن إضاعة المال [1] (وە پێغەمبەر (ﷺ) بە فیرۆدانی سامان و ماڵی قەدەغەکردووە)، بەڵام فرۆشتنی پڵنگ بۆ راو فیل بۆ بۆ جەنگ و مەیمون بۆ پاسەوانی و هەنگ بۆ هەنگوین دروستە چونکە سوودیان هەیە بەپێ عورف و رێگە پێدراویشە لەشەرعدا هیچیان رێگری لێ نەکراوە نە لە قورئاندا نە لە سوننەت دا بە پێچەوانەی سەگەوە کە رێگری کراوە لە فرۆشتنی.

**دـ بتوانرێت ـ فرۆشراو و نرخ ـ تەسلیم بکرێت**

کڕیار یا فرۆشیار نەیتوانی فرۆشراو یان نرخ تەسلیم بە بەرانبەرەکەی بکات ئەگەر مامەڵە بە حازر بوو ئەو مامەڵەیە دروست نیە، جگە لە سەلەم.تێدا کراوە کە لە کاتی مامەڵەکەدا تەسلیم ناکرێ بەڵکو دواتر لە کاتی دیاری کراودا تەسلیم دەکرێت، چونکە ئەگەر کڕیار پارە بدات و فرۆشراوەکەی پێ نەدرێت لەو کاتەدا پارەکەی بە فیڕۆ دەڕوات ئەوەش دروست نییە و حەرامە.

---

١) رواه البخاري (٢٢٧٧)

**هـ ـ خاوەندارێتی کڕیار و فرۆشیار:**

دەبێ کڕیار خاوەنی پارەکە بێت و فرۆشیاریش خاوەنی فرۆشراوەکە بێت، یان سەرپەرشتیاری منداڵ و هەتیو بێت ئەویش دەتوانێ کڕین و فرۆشتنیان بۆ بکات یا وەکیلی خاوەن شت و نرخەکە بێت، ئەمانەی باسمان کردن دروست بۆیان کڕین و فرۆشتن بکەن.

**و ـ نرخ و فرۆشراو دیاری بێت بۆ کڕیارو فرۆشیار.**

فرۆشراو یا نرخ نا دیاری تێدا بێت لای هەردووکیان یا یەکێکیان مامەڵەکە دروست نییە چونکە بە زۆری ئەو نادیاری یە کێشەو ئاژاوەی لێ پەیدا دەبێت، چونکە ئەگەر وابوو ئەو نەزانراوی و خەڵەتاندنی تێدا ڕوودەدات، پێشتر باسمان کرد کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری لە فریودان و خەڵەتاندن کردووە، ئەو شتانەی دەبێ دیارو زانراوبن ئەمانەن:

١ـ ئەگەر فرۆشراو و نرخ دیاربن و بە بەرچاوەوەبن باچەندە و چۆنە باس نەکرێت ئەو ماڵە دروستە.

٢ـ کڕیارو فرۆشیار پێش مامەڵەکە فرۆشراو نرخەکەیان دیوە و لەو شتانەش نین بە زوویی بگۆڕین لە نێوان بینینەکە یا مامەڵەکەدا وەك قوماش و خانوو ئەوە کڕین و فرۆشتنەکە دروستە بەڵام ئەگەر لەو شتانە بوو دەگۆڕێ لەو ماوە کەمەدا ئەوە ئەو بینینە بەس نییە دەبێ جارێکی تر ببینرێتەوە.

٣ـ بینینی هەندێك لە شتێك کە لە جیاتی هەمووی ، وەك نمونەی، قوماش یا گەنم و جۆر یا هەر شتێك کە هەمووی وەك یەك وایە ئەوە بیبینی هەندێکی بەسە لەبڕی هەمووی.

٤ـ بینینی بەشی دەرەوەی ئەو شتەی کە پارێزەرە بۆ ناوەوەی وەك شوتی و کاڵەك و هەنار و هێلکە ئەمانە بینینی توێکلەکەی بەسە لە بڕی هەمووی.

# پەشیمان بوونەوەکان

لەبنەڕەت دا کڕین و فرۆشتن ئەگەر پایەو مەرجەکانی بێتەدی بۆ دامەزراندنە، واتە فرۆشراو دەبێتە ماڵی کڕیارو نرخیش هی فرۆشیارە بۆ هیچیان نیە پەشیمان بێتەوە، بەڵام خوا و پێغەمبەر (ﷺ) ڕەچاوی بەرژەوەندی بەندەکانی کردووە چونکە هەندێ جار کڕیار یا فرۆشیار پەلەدەکات لە مامەڵەکەیدا وەك پێویست ورد بوونەوە و سەرنجدان بەکار ناهێنێ بۆیە هەر کات کڕین و فرۆشتن پایەو مەرجەکانی بەدی هات بۆیەکجاری کۆتایی بە مامەڵەکە نایەت بەڵکە مافی پەشیمان بوونەوە دەمێنێ هەر چۆنێك دەتوانێ مامەڵەکە دامەزرێنێت ، وە پەشیمان بوونەوەش لە سێ حاڵەتدا دروستە کە ئەمانەن:

پەشیمان بوونەوەی دانیشگە و پەشیمان بوونەوەی مەرج و پەشیمان بوونەوەی ناتەواوی .

ئێستاش بە درێژی باسی ئەم جۆرانە لە پەشیمان بوونەوە دەکەین:

**یەکەم: پەشیمان بوونەوەی دانیشگە (خیار المجلس):**

مەبەست لەم پەشیمان بوونەوە ئەوەیە هەتا کریارو فرۆشیار لەو شوێندا بن مامەڵەکەیان تێداکردوە بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە با زۆریش پێکەوبن لە هەمان شوێنی مامەڵەکەیاندا، بەڵام ئەگەر لێك حیابوونەوە ئەوە مامەڵەکە دادەمەزرێت و پەشیمان بوونەوەی دانیشگە نامێنێت، هەروەها پەشیمان بوونەوەی دانیشکە نامێنێت ئەگەر یەکێکیان یا هەردوکیان دامەزارندنی مامەڵەکەی هەڵبژاردو ووتی ئەوە دامەزراند یا کۆتایم پێ هێنا یا پەشیمان نابمەوە بەڵگەی ئەم جۆرە لە پەشیمان بوونەوە ئەم فەرموودەیە (قال ﷺ: البَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ ما لم يَتَفَرَّقَا وَكَانَا جميعا أو يُخَيِّرُ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ.[1] پێغەمبەر خوا (ﷺ) دەفەرموێ (کڕیارو فرۆشیار سەر پشکن ـ لە نێوان دامەزراندن یا پەشیمان بوونەوەدا ـ هەتا لە یەکتری جیانەبنەوە و بەیەکەوە بن یا یەکێکیان پەشیمانی دەداتە دەستی ئەوی تریان).

---

١) رواه البخاري (٢٠٠٣) و مسلم (١٥٣١)

( عن حَكِيمِ بن حِزَامٍ رضي الله عنه قال قال رسول اللَّهِ ﷺ الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ ما لم يَتَفَرَّقَا فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا في بَيْعِهِمَا وَإِنْ كَتَمَا وَكَذَبَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا)[1] حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خوای لێ بی) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن هەتا لەیەکتری جیا نەبنەوە جا ئەگەر لەگەڵ یەکتری ڕاستیان کرد ناتەواویان بۆ یەکتری باسکرد کڕین و فرۆشتنەکەیان پیت و فەڕی تیَ دەکەویَ بەڵام ئەگەر لەگەڵ یەکتری درۆیان کرد و ناتەواوییان لەیەکتری شاردەوە کڕین و فرۆشتنەکەیان پیت و فەڕی تێدا نامێنیَ).

**مەبەست لە جیابوونەوە:** جیابوونەوەی لاشەیانە لە یەکتری، (عن مالك عن نَافِعٌ وكان بن عُمَرَ إذا اشْتَرَى شيئا يُعْجِبُهُ فَارَقَ صَاحِبَهُ).[2] ئیمامی مالیك (ڕەحمەتی خوای لێبیَ) لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەیگێڕێتەوە دەڵێ نافیع دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لیَ بیَ) ئەگەر شتێکی بکڕیایە حەزی لێ بکردایە جیادەبوویەوە لەوەی لێی کڕیوە). لەم بەڵگەیەدا مەبەستی لە جیابوونەوەی لاشەییە.

(عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما قال بِعْتُ من أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ عُثْمَانَ مَالًا بِالْوَادِي بِمَالٍ له بِخَيْبَرَ فلما تَبَايَعْنَا رَجَعْتُ على عَقِبِي حتى خَرَجْتُ من بَيْتِهِ خَشْيَةَ أَنْ يُرَادَّنِي الْبَيْعَ وَكَانَتْ السُّنَّةُ أَنَّ الْمُتَبَايِعَيْنِ بِالْخِيَارِ حتى يَتَفَرَّقَا).[3] هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لیَ بیَ) دەڵێ: (زەوییەکم هەبوو لە مەدینە فرۆشتم بە پێشەوای ئیمانداران عوسمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خوای لیَ بیَ)بە زەویەکی ئەو لە خەیبەر جا کاتیَ لە مامەڵەکە بووەینەوە پاش و پاش گەڕامەوە دواوە هەتا لە ماڵەکەی هاتمە دەرەوە لە ترسی ئەوەی داوای پەشیمان بوونەوەی مامەڵەکەم لێ بکات وە سوننەت وابوو کڕیار و فرۆشیار پەشیمان بوونەوەیان بۆ هەبوو تا لە یەکتری جیا نەبنەوە).

---

١) رواه مسلم (٢١١٠) مسلم (٤٧ / ١٥٣٢)

٢) رواه البخاري (٢٠٠١)

٣) رواه البخاري (٢١١٦)

**دووەم : پەشیمان بوونەوەی مەرج:**

ئەمەیە کڕیارو فرۆشیار یەکێکیان یا هەردووکیان مەرجی پەشیمان بوونەوە بۆ خۆیان دابنێن، تا ماوەیکی دیاریکراو، دروستە لەگەڵ مامەڵەکەدا دابنرێت یان داوای مامەڵەکە بە مەرجێ لەیەکتری جیا نەبووینەوە، ئەم پەشیمان بوونەوەیەش چەند مەرجێکی هەیە ئەمانەن:

**أ ـ بۆ ماوەیەکی دیاری کراوبێت:** ئەگەر یەکێکیان بڵێ پەشیمان بوونەوەم بۆ هەبێ، بەڵام دیار نەکرد دروست نییە، هەروەها ئەگەر کاتێکی نادیاری دیاری کرد وەك بڵێ چەند ڕۆژێ یان تا فڵان کەس دێتەوە لەم حاڵەتەشدا دروست نییە.

**ب ـ نابێ لەسێ ڕۆژ زیاتر بێت:** چونکە بە زۆر لەو ماوەیەدا دەتوانێ خۆیەکلا بکاتە بەبارێکدا دامەزراندن یا پەشیمان بوونەوە ئەگەر لە سێ ڕۆژ زیاتر بوو مەرجی پەشیمان بوونەوەکە دروست نییە.

**ج ـ دەبێ ماوەی پەشیمان بوونەوەکە بە سەریەکەوە بێت و لەگەڵ مامەڵەکەشدا بێت:** ئەگەر ڕۆژەکان کە دیاری کردووە بۆ پەشیمان بوونەوەبەسەریەکەوە نەبوون یان لە پاش جیابونەوە بوون لە یەکتری ئەوە دروست نییە و مامەڵەکەش هەڵدەوشێتەوە.

بەڵگەی ئەم مەرجانەی باسمان کرد ئەم فەرمودەیە، (عن حبان بن منقذ رضي الله عنه وقد شكا إلى رسول الله ﷺ أنه يخدع في البيوع فقال له النبي ﷺ: إذا بايعت فقل لا خلابة)[1] (وفي رواية: وَلِيَ الخيارُ ثلاثَةَ أيام) حیبانی کوڕی مونقیز (ڕەزای خوای لێ بێ) کە هانای بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) برد کە لە کڕین و فرۆشتندا دەخەڵەتێنرێت پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرمووی (ئەگەر کڕین و فرۆشتنت کرد بڵێ: بێ خەڵەتاندن) لە ڕوایەتێکی تردا (وە پەشیمان بوونەوەم بۆ هەبێ تا سێ ڕۆژ).

زانایان دەڵێن ئەم فەرمودە ماناکەی گشتی یە تایبەت نیە بە جیابونەوە.

١) رواه البخاري (٢١١٧) و البيهقي ٢٧٣/٥.

* کەی پەشیمان بوونەوەی مەرج نامێنێ:

ئەگەر ئەوەی پەشیمان بوونەوەی بۆ هەیە مامەڵەکەی هەڵوەشاندەوە – لەماوەی دیاری.کراودا بۆ پەشیمان بونەوە ئەوە مامەڵەکە هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام ئەگەر پەشیمان بوونەوە نەما· مامەڵەکە دادەمەزرێت وە پەشیمان بوونەوەی مەرجیش بە مانەی خوارەوە نامێنێ.

أ۔ بە تەواو بوونی کات دیاری کراو: ئەگەر ئەو ماوەی بۆ پەشیمان بوونەوە دیاریان کرد تەواو بوو پەشیمان نەبوو ئەوە ئیتر مامەڵەکە دادەمەزرێت و کەسیان ناتوانن هەڵی بوەشێننەوە.

ب ۔ بە چواندنی مامەڵەکەو رازی بوون پێی لەماوەی دیاری کراودا بۆ پەشیمان بوونەوە، وەك ئەوەی کامیان پەشیمان بوونەوەی بۆ هەیە بڵێ رازیم بەمامەڵەکەو پەشیمان نابمەوە.

ج ۔ ئەوەی مافی پەشیمان بوونەوەی هەیە لەماوەی دیاری کراو بۆ پەشیمان بوونەوە فرۆشراوەکە بفرۆشێ یا بە کرێ بدات یا هەر کارێکی تر لەم جۆرانە کە بە خاوەنیەتی نەبێت کاری وا ناکرێت ئەوە رازیبوونە بە مامەڵەکە و پەشیمان بوونەوە نامێنێ لەو حاڵەتەدا ئەمە ئەگەر کڕیار شتێکی بە فرۆشراوەکە کرد بە دامەزراندنی مامەڵەکەیە بەڵام ئەگەر فرۆشیار ماڵە فرۆشراوەکەی فرۆشت بە کەسێکی تر یا هەر کارێکی تر لەو جۆرە ئەوە هەڵوەشاندنەوەی مامەڵەکەیە و رازی نەبوونە پێی.

**۔ حوکمی فرۆشراو لەماوەی دیاری کراو بۆ پەشیمان بوونەوەدا :**

**أ ۔ خاوەنی فرۆشراو لە کاتی دیاری کراو بۆ پەشیمان بوونەوە کێیە؟**

ئەگەر کڕیار و فرۆشیار هەردووکیان پەشیمان بوونەوە یان بۆیان هەبوو پەشیمان ببنەوە ئەوە خاوەنێتی فرۆشراوە کە راگیراوە هەتا دەردەکەوێ مامەڵەکە دادەمەزرێت یا هەڵدەوەشێتەوە ، ئەگەر هەڵوەشایەوە فرۆشیار خاوەنێتی، بەڵام ئەگەر مامەڵەکە دامەزرا ئەوە لە کاتی بەستی مامەڵەکەوە فرۆشراوە کە کڕیار خاوەنی بووە و نرخەکەش هی فرۆشیار بووە ، جا کەواتە هەر زیادەیەك پەیدا بێ و ببێ بە فرۆشراوەکەوە یا نرخەکەوە ، ئەوە هەر چی پەیوەند بێت بە فرۆشراوە وە هی کڕیارە و هەرچیش بە نرخەوە بێت هی فرۆشیارە.

بەڵام ئەگەر پەشیمان بوونەوە بۆ کڕیار یا فرۆشیار بێت ئەوە فرۆشراوە کە هی ئەوەیانە پەشیمان بوونەوەی بۆ هەیە چونکە ئەو دەتوانێ هەر کارێك بکات ئەوە لەکاتی پەشیمان

بوونەوەدا فرۆشراو ئەو خاوەنێتی هەر زیادە و سودێكی هەبێ هی ئەوە وە هەر ئەرك و خەرجێكیش ببێ لەسەر ئەوە.

**ب ـ تیاچوونی فرۆشراوەكە لە كاتی دیاری كراو بۆ پەشیمان بوونەوە:**

ئەگەر لە كاتی دیاری كراو بۆ پەشیمان بوونەوەوە فرۆشراوەكە فەوتاو تیاچوو، ئەگەر پێش وەرگرتن بوو لەلایەن كڕیارەوەئەو مامەڵەیە هەڵدەوەشێتەوە و پەشیمان بوونەوەو نامێنێ بەڵام ئەگەر پاش وەرگرتنی فرۆشراوەكە تیاچوو لەو كاتەدا مامەڵەكە هەڵناوەشێتەوە و پەشیمان بوونەوەش دەمێنێ چونكە فرۆشراوەكە لە ئەستۆی كڕیار دایە پاش وەرگرتنی.

**سێیەم : پەشیمان بوونەوەی عەیب و ناتەواوی**

(قال رسول الله ﷺ: من غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي) پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (ئەوەی فێڵمان لێ بكات لە ئێمە نییە)[1]

ئەگەر فرۆشراو عەیبی تێدا بوو فرۆشیار دەیزانی بەو عەیبە بە كڕیاری نەڵێ ئەوە فێڵ و نا ڕاستییە وەك لە هۆی فەرموودەی پێشتر باسمان كرد روون دەبێتەوە (عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ على صُبْرَةِ طَعَامٍ فَأَدْخَلَ يَدَهُ فيها فَنَالَتْ أَصَابِعُهُ بَلَلًا فقال ما هذا يا صَاحِبَ الطَّعَامِ؟ قال: أَصَابَتْهُ السَّمَاءُ يا رَسُولَ اللَّهِ قال: أَفَلَا جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ كَيْ يَرَاهُ الناس من غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي).[2] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە بازاردا تێپەڕی بەلای كۆمایە گەنم دا دەستی كرد بە ناویدا پەنجەكانی تەڕ بوون جا فەرمووی: (بۆچی ئەوە چیە خاوەنی گەنم ووتی باران لێ ی داوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئەو تەڕەت نەخستۆتە سەرەوەی گەنمەكە تا خەڵكی ببینن؟ ئەو كەسەی فێڵ بكات لە من نییە).

چ شتێك لەسەر ئەو سێ جۆر پەشیمان بوونەوە دادەمەزرێت؟

١ـ پێویستە كەسێ شتێكی فرۆشت عەیب و ناتەواوی باس بكات ئەگەر تێیدا بوو ئەگەر وای نەكرد ئەوە كڕیار مافی پەشیمان بوونەوەی هەیە، (عن عُقْبَةَ بن عَامِرٍ قال سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ

---

١) رواه مسلم ١٦٤.

٢) رواه مسلم (١٠١)

يقول الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ ولا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ بَاعَ من أَخِيهِ بَيْعًا فيه عَيْبٌ إلا بَيَّنَهُ له).[١] عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست دەیفەرموو: (موسڵمان برای موسڵمانە دروست نیە موسڵمان شتێك بفرۆشێت بە برایەکی موسڵمانی و عەیبێکی تێدابوو ئیلا دەبێت بۆی باس بکات).

(عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَجُلًا ذَكَرَ لِلنَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ يُخْدَعُ في الْبُيُوعِ فقال إذا بَايَعْتَ فَقُلْ لَا خِلَابَةَ)[٢] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پیاوێك بە پێغەمبەری (ﷺ) ووت لە کڕین و فرۆشتندا دەخەڵەتێنرێت ئەویش فەرمووی (ئەگەر کڕین و فرۆشتنت کرد بڵێ بێ فێڵ بێ).

٢ـ کەڵك و سوود لەبەرانبەر زەمانەت کردن دایە:

فرۆشراوەکە سوود و کەڵکی هەبوو بۆ ئەو کەسەیە کە فرۆشراوەکە زەمانەت دەکات و لە ئەستۆی دایە (عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت قال رسول اللَّهِ ﷺ الْخَرَاجُ بِالضَّمَانِ)[٣] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (سوود وەرگرتن لەبەرانبەر زەمانەت کردن دایە).

٣ـ کڕیار فرۆشراو دەگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی ئەگەر فێڵی لێ کرابوو:

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال لَا تَلَقَّوْا الرُّكْبَانَ ولا يَبِعْ بَعْضُكُمْ على بَيْعِ بَعْضٍ ولا تَنَاجَشُوا ولا يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ ولا تُصَرُّوا الْغَنَمَ وَمَنْ ابْتَاعَهَا فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ بَعْدَ أَنْ يَحْتَلِبَهَا إن رَضِيَهَا أَمْسَكَهَا وَإِنْ سَخِطَهَا رَدَّهَا وَصَاعًا من تَمْرٍ).[٤] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بی)دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (مەڕۆن بە پیری بارەوە -پێش گەیشتنی بە بازار- هەندێکتان مامەڵە مەکەن بەسەر مامەڵەی هەندێکتان وە زەم مەکەن بەسەر یەکتری دا - مەبەستی فێڵ کردنە- شارنشین شت نەفرۆشێت بۆ لادێ نشین وە گوانی ئاژەڵ مەبەستن هەر

١) رواه ابن ماجه (٢٢٤٦) و الحاكم ٣/ ٢٢ و صحيحة و فقه الذهبي وهو حديث حسن

٢) رواه البخاري (٢١١٧) و مسلم (٤٨ / ١٥٣٣)

٣) رواه ابو داود (٣٥٠٨) و الترمذي (١٢٨٥) و النسائي (٤٤٩٠) و ابن ماجه (٢٢٤٢) وهو حديث حسن

٤) رواه البخاري (٢١٥٠) و مسلم (١٥١٥)

کەس ئەو ئاژەڵە بکڕێت ئەوە سەرپشکە لە هەڵبژاردنی کامەیان بە چاکی دەزانێ: ئەگەر پێی ڕازیبوو هەڵیگرێتەوە ئەگەر پێی ڕازینەبوو بیگێڕێتەوە لەگەڵ مەنێ خورما).

٤ـ کڕیارو فرۆشراو دەتوانن پەشیمان ببنەوە ئەگەر مامەڵەکە حەرام بوو:

(قال ابو هُرَيْرَةَ رضي الله عنه يقول قال رسول اللَّهِ ﷺ لَا تَلَقَّوْا الْجَلَبَ فَمَنْ تَلَقَّاهُ فَاشْتَرَى منه فإذا أتى سَيِّدُهُ السُّوقَ فَهُوَ بِالْخِيَارِ)[1] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووی: (بەپیر کاروانی کەڵوپەلەوە مەچن، هەر کەسێك چوو بە پیریەوە شتی لێ کڕی هەر کات خاوەنەکە هاتە بازاڕ ئەوا سەربەستە - یانی دەتوانێ پەشیمان بێتەوە-).

ئەم جۆرە مامەڵە حەرامە کە ڕۆشتنە بە پیری کاروانی کەڵو پەل پێش گەیشتنی بە بازاڕ جا ئەگەر خاوەن کەڵوپەلەکە گەشتە بازاڕ زانی فێڵی لێ کراوە دەتوانێ پەشیمان بێتەوە شتەکەی لە کڕیارەکە وەرگرێتەوە.

(عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما عن النبي ﷺ قال كُلُّ بَيِّعَيْنِ لَا بَيْعَ بَيْنَهُمَا حتى يَتَفَرَّقَا إلا بَيْعَ الْخِيَارِ).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری (ﷺ) فەرمووی: (هەموو کڕیارو فرۆشیارێك کڕین و فرۆشتنەکەیان دانامەزرێت تا لەیەکتری جیانەبنەوە مەگەر مەرجی پەشیمان بوونەوە دانێن).

واتە: پێش جیا نەبوونەوە یان لەیەکتری مامەڵەکردن بە فرۆشراوەکەوە دروست نیە مەگەر بە مەرجێ بێ پەشیمان بوونەوە بێت ئەنجا دروستە چونکە وانەبێ مامەڵەکە دامەزارو نییە تا لەیەکتری جیانەبنەوە.

٥ـ ئەگەر قسەی کڕیاو فرۆشیار جیاواز بوو، قسەی فرۆشیار وەردەگیرێ:

(عن عبد الله بن مسعود قال سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول: " إذا اختلف البيعان وليس بينهما بينة فهو ما يقول رب السلعة أو يتاركان").[3] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بی) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیست فەرمووی : (ئەگەر کڕیارو فرۆشیار جیاواز بوون لە

---

١) رواه البخاري (٢١١٧) و مسلم (٤٨ / ١٥٣٣)

٢) رواه البخاري (٢١١٣) و مسلم (٤٦ / ١٥٣١)

٣) رواه ابو داود (٣٥٠٨) و النسائي (٤٦٤٨) و ابن ماجه (٢١٨٦) وهو حديث صحيح بمجموع طرقه

نێوانیاندا شایەتیش نەبوو ئەوە قسەی ئەوەیانە خاوەن فرۆشراوەکە ( بە قسەی دەکرێت ) یا واز لە مامەڵەکە دێنن و هەڵدەوەشێتەوە).

## ئەو کڕین و فرۆشتانەی ڕێگریان لێ کراوە

هەندێ مامەڵە هەیە کە لە شەرع دا قەدەغە کراوە و ڕێگری لێ کراوە لێرەدا باسیان دەکەین لەگەڵ بەڵگەکانیاندا:

**١ـ کڕین و فرۆشتنێ کە فێڵ و خەڵەتاندنی تێدا بێت:**

ئەم مامەڵە هەموو کڕین و فرۆشتنێك دەگرێتەوە کە نەزانراوە یا قومار یا مەترسی تێدا بێت (عن أبي هُرَيْرَةَ قال نهى رسول اللَّهِ ﷺ عن بَيْعِ الْحَصَاةِ وَعَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ)[1] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کرد لە کڕینی بەرد هاوێشتن[2] و کڕینی فێڵ و خەڵەتاندن تێدابوو).

ئەم جۆرە لەکڕین و فرۆشتن کە قەدەغە کراوە بنەمایەکی گەورەیە لە کڕین و و فرۆشتن دا زۆر شت دەگرێتەوە وەك فرۆشتنی شتێك کە نیە یا نادیارە یا نەزانراوە یا ناتوانرێ بدرێ بە دەستی کڕیارەوە یان شتێك فرۆشیار خاوەنی نییە یا فرۆشتنی ماسی لە دەریادا یا بێچو لە سکی دایکیدا، ئەمانە و شێوەی ئەمانەش کڕین و فرۆشتنی دروست نیە و مامەڵەکەشی دانامەزرێ چەند جۆرێك لە کڕین و فرۆشتنی قەدەغە کراو دواتر باس دەکەین کە بەڵگەیان لەسەر هاتووە زۆریان لەم جۆرە کڕین و فرۆشتنەن.

**٢ـ کڕین و فرۆشتن بە دەست لێدان و بۆ فڕێدان**

(عن أبي سَعْد الخدري ضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهى عَنِ الْمُنَابَذَةِ وَهِيَ طَرْحُ الرَّجُلِ ثَوْبَهُ بِالْبَيْعِ إلى الرَّجُلِ قبل أَنْ يُقَلِّبَهُ أو يَنْظُرَ إليه. وَنَهَى عن الْمُلَامَسَةِ وَالْمُلَامَسَةُ لَمْسُ الثَّوْبِ لَا يَنْظُرُ إليه)[3] ئەبو سەعید خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ:(پێغەمبەری خوا (ﷺ) کڕین و

---

١) رواه مسلم (١٥٣٤/٤)

٢) کڕینی بەرد هاوێشتن ئەوەیە کڕیار بەردێ بهاوێژێ بۆ کۆمەڵە شتێك کەوتە سەر هەرکامیان بەو نرخەی پێشتر وویەتی دەبیات ئەمە جۆرێکە لە قومار.

٣) رواه البخاري (٢١٤٤)

فرۆشتنی بۆ فڕێدان قەدەغەکردووە، ئەوەیە کەسێك فڕێدانی پوشاك و قوماشەکەی بۆ کەسێکی فرۆشتنە پێش ئەوەی ئەمدیو دیوی بکات یا سەیری بکات ، هەروەها کڕین و فرۆشتنی دەست لێدانی قەدەغەکردووە، ئەوەیە دەستدان لە شتەکە فرۆشتنیەتی - بێ ئەوەی سەیری بکات- ).

عن أبي هُرَيْرَةَ (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نهى عن الْمُلَامَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ)[1] ئەبوهوەریرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) کڕین و فرۆشتنی دەست لێدان و بۆ فڕێدانی قەدەغە کرد)

**٣ـ کڕین و فرۆشتنی سکی سك**

(عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نهى عن بَيْعِ حَبَلِ الْحَبَلَةِ وكان بَيْعًا يَتَبَايَعُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ كان الرَّجُلُ يَبْتَاعُ الْجَزُورَ إلى أَنْ تُنْتَجَ النَّاقَةُ ثُمَّ تُنْتَجُ التي في بَطْنِهَا)[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فرۆشتنی سکی سکی قەدەغەکرد کە کڕین و فرۆشتنیەك بوو خەڵکی سەردەمی نەفامی دەیانکرد — بەم شێوە بوو — کەسێکی گۆشتی ووشتری سەربڕاوی دەفرۆشێت بۆ ئەو کاتەی ووشترەکەی سکی ببێ و پاشان ئەو سکەش سکی ببێ کە لەسکی ووشترەکە دایە). واتە گۆشتی ووشترەکە دەفرۆشێ بە بێچووی بێچوویەك کە هێشتا خۆشی لەدایك نەبووە.

**٤ـ کڕین و فرۆشتنی بەرد هاوێشتن،**

پێشتر فەرموودەکەیان باس کرد.

پێشەوا نەوەوەی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ:[3] کڕین و فرۆشتنی بەردهاوێشتن سێ مانا و لێکدانەوە هەڵدەگرێ:

أـ ئەوەی بڵێ هەر کام لە پۆشاکانەی ئەم بەردەی کەوتە سەر کە فڕێی دەدەم بێنم فرۆشتنی یا ئەم زەوی لێرەو هەتا هەر کوێ بەردەکە گەیشت کە فڕێی دەدەم پێم فرۆشتی بەوەندە.

ب ـ پێم فرۆشتی بە مەرجێ پەشیمانە بوونەوەت بۆ هەیە هە تا ئەم بەردم نە فڕێ دەدەم.

---

١) رواه البخاري (٢١٤٦)

٢) البخاري (٢١٤٣، ٣٨٤٣) مسلم (٥،٦/ ١٥١٤)

٣) بڕوانە ( شرح النووي على صحيح مسلم)

ج ـ بەرد فڕێ دانە خۆی بکرێت بە کڕین و فرۆشتن بەم شێوە بڵێ ئەگەر بەردەم گرتە ئەو پۆشاکە ئەوە لێم کڕیوی بە ئەوەندە).

**٥ـ کڕین و فرۆشتنی پەڕینی نێری ئاژەڵ:**

(عن بن عُمَرَ رضي الله عنهما قال نَهى النبي ﷺ عن عَسْبِ الْفَحْلِ)[١] عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردوە پەڕینی ئاژەڵی نێر بفرۆشرێ).

**٦ـ فرۆشتنی شتێك کە نییەتی:**

(عن حَكِيمِ بن حِزَامٍ قال يا رَسُولَ اللَّهِ يَأْتِينِي الرَّجُلُ فَيُرِيدُ مِنِّي الْبَيْعَ ليس عِنْدِي أَفَأَبْتَاعُهُ له من السُّوقِ فقال لَا تَبِعْ ما ليس عِنْدَكَ)[٢] حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا کەسێك داوای شتێکم لێ دەکات پێی بفرۆشم منیش نیمە ئایا شتێکی پێی بفرۆشم کە لە بازار بیکڕم بۆی؟ فەرمووی: (شتێك مەفرۆشە کە نیتە).

**٧ـ فرۆشتنی فرۆشراوەکە پێش وەرگرتنی:**

(عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من ابْتَاعَ طَعَامًا فلا يَبِعْهُ حتى يَسْتَوْفِيَهُ).[٣] عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس خواردەمەنییەکی کڕی با نەیفرۆشێت هەتا وەری دەگرێ لە فرۆشیار).

(و جاء أَنَّ النبي ﷺ قال: من اشْتَرَى طَعَامًا فلا يَبِعْهُ حتى يَكْتَالَهُ).[٤] دەفەرموێ: (هەرکەس خۆراکێکی کڕی با نەیفرۆشێت هەتا پێوانەی دەکات).

(عن ابن عُمَرَ قال كَانُوا يَتَبَايَعُونَ الطَّعَامَ جُزَافًا بِأَعْلَى السُّوقِ فَنَهَى رسول اللَّهِ ﷺ أَنْ يَبِيعُوهُ حتى يَنْقُلُوهُ)[٥] عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (خەڵکی لە بەشی سەرەوەی بازاڕی مەدینە خۆراکیان دەکڕی بەگۆترە جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردن کە بیفرۆشنەوە تا نەیگوێزنەوە - لە شوێنەکەی خۆی-).

---

١) رواه البخاري (٢٢٨٤)

٢) رواه ابو داود (٣٥٠٣)

٣) رواه البخاري (٢١٢٦) و مسلم (١٥٢٦)

٤) رواه مسلم (٣٩/ ١٥٢٨)

٥) أخرجه البخاري ، ٢١٣٧، ومسلم، ٣٧/ ١٥٢٧.

**٨ـ مامەڵە بەسەر مامەڵەی برادا:**

ئەوەیە کەسێك شتێکی کڕیوە کەسێکی تردا لەماوەی دیاری کراو بۆ پەشیمان بوونەوەدا دێتەلایو دەڵێ: من لەو شتە چاکترت پێ دەفرۆشم بەهەمان نرخ یان وێنەی ئەو شتەت پێ دەفرۆشم بەکەمتر لەو نرخە، (عن ابن عُمَرَ عن النبي ﷺ قال لَا يَبِعْ الرَّجُلُ على بَيْعِ أَخِيهِ..).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (با کەس مامەڵە نەکات بەسەر مامەڵەی براکەیدا...). (عن أبي هريرة أن رسول الله ﷺ قال لا يسم المسلم على سوم أخيه).[2] وە ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (با موسوڵمان سەودا نەکات بەسەر سەودای براکەیدا).

**٩ـ دوو مامەڵە لەیەك مامەڵەدا کەسێکی تردا:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال النبي ﷺ من بَاعَ بَيْعَتَيْنِ في بَيْعَةٍ فَلَهُ أَوْكَسُهُمَا أو الرِّبَا)[3] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هەرکەس دوو مامەڵە بکات لەیەك مامەڵەدا ئەوە نرخە کەمەکەیان بۆ هەیە یا ریباو سوود - دەخوات-).

**١٠ـ حەرامە فرۆشتنی ئارەقو مردارۆبوو و بەرازو بتەکان:**

(عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ رضي الله عنهما أَنَّهُ سمع رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول عَامَ الْفَتْحِ وهو بِمَكَّةَ إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالْأَصْنَامِ فَقِيلَ يا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ فَإِنَّهَا يُطْلَى بها السُّفُنُ وَيُدْهَنُ بها الْجُلُودُ وَيَسْتَصْبِحُ بها الناس فقال لَا هو حَرَامٌ ثُمَّ قال رسول اللَّهِ ﷺ عِنْدَ ذلك قَاتَلَ الله الْيَهُودَ إِنَّ اللَّهَ لَمَّا حَرَّمَ شُحُومَهَا جَمَلُوهُ ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ)[4] جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: ئەو ساڵەی مەککە ئازاد کرا گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان خواو پێغەمبەرەکەی فرۆشتنی ئارەقو مردارۆبوو بەرازو بتیان حەرام کردووە) عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا رات چییە دەربارەی

---

١) رواه مسلم (١٥١٤)

٢) رواه مسلم (١٥١٥)

٣) رواه النسائي (٧/ ٢٩٥) و ابوداود (٣٤٦١) و الترمذي (١٢٣١) وهو حديث حسن

٤) رواه البخاری (٢١٢١) و مسلم (١٥٨١)

پیوی مردارۆبوو دیواری کەشتی پێ سواغ دەدرێت پێستەی پێ چەور دەکرێتو خەڵکی بۆ چرا بەکاری دێنن -وەك نەوت- فەرمووی: (نەخێر ئەوە حەرامە) پاشان لەوێ دا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (خوا جولەکەکان لەناوبات لەکاتێکدا خوای گەورەپیوی مردارۆبووی لێ حەرام کردبوون، دەیان تواندەوەو پاشان دەیانفرۆشتو پارەکەیان دەخوارد).

**١١ـ فرۆشتنی وێنەی گیاندار:**

(عن سَعِيدِ بن أَبِي الْحَسَنِ قال كنت عِنْدَ ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما إِذْ أَتَاهُ رَجُلٌ فقال يا أَبَا عَبَّاسٍ إِنِي إِنْسَانٌ إنما مَعِيشَتِي من صَنْعَةِ يَدِي وَإِنِّي أَصْنَعُ هذه التَّصَاوِيرَ فقال ابن عَبَّاسٍ لَا أُحَدِّثُكَ إلا ما سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول سَمِعْتُهُ يقول من صَوَّرَ صُورَةً فإن اللَّهَ مُعَذِّبُهُ حتى يَنْفُخَ فيها الرُّوحَ وَلَيْسَ بِنَافِخٍ فيها أَبَدًا فَرَبَا الرَّجُلُ رَبْوَةً شَدِيدَةً وَاصْفَرَّ وَجْهُهُ فقال وَيْحَكَ إن أَبَيْتَ إلا أَنْ تَصْنَعَ فَعَلَيْكَ بهذا الشَّجَرِ كل شَيْءٍ ليس فيه رُوحٌ).[1] سەعیدی کوڕی ئەبو حەسەن دەڵێ: من لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بووم (ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێ پیاوێك هات بۆلای‌و وتی: ئەی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس، من کەسێکم ژیانم لەسەر پیشەی دەستەکانمە من ئەم وێنانە دروست دەکەم، جا عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس وتی: هیچت بۆ باس ناکەم ئەوە نەبێت کە لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە فەرموویەتی، گوێم لێبوو فەرمووی: (هەرکەس وێنەیەك دروست بکات ئەوە خوا سزای دەدات هەتا گیان دەکات بەبەریدا وە هەرگیز ناتوانێ گیان بکات بەبەریدا) جا پیاوەکە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو ڕەنگی زەرد بوو جا عەبدوڵڵا وتی: داماو ئەگەر هەردەبێ وێنە بکێشیت ئەو وێنەی دارو درەختو هەرشتێك بێ گیان بێ بیکێشە).

**١٢ـ کڕین‌و فرۆشتنی بەرووبوم پێش پێگەیشتنی:**

(عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما النبي ﷺ نهى عن بَيْعِ الثَّمَرَةِ حتى يَبْدُوَ صَلَاحُهَا نهى البائع والمشتري).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)

١) رواه البخاري (٢٢٢٥) و مسلم (٢١١٠)

٢) رواه البخاري (٢١٩٤) و مسلم (١٥٣٤)

قەدەغەی کرد لەفرۆشتنی بەروبووم دەستی بەپێگەیشتن نەکردبێ ڕێگری کرد لەفرۆشیاو و کڕیار - ئەو مامەڵە بکەن-).

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نهى عن بَيْعِ الثِّمَارِ حتى تُزْهِيَ فَقِيلَ له وما تُزْهِي قال حتى تَحْمَرَّ أو تصفر. فقال رسول اللَّهِ ﷺ أَرَأَيْتَ إذا مَنَعَ الله الثَّمَرَةَ بِمَ يَأْخُذُ أحدكم مَالَ أَخِيهِ).[1] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی کرد لە فرۆشتنی بەروبووم هەتا پێدەگات) ووتیان پێگەیشتن چۆنە فەرمووی: (هەتا سوور دەبێت یا زەرد دەبێت) فەرمووی: (ئەگەر خوا بەروبومەکەی لەناوبرد لەبەرانبەری چیدا هەرکام لەئێوە ماڵی براکەی پێ حەڵاڵ دەبێ) واتە: دەبێت دەست بەپێگەیشتن بکات ئەنجا دروستە، بەڵام پێش ئەوە ئەگەر شتێکی بەسەرداهات‌و فەوتا لەبەرانبەری چیدا نرخەکەی وەرگرتووە.

**١٣ـ کڕین‌و فرۆشتنی موزابەنە:**

**موزابەنە:** بریتییە لەفرۆشتنی خورمای تازە پێگەیشتوو بەخورمای تر، وە فرۆشتنی مێوژ بەترێ بەپێوانە، (عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما قال نهى رسول اللَّهِ ﷺ عن الْمُزَابَنَةِ أَنْ يَبِيعَ ثَمَرَ حَائِطِهِ إن كان نَخْلًا بِتَمْرٍ كَيْلًا وَإِنْ كان كَرْمًا أَنْ يَبِيعَهُ بِزَبِيبٍ كَيْلًا وَإِنْ كان زَرْعًا أَنْ يَبِيعَهُ بِكَيْلِ طَعَامٍ وَنَهَى عن ذلك كُلِّهِ).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) کڕین‌و فرۆشتنی موزابەنەی قەدەغە کردووە، کە بریتییە لەوەی بەرووبومی باغەکەی گەر خورمای تازە پێگەیشتوو بوو بیفرۆشێت بەخورمای تر بە پێوانەو ئەگەر ترێ بوو بیفرۆشێت بەمێوژ بەپێوانەو ئەگەر گەنم‌و جۆ (ی سەوز) بوو بیفرۆشێ بەگەنم‌و جۆی تر. ئەمانەی هەموو قەدەغە کرد).

١) رواه البخاري (٢١٩٨) و مسلم (١٥٥٥)

٢) رواه البخاري (٢١٧١، ٢١٨٥، ٢٢٠٥) و مسلم (٧٦/ ١٥٤٢)

**١٤ـ کڕین‌و فرۆشتنی دانەوێڵەی سەوزی پێنەگەیشتوو:**

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی کردووە گەنم‌و جۆو دانەوێڵەی سەوزی پێنەگەیشتوو -لەگوڵەکەیدا بێت- بیفرۆشێت بەدانەوێڵەی ووشك)[1] وە هەندێك دەڵێن (محاقلة) فرۆشتنی کێڵگەیە بەگەنم‌و جۆ کە ئەندازەی دیاری کراو بێت.

وە (مخابرە)ش: فرۆشتنی کێڵگەیە بەسێیەك‌و چواریەك ئەو دانەوێڵەی لێی بەرهەم دێت (عن جَابِرَ بن عبد اللَّهِ رضي الله عنهما نهى النبي ﷺ عن الْمُخَابَرَةِ وَالْمُحَاقَلَةِ وَعَنْ الْمُزَابَنَةِ وَعَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ حتى يَبْدُوَ صَلَاحُهَا وَأَنْ لَا تُبَاعَ إلا بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ إلا الْعَرَايَا)[2]. جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری کرد لەفرۆشتنی (بەکرێ دانی) کێڵگە بەخۆراك (گەنم‌و جۆ) یا بەسێیەك‌و چواریەکی ئەوەی لێی بەرهەم دێت، هەروەها ڕێگری کرد لەفرۆشتنی بەرووبومی درەخت هەتا پێگەیشتنی دەست پێ نەکات‌و نابێ بیفرۆشێت بەپارەو پول نەبێت جگە لە عەرایا)

عەرایا کۆی (عریة) بریتییە لەئەوەی خێزانێك خورمای تازە پێگەیشتوو وەردەگرن‌و دەیخەملێنن بەخورمای وشك بۆئەوەی بەتازەیی بیخۆن لەجیاتیدا خورمای ووشك دەدەن.

**١٥ـ نرخی سەگ‌و کرێی ئافرەتی داوێن پیس‌و فاڵچی:**

(عن أبي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نهى عن ثَمَنِ الْكَلْبِ وَمَهْرِ الْبَغِيِّ وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ)[3] ئەبو مەسعودی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) نرخی سەگ‌و کرێی ئافرەتی داوێن پیس‌و فاڵچی قەدەغەکرد).

(عن رَافِعِ بن خَدِيجٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال: ثَمَنُ الْكَلْبِ خَبِيثٌ وَمَهْرُ الْبَغِيِّ خَبِيثٌ وكَسْبُ الْحَجَّامِ خَبِيثٌ)[4]. ڕافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)

---

١) رواه البخاري (٢٢٠٧)

٢) رواه البخاري (٢٣٨١) و مسلم (١٥٣٦)

٣) رواه البخاري (٢٢٣٧، ٢٢٨٢، ٥٣٤٦) و مسلم (١٥٦٧)

٤) رواه مسلم (٤١/ ١٥٦٨)

فەرمووی: (نرخی سەگ پیسە، کرێی ئافرەتی داوێن پیس پیسە، دەسکەوتی کەڵەشاخگر پیسە).

**١٦ـ جیاکراوەی نەزانراو:**

ئەوەیە هەندێك لەبەرووبوم یا دانەوێڵە جیاکاتەوە (بەڵام ئەندازەکەی نادیار بێت) ئەوە فرۆشتنی دروست نییە، بەڵام ئەگەر ئەندازەکەی زانراو بوو دروستە.

(عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ قال نهى رسول اللَّهِ ﷺ عَنْ الثُّنْيَا إلا أَنْ يُعْلَمَ).[1] جابیر (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فرۆشتنی جیاکراوە (نەزانراو)ی قەدەغەکرد مەگەر ئەندازەکەی بزانرێت). ئەو کاتە دروستە.

**١٧ـ فرۆشتنی خۆراك پێش پێوانەکردنی:**

دروست نییە خۆراك بفرۆشرێت هەتا پێوانە نەکرێت لەکاتی کڕینداو لەکاتی فرۆشتنیدا (عن جَابِرٍ قال نهى رسول اللَّهِ ﷺ عن بَيْعِ الطَّعَامِ حتى يَجْرِيَ فيه الصَّاعَانِ صَاعُ الْبَائِعِ وَصَاعُ الْمُشْتَرِي).[2] جابیر (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) فرۆشتنی خۆراکی قەدەغەکرد هەتا دوو پێوانە نەکرێت، پێوانەکردنی کڕیارو پێوانەکردنی فرۆشیار).

**١٨ـ فرۆشتنی ترێ بە کەسێ کە عارەقی لێ دروست دەکات:**

(عن ابن عُمَرَ يقول قال رسول اللَّهِ ﷺ لَعَنَ اللهُ الْخَمْرَ وَشَارِبَهَا وَسَاقِيَهَا وَبَائِعَهَا وَمُبْتَاعَهَا وَعَاصِرَهَا وَمُعْتَصِرَهَا وَحَامِلَهَا وَالْمَحْمُولَةَ إليه).[3] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە نەفرینی کردووە لەعارەق ئەوەی دەیخواتەوەو ئەوەی دەیگێڕێ‌و فرۆشیارو کڕیارو دروستکەر _ئەوەی دەیگوشێ_ بۆ دروستکراو و ئەوەی هەڵیدەگرێ‌و ئەوەی بۆی هەڵدەگرن - بۆی دەبەن-).

**١٩ـ دروست نییە فرۆشتن‌و کڕینی دەسکەوت (غەنیمەت) پێش بەشکردنی بەسەر جەنگاوەراندا:** (عن ابن عباس رضي الله عنه قال: نهى رسول اللَّهِ ﷺ عن بَيْعِ الْغَنَائِمِ حتى

---

١) رواه النسائي (٧/ ٣٨) و الترمذي (١٢٩٠)

٢) رواه ابن ماجه (٢٢٢٨) وهو حديث حسن

٣) رواه ابو داود (٣٦٧٤) و ابن ماجه (٣٣٨٠) وهو حديث صحيح

تُقَسَّمَ).[١] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی کرد غەنیمەت بفرۆشرێت هەتا دابەش دەکرێت).

**٢٠ـ فرۆشتنی زەمکاری بەنیازی فێڵ:**

ئەوەیە کەسێك بێ ئەوەی نیازی کڕینی شتێکی هەبێ زەم بکات بەسەر یەکێکی تردا بۆ ئەوەی نرخی شتە بەرز کاتەوە بۆ چەواشەکردنی کڕیار. (عن ابن عمر أن رسول الله ﷺ نهى عن النجش).[٢] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردووە لەزەمکاری بەنیازی فێڵو خەڵەتاندن).

**٢١ـ فرۆشتنی پشیلە دروست نییە:**

(عن أبي الزبير قال سألت جابرا عن ثمن الكلب والسنور ؟ قال زجر النبي ﷺعن ذلك).[٣] ئەبو زوبەیر دەڵێ: پرسیارم لە جابیر کرد دەربارەی نرخی سەگو پشیلە ـ بفرۆشرێت ـ وتی: پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری کرد لەو کارە).

**٢٢ـ فرۆشتنی خوێن دروست نییە:**

(عن ابن أبي جُحَيْفَةَ قال رأيت أبي اشْتَرَى حَجَّامًا فَأَمَرَ بِمَحَاجِمِهِ فَكُسِرَتْ فَسَأَلْتُهُ عن ذلك قال إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نهى عن ثَمَنِ الدَّمِ وَثَمَنِ الْكَلْبِ وَكَسْبِ الْأَمَةِ وَلَعَنَ الْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ وَآكِلَ الرِّبَا وَمُوكِلَهُ وَلَعَنَ الْمُصَوِّرَ).[٤] ئەبو جوحەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (باوکم دی کۆیلەیەکی کەڵەشاخگری کڕی فەرمانی کرد ئەوەی کەڵەشاخی پێدەگرت شکێنرا منیش پرسیارم لێ کرد لەوبارەیەوە وتی: (بێگومان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کرد لەنرخی خوێنو سەگو کرێی گەنیزەك (ئافرەتی داوێن پیس) وە نەفرینی کرد خاڵ کوتو خاڵ بۆکوتراو و سوو خۆرو سوودەر وە نەفرینی کردووە وێنەکێشو پەیکەرتاش).

---

١) رواه النسائي (٧/ ٣٠١) وهو حديث صحيح

٢) رواه البخاري (٢١٤٢) و مسلم (١٥١٦)

٣) رواه مسلم (١٥٦٩)

٤) رواه البخاري (٢٢٣٨)

**٢٣ـ دروست نییە زیادەی ئاو بفرۆشرێت:**

(عن إِيَاسِ بن عَبْدٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نهى عن بَيْعِ فَضْلِ الْمَاءِ).[١] **ئییاسی کوڕی عەبد (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فرۆشتنی زیادەی ئاوی قەدەغەکرد) واتە: ئەگەر کەسێ لەپێویستی خۆی زیاتر ئاوی هەبوو خەڵکیش پێویستیان بووە ئەوە دروست نییە بیفرۆشێت پێیان.**

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال لَا يُمْنَعُ فَضْلُ الْمَاءِ لِيُمْنَعَ بِهِ فَضْلُ الكلأُ) **ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ڕێگری زیادەی ئاو ناکرێ تا ڕێگری لەوەڕی پێ بکرێ).** (وفي لفظ: لا يباع فضل الماء ليباع به الكلأ).[٢] **لەریوایەتێکدا دەفەرموێ: (زیادەی ئاو نافرۆشرێت تا لەوەڕی پێ بفرۆشرێت).**

**٢٤ـ فرۆشتنی شارنشین بۆ گوندنشین دروست نییە:**

(عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال: نهينا أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ وان كان أخاه أو أباه).[٣] **ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (ڕێگریمان لێ کرا کە شارنشین شت بفرۆشێ بۆ گوندنشین یا براو باوکیشی بێت).**

**٢٥ـ دروست نییە قەرزو فرۆشتن بەیەکەوە، وە دوو مەرج لەفرۆشتنێکدا:**

(عن عَبْدَ اللَّهِ بن عَمْرٍو قال قال رسول اللَّهِ ﷺ لَا يَحِلُّ سَلَفٌ وَبَيْعٌ ولا شَرْطَانِ في بَيْعٍ ولا رِبْحُ ما لم تَضْمَنْ ولا بَيْعُ ما ليس عِنْدَكَ)[٤] **عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (حەڵاڵ نییە قەرزو فرۆشتن بەیەکەوەو دوو مەرج لەفرۆشتنێکداو قازانجی شتێك زەمانەتی نەکردووەو فرۆشتنی ئەوەی لات نییە).**

**٢٦ـ فرۆشتنی گۆشت بەئاژەڵی زیندوو دروست نییە:**

(عن سمرة رضي الله عنه أن النبي ﷺ نهى عن بيع الشاة باللحم)[٥] **سەمورە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) فرۆشتنی مەڕو بزنی بەگۆشت قەدەغە کرد).**

---

١) رواه ابو داود (٣٤٧٨) و النسائي ٧ / ٣٠٧ و الترمذي (١٢٧١) وهو حديث صحيح

٢) رواه البخاري (٢٣٥٣) و مسلم (٣٨/ ١٥٦٦)

٣) رواه البخاري (٢٧١٨) و مسلم (١٠٩ / ٧١٥)

٤) رواه ابو داود (٣٥٠٤) و النسائي (٤٦١١) و الترمذي (١٢٣٤) وهو حديث حسن

٥) رواه الحاكم ٢/ ٣٥ و البيهقي في السنن الكبرى ٢٩٦/٥ وهو حديث حسن

# سوود (الربا)

**یەکەم : (ربا) لەزمانەوانیو شەرعدا:**

(ربا) لەزمانەوانیدا بەمانای زیادەیە وەك قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ﴾ الحج: ٥، واتە: کاتێ بارانمان باراند بەسەر زەویدا (ڕووەکی لێ دەڕوێ) و دەجولێ زەوی بەرز دەبێتو گەشە دەکات.

وە (ربا) لەشەرعدا: وەرگرتنی زیاد لەدەستماییە لەهەندێ شتی دیاریکراودا.

کە حەرامە بەدەقی قورئانو سوننەتو یەك دەنگی زانایان.

قورئان دەفەرموێ:﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ البقرة: ٢٧٥ واتە: خوای گەورە فرۆشتنو کڕینی حەلاڵ کردووەو ریباو سوودی حەرام کردووە.

لە سوننەتدا: (عن جَابِرٍ قال لَعَنَ رسول اللَّهِ ﷺ آكِلَ الرِّبَا وموكله وَكَاتِبَهُ وَشَاهِدَيْهِ وقال هُمْ سَوَاءٌ).[1] جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ)دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرینی کردووە لەسوود خۆرو سوودەر و نووسەرو هەردوو شایەتەکەی وە فەرمووی هەموویان وەك یەکن ـ لەتاوانباریدا ـ).

زانایانی ئیسلامیش یەك دەنگن لەسەر حەرامی سوودو ریبا.[2]

**دووەم: حوکمەکەی:**

ریبا حەرامە بۆ وەرگرو ئەوەش دەیدات بەڵگەی حەرامیش ئەم بەڵگانەیە: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ فَأۡذَنُواْ بِحَرۡبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَإِن تُبۡتُمۡ فَلَكُمۡ رُءُوسُ أَمۡوَٰلِكُمۡ لَا تَظۡلِمُونَ

---

١) رواه مسلم (١٥٩٨)

٢) بڕوانە (موسوعة الاجماع ١ / ٤٢٩ - ٤٣٠)

وَلَا تُظْلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢٧٨ – ٢٧٩ واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە لەخوا بترسنو ئەو ڕیبای ماوتانە (لای خەڵك) وازی لێ بێنن ئەگەر خۆتان بەبڕوادار دەزانن جا ئەگەر دەستی لێ هەڵنەگرن کەواتە بزاننو ئاگادار بن بەجەنگێك لەلایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە، بەڵام ئەگەر پەشیمان ببنەوە ئەوە تەنها دەستمایەکەتان هی ئێوەیە نە ستەم بکە ـ لە خەڵکی ـ نە ستەمتان لێ دەکرێت، وە فەرموودەکەی جابیر گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرینی لەسوو خۆرو سوودەر نووسەر شایەتەکان کردو فەرموون هەموویان یەکسانن.[1]

**سێ یەم : بەشەکانی سوود:**

ریبا دوو بەشە: ریبای دواخستنو ریبای زیادە.

ـ **ریبای دواخستن:** ئەو زیادە بەمەرج گیراوەیە کە قەرزدەر لەقەرز وەرگری وەردەگرێ لەبەرانبەری دواکەوتنی قەرزەکەدا.

ئەو جۆرە ریبا بەدەقی قورئانو فەرموودەی پێغەمبەرو (ﷺ) یەك دەنگی زانایان حەرامە.

ـ **ریبای زیادە:** فرۆشتنی پارەیە بەپارەی وەك خۆی یا خۆراك بەخۆراکی وەك خۆیو یەکێکیان لەوەی تریان زیاترە دەست بەدەستو بێ دواکەوتن.

**چوارەم: ئەو شتانەی ریبای تێدایە:**

**أـ ئەم شەش شتەی لەم فەرموودەدا هاتوون ریبایان تێدایە بەیەك دەنگی زانایان:**

(عن عُبَادَةَ بن الصَّامِتِ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ الذَّهَبُ بالذَّهَبِ وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ وَالْمِلْحُ بِالْمِلْحِ مِثْلًا بِمِثْلٍ سَوَاءً بِسَوَاءٍ يَدًا بِيَدٍ فإذا اخْتَلَفَتْ هذه الْأَصْنَافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إذا كان يَدًا بِيَدٍ).[2] عویادەی کوڕی صامت (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئاڵتون بەئاڵتونو زیو بەزیو و گەنم بەگەنمو جۆ بەجۆو خورما بەخورماو خوێ بەخوێ بەئەندازەی یەك بنو یەکسان بنو دەست بەدەست، جا ئەگەر ئەم جۆرانە جیاواز بوون ئەوە چۆنتان ویست بیفرۆشن ئەگەر دەست بەدەست بوو).

---

١) رواه مسلم (١٠٦/ ١٥١٨)

٢) رواه مسلم (٨/ ١٥٨٧)

(عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال لَا تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إلا مِثْلًا بِمِثْلٍ ولا تُشِفُّوا بَعْضَهَا على بَعْضٍ ولا تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ إلا مِثْلًا بِمِثْلٍ ولا تَبِيعُوا منها شيئا غَائِبًا بِنَاجِزٍ).[1] وە ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئاڵتون بەئاڵتون مەفرۆشن مەگەر بە ئەندازەی بن هەندێکی لەهەندێکی زیاد مەکەن وە زیو مەفرۆشن بەزیو مەگەر بەئەندازەی یەك بنو هەندێکی زیاد مەکەن لەهەندێکی ئەوەیان قەرزو نادیارە مەیفرۆشن بە بەحازو بەرچاو تەنها دەست بەدەست نەبێ).

(عن عُمَرَ بن الْخَطَّابِ رضي الله عنه يُخْبِرُ عن رسول اللَّهِ ﷺ قال الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ رِبًا إلا هَاءَ وَهَاءَ وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا إلا هَاءَ وَهَاءَ وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِبًا إلا هَاءَ وَهَاءَ)[2]. وە عومەری کوری خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئاڵتون بەئاڵتون ریبایە مەگەر دەست بەدەست بێت، ئەو بڵێ: بیگرە، ئەمیش بڵێ: بیگرە، زیو بەزیو ریبایە مەگەر بڵێ هانێ ئەمیش بڵێ هانێ وە گەنم بەگەنم ریبایە مەگەر هانێ و هانێ بێت وە جۆ بەجۆ ریبایە مەگەر دەست بەدەست بێ هانێو هانێ).

٢ـ زانایان را جیان لە بوونی ریبا لەشتی تردا کە لەفەرموودەکەدا باس نەکراوە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ راجیاییان لەهۆی (علة) ریبا چییە لەو شتانەدا کەفەرموودەکەدا هاتووە.

هۆی ریبا لەئاڵتونو زیودا ئەوەیە کە نرخی بۆ شتومەكو کەلوپەل کەواتە هەرشتێك نرخ بێت بۆ کەلوپەل وەك پارەی ئەمرۆ بەهەموو جۆرەکانیەوە ئەوە ریبای تێدایە وە هۆی چوار شتەکەی تر کە ریبای تێدایە رای بەهێز ئەوەیە کە خواردەمەنین بۆ خەڵكو پێیان دەژین کەواتە هەر خواردەمەنییەکی تریش کە خەڵك پێویستی بێتو بژێوی بێت ریبای تێدا وەك برنج و زەرات ئەگەر ئەو شتانەی تر بەیەکتری فرۆشران دەبێت بەقەدەر یەك بنو دەست بەدەست، هەروەها هەموو جۆرەکانی پارە ئەگەر بەوێنەی خۆیان فرۆشران یا گۆڕانەوە دەبێت بەئەندازەی یەکتر بنو دەست بەدەست بێت.

---

١) رواه البخاري (٢١٧٧) و مسلم (١٥٨٤ ، ٧٦/ ١٥٨٤)

٢) رواه البخاري (٢١٣٤، ٢١٧٠، ٢١٧٤) و مسلم (١٥٨٦)

**پێنجەم: ئەگەر ئەو شتانەی لە فەرموودەکەی عوبادەی کوڕی صامیتدا هاتوون بفرۆشێن بەیەکتری وەك ئاڵتون بەزیو یا ئاڵتون بەخورما یا گەنم بەجۆ، خورما بەگەنم ئەوە دروستە یەکێکیان زیاتر بێت لەوەی تریان بەمەرجێ دەست بەدەست بێت.**

(فإذا اخْتَلَفَ فيه الأَوْصَافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إذا كان يَداً بِيَدٍ).[1] پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کۆتایی فەرمودەکەدا فەرمووی: (ئەگەر ئەو شتانە (بەیەکتر فرۆشران یەك جۆر نەبوون) جیاواز بوون ئەوە چۆنتان ویست بیفرۆشن ئەگەر دەست بەدەست بوو).

**شەشەم: نابێ شتێک بەرەگەزی خۆی بفرۆشرێت مەگەر بزانرێت بەقەدەر یەکن:**

(عن جَابِرَ بن عبد اللَّهِ قال: نهى رسول اللَّهِ ﷺ عن بَيْعِ الصُّبْرَةِ من التَّمْرِ لَا يُعْلَمُ مَكِيلُهَا بِالْكَيْلِ الْمُسَمَّى من التَّمْرِ).[2] جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردووە لەفرۆشتنی کومایە –خەرمانێ- خورما کە نەزانرێت پێوانەی چەندە بەخورمایەکی پێوانەکراو).

**حەوتەم: فرۆشتنی عەرایا ڕێگەی پێدراوە:**

عەرایا: کڕینی خورمای تازە پێگەیشتووە دەخەملێنرێ بەخورمای ووشك ئەوەی دەیکڕێ بۆ خواردنی خۆیو خێزانی دەکڕێ، لەبەر پێویستی ڕێگەی پێدراوە.

(عن زَيْدِ بن ثَابِتٍ رضي الله عَنْهُمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ فِي الْعَرَايَا أَنْ تُبَاعَ بِخَرْصِهَا كَيْلًا).[3] زەید کوڕی سابیت (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگەی دا خورمای تەڕو تازە بفرۆشرێت بەخەمڵاندنی بە ئەندازەی خورمای ووشك).

**هەشتەم: دروستە ئاژەڵێک بفرۆشرێت بەدوو یان زیاتر لەوێنەی خۆی:**

(عن عبد اللَّهِ بن عَمْرٍو أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَهُ أَنْ يُجَهِّزَ جَيْشًا فَنَفِدَتْ الْإِبِلُ فَأَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ فِي قِلَاصِ الصَّدَقَةِ فَكَانَ يَأْخُذُ الْبَعِيرَ بِالْبَعِيرَيْنِ إلى إِبِلِ الصَّدَقَةِ).[4] عەبدوڵلای کوڕی عەمر (ڕەزای

---

١) رواه مسلم (٨١/ ١٥٨٧)

٢) رواه مسلم (٤٢ / ١٥٣)

٣) رواه البخاري (٢١٩٢) و مسلم (١٥٣٠)

٤) رواه ابو داود (٣٣٥٧) وهو حديث حسن

خوای لێ بی)دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکرد لەشکرییەك ئامادە بکات، ووشتر تەواو بوو ئەنجا فەرمانی پێکرد کە لەبەچکە وشترەکانی زەکات بدات جا ووشترێکی وەردەگرت بەدوو بەچکە ووشتری زەکات).

**نۆیەم: کڕین و فرۆشتنی عینە دروست نییە:**

کڕین و فرۆشتنی عینە: ئەوەیە فرۆشیار کەلوپەلێك دەفرۆشێت بەقەرز بەکەسێك بەنرخێك پاشان لێی دەکڕێتەوە بەپارەی حازر بەنرخێکی کەمتر لەونرخەی پێی فرۆشتووە.

(عن ابن عُمَرَ قال سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول إذا تَبَايَعْتُمْ بِالْعِينَةِ وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ الْبَقَرِ وَرَضِيتُمْ بِالزَّرْعِ وَتَرَكْتُمْ الْجِهَادَ سَلَّطَ الله عَلَيْكُمْ ذُلًّا لَا يَنْزِعُهُ حتى تَرْجِعُوا إلى دِينِكُمْ).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر کڕین و فرۆشتنی عینەتان کردو دەستتان گرت بەکلکی مانگاوەو -ئاژەڵداریتان کرد- ڕازی بوون بەکشتوکاڵ کردن و وازتان لەخەبات و تیکۆشان هێنا خوا سەرشۆڕی و زەلیلییەکتان بەسەردا دێنێ لاینابات لەسەرتان هەتا نەگەڕێنەوە بۆ ئایینەکەتان).

---

١) رواه ابو داود (٣٤٦٢) وهو حديث حسن

# سەلەم

**یەکەم: سەلەم چی یە؟** فرۆشتنی شتێکی دیاری کراوە لەئەستۆی فرۆشیارەکەدا بێ بەنرخێکی پێش خراو. وەك سەلەمدەر بڵێ: ئەم ملیۆن دینارەمدا بەتۆ لەسەلەمی پەنجا تەنەکە گەنمی موصلی لەرەمەزاندا تەسلیمم بکە، سەلەم لەگەڵکراویش قبوڵی بکات، هەر لەدانیشتنەکەدا ملیونە دینارەکەی لێ وەربگرێ.

**دووەم: بەڵگەی دروستی سەلەم:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ ﴾ البقرة: ٢٨٢ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر قەرزێکتان دا بەکەسێك بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بینوسن.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: شایەتی ئەدەم سەلەمی زەمانەت کراو بۆماوەیەکی دیاری کراو خوای گەورە لەقورئانەکەیدا حەڵاڵی کردووەو ڕێگەی پێداوە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ ).[1]

عن ابن عَبَّاسٍ قال (قَدِمَ النبي ﷺ الْمَدِينَةَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ فِي الثِّمَارِ السَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ فقال من أَسْلَفَ فِي تَمْرٍ فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ إلى أَجَلٍ مَعْلُومٍ).[2] هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەدینەی پیرۆز، لەوکاتەدا دانیشتوانی مەدینە سەلەمیان لەمیوەدا دەکرد بۆماوەی ساڵێك و دووساڵ، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەسێك لەشتێکدا سەلەمی کرد، با لەپێوانو کێشانێکی زانراودا، بۆماوەیەکی دیاری کراو سەلەم بکات).

---

١) رواه الشافعي (١٣١٤) و الحاكم (٢/ ٢٨٦) و البهيقي (٦/ ١٨) بسند صحيح بروانە (ارواء الغليل ٥/٢١٣) (١٣٦٩)

٢) رواه البخاري (٢٢٣٩، ٢٢٤٠، ٢٢٥٣) و مسلم (١٦٠٤)

یەك دەنگی زانایانیشی لەسەرە پێشەوا شافیعی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: یەك دەنگی لەسەر دروستی سەلەم هەیە ئەوەندەی من بزانم‌و ئاگادارېم.

**سێ یەم: پایەو مەرجەکانی سەلەم:**

**پایەکانی سەلەم چوارن:** سەلەمدەرو سەلەم وەرگر، ووتەی پێدان‌و وەرگرتن (الصیغة) دەستمایە، سەلەم لەسەرکراو.

**أ- سەلەمدەرو سەلەم وەرگر:** ئەو مەرجانەی لەکڕیارو فرۆشیاردا پێویستە لەمانیشدا پێویستە لەباسی کڕین‌و فرۆشتندا ئەو مەرجانەمان باسکرد دووبارەی ناکەینەوە چونکە هەرهەمان باسە تەنها مەرجی بینین نەبێ، کە سەلەم کردنی دروستە، بەڵام کڕین‌و فرۆشتنی دروست نییە، چونکە لەفرۆشتندا دەبێت فرۆشراوەکە ببینین، بەڵام لەسەلەمدا ناونیشان دەکرێت لەگەردنی سەلەم وەرگردایە دەتوانێ بەبیستن ناونیشانەکان بزانێ وە لەکاتی وەرگرتنیشدا کەسێك دەکاتە وەکیلی خۆی بۆ ڕاستی ناونیشانەکان.

**ب - ووتەی پێدان‌و وەرگرتن (الصیغة):**

ئەوەیە سەلەمدەر بڵێ: ئەم سەد هەزار دینارەم دابەتۆ لەسەلەمی دە کراسدا بە ئەو ناونیشانانە مانگێکی تر تەسلیمم بکە، سەلەم وەرگریش بڵێ: قبوڵم کرد لەهەمان کاتداو لەهەمان دانیشگەدا هەموو مەرجەکان لە (صیغة)ی کڕین‌و فرۆشتندا پێویست بوون لەمیشدا پێویستە بن.

- دەبێت بەووشەی سەلەم یان سەلەف بێت، بەووشەی تر جگە لەم دوو ووشە دروست نییە.

- هەروەها مەرجە دەستمایەکە لەهەمان دانیشگەدا تەسلیم بکرێت، وە پەشیمانبوونەوە دروستە لەهەمان دانیشگەدا.

**ج - دەستمایە:** ئەو پارەیەیە کە کڕیار دەیدات بەفرۆشیار لەدانیشگەی مامەڵەکەدا کە دەبێت ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

**١- کڕیارو فرۆشیار پێویستە بزانن چەندەو چۆنە:** بۆ نمونە هەزار دیناری عێراقی، ئەگەر شتو مەك بوو وەك گەنم دەبێ ئەندازەکەی بزانرێت بەپێوانە یا کێشانە لەگەڵ ڕوونکردنەوە چاکی‌و خراپیدا.

**٢ـ لەدانیشگەدا:** سەلەم دەر پارەکە بدات بەسەلەم وەرگر: پێش ئەوەی لەیەکتر جیاببنەوە چونکە سەلەم بریتییە لەپارە تەسلیم کردن ئەگەر نەکرا ئەوە سەلەمەکە دروست نییە.

**دـ سەلەم لەسەرکراوەکە:** بریتییە لەو شتەی دەفرۆشرێت، کە فرۆشیار بەڵێن دەدات بیدات بەسەلەم دەر لەبەرانبەر ئەو پارەیەی سەلەم دەرەکە دەیداتێ، وە دەبێت ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١ـ دەبێت لەو شتانە بێت بەوەسف کردن چۆنێتیێو چەندێتی بزانرێت، بەجۆرێ جیا ببێتەوە لەشتی تر بۆئەوەی ناکۆکیو کێشەی تێدا نەبێ. بەڵگەی ئەمە:

(عن عبدالله بن أبي أَوْفَى رضي الله عنه قال: إِنَّا كنا نُسْلِفُ على عَهْدِ رسول اللَّهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ فِي الْحِنْطَةِ وَالشَّعِيرِ وَالزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ).[1] عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفا (ڕەزای خوای لێ بێ)دەڵێ: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خواو (ﷺ)و ئەبو بەکر و عومەردا (ڕەزای خوای لێ بێ) سەلەمان دەکرد لەگەنمو جۆو مێوژو خورمادا)

ئەمانەی لەم فەرمودەدا هاتوون هەموویان کێشانەو پێوانە دەکرێنو وەسف دەکرێن بەجۆرێ دواتر ناکۆکی لەسەر دروست نەبێ.

٢ـ دەبێ سەلەم لەسەرکراو زانراو بێت، ڕەگەزو جۆرو ئەندازەو سیفەتی لای سەلەم دەرو سەلەم وەرگر.(عن ابن عَبَّاسٍ قال( قَدِمَ النبي ﷺ الْمَدِينَةَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ في الثِّمَارِ السَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ فقال من أَسْلَفَ في تَمْرٍ فَلْيُسْلِفْ في كَيْلٍ مَعْلُومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ إلى أَجَلٍ مَعْلُومٍ).[2] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بی) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەسێك لەشتێکدا سەلەمی کرد با لەپێوانو کێشانێکی زانراودا، بۆ ماوەیەکی دیاری کراو سەلەم بکات).

٣ـ نابێ تێکەڵ بێت لەچەند جۆرە شتێك، وەك گەنمو جۆ کە نەزانرێت ڕێژەی هەریەکەیان چەندە ئەگەر ڕێژەیان دیار بوو دروستە وەك قوماش دروست کرابێ لەخوریو لۆکەو ڕێژەی هەریەکەیان دەزانرێ.

---

١) رواه البخاري (٢١٢٨)

٢) رواه البخاري (٢٢٣٩، ٢٢٤٠، ٢٢٥٣) و مسلم (١٦٠٤)

٤ـ سەلەم لەسەر کراوەکە دەبێ قەرز بێت لەئەستۆی سەلەم وەرگردا، چونکە سەلەم فرۆشتنی شتێکی وەسف کراوە لەئەستۆی سەلەم وەرگردا ئەگەر ئامادەو بەبەرچاوەوە بوو ئەوە سەلەم نیە.

٥ـ دەبێ بتوانێ سەلەم لەسەرکراوەکە تەسلیم بکات: لەکاتو شوێنی دیاری کراودا تەسلیمی سەلەم دەری بکات بەو جۆرە بێت وەسف کراوە لەپێشدا کەواتە دروست نییە سەلەم بکات لەشتێکدا لەکاتی بۆ دیاری کراودا نییە وەك ترێو خورما لەزستاندا.

٦ـ کاتی تەسلیم کردنی سەلەم لەسەرکراو دیاری کراو بێت:

بۆ نموونە بڵێ سەد هەزار دینارم دابەتۆ لەسەلەمی دە کراسدا واو وا بن پاش مانگێکی تر تەسلیمم بکەیت، ئەگەر کاتی دیاری نەکرد یا کاتێکی نەزانراوی دیاری کرد ئەوە دروست نییە بەبەڵگە (... بۆ ماوەی دیاری کراو سەلەم بکات).[1]

٧ـ شوێنی تەسلیم کردنی سەلەمە لەسەر کراوە دیاری بێت: ئەگەر ئەو شوێنەی مامەڵەی سەلەمەکەیان تێدا کردووە گونجاو نەبوو بۆ تەسلیمکردنی سەلەمە لەسەر کراوەکە یا دەگونجا، بەڵام هێنانی بۆ ئەوێ خەرج و مەسرەفی دەویست ، ئەوە دەبێ شوێنی تەسلیم کردنی دیاربکرێت.

بەڵام ئەگەر شوێنەکە مامەڵەکەی تێداکراوە دەگونجاو هیچ خەرجیش نەدەویست بۆ هێنانی ئەوە لەوێدا تەسلیمی دەکات ئەگەر شوێن دیاری نەکرابوو بەڵام ئەگەر دیارکرا بوو ئەبێ لەو شوێنەدا تەسلیمی سەلەمەرەکەی بکات .

١) سەرچاوەی پێشوو

# قەرز ( القرض )

**یەکەم: مانای قەرز:**

(قرض) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای بریتی و جیاکردنەوەیە، بۆیە بەماڵی بە قەرزدارو دەڵێن چونکە قەرزدەر ئەو ماڵە لە ماڵی خۆی جیادەکاتەوە.

**لە شەرعدا:** بەو ماڵە دەوترێت کە قەرزدەر دەیدات بە قەرز وەرگر کە وەك خۆی بێ زیادەو کەم بیداتەوە کاتێ توانای هەبوو.

**دووەم: بەڵگەی دروستی قەرزدان و وەرگرتنی:**

قەرزدان و قەرزوەرگرتن دروستە هیچ خراپەیەکی تێدانییە، بەڵکو قەرزادان سوننەتە گەر داوا لێکراو هەیبوو بیدات.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ﴾ البقرة: ٢٤٥ واتە: کێیە ئەو کەسەی دەست قەرزدەدات بە خوا خواش چەند بەرانبەری دەیداتەوە .

ئەم قەرزدانە بە خواو ماڵی بەخشین لەرێ خوادا دەگرێتەوە هەروەها قەرزدان بە خەڵکیش دەگرێتەوە .

(عن ابن مسعود أن النبي ﷺ قال ما من مسلم يقرض مسلما قرضا مرتين إلا كان كصدقتها مرة).[1] عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر موسڵمانێك دوو جار قەرز بە موسڵمانێك بدات ئەوە وەك ئەوە وایە جارێك بە خێر پێی دابێت).

(عن أبي هريرة أن رسول الله ﷺ قال من أخذ أموال الناس يريد أداءها أداها الله عنه ومن أخذها يريد اتلافها أتلفها الله).[2] ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ)

---

١) رواه ابن ماجه (٢٤٣٠) و ابن حبان (١١٥) وهو حديث حسن

٢) رواه البخاري (٢٢٥٧)

فەرمووی: (هەر کەس پارەو ماڵی خەڵك ببات بیەوێ بیداتەوە ئەوە خوای گەورە بۆی جێبەجێ دەکات و دەیداتەوە، بەڵام هەر کەس بیبات و بیەوێ نەیداتەوە لەناوی ببات ئەوە خوای گەورە لەناوی دەبات ـ ناتوانێ بیداتەوەـ).

وە زانایانی ئیسلام یەك دەنگن لەسەر دروستی قەرز، چونکە لەسەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کاری پێ دەکرێ تا ئەمڕۆ بێ ئەوەی کەس ئینکاری بکات.

**سێ یەم: حیکمەتی دروستی قەرز چییە:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ عن النبي ﷺ قال من نَفَّسَ عن مُسْلِمٍ كُرْبَةً من كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ الله عنه كُرْبَةً من كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَمَنْ يَسَّرَ على مُعْسِرٍ يَسَّرَ الله عليه في الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمَنْ سَتَرَ على مُسْلِمٍ سَتَرَ الله عليه في الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ في عَوْنِ الْعَبْدِ ما كان الْعَبْدُ في عَوْنِ أَخِيهِ).[1] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (هەر کەس نارحەتیەك لە نارەحەتیەکانی دونیا لەسەر موسڵمانێك لاببات ئەوە خوای گەورە نارەحەتیەك لە نارەتیەکانی ڕۆژی دوایی لەسەر لادەبات وە هەر کەسێك ئاسانکاری بکات بۆ قەرزارێکی نەدار خوای گەورە لە دونیاو دوارۆژدا ئاسانکاری بۆ دەکات وە خوای گەورە بەردەوامە لە یارمەتیدانی بەندەکەیدایە هەتا بەندە بەردەوام بێت لە یارمەتیدانی براکەی).

حیکمەتی قەرزدان هاوکاری و یارمەتی دانی یەکترییە لەناو موسڵماناندا و بەهێزکردنی گیانی برایەتی یە لە نێوانیاندا وە بەتەنگ یەکەوە بوونە لە نەبوونی و هەژاریدا و لابردنی نارەحەتیی و سەختییە لەسەر بێ نەواو و دەست کورتان.

**چوارەم: هەندێ لە حوکمەکانی قەرزدان:**

**أـ قەرزدانی حەرام:** هەندێ جار قەرزدان حەرامە، کاتێ بزانی ئەو کەسە قەرزدەکات بۆ ئەوە ئەو پارەیە لە ڕێگەی حەرام و نارەوادا خەرج بکات وەك قومارو عارەق خواردنەوە و ئەو جۆرە شتانە.

---

[1]) رواه مسلم (٢٦٩٩)

**ب ـ قەرزدانی ناپەسەند (مەکروه):** کاتێ بزانێ کەسێ قەرز دەکات بۆ ئەوەی خەرجی کات لە شتێکی کە هیچ بەرژەوەندییەکی تێدانیە یا هەروا بە فیڕۆی دەدات، یا قەرزکەر دەزانێت ناتوانێ بیداتەوە.

**ج ـ قەرزدانی واجب:** کاتێکە قەردار بزانێ قەرزکەر قەرزدەکات بۆ پێویستی خۆی و ماڵ و منداڵ و بۆ شتی ڕەوا و بەجێ وە جگە لە قەرزکردن ڕێگەیەکی تری نییە.

**پێنجەم:پایەکانی قەرز:**

**قەرز سێ پایەی هەیە:** وتەی پێدان و وەرگرتن (الصیغة) قەرزدەرو قەرزکەر و ماڵە قەرزکراوەکە.

**أـ وتەی پێدان و وەرگرتن (الصیغة):**

ئەوەیە قەرزدەر بڵێ ئەو پارەم بە قەرز پێدای، قەرزەکەریش بڵێ وەرم گرت.

مەرج نیە بە ووشەی قەرز بێت، بەڵکو هەر ووشەیەکی تریش مانای قەرز بگەیەنێ دروستە بەکاربهێنرێ لە جیاتی قەرز.

**ب ـ قەرزدارو قەرزکەر مەرجەکانیان:**

١ـ **ڕەشید بێ:** واتە بالغ بێ و قازانجی ئاین و ماڵ و سامان بزانێ ، چونکە ئاڵوگۆرکردنە بە ماڵ و سامان پێویستی بە سەلیقەو زانین هەیە کەواتە قەرزکردنی منداڵ و شێت و نازانێ کڕین و فرۆشتن وەك پێویست بکات دروست نیە چونکە هیچ یەك لەمانە ڕێگەیان پێ نەدراوە کاروباری ماڵ و سامانی بکەن.

٢ـ **سەربەست بوون:** کەسێ زۆرلێکراو بێت قەرزدان و یا وەرگرتنی دروست نیە، چونکە ڕەزامەندی کە مەرجە لەم کەسەدا نیە.

٣ـ قەرزدەر توانای بەخشینی ئەو ماڵەی هەبێ دەیدات بە قەرز:

چونکە قەرزدان جۆرە ماڵ بەخشینێکی تێدایە ، بۆیە دەبێ قەرز دەر بتوانێ ماڵ ببەخشێ ، کەواتە وەلی و سەرپەرشتیار ناتوانێ ماڵی ئەوەی ئەو سەرپەرشتی دەکات بدات بە قەرز مەگەر بەژەوەندی سەرپەرشتی کراوەکە لەم قەرزدانەدا بێت.

**ج ـ ماڵ و پارە قەرزکراوەکە:**

هەر ماڵێك یا شتێك کڕین و فرۆشتنی دروست بێ، قەرزکردن و قەرزدانیشی دروستە.

**شەشەم: قەرزکەر دەبێت ئەوەی قەرزی کردووە بیگێڕێتەوە:**

چونکە ئەگەر زیاتر لەوەی قەرزی کردووە لێی داوا بکرێت بیگێڕێتەوە ئەو ریبایە، بەڵکو دیاری بردن بۆ قەرزدەر لەلایەن قەرزکەرەوە ریبایە، (عن أَبِي بُرْدَةَ أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ فَلَقِيتُ عَبْدَ اللَّهِ بن سَلَامٍ رضي الله عنه ثُمَّ قال إِنَّكَ بِأَرْضٍ الرِّبَا بها فَاشٍ إذا كان لك على رَجُلٍ حَقٌّ فَأَهْدَى إِلَيْكَ حِمْلَ تِبْنٍ أو حِمْلَ شَعِيرٍ أو حِمْلَ قَتٍّ فلا تَأْخُذْهُ فإنه رِبًا).[1] ئەبوبوردە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: هاتم بۆ مەدینە بە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام گەیشتم (ڕەزای خوای لێ بێ)..... پاشان وتی: تۆ لە خاك و وڵاتێکدای سوو تێیدا بڵاوە جا ئەگەر مافێکت بەلای کەسێکەوە بوو جا بارێ گەنمی کا یا بارێ جۆ یا بارێ بەدیاری بۆ هێنای ئەوە بێگومان ریبایە).

**حەوتەم: دروستە قەرزکەر زیاتر لە قەرزەکە بداتەوە بە قەرزدەر:**

ئەگەر لە کاتی قەرزدانەکەدا بەمەرج دانەنرابوو، (عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ قال أَتَيْتُ النبي ﷺ وهو في الْمَسْجِدِ قال مِسْعَرٌ أُرَاهُ قال ضُحًى فقال صَلِّ رَكْعَتَيْنِ وكان لي عليه دَيْنٌ فَقَضَانِي وَزَادَنِي).[2] جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ : ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتێکدا لە مزگەوتدابوو ( میسعر دەڵێ: وابزانم جابیر ووتی چێشتەنگابوو) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (دوو رکات نوێژ بکە) من قەرزێکم لای پێغەمبەر بوو (ﷺ) جا قەرزەکەی دامەوە بە زیادەوە).

**هەشتەم: مۆڵەت دانی قەرزاری نەبوو:**

ئەگەر قەرزا نەیبوو قەرزەکە بداتەوە سوننەتە لەسەری بوەستێ و مۆڵەتی بدەی تا ئەیبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن

---

١) رواه البخاري (٣٨١٤)

٢) رواه البخاري (٢٣٩٤) و مسلم (٧١ /٧١٥)

كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢٨٠ واته ئەگەر قەرزدار نەداربوو ئەوە مۆڵەتی بدرێ تا دەولەمەند دەبێ خۆ ئەگەر( لە قەرزەکە ) ئازادی کەن ئەوە بۆخۆتان باشترە ئەگەر بزانن.

(عن حُذَيْفَةَ رضي الله عنه قال سمعت النبي ﷺ يقول مَاتَ رَجُلٌ فَقِيلَ له ما كنت تقول ؟ قال كنت أُبَايِعُ الناس فَأَتَجَوَّزُ عن الْمُوسِرِ وَأُخَفِّفُ عن الْمُعْسِرِ فَغُفِرَ له قال أبو مَسْعُودٍ سَمِعْتُهُ من النبي ﷺ).[1] حوزەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ : لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست فەرمووی: (پیاوێك مرد پێی ووترا تۆ چی دەڵێی؟ ووتی شتم بە خەڵکی دەفرۆشت ئەوەی دەوڵەندبوایە چاوپۆشیم لێ دەکرد وە ئەوەی دەست کورت و هەژار بوایە لەسەریم سووك دەکرد جا بەخشرا - خو لێی خۆش بوو - ) جا ئەبو مەسعود (کە حوزیفەیە ) دەڵێ ئەمەم لە پێغەمبەر (ﷺ) بیست.

**نۆیەم: قەرز کوێری دەوڵەمەند ستەمە:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ).[2] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ( دواخستنی دانەوەی قەرز بۆ دەوڵەمەند ستەمە).

**دەیەم: قەرزکەر بیەوێ بیداتەوە یان نەیداتەوە:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال من أَخَذَ أَمْوَالَ الناس يُرِيدُ أَدَاءَهَا أَدَّى الله عنه وَمَنْ أَخَذَ يُرِيدُ إِتْلَافَهَا أَتْلَفَهُ الله).[3] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس ماڵی خەڵك ببات و بیەوێ بیداتەوە خوای بۆی ئەداتەوە، بەڵام ئەو کەسەی ماڵی خەڵك ببات بیەوێ لەناوی ببات — بیخوات — ئەوە خوا لەناوی دەبات).

**یانزەیەم: قەرزدانەوەی چاك:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال كان لِرَجُلٍ على النبي ﷺ سِنٌّ من الْإِبِلِ فَجَاءَهُ يَتَقَاضَاهُ فقال أَعْطُوهُ فَطَلَبُوا سِنَّهُ فلم يَجِدُوا له إلا سِنًّا فَوْقَهَا فقال أَعْطُوهُ فقال أَوْفَيْتَنِي أَوْفَى الله بِكَ قال النبي

---

١) رواه البخاري (٢٣٩١)

٢) رواه البخاري (٢٤٠٠) و مسلم (١٥٦٤)

٣) رواه البخاري (٢٣٨٧)

ﷺ إِنَّ خِيَارَكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضَاءً).[1] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پیاوێك ووشترێکی شەش ساڵی بەقەرزدابوو بە پێغەمبەر (ﷺ) جا هاتبوو داوای کرد قەرزەکەی بداتەوە فەرمووی (ووشترەکەی بدەنەوە) هاوەڵانیش گەڕان بۆ ووشترێکی وەك ووشترەکەی خۆی لە تەمەندا بەڵام دەستیان نەکەوت ووشترێك نەبێ ساڵێك لەوی خۆی گەورەتر بوو فەرمووی (بیدەنێ) کابرا ووتی پێت دامەوە بە چاکتر خوا چاکتر بداتێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: چاکترینتان ئەو کەسەیە بە جوانی قەرز بداتەوە).

---

١) رواه البخاري (٢٣٠٥) و مسلم (١٦٠٥)

# بە کرێدان و بە کرێگرتن (الإجارة)

**یەکەم: مانای (إجارة) لەزمان و شەرعدا:**

**ئیجارە لە زمانی عەرەبیدا واتە:** پاداشت دانەوە وە ناوە بۆ ئەو کرێیەی دەدرێت بەو کەسەی کارێکی کردووە لەبەرانبەر کارەکەیدا، وە ووشەی (أجر) بە زۆری بۆ پاداشتی دوارۆژ بەکاردەهێنرێ وە (أُجرة) بۆ پاداشتی دونیا بەکاردەهێنرێ .

**لەشەرعدا:** سوودێك بکرێتە مولکی کەسێك لەبەرانبەر وەرگرتنی شتێك بەو مەرجانەی دواتر باسیان دەکەین.

**دووەم: بەڵگەی دروستی بەکرێدان:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ﴾ **الطلاق: ٦** واتە: جا ئەگەر شیریان دا بە منداڵەکەتان ئەوا ئێوەش کرێیان بدەنێ.

وە دەفەرمووێ: ﴿ قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ ۖ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ ﴾ **القصص: ٢٦** واتە: کچێکتان ـ لە دوو کچکە ـ ووتی ئەی بابەگیان بە کرێ بگرە ـ بۆ شوانی ـ چونکە بەراستی چاکترین کەسە بەکرێی بگری بەهێزو ئەمینەوەوە دەفەرمووێ: ﴿ فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ فَأَقَامَهُ ۖ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴾ **الكهف: ٧٧** واتە: ئەنجا لەو شارەدا دیوارێکیان بینی نزیك بوو بکەوێ (بەندە چاکەکە لەگەڵ مووسادا بوو) دیوارەکەی چاککردەوە ( مووسا ) ووتی ئەگەر بتویستایە کرێیەکت لەبەرانبەر وەردەگرت.

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنهاقالت :( وَاسْتَأْجَرَ النبي ﷺ وأبو بَكْرٍ رَجُلًا من بَنِي الدِّيلِ هَادِيًا خِرِّيتًا)[١] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) پیاوێکی ڕێنیشاندەری زۆر شارەزا لە ڕێگاوبانیان بە کرێ گرت لە هۆزی دیل بوو- تا ڕێگا نیشاندەریان بێت بۆ مەدینە).

---

١) رواه البخاري (٢٢٦٢)

**سێ یەم: پایەکانی بەکرێدان:**

پایەکانی بەکرێدان چوارن: بەکرێدەرو بەکرێگر، وتەی بە کرێدان و بە کرێگرتن، کەڵك و سوود بە کرێ دراوەکە، کرێ.

**چوارەم: مەرجەکانی دروستی بەکرێدان:**

أ- ڕازیبوونی هەردوولا بەکرێدەرو بەکرێگر، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَـٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ۚ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾ النساء: ٢٩ واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە ماڵ و سامانی یەکتری مەخۆن بە ناهەق مەگەر بازرگانیەك بێت بە ڕەزامەندی بێت لە نێوانتاندا وە خۆتان مەکوژن چونکە خوا میهرەبانە پێتان.

ب ـ زانینی ئەو سوودو کەڵکەی پەیمانەکەی لەسەر بەستراوە بە چاکی ، تا ڕێگر بێت لە ناکۆکیو ناژاوە، ئەویش بە بینینی ئەو شتەی بە کرێ دەگیرێ یا بە وەسف کردنی بە تەواوی.

ج ـ ئەوەی پەیمانەکەی لەسەر بەستراوە دەبێ بەجێ بگات بەراستی و بەپێی شەرع.

د- توانای تەسلیم کردنی بەکرێ گیراوەکە و سوود لێ وەرگرتنی بە گشتی، کەواتە شتی داگیرکراو یا وڵاغی بەرەڵابوو دروست نییە چونکە توانای تەسلیم کردنیان نیە.

هـ ـ ئەبێ کەڵك و سوودەکە حەڵاڵی و ڕەوا بێت ، نابێ حەرام یا واجب بێت، چونکە بەکرێگرتن لەسەر شتی حەرام دورست نییە هەروەها شتی فەرز وەك نوێژ و ڕۆژوو بەکرێ گرتن لەسەر ئەمانە دروست نییە چونکە فەرزی عەینن دەبێ خودی کەسەکە بیکات نەك کەسێکی تر.

**پێنجەم: حوکمەکانی بە کرێگرتن و بەکرێدان:**

أ- هەر کارو ئیشێك لە شەرعدا ڕەوا بێت کرێ وەرگرتن و کرێ دان لەسەری دروستە بەڵگەی زۆری لەسەرە لەوانە: (عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال ما بَعَثَ الله نَبِيًّا إلا رَعَى الْغَنَمَ)[1]. ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بی) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوا هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ شوانی مەڕو ماڵاتی کردووە،......).

---

١) رواه البخاري (٢٢٦٢)

(سُوَيْدُ بن قَيْسٍ قال جَلَبْتُ أنا ومخرمة الْعَبْدِيُّ بَزًّا من هَجَرَ فَأَتَيْنَا بِهِ مَكَّةَ فَجَاءَنَا رسول اللَّهِ ﷺ يَمْشِي فَسَاوَمَنَا بِسَرَاوِيلَ فَبِعْنَاهُ وَثَمَّ رَجُلٌ يَزِنُ بِالْأَجْرِ فقال له رسول اللَّهِ ﷺ زِنْ وَأَرْجِحْ).[1]
سوەیدی کوڕی قەیس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: من و مەخرەمی عەبدی لە هجەر[2] هەندێ پۆشاکمان هێنابوو ( بۆ فرۆشتن ) جا هاتین بۆ مەککە جا پێغەمبەر (ﷺ) بە پیادە هات بۆ لامان و مامەڵەی شەرواڵێکی لەگەڵ کردین و پێمان فرۆشت، وە لەوێدا پیاوێکی لێبوو بە کرێ شتی دەکێشا، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی پێی: (کێشانەکەت با قورس بێ). واتە هەمیشە با شتە کێشراوەکە پارسەنگی هەبێ.

ب ـ ئەگەر کرێکە دیاری نەکرابوو:

ئەو کرێکارە کرێی کارەکەی دەکەوێت چەند بێت لەلای ئەو کەسانەی لەو جۆرە کاردەکەن بەبەڵگەی فەرموودەکەی سوەیدی کوڕی قەیس.

ج ـ قەدەغەکراوە بانگ بێژ لەسەر بانگدانەکەی کرێ وەربگرێت:

(عن عُثْمَانَ بن أبي الْعَاصِ قال يا رَسُولَ اللَّهِ اجْعَلْنِي إِمَامَ قَوْمِي، قال: أنت إِمَامُهُمْ وَاقْتَدِ بِأَضْعَفِهِمْ وَاتَّخِذْ مُؤَذِّنًا لَا يَأْخُذُ على أَذَانِهِ أَجْرًا).[3] عوسمانی کوڕی ئەبولعاص (ڕەزای خوای لێ بێ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بمکە بە پێش نوێژی هۆزەکەم فەرمووی (تۆ پێش نوێژیانی، بەپێی توانای لاوازترینیان پێش نوێژیان بۆ بکە، بانگ بێژێکیش دابنێ لەسەر بانگدانەکەی کرێ وەرنەگرێ).

د ـ دانەوێڵە هاڕین بە بەشێك لە هاڕاوەکە:

دروست نییە گەنم یا جۆ یا هەر دانەوێڵەیەکی تر بە بەشێکی دانەوێڵە هاڕاوەکە بهارێ لە جیاتی کرێی هاڕینەکە (عن أبي سعيد الخدري قال نهى عن عسب الفحل وعن قفيز الطحان).[4]

---

١) رواه ابو داود (٣٣٣٦) ز الترمذي (١٣٠٥) و النسائي ٧/ ٢٨٤ (٤٥٩٢) وابن ماجه (٢٢٢٠) وهو حديث صحيح
٢) هەجەر شارێکە لە بەحرەین
٣) رواه ابو داود (٥٣١) ز الترمذي (٢٠٩) و النسائي (٦٧٢) وابن ماجه (٧١٤) وهو حديث صحيح
٤) الطحاوي في مشكل الاثار (أ/ ٣٠٧) و الدار قطني ٤٧/٣ (١٩٥) و البيهقي ٣٣٩/٥ وهو حديث صحيح.

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی کردووە بەکرێ دانی پەڕینی ئاژەڵی نێر ( لە ئاژەڵی مێ ) و دانەوێڵە هاڕین بە بەشێك لە هاڕاوەکە).

هـ ـ بەکرێ گرتن بۆ قورئان خوێندن دروستە[1]:

(عن ابن عباس رضي الله عنه أن نفرا من أصحاب النبي ﷺ مروا بماء فيهم لـديغ أو سـليم فعرض لهم رجل من أهل الماء فقال هل فيكم من راق إن في الماء رجلا لديغا أو سليما فـانطلق رجل منهم فقرأ بفاتحة الكتاب على شاء فبرأ فجاء بالشاء إلى أصحابه فكرهوا ذلـك وقـالوا أخذت على كتاب الله أجرا حتى قدموا المدينة فقالوا يا رسول الله أخذ على كتاب الله أجـرا فقال رسول الله ﷺ ( إن أحق ما أخذتم عليه أجرا كتاب الله).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بەلای ئاوێکدا تێپەڕین خێڵێك لەوێدا بوون کەسێکیان مار پێوەی دابوو جا پیاوێك لە خێڵەکە هاتە بەردەم هاوەڵەکان وتی: کەسێکتان تێدا نیە دوعا خوێن بێت ؟ چونکە لەو خەڵکەی لای ئاوەکەدان پیاوێك مار پێوەی داوە، یەکێك لە هاوەڵان لەگەڵی ڕۆشت بەچەند سەرمەڕێك سورەتی فاتیحەی بەسەردا خوێند جا کابرا چاك بوویەوە، پاشان مەڕەکانی هێنایەوە بۆ ناو هاوەڵەکانی، ئەوانیش ئەو کارەیان بە باش نەزانی، وتیان: لەسەر کتێبی خوا (قورئان خوێندن ) کرێت وەرگرتووە؟ کاتێ هاتنەوە بۆ مەدینە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم هاوەڵەمان لەسەر قورئان کرێی وەرگرتووە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (شایستەترین شتێك کە کرێتان لەسەر وەرگرتبێ کتێبەکەی خودایە).

و ـ دروست نیە لەسەر فێرکردنی قورئان کرێ وەربگیرێ:

(عن أُبَيِّ بن كَعْبٍ قال عَلَّمْتُ رَجُلًا الْقُرْآنَ فَأَهْدَى إلى قَوْسًا فَذَكَرْتُ ذلك لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فقال إن أَخَذْتَهَا أَخَذْتَ قَوْسًا من نَارٍ فَرَدَدْتُهَا).[3] ئوبەی کوڕی کەعب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پیاوێکم فێری قورئان کرد ئەویش کەوانێکی بە دیاری بۆ هێنام منیش ئەوەم بۆ

---

١) بڕوانە (فتح الباري شرح صحيح البخاري ٥ / ٥٧ -٥٧٢) حديث (٢٢٧٦)

٢) رواه البخاري (٥٧٣٧)

٣) رواه ابن ماجه (٢١٥٨) و البيهقي (٦ / ١٢٥ - ١٢٦) وهو حديث صحيح

پێغەمبەری خوا (ﷺ) باس کرد، فەرمووی: (ئەگەر وەریگری ئەوە کەوانێك لەئاگر وەردەگری بۆیە منیش بۆم گێڕایەوە).

ز- دروستە بەکرێدانی شتێك بەکرێیەکی دیاری کراو بۆماوەیکی دیاریکراو:

(عن رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ قالَ: كُنَّا أَكْثَرَ الأَنْصَارِ حَقْلاً، قَالَ: كُنَّا نُكْرِي الأَرْضَ عَلَى أَنَّ لَنَا هَـــذِهِ وَلَهُمْ هَذِهِ فَرُبَّمَا أَخْرَجَتْ هَذِهِ وَلَمْ تُخْرِجْ هَذِهِ فَنَهَانَا عَنْ ذَلِكَ وَأَمَّا الْوَرِقُ فَلَمْ يَنْهَنَا).[1] رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خوای لێ بی) دەڵێ: ئێمە لەناو ئەنصاردا زەوی و زارمان لە هەموویان زیاتر بوو، دەڵێ: ئێمە زەویمان بە کرێ دەدا — بەرهەمی — ئەو بەشەی بۆ ئێمەو ئەو بەشیش بۆ ئەوان، جا جاری وا هەبووئەوەیان سەوز دەبوو ئەوەی تریان سەوز نەدەبوو بۆیە ئەوەمان لێ قەدەغەکرا، بەکرێدان بە پارە قەدەغە نەکراوە لێمان.

ح - بەکرێدانی زەوی بە کرێیەکی دیاریکراو دروستە :

(عن جَابِرٍ قال كنا نُخَابِرُ على عَهْدِ رسول اللّهِ ﷺ فَنُصِيبُ مِنَ الْبُسْرِ وَمِنْ كَذَا فقال من كانت له أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا أو لِيُحْرِثْهَا أَخَاهُ وَإِلاَّ فَلْيَدَعْهَا).[2] جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) زەویمان بە بەشێکی بەرهەمەکەی (سێ یەك یا چوار یەك) دەدا بەکرێ، وە بن بێژنگ و شتڕتریشمان بەردەکەوت، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس زەوییەکی هەبوو با خۆی بیچێنێ یان براکەی بیکێڵێ ئەگەر نا وازی لێبێنێ).

(عن سَعْدِ بن أبي وَقَّاصٍ قال كان أَصْحَابُ الْمَزَارِعِ يُكْرُونَ في زَمَانِ رسول اللّهِ ﷺ مَزَارِعَهُمْ بِمَا يَكُونُ على السَّاقِي من الزَّرْعِ فجاؤوا رَسُولَ اللّهِ ﷺ فَاخْتَصَمُوا في بَعْضِ ذلك فَنَهَاهُمْ رسول اللّهِ ﷺ أَنْ يُكْرُوا بِذَلِكَ وقال أَكْرُوا بِالذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ).[3] سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: ئەو کەسانەی کێڵگەو زەویان هەبوو لەسەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ) زەوییەکانیان بە کرێ دەدا بەبەرهەمی ئەوەی لە چۆگە یا لە ئاو هەڵگواستنەکە سەوز

---

١) رواه البخاري (٢٣٣٢) و مسلم (١٥٤٧)

٢) رواه مسلم (٩٥ / ١٥٣٦)

٣) رواه ابو داود (٣٣٩١) و النسائي ٧/ ٤١ وهو حديث حسن بشواهده.

دەبوو جا هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەسەر هەندێ لەو بارەیەوە کێشەیان بوو، پێغەمبەریش (ﷺ) ڕێگری لێکردن بەو جۆرە زەوی بە کرێ بدەن و فەرمووی: (بە ئاڵتون و زیو ( پارە ) بە کرێی بدەن).

ح ـ ئەگەر کرێکارەکە شتەکەی خراپ کرد یان تیاچوو زامن دەبێ:

ئەگەر کەسێك کارێك بکات بە کرێ و شتەکە خراپ کات زامن دەبێت، یان شتێك بە کرێ دەگرێ بەدەستیەوە دەفەوتێ ئەوە دیسان زامن دەبێ: (عن عَمْرِو بن شُعَيْبٍ عن أبيه عن جَدِّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من تَطَبَّبَ ولا يُعْلَمُ منه طِبٌّ فَهُوَ ضَامِنٌ).[1] عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوەو لە باپیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: هەر کەس چارەسەری نەخۆش بکات پزیشکی نەزانێ ئەو زامن دەبێ - نەخۆشەکە هەرچی بەسەر بێ -).

**ئاگاداری:** گوناهی ئەو کەسەی کرێی گرێکار نادات:

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال قال الله ثَلَاثَةٌ أنا خَصْمُهُمْ يوم الْقِيَامَةِ رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا فَأَكَلَ ثَمَنَهُ وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا فَاسْتَوْفَى منه ولم يُعْطِ أَجْرَهُ).[2] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە دەفەرمووێ: سێ کەس خۆم لە ڕۆژی دوایی دا داواچیم لە دژیان : کەسێك بەمن سوێند دەخوا پەیمان دەدا پاشان ڕاست ناکات و پەشیمان دەبێتەوە، وەکەسێك کەسێکی ئازاد - کۆیلە نیە - دەفرۆشێت و نرخەکەی دەخوات وە کەسێك کرێکارێك بە کرێ دەگرێ و کاری خۆی پێ تەواو دەکات و کرێکەی ناداتێ).

١) رواه ابو داود (٤٥٨٦) و النسائي ٨/ ٥٢ (٤٨٣٠) و ابن ماجه (٣٤٦٦) وهو حديث حسن

٢) رواه البخاري (٢٢٢٧)

# شەریکایەتی (الشركة)

**یەکەم: پێناسەی (شوکة)** لە زمانی عەرەبیدا بەمانای تێکەڵاوی دێت.

لە شەرعدا: مامەڵەیەکە لە نێوان دوو کەس یا زیاتر دا بە ڕەزامەندی خۆیان ئەنجامی دەدەن کە تێکەڵکردنی ماڵ و سامانە بە مەبەستی قازانج کردن وە هەندێ جار بەبێ ویست و ڕەزامەندی خۆیان ڕوودەدات وەك شەریکایەتی لە میرات دا.

**دووەم: بەشەکانی شەریکایەتی:** لە ڕووی مەبەست بوونی قازانج یان نەبوونی لە شەریکایەتی دا شەریکایەتی دەبێتە دوو بەشەوە:

**أ- شەریکایەتی لە موڵکدا:** ئەویە دووکەس یا زیاتر ببنە خاوەنی موڵکێك بە بێ ویست وَ ڕەزامەندی خۆیان وەك ئەوەی بە میرات بۆیان جێ بمێنێ، یان بەرەزامەندی و ویستی خۆیان پێکەوە ببنە خاوەنی موڵکێك وەك ئەوەی بەیەکەوە موڵکێك بکڕن یا کەسێکی تر پێیان ببەخشێ هەردووکیان وەریبگرن.

**حوکمی ئەو جۆرە شەریکایەتیە:**

هەریەکیان خاوەنی بەشی خۆیەتی و ناتوانێ هیچ مامەڵەو کارێك لەبەشی شەریکەکەیدا بکات بەپرس و مۆڵەتدانی شەریکەکەی نەبێ چونکە هیچیان دەسەڵاتی بەسەر بەشی شەریکەکەیدا نییە.

مەبەستی ئێمە لێرەدا لە شەریکایەتی ئەم جۆرە شەریکایەتیە نیە بەڵکو ئەمانە لە شوێنی خۆیاندا باسیان لێوە دەکرێت ، لە باس میرات و بەخشین و وسیەت دا.

**ب - شەرکایەتی پەیمان بەستن (شركة العقد):**

ئەم شەریکایەتییە مەبەستمانە لەم باسەدا کە پێشتر پێناسەمان کرد، ئەم شەریکایەتیەش چەند جۆرێکی هەیە، هەیانە دروستە و هەشیانە دروست نییە.

**سێ یەم: بەڵگەی دروستی شەریکایەتی پەیمان بەستن:**

بەشێوەیەکی گشتی شەریکایەتی دروست و رەوایە و لە قورئان و سونەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بەڵگەی دروستی و رەوابوونی هاتووە.

لە قورئاندا چەندین ئایەتی پیرۆز باس لە میرات دەکات کە میراتگرەکان هاوبەشن لەو ماڵەدا کە بە میرات بۆیان بەجێ ماوە بۆ نمونە دەفەرموێ:﴿ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ﴾ النساء: ١٢ واتە: ئەگەر پیاوێك یان ئافرەتێك كە میراتی لێ ئەگیرا ( مردبوو ) نە باوانی هەبوو نە منداڵ وە تەنها برایەك یان خوشكێكی ( لە دایكەوە ) هەبوو ئەوە بۆ هەر یەك لەو دووانە شەش یەك هەیە بەڵام ئەگەر زیاتر بوون لە برایەك یا خوشكێك (ی دایكی ) ئەو كاتە ئەوانە هەموویان لەسێ یەك - ی میراتەكەدا هاوبەشن.

ئەم ئایەتە بە روونی شەریکایەتی لە نێوان میراتگراندا باسکردووە کە برا دایکی یەکان لە سێیەکدا شەریکن. وە ئەم ئایەتەش ئاماژەی بە شەریکی و هاوبەشی تێدایە کە لەسەر زمانی داود پێغەمبەر (علیه الصلاه و السلام) دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾ ص: ٢٤ واتە: بێگومان زۆر لە شەریك و هاوبەشەكان ستەم لە یەكتری دەكەن.

**لەسوننەتی پێغەمبەردا** (ﷺ) (عن أبِي هُرَيْرَةَ رَفَعَهُ قال إنَّ اللّهَ يقول أنا ثَالِثُ الشَّرِيكَيْنِ ما لم يَخُنْ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ فإذا خَانَهُ خرَجْتُ من بَيْنِهِمَا)[1] ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە دەفەرموێ: من سێیەمی دوو شەرکەکانم تا خیانەت لەگەڵ یەکتری نەکەن، جا ئەگەر هەر کاتێك یەکێکیان خیانەتی لەگەڵ ئەوەی تر کرد من لە نێوانیان دەردەچم - واتە بەرەکەت لە ماڵەکەیاندا ناهێڵم- ).

عن السَّائِبِ قال (أَتَيْتُ النبي ﷺ فَجَعَلُوا يُثْنُونَ عَلَيَّ وَيَذْكُرُونِّي فقال رسول اللّهِ ﷺ أنا أَعْلَمُكُمْ يَعْنِي بِهِ قلت صَدَقْتَ بِأَبِي أنت وَأُمِّي كُنْتَ شَرِيكِي فَنِعْمَ الشَّرِيكُ كُنْتَ لَا تُدَارِي ولاتماري)[2]

---

١) رواه ابو داود (٣٣٨٣)

٢) رواه ابو داود (٤٨٣٦) و ابن ماجه (٢٢٨٧) وهو حديث صحيح

سائیب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) هاوەڵانی دەستیان کردە وەسف و سەنای من بە چاکە ناویان دەبردم، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (من لە هەمووتان چاکتر دەیناسم) منیش وتم: ڕاست دەکەی بە دایك و باوکەوە بە قوربانت بم: تۆ شەریکم بوی جا چاکترین شەریك بووی هەرگیز ڕێگری و دەمەقاڵەت لەگەڵدا نەدەکردم).

**چوارەم: جۆرەکانی شەریکایەتی پەیمان و حوکمەکانیان:**

**أ- شەریکایەتی لە ماڵێکدا بۆ ئەوەی بازرگانی پێوە بکەن (شركة العنان):**

ئەوەیە دوو کەس یان زیاتر بن بە شەریك لە ماڵێکدا بۆ بازرگانی پێوە کردن بەمەبەستی قازانج کردن، و قازانجەکەش هاوبەش بێت لە نێوانیاندا بە ئەندازەی ماڵەکەیان ، بەڵام ئەگەر خۆیان ڕازی بوون لە قازانج دا یەکسان بن با پارەکەشیان یەکسان نەبێت ئەوە دروستە حوکمی ئەو جۆرە شەریکایەتیی یە دروستەو ڕەوایە بەیەك دەنگی زانایان و شەرعزانان.

**ب - شەریکایەتی یەکسانی (شركة المفاوضة):**

ئەوەیە دوو کەس یان زیاتر لە ماڵ و سامان دا بن بە شەریك بەشێوەیەکی گشتی ، هەریەکەیان چی هەیە هەموویان تێیدا شەرکن وە هەر یەك لەوان وکیل و کەفیلی ئەوی ترە و بەشدارە لە قازانج و زەرەری شەریکەکەیدا حوکمی ئەم جۆرە لە شەریکایەتی:

بەلای زانایانی شافیعی یەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دروست نییە و بەتاڵە چونکە نادیاری و خەڵەتاندنی گەورەی تێدایە بەهۆی وەکیل بوون کەفیل کردن بەشێکی نەزانراو ئەوەش نادروستە.

**ج - شەریکایەتی لاشەکان (شركة الابدان):**

پێشیدەوترێت شەریکایەتی لە کارو ئیشدا، ئەوەیە دوو کەس یا زیاتر ڕێك بکەون کارێ بکەن ئەو پارەی پەیدا دەکەن لەنێوانیان بەشی بکەن بەپێی ڕێکەوتنیان پێشەکەیان یەك جۆر بێت یا جیاواز هەر قەیناکات، وەك دارتاشەکان و ئاسنگرەکان و بەرگ دروەکان ... هتد.

حوکمی ئەم شەریکایەتیە: دروست نیە چونکە زەرەرو زیان و فریودانی تێدایە ئەمە ڕای شافعییەکانە کە ڕای بەهێز ئەمەیە لەم باسەدا ، چونکە ئەو فەرموودەی لەم بارەیەوە هاتووەکە ڕێگە بەم شەریکایەتی دەدات لاوازە.

**د ـ شەرکایەتی پیاوماقوڵان (شركة الوجوه):**

ئەوەیە دوو کەس یا زیاتری متمانە پێکراو لەلایەن خەڵکەوە ببنە شەریك بۆ ئەوەی هەریەکەیان شت بە قەرز بکڕێت بۆ هەردووکیان پاشان ئەو شتە بفرۆشن جا ئەگەر قازانجی هەبوو ئەوە بەش دەکرێت لە نێوانیاندا بە یەکسانی یا بەپێی ڕێکەوتنیان.

حوکمی ئەم شەریکایەتیە: دروست نییە چونکە ماڵ و سامان نیە لە نێوانیاندا شەریکایەتیش لە بنەڕەتدا بە ماڵ دەبێت و دەکرێ ئەمە لەلایەك ، لەلایەکی ترەوە زەرەرو زیانی تێدایە چونکە هەریەکیان کارێك دەکات بەرانبەر نیە لەگەڵ ئەوی تریان لە کارەکەدا یا لە جۆری ئیشەکەدا ئەمە رای شافعییەکانە ئەم رایەش بەهێزە.

# حوکمەکانی شەریکایەتی شەرعی

**١ـ خەڵک لە ئاو ئاگرو لەوەڕدا هاوبەشن:** (عن أبي خِدَاشٍ عن رَجُلٍ من الْمُهَاجِرِينَ من أَصْحَابِ النبي ﷺ قال غَزَوْتُ مع النبي ﷺ ثَلَاثًا أَسْمَعُهُ يقول: الْمُسْلِمُونَ شُرَكَاءُ في ثَلَاثٍ في الكلأ وَالْمَاءِ وَالنَّارِ).[1] ئەبو خەدداش دەگێڕێتەوە لە پیاوێك لە کۆچەران کە هاوەڵی پێغەمبەر بوو (ﷺ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) سێ غەزام کردووە گوێم لێبوو فەرمووی : (موسڵمانان لە سێ شت دا هاوبەشن : لەوەڕو ئاو ئاگر).

مەبەست لە هاوبەشیان واتە هەموویان دەتوانن سوودی لێ وەرگرن و کەس ناتوانێ ڕێگری خەڵکی لێ بکات ئەم لە کاتێکدایە ئەو ئاو ئاگر و لەوەڕە لە جێگایەکدا نەبێت مولکی کەسێك بێت بەڵکو لە شوێنێکدا بێت مولکی کەس نەبێت و مافی هەمووان بێت.

**٢ـ دابەشکردنی ئاو بەسەر ئەوانەدا مافیان تێیدایە:**

(عن عبد اللَّهِ بن الزُّبَيْرِ رضي الله عنهما أَنَّ رَجُلًا من الْأَنْصَارِ خَاصَمَ الزُّبَيْرَ عِنْدَ النبي ﷺ في شِرَاجِ الْحَرَّةِ التي يَسْقُونَ بها النَّخْلَ فقال الْأَنْصَارِيُّ سَرِّحْ الْمَاءَ يَمُرُّ فَأَبَى عليه فَاخْتَصَمَا عِنْدَ النبي ﷺ فقال رسول اللَّهِ ﷺ لِلزُّبَيْرِ اسق يا زُبَيْرُ ثُمَّ أَرْسِلْ الْمَاءَ إلى جَارِكَ فَغَضِبَ الْأَنْصَارِيُّ فقال أَنْ كان ابن عَمَّتِكَ فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رسول اللَّهِ ﷺ ثُمَّ قال اسْقِ يا زُبَيْرُ ثُمَّ احْبِسْ الْمَاءَ حتى يَرْجِعَ إلى الْجَدْرِ فقال الزُّبَيْرُ والله إني لَأَحْسِبُ هذه الْآيَةَ نَزَلَتْ في ذلك ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴾ النساء: ٦٥. عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێ: پیاوێ لە ئەنصارەکان دەمەقاڵێ بوو لەگەڵ زوبێردا لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) لەسەر جۆگە ئاوی حەڕڕە کە خورماکانیان پێ ئاودەدا، ئەنصاری یەکە وتی: ئاوەکە بەردە بار بڕوات زوبێر ڕازی نەبوو، سکاڵایان هێنایە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بە زوبێر: (تۆ

---

١) رواه ابو داود (٣٤٧٧) و احمد (٣٦٤/٥)

باغەکەت ئاودە و دوای ئەوە ئاوەکە بەردە بۆ دروا‌سێکەت) ئەنصارییەکە رقی هەستاو ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەرئەوەی کە پورزاتە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) رەنگی دەم و چاوی تێکچوو پاشان فەرمووی: (ئەی زوبێر باغەکەت ئاودە پاشان ئاوەکە بگەرەوە با بگەرێتەوە بۆ پەنگاوەکان) زوبێر ووتی: وللاهی من وادەزانم ئەم ئایەتی لەم بارەیەوە هاتە خوارەوە: (سوێند بێ بە خوا باوەڕیان تەواو نیە هەتا تۆ نەکەن بە حەکەم لە هەموو ئەو ناکۆکیانەی لە نێوانیاندا پەیدا دەبێ پاشان هیچ بێزاریەك هەست پێ نەکەن لە دەرونییاندا لەو بڕیارەی تۆ داوتە و بە تەواوی ملکەچی بن)

**٣ـ قەدەغەکردنی زیادەی ئاو ببێتە قەدەغەکردنی لەوەڕ دروست نییە:**

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال لَا تَمْنَعُوا فَضْلَ الْمَاءِ لِتَمْنَعُوا بِهِ فَضْلَ الْكَلَإِ).[1] ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (زیادەی ئاو قەدەغە مەکەن تا نەبێتە هۆی قەدەغەکردنی زیادەی لەوەڕ).

**٤ـ دروستە هاوبەشی لە پارەو بازرگانیدا:**

عن أَبِي الْمِنْهَالِ قال:( بَاعَ شَرِيكٌ لِي وَرِقًا بِنَسِيئَةٍ إِلَى الْمَوْسِمِ أو إِلَى الْحَجِّ فَجَاءَ إِلَيَّ فَأَخْبَرَنِي فقلت هذا أَمْرٌ لَا يَصْلُحُ قال قد بِعْتُهُ في السُّوقِ فلم يُنْكِرْ ذلك عَلَيَّ أَحَدٌ فَأَتَيْتُ الْبَرَاءَ بن عَازِبٍ فَسَأَلْتُهُ فقال قَدِمَ النبي ﷺ الْمَدِينَةَ وَنَحْنُ نَبِيعُ هذا الْبَيْعَ فقال ما كان يَدًا بِيَدٍ فلا بَأْسَ بِهِ وما كان نَسِيئَةً فَهُوَ رِبًا وَائْتِ زَيْدَ بن أَرْقَمَ فإنه أَعْظَمُ تِجَارَةً مِنِّي فَأَتَيْتُهُ فَسَأَلْتُهُ فقال مِثْلَ ذلك).[2]

ئەبو مینهال (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ شەرکێکم هەبوو زەوییکی فرۆشت بە قەرز تا وەرزی حەج لەدوایی هات بۆ لام ئەمەی بۆ گێڕامەوە منیش ووتم : ئەمە کارێکی نەشیاوە، ووتی: لەبازاڕ فرۆشتومە و کەسیش نکوڵی لێ نەکردوە، منیش رۆشتم بۆ لای بەرائی کوڕی عازیب پرسیارم لێ کرد ئەویش ووتی: کاتێ: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەدینە ئێمە بەم جۆرە سەودایەمان دەکرد فەرمووی: (ئەوەی دەست بەدەست بێ قەیناکات بەڵام هەرچی بە دواخستن -

---

١) رواه البخاري (٢٣٥٤) و مسلم (١٥٦٦)

٢) رواه البخاري (٢٤٩٧، ٢٤٩٨) و مسلم (٨٦/ ١٥٨٩)

قەرز - بێت ئەوە سوودە) بڕۆ بۆ لای زەیدی کوڕی ئەرقەم چونکە ئەو بازرگانێکی گەورەترە لەمن، منیش چووم بۆ لای پرسیارم لێ کرد ئەویش هەمان شێوەی پێ ووتم).

**٥- کێشەی ڕێگاوبان لەنێوان هاوبەشەکاندا:**

(عن أَبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال قَضَى النبي ﷺ إذا تَشَاجَرُوا في الطَّرِيقِ بِسَبْعَةِ أَذْرُعٍ) (وفي رواية قال:( إذا اخْتَلَفْتُمْ في الطَّرِيقِ جُعِلَ عَرْضُهُ سَبْعَ أَذْرُعٍ)[1] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: ئەگەر خەڵك کێشەو ناکۆکیان دروست کرد لەسەر ڕێگاو بان پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاریدا حەوت باڵ بێت. لە ڕوایەتێکی تردا دەڵێ: (ئەگەر لەسەر ڕێگا و جادە ناکۆکیتان تێکەوت ئەوا پانی ڕێگەکە بە حەوت باڵ مەزەندە دەکرێت).

**٦- دروست نییە دراوسێ ڕێگری بکات دراوسێکەی دار بخاتە سەر دیوارەکەی:**

(عن أَبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال لَا يَمْنَعْ جَارٌ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَهُ في جِدَارِهِ ثُمَّ يقول أبو هُرَيْرَةَ مالي أَرَاكُمْ عنها مُعْرِضِينَ والله لَأَرْمِيَنَّ بها بين أَكْتَافِكُمْ).[2] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (با هیچ کەس لە ئێوە ڕێگری دراوسێکەی نەکات لەوەی دارێك (تێرگەیەك) بخاتە سەر دیوارەکەی)، پاشان ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ووتی: ئەوە چیە دەبینم پێتان ناخۆشە ؟ وەڵڵاهی - پێتان رادەگەیەنم و - دەیخەنە سەرشانتان).

**٧- نابێ هاوبەشەکان زیان بەیەکتری بگەیەنن:**

عَن بن عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عنهما أَنّ النبي صلى اللَّهُ عليه وسلم:( قال لا ضَرَرَ وَلا ضِرَارَ وَلِلرَّجُلِ أَنْ يَجْعَلَ خَشَبَةً على حَائِطِ جَارِهِ وإذا شَكَكْتُمْ في الطَّرِيقِ فَاجْعَلُوهَا سَبْعَةَ أَذْرُعٍ).[3] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (موسڵمان - نابێ زیان بە خەڵك بگەیەنێ و نابێ زیان بەیەکتری بگەیەنن[4] وە دروستە موسڵمان دار بخاتە سەر دیواری دراوسێکەی وە ئەگەر گومان و کێشەتان بوو لەسەر ڕێگا و جادەو ئەوە حەوت باڵی بۆ دابنێن).

---

١) رواه البخاري (٢٤٧٣) و مسلم (١٦١٣).

٢) رواه البخاري، ٢٤٦٣. ومسلم ١٦٠٩.

٣) رواه احمد ١/ ٣١٣ و الطبراني في المعجم الكبير : ١١/ ٣٠٢ وهو حديث صحيح لغيره

٤) یان : نابێ لەسەرەتاوە زیان بە خەڵك بگەیەنرێ و نابێ تۆڵەی زیان بە زیان لێدان بکرێتەوە.

# بارمتەدانان (الرهن)

**یەکەم: پێناسەکەی:** لەزمانی عەرەبیدا بەمانای ڕاگرتنو بەندکردنە، وەك قورئان دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسِۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾ المدثر: ٣٨ واتە: هەموو کەس بەندی کردەوەکانیەتی کە ئەنجامی داوە، وە بەمانای جێگیر بوونیش دێت.

**وە لەشەرعدا:** شتێکە ـ نرخدار بێت لەشەرعدا ـ قەرزدار لەبارمتەی قەرزەکەی لای قەرزدەر دایدەنێ ئەگەر لەکاتی دیاری کراودا قەرزەکەی نەدایەوە، دەفرۆشرێت و قەرزەکەی لێ دەدرێتەوە.

**دووەم: بەڵگەی دروستی بارمتەدانان:**

أـ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُواْ كَاتِبًا فَرِهَٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ﴾ البقرة:٢٨٣ واتە: ئەگەر ئێوە لەسەفەردا بوونو (مامەڵەیەکی قەرزتان لەگەڵ یەکتریدا کرد) نووسەرێکتان دەست نەکەوت (قەرزەکە بنوسێت بۆ متمانەی دانەوەی قەرزەکە) بارمتەیەك وەربگرن.

ب ـ (عن عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّ النبي ﷺ اشْتَرَى طَعَامًا من يَهُودِيٍّ إلى أَجَلٍ وَرَهَنَهُ دِرْعًا من حَدِيدٍ)[1] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) هەندێك جۆی بەقەرز لەجولەکەیەك کڕیو زرێ پۆشێکی ئاسنی بەبارمتەی قەرزەکە دانا).

زۆجار وا پێویست دەکات لە زۆرێك لە مامەڵەکاندا بارمتە دابنرێ بۆ متمانە کردن و دڵنیابوون لەدانەوەی قەرزەکە وە لەکاتی نەدانەوەیدا دەتوانرێت قەرزەکە لەوبارمتەیە هەڵبگیرێتەوە وە قەرزدەر پارێزراو دەبێ لە فێڵ و غەدری قەرزدار.

---

١) رواه البخاري (٢٠٦٨، ٢٠٩٦) و مسلم (١٢٥/ ١٦٠٣)

**سێ یەم: سوود وەرگرتن لە بارمتە بەسوار بوون و دۆشینی شیرەکەی:**

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال قال رسول اللَّهِ ﷺ الظهر يُرْكَبُ بِنَفَقَتِهِ إذا كان مَرْهُونًا وَلَبَنُ الدَّرِّ يُشْرَبُ بِنَفَقَتِهِ إذا كان مَرْهُونًا وَعَلَى الذي يَرْكَبُ وَيَشْرَبُ النَّفَقَةُ).[1] ئەبو هوریرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (پشتی وولاغی ڕەهنکراو ـ لەلایەن قەرزدەرەوە ـ بۆ سواری بەکاردەهێنرێ لەبەرانبەر بەخێوکردنیدا وەشیری گوانی ئاژەڵی ڕەهنکراویش دەخورێتەوە لەبەرانبەر بەخێوکرنیدا، وە ئەو کەسەی سواری ڕەهنکراو دەبێ شیرەکەی دەخواتەوە بەخێوکردن لەسەر ئەوە).

---

١) رواه البخاري (٢٥١٢)

# سپـاردن (الـوديعه)

**یەکەم: پێناسەکەی:** لەزمانی عەرەبیدا: دانانی شتێکە لای کەسێك پارێزگاری بکات، وەبە شتە دانراوەکەش دەوترێت.

بەڵام (وديعة) لەشەرعدا: بەو شتە دەوترێت کەسێکی لای کەسێکی تر دایدەنێت بۆ ئەوەی بۆی بپارێزێت.

**دووەم: حوکمەکانی سپاردن:**

ئەگەر سپاردن بە شێوەیکی راست و دروست ئەنجامدرا ئەوە ئەم حوکمانەی لێ دەکەوێتەوە:

أ ـ ئەو کەسەی سپاردەکەی لا دانراوە واجبە بیپارێزێ.

ب ـ پێویستەی لەسەر ئەوەی سپاردەکەی لادانراوە لە شوێنی گونجاو بۆ ئەو شتەدا بیپارێزێ

ج ـ بە خودی خۆی بیپارێزێ، نابێ بیداتە دەستی منداڵ و خێزانی بیپارێزن.

**سێ یەم: سپاردە لادانراو زامن نابێ ئەگەر سپاردەکەی تیاچوو:**

ئەگەر سپاردەکە تیاچوو بێ ئەوەی هیچ دەسەڵاتو خیانەتی ئەو کەسەی تێدابێت لای دانراوە ئەو زامن نابێ و هیچی ناکەوێتە سەر.

عن عبد اللّهِ بن عُمَرَو رضي الله عنهما قال قال:( رسول اللّهِ ﷺ من أُودِعَ وَدِيعَةً فلا ضَمَانَ عليه)[1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێك سپاردەیەکی لادانرا ئەوە هیچ بژاردەنێکی لەسەر نیە).

**چوارەم: گێڕانەوەی سپاردە پێویستە:**

ئەگەر خاوەنی سپاردە داوای سپاردەکەی کرد پێویستە ئەو کەسەی سپاردەکەی لای بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾

١) رواه ابن ماجه (٢٤٠١) وهو حديث حسن

النساء: ٥٨ واتە: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەکات سپاردەکان بدەنەوە بە خاوەنی - ئەگەر داوای کرد -

وە دەفەمووێ: ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ﴾ البقرة:٢٨٣ واتە: جا ئەگەر هەندێکتان لە هەندێکتان دڵنیابوون ئەو با ئەوکەسەی بە ئەمین زانراوە سپاردەکە بداتەوە، وە با لە پەروەردگاری بترسێت .

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال: قال رسول اللَّهِ ﷺ أَدِّ الْأَمَانَةَ إلى من ائْتَمَنَكَ ولا تَخُنْ من خَانَكَ).[١]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس سپاردەیەکی لادانایت بیدەرەوە وە خیانەت لە کەسێك مەکە خیانەتی لێ کردوویت).

---

١) رواه ابو داود (٣٥٣٥) و الترمذي (١٢٦٤) وهو حديث حسن

# خواستن (العارية)

**یەکەم: پێناسەکەی:** لە زمانی عەرەبی دا: (عارية) ناوە بۆ هەر شتێ مرۆڤ دەیدات بە کەسێکی تر تا سوودی لێ ببینێت و پاشان بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

**لە شەرعدا:** شتێکە بە خواستن لە کەسێك وەربگرێ بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرێ و پاشان بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی بێ بەرانبەر .

**دووەم: بەڵگەی دروستی خواستن:** خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ۝٥ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ۝٦ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ۝٧ ﴾ الماعون: ٤ -٧ واتە: جا هاوار بۆ نوێژگەران ، ئەوانەی لە نوێژەکانیان بێ ئاگان ، ئەوانەی رووپامایی دەکەن هەموو شتێکی بەسود دەگرنەوە لە خەڵکی - وەك هەر شتێك خەڵك لە یەکتری دەخوازن - وە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ﴾ المائدة: ٢ واتە: موسڵمانان هاوکاری یەکتر بکەن لەسەر چاکەو پارێزگاری .

(قال رسول الله ﷺ: وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ ما كان الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ).[1] پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (خوای گەورە لە یارمەتیدانی بەندەی دایە هەتا بەندە لە یارمەتی دانی براکەیدا بێت) وە ئەنەس (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (لە مەدینەدا ترسێك روویدا ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەسپێکی لە ئەبوتەلحە خواست و بەرەو رووداوەکە رۆشت ئینجا کە گەڕایەوە فەرمووی هیچمان نەدی).[2]

**سێ یەم: حوکمەکانی خواستن:**

أ- پێویستە خوازراو بگەرێنێتەوە:خوای گەروە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴾النساء: ٥٨ واتە: خوا فەرمانتان پێدەکات سپاردەکان بدەنەوە بە خاوەنی.

---

١) رواه مسلم (٢٦٩٩) و ابوداود (٤٩٤٦) و الترمذي (١٤٣٠) و ابن ماجه (٢٢٥)

٢) رواه البخاري (٢٤٨٤) و مسلم (٢٣٠٧)

ب ـ تیاچوونی خوازراو:

ئەگەر شتێکی خوازراو تیاچوو ئەو کەسەی خواستویەتی دەبێ بیبژێرێت با کەمتەرخەفیش نەبوویێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند زرێیەکی لە صەفوان خواست بۆ جەنگی حونەین جا صەفوان ووتی: ئایا بە زەوتکردن زرییەکان دەبەیت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بەڵکو بە خواستن دەیان بەم ئەگەر تیاچوون دەیان بژێرم).[1]

ج ـ دروست نییە ڕێگری بکرێت لە خوازراو:

(عن عبد اللّٰهِ قال كنا نَعُدُّ الْمَاعُونَ على عَهْدِ رسول اللّٰهِ ﷺ عارية الدَّلْوِ وَالْقِدْرِ).[2] عەبدوڵڵا کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (ئێمە لەسەردەمەی پێغەمبەردا (ﷺ) - ماعون - مان بە دۆڵچەو قابلەمە دادەنا - کە دراوسێ لە دراوسێ ی بخوازێ).

د- چەند نمونەیەك لەو شتانەی نابێ ڕێگری لە خواستنیان بکرێ:

وەك دۆشینی شیری ئاژەڵ بۆ کەسێ پێویستی پێ ی بێ، سواری وولاغ کردن و پەراندنی ئاژەڵی نێر لە مێ ، (عن جَابِرِ بن عبد اللّٰهِ عن النبي ﷺ قال ما من صَاحِبِ إِبِلٍ ولا بَقَرٍ ولا غَنَمٍ لَا يُؤَدِّي حَقَّهَا إلا أُقْعِدَ لها يوم الْقِيَامَةِ بِقَاعٍ قَرْقَرٍ تَطَؤُهُ ذَاتُ الظِّلْفِ بِظِلْفِهَا وَتَنْطَحُهُ ذَاتُ الْقَرْنِ بِقَرْنِهَا ليس فيها يَوْمَئِذٍ جَمَّاءُ ولا مَكْسُورَةُ الْقَرْنِ قُلْنَا يا رَسُولَ اللّٰهِ وما حَقُّهَا قال إِطْرَاقُ فَحْلِهَا وَإِعَارَةُ دَلْوِهَا وَمَنِيحَتُهَا وَحَلَبُهَا على الْمَاءِ وَحَمْلٌ عليها في سَبِيلِ اللّٰهِ).[3] جابیری کوڕی عەبدوڵڵای (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەمووی: (هیچ خاوەن ووشتر و گا گەل و ئاژەڵێك نیە کە حەقەکەی -زەکاتەی- نەدات ، لە ڕۆژی دواییدا لە دەشتێکی فراوانی سەحرادا دادەنیشێنرێت وولاغە سمیان سمتیان پیادەنێن و شاخداریشیان شوقی لێدەدەن، لەو ڕۆژەدا هیچیان کۆڵ و شاخ شکاونین) عەرزمان کرد ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەقی ئاژەڵ وولاغ چییە؟ فەرمووی: (نێرەکانی بدرێ بەلای خەڵکەوە بۆ کەڵدان و دۆڵچە بدرێت بەلایانەوە وە ئاژەڵ بدرێت بە لایانە شیرو ماستەکەی بخۆن وەلەکاتی ئاودانیادا بدۆشرێن و بەشی نەدارانی لێ بدرێ - وە بۆ سواری لە ڕێی خودا بۆ جیهاد بەکار بهێنرێ).

---

١) رواه ابوداود (٣٥٦٢) و الحاكم (٢/ ٤٧) وهو حديث حسن.

٢) رواه ابو داود (١٦٥٧)

٣) رواه مسلم (٩٨٨/٢٧)

# داگیرکردن (الغصب)

**یەکەم: پێناسەکەی:** لەزمانی عەرەبیدا: داگیرکردن و بردنی ماڵە بە ناڕەواو بە زۆر.
وە **لەشەرعدا** : دەست بەسردا گرتنی مافی خەڵکە بەناهەق و بە زۆر.

**دووەم: حوکمەکەی:**

داگیر کردنی مافی خەڵکی لەلایەن دەسەڵاتدارەوە و ستەمەو حەرامە وە واجبە داگیرکەر ئەو شتەی داگیری کردووە بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی. وەك خوای گەورە دەفەرموویّ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ ﴾ النساء: ٢٩ واتە: ئەی ئەو کەسانە بڕواتان هێناوە لە نێوان خۆتان ماڵی یەکتری مەخۆن بە ناڕەوا.

(عن أبي بَكْرَةَ عن النبي ﷺ قال: فإن دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ بَيْنَكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هذا في شَهْرِكُمْ هذا في بَلَدِكُمْ هذا....).[1] ئەبوبەکرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان خوێن و ماڵ و ناموستان لە یەکتری حەرامە - بە ناهەق دەستی بۆ ببرێ وەك حەرامی جەنگ لەم ڕۆژەدا و لەم مانگەدا و لەم شارەدا — مەبەستی جەنگە لە مانگە حەرامەکان دا لە شاری مەککەدا-).

**سێ یەم: سودو کەڵك وەرگرتن لە داگیرکراو حەرامە:**

بەبەڵگەی فەرموودەکەی ئەبو بەکرە کە لە بڕگەی (٢) باسکرا، هەروەها ( عن عبد اللَّهِ بن السَّائِبِ بن يَزِيدَ عن أبيه عن جَدِّهِ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ لَا يَأْخُذْ أحدكم عَصَا أَخِيهِ لَاعِبًا أو جَادًّا فَمَنْ أَخَذَ عَصَا أَخِيهِ فَلْيَرُدَّهَا)[2]. عەبدوڵلای کوڕی سائیبی کوڕی یەزید لە باوکییەوە و لە باپیریەو دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کەسێکتان

١) رواه البخاري (٦٧) و مسلم (١٦٧٩)

٢) رواه الترمذي (٢٢٤٩) و ابو داود (٤٩٨٢) وهو حديث حسن

کەل‌و پەلی براکەی نەبات نەبە گاڵتەو نە بەراستی وەهەر کەس دارعاسای براکەی برد با بۆی بگێڕێتەوە).

**چوارەم: واجبە ئەو شتەی داگیرکراوە بگەڕێنرێتەوە بۆ خاوەنەکەی:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من كانت له مَظْلَمَةٌ لأحد من عِرْضِهِ أو شَيْءٍ فَلْيَتَحَلَّلْهُ منه الْيَوْمَ قبل أَنْ لَا يَكُونَ دِينَارٌ ولا دِرْهَمٌ إن كان له عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ منه بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ وَإِنْ لم تَكُنْ له حَسَنَاتٌ أُخِذَ من سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ فَحُمِلَ عليه).[1] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس مافی برایەکی لایە شەرەف و ناموس بێت یان شتێکی تر با ئەمڕۆ گەردەنی خۆی پێ ئازادکات پێش ئەو کاتێ بێت پارەو پول نەمێنێ ( کە ڕۆژی دوایی یە ) جا ئەگەر کردەوەی چاکی هەبوو ئەوە بە ئەندازەی ناهەقی و ستەمکردنەکەی لێ دەبڕدرێت ( و دەدرێت بە ستەم لێکراو ) وەئەگەر چاکەی نەبوو ( بە ئەندازەی ستەمەکەی ) لە خراپەو تاوانی ستەم لێکراوەکە دەدرێت بە کۆڵی ئەمدا).

**پێنجەم: ئەو کەسەی لە پێناو پارێزگاری لە ماڵ‌و سامانیدا بکوژرێت شەهیدە:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال جاء رَجُلٌ إلى رسول اللَّهِ ﷺ فقال يا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إن جاء رَجُلٌ يُرِيدُ أَخْذَ مَالِي قال فلا تُعْطِهِ مَالَكَ قال أَرَأَيْتَ إن قَاتَلَنِي قال قَاتِلْهُ قال أَرَأَيْتَ إن قَتَلَنِي قال فَأَنْتَ شَهِيدٌ قال أَرَأَيْتَ إن قَتَلْتُهُ قال هو في النَّارِ).[2] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەرکەسێك هات ویستی ماڵەکەم ببات؟ فەرمووی: (ماڵەکەتی مەدەرێ) وتی: ئەی ئەگەر جەنگی لەگەڵ کردم فەرمووی: (تۆش لەگەڵی بجەنگە) ووتی ئەی ئەگەر ئەو منی کوشت؟ فەرمووی (ئەوە تۆ شەهیدیت) ووتی: ئەی ئەگەر من ئەوم کوشت؟ فەرمووی: (ئەوە ئەو لە ئاگری دۆزەخدایە).

---

١) رواه البخاري (٢٤٤٩)

٢) رواه مسلم (٢٢٥/ ١٤٠)

**شەشەم: داگیرکردنی زەوی و زار**

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت:( أن رَسُولَ اللّهِ ﷺ قال من ظَلَمَ قِيدَ شِبْرٍ من الأرض طُوِّقَهُ من سَبْعِ أَرَضِينَ)[١] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس بستێ زەوی بەستەم داگیر بکات خوا لە حەوت چینی زەویدا کۆت و زنجیری دەکات)

**حەوتەم: حوکمی ئەو کەسەی بە زۆر درەخت دەنێژێ یا کشتوکاڵ دەکات لە زەوی خەڵکدا:**

عن رَافِعِ بن خَدِيجٍ رَضِيَ اللّهُ عنه قال قال رسول اللّهِ ﷺ :(من زَرَعَ في أَرْضِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ فَلَيْسَ له من الزَّرْعِ شَيْءٌ وَلَهُ نَفَقَتُهُ)[٢] رافعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کەسێك لە زەوی خەڵکدا کشتوکاڵ بکات بە بێ مۆڵەت و ڕەزامەندییان، ئەوە ئەو کشتوکاڵە هیچی بۆ ئەو نابێ وە خەرجی تێچوونەکەی پێ دەدرێت).

**هەشتەم: هەر کەس داگیرکراو بفەوتێنێ دەبێ فەوتاوەکە بژێرێ یا نرخەکەی:**

(عن أَنَسٍ رضي الله عنه أَنَّ النبي ﷺ كان عِنْدَ بَعْضِ نِسَائِهِ فَأَرْسَلَتْ إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ مع خَادِمٍ بِقَصْعَةٍ فيها طَعَامٌ فَضَرَبَتْ بِيَدِهَا فَكَسَرَتْ الْقَصْعَةَ فَضَمَّهَا وَجَعَلَ فيها الطَّعَامَ وقال كُلُوا وَحَبَسَ الرَّسُولَ وَالْقَصْعَةَ حتى فَرَغُوا فَدَفَعَ الْقَصْعَةَ الصَّحِيحَةَ وَحَبَسَ الْمَكْسُورَةَ).[٣] ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) لای خێزانێکی بوو، یەکێك لە خێزانەکانی بە خزمەتکارێکدا قاپێکی نارد کە خواردنی تێدابوو ئەو خێزانەی ( پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵیدا بوو ) دای بە دەستی خزمەتکارەکە داو قاپەکە شکا جا لکاندێوە بەیەکەوە و خواردنەکەی کردەوە ناوی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (بخۆن) جا پێغەمبەر (ﷺ) قاپە شکاوەکەی هێڵایەوە تا لە خواردنەکە بوونەوە جا قاپێکی ساغی پێداو شکاوەکەی هێڵایەوە).

---

١) رواه البخاري (٢٤٥٣) و مسلم (١٦١٢)

٢) رواه ابو داود (٣٤٠٣) و الترمذي (١٣٦٦) وابن ماجه (٢٤٦٦) و احمد ٣ / ٤٦٥ وقال الترمذي حسن غريب.

٣) رواه البخاري (٢٤٨١) و احمد ٣/١٠٥

# وەقف کردن

**یەکەم: پێناسەکەی:** لەزمانی عەرەبیدا: واتە وەستاندن و مانەوە. وە لە شەرعدا: وەستاندنی ماڵێکی بەردەوامی بەسوودە لەڕێی خودادا نافرۆشرێت و نابەخشرێت تا بەردەوام سوودی لێ وەربگیرێ.

**دووەم: بەڵگەی دروستی وەقف:**

ئیسلام هانی موسڵمانانی داوە بۆ وەقفکردن، چونکە چاکەیەکی بەردەوامە، (عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال إذا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عنه عَمَلُهُ إلا من ثَلَاثَةٍ إلا من صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أو عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أو وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو له).[1] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر مرۆڤـ (ی موسڵمان ) مرد کردەوەی کۆتایی پێ دێ لە سێ شتەوە نەبێ: خێرێکی بەردەوام یان زانیارییەك سوودی لێ وەربگیرێ یان منداڵێکی چاك دوعای بۆ بکات).

**سێ یەم: دروستە وەقف کردنی شتێک کە سوودەکەی بکرێت لە ڕێگای خودا:**

(عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضى الله عنهما قال: أَصَابَ عُمَرَ أَرْضًا بِخَيْبَرَ ، فَأَتَى النَّبِىَّ ﷺ يَسْتَأْمِرُهُ فِيهَا ، فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، إِنِّى أَصَبْتُ أَرْضًا بِخَيْبَرَ ، لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ هو أَنْفَسَ عِنْدِى مِنْهُ ، فَمَا تَأْمُرُنِي بِهِ؟ قَالَ « إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا ، وَتَصَدَّقْتَ بِهَا » . قَالَ فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ، غير أَنَّهُ لاَ يُبَاعُ أصلها وَلاَ يُورَثُ، قال: فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرَ فِي الْفُقَرَاءِ وَفِي الْقُرْبَى، وَفِي الرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالضَّيْفِ، لاَ جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ، أو وَيُطْعِمَ صديقا، غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: عومەر زەوییەکی بەرکەوت لە خەیبەر جا هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) تا فەرمانی وەربگرێ لەو بارەیەوە، جا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من زەوییەکم دەستکەوتووە لە خەیبەر هیچ ماڵ و

---

١) رواه مسلم (١٦٣١)

٢) رواه البخاري (٢٧٣٧) و مسلم (١٦٣٢)

سامانێکم نیە لام لەوە بە نرختربێت، جا چ فەرمانێکم پێدەکەی لەو بارەیەوە؟ فەرمووی: (ئەگەر ویستت ئەسڵی زەوییەکە وەقفبکەو سوودو قازانجەکە بکە بە خێر) عەبدوڵلا وتی: جا عومەریش وەقفی کرد کەوا نەفرۆشرێت و نەبەخشرێت و بە میرات نەبردرێت، عەبدوڵلا ووتی: عومەر کردی بەوەقف بۆهەژاران و خزمان و ئازادکردنی کویلە و جیهادو تێکۆشان لەرێی خودا و رێبواران و میوان ئەو کەسەش سەرپەرشتی زەوییەکە دەکات لیٚ بخوات بە ئەندازەی پێویست گوناهی ناگات یا بیدات بە هاورێیەکی بیخوات بیٚ ئەوەی لێی کۆبکاتەوەو هەڵیبگرێت).

**چوارەم:ئەو کەسەی وەقف دەکات دروستە خۆشی سوودی لیٚ ببینیٚ:**

(عن عُثْمَانُ بن عفان رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدِمَ الْمَدِينَةَ وَلَيْسَ بِهَا مَاءٌ يُسْتَعْذَبُ غَيْرَ بِئْرِ رُومَةَ فَقَالَ: مَنْ يَشْتَرِي بِئْرَ رُومَةَ فَيَجْعَلُ دَلْوَهُ مَعَ دِلَاءِ الْمُسْلِمِينَ بِخَيْرٍ لَهُ مِنْهَا فِي الْجَنَّةِ، فَاشْتَرَيْتُهَا مِنْ صُلْبِ مَالِي....).[1] عوسمانی کوڕی عەففان (رەزای خوای لێبیٚ) دەڵیٚ: کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە مەدینە جگە لە بیری رومە ئاوی شیرینی تێدا نەبوو فەرمووی: (کیٚ بیری رومە دەکرێت جا دوڵچەی خۆشی تێبخات لەگەڵ دوڵچەی موسڵماناندا بە بیرێکی لەوە چاکتر لە بەهەشتدا) جا منیش لە دەستمایەی ماڵی خۆم کریم ..).

**پێنجەم: وەقف کردنێک زیان گەیاندنی بە میراتگر تێدابیٚ دروست نییە:**

خوای گەورە دەفەرمووی: ﴿ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖ ﴾ النساء: ١٢

واتە: بەشی میراتگرەکان دەدریٚ لەپاش ( دەرکردنی ) و ەسیەتێك کە کرابیٚ یا قەرزێك بیٚ زیان بیٚ ( بۆ میراتگرەکان ) .

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « لاَ ضَرَرَ وَلاَ إِضِرَارَ).[2] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رەزای خوای لێبیٚ) دەڵیٚ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (زیان دان لە خەڵك دروست نییە، وەزیان بە یەکتری گەیاندنیش دروست نییە ...).

١) رواه النسائي ٦/٢٣٥ (٣٦٠٨) و الترمذي (٣٧٠٧) وقال حديث حسن

٢) رواه احمد (٣١٣/١) وهو حديث صحيح

**شەشەم:حوکمی ماڵێکی وەقفکراو کە سوودی لێ نەبینرێت:**

(عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: « لَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُو عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ – أَوْ قَالَ بِكُفْرٍ – لأَنْفَقْتُ كَنْزَ الْكَعْبَةِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَجَعَلْتُ بَابَهَا بِالأَرْضِ وَلأَدْخَلْتُ فِيهَا مِنَ الْحِجْرِ »).[١] عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست دەیفەرموو: (ئەگەر گەلەکەت تازە موسڵمان نەبوونایە، ئەو پارەی لە کەعبەدایە لەرێی خودا سەرفم دەکردو دەرگاکەی کەعبەم نزم دەکردەوە بۆ رێکی زەوی و هەندێ لە حجری ( ئیبراهمم ) دەخستە سەر کەعبە ..)

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ماڵی وەقفکراوئەگەر سوودی لێ نەبینرا دروستە خەرج بکرێت لە رێگەی خێرو چاکەدا چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر تازە موسڵمان بوونیان پارەو گەنجینەی کەعبەی خەرج نەکرد لەرێی خوادا، کەواتە ئەگەر ئەو ریگرە نەبوایە خەرجی دەکرد کە ماڵێکی وەقفکراو بوو ، لەمەوە بۆ مان ڕووندەبێتەوە کە ئەگەر ماڵی وەقف کراو سوودی نەبوو دروستە دەستکاری بکرێت.

---

١) رواه مسلم (٤٠ / ١٣٣٣)

# هەڵگرتنەوە (الشفعة)

**یەکەم: پێناسەکەی:** لەزمانی عەرەبی دا: داوکردنی بەشە فرۆشراوی شەریکەکەیەتی بەونرخەی پێی فرۆشراوە بۆ ئەوە بیخاتە سەر ملکەکەی خۆی وە (شفعة) لە شەفعەوە هاتوو کە بە مانای پێکەوە نوسان جوتکردن هاتووە چونکە کابرا بەشی شەریکەکەی دەخاتە سەر بەشەکەی خۆی.

**وەلەشەرعدا:** هەڵگرتنەوەی بەشی شەریکەکەیەتی بەو نرخەی فرۆشتوویەتی لە جیاتی کڕیار بە بێ ڕەزامەندی شەریك و کڕیار.

**دووەم: ڕەوابوونی:** هەڵگرتنەوە ڕەواو دروستە بەڵگەی ڕەوابوونیشی ئەم فەرموودەیە: (عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ رضي الله عنهما قال قَضَى النبي ﷺ بِالشُّفْعَةِ في كل مَالٍ لم يُقْسَمْ فإذا وَقَعَتْ الْحُدُودُ وَصُرِّفَتْ الطُّرُقُ فلا شُفْعَةَ).[1] جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هەڵگرتنەوەی داناوە لە هەموو شتێکدا کە هاوبەش بێت، هێشتا دابەش نەکرابێ ، بەڵام ئەگەر سنوور دانراو ڕێگاو بان دیاری کرا ئیتر هەڵگرتنەوە نامێنێ).

**سێ یەم: حوکمەکانی هەڵگرتنەوە:**

**أ- هۆی هەڵگرتنەوە هاوبەشییە لەشتێکدا، بە** بەڵگەی فەرمودەکەی جابیر گێڕایەوە.

وەك دووکەس لە زەوی یا باغێك دا شەریك بن یەکێکیان بەشەکەی خۆی بفرۆشێ بە نرخێك شەریکەکەی دەتوانێ بە هەمان نرخ هەڵیبگرێتەوە بۆ خۆی، هۆی ئەم مافە هاوبەشی یەتی لەگەڵ شەریکەکەیدا لەو زەوی یا باغەدا.

**ب - ئەگەر ماڵە هاوبەشەکە بەش کرا هەڵگرتنەوە دروست نییە و نامێنێ:** بە بەڵگەی فەرمودەکەی جابیر (پێغەمبەر (ﷺ) هەڵگرتنەوەی داناوە لە هەموو شتێکداکە هاوبەش بێت هەتا دابەش نەکرابێ) بەڵام ئەگەر دابەش کرا مافی هەڵگرتنەوەی نامێنێ.

---

١) رواه البخاري (٢٢١٣) و مسلم (١٣٤ / ١٦٠٨)

**ج ـ شەریك دروست نییە بەشەکەی خۆی بفرۆشێت هەتا شەریکەکەی ئاگادار نەکات:**

(عَنْ جَابِرٍ قَالَ قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ شِرْكَةٍ لَمْ تُقْسَمْ رَبْعَةٍ أَوْ حَائِطٍ. لاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَبِيعَ حَتَّى يُؤْذِنَ شَرِيكَهُ فَإِنْ شَاءَ أَخَذَ وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ فَإِذَا بَاعَ وَلَمْ يُؤْذِنْهُ فَهُوَ أَحَقُّ بِـهِ) [١]

جابیر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) - حوکمی بە هەڵگرتنەوە کرد لەهەموو شتێکی هاوبەشدا کە بەش نەکرابێ خانوو و زەوی بێت یا باخ و بێستان بێت، دروست نییە بۆی بیفرۆشێت هەتا شەریکەکەی مۆڵەتی نەدات، جا ئەگەر ویستی هەڵیگرێتەوە وە ئەگەر نەیویست وازی لێبێنێ، وە ئەگەر فرۆشتی و پرسی شەریکەکەی نەکرد ئەوا شەریکەکە شایستە ترە پێی - هەڵیگرێتەوە-).

**چوارەم: مافی هەڵگرتنەوە دەست بەجێ نییە:**

ئەگەر ئەوەی مافی هەڵگرتنەوەی هەیە یەکسەر دەست بەجێ نەهات وماڵەکەی هەڵنەگرتەوە مافی نافەوتێت ئەگەر دواتر بێت چونکە فەرموودەکان بەرەهایی هاتوون، بەڵگەیەك بەڵگە بێت لەسەر دەست بەجێ هەڵگرتنەوە نییە.

---

١) رواه مسلم (١٣٣/ ١٦٠٨) و ابو داود (٣٥١٣) و النسائي (٧/ ٣٢٠)

# بەخشین (الهبة)

**یەکەم:پێناسەکەی: لەزمانی عەرەبی دا:** بەخشینێکە دەدرێ بە کەسێك بە خۆڕای و بێ بەرانبەر و بەسودە بۆ پێ بەخشراوەکە، خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثٗا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴾ الشوری: ٤٩ واتە: ( خوا ) بەهەر کەس بیەوێ کچ دەبەخشێ و بەهەر کەسیش بیەوێ کوڕ دەبەخشێ.

**وە لە زاراوەی شەرعدا:** لە حاڵەتی ژیاندا شتێك بەخۆڕیی بدرێت بە کەسێك، ئەم پێناسەیە دیاری و ماڵ بەخشینی لەرێی خوادا دەگرێتەوە چونکە ئەم دووانەش بەخشینن بە کەسێکی تر لە کاتی ژیانیدا بە خۆڕایی.

**دووەم: رەوابوونی:**بەخشین بەو شێوەی پێناسەکرا سوننەتە، ئیسلام هانی موسڵمان دەدات بۆ ئەنجامدانی خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ فَإِن طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا ﴾ النساء: ٤ واتە: وەك بەخشین مارەیی ژنەکان بدەن جا ئەگەر ئەوان بەرەزامەندی خۆیان شتێکیان لە مارەییەکە بە ئێوە بەخشی ئەو بیخۆن و نۆشی گیانتان بێ.

عن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عنه ان رَسُولَ الله ﷺ قال:(وَتَهَادَوْا تَحَابُّوا)[1] ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (دیاری بەرن بۆ یەکتری یەکتریتان خۆش بوێ).

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت: قد كان لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ جِيرَانٌ من الْأَنْصَارِ كانت لهم مَنَائِحُ وَكَانُوا يَمْنَحُونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ من أَلْبَانِهِمْ فَيَسْقِينَا).[2] عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ:

---

١) رواه البيهقي ٦/١٦٩ وهو حديث حسن

٢) رواه البخاري (٢٤٢٨) و مسلم (٢٩٧٢)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند دراوسێیەکی ئەنصاری هەبوو ووشترو مەڕی شیرایان هەبوو لە شیر ئەوانەیان دەهێنا بۆ پێغەمبەر بە خۆرایی پێغەمبەریش (ﷺ) دەیدا بە ئێمە بیخۆینەوە).

وە زانایان لەهەموو سەردەمەکاندا یەك دەنگ بوون لەسەر سوننەت بوونی بەخشین و دیاری بە هەموو جۆرەکانیەوە چونکە جۆرێکە لە هاوکاریکردنی یەکتری خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ﴾ المائدة: ٢ واتە: هاوکاری یەکتری بکەن لەسەر چاکەو پارێزگاری.

**سێ یەم: بەخشین بە خزمان:**

(عن أَنَسُ بن مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال: من أَحَبَّ أَنْ يُبْسَطَ له في رِزْقِهِ وَيُنْسَأَ له في أَثَرِهِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ).[1] پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەموێ: (هەر کەس دەیەوێ رزق و رۆزی فراوان بێت و تەمەنی درێژو پڕ بەرەکەت بێ دەبا پەیوەندی خزمایەتی بەجێبێنێ). بەشێکی پەیوەندی خزمایەتی بە بەخشین دەکرێت.

**چوارەم: پاداشت دانەوەی بەخشین :**

سوننەتە بۆ ئەو کەسەی دیاری و بەخشینی بۆ دێ پاداشتی بداتەوە ئەگەر لە توانایدا هەبوو بە شوێن پێغەمبەردا (ﷺ) بڕوات لەم کارەیدا، (عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت كان رسول اللَّهِ ﷺ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عليها)[2] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دیاری وەردەگرت و پاداشت دیارییەکەشی دەدایەوە).

**پێنجەم: حیکمەتی ڕەوابوونی بەخشین:**

حیکمەتی بەخشین و دیاری بۆ یەکتری بردن چەندین سوود و کەڵکی هەیە، وەك: چاکەکردن لەگەڵ خەڵك و هاوکاری کردنی یەکتری، هۆی دروست بوونی خۆشەویستی یە بەتایبەتی بۆ خزمان و دەوروودراوسێ یا لەگەڵ کەسێکە دا کە دوژمنایەتی هەبێ نێوانیان چاك دەکات، پەیوەندی چاك و بەهێز دەکات، رق و کینە لادەبات و پاداشت بۆ خاوەنەکەی دەنوسرێت.

---

١) رواه البخاري (١٩٦١) و مسلم (٢٥٥٧)

٢) رواه البخاري (٢٤٤٥)

**شەشەم: بەخشین دروست نییە ئەگەر ناشەرعی بوو:**

کاتو حاڵەتی وا هەیە رێگریەکی شەرعی هەیە دروست نییە بە خشین یا دیاری وەربگیرێت وەك دیاری بردن بۆ کاربەدەست بۆ مەبەستێکی دنیای تا کاربەدەستەکە بە دڵی بکات ئەوەی دەیەوێ بۆی ئەنجامی بدات خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ١٨٨ واتە: ماڵی یەکتری مەخۆن بە ناڕەوا وە مەشیدەن بە کاربەدەستان بۆ ئەوەی بەشێك لەماڵ و سامانی خەڵکی بە ناهەق بخۆن لە کاتێدا خۆتان دەزانن ـ ماڵی خەڵکە.

(عن عبد اللَّهِ بن عَمْرٍو قال لَعَنَ رسول اللَّهِ ﷺ الرَّاشِي وَالْمُرْتَشِي).[1] عەبدوڵڵا کوڕی عەمر (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرینی کرد لە بەرتیلدەرو بەرتیل وەگر).

(عن الصَّعْبِ بن جَثَّامَةَ اللَّيْثِيِّ أَنَّهُ أَهْدَى لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِمَارًا وَحْشِيًّا وهو بِالْأَبْوَاءِ أو بِوَدَّانَ فَرَدَّهُ عليه فلما رَأَى ما في وَجْهِهِ قال إِنَّا لم نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إلا أَنَّا حُرُمٌ).[2] صەعبی کوری جوسامەی لەیسی (رەزای خوای لێبێ) لە ئەبواو یان و ددان بوو کەرە وەحشی یەکی بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلام پێغەمبەر (ﷺ) پێی دایەوە جا لەدەم چاویدا پێ ناخۆش بوونی بینی فەرموی: (ئەوسا بزانە بۆیە وەرمان نەگرت و پێمان دایتەوە چونکە ئێمە لە ئیحرامداین).

**حەوتەم: ئەو دیارییانەی ڕەت ناکرێتەوە:**

(عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « ثَلاَثٌ لاَ تُرَدُّ الْوَسَائِدُ وَالدُّهْنُ وَاللَّبَنُ »).[3] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (سێ شت ناگەڕێندرێتەوە: پشتی و رۆن و شیر).

---

١) رواه ابو داود (٣٥٨٠) و الترمذي (١٣٣٧) و ابن ماجه (٢٣١٣) وهو حديث صحيح

٢) رواه البخاري (١٧٢٩) و مسلم (١١٩٣)

٣) رواه الترمذي (٢٩٤٢) وهو حديث حسن

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس ڕێحانەی پێشکەش کرا با نەیگەڕێنێتەوە چونکە هەڵگرتنی سووکەو بۆنیشی خۆشە).[١]

(قال أَنَسٌ أَنَّ النبي ﷺ كان لَا يَرُدُّ الطِّيبَ).[٢] ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هیچ کات بۆنی خۆشی ڕەدنەدەکردەوە).

**هەشتەم: کێ شایانترە بە دیاری:**

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قلت يا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لي جَارَيْنِ فَإِلَى أَيِّهِمَا أُهْدِي قال إلى أَقْرَبِهِمَا مِنْكِ بَابًا).[٣] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو دراوسێم هەیە دیاری بۆ کامەیان ببەم؟ فەرمووی : (بۆ ئەوەیان دەرگاکەی لێتەوە نزیکترە).

(عَنْ كُرَيْبٍ أَنَّ مَيْمُونَةَ بِنْتَ الْحَارِثِ رضى الله عنها أَعْتَقَتْ وَلِيدَةً وَلَمْ تَسْتَأْذِنِ النَّبِىَّ ﷺ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُهَا الَّذِى يَدُورُ عَلَيْهَا فِيهِ قَالَتْ أَشَعَرْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنِّى أَعْتَقْتُ وَلِيدَتِى قَالَ «أَوَفَعَلْتِ». قَالَتْ نَعَمْ . قَالَ « أَمَا إِنَّكِ لَوْ أَعْطَيْتِيهَا أَخْوَالَكِ كَانَ أَعْظَمَ لأَجْرِكِ »).[٤] کورەیب دەڵێ: مەیمونەی کچی حارث (ڕەزای خوای لێبێ) کەنیزەکێکی ئازادکرد و پرسی بە پێغەمبەر (ﷺ) نەکردبوو جا ڕۆژێ کە نۆبەتی ئەو بوو پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی بێت ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زانیوتە کەنیزەکەکەم ئازادکرد؟ فەرموی (بۆ ئازادت کرد؟) ووتی بەڵێ فەرموی: (دەی دڵنیابە ئەگەر بتبەخشایە بە خاڵوانت پاداشتت ( لای خوا ) گەورەتر دەبوو).

**نۆیەم: دروستە موسڵمان و کافر دیاری بۆ یەکتری بنێرن:**

(عن أَنَسٍ إِنَّ أُكَيْدِرَ دُومَةَ أَهْدَى إلى النبي ﷺ).[٥] ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (ئوکەدیری دەومە دیاری بۆ پێغەمبەر (ﷺ) نارد).

---

١) رواه البخاري (٢٥٨٢)

٢) رواه مسلم (٢٢٣٥) و ابو داود (٤١٧٢) و النسائي (٨/ ١٨٩) و احمد ٢/ ٣٢٠

٣) رواه البخاري (٢٥٩٥) و ابو داود (٥١٣٣)

٤) رواه البخاري (٢٥٩٢) و مسلم (٩٩٩)

٥) رواه البخاري (٢٦١٦) و مسلم (٢٤٦٩)

**دەیەم: حەرامە پەشیمان بوونەوە لە بەخشین جگە لە بەخشینی باوک بۆ منداڵەکەی:**

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال قال النبي ﷺ الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ)[1] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەو کەسەی پەشیمان بێتەوە لە بەخشینەکەی وەك ئەو کەسە وایە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی).

(عن ابن عُمَرَ و ابن عَبَّاسٍ قالا قال رسول اللَّهِ ﷺ لَا يَحِلُّ لِأَحَدٍ أَنْ يُعْطِيَ الْعَطِيَّةَ فَيَرْجِعَ فيها إلا الْوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ...).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێن: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ڕەوا نییە بۆ ئەو کەسەی بەخشینێك دەبەخشێ لێی پەشیمان بێتەوە جگە لە باوك لەوەی بەخشیوویەتی بە منداڵی خۆی ...).

**یانزەیەم: حەرامە جیاوازی کردنی لە نێوان منداڵدا لە بەخششدا:**

دروست نییە باوك یان دایك بەخشش بدات بە هەندێ منداڵی و ئەوانی تری لێ بێ بەش کات یا بەشی یەکێکیان لەوانی تر زیاتر بدات، (عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ أَنَّهُ قَالَ إِنَّ أَبَاهُ أَتَى بِهِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ إِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي هَذَا غُلاَمًا كَانَ لِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَهُ مِثْلَ هَذَا ». فَقَالَ لاَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « فَارْجِعْهُ»).[3] نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: باووکی هێنای بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: من غوڵامێکم بەخشیوە بەم کوڕەم، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: (هەموو منداڵەکانت وە ئەمت پێ بەخشیوە؟) ووتی: نەخێر پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (کەواتە ئەمیش بگێڕەوە — پێی مەدە).

**دوانزەیەم: دروست نیە بۆکەس نەپەشیمان بێتەوە لە بەخشینەکەی نە بیکڕێتەوە:**

(عَنْ عُمَرَ رضى الله عنه قال: حَمَلْتُ عَلَى فَرَسٍ فِى سَبِيلِ اللَّهِ فَأَضَاعَهُ الَّذِى كَانَ عِنْدَهُ ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِيَهُ، وَظَنَنْتُ أَنَّهُ يَبِيعَهُ بِرُخْصٍ، فَسَأَلْتُ النَّبِىَّ ﷺ فَقَالَ: « لاَ تَشْتَرِهِ وَلاَ تَعُدْ فِى

---

١) رواه البخاري (٢٦٢١) و مسلم (١٦٢٢/٧)

٢) رواه احمد ٢٧/٢، ٧٨ و ابو داود (٣٥٣٩) و الترمذي (٢١٣٢) و النسائي ٢٦٧/٦ و ابن ماجه (٢٣٧٧)

٣) رواه البخاري (٢٥٨٦) و مسلم (١٦٢٣)

صَدَقَتِكَ وَإِنْ أعطاكَهُ بِدِرْهَمٍ، فَإِنَّ الْعَائِدَ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ كالعائِدُ فِي قَيْئِهِ»).[١] عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ئەسپێکم بەخشی بۆ جیهادکردن لە ڕێی خودا ئەنجا ئەو کەسەی بەلایەوە بوو فەوتانی، و خزمەتی باشی نەدەکرد، منیش ویستم لێی بکڕمەوە وە گومانم دەبرد کە بەهەرزان بیفرۆشێت، بۆیە پرسیارم لە پێغەمبەری خوا کرد (ﷺ) ئەویش فەرمووی: مەیکڕەرەوە پەشیمان مەبەروە لە بەخشینەکەت یا بەدرهەمێکیش پێت بدات چونکە بێگومان ئەو کەسەی لە بەخشینەکەی پەشیمان بێتەوە وەك ئەو کەسە وایە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی).

**سیانزەیەم: چ کاتێ بەخشین دەبێتە فرۆشتن:**

کاتێ بەخشین لەبەرانبەری شتێکدا بێت دەبێتە فرۆشتن، چونکە ئەوەی گرنگە لە کڕین و فرۆشتندا هەبێ ڕازی بوون و هاوکاری یە، کە هەردووکیان لە بەخشینی بەبەرانبەردا هەیە.

**چواردەیەم: پێبەخشین تا لە ژیاندایە: (العمرى و الرقبى)**

ئەگەر کەسێك ماڵێك ببەخشێت بە کەسێك تا ماوە لە ژیاندا ئەوە ئەو بەخشراوە دەبێت مولکی پێ بەخشراوەکە و بە مردنیشی بەخشراوەکە ناگەڕێتەوە بۆ بەخشەرەکە، بەڵکو بۆ میراتگرانی پێ بەخشراوەکە دەبێت. هەروەها ئەگەر شتێکی بەخشی بە کەسێکی وتی: هەر کەسمان پێشتر مردین بەخشراوەکە بۆ زیندوەکەمان بێت ئەمەش هەر بەخشینەکە دەبێت ملکی پێ بەخشراوەکە و دوای مردنیشی بۆ میراتکرانیەتی و ناگەڕێەوە بۆ بەخشەرەکەی.

(عَنْ جَابِرٍ رضى الله عنه قَالَ قَضَى النَّبِيُّ ﷺ بِالْعُمْرَى أَنَّهَا لِمَنْ وُهِبَتْ لَهُ).[٢] جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاری دا ماڵی ببەخشرێت بە کەسێك تا لە ژیاندایە بۆ ئەو کەسەیە پێی بەخشراوە).

(وفي لفظ مسلم: مَنْ أُعْمِرَ عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ فَإِنَّهَا لِلَّذِى أُعْطِيَهَا لاَ تَرْجِعُ إِلَى الَّذِى أَعْطَاهَا لأَنَّهُ عَطَاءٌ وَقَعَتْ فِيهِ الْمَوَارِيثُ»).[٣] لە ڕوایەتێکی موسلیم دا فەرمووی: ( هەرکەسێك ماڵێکی پێ

---

١) رواه البخاري (٢٦٢٣، ١٤٩٠) و مسلم (١٦٢٠)

٢) رواه البخاري (٢٦٢٥) و مسلم (٢٥ / ١٦٢٥)

٣) رواه مسلم (٢٠ / ١٦٢٥)

ببەخشرێت تا لە ژیاندایە بۆ خۆی و بۆ نەوەكانی ئەوە بێگومان ملكی ئەو كەسەیە پێی بەخشراوە، ناگەڕێـەوە بۆ ئەو كەسەی بەخشیویەتی چونكە بەخشینێكی بەخشیووە بەشی میراتگرانی تێكەتووە).

(عَنْ جَابِرٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « أَمْسِكُوا عَلَيْكُمْ أَمْوَالَكُمْ وَلاَ تُفْسِدُوهَا فَإِنَّهُ مَنْ أَعْمَرَ عُمْرَى فَهِيَ لِلَّذِى أُعْمِرَهَا حَيًّا وَمَيِّتًا وَلِعَقِبِهِ »).[1] جابیر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (دەست بە ماڵ و سامانتانەوە بگرن و لەناوی مەدەن، چونكە هەر كەسێك ماڵێك ببەخشێت بە كەسێك تا لە ژیاندایە ئەوە ملكی ئەو كەسەی پێی بەخشراوە بە زیندوویی و بە مردوویی وە بۆ نەوەكانیشی).

(عَنْ جَابِرٍ قَالَ: إِنَّمَا الْعُمْرَى الَّتِى أَجَازَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَقُولَ: هِيَ لَكَ وَلِعَقِبِكَ. فَأَمَّا إِذَا قَالَ: هِيَ لَكَ مَا عِشْتَ. فَإِنَّهَا تَرْجِعُ إِلَى صَاحِبِهَا).[2] جابیر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: بەخشینی ماڵێك بە كەسێك تا لە ژیاندایە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ڕەوای داناوە ئەوەیە كە بەخشەرەكە بڵێ: (ئەو ماڵە بۆ تۆ وە بۆ نەوەكانیشت)، بەڵام ئەگەر ووتی: ئەو ماڵە بۆ تۆ تا لە ژیاندای، ئەوە بێگومان ماڵە بەخشكراوەكە دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەكەی (ئەگەر پێ بەخشراوەكە مرد )[3]

جیاواز زانایان لەم باسەدا

**(العمری) سێ جۆرە:**

١ـ بۆ هەتا هەتایی وەك بڵێ: ئەو ماڵە بۆتۆ و لەپاش تۆش بۆ نەوەكانت.

٢ـ یا بەرەهایی وەك بڵێ: ئەو ماڵە بۆ تۆ هەتا تۆ یان من لە ژیاندا بین.

جەماوەری زانایان ئەم دوو جۆرە بە دروست دادەنێن و دەڵێن بەخشینەكە هەمیشەیی یە ناگەڕێتەوە بۆ خاوەنەكەی.

---

١) رواه مسلم، ٢٦/ ١٦٢٥

٢) رواه مسلم (٢٦ / ١٦٢٥)

٣) رواه مسلم (٢٣ /١٦٢٥)

٣ـ ئەو کەسەی ماڵەکە دەبەخشێت مەرج دانێت پاش مردنی یەکێکیان ماڵەکەی بۆ بگەڕێـتەوە، کۆمەڵێ لە زانایان وەك زوهری و ئیمام مالیك و ئەبو ثەور و داودی زاهیری و رایەکی ئیمام ئەحمەد کە ئیبن تەیمیە لای پەسندە، دەڵێن ئەم مەرجەی بەخشەرەکە دایناوە دروستەو کاری پێدەکرێت.

لەبەرانبەردا زانایانی شافیعی و حەنەفی و ئیمام ئەحمەد -کە ئەم رای مەشهورە لە ئیمام ئەحمەدەوە: دەڵێن ئەم مەرجانە بەتاڵە ماڵە بەخشراوەکە دەبێـتە موڵکی پێ بەخشراوەکە دوا مردنیشی میراتە بۆ میراتگرانی.

# وەکالەت کردن ( الوكالة )

**یەکەم: پێناسەکەی: لەزمانی عەرەبیدا:** بەمانای پاراستن هاتووە وەك قورئان دەفەرمووێ: ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾ آل عمران: ١٧٣ واتە: خوا بەسە بۆ ئێمە کە باشترین پارێزەرە، وە بە مانای پێ سپاردنیش هاتووە وەك قورئان دەفەرمووێ: ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾ **الأنفال:** ٦١ واتە کارت بەخوا بسپێرە.

**وەکالەت لە شەرعدا:** کاری خۆی بداتە دەستی کەسێکی تر لەشتێکدا کە جێگری دروستە بۆ ئەوەی لە حاڵەتی ژیانیدا لە جیاتی ئەو بیکات.

**دووەم: رەوابوونی وەکالەت:** وەکالەت دروستەو رێگە پێدراوە لە ئیسلام دا بەپشت بەستن بەم بەڵگانەی باسیان دەکەین:

**أ- قورئان دەفەرمووێ:** ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ ﴾ **النساء:** ٣٥ واتە: ئەگەر لەتێکچوونی نێوان ( ژن و مێرد ) ترسان ئەو ناوبژیوانێك لە خزمی پیاوەکەو ناوبژیوانێك لە خزمی ئافرەتەکە بنێرن ئەو دوو ناوبژیوانە وەکیلی ژن و پیاوەکەن ، ئەم ئایەتە با لەسەر باسی وەکالەت لە کاری ژن و مێردا هاتووە بەڵام بە گشتی بەڵگەیە لەسەر دروستی وەکالەت ، وە ئەم ئایەتەش دروستی وەکالەتی لێ وەردەگیرێ: ﴿فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ ﴾ **الكهف:** ١٩ واتە: دە یەکێکتان بەم دراوە ( زیوە ) تانۆ بنێرن بۆ شار جا با سەیرکات کێ (لە خەڵکی شار ) خۆراکی پاکترە ئەوە بالەو خۆراکەتان بۆ بێنێ، ناردنی کەسێك لەو کۆمەڵە واتە کردویانە بە وەکیل.

**ب ـ لە سووننەت دا:** (عن عُرْوَةَ الْبَارِقِيِّ قال دَفَعَ إِلي رسول اللَّهِ ﷺ دِينَارًا لِأَشْتَرِيَ له شَاةً فَاشْتَرَيْتُ له شَاتَيْنِ فَبِعْتُ إِحْدَاهُمَا بِدِينَارٍ وَجِئْتُ بِالشَّاةِ وَالدِّينَارِ إلى النبي ﷺ فذكر له ما كان

من أَمْرِهِ فقال له بَارَكَ اللهُ لك فِي صَفْقَةِ يَمِينِكَ).[١] عورووەی باریقی (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دینارێکی پێ دام بۆ ئەوەی مەڕێکی بۆ بکڕم ، منیش دوو مەڕم بۆ کڕی ، جا یەکێکیانم فرۆشت بە دینارێك ، ئەنجا مەڕەکەو دینارەکەم هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) جا ئەو کارەی خۆی بۆ گێڕایەوە ئەویش فەرمووی پێی : (خوای گەروە فەڕوبیت بخاتە مامەڵەتەوە). ئەم وەکیل بوو بۆ کڕین

عن أبِي هُرَيْرَةَ و زيد بن خالد الجهني رَضِي اللَّهُ عنهما ان رَسُولَ الله ﷺ قال:(اغْدُ يا أُنَيْسُ إلى امْرَأَةِ هذا فَإِنْ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا قال فَغَدَا عليها فَاعْتَرَفَتْ فَأَمَرَ بها رسول اللَّهِ ﷺ فَرُجِمَتْ).[٢] ئەبو هورەیرە و زەیدی کوڕی خالیدی جوهەینی (ڕەزای خوایان لێبێ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمودەیەك دەگێڕنەوە لە بەشێکی دا دەفەرمووێ: (ئەنەسە بچکۆل بڕۆ بۆ لای خێزانی ئەم پیاوە جا ئەگەر دانی پیانا زینای کردوە ئەوە بەربارانی بکە -تا دەمرێ- ) دەڵێ ئەویش ڕۆیشت بۆ لای ئافرەتەکە دانی بە زیناکردنەکە دانا جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی بەسەردا داو ڕەجم کرا).

(عن أبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال: وَكَّلَنِي رسول اللَّهِ ﷺ بِحِفْظِ زَكَاةِ رَمَضَانَ).[٣] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاراستنی زەکاتی سەرفیترەی ڕەمەزانی پێ سپاردم ).

وە زانایان یەك دەنگن لەسەر دروستی وەکالەت، بەڵکو سوننەتە چونکە جۆرێکە لە هاوکاری کردنی یەکتری لەبەرئەوەی مرۆڤ ناتوانێت هەموو کارەکانی خۆی بکات بۆیە پێویستی بە وەکیل دەبێت.

### سێ یەم:ئەگەر وەکیل شتێک بفرۆشێت بە زیاتر لەوەی بۆی دانراوە؟

ئەو زیادە بۆ ئەو کەسەیە وەکیلی گرتووە نەك بۆ وەکیلەکە، (عن عُرْوَةَ أَنَّ النبي ﷺ أَعْطَاهُ دِينَارًا يَشْتَرِي له بِهِ شَاةً فَاشْتَرَى له بِهِ شَاتَيْنِ فَبَاعَ إِحْدَاهُمَا بِدِينَارٍ وَجَاءَهُ بِدِينَارٍ وَشَاةٍ فَدَعَا له

---

١) رواه البخاري (٣٦٤٢) و الترمذي (١٢٥٨)

٢) رواه البخاري (٢٦٩٥، ٢٦٩٦) و مسلم (١٦٩٧، ١٦٩٨)

٣) رواه البخاري (٢٣١١)

بِالْبَرَكَةِ فِي بَيْعِهِ وكان لو اشتَرَى التُّرَابَ لَرَبِحَ فيه).[١] عوروەی باریقی (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دینارێكی پێدا بۆ ئەوەی مەڕێكی بۆ بكڕێت، ئەویش دوو مەڕی بۆ كڕی، ئەنجا یەكێكیانی فرۆشت بە دینارێك، جا دینارەكەو مەڕەكەی هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعای پیت و خێری بۆ كرد لە كڕین و فرۆشتندا، جا دوای ئەوە ئەگەر خۆڵیشی بكڕیایە هەر قازانجی دەكرد).

**چوارەم: ئەگەر وەكیل پێچەوانەی ڕای وەكیل گرەكەی كرد:**

ئەگەر ئەو كارە بەسوود تر بوو ئەوە دروستە، (عن مَعْنَ بْنَ يَزِيدَ رضى الله عنه قَالَ: وكَانَ أَبِي يَزِيدُ أَخْرَجَ دَنَانِيرَ يَتَصَدَّقُ بِهَا، فَوَضَعَهَا عِنْدَ رَجُلٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَجِئْتُ فَأَخَذْتُهَا فَأَتَيْتُهُ بِهَا فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا إِيَّاكَ أَرَدْتُ. فَخَاصَمْتُهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ «لَكَ مَا نَوَيْتَ يَا يَزِيدُ، وَلَكَ مَا أَخَذْتَ يَا مَعْنُ»).[٢] مەعنی كوڕی یەزید (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: باوكم چەند دینارێكی كردبو بە خێر و لا پیاوێك لە مزگەوت دایینابوو، منیش هاتم بردم و هێنامەوە بۆ لای باوكم، ئەویش ووتی وەڵڵاهی من نەمویستووە بۆ تۆ بێت ئەنجا لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) سكاڵای كردم ئەویش فەرمووی (ئەوەی نییەتت بوو بۆ نوسراوە ئەی یەزید وە ئەو پارەی وەرگرتووە بۆ خۆت ئەی مەعن).

---

١) رواه البخاري (٣٦٤٢) و الترمذي (١٢٥٨)

٢) رواه البخاري (١٤٢٢)

# زەمانەت و کەفالەت کردن ( الضمانة و الكفالة )

**یەکەم:پێناسەکەی:** لە زمانی عەرەبیدا بەمانای گرتنە ئەستۆ دێت خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ﴾ آل عمران: ٣٧ واتە پێغەمبەر زەکەریا (علیە الصلاة و السلام) ئەرکی بەخێوکردنی مەریەمی گرتە ئەستۆی خۆی وە (قال رسول اللّٰهِ ﷺ: أنا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هَكَذَا، وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى وَفَرَّجَ بَيْنَهُمَا شيئا).[1] پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێ: (من و بەخێوکەری هەتیوو لە بەهەشتدا - پێکەوە- ئاوەهاین) جا ئاماژەی کرد بە پەنجەی شایەتومان و پەنجەی ناوەراست و کەمێ لە یەکتری جیاکردنەوە.

**دووەم:رەوا بوونی:**

زەمانەت کردن و کەفالەت کردن دروستە بگرە سوننەتە ئەگەر ئەو کەسەی دەیکات لە خۆی دڵنیا بێت بە هۆیەوە تووشی زیان نابێت ، بەڵگەی رەوابوون و دروستیشی ئەم بەڵگانەیە:

أـ خوای گەورە لەسەر زمانی یوسف (علیە الصلاة و السلام) دەفەرمووێ: ﴿ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمۡلُ بَعِيرٖ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٞ ﴾ یوسف: ٧٢ واتە هەر کەس ( پێوانەکەی پادشا ) بهێنێتەوە باری ووشترێك - خۆراکی- دەدرێتێ وە منیش زامنی ئەو ( بارە ووشترە )دەبم.

ب ـ (عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ رضی الله عنه قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ أُتِيَ بِجَنَازَةٍ ، فَقَالُوا صَلِّ عَلَيْهَا . فَقَالَ « هَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ » . قَالُوا لاَ . قَالَ « فَهَلْ تَرَكَ شَيْئًا » . قَالُوا لاَ . فَصَلَّى عَلَيْهِ، ثُمَّ أُتِيَ بِجَنَازَةٍ أُخْرَى ، فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ ، صَلِّ عَلَيْهَا . قَالَ « هَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ ». قِيلَ نَعَمْ . قَالَ « فَهَلْ تَرَكَ شَيْئًا » . قَالُوا ثَلاَثَةَ دَنَانِيرَ. فَصَلَّى عَلَيْهَا ، ثُمَّ أُتِيَ بِالثَّالِثَةِ ، فَقَالُوا صَلِّ عَلَيْهَا . قَالَ « هَلْ تَرَكَ شَيْئًا » . قَالُوا لاَ . قَالَ « فَهَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ ». قَالُوا ثَلاَثَةُ دَنَانِيرَ . قَالَ «صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ » . قَالَ أَبُو قَتَادَةَ صَلِّ عَلَيْهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، وَعَلَيَّ دَيْنُهُ. فَصَلَّى عَلَيْهِ).[2]

---

١) رواه البخاري (٤٩٩٨

٢) رواه البخاري (٢٢٩٥)

سەلەمەی كوڕی ئەكوەع (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: مردوویەكیان هێنا تا پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر بكات جا فەرمووی: (هیچ قەرزارە) ووتیان نەخێر، ئەویش نوێژی لەسەر كرد پاشان مردوویەكی تریان هێنا جا فەرمووی : (هیچ قەرزارە) ووتیان : بەڵێ فەرمووی: (نوێژ بكەن لەسەر هاوەڵەكەتان) ئەبو قەتادە ووتی : قەرزەكەی لەسەر من ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر كرد).

**سێ یەم:حیكمەتی ڕەوا بوونی:**

بۆ ئاسان كاریە لەسەر موسڵمانان و ئەنجامدانی هاوكارییە لە نێوانیاندا مرۆڤ هەندێ جار قەرز دەكات و قەرزدەرەكە داوای زەمانەتی لێ دەكات یان بۆ هەندێ كاروباری پێویستە كەسێك ببێتە كەفیلی ئەنجا كارەكەی بۆ دەكرێ. یان شتێ دەكڕێ و نرخەكەی لەدەستدا نیە فرۆشیاریش پێ ێ نادات تا كەسێك نەبێـە زامنی .

**چوارەم: جۆرەكانی كەفالەت:**

**كەفالەت دوو جۆرە:** كەفالەت كردنی قەرز وە كەفالەت كردنی گیان.

**أ ـ كەفالەت كردنی قەرز:** كەفالەتی قەرزێك دەكات كە لە گەردنی كەسێكدایە دەبێتە كەفیلی دانەوەی قەرزەكە ئەگەر قەرزدارەكە لە كاتی خۆیدا نەیدایەوە، ئەمە پێشی دەوترێت زەمانەت كردن.

**ب ـ كەفالەت كردنی گیان:** ئامادەكردنی كەسێك لەئەستۆ ئەگرێ مافێكی لەسەرە قەرز بێت، یا شتێكی تر لەمەیاندا دانەوەی قەرز نیە بەڵكو ئامادەكردنی قەرزارەكەیە.

**پێنجەم:ئەوە زامنی زیندوو یا مردوو بكات چی لەسەرە؟**

ئەگەر كەسێك زامنی دانەوەی قەرزی كەسێكی زیندوو یا مردوو بوو، دەبێت لە كاتی داواكردنی قەرزەكەدا بۆی ببژێرێ لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) كە ئەبو ئومامە گێڕاویەتیەوە دەفەرمووێ: (...وَالزَّعِيمُ غَارِمٌ).[1] واتە: (...... كەفیل زامنە)، بەڵام ئەگەر بە ڕەزامەندی و ئاگاداری زەمانەت بۆ كراوەكە بۆتە زامنی ئەوە ئەو قەرزەی بۆی داوەتەوە دەبێت پارەكەی بۆ بگێڕێتەوە، چونكە لە بنەڕەت دا ئەو قەرزارە نەك زامنەكەی.

---

١) رواه ابن ماجه (٢٤٠) و الترمذي (١٢٦٥)

وە ئەگەر کەسێك کەفالەتی ئامادەکردنی کەسێکی کرد پێویستە لەکات و شوێنی دیاریکراودا ئامادەی کات ئەگەر نەیتوانی دەبێت ئەو قەرزەی لەسەریەتی بۆ ببژێرێت بە بەڵگەی فەرموودەکەی ئەبو ئومامە

# حەواڵە كردن (الحوالة)

**یەكەم: پێناسەكەی** : لە زمانی عەرەبیدا: بە مانای گواستنەوە گۆڕان دێت
**وە لە شەرعدا:** گواستنەوەی قەرزێكە لە ئەستۆی كەسێكەوە بۆ ئەستۆی كەسێكی تر.
**دووەم: ڕەوابوونی:** (عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ فإذا أُتْبِعَ أحدكم على مَلِيٍّ فَلْيَتْبَعْ).[1] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوار (ﷺ) فەرمووی: (دواخستنی قەرزدانەوەی دەوڵەمەند ستەمە، وە هەر كاتێك كەسێكتان حەواڵەكرا بۆ لای دەوڵەمەندێك قەرزەكەی بداتەوە بابڕوات).
**سێ یەم: مەرجی دروستی حەواڵەكردن :**
أ- ڕازیبوونی حەواڵەكەرو حەواڵەكراو نەك حەواڵە بۆ لای كراو بە بەڵگەی فەرموودەكەی ئەبوهورەیرە، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەكەیدا تەنها ئەو دووانەی باسكردووە.
ب - دەبێ هەر دوو قەرزەكە لە ڕەگەزو چەندێتی و ماوەو چاكی و خراپی دا وەك یەك بن ، كەواتە حەواڵەكردن دروستە ئەگەر قەرزەكە ئاڵتون بێت حەواڵەكرا بێتە سەر زیو ، یا قەرزێ كاتی دانەوەی هاتووە حەواڵە بكرێتەوە سەر قەرزێ كاتی نەهاتووە.
ج - ئەبێ هەردوو قەرزەكە دیار بن.
د - دەبێت قەرزەكە جێگیر بوو بێت، نابێ بە هۆی مامەڵەیەكەوە بێت كە مەرجی پەشیمان بوونەوەی تێدابێت.
**چوارەم: بە حەواڵەكردنەكە حەواڵەكەر قەرزی حەواڵەكراوی لەسەر نامێنێ،** وە حەواڵە بۆلا كراویش قەرزی حەواڵەكەر لەسەر نامێنێ ، مافی حەواڵەكراو دەگوازرێتەوە بۆ سەر حەواڵە بۆلا كراو.

---

[1]) رواه البخاري (٢٢٨٧، ٢٢٨٨، ٢٤٠٠) و مسلم (١٥٦٤)

# قەدەغەدانان لەسەر قەرزدار (الحجر علی المفلس)

**یەکەم: پێناسەکەی:**

(مفلس) لە (فلس) ەوە وەرگیراوە کە کەمترین پارەیە لە نرخ بووندا و مەبەست بە موفلیس کەسێك پارەکانی بوو بێت بە فلس کە نیشانەی هەژارکەوتنێتی.

**لەشەرعدا:** موفلیس ئەوەکەسەیە ئەوەندە قەرزی هاتبێـە سەر و کاتی دانەوەیان هاتبێ لەو ماڵە و سامانەی هەیەتی زیاتر بێت.

**دووەم: حوکمەکانی قەدەغەدانان لەسەر قەرزدار:**

**یەکەم:** دروستە قەدەغەدانان لەسەر قەرزدار ئەگەر قەرزەکان لەسامان و ماڵی زیاتر بن، بەڵام ئەگەر یەکسان بن یا ماڵ و سامانەکەی زیاتر بێت ئەو دروست نییە قەدەغەی لەسەر دابنرێت، چونکە ئەو بەڵگانەی ڕەوابوونی قەدەغە لەسەردانان لەسەر قەرزدار دەسەلمێنن لە کاتێکدایە قەرزەکان لە ماڵەکەی زیاتر بن.

**دووەم:** قەدەغە لەسەر قەرزدار دانانرێت لەسەر داوای خاوەن قەرزەکە نەبێ، جا ئەگەر خاوەن قەرزەکان هەموویان داوایان نەکرد قەدەغەی بخرێتە سەر، ئەگەر ئەوەی داوا دەکات قەدەغەی بخرێتە سەر قەرزەکەی هەموو ماڵی قەرزارەکەی دەگرتەوە، هەر دەبێ قەدەغەی بخرێتە سەر بە پێچەوانەوەناخرێتە سەری.

**سێیەم:** ئەگەر قازی قەدەغەی لەسەر قەرزارەکە دانا ئەو کاتە مافی خاوەن قەرزەکان دەگۆڕێت لەئەستۆی قەرزارەکەوە بۆ ماڵ و سامانەکەی، بۆیە خواو پێغەمبەر (ﷺ) مافی دەسەڵات بوونیان بە خاوەن قەرزەکان داوە بەسەر ماڵی قەرزارەکەدا بۆ ئەوەی ماف و قەرزی خۆیانی لێ وەربگرنەوە.

**چوارەم:** سوننەتە قازی بڕیاری قەدەغە لەسەر قەرزدار ئاشکرا بکات لەناو خەڵکدا بۆ ئەوەی مامەڵەی لەگەڵدا نەکەن، چونکە لەو کاتەدا کە قەدەغەکەی لەسەردانراوە نابێ مامەڵەیە

بكات زیان بە ماڵەكەی بگەیەنێت لەبەر ئەوەی مافی خاوەن قەرزەكانی لێبدرێت جگە لە خەرجی ڕۆژانەی خۆی و خێزانی.

**پێنجەم:** پێویستە قازی خۆی یا نوێنەری ماڵی قەرزدارەكە بفرۆشێت ، پاشان پارەكەی بەسەر خاوەن قەرزەكاندا دابەش بكات بەرێژەی قەرزەكانیان وە سوننەتە بە زوویی ئەو كارە بكات وە دەبێ ڕەچاوی بەرژەوەندی قەرزدارەكە بكات لە شێوەی فرۆشتنی ماڵەكەیداهەر شتی لە بازاڕِ خۆیدا و بەنرخی خۆی بفرۆشێت وە سوننەتە لە كاتی فرۆشتنی قەرزدارو خاوەن قەرزەكان ئامادەبن پێویستە قازی بەشی پێویستی خۆی و خێزانی بۆ بهێلێتەوە بۆ خواردن و پۆشاك و نیشتەجێ بوون.

**شەشەم:** ئەگەر ماڵەكەی فرۆشراو هەر خاوەن قەرزێ بە ئەندازەی قەرزەكەی پارەی پێدرا، ئەگەر دوای ئەوە قەرزیان لای مابوو دەبێ لێی بوەستن تا خوا دەروی لێ دەكاتەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢٨٠ واتە: ئەگەر قەرزدارێك دەست كورت بوو ئەوە مۆڵەتی بدەن تا ماڵی دەبێ دەستی دەكرێتەوە وە ئەگەر - لە قەرزەكە - ئازادی بكەن چاكترە بۆتان ئەگەر بزانن. (عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قال أُصِيبَ رَجُلٌ في عَهْدِ رسول اللَّهِ ﷺ في ثِمَارٍ ابْتَاعَهَا فَكَثُرَ دَيْنُهُ فقال رسول اللَّهِ ﷺ تَصَدَّقُوا عليه فَتَصَدَّقَ الناس عليه فلم يَبْلُغْ ذلك وَفَاءَ دَيْنِهِ فقال رسول اللَّهِ ﷺ لِغُرَمَائِهِ خُذُوا ما وَجَدْتُمْ وَلَيْسَ لَكُمْ إلا ذلك).[1] ئەبو سەعید خودری (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) تووشی زیان بوو لە بەرووبومێكدا كە كڕیبووی بەو هۆیەوە قەرزارێكی زۆر بوو پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: بە موسوڵمانان (پێی ببەخشن) ئەنجا خەڵكیش پێیان بەخشی بەڵام نەگەشتە ئەوەی قەرزەكانی تەواو بكات جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بە خاوەن قەرزەكان (ئەوەی دەستان كەوت بیبەن ئێستا جگە لەوە هیچتان بۆ نییە).

---

١) رواه مسلم (١٨ / ١٥٥٨)

**حەوتەم:** هەر کەس کەل و پەل یا ماڵەکەی خۆی لای قەرزدارێکی قەدەغە لەسەر دانراو بینیەوە ئەوە خۆی لە خاوەنی قەرزەکانی تر لە پێشترە بە ماڵەکەی خۆی و دەدرێتەوە پێی، (عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه يقول قال رسول اللَّهِ ﷺ من أَدْرَكَ مَالَهُ بِعَيْنِهِ عِنْدَ رَجُلٍ أو إِنْسَانٍ قد أَفْلَسَ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ من غَيْرِهِ).[١] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا فەرمووی (ﷺ): (هەرکەس ماڵەکەی خۆی لای کەسێکی قەرداری تێشکاو بینییەوە ئەوە ئەو کەسە لە خەڵکانی تر ( کە قەرزیان لای قەرزارەکەیە ) لە پێشترە بەو ماڵە لەوانی تر).

**هەشتەم:** ئەگەر روون بویەوە کە موفلیسە ئەوە دروست نیە بەند بکرێت، چونکە پێچەوانەی بڕیاری خوایە کە دەفەرمووێ: ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ﴾ البقرة: ٢٨٠ واتە: ئەگەر کەسێك قەرزدایێکی نەدار بوو ئەوە چاوەڕوانی بکرێت تا دارا دەبێت حالی ماددی چاك دەبێت.

**نۆیەم:** دەوڵەمەند قەرزدانەوەی دوا بخات:

دواخستنی قەرزدانەوەی دەوڵەمەند قسە پێ ووتنی و سزادانی حەلاڵ دەکات (عن عَمْرِو بن الشَّرِيدِ عن أبيه عن رسول اللَّهِ ﷺ قال لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ).[٢] عەمری کوڕی شەرید لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (قەرز کوێری دەوڵەندی قسە پێ ووتن و سزادانی حەلاڵ دەکات).

**دەیەم:** دروستە قەدەغە دانان لەسەر ماڵ بە فیڕۆدەر:

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ﴾ النساء: ٥ واتە: ماڵەکانتان مەدەنە دەست گێل و کەم عەقڵەکانتان ئەو کەسانەی ماڵ بە فیڕۆدەدەن و لە جێگای خۆیدا خەرجی ناکەن لە مامەڵەدا دەخەڵەتێن یا ماڵیان لە حەرامدا خەرج دەکەن.

---

١) رواه البخاري (٢٤٠٢) و مسلم (٢٢ / ١٥٥٩)

٢) رواه ابو داود (٣٦٢٨) و النسائي (٧/ ٣١٦) و ابن ماجه (٢٤٢٧) وهو حديث حسن

**یازدەیەم:** هەتیوو ماڵەکەی دەدرێتە دەستی کاتیٚ بالغ و هۆشیاربوون:

هەتیوو تا منداڵە سەرپەرشتیارەکەی ئاگای لە ماڵ و سامانی دەبێت کاتیٚ بالْغ و ژیر و هۆشیاربوون واتە بەرژەوەندی ئایین و دونیا لەبەرچاو بگرێت ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱبْتَلُوا۟ ٱلْيَتَـٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُوا۟ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ ﴾ النساء: ٦ واتە: هەتیوەکان تاقی بکەنەوە کاتی گەیشتنە - تەمەنی - ژنهێنان و شووکردن جا ئەگەر ژیری و هۆشیاریتان لەوانەدا هەست پێکرد ئەوسا پارە و سامانەکانیان بدنەوە دەستی خۆیان.

**دوازدەیەم:** سەرپەرشتیاری هەتیوو ( ئەگەر هەژار بوو ) دروستە لە ماڵی هەتیوەکە بخوات بە ئەندازەی پێویست :

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها تَقُولُ فِي قوله تعالى: ( وَمَنْ كان غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ كان فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ) أُنْزِلَتْ فِي وَالِي الْيَتِيمِ الذي يُقِيمُ عليه وَيُصْلِحُ فِي مَالِهِ إن كان فَقِيرًا أَكَلَ منه بِالْمَعْرُوفِ).[1] عائیشە (رەزای خوای لێبیٚ) دەربارەی ئەم ئایەتە:﴿ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ النساء: ٦ دەڵێ: ئەم ئایەتە لەبارەی ماڵی هەتیوەوە دابەزی ئەگەر سەرپەرشتیارەکەی هەژار بوو لەماڵی هەتیوەکە بخوات لە بەرانبەر سەرپەرشتی کردنی و بەخێوکردنی هەتیوەکەدا.

تەفسیری ئایەتەکەش ئەمەیە: هەر کەس ( لە سەرپەرشتیاری هەتیوان ) دەوڵەمەند بوو با خۆی بپارێزیٚ ( لە خواردنی ماڵی هەتیوان) وە هەر کەسیش هەژار بوو با بەئەندازەی پێویست لێی بخوات.

---

١) رواه البخاري، ٤٥٧٥. ومسلم ١٠/ ٣٠١٩.

# ماڵی دۆزراوە ( اللقطة )

**یەکەم: پێناسەکەی: لە زمانی عەرەبیدا:** ئەو شتەیە لە زەویدا هەڵدەگیرێ، خوای گەورە دەربارەی مووسا (علیه الصلاة و السلام) دەفەرموێ:﴿ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ ﴾ القصص:٨ واتە: دەست و پەیوەندی فیرعەون ( مووسایان ) هەڵگرتووە لە ئاوەکە - کە دایکی دوا لە دایکبوونی لەناو سندوقێکدا فڕێی دایە نیلەوە .

**لە زاراوەی شەرعدا:** ماڵێکە لە جێگایەکەدا کە مولکی کەس نییە دۆزرابێتەوە و خاوەنی نەناسرێت وە بە زۆری بەو شتانە دەوترێت کە ئاژەڵ نین، بەڵام ئەگەر وون بوو ئاژەڵ بوو پێی دەوترێت (ضالة).

**دووەم: ڕەوا بوونی هەڵگرتنەوەی ماڵی دۆزراوە:**

(عن زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ الْجُهَنِيَّ رضي الله عنه قالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ لُقَطَةِ الذَّهَبِ أَوِ الْوَرِقِ، فَقَالَ: «اعْرِفْ وِكَاءَهَا وَعِفَاصَهَا ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً فَإِنْ لَمْ تَعْرِفْ فَاسْتَنْفِقْهَا وَلْتَكُنْ وَدِيعَةً عِنْدَكَ فَإِنْ جَاءَ طَالِبُهَا يَوْمًا مِنَ الدَّهْرِ فَأَدِّهَا إِلَيْهِ». وَسَأَلَهُ عَنْ ضَالَّةِ الإِبِلِ فَقَالَ « مَا لَكَ وَلَهَا دَعْهَا فَإِنَّ مَعَهَا حِذَاءَهَا وَسِقَاءَهَا تَرِدُ الْمَاءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ حَتَّى يَجِدَهَا رَبُّهَا ». وَسَأَلَهُ عَنِ الشَّاةِ فَقَالَ « خُذْهَا فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ أَوْ لأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ »).[1] زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا کرا (ﷺ) دەربارەی ئاڵتون و زیوی دۆزراوە ئەویش فەرمووی: (بزانە پەتی دەم بەستنەکەو تورەکەکەی چییە و چۆنە؟ پاشان تا ساڵێك بانگەوازی بۆ بکە جا ئەگەر نەناسراو بێ و خاوەن بوو ئەوسا خەرجیکە و باسپاردە بێت لات، جا ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان خاوەنەکەی هات و داوای کرد بیدەرەوە) جا پرسیاری وشتری وونبووی لێ کرد فەرمووی: (تۆ چیتە بەسەریەوە؟ وازی لێ بێنە پێلاو و جەوەندە ئاوی خۆی پێیە، دەڕوات بۆ ئاو خواردنەوەو ( گەڵای ) درەخت دەخوات هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە) وە

---

١) رواه البخاري (٩١، ٢٣٢٧ ، ٢٤٢٨) و مسلم (٥ / ١٧٢٢)

پرسیاری مەڕو بزنی ونبووی لێ کرد فەرمووی (بیبە چونکە یا بۆ تۆ دەبێ یا بۆ براکەت یا بۆ گورك).

**سێ یەم: حیکمەتی ڕەوا بوونی هەڵگرتنەوەی شتی دۆزراوە:**

مرۆڤ ئەگەر شتێك وون بكات ، نارەحەت دەبێ و خەفەتی بۆ دەخوات زۆر جار نایدۆزێتەوە جا دۆزینەوەی ئەو وونبووەو هەڵگرتنی و پارێزگاری کردن تا دەدرێتەوە دەستی خاوەنەکەی کارێکی بە سوودە و بۆ خاوەنەکەی و پاداشتی دۆزەرەوەکەش دەگات بەدەمەوەچوونی ئەم وتەی خوای گەورەیە: ﴿ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ﴾ المائدة: ٢ واتە: هاوکاری یەکتری بکەن لەسەر چاکەو پارێزگاری بەڵام هاوکاری یەکتر مەبن لەسەر تاوان و دەستدرێژی وە گوێڕایەڵی ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە دەفەرمووێ: (وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ ما كان الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ).[1] (خوای گەورە لە یارمەتی دانی بەندەدایە هەتا بەند لە یارمەتی دانی براکەیدا بێت). وەکاتێ شتەکەی وون کردووە تووشی غەم و پەژارە بووە بەڵام بە دۆزینەوەی نامێنێ و لادەچێت، دۆزەرەوەکەش پاداشتی گەورەی دەبێ وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (من نَفَّسَ عن مُؤْمِنٍ كُرْبَةً من كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ الله عنه كُرْبَةً من كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ).[2] (هەر کەس نارەحەتێك لەسەر موسڵمانێك لابات لە نارەحەتێکانی دونیا بە هۆیەوە خوا نارەحەتێك لەنارەحەتێکانی ڕۆژی دوایی لەسەر لادەبات).

**چوارەم: ماڵە دۆزراوەکە ساڵێک جارو ئاگاداری بۆ دەکرێ:**

ئەگەر خاوەنی نەبوو دروستە بۆ دۆزەرەوەکەی خەرجی بكات یا بەکاری بهێنێ بۆ خۆی بەڵام هەر کاتێ خاوەنی پەیدابوو دەبێت بیداتەوە. (عن سُوَيْدَ بْنَ غَفَلَةَ قَالَ لَقِيتُ أُبَىَّ بْنَ كَعْبٍ رضي الله عنه فَقَالَ أَخَذْتُ صُرَّةً مِائَةَ دِينَارٍ فَأَتَيْتُ النَّبِىَّ ﷺ فَقَالَ « عَرِّفْهَا حَوْلاً ». فَعَرَّفْتُهَا حَوْلَهَا فَلَمْ أَجِدْ مَنْ يَعْرِفُهَا ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَقَالَ « عَرِّفْهَا حَوْلاً » فَعَرَّفْتُهَا فَلَمْ أَجِدْ ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ ثَلاَثًا فَقَالَ «احْفَظْ وِعَاءَهَا وَعَدَدَهَا وَوِكَاءَهَا ، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا ، وَإِلاَّ فَاسْتَمْتِعْ بِهَا » . فَاسْتَمْتَعْتُ

---

١) رواه مسلم (٢٦٩٩)

٢) رواه مسلم (٢٦٩٩) و ابو داود (٤٩٤٦)

فَلَقِيتُهُ بَعْدُ بِمَكَّةَ).[1] سووەیدی کوڕی غەفلە دەڵێ: بە ئوبەی کوڕی کەعب گەشتم (ڕەزای خوای لێبێ) جا ووتی: تورەکەیەکم دۆزیەوە سەد دیناری تێدابوو جا ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ساڵێك جاڕی بۆ بدە) منیش ساڵێك جاڕم بۆ دا کەسم نەدی خاوەنی بێت ، پاشان ڕۆشتمەوە خزمەتی فەرمووی (ساڵێك جاڕی بۆ بدە)[2] منیش جاڕم بۆ داو کەس خاوەنی نەبوو پاشان بۆ جاری سێیەم ڕۆشتمەوە بۆ خزمەتی پێغمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بزانە تورەکەکەو و ژمارەی و پەتی دەم بەستنەکەی چۆنە و چەندە جا ئەگەر خاوەنەکەی هات بیدەرەوە ( ئەگەر نەهات بۆخۆت سوودی لێ وەربگرە) منیش خەرجم کرد). جا دواتر لەمەککە بە خاوەنەکەی گەشتم

**پێنجەم: گرنگیدان بە جاڕدان بۆ دۆزراوە لە مەککەدا:**

(قَالَ أَبو هُرَيْرَةَ - رضى الله عنه - لَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ مَكَّةَ قَامَ فِى النَّاسِ ، فَحَمِدَ اللَّهَ ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ « إِنَّ اللَّهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْفِيلَ ، وَسَلَّطَ عَلَيْهَا رَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ ، فَإِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لأَحَدٍ كَانَ قَبْلِى ، وَإِنَّهَا أُحِلَّتْ لِى سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ ، وَإِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لأَحَدٍ بَعْدِى ، فَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهَا وَلاَ يُخْتَلَى شَوْكُهَا ، وَلاَ تَحِلُّ سَاقِطَتُهَا إِلاَّ لِمُنْشِدٍ ،..).[3] ئەبوهوریرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: کاتێ خوای گەروە شاری مەککەی بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئازاد کرد لەناو خەڵکەکەدا هەستاو ووتارێکی بۆ دان سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد پاشان فەرمووی: (بێگومان خوای گەورە بەرگری فیلەکانی ( ئەبرەهەی ) کرد لە مەککە بەڵام پێغەمبەرەکەی‌و باوەڕدارانی دەسەڵاتدارکرد بەسەرید ا بێگومان پێش من بۆهیچ کەس حەڵاڵ نەبووە بجەنگێ تێیدا بەڵام لە ساتێکی ڕۆژدا جەنگاندن بۆ من حەڵاڵ کرا، لەدوا منیش بۆ کەس حەڵاڵ نابێ نێچیری ڕاوناکرێ و ناترسێنرێ دڕکی هەڵناکەنرێ هەرچی کەوتووە ( و لە خەڵك

---

١) رواه البخاري (٢٤٢٦)

٢) ئیبن حەجری عەسقەلانی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: ئەوەی لام ڕوونە سەلەمەکە یەکێکە لە گێڕەروەکانی ئەم فەرموودە هەڵەی کردووە لە ژمارەی جاردانەکاندا کە سێ ساڵە دواتر بیری کەوتۆتەوە بەیەك ساڵ ریوایەتی کردووە.

٣) رواه البخاري (٢٤٣٤) و مسلم (١٣٥٥)

وون بـووه ) بـۆ کـەس حـەڵاڵ نییـە هـەڵی بگـرێ جگـە لـە جـاڕدەر (کـە بیـەوێ خاوەنەکـەی بدۆزێتەوه).

**شەشەم: ئەگەر دۆزراوەکە شتێکی کەم نرخ بوو دروستە بۆ دۆزەرەوەکەی خواردنی و بەکارهێنانی:**

(عن أَنَسٍ رضي الله عنه قال مَرَّ النبي ﷺ بِتَمْرَةٍ فِي الطَّرِيقِ قال لَوْلَا أَنِّي أَخَافُ أَنْ تَكُونَ مِنَ الصَّدَقَةِ لَأَكَلْتُهَا).[١] ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەنکێ خورمای دۆزییەوه جا فەرمووی (ئەگەر لەبەر ئەوه نەبێ لەوانەیە ئەمە خورمای زەکات بێ دەمخوارد)

١) رواه البخاري (٢٤٣١) و مسلم (١٠٧١)

# پێکهاتن (الصلح)

**یەکەم: پێناسەکەی:** لە زمانی عەرەبیدا : بەمانای کۆتایی هێنان بە ئاژاوەو کێشە.
وە لەزاراوەی شەرعدا واتە : پێکهاتن بۆ نەهێشتنی کێشەی نێوان دوو کەس یان زیاتر.
**دووەم: ڕەوا بوونی :** پێکهاتن دروستە و ڕەوایە قورئـان بـە چـاکەو خێـر ناوزەنـدی کـردووە، دەفـەرموێ:﴿ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞ ﴾ النـساء: ١٢٨ واتـە سـوڵح و ڕێکـەوتن چـاکەو خێرەئەمـەش بەڵگەی دروستییەتی چونکە هەر شتێ خێربێت دروست و ڕەوایە لە ئیسلامدا.
وە خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێ: ﴿ لَّا خَيۡرَ فِي كَثِيرٖ مِّن نَّجۡوَىٰهُمۡ إِلَّا مَنۡ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوۡ مَعۡرُوفٍ أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾ النساء: ١١٤ واتە: زۆربـەی بەچپەو سـرتەکانیان خێـرو چـاکەی تێـدا نییـە مەگـەر کەسێك فەرمان بکات بە ماڵ بەخشین یا چاکە یان چاککردنی نێوان خەڵك، جا هەر کەس ئـەوە بکـات و مەبەسـتی بەدەسـت هێنـانی ڕەزامەنـدی خودابێـت ئـەوە بێگومـان لـە داهـاتوودا پاداشتێکی گەورەی پێ دەبەخشێ.
**سێ یەم: حیکمەتی ڕەوابوونی:**
ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئایینی برایەتی و یەك ریزی و هاوکاریـە و دژی نـاکۆکی و جیـاوازی یـە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ ﴾ آل عمـران: ١٠٣ واتە هەمووتان دەست بگـرن بـە ئـایینی خـواوە جیـاواز مـەبن، بـۆ ئـەم مەبەسـتە ئیـسلام هـەموو هۆکارەکانی جیاواز بوون ناهێڵێ و فەرمان دەکات هەموو کەس مافی خـۆی پێبدرێـت چـونکە بەجێنەهێنانی کێشەی لێ پەیـدا دەبـێ خـوای گـەورە دەفـەرموێ :﴿ وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ وَتُدۡلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلۡحُكَّامِ لِتَأۡكُلُواْ فَرِيقٗا مِّنۡ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلۡإِثۡمِ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾
البقرة: ١٨٨ واتە : ماڵی یەکتری مەخۆن بە ناڕەوا و بەرتیل مەدەن بە کاربەدەستان بۆ ئـەوەی

بەشێك لە ماڵ و سامانی خەڵكی بخۆن بە تاوانباری لە كاتێكدا خۆتان دەزانن ( نارەوایە) وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگادارمان دەكاتەوە لە ئەنجامی خراپی یەكتر بوغزاندن و كێشەو ئاژاوە كە سەردەكێشێ بۆ یەكتر كوشتن كە هەندێ جار مرۆڤ پێی كافر دەبێت، دەفەرموێ: (لاَ تَبَاغَضُوا ، وَلاَ تَحَاسَدُوا ، وَلاَ تَدَابَرُوا ، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا) و يقول (لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ) [١] (یەكتری مەبوغزێنن و حەسودی بە یەكتری مەبەن و دەنگ لەیەكتری وەرمەگرن، هەموو بەندەی خواو برابن) و دەیفەرموو: (دوا من كافر مەبنەوە هەندێكتان بدەن لە گەردەنی هەندێكتان).

وە ئیسلام هانی موسڵمانان دەدات بۆ پتەوكردنی برایەتیان بە ئاسانكرای لەگەڵ یەكتری كردن پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (« رَحِمَ اللَّهُ رَجُلاً سَمْحًا إِذَا بَاعَ ، وَإِذَا اشْتَرَى ، وَإِذَا اقْتَضَى»). [٢] (رەحمەتی خوا لە پیاوێك بێت ئاسان كارە كاتێ شت دەفرۆێ و كاتێ دەیكڕێ و كاتێ مافێكی وەردەگرێ لە خەڵك)

وە دەبینین لە پێناو سوڵح و پێكهاتندا پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەی داوە قسەیەك بكات كەوا نییە وەك دەفەرموێ: (« لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِى يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ فَيَنْمِى خَيْرًا وَيَقُولُ خَيْرًا »). [٣] (ئەو كەسەی نێوان خەڵك چاك دەكات درۆزن نییە، قسەی چاك دەكەیەنێت و چاكیش دەڵێ). لەسەر زمانی هەردوولای كێشەكە بانەشیان ووتبێ.

**چوارەم: جۆرەكانی پێكهاتن:** پێكهاتن لە شەرعدا چەند جۆرێكی هەیە هەموویان دروستن لەوانە:

أـ ڕێكوتن لە نێوان دەوڵەتی ئیسلامی و بێ باوەڕاندا، خوای گەروە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ﴾ الأنفال: ٦١ واتە ئەگەر بێ باوەڕان ملیان دا بۆ ئاشتی تۆش پێ ڕازی بە و پشت بە خوا ببەستە، نمونەی ئەم جۆرە پێكهاتنە ڕێكەوتنی حودەیبیە وە زۆر سوڵحی تر لە ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ)

١) رواه البخاري (١٢١، ٥٧١٨) و مسلم (٢٥٥٩)

٢) رواه البخاري (٢٠٧٦)

٣) رواه البخاري (٢٥٤٦) و مسلم (٢٦٠٥)

**ب ـ ڕێکەوتن لە نێوان موسڵمانانی ڕاستەقینە لەگەڵ ئەوانی لە فەرمانی ئیمام دەرچوون،** خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ﴾ الحجرات:٩ واتە ئەگەر دوو دەستە لە باوەڕداران دژ بەیەکتری جەنگیان کرد ئەوە ئێوە نێوانیان چاك بکەن.

**ج ـ پێکهاتنی نێوان ژن و پیاو کاتێ ئاژاوەو کێشە پەیدا بێ لە نێوانیاندا:**

خوای گەروە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ﴾ النساء: ١٢٨واتە: ئەگەر ئافرەتێك ترسا لە گوێ پێندان یا پشت هەڵکردنی مێردەکەی ئەوە ژن و مێردەکە گوناهیان لەسەر نیە کە ئاشتەواییەکی چاك بکەن لە نێوان خۆیاندا.

**د ـ ڕێکەوتن و سوڵح کردن لە نێوان کەسانێکدا کێشەو ناکۆکیان هەیە لە شتانێکدا کە ماڵ و سامان نیە.**

**هـ ـ پێکهاتن لە مامەڵەدا کە پەیوەندە بە ماڵ و سامانەوە کە مەبەست لە باسی سولح ئەمەیان لای شەرعزانەکان،** بەڵام جۆرەکانی تر هەریەکەیان لە جێگای خۆیدا باسی لێوە دەکرێ.

**پێنجەم: پێکهاتن لەسەر حەڵاڵ کردنی حەرام یا بە پێچەوانەوە:**

دروست نییە ڕێکەوتن لەسەر حەڵاڵ و حەرام کردن یا پێچەوانەکەی، بەڵکو ڕێکەوتن لەسەر شتێك دەکرێ کە ڕێگە پێدراو بێت نەك گۆڕین و دەستکاری کردنی حوکمی خواو پێغەمبەر (ﷺ). (عنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ « الصُّلْحُ جَائِزٌ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ إِلاَّ صُلْحًا حَرَّمَ حَلاَلاً أَوْ أَحَلَّ حَرَامًا وَالْمُسْلِمُونَ عَلَى شُرُوطِهِمْ إِلاَّ شَرْطًا حَرَّمَ حَلاَلاً أَوْ أَحَلَّ حَرَامًا»).[١]

عەمری کوڕی عەوف (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (پێکهاتن لە نێوان موسڵماناندا دروستە جگە لە پێکهاتنێك حەڵاڵ حەرام بکات یان حەرام حەڵاڵ بکات وە موسڵمان دەبێ پابەندی مەرجەکانیان بن جگە لە مەرجێك حەڵاڵ حەرام کات یان حەرام حەڵاڵ کات).

---

١) رواه الترمذي (١٣٥٢) و ابن ماجه (٢٣٥٣) و قال الترمذي حديث حسن صحيح

**شەشەم: ڕێکەوتن لەسەر دان پیادانەهێنان:**

ئەوەیە کەسێك بڵێ مافێکی بەسەر کەسێکی ترەوەیە پارە بێت یا زەوی و زار بەڵام کەسێ بەرانبەر بێ دەنگ دەبێ یان دان نەنێت بەو قسەدا کە کەسی یەکەم دەیکات لەگەڵ ئەوەشدا کەسی یەکەم داوای پێکهاتن دەکات دەڵێ با سوڵح بکەین ، ئەم جۆرە پێکهاتن و سوڵحە دروست نییە ئەگەر ئەنجامیش بدرێت ڕەوا نیە هیچ ئەنجامێکی لێ ناکەوێتەوە ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی عەمری کوڕی عەوف لە بڕگەی (٥) دا باسکرا.

**حەوتەم: ڕێکەوتن لەسەر دان پیاداهێنان:**

ئەوەیە کەسێك دەڵێ بە کەسێکی تر مافێکم لاتە ئەویش دانی پێدادەهێنێ جا قەرز بێت یا کەلوپەل ئەنجا داوای پێکهاتن دەکات لەسەری جا ئەگەر پێکهاتن ئەوە دروستە و ئەنجامی ڕێکەوتنی لێ پەیدا دەبێت، ئەم جۆرە ڕێکەوتنە دوو بەشە: یان ڕێکەوتنە لەسەر شت و مەك یا ڕێکەوتنە لەسەر قەرز.

**أ۔ ڕێکەوتن لەسەر شت ومەك:** جا ئەگەر ڕێکەوتن لەسەر بەشێکی شتەکە ئەوە پێ دەڵێن ڕێکەوتنی داشکاندن وە ئەگەر ڕێکەوتن لەسەر شتێکی تر بدرێت لە جێگای ئەوەی لایەتی ئەوە پێی دەڵێن ڕێکەوتنی گۆڕاو.

**ب ۔ ڕێکەوتن لەسەر قەرز :** ئەوەیە کەسێك بڵێ بە کەسێکی تر ملیۆنێك دینارم لاتە ئەویش دانی پێدا بنێ پاشان ڕێك بکەون جا یا لەسەر هەندێکی ڕێکدەکەون ئەوە ڕێکەوتنی داشکاندنە یان قەرزەکە دەگۆڕن بە شتێکی تر ئەوەشیان ڕێکەوتنی گۆڕاوە.

**هەشتەم: ڕێکەوتن لەسەر قەرز**

(عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْنًا كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي عهد رسول الله ﷺ فِي الْمَسْجِدِ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِهِ فَنَادَى كعب بن مالك فقال: « يَا كَعْبُ » . قَالَ لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ . فأشار إليه بيده أن « ضَعْ الشطر مِنْ دَيْنِكَ» . قَالَ كعب قَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ . قَالَ « قُمْ فَاقْضِهِ »).[1] کەعبی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:

---

١) رواه البخاري (٤٧١) و مسلم (١٥٥٨)

لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لە مزگەوت دا داوای دانەوەی قەرزێکی خۆی لە ئیبن ئەبی حەدرەد کرد کە لەلای بوو، جا هەردووکیان دەنگیان بەرزبوویەوە - بەرادەیەك - هەتا پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی خۆیانەوە گوێی لێبوو، هاتە درەوە بۆ لایان پەردەی ژوورەکەی هەڵدایەوە و کەعبی کوڕی مالیکی بانگ کردو فەرمووی: (ئەی کەعبی کوڕی مالیك) کەعب وتی بەڵێ گوێڕایەڵتم ئەی پێغەمبەری خوا، جا بەدەستی ئاماژەی بۆ کەعب کرد کە لە نیوەی قەرزەکەت خۆش ببە، کەعبیش وتی: ئەوە لێی خۆش بووم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموو بە ئەبی حەدرەد (هەستە قەرزەکەی بدەرەوە). ئەم ڕێکەوتنە بە ووشەی سوڵح دروستە هەروەها بە ووشەی ئازادکردن و داشکاندنیش دروستە.

# کتێبی سوێند خواردن ( الأيمان )

**یەکەم: پێناسەکەی:** (أيمان) **لەزمانی عەرەبیدا:** کۆی (يمين)ە کە بەدەستی راست دەووترێت، وە بەسوێند دەووترێت، چونکە لەرابردوودا کاتێك سوێندیان بۆ یەکتر بخواردایە دەستی راستی یەکتریان دەگرت لەکاتی سوێند خواردنەکەدا.

**وە لەشەرعدا:** بەدیهێنان یا جەخت کردنەوەی کارێکە بەهۆی ناوهێنانی ناوێك لەناوەکانی خوای گەورە یان سیفەتێك لەسیفەتەکانی.

**دووەم: سوێند خواردن بەچی دروستە؟**

سوێند خواردن تەنها بەناوی خوای گەورەو بەسیفەتەکانی دروستە. (عن ابن عُمَـرَ رضـي الله عنهما أَدْرَكَ عُمَرَ بن الْخَطَّابِ يسير في رَكْبٍ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ فَقال رسول اللَّـهِ ﷺ ألا إِنَّ اللَّـهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ فَمَنْ كان حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أو فَلْيَصْمُتْ).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەعومەری کوڕی خەتتاب گەشت لەگەڵ کاروانێکدا دەرۆشت بەناوی باوکی سوێندی خوارد، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (ئاگادارین بێگومان خوا رێگریتان لێ دەکات کە سوێند بخۆن بەناوی باوکتان، جا هەرکەس سوێندی خوارد با بەخوا سوێند بخوات یا بێدەنگ بێت).

**سێ یەم: سوێند خواردن بەهەر شتێ جگە لەخوا هاوبەش پەیداکردنە بۆ خوا:**

هەرکەس سوێند بخوات بەهەرشتێ جگە لەناو و سیفەتەکانی خوای گەورە ئەوە هاوبەش دانانە بۆ خوای گەورە. (عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما قال: سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول: من حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ كَفَرَ أو أَشْرَكَ).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خوایان لێبێ) دەڵێ:

---

١) رواه البخاري (٦٢٧٠) و مسلم (١٦٦٤)

٢) رواه الترمذي (١٥٧٤) وهو حديث صحصح

لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست دەیفەرموو: (هەرکەس سوێند بخوات بەغەیری خوا ئەوە بێگومان کافر بووە یان هاوبەشی بۆ خوا داناوە).

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من حَلَفَ فقال في حَلِفِهِ وَاللَّاتِ وَالْعُزَّى فَلْيَقُلْ لَا إِلَهَ إلا الله...).[1] ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس سوێندی خواردو لە سوێندەکەیدا وتی بەلاتو عوززا ئەوە بابڵێت: لا الـه الا الله..). واتە شایەتومان بێنێتەوە چونکە بەو سوێند خواردنە لەبازنەی ئیسلام چووەتە دەرەوە دەبێ جارێکی تر شایەتومان بێنێ تا ئیمانی بۆ بگەڕێتەوە.

**چوارەم: سوێند خواردن بەئاینێک جگە لەئیسلام:**

(عن ثَابِتَ بن الضَّحَّاكِ الأنصاري أَنَّهُ بَايَعَ رسول اللَّهِ ﷺ تَحْتَ الشَّجَرَةِ وَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال: من حَلَفَ على يَمِينٍ بِمِلَّةٍ غَيْرِ الْإِسْلَامِ كَاذِبًا مُتَعَمِّداً فَهُوَ كما قالَ).[2] سابیتی کوڕی زەحاکی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ئەو لەژێر درەخت -ی ڕضوان- دا پەیمانیدا بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس سوێند بخوات بەئاینێك جگە لەئیسلام درۆ بکاتو بە ئەنقەست (بیلێ) ئەوە چی ووتوە وایە)[3] واتە لەئیسلام دەرچوە و بێ باوەڕ بووە، نموونەی ئەم سوێندە وەك بڵێ جوولەکە بم یا گاورم ئەگەر فلانە شت نەکەم..

عن عبد اللَّهِ بن بُرَيْدَةَ رضي الله عنه يقول: سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال:( من قال إني بريء مِنَ الإِسْلَامِ فان كان كَاذِباً فَهُوَ كما قال وان كان صَادِقاً فَلَنْ يَرْجِعَ إلى الإِسْلَامِ)

وە عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە (ڕەزای خوای لێبێ) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس بڵێ من لەئیسلام بەریم ئەوە ئەگەر درۆ بکات ئەوە چی ووتوە وایە وە ئەگەر ڕاست بکات ئەوە بەبێ زیان ئیسلامەتی بۆ ناگەڕێتەوە).

---

١) رواه البخاري (٦٦٥٠) و مسلم (١١٤٧/٥)

٢) رواه البخاري، ١٣٦٣، ٤١٧١، ٦٠٤٧، ٦١٠٥، ٦٦٥٢. ومسلم ١١٠.

٣) رواه البخاري (١٣٦٣، ٦١٠٥) و مسلم (١١٠)

**پێنجەم: هەرکەس بەخوا سوێندیان بۆ خوارد با باوەڕ بکاتو ڕازی بێت:**

(عن ابْنِ عُمَرَ قَالَ سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلاً يَحْلِفُ بِأَبِيهِ فَقَالَ « لاَ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ مَنْ حَلَفَ بِاللَّهِ فَلْيَصْدُقْ وَمَنْ حُلِفَ لَهُ بِاللَّهِ فَلْيَرْضَ وَمَنْ لَمْ يَرْضَ بِاللَّهِ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ »)[1]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لێ بوو پیاوێك بەباوکی سوێندی خوارد، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (بەباوکتان سوێند مەخۆن ئەو کەسەی بەخوا سوێندی خوارد با ڕاست بکات وە هەرکەس بەخوا سوێندیان بۆ خوارد با ڕازی بێت، وە هەرکەس ڕازی نەبێت ئەوە پەیوەندی بەخواوە نییە).

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ « رَأَى عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَجُلاً يَسْرِقُ فَقَالَ أَسَرَقْتَ قَالَ لاَ وَالَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ. فَقَالَ عِيسَى آمَنْتُ بِاللَّهِ وَكَذَّبْتُ بَصَرِي»).[2] وە ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (عیسای کوڕی مەریەم (علیه الصلاة و السلام) پیاوێکی بینی دزی دەکرد، فەرمووی: ئەوە دزی دەکەی؟ ووتی: نەخێر سوێند بەوزاتەی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو، جا عیسا فەرمووی: باوەڕ بەخواکەت دەکەمو باوەڕ بەچاوم ناکەم) کە بینی تۆ دزیت کرد.

**شەشەم: جۆرەکانی سوێند خواردن: سوێند دەکرێت بەسێ بەشەوە:**

**یەکەم: سوێندی سەرزاری (اليمين اللغو)**

أ- سوێندێکە مەبەست پێی سوێند خۆرەکە سوێند خواردن نییە وەك بەکەسێك بڵێ وەڵڵاهی ئەیخۆی وەڵڵاهی ئەیخۆیتەوە.. لەم جۆرە سوێندانە کەنیەتی سوێند خواردن نییە.

ب- حوکمەکەی: ئەم جۆرە سوێندە دانامەزرێت وە کەفارەتی نییەو بەتاوانیش دانانرێت خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَـٰنِكُمْ وَلَـٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ البقرة: ٢٢٥ واتە: خوا ئەو سوێندە سەرزارییەتان لێ ناگرێت بەڵکو ئەو سوێندەتان لێ دەگرێت کە بەدڵ دایدەبەستن وە خوا لێخۆش بووی لەسەر خۆیە.

---

١) رواه ابن ماجه (٢١٠١) وهو حديث صحيح

٢) رواه البخاري (٢١٠١) و مسلم (٢٣٦٨)

(عَنْ عَائِـشَةَ - رضـى الله عنـها (لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٢٥﴾البقـرة: ٢٢٥) قَالَتْ أُنْزِلَتْ هذه الاية فِى قَوْلِهِ لاَ وَاللَّهِ بَلَى وَاللَّهِ) [١] عائیشه (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (ئەم ئایەتە لەسەر ئەوە دابەزی کەسێك بڵێ نەوەڵلاهی بەڵێ وەڵلاهی).

**دووەم: سوێندی درۆو فێڵ (الیمین الغموس)**

**أ- سوێندێکە بەدرۆ دەخورێت** بۆ ئەوەی مافی خەڵکی بخوات، وە لەو گوناهە گەورانەیە کە سوێند خۆرەکە تووشی خەشمو سزای خوا دەکات. وە هۆی ناونانی بە (الغمـوس)، چونکە خاوەنەکەی دەژەنێت بەدۆزەخدا.

**ب ــ حوکمەکەی:** لە گوناهە هەرە گەورەکانەو کەفارەتیشی نییە چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ﴾ المائدة: ٨٩ واتە: بەڵکو خوا ئەو سوێندەتان لێ دەگرێت کە بەدڵ دایدەمەزرێنن ئەم سوێندە دانامەزرێتو کەفارەتیشی نییە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلَۢا بَيْنَكُمْ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعْدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ النحـل: ٩٤واتـە: سوێندو پەیمانەکانتان مەکەنە هۆی غەدرو ناپاکی لەنێو خۆتاندا بۆ ئەوەی پێ لەپاش جێگیربوونی (لەسەر باوەڕ) نەخلیسکێو بەهۆی بەرهەڵستی کردنتان لە ڕێبازی خوا سزاو نارەحەتی نەچەژن (بەڵام ئەگەر بیکەن) ئەوسا سزای زۆر گەورەتان دەبێ.

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو بن العاص- رضى الله عنهما - قَالَ جَاءَ أَعْرَابِىٌّ إِلَى النَّبِىِّ ﷺ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْكَبَائِرُ قَالَ « الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ » . قَالَ ثُمَّ مَاذَا قَالَ « ثُمَّ عُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ » . قَالَ ثُمَّ مَاذَا قَالَ « الْيَمِينُ الْغَمُوسُ » . قُلْتُ وَمَا الْيَمِينُ الْغَمُوسُ قَالَ « الَّذِى يَقْتَطِعُ مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ هُوَ فِيهَا كَاذِبٌ »). [٢] عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصی (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) جا ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

---

١) رواه البخاري (٦٦٦٣)

٢) رواه البخاري (٦٩٢٠)

گوناهە گەورەکان کامانەن؟ فەرمووی: (هاوبەش دانان بۆ خوا) ووتی: دوای ئەو چییە؟ فەرمووی: (پاشان سەرپێچی دایكو باوك) وتی: دوای ئەو چییە؟ فەرمووی: سوێند خواردنی غەموس) ووتم: سوێند خواردنی غەموس چییە؟ فەرمووی: (ئەو سوێندەیە مالّی کەسێکی موسولّمانی پێ دەبڕێ بۆ خۆیو لەو سوێندەشیا درۆ دەکات).

**سێ یەم: سوێندی دامەزراو (اليمين المنعقدة)**

**أ- سوێندێکە سوێند خۆر بەمەبەستی سوێند دەیخوات بۆ دڵنیاکردن لەکردنی کارێك یا نەکردنی.**

**ب - حوکمەکەی:**

ئەگەر سوێندەکەی بردە سەرو پارێزگاری لێ کرد ئەو هیچی ناکەوێتە سەر، بەلاّم ئەگەر سوێندەکەی کەوتو شکاندی ئەوە پێویستە لەسەری کەفارەتی بدات خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ ﴾ البقرة: ٢٢٥ واتە: بەڵکو خوای گەورە ئەو سوێندانەتان لێ دەگرێت کە بەمەبەستی دڵ دەیخۆن هەروەها ئایەتی: ﴿ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ ﴾ المائدة: ٨٩ ، واتە: بەڵکو خوا ئەو سوێندانەتان لێ دەگرێ کە مەبەستان سوێندە لەدڵتانەوە.

**حەوتەم: سوێند لەسەر نییەت دادەمەزرێت:**

سوێند لەسەر نییەتی سوێندەرەکە دادەمەزرێت نەك نییەتی سوێند خۆرەکە، (عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « إِنَّمَا الْيَمِينُ عَلَى نِيَّةِ الْمُسْتَحْلِفِ »).[١] ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان سوێند خواردن لەسەر نییەتی سوێندەرەکەیە).

(عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « يَمِينُكَ عَلَى مَا يُصَدِّقُكَ بِهِ صَاحِبُكَ »).[٢] هەر ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (سوێند

---

١) رواه ابن ماجه (٢١٢٠) و مسلم (١٦٥٣) بنحو

٢) رواه مسلم (١٦٥٣) و ابن ماجه (٢١٢٠)

خواردنەکەت بۆ ئەو مەبەستە دەخورێت هاوڕێکەت (بەرانبەرەکەت) باوەڕت پێ بکات). واتە ئەو کەسەی داوای سوێند خواردنت لێ دەکات لەسەر هەر شتێك ئەو مەبەستی بێت سوێندەکە بەو مەبەستەیە، ئیتر سوێند خۆرەکە لەدڵی خۆیدا نییەتێکی تری هەبێت بەهیچ دادەنرێ، چونکە سوێند خواردن لەسەر نییەتی سوێندەرەکەیە.

**هەشتەم: بەلەبیرچوون و هەڵە سوێند ناکەوێت:**

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد شتێك نەکات بەلەبیرچوون یا بەهەڵەکردنی ئەوە سوێندەکەی ناکەوێت بەبەڵگەی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ:﴿ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ﴾ البقرة: ٢٨٦، واتە: ئەی پەروەردگارمان ئەگەر (کردەوەیەکی پێویستمان) لەبیرچوو یا بەهەڵە گوناهێکمان کرد لێمان مەگرەو لەسەرمان مەنووسە. لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) (هاتووە) کاتێ ئیمانداران ئەم بەشەیان لەئایەتەکە خوێندەوە (رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا) خوای گەورە فەرمووی: ئەوا لێم گیرا کردن.[١] (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ « إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ »)[٢]. عەبدوڵلای کوری عەبباس (رەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان خوا تاوانی هەڵە و لەبیرچوون و زۆر لێکراوی لەسەر ئوممەتەکەم هەڵگرتووە).

**نۆیەم: ئەگەر لەگەڵ سوێندەکەیدا وتی: (ان شاء الله) سوێندەکەی ناکەوێت:**

(عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ « مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَقَالَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، لَمْ يَحْنَثْ»).[٣] ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس سوێندێکی خواردو وتی: (ان شاء الله) سوێندەکەی ناکەوێت).

**دەیەم: کەفارەتی سوێند:**

ئەگەر کەسێك سوێندی خواردو سوێندەکەی نەکەوت ئەوە کەفارەتی نییە، بەڵام ئەگەر سوێندەکەی کەوت دەبێ کەفارەتی بدات کە ئەمەیە لە ئایەتەکەدا باسکراوە:﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ

---

١) رواه مسلم (١٢٥/١٩٩)

٢) رواه ابن ماجه (٢٠٤٥) وهو حديث صحيح..

٣) رواه الترمذي (١٥٣٢) و النسائي (٧/ ٣٠) وابن ماجه (٢١٠٤) وهو حديث صحيح.

بِاللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ﴾ المائدة: ٨٩ واته: خوا ئەو سوێندانەتان لێ ناگرێت کە نیازی دڵتانی لەگەڵدا نیە بەڵام ئەو سوێندانەتان لێ دەگرێ (بەگوناه بۆتان دەنوسرێ) کە مەبەستی سوێند لەدڵتانەوە دادتان بەستووە (و شکاندوتانە) جا کەفارەتی ئەو سوێندە (شکاوە): خواردن دانە بەدە هەژار لە خۆراکێکی مامناوەندی کە ماڵو منداڵی خۆتان دەیخۆن یا پۆشاك کردن بۆ دە هەژار یان ئازادکردنی کۆیلەیەك جا ئەوەی دەستی نەکەوت (هیچ کام لەمانە) ئەوە سێ ڕۆژ بەڕۆژو بێت. ئەوەی (باسکرا) کەفارەتی سوێندەکانتانە ئەگەر سوێندتان خوارد (و سوێندەکەتان شکاند) کەواتە کەسێکی سوێندی خواردو سوێندەکەی شکاند کەفارەتەکەی یەکێك لەمانەی خوارەوەیە:

١- خواردن دان بەدە هەژار لەخواردنێکی مامناوەندی لەنێوان ئەو خواردنانەی ماڵو منداڵی دەیخۆن.

٢- جلو بەرگ کردن بۆ دە هەژار.

٣- ئازاد کردنی کۆیلەیەك کە ئێستا نییە.

جا ئەگەر نەیتوانی ئەم سیانە هیچیان بکات ئەوە کەفارەتەکە سێ ڕۆژ ڕۆژوو گرتنە.

**پانزەیەم: کەسێك سوێند بخوات لەسەر شتێك پێچەوانەکەی چاکتر بێت:**

(قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَمُرَةَ: قَالَ رسول الله ﷺ: « وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا ، فَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ ، وَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ »).[1] عەبدولڕحمانی کوڕی سەمورە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (........ ئەگەر سوێندت خوارد لەسەر شتێك جا زانیت بارەکەی تری چاکترە لەوەی سوێندی لەسەر خوراوە ئەوە کەفارەتی سوێندەکەت بدەو ئەوەیان بکە کە چاکترە).

---

١) رواه البخاري (٦٦٢٢، ٦٧٢٢، ٦١٤٦) و مسلم (١٦٥٦)

**دوانزەیەم: سوێندێک شت لەخۆ حەرام کردن بێت:**

وەك ئەوەی بڵێ: خواردنم لێ حەرام بێت، یان رۆشتنە ماڵی فلان کەسم لێ حەرام بێت، لەو جۆرانە ئەوە لێی حەرام نابێت وە ئەگەر خواردی یا رۆشتە ماڵەکەی کەفارەتی سوێند بدات کە پێشتر باسمان کرد خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝١ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ﴾ التحریم: ١ - ٢ واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆچی شتێك لەخۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەلاڵ کردوویت، مەبەستت رەزامەندی خێزانەکانتە وەخواش لێخۆشبووی میهرەبانە بێگومان خوا بڕیاریدا بەهەڵوەشاندنەوەی سوێندەکەتان.

(عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَشْرَبُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ وَيَمْكُثُ عِنْدَهَا فَوَاطَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ عَنْ أَيَّتُنَا دَخَلَ عَلَيْهَا فَلْتَقُلْ لَهُ أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟ إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ. قَالَ: « لاَ وَلَكِنِّي كُنْتُ أَشْرَبُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ، فَلَنْ أَعُودَ لَهُ وَقَدْ حَلَفْتُ لاَ تُخْبِرِي بِذَلِكِ أَحَدًا »).[1] عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لای زەینەبی کچی جەحش هەنگوینی دەخوارد لەلاشی دەمایەوە، منو حەفصە لەنێوان خۆمان رێکەوتین پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆلای هەرکامان پێی بڵێت مەغافیرت[2] خواردووە؟ بۆنی مەغافیرت لێ دێ، پێغەمبەریش فەرمووی: (نەخێر (مەغافیرم) نەخواردووەو لای زەینەبی کچی جەحش هەنگوینم خواردووەتەوە، ئەوە سوێندم خوارد جارێکی تر دووبارەی نەکەمەوە، ئەمە بەکەس مەڵێ).

**سیانزەیەم: لەمافەکانی موسوڵمانە بەسەر موسوڵمانەوە سوێندەکەی نەشکێنێ:**

(عَنْ الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ رضي الله عنهما أَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ بِسَبْعٍ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ، أَمَرَنَا بِعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعِ الْجِنَازَةِ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وَإِبْرَارِ الْقَسَمِ، وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي وَإِفْشَاءِ السَّلَامِ).[3] بەرائی کوڕی عازیب (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)

---

[1] رواه البخاري (٤٩١٣)

[2] مغافر : جۆرە شیلەیەکی شیرینە و بۆنی ناخۆشە لە درەخت پەیدا دەبێت

[3] رواه البخاري (٥٨٦٣) و مسلم (٢٠٦٦)

فـەرمانی پێكردنـی بەحـەوت شـتو حـەوت شتیـشی لێ قەدەغـە كـردین: فـەرمانی پێكـردین بەسەردانی نەخۆشو شوێنكەوتنی جەنازەو كەسێك بژمی ووتی: الحمد لله پێی بڵێین یرحمك الله، نەشكاندنی سوێند ـ ی موسوڵمان ـ، یارمەتی دانی سـتەم لێكـراو، بـەدەم دەعـەوەتـەوە چـوونو زۆر سەلام (لە خەڵك) كردن...).

**چواردەیەم: خۆ پاراستن لەسوێند خواردنی درۆ:**

سوێند خواردنی درۆ بەمەبەستی ماڵی خەڵك داگیر كردنو خواردنی تاوانێكی زۆر گەورەیـە جـا هەركەس ئەگەر زانی قسەكەی راست نییـە بـا سـوێند نـەخوات لەسـەریو ئـەو مافـە بداتـەوە بەخاوەنەكـەی خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَـٰٓئِكَ لَا خَلَـٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ آل عمـران: ٧٧، واتـە: بێگومـان ئـەو كەسـانەی پـەیمانی خـواو سوێندەكانیان دەفرۆشن بەنرخێكی كەم ئەوانە لـەرۆژی دواییـدا بـێ بەشـن (لەبـەهرەی خـوا) وە خوای گەورە قـسەیان لەگەڵـدا ناكـاتو سـەیریان ناكـات (بەچـاوی بـەزەیی) و لەگوناهـەكانیان پاكیان ناكاتەوە وە سزای سەختیان بۆ هەیە.

(عن الأَشْعَثَ بْنَ قَيْسٍ قال: كَانَتْ بَيْنِى وَبَيْنَ رَجُلٍ خُصُومَةٌ فِى بِئْرٍ فَاخْتَصَمْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « شَاهِدَاكَ أَوْ يَمِينُهُ » . قُلْتُ: إِنَّهُ إِذًا يَحْلِفُ وَلاَ يُبَالِى . فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينِ صَبْرٍ يَقْتَطِعُ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ وَهْوَ فِيهَا فَاجِرٌ، لَقِىَ اللَّهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ »).[١] ئەشعەسی كوڕی قەیس (ڕەزای خوای لـێبێ) دەڵـێ: لـەنێوان مـنو پیاوێكدا لەسەر بیرێكی ناو كێـشەمان بـوو جـا كێـشەكەمان بـردە خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (دوو شایەت بێنە یـا سـوێند خـواردنی ئـەو پیـاوە) منـیش ووتم: دەی ئـەو سـوێند دەخـواتو گـوێی لێ نییـە، جـا پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: (هەركەس سوێندێكی یەكلا كەرەوە بخوات ماڵو سامانی موسوڵمانێكی پـێ دابـڕ بكـات، لـەو سوێند خواردنەدا درۆ بكات، كە دەگات خزمەتی خوا (لەرۆژی دواییدا) زۆر توڕەیە لێی).

١) رواه البخاري (٦٦٧٧) و مسلم (١٣٨)

# نەزرکردن (النذور)

**یەکەم: پێناسەکەی:**

لەزمانی عەرەبیدا (نذور) کۆی (نذر)ە واتە کارێکی لەسەرخۆی پێویست کرد کە لەسەر پێویست نەبوو.

**لە شەرعدا:** واجبکردنی خواپەرستییەکە لەسەر خۆی کە واجب نەبووبێ لەسەر بەرەهایی یان پەیوەست کرابێ بە شتێکەوە.

**دووەم: بەڵگەی ڕەوابوونی نەزر کردن:**

أـ خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ: ﴿ يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا ﴾ الإنسان: ٧ واتە: (باوەڕداران) نەزرەکانیان دەبەنە سەرو بەجێی دێنن، وە ئەترسن لە ڕۆژێ کە خراپە و زیانی هەموو لایەك دەگرێتەوە وە دەفەرموێ: ﴿ وَلۡيُوفُواْ نُذُورَهُمۡ ﴾ الحج: ٢٩ واتە دەبا نەزرەکانیان ببەنە سەر.

ب ـ **لە سوننەتدا:** (عَنْ عَائِشَةَ رضى الله عنها عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَهُ فَلاَ يَعْصِهِ»)[1]. عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموی: (هەر کەس نەزری کرد لەسەر خۆی کە گوێڕایەڵی و پەرستشی خوا بکات با گوێڕایەڵی یەکەی بکات بەڵام هەر کەس نەزری کرد لەسەر خۆی سەرپێچی خوا بکات ئەوە با سەرپێچی نەکات).

**سێ یەم: حوکمی نەزر کردن:**

نەزرکردن دروستە و جۆرێکە لە پەرستن و نزیك بوونەوە لە خوا، بۆیە شەرعزانان ووتوویانە دروست نیە کافر نەزر بکات، چونکە پەستنی دروست نیە.

---

١) رواه البخاري (٦٦٩٦)

چاکتر وایە موسڵمان ئەو پەرستشانە بکات بەبێ لەسەرخۆ نەزرکردن، ماڵ بەخشینێك موسڵمان وەك سوننەتێك بیکات چاکتر لەو بەخشینەی وەك نەزر بیکات بەبەڵگەی ئەم فەرمودە:
(عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ نَهَى عَنِ النَّذْرِ وَقَالَ « إِنَّهُ لاَ يَأْتِي بِخَيْرٍ وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ»).[1] عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) نەزرکردنی قەدەغەکردو فەرمووی: (بێگومان نەزرکردن هیچ خێرو چاکەیەك بەدی ناهێنێ، تەنها ئەوەندەیە ماڵێکی لە ڕەژدو چرووك پێ دەکرێ بە خێر).

واتە نەزر کردن هیچ قەزاو قەدەری خوا ناگێڕێتەوە تەنها لەبەرئەوەیە ئەو کەسە ڕژدەیە خێرێك بکات و ماڵێك ببەخشێ، چونکە دەزانێ ئەگەر بەو نەزرکردن نەبوایە کە پێویست بووە لەسەری نەیدەتوانی ماڵ ببەخشێت.

**چوارەم: جۆرەکانی نەزرکردن:** نەزرکردن سێ جۆرە:

**یەکەم: نەزری توڕەیی و ڕقەکاری:** ئەو نەزرەیە لە کاتی کێشەو توڕەبووندا دەکرێت بۆ نموونە لە کاتی دەمەقاڵێ و تووڕەبووندا بڵێ: ئەگەر لەگەڵ فلان کەسدا قسەم کرد مانگێ ڕۆژم لەسەر نەزربێ بۆ خوا.

**حوکمی نەزری توڕەیی و ڕقەکاری:**

ئەگەر ئەو شتەی نەزرەکەی پێوە بەستراوە هاتەدی پێویستە ئەو کەسەی نەزرەکەی کردووە نەزرەکەی بەجێ بێنێ و بیکات یان کەفارەتی سوێندێك بدات، دەبێ یەکێکیان بکات. یا بەجێ هێنانی نەزرەکە یا کەفارەتی سوێندێك کە پێشتر باسمان کرد بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە: (عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ « كَفَّارَةُ النَّذْرِ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ»).[2] عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کەفارەتی نەزر - ئەگەر نەزرەکە بەجێ نەهێنا- کەفارەتی سوێندە).

**دووەم: نەزری پاداشتی چاکە:** نەزرێکە خواپەرستیەك لەسەر خۆی واجب دەکات ئەگەر چاکەو نیعمەتێکی دەست کەوێ یان زیان و خراپەیەکی لەسەر لاچێ بۆ نموونە دەڵێ: ئەگەر خوا

---

١) رواه البخاري (٦٦٠٨، ٦٦٩٣، ٦٦٩٢) و مسلم (١٦٣٩/٤)

٢) رواه مسلم (١٦٤٥)

نەخۆشەکەمان شیفا بدات مەڕێك دەکەم لەڕێ خودا، یان ئەگەر لە تاقیکردنەوە دەرچووم سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبم بۆ خوا.

**حوکمەکەی:** ئەگەر ئەوەی نەزرەکەی پێوە بەستراوە بەدی هات ( خوا شیفای نەخۆشەکەی دا ) ئەوە لەوکاتەدا دەبێ نەزرەکەی بکات ئەوەی لەسەر خۆی پێویست کرد ئەنجامی بدات چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمْ ﴾ النحل: ٩١ واتە: بەڵێنەکانتان ببەنەسەر ئەگەر بەڵێنتان دا بە خوا، (قال رسول الله ﷺ: مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ).[١] پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (هەرکەس نەزری کرد خواپەرستیەك بکات، دەبێ بیکات و ئەنجامی بدات).

**سێیەم : نەزری ڕەهاو چاکە:** ئەوەیە نەزری خواپەرستیەك بکات لەسەر خۆی بەبێ بەستنی بە شتێکەوە یا کێشەو تورەبوونەوە بەڵکو تەنها حەزدەکات خواپەرستیەك ئەنجام بدات بە نەزرکردنی لەسەر خۆی وەك بڵێ نەزر بێ لەسەرم ئەم پێنجشەممەیە بە ڕۆژووبم بۆ خوا.

**حوکمەکەی:**

أ- پێویستە نەزرەکەی بەجێبێنی و بیباتەسەر.

ب ـ دەتوانێ جێبەجێکردنەکەی دوا بخات بەمەرجێ نەگاتە کاتێ زۆر تر گومانی وابێ ناتوانێ جێبەجێ بکات.

ج ـ ناتوانی بیگۆڕێ بۆ کەفارەتی سوێندان چونکە ئەم جۆرە لە نەزر مانای سوێندی تێدا نیە.

**پێنجەم: پێویستە نەزرکراوەکە کارێک بێت لە خوا نزیکت کاتەوە:**

دروست نیە موسڵمان شتێك نەزر بکات کە خراپە یا هیچ مانایەکی خواپەرستی و نزیك بوونەوە لە خوا تێدا نیە یا کارێکی ڕەواش بێت سەرنجی ئەم فەرمەدەیە بدە:

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ بَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ إِذَا هُوَ بِرَجُلٍ قَائِمٍ فَسَأَلَ عَنْهُ فَقَالُوا أَبُو إِسْرَائِيلَ نَذَرَ أَنْ يَقُومَ وَلاَ يَقْعُدَ وَلاَ يَسْتَظِلَّ وَلاَ يَتَكَلَّمَ وَيَصُومَ . فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ « مُرْهُ فَلْيَتَكَلَّمْ وَلْيَسْتَظِلَّ وَلْيَقْعُدْ وَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ »).[٢] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: لەکاتێکدا

---

١) رواه البخاري (٦٦٩٦)

٢) رواه البخاري (٦٧٠٤)

پێغەمبەر (ﷺ) ووتاری دەدا پیاوێکی دی بە پێوە وەستابوو، پرسیاری کرد لەبارەوەیە، وتیان ئەوە ئەبو ئیسرائیلە نەزری کردووە بە پێوە بێت و دانەنیشێت وە نەیتە سێبەر وە قسە نەکات و بە رۆژوو بێت، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (فەرمانی پێ بکە با قسە بکات و با بێتە سێبەر و دانیشێت بەڵام رۆژووەکە بگرێ و تەواوی بکات).

(«وقال ﷺ: لاَ نَذْرَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّــهِ »).[1] پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (نەزر کردن دروست نیە لە شتێکدا سەرپێچی خوا بێت). (عَنْ عَائِشَةَ رضـى الله عنـها أَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ قَالَ:«لاَ نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ وَكَفَّارَتُهُ كَفَّـارَةُ يَمِـينٍ»).[2] عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (نەزرکردن لەتاوان دا دروست نیە کەفارەتەکەشی کەفارەتی سوێندە).

**شەشەم: نەزرێک لەتوانای موسڵماندا نەبێت واجب نابێ لەسەری**

(عَنْ أَنَسٍ رضى الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى شَيْخًا يُهَادَى بَيْنَ ابْنَيْهِ قَالَ مَا بَالُ هَذَا». قَالُوا نَذَرَ أَنْ يَمْشِيَ. قَالَ « إِنَّ اللَّهَ عَنْ تَعْذِيبِ هَذَا نَفْسَهُ لَغَنِيٌّ». وَأَمَرَهُ أَنْ يَرْكَـبَ).[3] ئەنەس (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پیاوێکی پیری بینی دوو کوڕی چووبوونە ژێر باڵی بەم لاو لادا دەکەوت فەرمووی : (ئەمە چییە؟ ) ووتیان نەزری کردوە بەپێ بڕوات - بۆ حەج - فەرموی (بێگومان خوا لە خۆئەزێت دانی ئەو بێ نیازە فەرمانی پێ بکە با سواری وڵاغێک بێت).

**حەوتەم:نەزرکردنی هەموو ماڵ و سامان دروست نیە:**

.(عن كَعْبٌ بن مالك رضى الله عنه قال في حديثه (وعلى الثلاثة الذين خلفوا) فقـال في آخـر حديثه: إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ ﷺ. قَـالَ: « أَمْـسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ، فَهْوَ خَيْرٌ لَكَ»).[4] کەعبی کوڕی مالیک (رەزای خوای لێبێ) لەباسی

---

١) رواه مسلم (١٦٤١)

٢) رواه ابو داود (٣٢٩٠) و الترمذي (١٥٢٤) و النسائي ٢٦/٧ و ابن ماجه (٢١٢٥) وهو حديث صحيح بطرقه

٣) رواه البخاري (١٨٦٥) و مسلم (١٦٤٢)

٤) رواه البخاري (٦٦٩٠) و مسلم (٢٧٦٩)

دابەزینی لێخۆشبوونی خوای گەورە لێی کاتێ دواکەوت لە غەزا لە کۆتاییی قەسەکانیدا دەڵێ: بێگومان بەشێك لە تەوبەکردنی من دەست لە هەموو ماڵ و سامانەکەم هەڵدەگرم خێرو چاکە بێت بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەندێ لەماڵ و سامانەکەت بهێڵەرەوە بۆ خۆت ئەوە چاکترە بۆت).

**هەشتەم:کەسێک نەزرێک بکات پاشان بمرێت:**

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ اسْتَفْتَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ تُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:« فَاقْضِهِ عَنْهَا »).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ : سەعدی کوڕی عوبادە پرساری لە پێغەمبەر کرد (ﷺ) دەربارەی نەزرێك کە لەسەر دایکی بووە ( لە ژیانی خۆیدا کردبووی ) بەڵام پێش ئەوەی نەزرەکە بەجێ بێنێ مردووە، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: (تۆ لەجیاتی ئەو بۆی بکە).

**نۆیەم:کەسێکی بێ باوەڕ نەزرێ بکات پاشان موسڵمان بێت:**

(عن عُمَر بن الخطاب رضي الله عنه قَالَ: قلتُ النَّبِيَّ يا رسول الله كُنْتُ نَذَرْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ لَيْلَةً فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، قَالَ « فَأَوْفِ بِنَذْرِكَ »).[2] عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من لەسەردەمی نەفامیدا نەزرم کرد شەوێك لە کەعبدا بۆ خوا پەرستی بمێنمەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (نەزرەکەت جێبەجێ بکە). کەواتە نەزرێك پێش موسڵمان بوون کرابێ دەبێ پاش موسڵمان بوونی بیکات و بەجێبێنێ.

١) رواه البخاري (٢٠٣٢- ٢٠٤٣) و مسلم (١٦٥٦)

٢) رواه البخاري (٢٠٣٢، ٢٠٤٣) و مسلم (١٦٥٦)

# خوارادەمەنی ( الاطعمة )

**یەکەم: پێناسەکەی**

(اطعمة) هەموو ئەو شتانەیە ئادەمیزاد دەیان خوات و پێیان دەژی .

وە خواردەمەنی لە بنەڕەتدا حەلاڵە جگە لەوەی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) حەرامیان کردبێ، خوای گەروە دەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا ﴾ البقرة: ١٦٨ واتە: ئەی خەڵکینە ئەوەی لە زەویدایە بیخۆن کە حەلاڵ و پاکە وە دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ۝٣١ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ ﴾ الأعراف: ٣١ – ٣٢ واتە ئەی نەوەی ئادەم لەکاتی هەموو نوێژێکدا پۆشاکی جوان رازاوەتان بپۆشن وە (لەوەی حەلاڵە بۆتان ) بیخۆن و بیخۆنەوە زیادە ڕەوی مەکەن بێگومان خوا زیادە ڕەوانی خۆش ناوێ (ئەی موحەممەد) بڵێ کێ جوانی و رازاوەییەکانی حەرام کردووە کە خوا بۆ بەندەکانی دروست کردووە، هەروەها رۆزی و خۆراکە پاك وە حەلاڵەکان کێ حەرامی کردون.

**دووەم: جگە لە خوا و پێغەمبەر (ﷺ) کەس حەلاڵ و حەرام کردنی بەدەست نیە:**

ئەو خواردەمەنیانە حەرامن کە خواو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردوە هەر کەس شتێکی تر بڵێ جگە لەوە ئەوە درۆ بەدەم خواو پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەکات قورئان دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزۡقٖ فَجَعَلۡتُم مِّنۡهُ حَرَامٗا وَحَلَٰلٗا قُلۡ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمۡۖ أَمۡ عَلَى ٱللَّهِ تَفۡتَرُونَ ۝٥٩ وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ ﴾ یونس: ٥٩ – ٦٠

واتە: ئەی موحەممەد بڵێ پێم بڵێن ئەو رزق و رۆزییەی خوای بۆی ناردونەتە خوارەوە بەشێکیتان

کردوە بە حەرام و بەشێکی بە حەڵاڵ بڵێ ئایا خوا مۆڵەتی ئەوەی پێ داون یان بەناوی خواوەو درۆدەکەن ئەوانەی درۆ بەدەم خواوەوە هەڵدەبەستن بە گومانیان دەبێ ڕۆژی دوایی چۆن بێت؟

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ النحل: ١١٦ – ١١٧ واتە: بەدرۆ زمانتان مەچەرخێنن بڵێن ئەمە حەلاڵە و ئەوە حەرامە بۆ ئەوەی بەدەم خواوە درۆ هەڵبەستن بێگومان ئەوانەی درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستن رزگار نابن (لە دنیا) رابواردنێکی کەم ( یان دەبێ ) وە ( لەدوارۆژدا ) سزای سەختیان بۆ هەیە.

**سێ یەم: یاسایەکی شەرعی بۆ حەلاڵ و حەرامی خواردەمەنی:**

ئەو یاسا شەرعی یە کە حەلاڵ و حەرامی خواردەمەنی پێ بزانرێت لەم ئایەتەوە سەرچاوە دەگرێـــت: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ۚ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ الأنعام: ١٤٥ واتە: بڵێ لەناو ئەوانەدا لە بەنیگا بۆم هاتووە شتێك شك نابەم خواردنی لەکەسێك حەرام کرابێ جگە لە مردارۆبوو یان خوێنی رژێندراو یان گۆشتی بەراز ( کەپیسە) یان ئاژەڵێك کە بەناوی غەیری خواوە سەربڕاوە هەر کەسیش بەناچاری لەو ناڕەوایانە بخواو لە ئەندازەی تێربوونی زیاتر نەخوا بێگومان خوا لێبوردەیی بە بەزەییە.

هەورەها خوای گەورە دەفەمویێ: ﴿ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ﴾ الأعراف: ١٥٧ واتە: پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی پاکە بۆیان حەلاڵ دەکات و ئەوەی پیسە لێیان حەرام دەکات.

**چوارەم: ئەو خواردەمەنیانەی حەرامن:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ﴾ الأنعام: ١١٩ واتە: بۆچی ئێوە خۆتان لە خواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵانە - دەپارێزن کە ناوی خوایان لەسەر هێنراوە؟ کە هەر خوداش بە روونی باسی ئەوانەی بۆ کردوون لێتان حەرام کراوە ( مەگەر ناچاربن).

وە دەفەرموێ: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ المائدة: ٣ واتە: لەسەرتان حەرام کراوە مردارۆبوو خوێن و گۆشتی بەراز وهەر ئاژەڵێ لەکاتی سەربڕیندار ناوی غەیری خوای لێ هێنرابێ و خنکاو بەلێدان مرێندراو هەڵدێراو شۆق لێدراو (بەو شۆقەی مردبێ) و ئەوەی دڕندە لێی خواردبێ جگە لەوەی سەرتان بڕی بێ ( پێش مردنی ) وە ئەو ئاژەڵەی لەسەر بەرد[١] سەربڕابێ .. جا هەرس ناچاربوو لەبرسا بێ ئەوەی مەبەستی گوناح بێ ( لەو نارەوایانەی بخوا ) ئەوە بێگومان خوا لێخۆشبووی بەبەزەییە.

وە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ ﴾ الأنعام: ١٢١ واتە: ئەوەی ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە ( لەکاتی سەربڕیندا ) مەیخۆن چونکە بێگومان ئەوە تاوان و لەسنووردەرچوونە.

---

١) چەند بەردێك بوون لە دەوری کەعبی بە پیرۆز سەیر دەکران لەلایاندا ئاژەڵیان سەر دەبڕی.

وە دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ﴾ الأنعام: ١٤٥ لە بڕگەی ٣ دا تەفسیرمان کرد.

وە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ﴾ المائدة: ٩٦ واتە لە کاتێکدا لە ئیحرامدان ڕاوی نێچیری ووشکانیتان لێ حەرام کراوە.

وە دەفەرموێ: ﴿ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ﴾ الأعراف: ١٥٧واتە ئەو شتانەیان یان لێ حەرام کراوە کە پیسن . هەموو ئەمانەی لەم ئایەتانەدا باسکران حەرامن.

ئەگەر ئاژەڵێکی زیندوو هەرچی لێ بدرێت بە مردارۆبوو دادەنرێت.

(عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ قَالَ: قال رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ فَهِيَ مَيْتَةٌ»).[1] ئەبو واقیدی لەیسی (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەوەی لە ئاژەڵێکی زیندووی دەبردێت ئەوەش مردارۆبووە) واتە وەك مرداۆبوو دادەنرێت.

**- ئەو مردوو و خوێنەی حەرام نییە:**

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ فَالْحُوتُ وَالْجَرَادُ وَأَمَّا الدَّمَانِ فَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ»).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (دوو مردوو و دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵە: دوو مردووەکە ماسی و کوللەن و دو خوێنەکەش جگەر و سپڵە).

**پێنجەم: گۆشتی کوێدرێژی ماڵی حەرامە:**

(عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى يَقُولُ أَصَابَتْنَا مَجَاعَةٌ لَيَالِيَ خَيْبَرَ فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ خَيْبَرَ وَقَعْنَا فِي الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ فَانْتَحَرْنَاهَا فَلَمَّا غَلَتْ بِهَا الْقُدُورُ نَادَى مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنِ اكْفَئُوا الْقُدُورَ وَلاَ تَأْكُلُوا مِنْ لُحُومِ الْحُمُرِ شَيْئًا).[3] عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:

---

١) رواه ابو داود (٢٨٤١) و ابن ماجه (٣٢١٦) وهو حديث صحيح

٢) رواه احمد ٩٧/٢ و ابن ماجه (٣٢١٨) وهو حديث صحيح

٣) رواه البخاري (٥٥٢٨) و مسلم (١٩٣٧)

لەشەوانی غەزای خەیبەردا تووشی برسیەتی بووین جا کە ڕۆژبوویەوە لە خەیبەر کەوتینە کوێدرێژە ماڵییەکان سەرمان بڕین ئەنجا کاتێ گۆشتەکەیان لە مەنجەڵەکاندا کوڵی دەدا جاردەرێکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جاڕی دا(کە مەنجەڵەکان لارکەنەوەو ئەوە تێیدایە بیڕێژن و لە گۆشتی ئەو گوێدرێژە ماڵیانە هیچ مەخۆن)

(عن أَبِي ثَعْلَبَةَ رضي الله عنه قَالَ: حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لُحُومَ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ).[1] ئەبو سەعلەبە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) گۆشتی گوێدرێژی ماڵی حەرام کرد.

**شەشەم: هەموو دڕندەیەکی کەڵبەدار:**

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ فَأَكْلُهُ حَرَامٌ»).[٤] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە فەرمووی: (هەموو دڕندەیەك کەڵبەدار بۆ خواردنی حەرامە) سەگ لەو دڕندانەیە گۆشتی ناخورێ، چونکە لاکە تۆپیوو دەخوات و فرۆشتنی قەدەغە کراوە.

**حەوتەم: هەموو باڵندەیەی چڕنوك دار:**

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ).[٢] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کرد لە ( خواردنی گۆشتی ) هەموو دڕندەیەکی کەڵبەدارو وە لە هەموو باڵندەیەکی چڕنوك دار).

**هەشتەم: پیسی خۆر (الجلالة)**

بە وشترو ڕەشەوڵاغ و مەڕو بزن دەوترێت کە پاشەڕۆ و پیسی بخۆن ئەوە دروست نییە شیرو گۆشتیان بخورێت، بەڵام ئەگەر ماوەیەك بەسترایەوە و ئالکی خاوێنی دەرخوارد درا گۆشتەکەی خۆش بوۆوە و ناوی جەلالەی لەسەر نەما دروستە شیرو گۆشتەکە بخورێت (عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما قال: نهى رسول اللَّهِ ﷺ عن أَكْلِ الْجَلَّالَةِ وَأَلْبَانِهَا).[٣] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر

---

١) رواه البخاري (٥٥٢٧) و مسلم (١٩٣٦)

٢) رواه مسلم (١٩٣٤/١٦)

٣) رواه ابو داود (٣٧٨٥) و الترمذي (١٨٢٤) و ابن ماجه (٣١٨٩) وهو حديث صحيح

(ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کرد لە خواردنی گۆشت و شیری پیسی خۆر).

**نۆیەم: ئەو گیاندارانەی فەرمان کراوە بە کوشتنیان:**

ئەو گیاندارانەی فەرمان کراوە بە کوشتنیان خواردنیان دروست نیە، (عن عَائِشَةَ رضي الله عنها عن النبي ﷺ قال: خَمْسٌ فَوَاسِقُ يُقْتَلْنَ فِي الْحَرَمِ الْفَأْرَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْحُدَيَّا وَالْغُرَابُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ).[1] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (پێنج فاسق لەدەرەوەی هەرەمی مەککە و لەناو حەرەمی مەککەدا دەبێ بکوژرێن : مارو دووپشك و مشك قەڵەرەش و کۆلارە و سەگی هار).

لەبەرئەوەی ئەم گیاندارانە زیانیان هەیەو هیچ سوودێکیان نیە ناوی فاسقیان لێ نراوە چونکە لە مرۆڤی فاسق دەچن کە کاری خراپ دەکات.

**دەیەم: ئەو گیاندارانەی بەرگریی کراوە لە کوشتنیان:**

(عن ابن عبَّاسٍ قال إِنَّ النبي ﷺ نهى عن قَتْلِ أَرْبَعٍ من الدَّوَابِّ النَّمْلَةُ وَالنَّحْلَةُ وَالْهُدْهُدُ وَالصُّرَدُ).[2] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کوشتنی چوار شتی قەدەغەکردووە: مێروله و هەنگ پەپوسلێمانە و صورەد[3]).

(عن عبد الرحمن بن عُثْمَانَ رضي الله عنه أَنَّ طَبِيبًا سَأَلَ النبي ﷺ عن ضِفْدَعٍ يَجْعَلُهَا في دَوَاءٍ فَنَهَاهُ النبي ﷺ عن قَتْلِهَا) عەبدوڕەحمانی کوڕی (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (پزیشکێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد لەبارەی بۆقەوە دەیکاتە دەرمان پێغەمبەریش (ﷺ) ڕێگری کرد لە کوشتنی).[4]

---

١) رواه البخاري (٣٣١٤) و مسلم (١١٩٨)

٢) رواه ابو داود (٥٢٦٧) و ابن ماجه (٣٢٢٤) وهو حديث صحيح

٣)(صرد) باڵندەیەکە لە چۆلەکە گەورەترە پشتی سەوزو ژێر سنگی سپی یە و دەنوك و سەری گەورەیە باڵندەی بچوك دەخوات

٤) رواه ابو داود (٥٢٦٩) و النسائي (٤٣٦٦) وهو حديث صحيح

**پانزەیەم: ئەو گیاندارانەی فرۆشتنی قەدەغەکراوە:**

عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ رضي الله عنهما (أَنَّ النبي ﷺ نهى عن ثَمَنِ الْكَلْبِ وَالسِّنَّوْرِ)[1]

جابیر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نرخی سەگ و پشیلەی قەدەغەکرد)

هەر گیاندارێك نرخەکەی قەدەغەکرا بێ خواردنیش حەرامە

عن بن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال :قال رَسُولَ اللَّهِ ﷺ :( لَعَنَ الله الْيَهُودَ ثَلَاثًا إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عليهم الشُّحُومَ فَبَاعُوهَا وَأَكَلُوا أَثْمَانَهَا وَإِنَّ اللَّهَ إذا حَرَّمَ على قَوْمٍ أَكْلَ شَيْءٍ حَرَّمَ عليهم ثَمَنَهُ)[2]

وەك عەبدوڵلای کوڕی عەبباس لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێراویەتیەوە کە فەرموویەتی (خوا نەفرینی لە جوولەکە کرد سێ جار، کە چەوریان لێ حەرام کرا کەچی فرۆشتنیان و نرخەکەیان خوارد، بێگومان ئەگەر خوای گەورە خواردنی شتێکی لە کەسانێ حەرام کرد ئەوە نرخەکەشی لێ حەرام کردوون)

**دوانزەیەم: لەناچاریدا حەرام حەڵاڵ دەبێت:**

هەر خواردەمەنیك خواردنی لە کاتی ئاساییدا حەرامە لەکاتی ناچاریدا حەڵاڵە خواردنی بە ئەندازەی پێویست کە لە مردن ڕزگاری بکات خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ البقرة: ١٧٣ واتە: ئینجا هەر کەس ناچار بوو ( بە خواردنی حەرامێك ) بەبێ ئارەزوو بەشی تێربوون بخوات هیچ گوناهێکی لەسەر نیە بێگومان خوای گەورە لێبوردەی بە بەزەییە ، هەروەها دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ المائدة: ٣ واتە : جا هەر کەسی ناچار لە برسا بەبێ نیازی گوناهکردن ( شتی حەرام کراو بخوات گوناهبار نیە) چونکە بەراستی خوای گەورە لێبوردەی بەبەزەییە.

---

١) رواه احمد (٣/٣٧٠) و ابوداود (٣٤٨٨) وهو حديث صحيح

٢) رواه مسلم (١٥٦٩) و ابو داود (٣٤٧٩) و الترمذي (١٢٧٩)

# ڕاوکردن ( الصيد )

**یەکەم: پێناسەکەی:**

(صـيد) لـە زمـانی عەرەبیـدا بـەمانای چـاوگەکەی دێـت کـە ڕاوکردنـە هـەروەها بـەمانای ڕاوکراوەکەش دێا کە نێچیرەکەیە.

وە لەزاراوەی شەرعدا : ڕاوکردنی گیاندارێکی حەلاڵی بە سروشت کێوی یە، دەسەلاّت بەسەریدا نیەو بیٚ خاوەنە.

**بەڵگەی حەلاڵی ڕاو:** خوای گەروە دەفەرمویٚ: ﴿ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا ﴾ المائدة: ٢ واتە: کاتیٚ ئیحرامتان شکاند ڕاو بکەن وە دەفەرمویٚ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ ﴾ المائدة: ٩٦ واتە : ڕاوی ( نێچیری ) دەریاتان بۆ حەلاڵ کراوە - کاتیٚ لە ئیحارمدا بن.

**دووەم: ئامێری ڕاوکردن:**

ڕاوکردن یان بە چەك و ئامێری بریندارکـەر دەبـیٚ وەك شمێـر و چـەقۆ و کێـردو تـیرو ڕم یـان بـە گیاندار وەك سەگ و تانجی و باز. خوای گەروە لـەو بارەیـەوە دەفـەرمویٚ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَيَبْلُوَنَّكُمُ اللَّهُ بِشَيْءٍ مِنَ الصَّيْدِ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ ﴾ المائدة: ٩٤ واتە ئـەی ئـەو کەسـانەی باوەڕتان هێناوە بێگومان خوا تاقیتان دەکاتەوە بـە هەنـدێك نێـچیر کـە بەدەسـتان دەیـانگرن و بەڕمەکانتان ڕاویان دەکەن.

هـــەروەها دەفـــەرمویٚ: ﴿ وَمَا عَلَّمْتُمْ مِنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ ﴾ المائدة: ٤ واتە : حـەلاڵ کـراوە بۆتـان نێـچیری ئـەو باڵنـدەو تـانجی و سـەگە ڕاوکەرانەی کە فێری ڕاوتان کـردوون لـەوەی خـوا فێـری کـردوون ئێـوەش فێـری ئـەوانی دەکـەن کەواتەلەوەی بۆتان ڕاودەکەن و دەیگرن بخۆن.

لەم دوو ئایەتەدا هەردوو ئامێری ڕاوکردنی باسکرد چ چەك و بریندارکەر یا گیاندار.

جا مەرجە ئەگەر ئامێری راوکردنەکە چەك بوو لاشەی نێچیرەکە کون بکات بە لەشیدا بڕوات وە مەرجی راوکردنیش بە گیاندار ئەوەیە فێری راو کرابێ و لە نێچیرەکە نەخوات و سەگ و تانجی فێرنەکراویش لەگەڵیدا نەبێت.

(عن عَدِيٍّ بن حَاتِمٍ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال إذا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ وَسَمَّيْتَ فَأَمْسَكَ وَقَتَلَ فَكُلْ وَإِنْ أَكَلَ فلا تَأْكُلْ فَإِنَّمَا أَمْسَكَ على نَفْسِهِ وإذا خَالَطَ كِلَابًا لم يُذْكَرْ اسْمُ اللَّهِ عليها فَأَمْسَكْنَ وَقَتَلْنَ فلا تَأْكُلْ فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي أَيُّهَا قَتَلَ وَإِنْ رَمَيْتَ الصَّيْدَ فَوَجَدْتَهُ بَعْدَ يَوْمٍ أو يَوْمَيْنِ ليس بِهِ إلا أَثَرُ سَهْمِكَ فَكُلْ وَإِنْ وَقَعَ في الْمَاءِ فلا تَأْكُلْ).[1] عەدی کوڕی حاتم (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەر کات سەگە (فێرە راوە ) کەت کردە نێچیرەکە و ناوی خوات هێنا نێچیەرەکەی گرت و کوشتی ئەوە نێچیرەکە بخۆ و ئەگەر لە نێچیرەکەی خوارد ئەوە مەیخۆ چونکە لەو کاتەدا نێچیرەکەی بۆخۆی گرتووە وە ئەگەر سەگەکەت تێکەڵ چەند سەگێکی تر بوو کە - لە کاتی ناردنیاندا بۆ نێچیرەکە- ناوی خوایان لێ نەهێنرابوو جا نێچریان گرت و کوشتیان ئەوە مەیخۆ چونکە لەو کاتەدا تۆ نازانی کام لە سەگەکان کوشتویەتی وە ئەگەر تیرێکت گرتە نێچیرێك دوا رۆژێك یا دوو رۆژ دۆزیتەوە تەنها شوێنی تیرەکەی تۆی پێوە بوو ئەوە گۆشتەکەی بخۆ بەڵام ئەگەر کەوتبووە ئاوەوە ئەو مەیخۆ). چونکە نازانی بە تیرەکەی تۆ مردووە یا بە خنکا لە ئاوەکەدا.

**سێ یەم: راوکردن بە سەگی فێرەڕاونەکراو:**

سەگ ئەگەر فێری راو نەکرابێ ئەگەر نێچیرێ بگرێت دروسا نیە گۆشتی بخورێت مەگەر بەزیندوویی فریای کەوێ و سەری ببڕێت. عن أبي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ رضي الله عنه قال( قلت يا نَبِيَّ اللَّهِ إِنَّا بِأَرْضِ قَوْمٍ أَهْلِ الْكِتَابِ أَفَنَأْكُلُ في آنِيَتِهِمْ وَبِأَرْضِ صَيْدٍ أَصِيدُ بِقَوْسِي وَبِكَلْبِي الذي ليس بِمُعَلَّمٍ وَبِكَلْبِي الْمُعَلَّمِ فما يَصْلُحُ لي قال أَمَّا ما ذَكَرْتَ من أَهْلِ الْكِتَابِ فَإِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَهَا فلا تَأْكُلُوا فيها وَإِنْ لم تَجِدُوا فَاغْسِلُوهَا وَكُلُوا فيها وما صِدْتَ بِقَوْسِكَ فَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ فَكُلْ وما صِدْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ فَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ فَكُلْ وما صِدْتَ بِكَلْبِكَ غَيْرِ مُعَلَّمٍ فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ فَكُلْ)).[2] ئەبو سەعلەبەی

---

١) رواه البخاري، ٥٤٨٤. ومسلم ١٩٢٩.

٢) رواه البخاري (٥٤٧٨، ٥٤٨٨، ٥٤٩٦) ومسلم (١٩٣٠)

خوشەنی (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ڕۆشتمە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە خاکی خەڵکانێکداین کە خاوەن پەڕاوی ئاسمانین ئایا لە قاپ و قاچاغیان دا شت بخۆین؟ وە لە زەویەکەمدا نێچیری هەیە، بە تیرو کەوان و بەسەگی فێرە ڕاوکراو و فێرنەکراو ڕاودەکەم جا کامەیان بۆمن حەڵاڵە؟ فەرمووی: (دەربارەی ئەوەی کە باست (واتە) لە قاپ و قاچاغی نامەدارەکان ئەوە ئەگەر قاپ و قاچاغی ترتان دەست کەوت ئەوا لە قاپ و قاچاغی ئەواندا شت مەخۆن بەڵام ئەگەر قاپ و قاچاغی ترتان دەست نەکەوت ئەوە قاپ و قاچاغەکەیان بشۆرن و شتی تیا بخۆن. ئەو نێچیرەش بە تیروکەوانەکەت ڕاوی دەکەی و ناوی خوات لێ هێناوە ( لەکاتی تێگرتنیدا ) ئەوە بیخۆ ئەو نێچیرەش بەسەگە فێرراوکراوەکەت راوت کرد و ناوی خوات لێ هێناوە ( لەکاتی بەرەڵاکردنیدا بۆ راوی نێچیرەکە ) ئەوە بیخۆ وە ئەوەش ڕاوت کرد بەسەگە فێرنەکراوەت و فریای سەربڕینی کەوتی ئەوەش بخۆ).

**چوارەم: ئەگەر نێچیرەکە بکەوێتە ئاوەوە:**

ئەگەر نێچیرەکە بکەوێتە ئاوەوە دروست نیە خواردنی. (لقول النبی ﷺ لعَدِيٍّ بن حَاتِمٍ: إذا رَمَيْتَ سَهْمَكَ فَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ فَإِنْ وَجَدْتَهُ قد قُتِلَ فَكُلْ إلا أَنْ تَجِدَهُ قد وَقَعَ في مَاءٍ فلا تَأْكُلْ فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي الْمَاءُ قَتَلَهُ أو سَهْمُكَ).[1] پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بە عەدی کوڕی حاتیم (ڕەزای خوای لێبێ) ئەگەر تیرەکەت گرتە (نێچیرێك) و ناوی خوای لێ بێنە جا ئەگەر -دواتر- دۆزیتەوە کوژرابوو ئەوە بیخۆ ، مەگەر کە دەیدۆزیتەوە کەوتبێە ئاوەوە چونکە تۆ نازانیت ئاوەکە خنکاندویەتی یان تیرەکەی تۆ).

**پێنجەم: ئەگەر پاش دوو یا سێ ڕۆژ نێچیرەکە بدۆزێتەوە:**

ئەگەر راوکەرێك تیرێك یا فیشەکێك بدات لە نێچیرێك ئەنجا نێچیرەکەی لێ وون ببێ دوو ڕۆژ یا سێ ڕۆژ دواتر بیدۆزێتەوە ئەوە دروستە بیخوات بە مەرجێ بۆنی نەکردبێ.

(عن عَدِيٍّ بن حَاتِمٍ رضي الله عنه أنَّ النبي ﷺ قال: وَإِنْ رَمَيْتَ الصَّيْدَ فَوَجَدْتَهُ بَعْدَ يَوْمٍ أو يَوْمَيْنِ ليس بِهِ إلا أَثَرُ سَهْمِكَ فَكُلْ).[2] عەدی کوڕی حاتیم (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ:

---

١) رواه النسائي (١٩٣/٧)

٢) رواه البخاري (٥٤٨٤) و مسلم (١٩٢٩)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پێی: (ئەگەر تیرێکت گرتە نێچیرێك ) و لێت دا جا پاش ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ دۆزیتەوە بە کوژراوەیی جگە لە شوێنی تیرەکەی تۆ هیچی تری پێوە نەبوو ئەوە بیخۆ).

(عن أبي ثَعْلَبَةَ عن النبي ﷺ قال إذا رَمَيْتَ بِسَهْمِكَ فَغَابَ عَنْكَ فَأَدْرَكْتَهُ فَكُلْهُ ما لم يُنْتِنْ).[1]

ئەبو سەعلەبە خوشەنی (ڕەزای خوای لێبێ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: (ئەگەر تیرێکت گرتە نێچیرێك و لێت وون بوو دواتر دۆزیتەوە ئەوە بیخۆ بە مەرجێ بۆنی نەکردبێ).

١) رواه مسلم (١٩٣١)

# سەربڕاوەکان (الذبائح)

**یەکەم: پێناسەکەی:** (ذبائح) کۆی (ذبیحة) یە مەبەست پێی ئاژەڵی سەر بڕاوە.

وە لەشەرعدا: ئەو ئاژەڵەیە بەشێوەیەکی شەرعی سەربڕاوە، وە لە ئاژەڵانە بێت گۆشتی دەخورێ و بە چەند مەرجێکی دیارکراو کە دواتر باسیان دەکەین.

**دووەم: سەربڕین:** واتە سەربڕینی ئاژەڵو شێوەکانی بە بڕینی قورقوڕاگە( گەرو ) یاسورێنچك.

**سێ یەم: حیکمەتی سەربڕین:** بۆ حەڵاڵ بوونی خواردنی گۆشتی ئاژەڵە سەربڕاوەکەیە، گوێڕایەڵی کردنە بۆ فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی، بەڵام زیاد لەوەش چەند حیکمەتێکی تێدایە کە پەیوەستە بە مەرجی سەربڕینەوە کە ئەمانە هەندێکیانن:

**أ- ئاژەڵی مرداربوو:** لەهەموو ئایینەکاندا ئاژەڵی مرداربوو بە حەرام دانراوە و بڕیاری پیسیەتی دراوە، کەواتە دەبێ جیاوازی بکرێت لەنێوان ئاژەڵی پیسبوو بە مرداربوون لەگەڵ مردنی تردا ئیسلام سەربڕینی کردۆتە جیاکەرەوە لە مرداربوونەوە بە سەربڕین حەڵاڵ بە مرداربووەنەوە حەرامە.

**ب - پیسی خوێن:** شەریعەتی ئیسلام بڕیاری داوە کە خوێن پیسە، پێویستە موسڵمان خۆی لێ بپارێزێ لەبەر ئەو زیانانەی هەیەتی، سەربڕینی ئاژەڵ پاککردنەوەی ئاژەڵە لە خوێن، بەڵام مردنی ئاژەڵ بە خنکاندن و جۆرەکانی تری مرد خوێنی لێ نەیەت خوێنەکە لەلاشە و دەمارەکانی ئاژەڵەکەدا دەمێنێتەوە.

**چوارەم: ئاژەڵێ نەتوانرێت سەرببڕدرێت:**

ئەگەر ئاژەڵێك نەتوانرا بەشێوەی سەربڕینی ئاسایی سەر ببڕدرێت، لەبەرئەوەی بەڕەڵایەو ناگیرێتەوە یا هەر حاڵەتێکی تر کە نەتوانرێت سەر ببردرێت ئەوە بە تیر یا فیشەك لێی بدرێت و بمرێت ئەو سەربڕینیەتی.

(قال رَافِعِ و ابن خَدِيجٍ رضي الله عنه كنا مع النبي ﷺ فند بَعِيرٌ فضربه رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ: إِنَّ لهذه البهائم لها أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ فما غَلَبَكُمْ منها شيء فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا). [1] رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردابووین (ﷺ) وشترێك هەڵات جا پیاوێك تیرێکی لێدا وەستاندی پێغەمبەریش فەرمووی: (ئەم ئاژەڵانە دڕندەیەتییەکیان تێدایە وەك دڕندەیی ئاژەڵی کێوی جا هەر کامیان ئەوەی کرد ئێوەش بەو شێوەی لێ بکەن).

(عن أبي الْعُشَرَاءِ عن أبيه قال:( قلت يا رَسُولَ اللَّهِ ما تَكُونُ الذَّكَاةُ إلا في الْحَلْقِ وَاللَّبَّةِ قال لو طَعَنْتَ في فَخِذِهَا لَأَجْزَأَكَ) [2] ئەبو عەشرا لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە (ڕەزای خوای لێبێ) کە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەربڕین هەر دەبێ لە ملەوە بێت؟ فەرمووی: (ئەگەر تیرێ ( یا فیشەکێك ) بدەی لە ڕانی هەر بە سەربڕین دادەنرێ)

ئەبو داود دەڵێ: ئەوە تەنها بۆ ئەو ئاژەڵانەیە کە لە شوێنی بەرزەوە دەکەونە خوارەوە یا کێوی دەبن تیرمزی دەڵێ: ئەوە بۆ کاتی پێویستە کە ئاژەڵێك هەڵبێت یا هەڵبگەڕێتەوە دەسەڵاتمان بەسەریدا نەبێ یا بکەوێتە دەریایەکەوە ترسی نوقم بوونمان لێی هەبێ ئەو کات بە چەقۆ یا بەتیر لێی دەدەین هەتا خوێنەکەی دەڕوات ئیتر دەمرێ و حەڵاڵە.

**پێنجەم: سەربڕاوی کێ حەڵاڵە:**

سەربڕاوی هەموو موسڵمانێك و خاوەن پەڕاوە ئاسمانیەکان پیاو بێت یا ئافرەت حەڵاڵە.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ ﴾ المائدة: ٥ واتە خواردنی ـ سەربڕاوی ـ نامەدارەکان حەڵاڵە بۆتان، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ خواردنیان [3] واتە سەربڕاویان [4] سەربڕاوی بێ باوەڕ و هەڵگەڕاوە و بت پەرست دروست نیە.

---

١) رواه الدارقطني ٢٨٣/٤ و البخاري (٥٤٩٨) و مسلم (٢٠ / ١٩٦٨)

٢) رواه احمد (٣٣٤/٢) و ابو داود (٢٨٢٥) و الترمذي (١٤١٨) و النسائي (٢٢٨/٧) وابن ماجه (٣١٨٤)

٣)كە لەئایەتەکەدا دەفەرموێ (طعامهم) مەبەست پێی سەربڕاوەیانە ئەمە تەفسیری عەبدوڵڵایە

٤) بڕوانە (فتح الباري) ٦٣٦/٩

**شەشەم: سەربڕین بەچی دروستە؟**

(عن رَافِعِ بن خَدِيجٍ قال:( قلت يا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا لَاقُو الْعَدُوِّ غَدًا وَلَيْسَتْ مَعَنَا مُدًى فقال اعْجَلْ أو أَرِنْ ما أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ فَكُلْ ليس السِّنَّ وَالظُّفُرَ وَسَأُحَدِّثُكَ أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ وَأَصَبْنَا نَهْبَ إِبِلٍ وَغَنَمٍ فَنَدَّ منها بَعِيرٌ فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ فقال رسول اللَّهِ ﷺ إِنَّ لِهَذِهِ الْإِبِلِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ فإذا غَلَبَكُمْ منها شَيْءٌ فَافْعَلُوا بِهِ هَكَذَا).[1] رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خوای لێبێ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سبەینێ بە دوژمن دەگەین و چەقۆمان پێ نیە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : (پەلە بکە- دەستت سوککە- هەرچی خوێن فیشقە پێ بکات و ناوی خواشی لەسەر برابێ بیخۆ جگە لە ددان و نینۆك، با پێت بڵێم ( بۆچی ) چونکە ددان ئێسقانە و نینۆکیش چەقۆی حەبەشیەکانە) ووتی لە ووشترو مەڕی دەستکەوتی جەنگمان دەست کەوت جا ووشترێکیان یاخی بوو جا پیاوێك تیرێکی تێ گرت و کوشتی، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموی: (بێگومان ئەم ووشترانە هەیانە یاخی دەبێت وەك یاخی بوونی کێوییەکان ئەگەر یەکێکیان لێتان یاخی بوو ئێوەش ئاوای لێبکەن)

**حەوتەم: بەچاکی سەربڕین:**

(عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ قَالَ ثِنْتَانِ حَفِظْتُهُمَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ « إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَىْءٍ فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ »).[2] شەددادی کوڕی ئەوس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان خوای گەورە چاکەی لەسەر هەموو شت پێویست کردووە، جا ئەگەر شتێکتان کوشت بەشێوەیەکی چاك بیکوژن و ئەگەر ئاژەڵێکتان سەربڕی بە چاکی سەری بڕن با یەکێکتان ( ئاژەڵی سەربڕی ) کێردەکەی تیژ بکات بەپەلە سەربڕێ و ڕزگاری بکات).

**هەشتەم: سەربڕینی کۆرپەلە:**

سەربڕینی کۆرپەلە کە لەسکی دایکیایەتی سەربڕینی دایکەکەی سەربڕینی کۆرپەلەکەشە، (عَنْ أَبِى سَعِيدٍ قَالَ سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْجَنِينِ فَقَالَ « كُلُوهُ إِنْ شِئْتُمْ فَإِنَّ ذَكَاتَهُ ذَكَاةُ

---

١) رواه البخاري (٥٥٤٣) و مسلم (١٩٦٨/٢٠)

٢) رواه مسلم (١٩٥٥) و ابوداود (٢٨١٦) و الترمذي (١٤٣٠) و النسائي (٢٢٧/٧) و ابن ماجه (٣١٧٠)

أمِّهِ»).[١] ئەبو سەعەیدی خودری (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: دەربارەی ( گۆشتی ) کۆرپەلە پرسیارم لە پێغەمبەی خوا کرد (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر ویستان بیخۆن چونکە سەربڕینی ئەو سەر بڕینی دایکێتی).

**نۆیەم: سوننەتە لەکاتی سەربڕیندا ئاژەڵەکە روو بە قیبلە بێت:**

(عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ قال:( ذَبَحَ النبي ﷺ يوم الذَّبْحِ كَبْشَيْنِ أَقْرَنَيْنِ أَمْلَحَيْنِ موجئين فلما وَجَّهَهُمَا قال إِنِي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السماوات وَالْأَرْضَ على مِلَّةِ إبراهيم حَنِيفًا وما أنا من الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ له وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وأنا من الْمُسْلِمِينَ اللهم مِنْكَ وَلَكَ عن مُحَمَّدٍ وَأُمَّتِهِ بِاسْمِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرُ ثُمَّ ذَبَحَ)[٢] جابیر کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە رۆژی جەژنی قورباندا دوو بەرانی شاخداری رەش و سپی خەسێنراوی سەربڕی و رووی کردنە قیبلە و فەرمووی: (بێگومان من رووی خۆم دەکەمە ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە بە دڵسۆزی لەسەر ئایینی ئیبراهیم (علیه الصلاة و السلام) وە بێگومان من لە هاوبەش پەیداکەران نیم بەراستی نوێژو سەربڕینو ژیان و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە کە هیچ هاوبەشی نیە منیش بەوە فەرمانم پێکراوە وە من یەکێکم لە موسڵمانان خوایە ئەمە لە خۆتەوەیە هەر بۆ تۆیە ئەم سەربڕینە لە جیاتی موحەممەد و ئومەتەکەی بەناوی خواوە (الله اکبر)).

**دەیەم: دەبێ لەکاتی سەربڕینیدا ناوی خوای لەسەر بهێنرێت:**

پێویستە لەکاتی سەربڕینەکەدا ناوی خوای لێ بهێنرێ ئەگەر بەدەست ئەنقەست ناوی خوای لێ نەهێنا ئەو سەربڕاوە دروست نییە خواردنی. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَـٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴾ الأنعام: ١١٨، واتە: لەو سەربڕاوانە بخۆن کە ناوی خوایان لەسەر هێنراوە ئەگەر ئێوە باوەڕدارن بە نیشانەکانی خوا.

١) رواه ابو داود (٢٨٢٧) و الترمذي (١٤٧٦) و ابن ماجه (٣١٩٩) و احمد (٣/ ٣١، ٥٣) وهو حديث صحيح

٢) رواه ابو داود (٢٧٩٥) وهوحديث صحيح

وە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَـٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴾ الأنعام: ١٢١ واتە: لەو سەربڕاوانە مەخۆن کە ناوی خوایان لەسەر نەهێنراوە چونکە بێگومان ئەوە تاوانە وە بەراستی شەیتانەکان بە نهێنی شت بە دوستیان دەڵێن تا موجادەلەو دەم دەمێتان لەگەڵ بکەن، جا ئەگەر بەگوێیان بکەن ئەوە بێگومان لەهاوبەش پەیداکەران دەبن.

(عن رَافِعِ بن خَدِيجٍ أن النبي ﷺ قال له: ما أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ فَكُلْ). [١] رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پێم: (ئەوەی خوێن فیشقە پێ بکاتو ناوی خوای لێ هێنرابێت ئەوە بیخۆ).

**پانزەیەم: سەربڕین بۆ غەیری خوا دروست نیە:**

(عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ سُئِلَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ أَخَصَّكُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَيْءٍ قَالَ مَا خَصَّنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَيْءٍ لَمْ يُعَمِّمْ بِهِ النَّاسَ كَافَّةً إِلا مَا كَانَ فِي قِرَابِ سَيْفِي هَذَا فَأَخْرَجَ صَحِيفَةً مَكْتُوبَةً لَعَنَ اللَّهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ لَعَنَ اللَّهُ مَنْ لَعَنَ وَالِدَيْهِ لَعَنَ اللَّهِ مَنْ آوَى مُحْدِثًا). [٢] ئەبو توفەیل (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پرسیار کرا لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب (ڕەزای خوای لێبێ) ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتێکی تایبەتی بەئێوەوە هەبووە؟ عەلی ووتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ شتێکی تایبەتی لەگەڵ ئێمەدا نەبوو کە بەگشتی بۆ هەموو خەڵك نەبووبێت جگە لەوەی لەکیفی ئەم شمشێرەدایە جا پەڕەیەکی تیا دەرهێنا کە تێیدا نووسرابوو: (خوا نەفرینی کردووە لەو کەسەی ئاژەڵ بۆ غەیری خوا سەردەبڕێ، وە خوا نەفرینی کردووە لەو کەسەی جنێو بەدایكو باوکی دەداتو خوا نەفرینی کردووە لەوەی بیدعە چییەك داڵدە دەدات).

---

١) رواه البخاري (٥٥٤٣) و مسلم (٢٠/ ١٩٦٨)

٢) رواه مسلم (١٩٨٧)

# قوربانی (الأضحية)

**یەکەم: پێناسەکەی:** (أضحية) لە زمانی عەرەبیدا لەناوی ئەو کاتەوە وەرگیراوە قوربانیەکەی تێدا سەردەبڕدرێت کە چێشتەنگایە.

**لەشەرعدا:** ئەو ئاژەڵەیە کە لەرۆژی جەژنی قوربانو سێ رۆژی دواتریدا بەمەبەستی نزیك بوونەوە لەخوا سەردەبڕدرێت.

**بەڵگەی رەوا بوونی قوربانی:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴾ الكوثر: ٢ واتە: نوێژی جەژن بکەنو قوربانی سەربڕە. ئەمە ڕای هەندێك لەزانایانی تەفسیرە.

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من كان له سَعَةٌ و لم يُضَحِّ فلا يَقْرَبَنَّ مُصَلَّانَا).[1] ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس ماڵو سامانی هەبێو قوربانی نەکات ئەوە با نزیکی نوێژگەی[2] ئیمە نەبێتەوە).

**دووەم: حیکمەتی قوربانی کردن چییە؟**

نزیك بوونەوە لەخوای گەورە بەخوێن رشتن لەپێناوی خوادا، چونکە لەپەرستشە هەرە گەورەکانە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَالَمِينَ ﴾ الأنعام: ١٦٢ واتە: بێگومان نوێژو سەربڕینو ژیانو مردنم هەمووی بۆ خوایە کە پەروەردگاری جیهانیانە.

ماڵ بەخشینو هاوکاری کردنی هەژارو نەدارانە لە رۆژی جەژنەدا کە رۆژێکی گەورەو پیرۆزە بە سوپاس کردنی بەهرەو نیعمەتی خوای گەورە لەسەر بەردەوامی بەهرەکانی ساغی ئاینو

١) رواه احمد (٢/ ٣٢١) و ابن ماجه (٣١٢٣) وهو حديث حسن

٢) نوێژگە: شوێنی نوێژکردنی جەژنە لە دەرەوەی شاردا بووە ، پێغەمبەر (ﷺ) هەمیشە لە نوێژگە نوێژی جەژنەکانی دەکرد.

بێوەیی، شوێن پێ هەڵگرتنی ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه الصلاة و السلام) کە ئیسماعیلی کوڕی کردە قوربانی کاتێ خوا فەرمانی پێکرد جا خوای گەورە لەجیاتیدا بەرانێکی پێبەخشی بیکاتە قوربانی. دواتر پێغەمبەری خۆمان (ﷺ) تازەی کردەوە. ئێمەش بەشوێنیاندا دەڕۆین.

بەهۆیەوە خۆشی‌و شادی خستنە نێو ماڵ‌و منداڵی قوربانی کەرەکەوە لەو جەژنە ئیسلامیەدا (عن عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ يَقُولُ سَأَلْتُ أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ كَيْفَ كَانَتِ الضَّحَايَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ كَانَ الرَّجُلُ يُضَحِّي بِالشَّاةِ عَنْهُ وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ فَيَأْكُلُونَ وَيُطْعِمُونَ حَتَّى تَبَاهَى النَّاسُ فَصَارَتْ كَمَا تَرَى) [1]. عەتای کوڕی یەسار دەڵێ: پرسیارم لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاری کرد (ڕەزای خوای لێبێ) قوربانی کردن لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چۆن بوو، ئەویش وتی: لەوکاتەدا پیاو مەڕێکی دەکردە قوربانی بۆ خۆی‌و بۆ ماڵ‌و منداڵی، جا خۆیان لێیان دەخواردو بۆ خەڵکیشیان دەنارد هەتا خەڵك کردیانە خۆهەڵکێشان ئیتر ناوای لێهات کە دەیبینی).

**سێ یەم: حوکمی قوربانی کردن:**

قوربانی کردن واجبە بۆ ئەو کەسەی ماڵ‌و سامانی هەبێ‌و بتوانێ قوربانی بکات. (عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من كان له سَعَةٌ و لم يُضَحِّ فلا يَقْرَبَنَّ مُصَلَّانَا). [2] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس ماڵ‌و سامانی هەبێ‌و قوربانی نەکات ئەوە با نزیکی نوێژگەی ئێمە نەبێتەوە). کە هەرەشەی لێ دەکرێ بەوەی نزیکی نوێژگەی موسوڵمانان نەبێتەوە ئەمەیە بەڵگەیە کە واجبێکی نەکردووە.

(عن مِخْنَفُ بن سُلَيْمٍ قال: وَنَحْنُ وُقُوفٌ مع رسول اللَّهِ ﷺ بعَرَفَاتٍ قال: يا أَيُّهَا الناس إِنَّ على كل أَهْلِ بَيْتٍ في كل عَامٍ أُضْحِيَّةً وَعَتِيرَةً أَتَدْرُونَ ما الْعَتِيرَةُ هذه التي يقول الناس الرَّجَبِيَّةُ). [3]

میخنەفی کوڕی سولەیم (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ئێمە لەعەرەفات لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) وەستابووین فەرمووی: (ئەی خەڵکینە پێویستە لەسەر هەر خێزان‌و ماڵێك قوربانییەك‌و

---

١) رواه الترمذي (١٥٠٥) و ابن ماجه (٣١٤٧) وهو حديث صحيح

٢) رواه احمد (٢/ ٣٢١) و ابن ماجه (٣١٢٣) وهو حديث حسن

٣) رواه احمد (٢/٢١٥) و ابو داود (٢٧٨٨) و النسائي (٧/١٦٧)و الترمذي (١٥١٨) و ابن ماجه (٣١٢٥)وهو حديث حسن.

عەتیرەیەك بكەن لەهەمووساڵێكدا، دەزانن عەتیرە چییە؟ ئەو ئاژەڵەیە -لەرەجەبدا سەردەبڕدرێت- خەڵك پێی دەڵێن رەجەبانە).

جا عەتیرە بەم فەرموودەیە عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال (لَا فَرَعَ ولا عَتِيرَةَ) [١] (فەرەع و عەتیرە دروست نییە) فەرەع یەكەم بەچكەی ئاژەڵ بوو سەریان دەبڕی بۆ بتەكانیان جا عەتیرە بەم فەرموودەیە حوكمەكەی بەواجب نەماوە و سڕاوەتەوە بەڵام قوربانی هەروەك خۆی ماوەتەوە بەواجبی.

**چوارەم: كاتی سەربڕینی قوربانی:**

قوربـانی لـەپاش تـەواوبوونی نوێـژی جـەژنی قوربانـەوە سـەردەبڕدرێت هـەتا سـێ رۆژی دوای جەژنیش.

(عن أَنَسٍ قال قال النبي ﷺ من ذَبَحَ قبل الصَّلَاةِ فَلْيُعِدْ). [٢] ئەنـەس (رەزای خـوای لـێبێ) دەڵـێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەركەس پێش نوێژی جەژن قوربانی سەربڕیوە با ئاژەڵێكی تر سەر ببڕێت ـ پاش نوێژ ـ). چونكە قوربانییەكەی كە پێش نوێژ سەری بڕیوە دروست نەبووە.

(عن جُبَيْرِ بن مُطْعِمٍ عَنِ النبي ﷺ قال ... وَكُلُّ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ ذَبْحٌ). [٣] جوبـەیری كـوڕی مـوتعیم (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (... هـەموو رۆژەكـانی تەشریق كاتی قوربانی سەربڕینە).

لەم دوو فەرموودەدا روون بوویەوە كە سەرەتای كاتی قوربانی سەربڕین پـاش نوێـژی جەژنـە جـا كاتەكەی بەردەوام دەبێت تا سێ رۆژی پاش جەژن كە پێی دەڵێن رۆژانی تەشریق.

**پێنجەم: چ ئاژەڵێك بۆ قوربانی دروستە:**

**أ ـ مەڕو بزن بۆ یەك كەس دەبێ، ووشترو مانگاش بۆ حەوت كـەس دەبێـت.** (عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ قال نَحَرْنَا مع رسول اللَّهِ ﷺ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ الْبَدَنَةَ عن سَبْعَةٍ وَالْبَقَرَةَ عن سَـبْعَةٍ). [٤] جـابیری

---

١) رواه البخاري (٥٤٧٣) و مسلم (١٩٧٦)

٢) رواه البخاري (٥٥٤٩) ومسلم (١٩٦٢/١٠)

٣) رواه أحمد ٨٢/٤ وابن حبان (٣٨٤٣) وهو حديث صحيح

٤) رواه مسلم (١٣١٨) وابو داود (٢٨٠٩)

کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (لە ساڵی ڕێککەوتنی حودەیبییەدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ووشترمان سەربڕی بۆ حەوت کەس مانگاشمان سەربڕی بۆ حەوت کەس).

**ب ـ مەڕ دەبێ تەمەنی ساڵێکی تەواو کردبێت وە بزنو ڕەشەووڵاخ دوو ساڵیان تەواو کردبێت وە ووشتریش پێنج ساڵی تەواو کردبێت،** (عن جَابِرٍ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ( لَا تَذْبَحُوا إلا مُسِنَّةً إلا أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً من الضَّأْنِ) [1] جابیر (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: ( ـ مسنە ـ نەبێت سەری مەبڕن ئەگەر نارەحەت بوو لەسەرتان کاوڕێکی مەڕ سەربڕن).

(مسنە) لە ووشتردا دەبێ پێنج ساڵی تەواو کردبێت لە ڕەشەووڵاخو بزندا دوو ساڵی تەواو کردبێت، لەمەڕدا ساڵێك یا شەش مانگی تەواو کردبێ.

ج ـ ( وكان أبو بُرْدَةَ بن نِيَارٍ قد ذَبَحَ فقال عِنْدِي جَذَعَةٌ خَيْرٌ من مُسِنَّةٍ فقال اذْبَحْهَا وَلَنْ تجزى عن أَحَدٍ بَعْدَكَ) [2] ئەبو بوردەی کوڕی نیار (ڕەزای خوای لێبێ) پێش ـ نوێژی جەژن ـ سەری بڕیبوو، پاشان ووتی: گیسکێکم هەیە باشترە لەو بزنەی دوو ساڵی تەواو کردوە فەرمووی: (سەری ببڕە لەپاش تۆ ئیتر بۆ کەسی تر دروست نییە).

**شەشەم: ئەو ئاژەڵەی بۆ قوربانی دروست نییە:**

(عن الْبَرَاءِ بن عَازِبٍ رَفَعَهُ قال لَا يُضَحَّى بِالْعَرْجَاءِ بَيِّنٌ ظَلَعُهَا ولا بِالْعَوْرَاءِ بَيِّنٌ عَوَرُهَا ولا بِالْمَرِيضَةِ بَيِّنٌ مَرَضُهَا ولا بِالْعَجْفَاءِ التي لَا تُنْقِي). [3] بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (چوار ئاژەڵ بۆ قوربانی دروست نین: ئەوەی بەئاشکرا چاوی کوێرە، ئەوەی بەئاشکرا نەخۆشە، ئەوەی بەئاشکرا دەشەلێ، ئەوەی مێشکی نەماوە).

---

١) رواه مسلم (١٩٦٣/١٣) وأحمد (٢٣٢/٣) وأبو داود (٢٧٩٧) والنسائي ٢١٨/٧ وابن ماجه (٣١٤١)

٢) رواه مسلم (١٩٦١/٧) و أبوداوود (٢٨٠٠١)

٣) رواه أبو داوود (٢٨٠٢) والترمزي (١٤٩٧) و ابن ماجه (٣١٤٢) وهو حديث صحيح

**حەوتەم: حوکمەکانی قوربانی:**

**أ- دروستە گۆشتی قوربانی لێی بەخشریٚو لێی بخوریٚو لێشی هەڵگیرێت:**

(عن عبد اللَّهِ بن أبي بكر عن عبد اللَّهِ بن وَاقِدٍ قال نهى رسول اللَّهِ ﷺ عن أَكْلِ لُحُومِ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلَاثٍ قال عبد اللَّهِ بن أبي بَكْرٍ فَذَكَرْتُ ذلك لِعَمْرَةَ فقالت صَدَقَ سمعت عَائِشَةَ تَقُولُ دَفَّ أَهْلُ أَبْيَاتٍ من أَهْلِ الْبَادِيَةِ حَضْرَةَ الْأَضْحَى زَمَنَ رسول اللَّهِ ﷺ فقال رسول اللَّهِ ﷺ ادَّخِرُوا ثَلَاثًا ثُمَّ تَصَدَّقُوا بِمَا بَقِيَ فلما كان بَعْدَ ذلك قالوا يا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الناس يَتَّخِذُونَ الْأَسْقِيَةَ من ضَحَايَاهُمْ وَيَجْمُلُونَ منها الْوَدَكَ فقال رسول اللَّهِ ﷺ وما ذَاكَ قالوا نَهَيْتَ أَنْ تُؤْكَلَ لُحُومُ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلَاثٍ فقال إنما نَهَيْتُكُمْ من أَجْلِ الدَّافَّةِ التي دَفَّتْ فَكُلُوا وَادَّخِرُوا وَتَصَدَّقُوا).[1] عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکر لەعەبدوڵڵای کوڕی واقیدەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کرد لەخواردنی گۆشتی قوربانی لەسێ ڕۆژ بەدواوە، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکر دەڵێ: ئەمەم بۆ عەمرە باس کرد، ئەویش ووتی: ڕاست دەکات، لەعائیشەم بیستووە (ڕەزای خوای لێبێ) دەیووت: کەسانێ لەدانیشتوانی بیابان لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا) لەڕۆژی جەژنی قورباندا هاتنە مەدینە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بەشی سێ ڕۆژ هەڵبگرن پاشان ئەوەی کە مایەوە بیبەخشن) جا ماوەیەك دوای ئەوە ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەڵکی هیزە دروست دەکەن لە - پێستی - قوربانییەکانو بەزو پیوی تێدا هەڵدەگرن پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (جا ئەوە چییە؟) ووتیان: تۆ ڕێگریت کرد لەوەی گۆشتی قوربانی پاش سێ ڕۆژ بخورێت، فەرمووی: (من لەبەرئەوە ڕێگریم لێ کردن لەبەر ئەو میوانانەی دەرەوە کە هاتبوونە ئێرە، ئێستە بیخۆنو هەڵیبگرنو لێشی ببەخشن).

**ب - لەنوێژگە قوربانی سەربڕدرێت چاکترە:**

(عن ابن عُمَرَ رضي الله عنهما قال: كان رسول اللَّهِ ﷺ يَذْبَحُ وَيَنْحَرُ بِالْمُصَلَّى).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاژەڵو ووشتری لە نوێژگە سەردەبڕی).

---

١) رواه مسلم (١٩٧١/٢٨)

٢) رواه البخاري (٥٥٥٢)

**ج ـ سوننەتە قوربانیکەر نینۆك نەكات‌و موو لە خۆی نەكاتەوە:**

ئەو كەسەی بەنیازە قوربانی بكات سوننەتە لەسەرەتای مانگی (ذی الحجة)وە نینۆك نەكات‌و مووی سەرو ریش‌و لەشی لانەبات تا لەجەژندا قوربانییەكەی سەردەبڕێت. (عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ هِلاَلَ ذِي الْحِجَّةِ وَأَرَادَ أَنْ يُضَحِّيَ فَلْيُمْسِكْ عَنْ شَعْرِهِ وَأَظْفَارِهِ).[1] ئومو سەلەم (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر مانگی (ذی الحجة)تان بینی‌و كەسێكتان ویستی قوربانی بكات با موو و نینۆكی لانەبات).

**دـ سوننەتە پاڵخستنی مەڕ لەسەر لای چەپ‌و دوعای گیرا كردنی بكات:**

(عن عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِكَبْشٍ أَقْرَنَ يَطَأُ فِي سَوَادٍ وَيَبْرُكُ فِي سَوَادٍ وَيَنْظُرُ فِي سَوَادٍ فأتى بِهِ ليضحي بِهِ فقال لها يا عَائِشَةُ هَلُمِّي الْمُدْيَةَ ثُمَّ قال اشْحَذِيهَا بِحَجَرٍ فَفَعَلَتْ ثُمَّ أَخَذَهَا وَأَخَذَ الْكَبْشَ فَأَضْجَعَهُ ثُمَّ ذَبَحَهُ ثُمَّ قال بِاسْمِ اللَّهِ اللهم تَقَبَّلْ من مُحَمَّدٍ وَآلِ مُحَمَّدٍ وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ ثُمَّ ضَحَّى بِهِ).[2] عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانیدا بەرانێكی شاخدار چوارپەلی ڕەش بوو، ژێر سكی ڕەش بوو دەوری چاوەكانی ڕەش بوو بۆی هێنرابوو تا بیكاتە قوربانی بە عائیشەی فەرموو: (عائیشە چەقۆكە بێنە) پاشان فەرمووی: (بەبەردێك تیژی بكە) منیش تیژم كرد پاشان چەقۆكەی گرت بەدەستیەوەو بەرانەكەشی گرت‌و پاڵی خست‌و سەری بڕی‌و فەرمووی: (بسم الله، خوایە قبوڵی بكە لەموحەممەدو كەس‌و كاری موحەممەدو ئوممەتی موحەممەد) پاشان كردیە قوربانی.

**هـ ـ لەقوربانیەكە هیچ نادرێت بەقەسابەكە:**

(عَنْ عَلِيٍّ – رضى الله عنه – قَالَ أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ وَأَقْسِمَ جُلُودَهَا وَجِلاَلَهَا وَأَمَرَنِي أَنْ لاَ أُعْطِيَ الْجَزَّارَ مِنْهَا شَيْئًا) عەلی كوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێكردم بە سەر ووشترەكانیەوە ـ كە دەكرێنە قوربانی ـ بوەستم وە گۆشت‌و پێستەو سەرجلەكەی دابەش بكەم بەسەر هەژاراندا هیچی لێ نەدەم بەقەسابەكە).[3]

---

١) رواه مسلم (١٩٧٧/٤١)

٢) رواه مسلم (١٩٦٧) و أبوداوود (٢٧٩٢) وأحمد (٧٨/٦)

٣) رواه البخاري (١٧١٦) ومسلم (١٣١٧) وابو داود (١٧٦٩) وابن ماجه (٣٠٩٩).

# گوێزەبانە -حەوتم- (العقیقة)

**یەکەم: پێناسەکەی:** (عقیقة) لەزمانی عەرەبیدا بەمانای بڕینە، وە لە بنەڕەتدا بەو مووە دەوترێت کەبەسەری منداڵی تازە لەدایك بووەوەیە بۆیە وای پێدەوترێت چونکە دەتاشرێتو دەبڕدرێت بەسەری منداڵەکەوە.

**وەلە شەرع دا:** ئەو ئاژەڵەیە کە بۆ منداڵی تازە لە دایك بوو سەردەبڕدرێت لەکاتی سەرتاشینو ناونانیدا.

**دووەم: حوکمی گوێزەبانە:** سوننەتێکی جەخت لەسەرکراوەیە ئەگەر باوکەکەشهەژاربێت.

(عن سَلْمَانُ بن عَامِرٍ الضَّبِّيُّ قال سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول مع الْغُلَامِ عَقِيقَةٌ فَأَهْرِيقُوا عنه دَمًا وَأَمِيطُوا عنه الْـأَذَى)[1] سەلمانی کوڕی عامیری صەنەببی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست فەرمووی: (حەوتم لەگەڵ منداڵدایە کەواتە خوێنی (ئاژەڵی) بۆ بڕێژنو سەری بتاشن).

**سێ یەم: حیکمەتی دانانی گوێزەبانە:**

أـ شادی دەربڕین بەبۆنەی بەهرەی خواوە کەبەبێوەی لەدایك بوو وە بە بۆنەی پەیدابوونی منداڵەکەوە.

ب ـ ناساندنیو ئاشکراکردنی منداڵەکە کەلەو دایكو باوکەیە.

ج ـ گەشەدان بەسیفەتی ماڵ بەخشین لەئادەمیزاددا و خۆ دوورخستنەوە لە ڕەزیلیو چروکی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ الحشر: ٩

واتە: (هەرکەس خۆی بپارێزێ لە ڕژدەیی دەروونی ئەوە بێگومان لە ڕزگاربوانە).

---

١) رواه البخاري (٥٤٧٢) و ابو داود (٢٨٣٩) والترمذي (١٥١٥).

**چوارەم: خۆشەویست بوونی گویزەبانە:** بەلای ماڵو منداڵو کەس‌وکارو دراوسێوە کەهەموویان لەسەر سفرەی ناوانی منداڵەکە کۆدەبنەوەو نان خواردنێك سازدەکرێت بۆیان کەبەڕاستی ڕووداوێکی جوانو خۆشەویستە لای هەمووان.

**پێنجەم: گویزەبانەی کوڕو کچ:**

دوو مەڕ بۆ کوڕ سەردەبڕدرێتو یەك مەڕ بۆ کچ:

(عن عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَهُمْ عن الْغُلَامِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ وَعَنْ الْجَارِيَةِ شَاةٌ) عائیشە (ڕەزای خوای لیّ بیّ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردن بۆ کوڕ دوو مەڕی وەك یەك بۆ کچ مەڕێك سەربڕن).[1]

**شەشەم: سوننەتی گویزەبانە:**

**أ- سوننەتە:** سەربڕینی مەڕەکەو سەرتاشینی منداڵەکەو ناونانەکەی لەرۆژی حەوتەمی لەدایك بوونی منداڵەکەدابن: (عن سَمُرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ الْغُلَامُ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ يُذْبَحُ عنه يوم السَّابِعِ وَيُسَمَّى وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ).[2] (هەموو منداڵێك بارمتەی گویزەبانەکەیەتی، لە ڕۆژی حەوتەمدا مەڕێکی بۆ سەردەبڕێتو ناو دەنرێتو سەری دەتاشرێت).

**ب - کێشی مووی سەری منداڵەکە ئاڵتون یا زیوو دەبەخشرێت:**

(عن أبي رافع قال لما ولدت فاطمة حسنا رضي الله عنهما قالت يا رسول الله ألا أعق عن ابني بدم قال لا ولكن احلقي شعره وتصدقي بوزنه من الورق على الأوقاص أو على المساكين).[3]

ئەبو ڕافیع (ڕەزای خوای لیّ بیّ) دەڵێ: کاتێ فاتیمە حەسەنی بوو (ڕەزای خوایان لیّ بیّ) فاتیمە ووتی ئەی پێغەمبەری خوا ئاژەڵێك سەرنەبڕم بۆ منداڵەکەم؟ فەرمووی: (نەخێر بەڵام سەری بتاشەو کێشانەی مووەکەی سەری لەزیوو ببەخشە بەخەڵکی صوفە یا هەژاران).

---

١) رواه مسلم (٢٠٢٠/١٠٥).

٢) رواه الترمذي (١٨٠٥) وابن ماجه (٣٢١٧)وهو حديث صحيح.

٣) رواه أحمد (٣٩٠١٦) والبيهقي (٣٤/٩)وهو حديث حسن.

# ئادابەکانی نان خواردن

**یەکەم: خوێندنی دوعای سەرەتای نان خواردن:**

لەسەرەتادا (بسم الله) بکات، (عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللَّهِ فَإِنْ نَسِىَ فِى أَوَّلِهِ فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللَّهِ فِى أَوَّلِهِ وَآخِرِهِ »). عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان خواردنێکی خوارد بابلێت (بسم لله) جا ئەگەر لەسەرەتاوە لەبیرچوو بیلێت بابلێ (بسم الله في أوله وآخره).[1]

**دووەم: بەدەستی ڕاستی بیخوات:** (عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ « إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بِيَمِينِهِ وَإِذَا شَرِبَ فَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ »).[2]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر کەسێکتان خواردنی خوارد بابەدەستی ڕاستی بیخوات، وە ئەگەر ئاوی خواردەوە بابەدەستی ڕاستی بیخواتەوە چونکە شەیتان بەدەستی چەپی دەخوات و دەخوارەدەوە).

**سێ یەم: لەقەراغی خواردنەکەوە بخوات نەک ناوەڕاستی:**

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِىَّ ﷺ قَالَ « إِنَّ الْبَرَكَةَ تَنْزِلُ وَسَطَ الطَّعَامِ فَكُلُوا مِنْ حَافَتَيْهِ وَلاَ تَأْكُلُوا مِنْ وَسَطِهِ »).[3] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: فەڕو بەرەکەت دادەبەزێتە ناوەڕاستی خواردنەکە، بۆیە لەقەراغەکانیەوە بخۆن و لەناوەڕاستیەوە مەخۆن).

**چوارەم: لەبەردەم خۆیەوە:**

(عن عُمَرَو بن أبي سَلَمَةَ يقول كنت غُلَامًا في حَجْرِ رسول اللَّهِ ﷺ وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ في الصَّحْفَةِ فقال لي رسول اللَّهِ ﷺ يا غُلَامُ سَمِّ اللَّهَ وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ فما زَالَتْ تِلْكَ

---

١) رواه أبو داود ٤/١٣٩ (٣٧٦٧) والترمذي (١٨٥٨) وابن ماجه (٣٢٦٤) وهو حديث صحيح.

٢) رواه مسلم (٢٠٢٠/١٠٥).

٣) رواه الترمذي (١٨٠٥) والترمذي (٣٢٧٧) وهو حديث صحيح.

طِعْمَتِي بَعْدُ).[١] عەمری کوڕی سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (من منداڵێکی بچوك بووم لە ماڵی پێغەمبەردا بووم (ﷺ) لەنان خواردندا دەستی دەبرد بەم لاولای قاپەکەدا جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پێم: (کوڕە بچکۆل -کاتێ خاواردنت خوارد- ناوی خوابێنەو. بەدەستی ڕاست بخۆو لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ) جا لەوە بەدواوە هەر بەو شێوەی پێغەمبەری (ﷺ) فەرمووی خواردنم دەخوارد).

**پێنجەم: لێسانەی پەنجەکان و قاپەکە:**

(عَنْ أَنَسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا أَكَلَ طَعَامًا لَعِقَ أَصَابِعَهُ الثَّلاَثَ. قَالَ وَقَالَ « إِذَا سَقَطَتْ لُقْمَةُ أَحَدِكُمْ فَلْيُمِطْ عَنْهَا الأَذَى وَلْيَأْكُلْهَا وَلاَ يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ». وَأَمَرَنَا أَنْ نَسْلُتَ الْقَصْعَةَ قَالَ « فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْرُونَ فِى أَىِّ طَعَامِكُمُ الْبَرَكَةُ »).[٢] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمیشە کە خواردنێکی بخواردایە سێ جار پەنجەکانی دەلێسایەوە ووتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان پارویەکی لەدەست کەوتە خوارەوە با چی پێوەدرا لایبات و بیخوات وازی لێ نەهێنێ بۆ شەیتان) وە فەرمانی پێکردین قاپەکە بلێسینەوە فەرمووی: (چونکە ئێوە نازانن فەڕو بەرەکەت بەکام بەشی خواردنەکەوەیە).

**شەشەم: بەدانیشتنەوە بیخوات:**

(عَنْ أَبِى جُحَيْفَةَ قَالَ كُنْتُ عِنْدَ النَّبِىِّ ﷺ فَقَالَ لِرَجُلٍ عِنْدَهُ « لاَ آكُلُ وَأَنَا مُتَّكِئٌ »).[٣] ئەبو جوحەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (من لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم (ﷺ) بەپیاوێکی فەرموو کە لەخزمەتیدا بوو: (من بەشاندادانەوە خواردن ناخۆم).

**حەوتەم: خواردن بەسێ پەنجە:**

ئەگەر بەدەست نانی خوارد سوننەتە بەسێ پەنجە نان بخوات نەك بەهەموو پەنجەکانی: (عن بن كَعْبِ بن مَالِكٍ عن أبيه قال( كان رسول اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ بِثَلَاثِ أَصَابِعَ وَيَلْعَقُ يَدَهُ قبل أَنْ يَمْسَحَهَا).[٤]

---

١) رواه البخاري (٥٣٧٦) ومسلم (٢٠٢٢).

٢) رواه مسلم (٢٠٣٤/١٣٦).

٣) رواه البخاري (٥٣٩٩).

٤) رواه مسلم (٢٠٣٢/١٣١).

کەعبی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسێ پەنجە خواردنی دەخواردو دەستی دەلێسایەوە پێش ئەوەی بیسڕێت).

**هەشتەم: دوعا خوێندنی کۆتایی نان خواردن:**

(عن أبي أُمَامَةَ أَنَّ النبي ﷺ كان إذا رَفَعَ مَائِدَتَهُ قال الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فيه غير مَكْفِيٍّ ولا مُوَدَّعٍ ولا مُسْتَغْنًى عنه رَبَّنَا).[1] ئەبو ئومامە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ سفرەکەی هەڵدەگیرا دەیفەرموو: (الحمدلله كثيراً طيباً مباركاً فيه غير مكفي ولامودع ومستغني عنه ربنا) واتە: سوپاس بۆ خوا سوپاسێکی زۆری پاکی بەپیتو بەرەکەتی وەرگیراوی‌و نەبڕاوەیی بێ نیازنەبوونمان ئەی پەروەردگارمان.

(عَنْ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ جبل أن رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «مَنْ أَكَلَ طَعَامًا فَقَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَطْعَمَنِى هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّى وَلاَ قُوَّةٍ. غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»).[2] موعازی کوڕی جەبەل (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس خواردنێکی خوارد پاشان بڵێت (الحمدلله الذي أطعمني هذا الطعام ورزقنيه من غير حول ولا قوة) لەگوناهەکانی ڕابردوو چاوپۆشی دەکرێ).

---

١) رواه البخاري (٥٨٠/٥٤٥٨).

٢) رواه الترمذي (٣٤٥٨) وابن ماجه (٣٢٨٥) وهو حديث حسن.

# خواردنەوەکان (الأشربة)

**یەکەم: خواردنەوەکان لەبنەڕەتدا حەڵاڵن:**

زیادە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ البقرة:٢٩ واتە: (خوا ئەو زاتەیە هەرچی لەزەویدایە بۆ ئێوەی دروستکردووە. کەواتە ئەوەی لەئاسمانەوە دەبارێ و ئەوەی لەزەویەوە هەڵدەقوڵێ و ئەو میوەجاتە دەکرێت بەدۆشاو هەمووی حەڵاڵە) وە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِۦۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِّنُحْـِۧيَ بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا وَنُسْقِيَهُۥ مِمَّا خَلَقْنَآ أَنْعَٰمًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا ﴾ الفرقان: ٤٨ – ٤٩ واتە: (ئێمە لەئاسمانەوە بارانێکمان باراندووە تا خاك و وڵاتێکی مردووی پێ زیندو بکەینەوە وە زۆرێ لە ئاژەڵ و خەڵکانێ کە خۆمان دروستمانکردوون تێراو بکەین).

ئەوەی کەووتمان هەموو خواردنەوەیەك لەبنەڕتدا حەڵاڵە تەنها شتانێك ناگرێتەوە کە بەڵگە هەبێت کە پیسە کەلە بڕگەی دووەمدا باسی دەکەین:

**دووەم: ئەو خواردنەوانەی کە حەرامن:**

هەموو خواردنەوەیەکی زیان بەخش و پیس و سەرخۆشکەر حەرامە:

أ- ئەو خواردنەوانەی زیانیان هەیە وەك ژەهرو هەر خواردنەوەیەکی تر کە زیان بەخش بێت، چونکە ئەوانە لەشی مرۆڤ زیان لێدەدەن و لەناوی دەبەن خوای گەورەش دەفەرموویت: ﴿ وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ﴾ البقرة: ١٩٥ واتە: (بەدەستی خۆتان خۆتان لەناو مەبەن). وە دەفەرموویت: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾ النساء: ٢٩ واتە: (خۆتان مەکوژن بێگومان خوای گەورە میهرەبانە بەرامبەر بەئێوە).

ب ـ ئەو خواردنەوانەی کە پیسن وەك خوێن و میـز و شـیری گیانـدارێك کـە گۆشـتی ناخورێـت جگە لە ئافرەت، یان شلەیەك پیسی تێکەوتبێت لەبەر زەرەرو زیانی بۆ لەشی مرۆڤ وەلـە بـەر ئـەوەی لەگـەڵ سروشـتی ڕێکـدا ناگونجێ‌و مرۆڤ قیـزی لێدەکاتـەوە، خـوای گـەورە لەباسـی حەرامەکانـدا دەفـەرمووێت: ﴿ أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا ﴾ الأنعـام: ١٤٥ واتـە: (یـەکێکی تـر لـە حەرامەکان یان خوێنێکی ڕژاوبێت).

ج ـ ئەوەی سەرخۆشکەربێت: جا عارەق بێت ئەوەی کەلە ترێ دروست دەکرێ یان هـەر نـاوێکی تری هەبێت بەمەرجێ سەرخۆشکەربێت ئەوە حەرامـە، (عن ابن عُمَرَ قال قال رسول اللّـهِ ﷺ كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ).[1] عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لـێ بـێ) دەڵـێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هەموو سەرخۆشکەرێك عارەقە، هەموو سەرخۆشکەرێکیش حەرامە).

د ـ ئەو خواردنەوەیەی زۆرەکەی سەرخۆشکەربێت کەمەکەشی حەرامە:

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ وما أَسْكَرَ منـه الْفَرْقُ فَمِلْءُ الْكَفِّ منه حَرَامٌ).[2] عائیـشە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) لـە پێغەمبـەری خـوام (ﷺ) بیست دەیفەرموو: (هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامـە، ئـەوە پـڕی فـەرقێکی[3] مرۆڤ سـەرخۆش بکات ئەوە گولێکیشی حەرامە).

**سێ یەم : دروست کردنی خواردنەوە لەهەموو پێستو دەفرێکدا دروستە:**

لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) خەڵکی دۆشاوی ترێ‌و خورمـاو شـتانی تریـان لەکوپـەو پێـستەو ئـەو جۆرە شتانەدا دروست دەکرد، بەشێکی ئەو خواردنەوانە کە دروست دەکـران سەرخۆشـکەربوون، بۆیـە حوکمەکەی بۆ روون کردنەوە (عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنِ الأَشْـرِبَةِ فِـى ظُرُوفِ الأَدَمِ فَاشْرَبُوا فِى كُلِّ وِعَاءٍ غَيْرَ أَنْ لاَ تَشْرَبُوا مُسْكِرًا»).[4] بورەیـدە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ)

---

١) رواه مسلم (٢٠٠٣/٧٤).

٢) رواه أبو داود (٣٦٨٧) والترمذي (١٨٦٦) وهو حديث صحيح.

٣) (الفرق) کاسەیەکی پێوانەیە سێ ساع دەگرێت کە بە لیتر: ١٢/٦١٧ لیتردەکات.

٤) رواه مسلم (٩٧٧/٦٥).

دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (من ڕێگریم لێ کردن لە (دروستکردنی) خواردنەوە لەپێست دا، دەی ئێستا لەهەموو پێستو دەفرێکدا خواردنەوە بخۆنەوە بەلاّم سەرخۆشکەر مەخۆنەوە).

**چوارەم : دروست نیە دۆشاو خواردنەوەی دوومیوە تێکەڵکراین:**

(عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيِّ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُنْبَذَ الزَّبِيبُ وَالتَّمْرُ جَمِيعًا وَنَهَى أَنْ يُنْبَذَ الْبُسْرُ وَالرُّطَبُ جَمِيعًا).[1] جابری کوڕی عەبدوللاّ (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کرد کە مێوژو خورما تێکەڵ بکرێن بۆ خواردنەوە، هەروەها ڕێگری کردووە خورمای تەڕوتازە لەگەڵ بەرسیلە خورما تێکەڵ بکرێن بۆ خواردنەوە).

**پێنجەم: عارەق کردن بە سرکە حەرامە:**

(عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْخَمْرِ تُتَّخَذُ خَلاًّ فَقَالَ « لاَ »).[2] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پرسیار لە پێغەمبەری (ﷺ) کرا دەربارەی عارەق شتی تێبکرێ‌و بکرێ بەسرکە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (نەخێر) دروست نیە.

**شەشەم: دروستە دۆشاو خۆشاو پێش کوڵانی بخورێتەوە:**

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُنْقَعُ لَهُ الزَّبِيبُ فَيَشْرَبُهُ الْيَوْمَ وَالْغَدَ وَبَعْدَ الْغَدِ إِلَى مَسَاءِ الثَّالِثَةِ ثُمَّ يَأْمُرُ بِهِ فَيُسْقَى أَوْ يُهَرَاقُ).[3] عەبدوللاّی کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (لەشەوداميوژیان دەکردە ئاوەوە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) جا ڕۆژی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەم تا ئێوارەکەی دەیخواردەوە پاشان فەرمانی دەکرد بدرێ بەکەسێ بیخواتەوە یان بڕژێنرێت).

**حەوتەم: ئادابەکانی خواردنەوە:**

**أ- بە دەستی ڕاست خواردنەوە:** (عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ « إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بِيَمِينِهِ وَإِذَا شَرِبَ فَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ »).[4] عەبدوللاّی

---

١) رواه البخاري (٥٦٠١) ومسلم (١٩٨٦/١٩)

٢) رواه مسلم (١٩٨٣/١١).

٣) رواه مسلم (٢٠٠٤/٨١).

٤) رواه مسلم (٢٠٢٠/١٠٥).

کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان خواردنی خوارد بابەدەستی ڕاستی بیخوات وە ئەگەر خواردنەوەی خواردەوە بابەدەستی ڕاستی بیخواتەوە، چونکە بێگومان شەیتان بەدەستی چەپی دەخوات‌و دەخواتەوە).

**ب ـ لای ڕاستەوە:** ئەگەر خواردنەوە بۆ چەند کەسێك هێنرا ئەوە لەڕاستەوە سوننەتە بەسەریاندا بگەڕێنرێت، (عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِلَبَنٍ قَدْ شِيبَ بِمَاءٍ وَعَنْ يَمِينِهِ أَعْرَابِيٌّ وَعَنْ يَسَارِهِ أَبُو بَكْرٍ فَشَرِبَ ثُمَّ أَعْطَى الأَعْرَابِيَّ وَقَالَ « الأَيْمَنَ فَالأَيْمَنَ »).[1] ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: شیرێکیان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێنا کەئاوی تێکەڵکرابوو لای ڕاستیەوە عەرەبێکی دەشتەکی بوو لای چەپیشیەوە ئەبو بەکر بوو خۆی خواردیەوە - پاشان دای بەعەرەبە دەشتەکیەکەو فەرمووی: (ئەوانەی لای ڕاستەوەن جا ئەوانەی لای ڕاستەوە).

**ج ـ ئەو جامە یا پەرداخەی ئاوی پێدەخواتەوە هەناسەی تێدا نەدات:** (عن أَبِى قَتَادَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَتَنَفَّسْ فِى الإِنَاءِ).[2] ئەبو قەتادە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان خواردنەوەیەکی خواردەوە بالەو دەفرەدا هەناسە نەدات). واتە لەکاتی خواردنەوەیدا هەناسە نەدات.

**د. ئاوگێڕ دوای هەمووان ئاو بخواتەوە:**

(منْ حديث أَبِى قَتَادَةَ الطويل أن النبي ﷺ قَالَ «..... إِنَّ سَاقِىَ الْقَوْمِ آخِرُهُمْ شُرْبًا »).[3] ئەبو قەتادە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (..... ئاوگێڕی کۆمەڵێ پاش هەموویان ئاو بخواتەوە).

**هـ ـ ناپەسەندە ئاوخواردنەوە لەدەمی کوندەوە:**

مەکروهە لە دەمی کوندەو هەرشتێکی لەو جۆرە وەك دەمی دەبەو بەلوعەو ئەو جۆرانە دەمی پێوەنێت‌و ئاوی لێ بخۆیتەوە چونکە لەوانەیە شتێکی خراپ یان زیان بەخشی تێدابێ‌و یەکسەر بڕواتە دەمیەوە. (عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ رضى الله عنه قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ اخْتِنَاثِ

١) رواه البخاري (٥٦١٩) ومسلم (٢٠٢٩/١٢٤).

٢) رواه البخاري (٥٦٣٠) ومسلم (٢٦٧/١٢١).

٣) رواه مسلم (٦٨١/٣١١).

الأَسْقِيَةِ . يَعْنِي أَنْ تُكْسَرَ أَفْوَاهُهَا فَيُشْرَبَ مِنْهَا).[1] ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ڕێگری کرد لە دەمەوخوارکردنەوەی کوندەو خواردنەوە لەدەمەکەیەوە) لەڕیوایەتێکدا دەڵێ: (سەرەوخوار بکرێتەوە ئینجا لێی بخورێتەوە).

**و- بەپێوە ئاوخواردنەوە ناپەسندە:**

(عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الشُّرْبِ قَائِمًا).[2] ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کرد لە ئاوخواردنەوە بەپێوە).

ئەم فەرموودەی ئەبو سەعید پێچەوانە نیە لەگەڵ ئەم فەرموودەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) (عن ابْنَ عَبَّاسٍ رضى الله عنهما أَنَّه قَالَ: سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنْ زَمْزَمَ فَشَرِبَ وَهُوَ قَائِمٌ).[3] دەڵێ: (لەئاوی زەمزەم ئاوم دا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) جا ئەویش خواردیەوە بەپێوە)..

ماناکانیان ڕێکدەخرێت بەوەی بووترێت ڕێگری کردنەکەی بۆ کەراهەتە.

**ز- خواردنو خواردنەوە لەقاپو قاچاغی ئاڵتونو زیودا حەرامە:**

(عن حُذَيْفَةُ رضي الله عنه قَالَ إِنِّي سَمِعْتُ النبيِ ﷺ يَقُولُ: « لاَ تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ وَلاَ الدِّيبَاجَ وَلاَ تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَلاَ تَأْكُلُوا فِي صِحَافِهَا فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا ولنا في الآخرة»).[4] حوزەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (لە پێغەمبەرم بیست (ﷺ) دەیفەرموو: (پۆشاکی ئاوریشمو دیباج[5] لەبەرمەکەن وەلە قاپو دەفری ئاڵتونو زیودا ئاو مەخۆنەوە خواردنیشی تێدا مەخۆن چونکە ئەوانە بۆ ئەوانە لەدنیا وەلەڕۆژی دوایی دا بۆ ئێمەیە).

---

١) رواه البخاري (٥٦٢٥) ومسلم (٢٠٢٣/١١١).

٢) رواه مسلم (٢٠٢٥/١١٥).

٣) رواه البخاري (٥٤٢٦) ومسلم (٢٠٦٧/٤).

٤) رواه البخاري (٥٤٢٦) ومسلم (٢٠٦٧/٤).

٥) دیباج: پۆشاکێکە قەراغەکانیو هەندێ شوێنی ئاوریشم بێت.

# کتێبی پزیشکی (الطب)

**یەکەم: چارەسەر بەشتی حەڵاڵ دروستە:**

(عن جَابِرٍ عن رسول اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قال لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ فإذا أُصِيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ بَرَأَ بِإِذْنِ اللَّــهِ عــز وجل).[1] جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەموویەتی: (هەموو دەردێك دەرمانی هەیە جا هەرکات دەرمانی ئەو دەردە دۆزرایەوە چاك دەبێتەوە بە ئیزنی خوای گەورە).

**دووەم: پشت بەستن بەخواو ئارامگرتن چاکترە:**

واتە ئەگەر کەسێك نەخۆش بوو ئەگەر پشت بەخوا ببەستێ‌و ئارام گربێ ئەوە چاکترو گەورەترە لەچارەسەرکردن، هەرچەندە چارەسەرکردنی دروستەو ڕەوایە.

(عن عَطَاءُ بن أبي رَبَاحٍ قال: قال لي ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما ألا أُرِيكَ امْرَأَةً من أَهْلِ الْجَنَّــةِ قلت بَلَى قال هذه الْمَرْأَةُ السَّوْدَاءُ أَتَتْ النبي ﷺ فقالت إني أُصْرَعُ وَإِنِّي أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللَّــهَ لي قال: إن شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَكِ فقالت أَصْبِرُ فقالــت إني أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللَّهَ أَنْ لَا أَتَكَشَّفَ فَدَعَا لها).[2] عەتای کوڕی ئەبی ڕەباح وتی: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) پێی ووتم: ئافرەتێکی بەهەشتیت پیشان بدەم؟ ووتم: بەڵێ، ووتی ئەو ئافرەتە ڕەش پێستەیە، هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: مـن فـێم لێـدێ‌و خـۆم ڕووت دەکەمەوە دەی دوعام بۆ بکە (چاك ببمەوە) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگـەر دەتـەوێ ئـارام بگرەو بەهەشت پاداشتە، ئەگەر دەتەوێ لەخوا دەپاڕێمەوە چاکت کاتەوە، ئافرەتەکە ووتی: ئارام

---

١) رواه مسلم (٦٩/٢٢٠٤).

٢) رواه البخاري (٥٦٥٢) ومسلم (٥٤/٢٥٧٦).

دەگرم، ووتی: بەڵام کاتێ فێم لێدێ خۆم ڕووت دەکەمەوە جا دوعام بۆ بکە خۆم ڕووت نەکەمەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) دوعای بۆ کرد).

**سێ یەم: چارەسەر بەشتی حەرام دروست نیە:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال نهى رسول اللَّهِ ﷺ عن الدَّوَاءِ الْخَبِيثِ).[1] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرمانی پیسی قەدەغەکرد) هەر شتێکیش پیس بێت حەرامە.

(عن أبي الدَّرْدَاءِ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ إِنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ الدَّاءَ وَالدَّوَاءَ وَجَعَلَ لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءً فَتَدَاوَوْا ولا تَدَاوَوْا بِحَرَامٍ).[2] ئەبو دەرداو (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان خوای گەورە دەردو دەرمانیشی دابەزاندووە، وە بۆ هەموو دەردێك دەرمانێکی داناوە، کەوابوو، -دەردەکانتان- چارەسەربکەن بەڵام چارەسەر بەشتی حەرام مەکەن).

**چوارەم: چارەسەر بەداغکردن و سوتاندن مەکروهە:**

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال الشِّفَاءُ في ثَلَاثَةٍ شَرْبَةِ عَسَلٍ وَشَرْطَةِ مِحْجَمٍ وَكَيَّةِ نَارٍ وَأَنْهَى أُمَّتِي عن الْكَيِّ).[3] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (چاکبوونەوە لە سێ شتدایە: هەنگوین خواردن و کەڵەشاخ گرتن و داغکردن، بەڵام من ئوممەتەکەم ڕێگریان لێدەکەم لە داغکردن).

**پێنجەم: کەڵەشاخ گرتن دروستە:**

(عن أَنَسٍ قال كان رسول اللَّهِ ﷺ يَحْتَجِمُ في الْأَخْدَعَيْنِ وَالْكَاهِلِ وكان يَحْتَجِمُ لِسَبْعَ عَشْرَةَ وَتِسْعَ عَشْرَةَ وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ).[4] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) کەڵەشاخی دەگرت لەپشت مل و ناوشانی وەلە ڕۆژانی حەڤدەو نۆزدەو بیستویەکەمی مانگدا کەڵەشاخی دەگرت).

---

١) رواه أبو داود (٣٨٧٠) والترمذي (٢٠٤٥) وابن ماجه (٣٤٥٩) وهو حديث صحيح.

٢) رواه أبو داود (٣٨٧٤) وهو حديث حسن بشواهده.

٣) رواه البخاري (٥٦٨١).

٤) رواه أبو داود (٣٧٦٠) والترمذي (٢٠٥١) وابن ماجه (٣٤٨٢) وهو حديث صحيح.

**شەشەم: دوعاکردن بۆ خۆپاراستن لەچاوپیسی شتی تر دروستە:**

(عن عَائِشَةَ قالت كان رسول اللَّهِ ﷺ إذا مَرِضَ أَحَدٌ من أَهْلِهِ نَفَثَ عليه بِالْمُعَوِّذَاتِ فلما مَرِضَ مَرَضَهُ الذي مَاتَ فيه جَعَلْتُ أَنْفُثُ عليه وَأَمْسَحُهُ بِيَدِ نَفْسِهِ لِأَنَّهَا كانت أَعْظَمَ بَرَكَةً من يَدِي).[1] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر کەسێکی خێزانەکەی نەخۆش بکەوتایە (قل أعوذ)وەکانی بەسەردا دەخوێندو فوی دەکرد بەسەریدا، کاتێ خۆی نەخۆش کەوت لە نەخۆشی وەفاتیدا من فوم دەکرد بەسەریدا دەستی خۆیم دەهێنا بەڕوومەتیدا چونکە دەستی ئەو لەدەستەکانی من بەبەرەکەت تربوون).

(عن عَوْفِ بن مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ قال كنا نَرْقِي في الْجَاهِلِيَّةِ فَقُلْنَا يا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ تَرَى في ذلك فقال اعْرِضُوا عَلَيَّ رُقَاكُمْ لَا بَأْسَ بِالرُّقَى ما لم يَكُنْ فيه شِرْكٌ).[2] عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: ئێمە لەسەردەمی نەفامیدا دوعاو نوشتەمان دەکرد جا بە پێغەمبەری خوامان ووت (ﷺ) لەو بارەیەوە ڕات چۆنە؟ فەرمووی: (دوعاو نوشتەکانتانم نیشاندەن. ئەگەر دوعاو نوشتە هاوبەشدانان بۆ خوای تێدانەبێ قەیناکات).

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ في الرُّقَى قال رُخِّصَ في الْحُمَةِ وَالنَّمْلَةِ وَالْعَيْنِ).[3] ئەنەسی کوڕی مالیک (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگەی دا بەدوعای چاوپیسی‌و گەستنی گیانداری ژەهراوی‌و برینی پێست).

---

١) رواه البخاري (٥٠١٦) ومسلم (٢١٩٢).

٢) رواه مسلم (٢٢٠٠).

٣) رواه مسلم (٢١٩٦/٥٨).

# پۆشاك و ڕازاوەیی ( اللباس و الزينة )

## پۆشاك و ڕازاوەیی ( اللباس والزينة )

حوكمی بەرگو پۆشاكو ڕازاوەیی لەبنەڕەتدا چ وەك پۆشاك بۆ لەبەركردن بێت یا بۆ ڕازاندنەوەی ماڵو جێگاو شوێن بێت دروستو حەڵاڵە بەبەڵگەی ئەو ئایەتانەی باسی منەتی خوای گەورە دەكەن كە هەرچی لەم دونیایەدایە بۆ مرۆڤەكانی دروستكردووە بۆئەوەی كەڵكو سوودی لیَ وەرگرن بەشێوەی پۆشاك خۆڕازاندنەوەو جوانیو بەكارهێنانو خۆش گوزەرانی پێكردن خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ البقرة: ٢٩ واتە: خوا ئەو زاتەیە هەموو ئەو شتانەی لەزەویدایە بۆ ئێوەی دروست كردووە. وە دەفەرمووێت: ﴿ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ﴾ إبراهيم: ٣٤ واتە: هەرچیتان داواكردووە پێی داون وە ئەگەر بتانەوێ بەهرەكانی خوا بژمێرن ناتوانن بیانژمێرن. هەروەها دەفەمووێت: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ قُلْ هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ الأعراف: ٣٢ واتە: (ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ كێ پۆشاكی جوانو خشڵو بژێوی خاوێنی كەخوا بۆ بەندەكانی بەدیهێناوە، لای وایە كەحەرامە، بڵێ ئەوانە لەژیانی دنیادا بۆ باوەڕدارانە (لەگەڵ بێ باوەڕانیشیدا بەڵام) لەڕۆژی دواییدا تایبەتە بەو باوەڕدارانە، ئابەم شێوەیە ئایەتەكانمان ڕوون دەكەینەوە بۆ كەسانێ كە دەزانن‌و تێدەگەن. وەخوا منەتی خۆی بەسەر بەندەكانیەوە باس دەكات لەو شتانەی بۆ دروستكردن‌و دفەرمووێت: ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمْ سَكَنًا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلْأَنْعَٰمِ بُيُوتًا تَسْتَخِفُّونَهَا يَوْمَ ظَعْنِكُمْ وَيَوْمَ

﴿إِقَامَتِكُمْ وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَا أَثَاثًا وَمَتَاعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴿٨٠﴾ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَالًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ وَسَرَابِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ﴾

**النحل:٨٠ – ٨١** واتە: خوای گەورە ماڵەکانتانی کردووە بەجێی دانیشتنو حەوانەوە، وەلە پێستی ئاژەڵیش ڕەشماڵو دەواری بۆ فەراهەم هێناون (هەڵدەدرێو دەگوێزرێتەوە) بەئاسانی لەڕۆژی کۆچو بارکردنتاندا وەلەڕۆژی مانەوەو نیشتەجێ بوونتاندا وە لە خوری و کوڵکو مووەکانیان شتومەکی ناوماڵ(یان لێ دروست دەکەن) کەکەڵکی لێ وەردەگرن لەماوەی ژیانیاندا وەخوا لەوەی دروستی کردووە سێبەری زۆر بۆ ئێوە بەدیهێناوە وەلە چیاکاندا پەناگاو ئەشکەوتی بۆ ڕەخساندونو جلو بەرگیشی بۆ بەدیهێناون لەکاتی شەڕو گەرمادا دەتانپارێزێ ئاوا خوا بەهرەکانی خۆی بۆ ئێوە تەواو دەکات بۆئەوەی گەردن کەچی بن.

لەم چەند ئایەتە پیرۆزەوە دەزانینو بۆمان ڕوون بوویەوە هەرچی پۆشاکو ڕازاوەیی‌و جوانی هەیە لەبنەڕەتدا حەڵاڵو ڕەوایە جگەلەوشتانەی کەبەڵگەی حەرامێتی لەسەریان هاتووە وەك:

**یەکەم: پۆشینی ئاوریشمو ئاڵتون بۆ پیاوان حەرامە:**

(عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه قال قال رسول الله ﷺ لا تلبسوا الحرير فإنه من لبسه في الدنيا لم يلبسه في الآخرة).[1] عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئاوریشم مەپۆشنو لەبەرمەکەن چونکە بەڕاستی ئەوەی لەدنیا ئاوریشم لەبەربکات لەدواڕۆژدا لەبەری ناکات).

بەڵام بۆ ئافرەتان حەڵاڵە: (عن أبي مُوسَى أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال أُحِلَّ الذَّهَبُ وَالْحَرِيرُ لِإِنَاثِ أُمَّتِي وَحُرِّمَ على ذُكُورِهَا).[2] ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئاڵتونو ئاوریشم حەڵاڵ کراوە بۆ ئافرەتانی ئوممەتەکەم حەرامیش کراوە بۆ نێرینەکانی ئوممەتەکەم).

---

١) رواه البخاري (٥٨٣٤) ومسلم (٢٠٦٩/١١).

٢) رواه نسائي (١٦١/٨) والترمذي (١٧٢٠) وقال حسن صحيح.

**أ- ئەو ئەندازەی پۆشینی دروستە لەئاوریشم:**

بۆ پیاوانو نێرینە ئەندازەیەکی کەم ئاوریشم دروستە لەجلو بەرگدا بپۆشرێت وەك لەم فەرموودەدا هاتووە: (عن أبي عُثْمَانَ قال كَتَبَ إِلَيْنَا عُمَرُ وَنَحْنُ بِأَذْرَبِيجَانَ أَنَّ النبي ﷺ نهى عن لُبْسِ الْحَرِيرِ إلا هَكَذَا وَصَفَ لنا النبي ﷺ إِصْبَعَيْهِ وَرَفَعَ زُهَيْرٌ الْوُسْطَى وَالسَّبَّابَةَ).[1] ئەبو عوسمان دەڵێ ئێمە لە ئەزربایجان بووین عومەر نامەیەکی بۆ نووسین (کە پێغەمبەر (ﷺ) ئاوریشمی قەدەغەکرد ئابەو شێوەنەبێ، دووپەنجەی بەرزکردەوە، جا زوهەیر[2] پەنجەی ناوەڕاستو شایەتومانی بەرزکردەوە).

(وفي لفظ مسلم: نَهَى نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ إِلاَّ مَوْضِعَ إِصْبَعَيْنِ أَوْ ثَلاَثٍ أَوْ أَرْبَعٍ).[3] وە لە گێڕانەوەیەکی موسلیم دا عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەر پۆشینی ئاوریشمی قەدەغە کرد مەگەر بەئەندازەی دوو پەنجە یا سێ پەنجە یا چوارپەنجە).

**ب - پۆشینی ئاوریشم لەبەر نەخۆشی دروستە بۆ پیاوان:**

(عن أَنَسٍ قال رَخَّصَ النبي ﷺ لِلزُّبَيْرِ وَعَبْدِ الرحمن في لُبْسِ الْحَرِيرِ لِحِكَّةٍ بِهِمَا).[4] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا مۆڵەتی دابە بەزوبەیر و عەبدوڕەحمان بەپۆشینی کراسی ئاوریشم لەبەر خوراندنێك کە پێیانەوە بوو).

**دووەم: ئاوریشم ڕاخستن دروست نیە:**

حەرامە ئاوریشم داخستنو لەسەردانیشتنی (عن حُذَيْفَةَ رضي الله عنه قال نَهَانَا النبي ﷺ أَنْ نَشْرَبَ في آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَأَنْ نَأْكُلَ فيها وَعَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ وَالدِّيبَاجِ وَأَنْ نَجْلِسَ عليه).[5] حوزەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری لێ کردین لەدەفرو قاپی ئاڵتونو

---

١) رواه البخاري (٥٨٢٩) ومسلم (٢٠٦٩/١٢).

٢) زوهەیر یەکێکە لەو کەسانەی ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە دوو پەنجەی بەرزکردەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) بەرزی کردبووەوە تاخەڵك بزانن پێغەمبەر (ﷺ) چۆنی کردووە.

٣) رواه مسلم (٢٠٦٩/١٥).

٤) رواه البخاري (٥٨٩) ومسلم (٢٠٧٦/٢٥).

٥) رواه البخاري (٥٨٣٧).

زیودا ئاو بخۆینەوەو خواردنیان تیا بخۆین، وەڕێگری کردین لە پۆشینی ئاوریشمو پۆشاکی ئاوریشمی تێکەڵە وەڕێگری کردین لەسەر ئاوریشم دانیشین).

**سێ یەم: ئاوریشمی ڕەنگ کراو بەزەرد:**

(عن عَلِيٍّ بن أبي طَالِبٍ قال نَهَانِي النبي ﷺ عن التَّخَتُّمِ بِالذَّهَبِ وَعَنْ لِبَاسِ الْقَسِّيِّ وَعَنْ الْقِرَاءَةِ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ وَعَنْ لِبَاسِ الْمُعَصْفَرِ).[1] عەلی کوڕی ئەبی تالیب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ڕەزای خوای لێ بێ) ڕێگری لێ کردین لە پۆشاکی کەتانی ئاوریشمدار و ڕێگری کردین لە قورئان خوێندن لە کوڕنوش و سوژدەدا و ڕێگری پۆشاکی ڕەنگکراو بە زەردی لێ کردین.).

**چوارەم: پۆشینی پۆشاکی بەناوبانگ حەرامە:**

(عن ابن عُمَرَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ أَلْبَسَهُ الله يوم الْقِيَامَةِ ثَوْبَ مَذَلَّةٍ).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس پۆشاکی شوهرەو بەناوبانگی لەبەرکات -لەدنیادا- لەڕۆژی دوایدا خوای گەورە پۆشاکی ریسوایی دەکاتە بەری).

**پێنجەم: ژن و پیاو پۆشاکی یەکتری لەبەرکەن حەرامە:**

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال لَعَنَ رسول اللَّهِ ﷺ الْمُتَشَبِّهِينَ من الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ وَالْمُتَشَبِّهَاتِ من النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ).[3] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرەتی کرد لەو پیاوانەی خۆیان وەك ئافرەتان لێدەکەن وەنەفرەتیشی کرد لەو ئافرەتانەی خۆیان وەك پیاوان لێدەکەن).

**شەشەم: سەر بۆیاخکردن بەڕەش حەرامە:**

ئەگەر پیاوێ یا ئافرەتێك سەری سپی بوویێت بەتەواوی لەتەمەنی ئەودا کەس سەری ڕەش نیە، ئەوە حەرامە بۆیاخی ڕەشی بکات ریشیش بەهەمان شێوە، بەڵام بەڕەنگێکی تر جگەلە ڕەش سوننەتە ڕەنگی بکات.

---

١) رواه مسلم (٢٠٧٨/٢٩).

٢) رواه أبو داود (٤٠٢٩) وابن ماجه (٣٦٠٦).

٣) رواه البخاري (٥٨٨٥).

(عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ قال أُتِيَ بِأَبِي قُحَافَةَ يوم فَتْحِ مَكَّةَ وَرَأْسُهُ وَلِحْيَتُهُ كَالثَّغَامَةِ بَيَاضًا فقال رسول اللَّهِ ﷺ غَيِّرُوا هذا بِشَيْءٍ وَاجْتَنِبُوا السَّوَادَ).[١] جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: لەڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا ئەبو قوحافەی باوکی ئەبو بەکریان هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) سەرو ڕیشی وەکو بەفر سپی بوو پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (ئەم -سەرو ڕیشەی- بەڕەنگێك بگۆڕن بەڵام خۆ لەڕەش بپارێزن).

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لَا يَصْبُغُونَ فَخَالِفُوهُمْ).[٢] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان جولەکەو گاورەکان بۆیاخ بەکارناهێنن -بۆ سەرو ڕیشیان- دەی ئێوە پێچەوانەی ئەوان بکەن). بۆیاخیان بکەن.

**حەوتەم: قژ لکاندن بەقژەوە حەرامە:**

دروست نیە ئافرەت قژو مووی ئافرەتی تر یان دروسکراو ببەستێ بەقژیەوە یاقژی ڕوتابێتەوەو قژ بلکێنێ بەسەریەوە ئەوە حەرامەو قەدەغەکراوە.

(عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِى بَكْرٍ قَالَتْ جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِىِّ ﷺ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِى ابْنَةً عُرَيِّسًا أَصَابَتْهَا حَصْبَةٌ فَتَمَرَّقَ شَعْرُهَا أَفَأَصِلُهُ فَقَالَ « لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ »).[٣]

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کچێکم هەیە بووکە، تووشی سورێژەبوو قژەکەی وەریوە ئایا قژی تری پێوە ببەستم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (نەفرینی خوا لەو ئافرەتەی کە قژ دەلکێنێ‌و ئەو ئافرەتەش کە قژەکەی بۆ دەلکێنێ).

(عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضى الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ « لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ، وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ »).[٤] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری

---

١) رواه مسلم (٢١٠٢).

٢) رواه البخاري (٥٥٥٩) ومسلم (٢١٠٣).

٣) رواه البخاري (٥٥٩١) ومسلم (٢١٢٢).

٤) رواه البخاري (٥٥٩٣) ومسلم (٢١٢٤).

خوا (ﷺ) فەرمووی: (خوا نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتەی کە قژەلکێنیو ئەو ئافرەتەش کەقژی بۆ دەلکێنن‌و ئەو ئافرەتەی خاڵ دەکوتیو ئەو ئافرەتەش خاڵی بۆ دەکوتن).

**هەشتەم: ئەنگوستیلەی ئاڵتون بۆ پیاوان حەرامە:**

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ فِي يَدِ رَجُلٍ فَنَزَعَهُ فَطَرَحَهُ وَقَالَ: «يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ إِلَى جَمْرَةٍ مِنْ نَارٍ فَيَجْعَلُهَا فِي يَدِهِ». فَقِيلَ لِلرَّجُلِ بَعْدَ مَا ذَهَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خُذْ خَاتَمَكَ انْتَفِعْ بِهِ. قَالَ لاَ وَاللَّهِ لاَ آخُذُهُ أَبَدًا وَقَدْ طَرَحَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنگوستیلەیەکی ئاڵتونی لەپەنجەی دەستی پیاوێکدا بینی، جا لەپەنجەی دەرهێناو فڕێی دا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کەسێکتان دەچێت پشکۆیەك لە ئاگردێنیو دەیکاتە دەستی) دواتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆشت ووترا بە پیاوەکە: ئەنگوستیلەکەت هەڵگرەوە کەڵکی لێ وەرگرە (بیفرۆشە) پیاوەکە ووتی هەرگیز هەڵیناگرمەوە لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەرامی کردووە.

**نۆیەم: پیاوو ئافرەت حەرامە لاسایی یەکرت بکەنەوە:**

حەرامە پیاوو ئافرەت خۆیان لەیەکتری بچوێنن چ لەجل‌و بەرگدابێت یان لەهەڵس‌و کەوتدابێت.

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال لَعَنَ رسول اللَّهِ ﷺ الْمُتَشَبِّهِينَ من الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ وَالْمُتَشَبِّهَاتِ من النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ).[2] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرەتی کرد لەو پیاوانەی خۆیان لە ئافرەتان دەچوێنن وە نەفرەتی کرد لەو ئافرەتانەی خۆیان لە پیاوان دەچوێنن).

(عن بن عَبَّاسٍ قال لَعَنَ النبي ﷺ الْمُخَنَّثِينَ من الرِّجَالِ وَالْمُتَرَجِّلَاتِ من النِّسَاءِ وقال أَخْرِجُوهُمْ من بُيُوتِكُمْ).[3] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) نەفرینی کردووە لەو پیاوانەی خۆیان وەك ئافرەتان لێدەکەن -لەقسە هەڵس‌وکەوت دا- وەنەفرین لەو ئافرەتانە کردووە خۆیان وەك پیاوان لێ دەکەن، وە فەرمووی: (لەماڵەکانتاندا دەریان بکەن).

---

١) رواه مسلم (٢٠٩٠).

٢) رواه البخاري (٥٥٤٦).

٣) رواه البخاري (٥٨٨١).

# کتێبی وەسیەت کردن ( الوصية )

**یەکەم: پێناسەکەی:**

لەزمانی عەرەبیدا بەمانای پەیوەسکردنو گەیاندن دێت، بۆیە بە وەسیەت دەڵێ (وصية) چونکە کابرای وەسیەتکەر ئەوەی لەژیاندا هەیبووە گەیاندویەتی بەپاش مردنی.

وەلەشەرعدا: پەیمانێکی تایبەتیە بەبەخشینیماڵو سامان یا هەر کارێکی تر کە پێی بکرێت لەپاش مردنی وەسیەت کەر.

**دووەم: وەسیەت بەقورئانو سوننەت ڕەواو ڕێگەپێدراوە:**

خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێت: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ ﴾ البقرة: ١٨٠ واتە: لەسەرتان پێویستکراوە هـەرکات کەسێکتان لـە سـەرەمەرگدا بوو ئەگەر ماڵو سامانی لەپاش بەجێما وەسیەت بکەن، وە خوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ﴾ النساء: ١١ واتە: لەپاش وەسیەتێك کە وەسیەتی پێکردبێ یـان قـەرزێك، هـەروەها دەفـەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ شَهَٰدَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ حِينَ ٱلْوَصِيَّةِ ٱثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ ﴾ المائـدة: ١٠٦) واتـە: ئـەی ئـەو کەسـانەی باوەڕتان هێناوە کاتێ کەسێکتان لەسەرەمەرگدابوو دوو کەسی دادپەروەر لە خۆتـان ـ موسـڵمان بن ـ شایەتی بدەن لەنێوانتاندا لەکاتی وەسیەت کردنتاندا.

(عن عبد اللّٰهِ بن عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ قال ما حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لـه شَـيْءٌ يُوصِي فيه يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ إلا وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ).[1] وە عەبدوڵڵای کوڕی عومـەر (ڕەزای خـوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفـەرمووێت: (حـەق نیـە بـۆ هـیچ کەسـێکی موسـڵمان

---

١) رواه البخاري (٢٧٣٨) ومسلم (١٦٢٧).

ئەگەر شتێکی هەبێ بیەوێ وەسیەتی تێدابکات دوو شەو بەسەری دا بڕوات مەگەر وەسیەتەکەی نوسرابێتو لە ژێر سەریدابێت). هەروەها زانایانی ئیسلام یەك دەنگن لەسەرئەوەی پێویستە.

**سێ یەم: حوکمی وەسیەتکردن:**

بەسەرنجدانی ئایەتەکانو فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و یەك دەنگی زانایان ڕوون بوویەوە کەوەسیەتکردن واجبە بۆ کەسێك لەنەخۆشی سەرەمەرگدابێت.

**چوارەم: ئەندازەکەی:**

وەسیەتکردن تاسێ‌یەکی ماڵی وەسیەتکەرەکە دروستە:

(عن بن سَعْدِ بن أبي وَقَّاصٍ رضي الله عنه قال: قَالَ جَاءَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ مِنْ وَجَعٍ اشْتَدَّ بِي فَقُلْتُ يا رسول اللَّهِ قد بَلَغَ بِي مَا تَرَى وَأَنَا ذُو مَالٍ وَلاَ يَرِثُنِي إِلاَّ ابْنَةٌ أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: «لاَ» . قُلْتُ فَالشَّطْرِ يا رسول اللَّهِ قَالَ: «لاَ». قُلْتُ فَالثُّلُثُ قَالَ: الثُّلُثُ وَالثُّلُثُ كَبِيرٌ أو كَثِيرٌ إِنَّكَ أَنْ تَذَرَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ من أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ الناس وَإِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بها وَجْهَ اللَّهِ إلا أُجِرْتَ بها حتى ما تَجْعَلُ في فِي امْرَأَتِكَ).[1] سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: لەحەجی ماڵئاواییدا نەخۆش کەوتم خەریك بوو بمرم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی کردم، پێم ووت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ): خۆت ئەبینی چەند نەخۆشم، منیش کەسێکی دەوڵەمەندم کەسیش نیە میرات گرم بێت جگەلە تاقە کچێك، ئایا دروستە دوو سێ‌یەکی ماڵەکەم بکەم بەخێر؟ فەرمووی: (نەخێر) ووتم: نیوەی بکەم بەخێر ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: (نەخێر) ووتم سێ یەکی بکەم فەرمووی سێ‌یەکی بکەو سێ‌یەکیش زۆرە، تۆئەگەر پاش خۆت منداڵت بەدەوڵەمەندی بەجێ بێڵی باشترە لەوەی بەهەژاری جێیان بێڵیو دەست لەخەڵکی پان بکەنەوە، تۆ هیچ خەرجییەك ناکێشیت کەمەبەستت پێی ڕەزامەندی خوابێت مەگەر خوا پاداشتت ئەداتەوە لەسەری تەنانەت ئەو پارەوش کە ئەیکەیت بەدەمی خێزانەکەتەوە.

---

١) رواه البخاري (١٢٩٥، ٢٧٤٢، ٢٩٣٦) ومسلم (١٦٢٨).

**پێنجەم: وەسیەت بۆ میراتگر دروست نیە:**

(عن عَمْرِو بن خَارِجَةَ أَنَّ النبي ﷺ يقول إِنَّ اللَّهَ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ ولا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ..).[1] عەمری كوڕی خارجە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان خوا مافی هەموو مافدارێكی داوە وەسیەت ناكرێت بۆ میراتگر).

(عن أَبِي أُمَامَةَ قال سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول إِنَّ اللَّهَ قد أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فلا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ).[2] ئەبو ئومامە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست فەرمووی: (بێگومان خوا مافی هەموو خاوەن مافێكی داوە كەواتە وەسیەتكردن دروست نیە بۆ میراتگر).

عن بن عَبَّاسٍ قال( لو أَنَّ الناس غَضُّوا من الثُّلُثِ إلى الرُّبُعِ فإن رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال الثُّلُثُ وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ).[3] عەبدوڵلای كوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: ئەگەر خەڵك وەسیەتكردنیان بكردایە بەچواریەك ئەوە باشتربوو چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (دەی سێیەك بكەو سێیەكیش زۆرە).

**شەشەم: كەی وەسیەتكردن حەرامە:**

ئەگەر وەسیەتكردن زیانگەیاندنی تێدابێت ئەوە حەرامەو دروست نیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ وَصِيَّةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٞ﴾ النساء: ١٢لەپاش وەسیەتێ وەسیەتی پێكرابێ یان قەرزێ كە بێ زیان بێ -بۆ میراتگر- ئەمە بڕیارە لەلایەن خواوە خواش زانای لەسەرخۆیە.

**حەوتەم: دانەوەی قەرز پێشدەخرێت لەبەجێهێنانی وەسیەت:**

(عَنْ سَعْدِ بْنِ الأَطْوَلِ أَنَّ أَخَاهُ مَاتَ وَتَرَكَ ثَلاَثَمِائَةِ دِرْهَمٍ وَتَرَكَ عِيَالاً فَأَرَدْتُ أَنْ أُنْفِقَهَا عَلَى عِيَالِهِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) « إِنَّ أَخَاكَ مُحْتَبَسٌ بِدَيْنِهِ فَاقْضِ عَنْهُ ». فَقَالَ يَا رَسُولَ

---

١) رواه ابن ماجه (٢٧١٢) والترمذي (٢١٢١) والنسائي (٢٤٧/٦) وهو حديث صحيح بشواهده.

٢) رواه ابو داود (٢٨٧٠) والترمذي (٢١٢٠) وابن ماجه (٢٧١٣) وهو حديث صحيح.

٣) رواه البخاري (٢٧٤٢) ومسلم (١٦٢٩).

اللَّهِ قَدْ أَدَّيْتُ عَنْهُ إِلاَّ دِينَارَيْنِ ادَّعَتْهُمَا امْرَأَةٌ وَلَيْسَ لَهَا بَيِّنَةٌ. قَالَ « فَأَعْطِهَا فَإِنَّهَا مُحِقَّةٌ»).[1]

سەعدی کوڕی ئەتوەل (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: براکەی مرد، سێ سەد درهەمو چەند هەتیوێکی لێ بەجێما، منیش ویستم پارەکەی بکەمە خەرجی منداڵەکانی، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (براکەت ڕاگیراوە بەهۆی قەرزاریەکەیەوە، کەواتە بۆی بدەرەوە) ئەویش ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموویم بۆ داوەتەوە دوو دیناری نەبێت، ئافرەتێك داوای دەکاتو شایەتی نیە فەرموی: (کەوابوو بیدەرەوە چونکە ئەو ڕاست دەکات).

**هەشتەم: گەورەو کاربەدەستی موسڵمانان قەرزی مردووی قەرزای نەبوو دەداتەوە:**

ئەگەر کەسێك مردو قەرزار بوو هیچی لێ بەجێنەما قەرزەکەی لێ بدەنەوە ئەوە کاربەدەستو گەورەی موسڵمانان قەرزەکەی بۆ دەداتەوە لە خەزێنەی دەوڵەت.

(عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ ( رضى الله عنه ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ( صلى الله عليه وسلم ) كَانَ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ الْمُتَوَفَّى عَلَيْهِ الدَّيْنُ فَيَسْأَلُ « هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِهِ فَضْلاً » . فَإِنْ حُدِّثَ أَنَّهُ تَرَكَ لِدَيْنِهِ وَفَاءً صَلَّى ، وَإِلاَّ قَالَ لِلْمُسْلِمِينَ « صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ » . فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْفُتُوحَ قَالَ « أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ ، فَمَنْ تُوُفِّىَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فَتَرَكَ دَيْنًا فَعَلَىَّ قَضَاؤُهُ ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ»).[2] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پیاوی مردووی قەرزاریان دەهێنایە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جا پرسیاری دەکرد (ئایا هیچ زیادەیەکی لێ بەجێماوە بۆ دانەوەی قەرزەکە) جا ئەگەر پێی بوترایە بەشی دانەوەی قەرزەکەی بەجێ هێشتووە نوێژی (مردووی) لەسەردەکرد، ئەگەرنا بەموسڵمانانی دەفەرموو: (نوێژیکەن لەسەر هاوەڵەکەتان) جا کاتێك خوای گەورە دەروی تەواوی لێ کردەوە فەرمووی: (من لە ئیماندار لە خۆیان لەپێشترم بۆیان جا هەرکەس لەئیمانداران مرد لەپاش خۆی قەرزی بەجێهێشت ئەوە دانەوەی لەسەر منە، ئەوەش لەپاش خۆی ماڵو سامانی بەجێهێشت ئەوە بۆ میراتگرەکانی).

---

١) رواه ابن ماجه (٢٤٣٣).

٢) رواه البخاري ٢٢٩٨. ومسلم ١٤/ ١٦١٩.

**نۆیەم: لەپێشەکی وەسیەتەکەدا ئەمە دەنوسرێت:**

(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ : كَانُوا يَكْتُبُونَ فِي صُدُورِ وَصَايَاهُمْ بسم الله الرحمن الرحيم هَذَا مَــا أَوْصَى بِهِ فُلاَنُ ابْنُ فُلاَنٍ أَوْصَى أَنَّهُ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لاَ رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ مَنْ فِي الْقُبُورِ وَأَوْصَى مَنْ تَرَكَ بَعْدَهُ مِــنْ أَهْلِهِ أَنْ يَتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَأَنْ يُصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِهِمْ وَيُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كَــانُوا مُــؤْمِنِينَ وَأَوْصَاهُمْ بِمَا وَصَّى بِهِ إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبَ ( يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ)) ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: هاوەڵان لەپێشەکی وەسیەتەکانیاندا ئەمەیان دەنوسی: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، ئەمە ئەو وەسیەتەیە فلانی کوڕی فلان کردویەتی: شایەتی ئەدا کە هیچ بەستراوێکی ڕاست نیە جگە لەخوای تاكو تەنیای بێ هاوتا وە موحەمەدیش بەندەو نێردراوی خوایە وەبێگومان ڕۆژی دوایی دێتو گومانی تێدانیە وەبەڕاستی خوا هەموو ئەوانەی لە گۆڕەکاندان زیندوویان دەکاتەوە، وە وەسیەت بکات بۆ ئەو کەسو کارەی لێ ی بەجێ‌ماوون لەخوا بترسنو نێوانیان چاك کەنو گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بن ئەگەر باوەڕدارن وەسیەتیان بۆ بکات بەو وەسێتەی کە ئیبراهیم و یەعقوب وەسێتیان پێکرد بۆ کوڕەکانیان (ڕۆڵەکانم بێگومان خوا ئایینی ئیسلام بۆ هەڵبژاردون کەواتە بەموسڵمانێتی نەبێ مەمرن).[1]

---

(١) رواه الداقطني (١٥٤/٤) (١٦) والبيهقي (٢٨٧/٦).

# دابەشکردنی میرات (الفرائض)

**یەکەم: پێناسەکەی:**

(فرائض) لە زمانی عەرەبیدا واتە: ئەندازە دیاریکراوەکان، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ فَنِصۡفُ مَا فَرَضۡتُمۡ ﴾ البقرة:٢٣٧ واتە: نیوەی ئەو ئەندازەیەی دیاری کردووە.

وەلەشەرعدا: ئەو بەشە دانراوەیە بۆ میراتگردانراوە.

وە میرات: هەموو ئەو شتانەیە لەمردوو بەجێ دەمێنێ لەماڵو سامان، پارەو پول بێت یان زەویو زارو هەرشتێکی تر نرخی ئەبێو حەڵاڵی بێت.

**دووەم: حیکمەتی دانانی میرات:**

دانانی میراتو دابەشکردنی لەنێوان میراتگرەکاندا چەندین حیکمەتی ڕوونی تێدایە لەوانە:

أ. ڕازی کردنی سروشتی مرۆڤ، خوای گەورە مرۆڤی وادروست کردووە منداڵی خۆی خۆش دەوێ بە درێژە پێدەری خۆی دەزانێ، بۆیە لەپێناویدا خۆی ماندودەکاتو هەوڵ دەدات بۆ منداڵەکانی پاش مردنی بەختەوەرین ببنە میراتگری ئەوەی باوکیان بۆ بەجێ‌هێشتوون، جا ئەگەر یاسای میرات نەبوایە مرۆڤ هەوڵی کارکردنی نەدەداو ئومێدی بەداهاتووی منداڵەکانی نەدەبوو، وە هەوڵو کۆششی بەفیڕۆ دەڕوات، لەوانەیە خەڵکانێکی تر بەری ڕەنجی بخۆن.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ أَمَلٗا ﴾ الكهف: ٤٦ واتە: سامانو منداڵ جوانیو ڕازاوەیی ژیانی دونیان، وە دەفەرمووێت: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ ﴾ آل عمران: ١٤واتە: خۆشی ئارەزووی ئافرەت منداڵی نێرینە بۆ خەڵکی ڕازێنراوەتەوە.

ب. هاوکاریو بەتەنگ یەکەوەبوون لەنێوان ئەندامانی خێزاندا، بەبۆنەی ئەو ماڵو سامانەی لەرێگەی کەلەپورەوە دەیانگاتێ، کەبێگومان بەرژەوەندیەکی گەورەی تێدایە.

ج. بەردەوام بوونی پەیوەندی خزمایەتی دوامردنی میرات لێبڕاوەکە، ئەوەش بەهۆی بەشداربوونی خزمو نزیکانی وەك براو خوشكو منداڵ لەماڵ کە لە مردووەکە بەجێ ماوە.

**سێ یەم: کارکردن بەیاسای میراتو کەلەپور دابەش کردن واجبە:**

دابەش کردنی میرات بەسەر میراتگرەکاندا واجبە بەبەڵگەی قورئانو سوننەتو یەك دەنگی زانایانی ئیسلام، دەبێ جێبەجێ بکریت بەو شێوەی کەباس کراوە بەبێ دەست کاریو هیچ زیادوکەم لێ کردنێك، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾ الأحزاب: ٣٦ واتە: بۆ هیچ پیاوو ئافرەتێکی باوەڕدار نیە کاتێ خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری هەرکارێکیان دا، سەرپشك بن لەکارەکەیاندا، وە هەرکەس سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بەگومڕابوونێکی ئاشکرا، وە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ النساء: ١٤. واتە: هەرکەس سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکاتو سنوورەکانی خوابشکێنێ دەیخاتە ئاگرێکەوە کەهەمیشەیی دەبێ تێیداو سزای ریسواکەری بۆ هەیە.

**چوارەم: ئەو مافانەی پەیوەندن بەمیراتەوە:**

پێنج شت پەیوەندی بەمیراتەوە هەیە کە بەم ڕیزبەندییەی خوارەوەیە:

**أ ـ کەلو پەلی قەرزکراو پێش مردن:**

وەك ڕەهن، ئەگەر شتێکی لەڕەهندا داناو تەنها ئەو شتەشی لێ بەجێ مابوو لەوکاتەدا دانەوەی قەرزی ئەو کەسەی مردوەکە ڕەهنی لاداناوە پێشترە لەخاوەن قەرزەکانی تر هەروەها ئەگەر مردووەکە شتێکی کڕیبێ بەقەرز هێشتا شتەکەی وەرنەگرتبوو مرد ئەوە فرۆشیارەکە لەهەموو شتێکی تر لەپێشترە کەقەرزەکەی بدرێتەوە هەتا پێش پارەی کفنو ناشتنی دەکەوێت.

**ب ـ خەرجی کفن و شۆردن و ناشتنی مردووەکە:**

ئەم خەرجیانە ئەگەر کەس‌وکاری نەیانخستە سەرخۆیان دەبێ لەماڵی خۆی بکرێت ئەمە پێشترە لەجێبەجێکردنی وەسیەت‌و بەشی میراتگران چونکە ئەمە پێویستەو زەرورە وەکو ڕێزنان لەمردووەکەو بەخاك سپاردنی.

**ج ـ ئەو قەرزانەی لەگەردنی مردووەکەدایە:**

پاش خەرجی بەخاك سپاردنی دانەوەی قەرزەکانی دێت کەلە گەردنیدایە ئەم قەرزدانەوە پێش دەخرێت لەوەسیەت‌و بەشی میراتگران، جا ئەو قەرزانە قەرزی خوابن وەك زەکات‌و نەزرو کەفارەت یان قەرزی خەڵك بن وەك قەرزی دەستی‌و شتی لەو بابەتە لەنێوان قەرزی خواو قەرزی خەڵکدا قەرزی خوا پێشدەخرێت.

**دـ وەسیەتکردن:**

ئەگەر مردووەکە وەسیەتی کردبێ بەمەرجێ لەسێ‌یەکی ماڵەکەی زیاتر نەبێت لەپاش دانەوەی قەرز جێبەجێ دەکرێ لەبەشی میراتگران پێش دەخرێت.

**هـ ـ بەشی میراتگران:**

ئەم بەشە لەکۆتایی مافەکانی میرات دا دێت، دابەش دەکرێت بەسەر میراتگراندا بەپێی بەشیان کە بۆیان دیاری کراوە.

**پێنجەم: مەرجەکانی میرات بردن لەمردوو:**

أـ مردنی میرات لێ براو بەدڵنیاییەوە یا لەڕیزی مردوواندا دانرێت وەك گوم بوون کەقازی بڕیاری مردنی بدات.

ب ـ لەژیاندا بوونی میراتگر پاش میرات لێ براوەکەی باساتێکی کەمیش بێت.

ج ـ پەیوەندی میرات گر بە مردووەکەوە زانراوو دیاربێت: خزمایەتیەو ژن‌و مێردایەتیە.

دـ ئەبێ ڕێگرێك لەڕێگرەکانی میرات نەبێ کەدواتر باسیان دەکەین.

**شەشەم: هۆیەکانی میرات:**

**أ- نەسەبو خزمایەتی:** خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ﴾ الأنفال: ٧٥). واتە: ئەوانەی پەیوەندی خزمایەتیان هەیە هەندێکیان شایستەترن -لەمیرات بردندا- بەهەندێکی تریان لە کتێبی خوادا- قورئان دا-.

**ب - ژنو مێردایەتی ڕاستو دروست:** خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ ﴾ النساء: ١٢ واتە: بۆ ئێوە نیوەی ئەو ماڵە هەیە ژنەکانتان بەجێی دێڵن.

**ج - دۆستایەتی نێوان کویلەو خاوەنەکەی:** (عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِىَّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ : « الْوَلاَءُ لُحْمَةٌ كَلُحْمَةِ النَّسَبِ لاَ يُبَاعُ وَلاَ يُوهَبُ »).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (دۆستایەتیش تێکەڵاوی‌و خزمایەتی یە هەروەك خزمایەتی نەسەب نافرۆشرێت‌و نابەخشرێت).

**حەوتەم: بەربەستو ڕێگرەکانی میرات:**

ڕێگرەکانی میرات دەبنە هۆی میرات نەبردنی ئەو کەسەی ئەگەر یەکێك لەم هۆیانە نەبوایە میراتی لەمردووەکەی دەبرد، سیانن.

**أ- کوشتن:** ئەگەر میراتگر بەناڕەوا میرات لێگیراو بکوژێت میراتی لێ نابات. (عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « الْقَاتِلُ لاَ يَرِثُ »).[2] ئەبو هوزەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بکوژ میرات نابات- لەکوژراوەکە-).

ب - جیاوازی ئایین: ئەگەر میراتگر لەگەڵ مردووەکەدا ئایینیان جیا بوو ئەو میراتی لێ نابات: (عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضى الله عنهما أَنَّ النَّبِىَّ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ « لاَ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ ، وَلاَ الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ »).[1] ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (موسڵمان میرات لە کافر نابات، کافریش میرات لە موسڵمان نابات).

---

١) رواه ابن حبان (٤٩٥٠) والحاكم (٤/٢٩٢-٢٩٣) والبيهقي (١٠/٢٩٢) وهو حديث صحيح.

٢) رواه الترمذي (٢١٩٢) وابن ماجه (٢٦٤٥) وهو حديث صحيح.

ج ـ کۆیلە: چونکە کۆیلە خۆیو هەرچی هەیە مولکی خاوەنەکەیەتی ئەگەر میرات ببات لەخزمی لەوکاتەدا بۆ خاوەنەکەی دەبێت نەك بۆ خۆی لەبەرئەوە میرات نابات لەخزمەکانی هەتا کۆیلەبێت.

**هەشتەم: میرات بەجوانی لەقورئاندا باس کراوە:**

سێ ئایەت لەقورئاندا بنەماکانی زانستی میرات دابەش کردنیو پایەو حوکمەکانی میراتیان لەخۆگرتووە کەئەمانەن: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ ۚ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ ۚ فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ ۚ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ ۗ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا ۚ فَرِيضَةً مِّنَ اللَّهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ النساء: ١١ واتە: خوا ئامۆژگاریتان دەکات دەربارەی (میراتی) ڕۆڵەکانتان کە بەشی نێرینەیەکیان ئەندازەی بەشی دوو مێینەیانە، خۆئەگەر منداڵەکان هەر ئافرەت بوون — دووان-و دووان زیاتر بوون ئەوە دووبەش لەسێ بەشی میراتەکە لەوان بەش دەکرێت، خۆ ئەگەر یەك ئافرەت بوو ئەوە نیوەی (میراتەکەی) بۆ هەیە، شەش یەکیش دەدرێت بەهەریەك لەدایكو باوکی (مردووەکە) ئەگەر منداڵی هەبوو، بەڵام ئەگەر منداڵی نەبوو تەنها دایكو باوکی هەبوو ئەوە سێیەکی بۆ دایکیەتی -ئەوی تریشی بۆ باوکی دەبێ- بەڵام ئەگەر چەند برایەکی هەبوو ئەوە شەش یەکی بۆ دایکی دەبێت لەپاش -دەرکردنی- وەسیەتێك وەسیەتی پێکرابێ —لەلایەن مردووەکەوە- یان دانەوەی قەرزێك -کەلەسەری بێت- باوکانو کوڕەکانتان نازانن کامەیان بەسوودترن بۆتان -ئەو دابەشکردنە- لەلایەن خواوە پێویست کراوە بێگومان خوا هەمیشە زانای کاربەجێیە.

---

١) رواه البخاري (٦٧٦٤) ومسلم (١٦١٤/١٢٣٣) وابن ماجه (٢٧٢٩).

وەخوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوا أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ وَصِيَّةً مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴾ النساء: ١٢واتە: وەنیوەی میراتی ژنەکانتان بۆ ئێوەیە ئەگەر منداڵیان نەبوو، بەڵام ئەگەر منداڵیان هەبوو ئەوە چواریەکی میراتی ژنەکانتان بۆ ئێوەیە، لەپاش وەسیەتێك وەسیەتیان پێکردبێ یا قەرزێك -لەسەریانە- وە چواریەکی ئەو میراتەی ئێوە بەجێتان هێڵاوە بۆ ژنەکانتان ئەگەر منداڵتان نەبوو بەڵام ئەگەر منداڵتان هەبوو ئەوە هەشت یەکیان بۆ هەیە لەو میراتەی بەجێیان هێڵاوە لە پاش وەسێتێك کردبێتان یا -دانەوەی- قەرزێك -لەسەرتان بووبێ- وە ئەگەر پیاوێك یا ئافرەتێك مرد و کەس نەبوو جگە لەبرایەك یاخوشکێك –ی دایکی- ئەوە هەریەکیان شەش یەك بەشیەتی، جا ئەگەر -براو خوشکی دایکی- لەیەك زیاتربوون ئەوە هەموویان هاوبەش دەبن لەسێیەکی میراتەکەیدا لەدوای وەسیەتێك کەکرابێ یا قەرزێك -بدرێتەوە- کەبێ زیان بێ ئەمە بڕیارە لەلایەن خواوە -بۆ ئێوە- وە خوا زانای لەسەرخۆیە.

وە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَا إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِن كَانُوا إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ النساء: ١٧٦ واتە: ئەی موحەمەد داوای فەتوات لێ دەکەن دەربارەی کەلالە -کەبریتی یە کەسێك باوكو نەوەی نەبێت- بڵێ خوا

فەتواتان بۆ دەدات دەربارەی کەلالە، ئەگەر پاوێك مرد منداڵی نەبوو تەنها خوشکێکی هەبوو ئەوە نیوەی میراتی برامردووەکەی دەبات وە ئەگەر ـ مردووەکە ئافرەت بوو ـ ئەو برایە میراتی خوشکە مردووەکە هەمووی دەبات ئەگەر خوشکە مردووەکەی منداڵی نەبێت بەڵام ئەگەر دوو خوشك بوون ـ دوای برا مردووەکەیان ـ ئەوە دوو سێ‌یەکی میراتی براکەیان دەبەن، وە ئەگەر میراتگرەکان چەند خوشكو برایەك بوون پیاوانو ئافرەتان ئەوە بۆ هەر نێرینەیەك ئەندازەی بەشی دوو مێینەی هەیە ئاوا خوا بۆتان ڕوون دەکاتەوە تا گومڕانەبن وە خوا بەهەموو شتێك زانایە.

وە چەند ئایەتێکی تر دەربارەی میرات هاتووە باسی مافی میراتگران دەکات بەکورتی کە ئەمانەن:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمُۢ ﴾ الأنفال: ٧٥. واتە: ئەوانەی پەیوەندی خزمایەتیان هەیە هەندێکیان شایستەترن ـ لەمیرات بردندا ـ بە هەندێکی تریان لە قورئانی خوادا.

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٞ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَۚ نَصِيبٗا مَّفْرُوضٗا ﴾ النساء: ٧. واتە: بۆ پیاوان بەشێك لەو میراتە هەیە کە باوكو دایكو خزمان بەجێی دێڵن ئیتر کەم بێت یان زۆر ئەمە بەشێکی پێویست کراوە لەلایەن خوای گەورە.

**نۆیەم: بەشدارانی میرات:**

لەم ئایەتانەداو چەندین ئایەتی تری قورئاندا بەشی ئەو کەسانەی میراتیان بەردەکەوێت دیاری کراوە:

**أ ـ میرات گران لەپیاوان:** ئەوانەی میرات دەبەن لە پیاوان دە کەسن کە ئەمانەن:

١. کوڕو کوڕی کوڕ بۆ خوارەوە: خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ ﴾ النساء: ١١واتە: (خوای گەورە لەبارەی ڕۆڵەکانتانەوە ئامۆژگاریتان دەکات بۆ نێرینە بە ئەندازەی بەشی دوو مێینە میرات هەیە).

٢ـ باوكو باوکی باوكو بۆ سەرەوە : خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ ﴾ النساء: ١١ واتە: (وە دایكو باوك بۆ هەریەکەیان شەش یەك هەیە، باپیریش وەك باوك وایە ئەگەر باوك نەبوو بەیەك دەنگی زانایانی ئیسلام).

٣ـ مامو کوڕی مامو دورتر: (قَالَ رسول الله ﷺ: « أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا ، فَمَا بَقِيَ فَهُوَ لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ »).[1] پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموویت: (بەشە میراتەکان بدەن بەخاوەنەکانیان جا ئەوەی مایەوە بۆ نزیکترین پیاوە لە مردووەکە).

٤. مێرد: قورئان دەفەرموویت: ﴿ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ ﴾ النساء: ١٢ واتە: (لەو میراتەی ژنەکانتان بەجێیان هێلاوە نیوەی بۆ ئێوەیە).

٥. براو کوڕی برا: خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَهُوَ يَرِثُهَا إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ﴾ النساء: ١٧٦واتە: (وە -ئەگەر مردووەکە ئافرەت بوو- ئەوە برا هەموو میراتی خوشکە مردووەکە دەبات ئەگەر خوشکە مردووەکە منداڵی نەبێت.

٦. ئازادکەری کۆیلە: ئەو پیاوەی کۆیلەیەك ئازاد دەکات. (عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ قال رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم: الْوَلاَءَ لِمَنْ أَعْتَقَ »).[2] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (دۆستایەتی کۆیلەی ئازادکراو بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردووە).

عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ( الْوَلاءُ لُحْمَةٌ كَلُحْمَةِ النَّسَبِ لا يُبَاعُ وَلا يُوهَبُ)

وە عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:

---

١) رواه البخاري (٦٧٤٦) و مسلم (١٦١٥/٢).

٢) رواه البخاري (٤٥٦) ومسلم (١٥٠٤).

(دۆستایەتی تێکەوڵایەو خزمایەتیە هەروەك خزمایەتی نەسەب نافرۆشرێتو نابەخشرێت).[١]

ب. میراتگران لە ئافرەتان: ئەو ئافرەتانەی میرات دەبن حەوتن کەئەمانەن:

١. کچو کچی کوڕ بۆ خوارەوە: خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ ﴾ النساء: ١١. واتە: خوای گەورە لەبارەی ڕۆڵەکانتانەوە ئامۆژگاریتان دەکات بۆ نێرینە بەئەندازەی بەشی دوو مێینە میرات هەیە.

٢. دایكو نەنكو بۆ سەرەوە، خوای گەورە دەفەرموویت:﴿ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ ﴾ النساء: ١١). واتە: (وە دایكو باوکی بۆ هەریەکەیان شەش یەك هەیە لەمیرات) .

٣. خوشك،: خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ﴾ النساء: ١٧٦ واتە: (ئەگەر پیاوێك مردوو منداڵی نەبوو تەنها خوشکێکی هەبوو ئەوە نیوەی میراتی براکەی دەبات).

٤. هاوسەر (ژن): خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ ﴾ النساء: ١٢ واتە: ژنەکانتان چواریەکی میراتی ئێوەیان دەکەوێت.

٥. ئازادکەری کۆیلە: کاتێ ئازادکەرەکە ئافرەت بێ کۆیلە ئازادکراوە بمرێت میراتی لێ دەبات، (عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ قال رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم: الْوَلَاءَ لِمَنْ أَعْتَقَ »).[٢] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (دۆستایەتی کۆیلەی ئازادکراو بۆ ئازادکەرەکەیەتی).

عن بِنْتِ حَمْزَةَ قالت( مَاتَ مَوْلَايَ وَتَرَكَ ابْنَةً فَقَسَمَ رسول اللَّهِ ﷺ مَالَهُ بَيْنِي وَبَيْنَ ابْنَتِهِ فَجَعَلَ لِي النِّصْفَ وَلَهَا النِّصْفَ)وە کچی حەمزە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: کۆیلەئازادکراوەکەم مردو کچێکی لێ بەجێما جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماڵەکەی لەنێوان منو کچەکەیدا دابەش کرد، نیوەی دابە من نیوەشی بەکچەکەی).[٣]

١) رواه ابن حبان (٤٩٥٠) والحاكم (٤/٢٩٢-٢٩٣) والبيهقي (١٠/٢٩٢) وهو حديث صحيح.

٢) رواه البخاري (٤٥٦) ومسلم (١٥٠٤).

٣) رواه ابن ماجه (٢٧٣٤) والحاكم (٤/٦٤) وهو حديث صحيح.

**دەیەم: ئەو کەسانەی میراتیان بەردەکەوێت:**

ئەو کەسانەی لەمردوو میرات دەبن‌و بەشیان دەکەوێت سیانن: بەش بۆ دیاریکراوەکان‌و میراتگران بەهۆی پشت‌و میراتگران بەهۆی خزمایەتیەوە.

## یەکەم

**بەش بۆ دیاریکراوەکان لە قورئاندا شەش بەشە نیو ٢/١ ، چواریەك ٤/١ ، هەشت یەك ٨/١، دوو سێ‌یەك ٣/٢، سێ‌یەك ٣/١، شەش یەك ٦/١.**

**١. ٢\١ نیو، بەشی ئەمانەیە:**

أ- مێرد: ئەگەر ژنەکەی کەمردووە منداڵی نەبێت ئەو مێردەکەی نیوەی میراتی ژنەکەی بەردەکەوێت خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ ﴾ النساء: ١٢). واتە: (-پیاوان- نیوەی میراتی ژنەکانتان دەکەوێت ئەگەر ژنەکانتان منداڵیان نەبوو).

**ب - کچی مردووەکە** خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ ﴾ **النساء: ١١. واتە: ئەگەر مردووەکە تەنها یەك کچی هەبوو ئەوە نیوەی میراتەکە بۆ ئەوە.**

**ج - کچی کوڕی مردووەکە: چونکە وەك کچی مردوو وایە بەیەك دەنگی زانایان.**

ئیبن مونزر دەڵێ: (زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کوڕی کوڕو کچی کوڕ لەشوێنی کوڕو کچی مردوەکەن نێرینەیان وەك نێرینەیەو مێینەیان وەك مێینەیە، ئەگەر مردووەکە کوڕی خۆی نەبوو).[١]

**د- خوشکی دایکی‌و باوکی یان باوکی بێت:**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ﴾ **النساء: ١٧٦**واتە: ئەگەر پیاوێك مردوو منداڵی نەبوو تەنها خوشکێکی هەبوو ئەوە نیوەی میراتی برا مردووەکەی دەبات.

---

١) بروانە (الإجماع لابن المنذر ص٧٩).

٢ـ ٤\١١ چواریەك، بەشی ئەم کەسانەیە:

أـ مێرد ئەگەر ژنە مردووەکەی منداڵی هەبێت: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡنَ ﴾ النساء: ١٢. واتە: (ئەگەر ژنەکانتان منداڵیان هەبوو ئەوە چواریەکی میراتەکەیان بۆ ئێوەیە).

ب ـ ژن ئەگەر مێردەکەی -کە مردووە- منداڵی نەبێت: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡتُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّكُمۡ وَلَدٌۚ ﴾ النساء: ١٢). واتە: (ژنەکانتان لەو میراتەی ئێوە بەجێتان هێڵاوە چواریەکیان دەکەوێت ئەگەر ئێوە منداڵتان نەبوو).

٣. ٨/١ هەشت یەك: بەشی ژنە -هاوسەر- کاتێ مێردەکەی بمرێ‌و منداڵی ببێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَإِن كَانَ لَكُمۡ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكۡتُم ﴾ النساء: ١٢. واتە: (ئەگەر ئێوە مردن‌و منداڵتان هەبوو ئەوە ژنەکانتان هەشت یەکی میراتی ئێوەیان بەردەکەوێت).

٤. ٣/٢ دوو سێ‌یەکی بەشی ئەمانەیە:

أ. دوو کچ‌و دوو کچی کوڕ: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ ﴾ النساء: ١١ واتە: (جا ئەگەر منداڵەکان ئافرەت بوون دووان و لەدووان زیاتر بوون ئەوە دوو سێ‌یەکی میراتەکە بۆ ئەوانە) وەك پێشتر باسمان کرد کچی کوڕیش وەك کچی مردووەکە وایە ئەگەر مردوەکە کوڕی نەبوو.

ب. دوو خوشکی دایکی باوکی یان دوو خوشکی باوکی: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ ﴾ النساء: ١٧٦.

٥. ٣/١ سێ‌یەك بەشی ئەمانەیە:

أ. دایك ئەگەر مردووەکە منداڵی نەبێت خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ ﴾ النساء: ١١ واتە: (جا ئەگەر مردووەکە منداڵی نەبوو تەنها دایكو باوکی میراتگری بوون ئەو بەشی دایکی سێ‌یەکە).

ب. دوو خوشکیو برای دایکی یان زیاتر: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ﴾ النساء: ١٢ . واتە: (وە ئەگەر پیاوێك یان ئافرەتێك مرد کەسی نەبوو جگەلە برایەك یان خوشکێکی –دایکی- ئەوە هەریەکەیان شەش یەك بەشیەتی، جائەگەر -براو خوشکی دایکی- لەیەکێك زیاتربوون ئەوا هەموویان هاوبەش دەبن لە سێ‌یەکی میراتەکەدا).

٦. ٦/١ شەش یەك بەشی ئەمانە دەبێت:

أـ دایك ئەگەر مردووەکە منداڵ یان چەند برایەکی هەبێ، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم ۚ مِّنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۗ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ ﴾ النساء: ١١.

واتە: (بۆ هەریەك لەدایكو باوکی –مردووەکە- شەش یەکی میراتەکەی دەبەن ئەگەر مردووەکە منداڵی هەبوو، بەڵام ئەگەر منداڵی نەبوو تەنها دایكو باوکی میراتگری بوون ئەوە بەشی دایکی سێ‌یەکە بەڵام ئەگەر چەند برایەکی هەبوو ئەوە بەشی دایکی شەش یەکە).

ب ـ نەنك ئەگەر دایك نەبوو:

ئیبن مونزیر دەڵێ: زانایان یەك دەنگن کە بەشە میراتی نەنك شەش یەکە ئەگەر مردووەکە دایکی نەبوو.[١]

---

١) بڕوانە (الإجماع ٨٤).

جـ. خوشکێك یان برایەکی دایکی: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ﴾ النساء: ١٢ واتە: (ئەگەر پیاوێك یا ئافرەتێك مردو کەسی نەبوو جگەلە برایەکی -دایکی- یا خوشکێکی -دایکی- ئەوە هەریەکەیان شەش یەك بەشیەتی).

د. کچی کوڕ لەگەڵ کچی مردووەکە: واتە لەکاتێکدا مردووەکە کە خۆی کچێکی هەیە، کچی کوڕێکیشی هەیە، لەو حاڵەتەدا کچی کوڕەکە شەش یەکی دەکەوێت.

(عن أَبِي قَيْسٍ سَمِعْتُ هُزَيْلَ بْنَ شُرَحْبِيلَ قَالَ سُئِلَ أَبُو مُوسَى عَنِ ابْنَةٍ وَابْنَةِ ابْنٍ وَأُخْتٍ فَقَالَ لِلابْنَةِ النِّصْفُ وَلِلأُخْتِ النِّصْفُ ، وَأْتِ ابْنَ مَسْعُودٍ فَسَيُتَابِعُنِي . فَسُئِلَ ابْنُ مَسْعُودٍ وَأُخْبِرَ بِقَوْلِ أَبِي مُوسَى فَقَالَ لَقَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ ، أَقْضِي فِيهَا بِمَا قَضَى النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – « لِلابْنَةِ النِّصْفُ ، وَلابْنَةِ ابْنٍ السُّدُسُ تَكْمِلَةَ الثُّلُثَيْنِ ، وَمَا بَقِيَ فَلِلأُخْتِ » . فَأَتَيْنَا أَبَا مُوسَى فَأَخْبَرْنَاهُ بِقَوْلِ ابْنِ مَسْعُودٍ ، فَقَالَ لاَ تَسْأَلُونِي مَا دَامَ هَذَا الْحَبْرُ فِيكُمْ).[1] ئەبو قەیس دەڵێ لە هوزیلی کوڕی شورەحبیلم بیست ووتی پرسیارکرا لەئەبو مووسا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەربارەی کچێك‌و کچی کوڕو خوشکێکەوە، ئەویش ووتی نیوەی ٢\١ بۆ کچەکە، نیوەش بۆ خوشکەکە، بڕۆ بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ئێستا ئەویش وەك من دەڵێ، ئینجا پرسیار لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود کرا، قسەکەی ئەبو مووساشیان پێووت ئەویش ووتی: بێگومان سەر لێ شێواو بووم‌و لەرێی ڕاست لامداوە، لەمەدا ئەو بڕیارە دەدەم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڕیاری پێداوە، کچەکە نیوە ٢/١ و کچی کوڕەکە شەش یەك ٦/١ تەواوکەری ٣/٢ دووسێیەك وە ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ خوشکەکە، جاهاتینەوە بۆلای ئەبو مووسا قسەکەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودمان بۆ باسکرد ئەویش ووتی: پرسیار لەمن مەکەن هەتا ئەو زاناو شارەزایەتان تێدابێت.

هـ ـ خوشکی باوکی لەگەڵ خوشکی دایکی‌و باوکی: ٣/٢ دووسێیەکی پێ تەواو دەکرێت، بەقیاس لەسەر کچی کوڕ لەگەڵ کچی مردووەکەدا.

---

١) رواه البخاري (٦٧٣٦).

و. باوك لەگەڵ منداڵی مردووەكەدا: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞۚ ﴾ النساء: ١١). واتە: (باوكو دایكی هەریەكەیان شەش یەكی دەكەوێت ئەگەر مردووەكە منداڵی هەبێت).

ز. باپیر ئەگەر باوك نەبوو: ئیبن مونزیر دەڵێ: زانایان یەك دەنگن كە حوكمی باپیر حوكمی باوكە ئەگەر باوك نەبوو. [١]

١) بروانە (الإجماع). ٨٤

## دووەم

## میراتگران بەهۆی پشتەوە (العصبة):

**یەکەم: پێناسەکەی:** لەزمانی عەرەبیدا (عصبة): خزمی پیاوە لەسەری باوکیەوە، بۆیە ئەو ناوەی لێ نراوە چونکە دەوریان داوە وەك شتێك دەوری شتێك بدات ئەو ووشەی بۆ بەکاردەهێنن.

لەشەرعدا: ئەو کەسەیە هەموو میراتەکە دەبات ئەگەر بەتەنها بوو، یان ئەوەی مایەوە لەبەشدارە دیاریکراوەکان دەیبات ئەگەر تەنها نەبوو، وە هیچ نابات ئەگەر لەبەشدارە دیاریکراوەکان هیچ نەمایەوە.

**دووەم: ڕەوایی میرات بردن بەهۆی پشتەوە:** لەقورئانو سوننەتدا بەڵگە هەیە لەسەر ڕەوابوونی میرات بردن لەڕێگەی عەصەبە و پشتەوە، قورئان دەفەرموویێت: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ ﴾ النساء: ١١

واتە: (خوای گەورە ئامۆژگاریتان دەکات دەربارەی ڕۆڵەکانتان بۆ نێرینەیەك بە ئەندازەی بەشی دوو مێینە میرات هەیە). وە دەفەرموویێت: ﴿ وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ ﴾ النساء: ١٧٦) واتە: (وە ئەگەر چەند براو خوشکێك بوون ئەوە براکان دوو ئەوەندەی خوشکەکانیان میرات هەیە ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە ئاشکرایان کرد کە کوڕو برا میرات دەبەن بەهۆی پشتەوە -عەصەبەوە- وە هەریەك لەبراو لەکوڕ خوشکی کردووە بەعەصەبە بەشی نێرینەکان دوو ئەوەندەی مێینەکان بووە لەم حاڵەتەدا).

وەلە سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمە ڕوون کراوەتەوە، (عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عن النبي ﷺ و زيد بن خالد الجهني قال أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا فما بقى فَهُوَ لِأَوْلَى رَجُلٍ

ذَكَرٍ).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بەشەکان بدەن بەخاوەن بەشەکان جا ئەوەی مایەوە بۆ نزیکترین میراتگری نێرە).

**سێیەم: بەشەکانی پشت (عصبە):** عەصەبە دوو بەشە: عەصەبەبە هۆی خزمایەتیەوە، عەصەبە سەبەبی.

**أ- عەصەبەی سەبەبی:** مەبەست پێی ئازادکەری کۆیلەیە ئەگەر مردووەکە کاتی خۆی کۆیلە بووبێ‌و کەسێك ئازادی کردبێت -جائازادکەرەکە پیاو بووبێت یان ئافرەت- ئەم بەشەیان بەوەندە کۆتایی دێنین چونکە لەئەمڕۆدا نیە بەڵکو تەنها وەك باسێکی مێژوویی باسی لێوە دەکرێ.

**ب - عەصەبەی خزمایەتی (نسبي):** هەموو ئەوکەسانەن لەباسی بەشدارە دیاریکراوەکانی پیاواندا باسمان کردن جگە لەمێردو برای دایکی ئەم دووانە بەشداری دیاریکراوی پیاوانن بەڵام عەصەبە نین کەواتە ئەم کەسانە دەگرێتەوە باوك‌و باپیرو کوڕو کوڕی کوڕ، برای دایکی‌و باوکی‌و کوڕی برای باوکی‌و مامەی دایکی‌و باوکی، مامەی باوکی‌و ئامۆزای دایکی‌و باوکی، ئامۆزای باوکی ئەمانە هەموویان عەصەبەن هەموویان بەهۆی عەصەبەو پشتەوە میرات دەبەن باهەندێکیان بەبەشداری دیارکراویش بەش دەبەن.

**ئاگاداری: عەصەبەی پشتی سێ بەشە:**

عەصەبەی سەربەخۆو عەصەبە بەهۆی کەسێکی ترەوەو عەصەبە لەگەڵ کەسێکی تردا.

**أ- عەصەبەی سەربەخۆ:** ئەو پیاوانەن میراتی دیاریکراویان هەیە جگەلە مێردو برای دایکی.

**ب - عەصەبە بەهۆی کەسێکی ترەوە:** ئەمانە کچ یا کچەکان‌و کچ یاکچانی کوڕ، خوشك یا چەند خوشکێکی باوکی خوشکێکی یا چەند خوشکێکی دایك‌و باوکی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن كَانُوٓاْ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ﴾ النساء: ١٧٦). واتە: (ئەگەر چەند خوشك‌و برایەك بوون ئەوە بۆ براکان دوو ئەوەندەی خوشکەکان میرات هەیە).

---

١) رواه البخاري (٦٣٥١) ومسلم (١٦١٥).

**ج ـ عەصەبە لەگەڵ كەسێكی تردا:** كە ئەمانەن خوشكێكی دایكی و باوكی یا چەند خوشكێكی دایكی و باوكی لەگەڵ كچدا یا كچی كوڕدا هەروەها خوشكێكی باوكی یا چەند خوشكێكی باوكی لەگەڵ كچدا یا كچی كوڕدا، بەبەڵگەی فەرموودەی (وما بقي فللأخت).[1] (ئەوی مایەوە ئەوە بۆ خوشكە).

---

١) رواه البخاري (٦٧٣٦).

## سێیەم

## میراتگران بەهۆی خزمایەتیەوە:

ئەو خزمانەن لەکاتی نەبوونی بەشداری بەش بۆ دیاریکراوو عەصەبە دابەش دەبن، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ الأنفال: ٧٥. واتە: (ئەوانەی خزمی یەکترن هەندێکیان لە پێشترن بۆ هەندێکیان لە قورئانی خوادا).

(عَنْ أَبِى أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قَالَ كَتَبَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ إِلَى أَبِى عُبَيْدَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « اللَّهُ وَرَسُولُهُ مَوْلَى مَنْ لاَ مَوْلَى لَهُ وَالْخَالُ وَارِثُ مَنْ لاَ وَارِثَ لَهُ»).[1] ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب نامەیەکی بۆ ئەبو عوبەیدە نووسی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خواو پێغەمبەر دۆستو پشتیوانی ئەو کەسەن دۆستو پشتیوانی نیە خاڵیش میراتگری خوشکەزای دەبێت ئەگەر میراتگری نەبوو).

(عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ مَوْلًى لِلنَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- وَقَعَ مِنْ عِذْقِ نَخْلَةٍ فَمَاتَ فَقَالَ النَّبِىُّ -صلى الله عليه وسلم- « انْظُرُوا هَلْ لَهُ مِنْ وَارِثٍ ». قَالُوا لاَ. قَالَ « فَادْفَعُوهُ إِلَى بَعْضِ أَهْلِ الْقَرْيَةِ »).[2] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: کۆیلەیەکی ئازادکراوی پێغەمبەر لەپەلی دارخرمایەك کەوتە خوارەوەو مرد جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (سەیریکەن ئایا میراتگر هەیە؟) ووتیان: نەخێر فەرمووی: (میراتەکەی بدەن بەهەندێ لەخەڵکی گوندەکەیان).

- ئەگەر بەشدارەکان زۆربوون عەول دەکرێت:

عەول: ئەوەیە بەشدارەکان زیاترین لە بەشەکان بەجۆرێ هەندێ لە خاوەن بەشەکان میراتی بەرناکەوێ، لەوکاتەدا ناچار دەبین بەشەکان زیادکەین تا هەموو خاوەن بەشەکان میراتیان بەرکەوێت ئەمەش بەکەم کردنەوەی بەشەکان دەبێت بەڵام کەس بێ بەش نابێ لەوانەی مافی میرات بردنیان هەیە.

---

١) رواه الترمذي (٢١٠٣) وابن ماجه (٢٧٣٧).

٢) رواه أبو داود (٢٩٠٢) والترمذي (٢١٠٥) وابن ماجه (٢٧٣٣) وهو حديث صحيح.

یەکەم ڕووداو کە عەولی تێداکرا لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب دا (ڕەزای خوای لێ بێ) ڕووی دا ئەویش پرس‌و ڕای بە هاوەڵان کرد، زەیدی کوڕی سابیت (ڕەزای خوای لێ بێ) پێشنیاری عەولی بۆ کرد عومەریش ووتی: عەول بکەن لەبەشەکاندا وهاوەڵانیش ئەم کارەی عومەریان پەسەندکرد ئیتر ئەمە بوویە کۆ دەنگی لەناو هاوەڵاندا لەسەر حوکمی عەول‌و کارپێکردنی.

بنچینەی مەسەلەکانی حەوتن، سسیانیان عەولی تێدادەکرێت، چواریان عەولی تێداناکریت:

ئەوانەی عەولی تێدادەکرێ ئەمانەن شەش‌و دوانزە‌و بیست‌و چوار، ئەوانەش عەولیان تێدا ناکرێ ئەمانەن: دوو و سێ و چوار و هەشت.

ـ منداڵی زیناو منداڵی نەفرین لێکراو: تەنها لەدایك‌و خزمانی دایك میرات دەبەن بەپێچەوانەشەوە، (عن سهل بن سعد الأنصاري في حديث الملاعنة ابنها يدعى إلى أمه ثم جرت السنة أنه يرثها وترث منه ما فرض الله لها).[1] سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) لەفەردوودەی (ملاعنە)دا دەڵێ: کوڕەکە بەناوی دایکیەوە بانگ دەکرا پاشان سوننەت وایلێهات کەئەو کوڕە میراتی لەدایکی دەبات‌و دایکیشی میرات لەو دەبات ئەو بەشەی خوای بۆ دیاری کردووە.

ـ منداڵ دەنگی گریانی بێ میرات دەبات:

ئەگەر منداڵێك تازە لەدایك بوو دەنگی لێوەهات یاگریا ئەوە میرات دەبات چونکە ئەو دەنگ هاتنە نیشانەی زیندوویی‌و گیان تێدابوونە، (عن أبي هُرَيْرَةَ عن النبي ﷺ قال إذا اسْتَهَلَّ الْمَوْلُودُ وُرِّثَ).[2] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر مندڵێ لەدایك بوو دەنگی لێوەهات ئەوە میرات دەبات).

---

١) رواه البخاري (٥٣٠٩) ومسلم (١٤٩٢/٢).

٢) رواه ابو داود (٢٩٢٠) وهو حديث صحيح بشواهده.

# ڕێگری لە میرات بردن (الحجب)

**یەکەم: پێناسەکەی:** لەزمانی عەرەبی دا (حجب) بەمانای ڕێگریو بەربەستە وەك ڕێگری لە ڕۆیشتنە ژوورەوە وە (حاجب) بەکەسێك دەڵێن کەڕێگری دەکات لەڕۆشتنە ژوورەوە بۆلای پاشا.

لەشەرع دا: ڕێگری کردنی میراتگرە لەهەموو میراتەکەی یان بەشێکی میراتەکەی، کەواتە حەجب بۆ کەسێکە کە هۆی میرات وەرگرتنی تێدابێت بەڵام کەسێك هۆی میراتگرتنی نەبێ ئەوە حەجب بۆ ئەو بەکارناهێنرێ.

**دووەم: بەشەکانی ڕێگری لەمیرات بردن:**

**أ- جیاوازی ئایین:** (عن أُسَامَةَ بن زَيْدٍ رضي الله عنهما أَنَّ النبي ﷺ قال لَا يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ ولا الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ).[1] ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کافر میرات لەموسڵمان ناباتو موسڵمانیش میرات لەکافر نابات).

**ب - بکوژ میرات نابات:** ئەگەر کەسێك کەسێکی کوشت، میراتی کوژراوەکە بکوژەکەی لێ بێ بەش دەکرێ. (عن أبي هُرَيْرَةَ عن النبي ﷺ قال الْقَاتِلُ لَا يَرِثُ).[2] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بکوژ میرات نابات). لەمیراتی کوژراوەکە.

**ج - کۆیلایەتی:** چونکە کۆیلە خۆشی موڵکی خاوەنەکەیەتیو کۆیلە خاوەنی هیچ نیە.

**د- کەمکردنەوەی بەشی میراتگر:** ئەوەیە یەکێك لە میرات گرەکان بەشەکەی کەم دەبێتەوە بەهۆی بوونی میراتگرێکی ترەوە ئەم کەمکردنەوەش بۆ پێنج کەسە کەئەمانەن:

١- مێرد: بەشە میراتەکەی لە نیوە وەکەم دەبێتەوە بۆ چواریەك ئەگەر ژنەکەی منداڵی هەبوو.

٢- ژن: بەشە میراتەکەی لە چواریەکەو کەم دەبێتەوە بۆ هەشت یەك ئەگەر مێردەکەی منداڵی هەبوو.

---

١) رواه البخاري (٦٧٦٤) ومسلم (١٦١٤/١).

٢) رواه ابو داود (٤٥٦٤) والنسائي (٩٧/٤) والدارقطني (٩٦/٤، ٩٧) (٨٧، ٨٨) وهو حديث صحيح بشواهده.

**٣ـ دایك:** لەسێ یەكەو كەم دەبێتەوە بۆ شەش یەك ئەگەر مردووەكە منداڵی هەبوو.

**٤ـ كچی كوڕ:**

**٥ـ خوشكی باوكی:**

**ه ـ بێبەش بوون لەمیرات:** ئەوەیە كەسێك كە میراتگرە هیچ میراتی بەرناكەوێت بەهۆی بوونی میراتگرێكی ترەوە وەك برا هیچ نابات ئەگەر مردووەكە كوڕی هەبوو، یان كوڕی كوڕ هیچ نابات ئەگەر مردووەكە كوڕی هەبوو، بەڵام شەش كەس لە میراتگران هیچ كات بێبەش نابن لەمیرات كەئەمانەن:

دایك‌و باوك، كچ‌و كوڕ، ژن‌و مێرد، جگە لەم شەش كەسە هەموو میراتگرەكانی تری دەگونجێ لەهەندێ كات دا بێبەش بن لەمیرات وەرگرتن.

وەبێبەش بوونی میراتگران لەمیرات لەسەر دوو بنەما دامەزراوە كە ئەمانەن:

١ـ ئەگەر كەسێك خزمایەتیەكەی بەهۆی كەسێكی ترەوە دەگەشتەوە بەمردووەكە ئەوە بێبەش دەبێ لەمیرات ئەگەر ئەو كەسە خۆی لە ژیاندابێت، وەك كوڕی كوڕ بێبەش دەبێ ئەگەر كوڕەكە خۆی هەبێت جگەلە كوڕی دایك لەگەڵ بوونی دایكیشدا میرات دەبات.

٢ـ خزمی نزیك پێشدەخریت بەسەر خزمی دووردا بۆ نموونە برا مامە بێبەش دەكات بەڵام ئەگەر خزمەكان لەیەك پلەدابن ئەوە كامیان خزمایەتیەكەی بەهێزترە پێشدەخرێت وەك برای دایك‌و باوكی برای باوكی بێبەش دەكات.

# تۆڵەی تاوانەکان ( الحدود )

**یەکەم: پێناسەکەی:**

لەزمانی عەرەبی دا (حدود) کۆی (حد)ە بەمانەی ڕێگرتنە، کە ناهێڵێ دوو شت تێکەڵ بن ، لە شەرع دا : تۆڵەیەکی دیاری کراوە لە شەرع دا دانراوە بۆ پاراستنی مافی خوا.[1]

ئەو تۆڵانە لە ئیسلام دا بۆ ئەوە دانراون خەڵك ئەو تاوانانە نەکەن کە زیانیان بۆ هەموو کۆمەڵگا هەیە بەگشتی . چونکە ئەگەر تاوانباران سزا بدرێن لەسەر تاوانەکانیان خەڵکانی تری پێ تەمبێ دەبێ .

**دووەم: بەشەکانی سزا**

ئەو سزایانەی ئیسلام دایناوە لەبەرانبەر تاوانەکاندا دوو بەشە : تۆڵەکان و تەمبیەکان پێشتر پێناسەی تۆڵەکانمان کرد، تەمبیەش: تۆڵەیەکە دیاریکراونیە بەڵکو قازی خۆی دیاری دەکات کە لەگەڵ ئەو تاوانەدا گونجاوبێت وە شیاوی تاوانبارەکە بێت.

**سێ یەم: تۆڵە دیارکراوەکان**

تۆلە دیارکراوەکان شەشن : تۆلەی زینا ، تۆڵەی بوختانی زینا ، تۆڵەی دزی ، تۆڵەی ئارەق خواردنەوە ، تۆڵەی ڕێگری، تۆلەی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام .

**چوارەم: گەورەیی جێبەجێ کردنی تۆڵەکان:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ حَدٌّ يُعْمَلُ بِهِ فِي الأرض خَيْـرٌ لِأَهْـلِ الأرض مـن أَنْ يُمْطَرُوا أَرْبَعِينَ صَبَاحًا).[2] ئەبوهورەیرە ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ

---

١) مافی خوا: واتای مافی گشتی ،هەرمافێکیش مافی خوابێت لێ خۆش بوون نیە تێدا بە پێچەوانەی مافی تاکەوە کە خاوەنەکەی دەتوانێ لە بەرامبەرەکەی خۆش بێت .

٢) رواه ابن ماجة (٢٥٣٨ ) وهو حديث حسن

فەرمویەتی (تۆڵەی تاوانێك جێبەجێ کرێت لە زەویدا بـۆ خـەڵکی لـەوەی چـل ڕۆژ بارانیـان بـۆ ببارێ پاکترە).

**پێنجەم: پۆشینی ئیماندار**

ئەگەر باوەڕدارێك تاوانێکی کرد سونتە بپۆشرێت و ئاشکرا نەکرێت مەگـەر زیـانی گـەورەی لێ بکەوێتەوە ئەو کاتە دروست نیـە پۆشـینی. (قال: رســـول الله ﷺ كُـــلُّ أُمَّتِـــي مُعَـــافًى إلا الْمُجَاهِرِينَ وَإِنَّ من الْمُجَاهَرَةِ أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ عَمَلًا ثُمَّ يُصْبِحَ وقد سَتَرَهُ الله فَيَقُولَ يـــا فُلَانُ عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا وَكَذَا وقد بَاتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللَّهِ عنه).[1] پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی (هەموو ئوممـەتی مـن چاوپۆشـی لێ دەکـرێ جگـە لەوانـە تاوانـەکانیان ئاشـکرا دەکـەن . ئـەو ئاشـکراکردنەش ئەمەیـە کـە کەسـێك تاوانێـك بکـات لەشـەودا پاشـان کـە ڕۆژ دەکاتەوە خوای گەورە تاوانەکەی بۆ پۆشیوە ، ئەنجا دەڵێ : فلان کەس من دوێنێ ئـەوەو ئـەوەم کرد کە بێگومان پەروەردگاری بۆی پۆشیبوو بەڵام ئەو کە ڕۆژ دەکاتەوە داپۆشینەکەی خوا بۆی کردبوو ئاشکرای دەکات).

(..وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ الله فِي الـــدُّنْيَا وَالْـــآخِرَةِ..)[2] وە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفـەرموێ (هەرکەس موسوڵمانێك بپۆشێ خوا لە دونیا و دوارۆژدا دەیپۆشێت ).

**شەشەم: تکاکردن بۆ جێ بەجێ نە کردنی تۆڵەکان :**

دروست نیە دوا ئەوەی تاوانبار تاوانەکـەی گەیـشتە لای قـازی تکـا بکرێـت تۆڵـەی تاوانەکـەی بەسەردا جێبەجێ نەکرێت.

(عَنْ عَائِشَةَ – رضى الله عنها أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّتْهُمُ الْمَرْأَةُ الْمَخْزُومِيَّةُ الَّتِى سَرَقَتْ فَقَالُوا مَنْ يُكَلِّمُ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلاَّ أُسَامَةُ حِبُّ رَسُولِ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – . فَكَلَّمَ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – فَقَالَ « أَتَشْفَعُ فِى حَدٍّ مِنْ حُـــدُودِ اللَّهِ » . ثُمَّ قَامَ فَخَطَبَ قَالَ « يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا ضَلَّ مَنْ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ الـــشَّرِيفُ تَرَكُوهُ ، وَإِذَا سَرَقَ الضَّعِيفُ فِيهِمْ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ ، وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ

---

١) رواه البخاري (٦٠٦٩ ) و مسلم (٢٩٩٠ ) .

٢) رواه مسلم (٢٦٩٩)

لَقَطَعَ مُحَمَّدٌ يَدَهَا »).[١] عایشە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەڵێ: قوڕەیشیەکان ئەو ئافرەتە مەخزومییەی کە دزی کردبوو زۆر خەفەتباری کردبوون جا ووتیان: کێ لە بارەیەوە قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوا دەکات جا کێ لە ئوسامەی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ـ علیە الصلاة وسلام دەوێرێ بەو قسەیە ، ئەنجا ئوسامەش قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا کرد علیە الصلاة وسلام ئەویش فەرمووی: (تۆ لەتۆڵەیەك لە تۆڵەکانی خوا دا تکا دەکەیت) پاشان هەستایە سەرپێو ووتارێکی دا و فەرمووی ( ئەی خەڵکینە بێگومان خەڵکانی پێش ئێوە بۆیە گومڕابوون چونکە ئەگەر کەسێ ناودارو گەورە دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا بەڵام ئەگەر کەسێ لاواز لەناویاندا دزی بکردایە سزایان بەسەردا جێ بەجێ دەکرد سوێند بە خوا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەمەد دزی بکات موحەمەد دەستی دەبڕێت).

**حەوتەم: جێ بەجێ کردنی تۆڵەکان دەبێتە کە فارەتی تاوانەکە :**

(عن عُبَادَةَ بن الصَّامِتِ قال كنا مع رسول اللَّهِ ﷺ في مَجْلِسٍ فقال تُبَايِعُونِي على أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شيئا ولا تَزْنُوا ولا تَسْرِقُوا ولا تَقْتُلُوا النَّفْسَ التي حَرَّمَ الله إلا بِالْحَقِّ فَمَنْ وفي مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ على اللَّهِ وَمَنْ أَصَابَ شيئا من ذلك فَعُوقِبَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ له وَمَنْ أَصَابَ شيئا من ذلك فَسَتَرَهُ الله عليه فَأَمْرُهُ إلى اللَّهِ إن شَاءَ عَفَا عنه وَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ).[٢] عوبادەی کوڕی صامت ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: لەکۆڕێکدا ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووین ﷺ فەرمووی: (پەیمانم پێ بدەن لەسەر ئەوەی هاوبەش بۆ خوا پیدانەکەن و دزی و زینا نەکەن بەهەق نەبێت کەسێك نەکوژن کە خوا کوشتنی ئەوی حەرام کردووە جا هەرکەستان ئەمەی بردە سەر ئەوە پاداشتی لای خوایە ، هەر کەسیش هەندێ لەو تاوانانەی توشی بووە تۆڵەی لێ سەندرا لەسەری ئەوە کەفارەتە بۆی هەر کەسیش هەندێ تاوانی لەوانەی کرد و خوا بۆی پۆشی ئەوە کاری لای خوایە ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێ وە ئەگەر ویستی سزای دەدات).

---

١) رواه البخاري (١٦٨٨ ) و مسلم (٦٧٨٨)

٢) رواه البخاري ( ٦٧٨٤ ) و مسلم (١٧٠٩/٤١)

**هەشتەم: کێ تۆڵەی تاوانەکان جێ بەجێ دەکات :**

تەنها گەورەو پێشەوای موسڵمانان یان نوێنەرەکانی تۆڵەی تاوانەکان جێ بەجێ دەکەن . چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی تۆڵەکانی جێ بەجێ دەکرد لە ژیانی خۆیدا ، دوا ئەویش خەلیفەو جێنیشینەکان خۆیان جێ بەجێیان دەکرد وە پێغەمبەر ﷺ نوێنەری خۆی ناردووە بۆ جێ بەجێ کردنی تۆڵەی تاوانەکان دەفەرموێ: (« وَاغْدُ يَا أُنَيْسُ إِلَى امْرَأَةِ هَذَا ، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا»).[1] (ئەنەسەبچکۆل بڕۆ بۆ لای ژنی ئەم کابرا جا ئەگەر دانی بەوەدانا کە زینای کردووە ئەوە بەرد بارانی کە تا دەمرێ).

١) رواه البخاري (٢٦٦٩،٢٦٩٥ ) ومسلم (٢٥/ ١٦٩٧ ) ومالك ٨٢٢/٢ (٦)

# تۆڵەی زینا کردن

**یەکەم:جۆرەکانی زینا**

**أ ـ زینا کردن بە گومانێك کە پاساوی شەرعی هەبێت** ، وەك ئەوەی لەگەڵ ئافرەتێدادروست بێت وای زانبێ ژنی خۆیەتی کەچی دەرکەوت ئافرەتێکی بێگانەیە یا گومانی وابوو ژنی کەس نیە یا لە ئیحرامدا نیە مارەی کرد ، بەڵام دواتر روون بوویەوە کە خێزانی پیاوێکە یان لە ئیحرامدایە ، لەم حاڵەتانەدا گوناهبار نابێ لەگەڵی جووت بووە و نەیزانیوە و تۆڵەشی ناکەوێتەسەر خاون ژن بووبێت یان نا لەبەرئەوە گومانەکە هەیبووە. بەڵام هەندێ حوکم و ئەنجامی لێدەکەوێتەوە دواتر باسی دەکەین .

**ب ـ زینا کردن وەك تاوان وداوێن پیسی بەبێ بوونی هیچ گومانێك**، بەڵکو دەزانێ ئەوە زینایەو حەرامە جا ئەو کەسە هاوسەری هەیە ژن بێت یا پیاو یان نیەتی کوڕ بێت یا کچ .

جاهاوسەربوون ئەوەیە ئەم مەرجانە تێدابێت:

١ـ ژیری باڵغی موسوڵمان بێت، کەواتە شێت ومنداڵ و کافر ناگرێتەوە . (عَنِ النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِىِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ »).[1] پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (قەڵەمی تاوان لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە ، لە خەوتوو تا هەڵدەسێت لەخەو لەمنداڵ تا باڵغ دەبێت وە لەشێت تاچاك دەبێتەوە).

٢ ـــ خێزانی هەبووبێ بەمارەبڕینێکی شەرعی و لەگەڵیشی ژن ومێردایەتی کردبێ . جاخێزانەکەی لە ژیاندابێت یا مردبێ یەکسانە گرنگ ئەوەیە جووت بوونی کردبێ لەگەڵیدا و بەشرعی خێزانی بووبێ .

٣ـ ئازاد بێ وکۆیلە نەبێت چونکە تۆڵەی کۆیلە جیاوازە .

دووەم: مەرجەکانی جێ بەجێ کردنی تۆڵەی زینا: بۆ ئەوەی تۆڵەی زینا جێبەجێ بکرێت بەسەر کەسێکدا دەبێ ئەم مەرجانەی تێدابێ :

---

١) رواه الترمزى (٦٩٣ ) و وهو حديث صحيح وصحيح جامع الصغير(٣٥١٤ )

١ـ بالغ و ژیر بێت .

٢ـ زۆری لێ نەکرابێ ، بە ویستی خۆی کردبێتی.

٣ـ هیچ گومانێك نەبێ بۆ زیناکە کە پاساوی شەرعی هەبێ.

٤ـ زینا دەچەسپێ بەدانپیادان یان چوار شایەت :

یەك جاردان پیادانان زینای پێدەچەسپێ ،چوارجار دان پیادانان بۆ زیاتر دڵنیابوونە ، چونکە کارکردن بە دان پیادانان لە شەریعەتی ئسلام داهەیە ، (عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه وَزَيْدَ بْنَ خَالِدٍ وفيه: وَاغْدُ يَا أُنَيْسُ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا ، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا» . فَغَدَا عَلَيْهَا فَاعْتَرَفَتْ فَرَجَمَهَا). [١] وەك لەگێرانەوەی ئەبوهورەیرە وخالیدی جوهەنی ڕەزای خوایان لێبێ دەڵێن : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (ئەنەسە بچکۆلە بڕۆ بۆ لای ژنی ئەم کابرا جا ئەگەر دانی بەوەدانا کە زینای کردووە ئەوە بەردبارانی کەتا دەمرێ جا ئەنەسیش ڕۆشت بۆ لای و ئافرەتەکە دانی پیانا کە زینای کردووە جا ئەنەسیش بەرد بارانی کرد تا مرد).

(و عن بريدة أنه ﷺ إكتفى بإقرار الغامدية مرة واحدة). [٢] بورەیدە دەڵێ پێغەمبەر ﷺ بەیەکجار دان پیادانانی ئافرەتە غامیدییەکە کۆتای هێنا وەیەکجار دان پیادانانی ژن و پیاوێکی جوولەکە کۆتایی هێنا وەبێدەنگ بوونی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ماعیز هەتا چوارجار دانی نابە تاوانەکەیدا ئەوەی تێدانیە کە چوار جار مەرج بێت، بەڵکو ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە گەورە و قازی بۆ دڵنیابوون دەتوانێ چاوەڕوانی بکات تازیاتر لە جارێك دان پیادانان ڕوویدات.

**دووەم: زینا بەچوار شایەت دەچەسپێ :**

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ ﴾ النور: ٤ واتە: ئەو کەسانەی بوختانی زینا بۆ ئافرەتانی داوێن پاك دەکەن پاشان چوارشایەت ناهێنن ئەوە هەشتا شەلاقەیان لێ دەن.

---

١) رواه البخاري (٢٦٩٥ ،٢٦٦٩ ) ومسلم (٢٥/ ١٦٩٧ ،١٩٩٨) ٣- رواة مسلم (٢٣ /١٦٩٥ )

٢) رواه البخاري (٣٦٣٥) و مسام (١٦٩٩/٢٦)

وەقورئـــان دەفـــەرمووێ: ﴿ وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡ ﴾ النساء: ١٥ واتـە: ئەوانـەی داویـن پیـسی دەکـەن لـە ئافرەتانتـان ئـەوە چوارکەس لەخۆتان ـ پیاوانی موسڵمان ـ شایەتی بدەن لە سەریان .

ج ـ واجبە دان پیادانان یا شایەتی دانەکەدا هەبێ کە جووت بوون ڕویداوە :

(عن ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال لَمَّا أتى مَاعِزُ بن مَالِكٍ النبي ﷺ قال له لَعَلَّـكَ قَبَّلْـتَ أو غَمَزْتَ أو نَظَرْتَ قال لَا يا رَسُولَ اللَّهِ قال أَنِكْتَهَا لَا يَكْنِي قال فَعِنْدَ ذلـك أَمَـرَ بِرَجْمِـهِ).[1]

عەبـدوڵڵای کـوڕی عبـاس ـ ڕەزای خوایـان لێبێـت ـ دەڵـێ : کاتـێ مـاعیز هـات بـۆ خزمـەتی پێغەمبەر -علية الصلاة سلام- فەرمووی بە ماعیز (لەوانەیەماچت کردبێ یـا دەسـت لـێ دابـێ یا سەیرت کردبێ ؟ ووتی: نەخێر ئەی پێغەمبـەری خوا_ فـەرموو (زینـات کـردووە ) عـەبـدوڵڵا دەڵێ : جا لەوکاتەدا فەرمانی کردبە بەردباران کردنی).

**سێ یەم: تۆڵەی کوڕ و کچی زیناکەر :**

ئەگەر ئەو کەسەی زیناکە دەکات کوڕ یا کـچ بـوو سـەد شـەلاقی لێ دەدرێ و سـاڵێکیش دوور دەخرێتەوەلە شوێن و جێگای خۆی. خوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ وَلۡيَشۡهَدۡ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ النور: ٢ واتە: ئافرەت وپیاوی زیناکەر هەریەکەیان سـەد شـەلاق ـ دار_ یان لێ دەن وەبەزەیی هاتنەوەتان پیاندانەتان گرێ لە جێبەجێکردنی فـەرمانی خـوا ئەگـەرئێوە باوەڕدارن بەخواوڕۆژی دوایی وە با کۆمـەڵێك لە باوەڕداران ئامادەی سزادانەکە بن.

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى فِيمَنْ زَنَى و لم يُحْصَنْ بِنَفْيِ عَامٍ وبإقامة الْحَدِّ عليه).[2] ئەبو هورەیرە - ڕەزای خوای لێ بـێ- دەڵـێ : پێغەمبـەری خـوا ﷺ بڕیـاری دا دەربارەی کەسێك زینای کردووە و ژنـی نـەهێناوە بـە سـاڵێ دوورخـستێنەوە و تۆڵـەی زیناشـی بەسەرد بدرێت - کە سەد شەلاقە- .

---

١) رواه البخاري(٦٨٢٤)

٢) رواه البخاري (٦٨٣٣)

**چوارەم: تۆڵەی ژن و پیاوی زیناکەر:**

(عن ابن عَبَّاسٍ أَنَّ النبي ﷺ قال لِمَاعِزِ بن مَالِكٍ أَحَقٌّ ما بَلَغَنِي عَنْكَ قال وما بَلَغَكَ عَنِّي قال بَلَغَنِي أَنَّكَ وَقَعْتَ بِجَارِيَةِ آلِ فُلَانٍ قال نعم قال فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ ثُمَّ أَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ). [1]

عەبدوڵڵای کوڕی عبباس ـ ڕەزای خوایان لێ بێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەماعیزی کوڕی مالیکی ووت: (ئەو قسەی دەربارەت بەمن گەیشتووە ڕاستە؟) ووتی: دەربارەی من چیت پێ‌گەیشتووە؟ فەرمووی: (پێم گەیشتووە کە زینات کردووە لەگەڵ کەنیزەکی ماڵی فلانە کەسدا) ووتی: بەڵێ ،عەبدوڵڵا ووتی: جا چوار شایەتی دا. لەسەرخۆی کە زینای کردووە ـ پاشان فەرمانی بۆداو بەردباران کرا).

عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ( أَنَّ رَجُلًا من أَسْلَمَ جاء إلى رسول اللَّهِ ﷺ فَاعْتَرَفَ بالزنى فَأَعْرَضَ عنه ثُمَّ اعْتَرَفَ فَأَعْرَضَ عنه حتى شَهِدَ على نَفْسِهِ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ فقال له النبي ﷺ أَبِكَ جُنُونٌ قال لَا قال أُحْصِنْتَ قال نعم قال فَأَمَرَ بِهِ النبي ﷺ فَرُجِمَ) [2]

وە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ـ ڕەزای خوایان لێ بێ ـ دەڵێ: پیاوێکی ئەسلەمی هات بۆخزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و باسی کرد بۆی کە زینای کردووە ئەنجا چوار شایەتی لەسەر خۆی دا جا پێغەمبەر فەرموی پێ ی شێتی ووتی نەخێر فەرمووی خێزانت هەیە ووتی بەڵێ، پێغەمبەریش فەرمانی کرد کەبەرد باران بکرێت).

**پێنجەم: تۆڵەی زینا بەچی نامێنێ؟**

١ـ بەپەشیمان بوونەوە لە دان پیادانان: عن أبي هُرَيْرَةَ قال (فلما وَجَدَ مَاعِزٌ مَسَّ الْحِجَارَةِ فَرَّ يَشْتَدُّ حتى مَرَّ بِرَجُلٍ معه لَحْيُ جَمَلٍ فَضَرَبَهُ بِهِ وَضَرَبَهُ الناس حتى مَاتَ فَذَكَرُوا ذلك لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ فَرَّ حين وَجَدَ مَسَّ الْحِجَارَةِ وَمَسَّ الْمَوْتِ فقال رسول اللَّهِ ﷺ هَلَّا تَرَكْتُمُوهُ)وفي رواية(فَوَجَدَ مَسَّ الْحِجَارَةِ صَرَخَ بِنَا يا قَوْمُ رُدُّونِي إلى رسول اللَّهِ ﷺ فَإِنَّ قَوْمِي قَتَلُونِي وَغَرُّونِي من نَفْسِي وَأَخْبَرُونِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ غَيْرُ قَاتِلِي فلم نَنْزَعْ عنه حتى قَتَلْنَاهُ فلما رَجَعْنَا إلى رسول اللَّهِ ﷺ وَأَخْبَرْنَاهُ قال فَهَلَّا تَرَكْتُمُوهُ وَجِئْتُمُونِي بِهِ ) ئەبوهوریرە ـ ڕەزای خوای لێ بێ

---

١) رواه البخاري (٦٨٢٤) ومسلم (١٦٩٣/٠١٩)

٢) رواه أبوداود(١٢رقم ٤٤٠٧) والترمزي (١٤٥٤) وهوحديث صحيح

ـ دەڵێ: کاتێ ماعیز هەستی کرد بەردبارانەکەی زیادی کرد ڕایکرد هەتا بەلای کابراکدا تێپەڕی لاشەویلگەی ووشترێکی بەدەستەوەبوو کێشای بە ماعیزدا خەڵکەکەش دەستیان بە بەردباران کردنی هەتا گیانی دەرچوو، ئەو حاڵەتەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە فەرمووی (ئەی بۆ وازتان لێنەهێنا؟). ئەم زیادەی هەیە: کاتێ بینی بەردەکانی بەرکەوت هاواری کرد: خەڵکینە بمگێڕنەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ چونکە هۆزەکەم کوشتمیان و فریویان دام ، وەپێیان ڕاگەیاندم کەپێغەمبەر ﷺ نامکوژێ، ئێمەش لەکۆڵی نەبوینەوە هەتا کوشتمان . کاتێ گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەمان پێڕاگەیاند فەرمووی: (دەی بۆ وازتان لێ نەهێنا و بیهێنەوە بۆ لام ).[1]

٢ـ ئافرەتەکە کچێنی مابێ یا پیاوەکە زەکەری بڕابێ یا شلەپەتە بێ: هەرکام لەم هۆیانە ڕێگرن لە زینا کردن کەواتە شایەتی دان یان دا پیادا هێنان ڕاست نیە.

**شەشەم: تۆڵەی نێر بازی:**

(عن ابن عَبَّاسٍ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ).[2] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ـ ڕەزای خوایان لێ بێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هەرکەستان بینی کاری گەلی لوتیان دەکرد ـ نێربازی ـ ئەوە بکەر و لێکراو بکوژن).

**حەوتەم: تۆڵەی چوونە لای ئاژەڵ تەمبێ کردنە :**

(عَنْ أَبِي رَزِينٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ لَيْسَ عَلَى الَّذِي يَأْتِي الْبَهِيمَةَ حَدٌّ). عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ـ ڕەزای خوایان لێ بێ ـ دەڵێ: ئەوەی دەچێتەلای ئاژەڵ تۆڵەی دیاری کراوی نیە، کواتە تەمبێ کردنە لەسەری چونکە تاوانێکە تۆڵەی دیاری کراوەی نیە و کەفارەتیشی نیە .

**هەشتەم: بەرد باران کردنی ئافرەتی سک پڕ ـ دووگیان ـ**

ئەگەر ئافرەتێك شووی کردبوو زینای کردوو چەسپا بەسەریدا ، ئەو بەرد باران ناکرێت تا منداڵەکەی دەبێت و شیری دەداتێ تا ئەو ڕادەی خۆی بتوانێ خواردن بخوات ئەگەرکەس نەبوو منداڵەکە شیرپێبدات و بەخێوی کات.

---

١) رواه أبوداود (٤٤٢٠) والترميزى (١٤٣٣) و النسائى فى الكبرى (٧٢٠٧) باسناد جيد.

٢) رواه أبوداود (٤٤٦٢) والترمزى (١٤٥٦) وابن ماجه (٢٥٦١) وهو حديث صحيح

(عن بريدة عن أبيه قال جاءت امرأة غامدية من الأزد فقالت يا رسول الله طهرني قال ويحك ارجعي فاستغفري الله وتوبي إليه فقالت لعلك تريد أن تردني كما رددت ماعز بن مالك قال وما ذاك قالت إنها حبلى من الزنا قال أثيب أنت قالت نعم قال فلا أرجمك حتى تضعي ما في بطنك قال فكفلها رجل من الأنصار حتى وضعت وأتى إلى النبي ﷺ فقال قد وضعت الغامدية فقال إذا لا نرجمها وندع ولدها صغيرا ليس له من يرضعه فقام رجل من الأنصار فقال إلي رضاعه يا نبي الله فرجمها).[1] بورەیدە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پاشان ئافرەتێکی کە غامیدی بوو لەهۆزی ئەزد هات بۆخزمەتی پێغەمبەر ﷺ ووتی پاکم کەرەوە لەتاوان فەرمووی (هاوار بۆ تۆ بگەڕێرەوەوداوای لێبوردن لەخوابکە وتەوبە لە لای خوا ) جائەویش ووتی: دەبینم دەتەوێ منیش بگێڕیتەوە وەك چۆن ماعیزی کوڕی مالیکت ناردەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بۆچی؟) ووتی: ئەو دووگیانە بەهۆی زیناوەبووە، جا فەرمووی: (تۆ) ووتی: بەڵێ، جا پێی وت: (بڕۆ ـ تائەو منداڵەی لەسکت دایە دەتبێ ) بورەیدە دەڵێ: جاپیاوێکی ئەنصاری بردیە لای خۆی تا منداڵەکەی بوو،دەڵێ:جاپیاوەکەهاتەخزمەتی پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئافرەتە غامیدیەکە منداڵەکەی بوو، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (کەواتە بەردبارانی ناکەین ومنداڵە بچکۆلەکەی بەجێ بێلێت کە کەس نەبێ شیری بداتێ) جا پیاوێکی ئەنصاری هەستاو ووتی:ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شیرپێدان و بەخێوکردنی لەسەرمن ، بورەیدە ووتی: ئەنجا بەرد بارانی کرد).

**نۆیەم: هەرکەس بەزۆر زینای لەگەڵ کرا تۆڵەی لەسەرنیە :**

(عن أبي عبد الرحمن السلمي قال أتي عمر بن الخطاب رضي الله عنه بامرأة جهدها العطش فمرت على راع فاستسقت فأبى أن يسقيها إلا أن تمكنه من نفسها ففعلت فشاور الناس في رجمها فقال علي رضي الله عنه هذه مضطرة أرى أن تخلي سبيلها ففعل).[2] ئەبوعەبدوڕحمانی سولەمی دەڵێ: ئافرەتێکیان هێنا بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ـ ڕەزای خوای لێ بێ- کەتینوێتی زۆری بۆ هێنابوو لەوکاتەدا بەلای شوانێکدا تێدەپەڕێ وداوای ئاوی لێ دەکات،

١) رواه مسلم (١٦٩٥/٢٢)

٢) رواه البيهقي (٢٣٨/٨) وهو حديث صحيح

شوانەکەش ناوی پێ نادات بەو مەرجەنەبێت ڕێگەی بدات زینای لەگەڵ بکات ئافرەتەکەش وادەکات ـ ئیمامی عومریش ـ دەربارەی بەرد باران کردنی ڕاوێژی بەخەڵك کرد ، جا عەلی ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ ووتی: ئەم ئافرەتە ناچار بووە من رام وایە وازی لێ بێنی بڕوات جا عومەریش ڕێی پێدا بڕوات).

**دەیەم: ئەگەر سێ کەس شایەتی بدەن:**

ئەگەر لە چوار کەسەکە سیانیان شایەتی بدەن لەسەرزینای پیاو و ئافرەتێك ئەو تۆڵەی بوختانی زینا دەدرێت لە سێ شایەتەکەو بەبوختانچی دادەنرێن و پیاو وئافرەتەکە تۆڵەی زینایان لێ نادرێت خوای گەورە دەفەرمێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾ النور: ٤ واتە: ئەو کەسانەی بوختانی زینادەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك پاشان چوارشایەت ناهێنن ـ لەسەری ـ ئەوە هەشتادار ـ شەلاق ـ یان لێ بدەن وەهەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن وە ئەوانە هەر خۆیانن لە سنوور دەرچوان.

کەواتە دەبێ چوار شایەت هەبێ ئەنجا زینادەچەسپێت بەسەر پیاو و ئافرەتەکەدا ئەگەر لەچوار کەمتربوون لەوکاتەدا شایەتەکان بوختانچین و هەشتا داریان لێ دەدرێت .

(عن قسامة بن زهير قال لما كان من شأن أبي بكرة والمغيرة الذي كان وذكر الحديث قال فدعا الشهود فشهد أبو بكرة وشبل بن معبد وأبو عبد الله نافع فقال عمر رضي الله عنه حين شهد هؤلاء الثلاثة شق على عمر شأنه فلما قام زياد قال إن تشهد إن شاء الله إلا بحق قال زياد أما الزنا فلا أشهد به ولكن قد رأيت أمرا قبيحا قال عمر الله أكبر حدوهم فجلدوهم قال فقال أبو بكرة بعد ما ضربه أشهد أنه زان فهم عمر رضي الله عنه أن يعيد عليه الجلد فنهاه علي رضي الله عنه وقال إن جلدته فارجم صاحبك فتركه و لم يجلده).[1] قەسامەی کوڕی زوهەیر دەڵێ: ئەبوبەکرە و شبیلی کوڕی مەعبەد وباوکی عەبدوڵڵا کەناوی نافیعە لە خزمەتی عومەری کوڕی خەتتاب دا شایەتیان دا کە پیاوێکیان بینیوە زینای کردووە جا چوارەمیان زیادبوو

---

١) رواه البيهقي في السنن الكبرى ٣٣٤/٨ باسناد صحيح

هات، ئیمامی عومەر ووتی: (ان شاالله) تۆ شایەتی ڕاستی دەدەیت، زیادیش ووتی: بۆ زینا شایەتی لەسەر نادەم ،بەڵام کارێکی زۆرناشیرینم بینی . ئیمامی عومەر ووتی: الله أکبر، تۆڵەی بوختانیان لێدەن جا تۆڵەی بوختانیان لێ دان ، جا ئەبوبکرە دوای ئەوەی شەلاقیان دا ووتی: شایەتی دەدەم زینای کردووە، ئیمامی عومەر وویستی شەلاقی لێ بداتەوە بەڵام عەلی ڕێگری لێ کردوو ووتی: ئەگەر دووبارە لێی بدەیتەوە کەواتە بە دوو شایەتی داتناوە ـ دەی هاوڕێکەت بەرد باران بکە، جاعومەر وازی لێ هێناو شەلاقی لەئەبوبەکر نەدا.

# تۆڵەی بوختانی زینا ( حد القذف )

**یەکەم: پێناسەکەی:**

(قذف) لەزمانی عەرەبی دا بەمانەی فڕێدانە .

لەشەرعدا : بوختانی زیناکردنە بۆپیاو و ئافرتی موسڵمانی داوێن پاك که بڵێت داوین پیس، زیناکەر.

**دووەم: حوکمی بوختان کردن:**

حەرامە موسڵمان بوختان بۆ پیاو وئافرەتی موسڵمانی داوێن پاك بکات. وە ئیسلام بەیەکێك لەتاوەنە گەورەکانی داناوە. (قال رسول الله ﷺ : اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ: الشِّرْكُ باللَّهِ وَالسِّحْرُ وَقَتْلُ النَّفْسِ التي حَرَّمَ الله إلا بِالْحَقِّ وَأَكْلُ الرِّبَا وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ وَالتَّوَلِّي يوم الزَّحْفِ وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلَاتِ).[1] پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (خۆتان لەحەوت گوناهە فەوتێنەرەکە بپارێزن ـ کە ئەمانەن: هاوبش پەیداکردن بۆ خوا و جادووگەری و بەهەق نەبێ کوشتنی ئەوکەسەی خواکوشتنی حرام کردووە و سووخواردن و مالی هەتیوخواردن و هەڵهاتن لەرۆژی رووبەڕووبوونەوەدا و بوختانی زیناکردن بۆ ئافرەتی داوێن پاکی بێ ئاگا).

**سێ یەم: تۆڵەی بوختانی زینا:**

**تۆڵەی بوختانی زینا:** ئەو سزایە شەرع دیاری کردووە و مافی مرۆڤەکانە.. هەشتا دارە، شایەتی لێ وەرناگیرێ مەگەر تۆبە بکات وپەشیمان ببێتەوە.

بەڵگەی بوختان ئەم ئایەتیە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةً وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدًاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٤ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ النور: ٤ – ٥ واتە: ئەو کەسانەی بوختانی زینا دەکەن بۆ ئافرەتی داوێن پاك پاشان چوار شایەت ناهێنن ئەوە هەشتا داریان لێ دەن وەهەرگیز شایەتیان

---

١) رواه البخاري (٢٦١٥) و مسلم (٨٩)

لێ وەرمەگرن وە ئەوانە خۆیان لەسنوور دەرچوون جگەر لەوانەیان کە لە دواتەوە پەشیمان دەبنەوە و خۆیان چاك دەكەن ئەوە بێگومان خوا لێبوردەی بەبەزەیی یە.

**چوارەم: مەرجەکانی تۆڵەی بوختانی زینا :**

کاتێ تۆڵەی بوختان کردنی زینا بەسەر کەسێکدا جێبەجێ دەکرێ ئەم دە مەرجە هەبێت کە پێنجیان دەبی لە بوختان کەرەکە دابێت وە پێنجیان لە بوختان بۆ کراوەکە دابێت .

مەرجەکانی بوختان کەر :

أ ـ بالغ بێت . ئەگەر منداڵ بوو شەلاقی لێ نادرێت .

ب ـ ژیر بێت . ئەگەر شێت بوو شەلاقی لێ نادرێت .

ج ـ باوکی بوختان بۆ کراوەکە نەبێت. ئەگەر باوکی بوو یا دایکی و نەنکی بووتۆڵەی بوختانی زینای لێ نادرێت.

د ـ دەبێت بە ئارەزووی خۆی بێ . ئەگەر زۆری لێ کرابوو بیلێت سزا نادرێت .

هـ ـ بزانێ بوختانی زینا حەرامە، کەسێك نەی زانیبێ و نەزان بێت تۆڵەی لەسەر نیە وەك تازە موسڵمان بوو .

**مەرجەکانی بوختان بۆ کراو:**

أـ موسڵمان بێت ب ـ بالغ بێت ج ـ ژیربێت د ـ داوێن پاك بێت پێشتر زیناکەر نەبووبێت هـ ـ بوختان بۆ کراوەکە ڕێگەی پێنەدابێ ئەوەی پێ بڵێ .

**پێنجەم: کەی تۆڵەی بوختانی زینا کردن جێبەجێ ناکرێ :**

أ ـ چوار شایەت هەبێت لەسەر زیناکردنەکە یان بوختان بۆ کراوەکە دانی پیادابنێ کەزینای کردووە ئەگەر چوار شایەتەکە لەوانەبوون شایەتیان وەردەگیرێ شایەتیان دا یاخوی دانی پیادانا لەوکاتەدا شایەتەکان تۆڵەی بوختانی زینایان لێ نادرێ بەڵکو تۆڵەی زینا لەوە دەدرێ کە زینای کردووە جا چ چوار شایەت ببێ یاخۆی چوبێتە ژێر کە زینای کردووە. بەڵام ئەگەر شایەتەکان لە چوار کەمتربوون لەوکاتەدا شایەتەکانیان ناخوات و شەلاق دەدرێن.

ب ـ بوختان بۆکراوەکە لە بوختان کەرەکان خۆش بێت، لەم کاتەش دا شەلاق نادرێن چونکە مافی خۆیەتی دەستی لێ هەڵدەگرێ.

ج ـ ئەگەر مێردی ئافرەتەکە بوو، ئافرەتەکەی بەزینا تاوان بارکردبوو بەلیعان کردن تۆڵەی بوختانی زینا لەسەر مێردەکەی لادەچێت. خوای گەورە دەفەرمووی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾ النور: ٦ – ٧ واتە: ئەو پیاوانەی زینا دەدەنە چاڵ ژنەکانیان و جگە لە خۆیان شایەتیان نیە ، ئەو شایەتی دانی هەریەك لەوانە بەم جۆرەیە ـ کە چوار سوێند بەخوابخوات کە بێگومان ئەو لە ڕاسگۆیانە ـ کە دەڵێ ژنەکەم بینیوە زینای کردووە ـ وەلە پێنجەم جاردا بڵێ نەفرینی خوای لە سەربێ ئەگەر لە درۆزنان بێ.

# تۆڵەی دزی کردن

هەر چۆنێ ئایینی پیرۆزی ئیسلام بۆ پاریزگاری لە گیان و ناموس هاتووە بەهەمان شێوە بۆ پارێزگاری لەماڵ و سامان هاتووە، بۆیە تۆڵەی دزی کردنی داناوە بۆ ئەو کەسەی ماڵ وسامانی خەڵك دەبات و دەست درێژی دەکات بۆ سەروەت و سامانیان .

**یەکەم: پێناسەکەی:** (سرقة) لەزمانی عەرەبیدا: بردنی ماڵ وسامانی خەڵکە بە دزیەوە.

لە شەرعیشدا: بردنی ماڵی خەڵکە بە دزیەوە بەستەم لە جێگای تایبەتی خۆیدا بە چەند مەرجێکی دیاری کراو . تۆڵەکەشی: بڕینی دەستیەتی لەمەچەکدا .

**دووەم: مەرجەکانی جێبەجێ کردنی تۆڵەی دزی کردن**

أ ـ باڵغ بوون، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: قَالَ « رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ ... وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ»).[1] (تۆڵەی تاوان لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە ...... لەسەر منداڵ تا باڵغ دەبێت).

ب ـ ژیری، دەستی شێت نابڕدرێت .

ج ـ زۆری لێ نەکرابێ

د ـ ماڵەکە گیشتبێتە ڕادەی دەست بڕین کە ١/٤ چواریەکی دینارێکە[2]

(عن عَائِشَةَ قال سمعت النبي ﷺ قال تُقْطَعُ الْيَدُ فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا).[3] عایشە ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ دەڵێ: ئەو لە پێغەمبەری خوای بیست دەیفەرموو: ( لەچارەکە دینارێك و بۆسەرەوە دەست دەبڕێت).

هـ ـ ئەو ماڵەی دزیویەتی لەشوێنی تایبەتی خۆیدا بێت: بۆ نموونە پارە لە قاسەو کلیلدا بێت پۆشاك لە کەنتۆر و بۆفی. ئاژەڵ لەگەوڕ و پەچە دابێت . هەرشتەو بەگوێرەی خۆی .

---

١) پێشتر باسمان کرد

٢) دینار: واتە یەك مسقاڵ ئاڵتونی پوخت و چواریەکە کە چارەکە مسقاڵێك دەکات

٣) رواه البخاري (٦٧٩١) و مسلم ( ١٦٨٤)

(عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو عَنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الثَّمَرِ الْمُعَلَّقِ فَقَالَ « مَا أَصَابَ مِنْ ذِى حَاجَةٍ غَيْرِ مُتَّخِذٍ خُبْنَةً فَلاَ شَىْءَ عَلَيْهِ وَمَنْ خَرَجَ بِشَىْءٍ مِنْهُ فَعَلَيْهِ غَرَامَةُ مِثْلَيْهِ وَالْعُقُوبَةُ وَمَنْ سَرَقَ شَيْئًا مِنْهُ بَعْدَ أَنْ يُؤْوِيَهُ الْجَرِينُ فَبَلَغَ ثَمَنَ الْمِجَنِّ فَعَلَيْهِ الْقَطْعُ وَمَنْ سَرَقَ دُونَ ذَلِكَ فَعَلَيْهِ غَرَامَةُ مِثْلَيْهِ وَالْعُقُوبَةُ »).[1] عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە و لە باپیرەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری ـ ڕەزای خوایان لێ بێ ـ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری میوەی لێکرا بە درەختەوە بێت فەرمووی: (ئەوە کەسێك بیخوات کە پێوستی بێت بێ ئەوەی کۆشی لێ پڕبکات ئەوە هیچی لەسەر نیە. وەهەر کەس لێی بباتەوە لەگەڵ خۆیدا ئەوە دوو قات بژاردنی لەسەرە لەگەڵ سزاشدا ، هەرکەسێکیش شتێکی لێ بدزێ کەلە شوێنی ووشك کردنەکەیدا بێت ئەوە دەستی دەبڕدرێت ئەگەر نرخەکەی بگاتە نرخی قەڵغانێك هەرکەس لەوە کەمتر بدزێ ئەوە بژاردنی دووقاتی دزراوەکە و خۆی سزاشی لەسەرە).

و ـ ماڵەکە دزەکە خاوەنی نەبێ یا گومانێکی تیدابێت:

ئەگەر شەریکی خاوەن ماڵەکە بوو دەستی نابڕدرێت چونکە ئەمیش خاوەنێتی . یان منداڵ پارەی باوکی ببات دەستی نابڕدرێت چونکە گومانی تێدایە، چونکە خەرجی مندالەکە لەسەر باوکێتی.

**سێ یەم: دزی بەچی دەسەلمێت:** بەیەکێ لەم دووانە :

أ ـ دزەکە یەك جار دان بنێت بەدزیەکەیدا، پێشتر لەباسی تۆڵەی زینا باسی بەلگەکەیان کرد.

ب ـ دوو شایەتی ڕاست ودوروست شایەتی بدەن کە دزی کردووە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَن تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَىٰ وَلَا يَأْبَ الشُّهَدَاءُ إِذَا مَا دُعُوا ... ﴾ البقرە ٢٨٢ واتە: دوو شایەت لە پیاوانی خۆتان ـ موسڵمانان ـ بگرن بەشایەت جا ئەگەر

---

١) رواه أبوداود (٤٣٩٠) والترمزي (١٢٨٩) والنسائي ٨٥/٨ وهو حديث حسن.

دووشایەت نەبوون ئەوە پیاوێك و دوو ئافرەت لەو شایەتانەی کە لێیان ڕازین بۆ ئەوەی ئەگەر ئافرەتێکیان لەبیری چوو ئەوی تریان بیرخاتەوە .

**چوارەم: دەستی دز نابڕدرێت ئەگەر خاوەن ماڵەکە لێ ی خۆش بێت پێش گەیشتنی بە قازی:**

(عن عَمْرِو بن شُعَيْبٍ عن أبيه عن عبد اللَّهِ بن عَمْرِو بن الْعَاصِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال تَعَافُوا الْحُدُودَ فِيمَا بَيْنَكُمْ فما بَلَغَنِي من حَدٍّ فَقَدْ وَجَبَ).[1] عومەری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ـ ڕەزای خوایان لێ بێ ـ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لە نیوان خۆتاندا لە تۆڵەکاندا چونکە ئەگەر تۆڵە سەندنێ گەشتە لای من ئەوە پێویستە جێبەجێ بکرێت).

**پێنجەم: دان پێدانەهێنانی شتی خوازراو دزییە :**

ئەگەر کەسێك بە خواستن کەل و پەل لای خەڵك بهێنێ و دانی پێدانەنێ کە خوازراوە ئەوە ئەو کەسە دزە و تۆڵەی دزی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت .

(عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَتِ امْرَأَةٌ مَخْزُومِيَّةٌ تَسْتَعِيرُ الْمَتَاعَ وَتَجْحَدُهُ فَأَمَرَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم– أَنْ تُقْطَعَ يَدُهَا فَأَتَى أَهْلُهَا أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ فَكَلَّمُوهُ فَكَلَّمَ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم– فِيهَا).[2] عایشە ڕەزای خوای لێ بێ ـ ئافرەتێکی مەخزومی هەبوو شت ومەکی لە خەڵك دەخواست ئینکاری لێ دەکرد جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد کە دەستی ببڕدرێت جا کەس وکاری هاتن بۆلای ئوسامەی کوڕی زەید و قسەیان لەگەڵ کرد ئەویش لەبارەیەوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر دا کرد لە بارەیەوە....... ).

---

١) رواه أبو داود (٤٣٧٦) والسائي ٨/٧٠ (٤٨٨٦) والحاكم ٣٨٣/٤ وهوحديث صحيح

٢) رواه مسلم (١٦٨٨/١٠)

# تۆڵەی عارەق خواردنەوە ( حد شرب الخمر )

**یەكەم: پێناسەكەی:** (خمر) لەزمانی عەرەبی دا بەسێ مانادێت:

١ـ داپۆشین ٢ـ تێكەڵ بوون. ٣ـ گەیشتن .

جا عەرەق ئەم سێ مانای تێدایە بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە: چونكە عەقل و ژیری دادەپۆشێ تێكەڵ دەبێ وە دایدەنێن و وازی لێ دێنن تا دەگات و دەبێتە عارەق .

**وەلە شەرع دا:** ناوە بۆ هەرشتێ ژیری داپۆشێت و تێكی بدات لە هەر جۆرە خواردنەوەیەك بێت، (قال رسول اللَّهِ ﷺ: كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ).[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ(هەموو هۆشبەرێك عارەقە وە هەموو هۆشبەرێكیش حەرامە).

**دووەم:حوكمی عارەق و هۆشبەر:** عارەق و هەموو هۆشبەرێك كەژیری مرۆڤ نەهێڵێ حەرامە. قورئان دەفەرمووێ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ المائدة: ٩٠ واتە: ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان هێناوە دڵنیابن كە عارەق و قومار بتەكان ـ كەبەردن ـ و فاڵ گرتنەوەو چارەنووس دیاری كردن، هەموویان پیسن لە كردەوەی شەیتانن كەواتە لێیان دووركەونەوە بۆ ئەوەی ڕزگاربن.

خوای گەورە عەرەقی لەم ئایەتەدا لە ڕیزی بت پەرستی دا باسی كردووە كە لە گوناهە هەرەگەورەكانە لە سوننەتی پێغەمبەریشدا ﷺ فەرموودەی زۆر لەبارەی حەرامی عەرەقەوە هاتووە وەك: (كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ).[٢] (هەموو هۆشبەرێك عەرەقە وە هەموو هۆشبەرێكیش حەرامە). وەزانایانی ئیسلام لەسەر حەرامێتی یەك دەنگن.

---

١) رواه ابوداود (٣٦٧٩) و أحمد (٢/٣١،٢٩)

٢) سەیری پەراویزی پێشوو بكە.

**سێ یەم: حیکمەتی حەرام کردنی عارەق:**

عەرەق خواردنەوە زەرەرو زیانی زۆری هەیە ئێمە لێرەدا هەندێکی باس دەکەین ، خوای گەورە لەبارەی زیانەکانیەوە دەفەرموێ ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾ المائدة: ٩١. واتە: بێگومان شەیتان دەیەوێ دوژمنایەتی و ڕق و کینە بخاتە نێوانتانەوە بەهۆی عەرەق و قومارەوە و ڕێگری یادی خواو نوێژتان لێ بکات دەی ئایا ئیتر ئێوە واز ناهێنن .

کەواتە عەرەق خواردنەوە هۆی پیدابوونی هەموو خراپەیەکەو ڕێگرە لە هەموو چاکەیەك.

(قال رسول الله ﷺ الخمر أم الخبائث).[1] پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (عەرەق ئەصڵ بنەڕەتی هەموو پیسیەکانە). بەبنەڕەت و ڕیشەی هەموو خراپە و چەپەڵی یەکی داناوە .وە زیانی ئاینی و ڕەوشتی و عەقڵی ئەوەندە ڕوونە پێویست بە باسکردن ناکات . لەڕوی تەندروستی یە و پزیشکەکان دەڵێن چەندین نەخۆشی ترسناکی لێوە پەیدا دەبێ . جا لەبەرئەوە زەرەرو زیانە زۆرانەی کەهەیەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام حەرامی کرووە .

**چوارەم: عەرەق لەچی دروست دەکرێت؟**

(عن ابن عُمَرَ قال سمعت عُمَرَ رضي الله عنه على مِنْبَرِ النبي ﷺ يقول أَمَّا بَعْدُ أَيُّهَا الناس إنه نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ وَهْيَ من خَمْسَةٍ من الْعِنَبِ وَالتَّمْرِ وَالْعَسَلِ وَالْحِنْطَةِ وَالشَّعِيرِ وَالْخَمْرُ ما خَامَرَ الْعَقْلَ).[2] عەبدوڵلای کوڕی عومەر ـ ڕەزای خوایان لێ بێ ـ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب لەسەر مینبەر ڕاوەستاو ووتی: (ئاگاداربن حەرام بوونی عەرەق دابەزیوە. عەرەقیش لەم پێنج شتە دروست دەکرێت: ترێ و خورما و هەنگوین و گەنم وجۆ، وەعەرەق ئەوەیە ژێری وعەقڵ داپۆشێ و نەهێڵێ).

---

١) رواة الدارقطنى ٢٤٧/٤ باسناد حسن

٢) رواه البخارى (٥٥٨١) ومسلم (٣٠٣٢)

**پێنجەم: تۆڵەی عارەق خۆر:**

کەسێك بالغ وژیر بێت بە ئارەزوی خۆی عـەرەق بخواتـەوە وبزانـێ حەرامـە ئـەوە چـل دار یـا شـەلاقی لـێ دەدرێت وە ئەگەر قازی یا گەورەی موسڵمانان ڕای لەسەر زیاتر هەبوو دەتوانێ تا هەشتا داری لێی بدات.

(روى الحصين بن المنذر: أن عليا جلد الوليد بن عقبة في الخمر أربعين ثُمَّ قَالَ جَلَـدَ النَّبِـيُّ (صلى الله عليه وسلم) أَرْبَعِينَ وَجَلَدَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ وَعُمَرُ ثَمَانِينَ وَكُلٌّ سُنَّةٌ وَهَذَا أَحَبُّ إِلَيَّ). [1]

حوصەینی کوڕی مونزیر دەڵێ: (عەلی ـ ڕەزای خوای لێ بـێ ـ چـل داری دا لـە وەلیـدی کـوڕی عوقبە لەسەر عەرەق خواردنەوە ، پاشان ووتـی پێغەمبـەر ﷺ چـل شـەلاقی داوە - لەعـەرەق خۆر ـ ئەبوبەکریش چل و عومەریش هەشتا هەموویان سونەتن بەڵام من ڕام لەم ـ چل ـ یانە).

(عن أَنَس بن مَالِكٍ رضي الله عنه أنَّ النبي ﷺ ضَرَبَ فِي الْخَمْرِ بِالْجَرِيدِ وَالنِّعَالِ وَجَلَدَ أبو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ). [2] ئەنەسی کوڕی مالیك ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەپـەلی دارخورمـا و نەعل دەیدا لە عەرەق خۆر ، ئەبوبەکریش ڕەزای خوای لێبێ چل داری لێ دەدا).

هـەروەها (عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- أُتِيَ بِرَجُلٍ قَدْ شَـرِبَ الْخَمْـرَ فَجَلَدَهُ بِجَرِيدَتَيْنِ نَحْوَ أَرْبَعِينَ. قَالَ وَفَعَلَهُ أَبُو بَكْرٍ فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ اسْتَشَارَ النَّاسَ فَقَـالَ عَبْـدُ الرَّحْمَنِ أَخَفَّ الْحُدُودِ ثَمَانِينَ.فَأَمَرَ بِهِ عُمَرُ). [3] ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: پیاوێکیان هێنـا بـۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ عەرەقی خواردبووە بـەدوو پـەلی دارخورمـا نزیکـەی چـل داری لـێ دا) دەڵێ: ئەبوبەکریش وەك پێغەمبـەر ﷺ کرد جا کاتێك عومەر ڕەزای خوای لێبێ بویە جێنـشین، ڕاوێژی بەخەڵك کرد، عەبـدوڕەحمان ووتـی: سـوکترین تۆڵـە هەشـتایە جـا عومـەریش فـەرمانی پێکرد).

**شەشەم: بەچی تۆڵەی عەرەق خۆر دەسەلمێ:**

أ ـ بەدان پێدانانی عەرەق خۆرەکە، کە عەرەقی خواردۆتەوە.

ب ـ بە شایەتی دانی دوو شایەتی ڕاست و دروست.

---

١) رواه مسلم (١٧٠٧)

٢) رواه البخاري (٦٧٧٣) و مسلم (١٧٠٦/٣٦)

٣) رواة مسلم (١٣٣٠/٣)

**حەوتەم: کوشتنی عەرەق خۆر سڕاوەتەوە :**

ئەگەر عەرەق خۆرێك سێجار تۆڵەی عەرەق خۆری لێ درابێ بۆ جاری چوارەم لە فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە بکوژرێت، بەڵام حوکمەکەی سڕاوەتەوە جا ئێمە هەردوو فەرمودەکە دەخینە ڕوو.

عن جابر بن عبد الله أن رسول الله ﷺ قال( من شرب الخمر فاجلدوه فإن عاد فاجلدوه فإن عاد فاجلدوه فإن عاد الرابعة فاقتلوه قال وضرب رسول الله ﷺ النعيمان أربع مرات قال فرأى المسلمون أن الحد وقع حين ضرب رسول الله ﷺ أربع مرات) [1]

جابری کوڕی عەبدوڵلا - ڕەزای خوایان لێ بێ - دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (هەرکەس عەرەقی خواردەوە شەلاقی لێ دەن، جا ئەگەر دووبارەی کردەوە شەلاقی لێ دەن ئەنجا ئەگەر سێ بارەی کردەوە جاریکی تر شەلاقی لێ دەن. جائەگەر چوارەم جار خواردییەوە ئەوە بیکوژن). جابیر دەڵێ: نوعەیمانیان هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ عەرەقی خواردبۆوە بۆ جاری چوارەم پێغەمبەر ﷺ شەلاقی لێداو نەی کوشت ئەمە سڕینەوەی حوکمی کوشتن بوو).

**هەشتەم: تەمێکردن دروستە بۆ ئەو تاوانانەی تۆڵەیەکی دیاری کراویان نیە:**

(عن أَبِي بُرْدَةَ الْأَنْصَارِيِّ أَنَّهُ سمع رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول لَا يُجْلَدُ أَحَدٌ فَوْقَ عَشَرَةِ أَسْوَاطٍ إلا في حَدٍّ من حُدُودِ اللَّهِ). [2] ئەبو بوردەی ئەنصاری ڕەزای خوای لێبێ دەڵێ: ئەو لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست دەیفەرموو (لە دە قامچی زیاتر لە کەس نادرێ جگە لە تۆڵەیەك لە تۆڵە دیاری کراوەکانی خودا).

(عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ أَنَّ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- حَبَسَ رَجُلاً فِى تُهْمَةٍ). لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە لەباوکیەوە لە باپیرەیەوە دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بەندکرد لەبەر تۆمەت و گومانێك کە لە سەری بوو). [3]

---

١) رواة الترمزی (٤٩/٤) والنسائی فی الکبری (٣٧٣/٢(٣٠٧٣) والبزار (١٥٦٢) وهوحدیث حسن.

٢) رواة البخاری(٦٨٤٨) ومسلم(١٧٠٨/٤٠).

٣) رواة أبوداود (٣٦٣٠) والنسائی ٦٧/٨ و الترمزی (١٤١٧) وهو حسن.

**نۆیەم: دورست نیە دوعا لە عەرەق خۆر بکرێت :**

(عن عُمَرَ بن الْخَطَّابِ أَنَّ رَجُلًا على عَهْدِ النبي ﷺ كان اسْمُهُ عَبْدَ اللَّهِ وكان يُلَقَّبُ حِمَارًا وكان يُضْحِكُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وكان النبي ﷺ قد جَلَدَهُ في الشَّرَابِ فأتى بِهِ يَوْمًا فَأَمَرَ بِهِ فَجُلِدَ فقال رَجُلٌ من الْقَوْمِ اللهم الْعَنْهُ ما أَكْثَرَ ما يُؤْتَى بِهِ فقال النبي ﷺ لَا تَلْعَنُوهُ فَوَاللَّهِ ما عَلِمْتُ إلا أنه يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ)[1] عومەری کوڕی خەتتاب رەزای خوای لێبێ دەڵێ: پیاوێك هەبوو لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ناوی عەبدوڵڵا بوو نازناوی لێ نابوو بە گوێدرێژ، هەمیشە قسەی خۆشی دەکرد و پێغەمبەری ﷺ دەهێنایە پێکەنین پێغەمبەر شەلاقی عارەق خۆری لێدابوو جا رۆژێکیان هێنایان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد شەلاقیان دا ئەنجا پیاوێك لەناو خەڵکەکەدا وتی: خوایە نەفرینی لێ کەیت چەند زۆر دەیهێنن - بۆ شەلاق لێدان - پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (نەفرینی لێ مەکە جا سوێندی خوارد من دەزانم بەڕاستی خوا و پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێ).

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال أتى النبي ﷺ بِسَكْرَانَ فَأَمَرَ بِضَرْبِهِ فَمِنَّا من يَضْرِبُهُ بيده وَمِنَّا من يَضْرِبُهُ بِنَعْلِهِ وَمِنَّا من يَضْرِبُهُ بِثَوْبِهِ فلما انْصَرَفَ قال رَجُلٌ ما له أَخْزَاهُ الله فقال رسول اللَّهِ ﷺ لَا تَكُونُوا عَوْنَ الشَّيْطَانِ على أَخِيكُمْ)[2] ئەبوهورەیرە - رەزای خوای لێ بێ - دەڵێ: پیاوێکی سەرخۆشیان هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ جا فەرمانی کرد بەلێدانی ئیتر هەمان بوو بەدەست لێدەدا و هەمان بوو بەنەعلەکەی لێدەدا و هەمان بوو بەجل و بەرگەکەی لێدەدا جا کاتێك رۆیشت پیاوێك ووتی: خوا ڕیسوای بکات! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: مەبنە یارمەتی دەری شەیتان لە دژی براکەتان).

١) رواه البخاري(٦٧٨٠)

٢) رواه البخاري (٦٧٨١)

# تۆڵەی جەردەیی و ڕێگری (الحرابة)

**یەکەم: پێناسەکەی**: (حرابة) کەسێکە یا زیاتر ڕێ لە ڕێبواران دەگرێ بە ئاشکرا ماڵیان لێ دەسەنێ یان دەیانکوژێ یا گیانیان دەخاتە مەترسیەوە پشت بەهێزو توانا دەبەستێ دووریشە لە بە دەمەوەهاتن.

**دووەم: بەشەکانی جەردەیی و ڕێگری**: چوار بەشی هەیە ئەمانەن :

أـ ئەوانەی هەرکەس و کاروانێك بەلایاندا تێپەڕێ دەیکوژن و سامانەکەشی دەبەن .

ب ـ ئەوانەی هەرکەس و کاروانێك بەلایاندا بڕوات دەیکوژن بەڵام سامانەکەی نابەن .

ج ـ ئەوانەی ماڵ وسامانی کاروان و ڕێبواران دەبەن بەڵام نایان کوژن وە دەست درێژی ناکەنە سەر گیانیان .

د ـ ئەوانەی ڕێبواران دەترسێنن ، بەڵام نایان کوژن و ماڵ وسامانیان لێ ناسەنن .

ئەم چوار بەشە خراپترینیان ئەوەیانە کە خەڵك دەکوژن و ماڵیان دەبەن وەسوکترینیان ئەوەیانە تەتها خەڵك دەترسێنن.

**سێ یەم: حوکمی هەریەک لەو چوار بەشە :**

أ ـ ئەوانەی ڕێبواران دەکوژن و سامانیان دەبەن : پێویستە بکوژرێن پاشان بە شوێنێکی بەرزدا سێ ڕۆژ هەڵواسرێن ـ دوای شۆردن و کفن کردنیان و نوێژ لەسەر کردنیان ، چونکە بە کارەکەیان کافر نەبوون ـ

ب ـ ئەوانەی تەنها خەڵکیان کوشتووە، ئەوە دەکوژرێنەوە و بەس، لێخۆش بوونی کەس و کاری کوژراوەکان سزاکەیان لەسەر لانابات، چونکە ئەم کوشتنەوەیان مافی خوایە. لێخۆش بوونی خەڵك سودی نیە.

ج ـ ئەوانەی تەنها ماڵ وسامانیان بردووە، ئەوە دەست وقاچیان بە پێچەوانەوە دەبڕدرێت، واتە: دەستی ڕاست لە مەچەکدا و قاچی چەپیان لە قولە پێدا. جا ئەگەر دووبارەی کردەوە دەست و

قاشەکەی تری دەبڕدرێت . بەمەرجێ ماڵ و سامانەکە چارەکە مسقالێك ئالتون بێت. ئەگەر کەمتر بوو ئەوە قازی چ تەمێ یەك بە گونجاو بزانێت دەیدات بەسەریدا .

ـ جیاوازی دز و ڕێگر ئەوەیە دز بەدزیەوە ماڵەکە دەبات، بەڵام جەردەو ڕێگر بەئاشکرا و بەزۆر دەیبات شوێنەکەی دوور لەشارو ئاوەدانیەوە .

د ـ ئەوانەی تەنها ڕێبوار دەترسێنن : ئەوە تەمێ دەکرێن وەك بەندکردن یا دوورخستنەوە . ئەمە ڕای گەورەی موسڵمانان چی بەچاك بزانێ ئەوەیان لەگەڵ دەکات دەشتوانێ لێیان ببورێ ئەگەر بەرژەوەندی لەوەدا بوو.

**چوارەم: بەڵگەی ئەم چوار حوکمە:** بەڵگەی ڕێگری و ئەو بەش و جۆرانەی کەباسمان کرد ئەم ئایەتە پیرۆزەیە.

﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٌ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ ﴾ المائدة: ٣٣. واتە: بێگومان سزای ئەو کەسانەی جەنگی دژی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ -دەکەن ـ جەردەی و ڕێگری دەکەن ـ هەر ئەوەیە بکوژرێن یا هەڵواسرێن بەدارا یان دەست و قاچیان بە پێچەوانە ببڕدرێت یان لە شوێنی خۆیان دووربخرێنەوە و بەندبکرێن ئەو سزایە ڕسوایی یە بۆیان لەدونیا و لە ڕۆژی دواییدا سزای گەورەیان بۆ هەیە ﴾

**پێنجەم: گەورەی موسڵمانان هەر سزایەکیان بدات ئازادە:**

ڕێگرو جەردە گەورەو پێشەوای موسڵمانان هەرسزایەك خۆی بەرژەوەندی ئیسلامی تێدابێ دەتوانێ بیدات بەسەریاندا کەلە ئایەتەکەدا هاتووە. چونکە پێغەمبەر ﷺ یەکێك لەو سزایانەی دا سەر عورەنیەکاندا کە دەست بڕین بوو. (عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ نَاسًا مِنْ عُرَيْنَةَ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- الْمَدِينَةَ فَاجْتَوَوْهَا فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « إِنْ شِئْتُمْ أَنْ تَخْرُجُوا إِلَى إِبِلِ الصَّدَقَةِ فَتَشْرَبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا ». فَفَعَلُوا فَصَحُّوا ثُمَّ مَالُوا عَلَى الرِّعَاءِ فَقَتَلُوهُمْ وَارْتَدُّوا عَنِ الإِسْلاَمِ وَسَاقُوا ذَوْدَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله

علیه وسلم- فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- فَبَعَثَ فِي أَثَرِهِمْ فَأُتِيَ بِهِمْ فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ وَتَرَكَهُمْ فِي الْحَرَّةِ حَتَّى مَاتُوا).[1] ئەنەسی کوڕی مالیك ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ دەڵێ: کەسانێك لەهۆزی عورەینە هاتن بۆخزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە ئاو وهەوای مەدینەیان پێنەکەوت ـ نەخۆش کەوتن ـ پێغەمبەری خواش پێفەرموون: (ئەگەر دەتانەوێ بڕۆنە دەرەوەی مەدینە بۆ لای ووشترەکانی زەکات ئەنجا شیرو میزیان بخۆنەوە) ئەوانیش وایان کرد جا چاك بوونەوە ـ لەو نەخۆشیەی لە مەدینە توشیان بوو بوو ـ ئەنجا دایان بەسەر شوانی ووشترەکاندا هەموویان کوشتن و پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام و ووشترەکانی پێغەمبەریان دایەبەر و بردیان جا ئەم هەواڵە بەپێغەمبەر ﷺ گەیشت . جا هێزێکی نارد بەشوێنیاندا هەموویان هێنانەوە ـ بۆ مەدینە ـ جا دەست و قاچیانی بڕی و چاویانی هەڵکۆڵی لە حەڕەڕە[2] فڕێ دان تا مردن).

**شەشەم: ئەگەر جەردەو ڕێگر پەشیمان ببێتەوە :**

ئەگەر پێش ئەوەی دەست گیر بکرێت جەردەو ڕێگر تەوبە بکەن و پەشیمان ببنەوەخۆیان بدەن بەدەستەوە، سزاو تۆڵەیان لەسەر لادەچێت . خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهِمْ ۖ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٤﴾ ﴾ المائدة: ٣٤ واتە:جگەر لەوانەی کە پەشیمان دەبنەوە پێش زاڵبوون بەسەریاندا تا بزانن کەبەڕاستی خوا لێبوردەی بەبەزەییە .

**حەوتەم: تۆڵەی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام کوشتنە:**

(عن عِكْرِمَةَ أَنَّ عَلِيًّا رضي الله عنه حَرَّقَ قَوْمًا فَبَلَغَ ابن عَبَّاسٍ فقال لو كنت أنا لم أُحَرِّقْهُمْ لِأَنَّ النبي ﷺ قال لَا تُعَذِّبُوا بِعَذَابِ اللَّهِ وَلَقَتَلْتُهُمْ كما قال النبي ﷺ من بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ).[3] عیکرەمە ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ دەڵێ: عەلی ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ کەسانێکی سوتاند ـ

---

١) رواه البخاري (٢٣٣) ومسلم (٩م١٦٧١).

٢) حرە شوێنێکی بەردەڵانی ڕەشە لەدەرەوەی مەدینەدا، ئەو شوێنە بوو شوانەکانیان تێدا کوشتبوو وەهۆی چاوهەڵکۆڵینیان ئەوەبو ئەوان چاوی شوانەکانیان هەڵکۆڵیبوو .

٣) رواه البخاري (٣٠١٧).

هەڵگەڕابوونەوە ـ ئەم هەواڵە بەعبدوڵڵای کوڕی عباس گەیشت جا ووتی: ئەگەر من بوومایە ئەم دەسوتاندن چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (بە سزای خوا ـ کەئاگرە ـ کەس سزا مەدەن) وەدەم کوشتن وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی (هەرکەس هەڵگەڕایەوە لەئیسلام ئەوە بیکوژن).

**هەشتەم: جادووباز دەکوژرێت :**

ئەوکەسەی جادووبازبێت و جادووبکات دەکوژرێت چونکە جادوو یەکێکە لەتاوانە گەورەکان و کوفرە.[1] کەواتە جادووباز بەهەڵگەڕاوە دادەنرێت و هەمان حوکمی هەیە .

خوای گەورە لە بارەی هاروت و ماروتەوە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ..............وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ﴾ البقرة: ١٠٢ واتە: وەکەسیان فێرنەدەکرد تا پێیان دەووت ئێمە هۆی تاقی کردنەوەین جا ئاگاداربە کافرنەبیت ..... وەبێگومان دەیزانی هەرکەس جادوو بکرێ لەرۆژی دوایی هیچ بەشێکی نابێ .

**نۆیەم: فاڵ گرەوە :**

فاڵگرتنەوە جۆرێکە لە کوفر و بێ باوەڕی چونکە لە کارەکەیدا شتانێك دەکات کەپێی بێ باوەڕ دەبێت وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کەباوەڕکردن بە فاڵگرتنەوە کوفرە کەواتە ئەو کەسەی کارەکەدەکات شیاوترە بێ باوەڕبێ ئەگەر باوەڕی بەڕاستی فاڵگرتنەوەکە هەبێ .

(عن صَفِيَّةَ عن بَعْضِ أَزْوَاجِ النبي ﷺ عن النبي ﷺ قال من أتى عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عن شَيْءٍ لم تُقْبَلْ له صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً).[2] صەفیە ـ ڕەزای خوای لێ بی ـ لەیەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە ـ علیەسلام ـ لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (هەرکەس بڕوات بۆلای فاڵچیەك و پرسیاری شتێکی لێ بکات چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت).

---

[1] بڕوانە (کتاب الکبائر الذهبی ٤٥، ٤٦)

[2] رواه مسلم (١٢٥/٢٢٣٠)

(عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « مَنْ أَتَى حَائِضًا أَوِ امْرَأَةً فِى دُبُرِهَا أَوْ كَاهِنًا فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ -صلى الله عليه وسلم- »).[1] ئەبوهوڕەیرە ـ ڕەزایی خوای لیّ بیّ ـ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ـ علیه سلام ـ فەرمویەتی: ( هەرپیاوێك بچێتە لای حەیزدارێك یا لە کۆمەوە بچێتە لای ئافرەتێك یا بڕوات بۆ لای فالّچیەك ئەوە بێگومان بیّ باوەڕ بووە بەو ئایینەی دابەزێنراوە بۆ موحەمەد ـ علیه سلام ـ).

**دەیەم: جنێودان بە خوا و قورئان و پێغەمبەر ـ ﷺ ـ کوفرە:**

هەر کەس جنێو بدات بە خوا یا قورئان یا بە پێغەمبەر ﷺ یا بەسونەتی پێغەمبەر ـ ﷺ ـ یا بە ئیسلام، هەموو ئەمانە کوفری ئاشکران ئەوەی بیکات لە ئیسلام دەرچووە و هەڵگەڕاوەیە.
(عن عَلِيٍّ رضي الله عنه أَنَّ يَهُودِيَّةً كانت تَشْتُمُ النبي ﷺ وَتَقَعُ فيه فَخَنَقَهَا رَجُلٌ حتى مَاتَتْ فَأَبْطَلَ رسول اللَّهِ ﷺ دَمَهَا).[2] عەلی کوڕی ئەبوتالیب ـ ڕەزای خوای لیّ بی ـ دەڵێ: ئافرەتێکی جولەکە جنێوی دەدا بە پێغەمبەر ﷺ وە قسەی پێدەووت پیاوێك دەستی خستە بینەقاقەی تا مرد پێغەمبەریش خوێنەکەی بە فیڕۆدا.

---

١) رواه أبو داود (٣٩٠٤) والترمزی (١٣٥) وابن ماجه (٦٣٩) وهو صحيح

٢) رواه أبوداود (٤٣٦١) وهو حسن

# تۆڵە سەندنەوە ( القصاص )

**یەکەم: پێناسەکەی:** ( قصاص) لەزمانی عەرەبی دا بەمانای شوێن پێ هەڵگرتنە لەڕۆیشتندا.

وەلەشەرع دا: مەبەست پێی تۆڵەسەندنە لەتاوانبارێك بەوێنەی ئەو زیانەی گەیاندویێتی بە کەسێك لەڕووی لاشەیی یەوە جاکوشتن بێت یان کەمتر لەکوشتن .

**دووەم: حوکمی تۆڵە سەندنەوە لەشەرعدا:**

واجبە تۆڵە لە تاوانبار بسەنرێت لە بەرامبەری تاوانەکەیدا، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى﴾ البقرة: ١٨٧ واتە: لە کوژراوەکاندا تۆڵە سەندنەوە لەسەر ئێوە فەرزکراوە ونووسراوە.

وە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَكُمْ فِى ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴾ البقرة: ١٧٩ واتە: لەتۆڵە سەندنەوەدا ژیان هەیە بۆ ئێوە .

(قَالَ أَبو هُرَيْرَةَ رضى الله عنه لَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ (صلى الله عليه وسلم) مَكَّةَ قَامَ فِي النَّاسِ، فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ «... وَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهْوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ، إِمَّا أَنْ يُفْدَى، وَإِمَّا أَنْ يُقِتل»).[1] ئەبوهورەیرە ـ ڕەزایی خوای لێ بێ ـ دەڵێ: کاتێ خوای گەورە ئازادکردنی شاری مەککەی بۆ پێغەمبەر ﷺ ئاسان کرد لە ناو مەککەدا هەستایە پیە و سوپاس و ستایشی خوای کردو پاشان فەرمووی: (ئەوەی کەسێکی کوژراوە ئەوە یەکێ لەم دوو ڕێگایە: یان خوێنی دەدرێ یان -بکوژەکە- دەکوژرێتەوە).

١) رواه البخاري (١١٢) ومسلم ١٣٥٥/٠٤٤٧)

**ـسێ یەم: کوشتنی موسڵمان تاوانێکی گەورەیە :**

خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێ: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ عُدْوَٰنًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴾ النساء: ٢٩—٣٠

واتە: خۆتان مەکوژن ـ یەکتر مەکوژن ـ بێگومان خوای بەبەزەیی یە پێتـان جـا هەرکـەس ئـەو کارەبکات بەدەست درێژی وستەم ئەو لە داهاتوودا دەخەینە ئاگرێکی بە هێزەوە وە ئەوسزایەش بۆ خوا ئاسانە.

وە خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێ: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴾ النـساء: ٩٣ واتـە: ئەوەی ئیماندارێك بەئەنقەست بکوژێ ئەوە سـزاکەی دۆزەخـە هەمیـشەیی دەبـێ تێیـدا وە خـوا خەشمی لێ گرتووە و نەفرینی لێ کردووە و سزایەکی گەورەی بۆ ئامادەکردووە .

(عن أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ قالوا يا رَسُولَ اللَّهِ وما هُنَّ قال الشِّرْكُ بِاللَّهِ وَالسِّحْرُ وَقَتْلُ النَّفْسِ التي حَرَّمَ الله إلا بِالْحَقِّ وَأَكْلُ الرِّبَا وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ وَالتَّوَلِّي يوم الزَّحْفِ وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلَاتِ).[١] ئەبوهورەیرە ـ ڕەزایی خوایْ لێ بێ ـ دەڵێ: پێغەمبەری خو ا (ﷺ) فەرمووی: (خۆتان لە حەوت تاوانە فەوتێنەرەکە بپارێزن) ووترا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کامانەن؟ فەرمووی: (هاوبەش دانان بۆخوا و جادووکردن و بە هەق نەبێ کوشتنی کەسێك خوا کوشتنی حەرام کردووە و ماڵی هەتیوو خواردن و سوو خواردن وهەڵهاتن لە ڕۆژی ڕووبەڕووبونەوەدا و بوختان کردن بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی بێ ئاگا یانی باوەڕداران). (عن عبد اللَّهِ بن مسعود رضي الله عنه قال قال النبي ﷺ أَوَّلُ ما يُقْضَى بين الناس في الدِّمَاءِ).[٢] عەبدوڵڵای کوڕی مسعود ـ ڕەزایی خوای لێ بێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (یەکەم شت دادگای دەکرێ لە نێوان خەڵکدا لە کوشتندایە ـ لە ڕۆژی دواییدا ـ).

---

١) رواه البخاري (٢٧٦٦) ومسلم (٨٩).

٢) رواه البخاري (٦٥٣٣) و مسلم (١٦٧٨)

**چوارەم: مەرجەکانی تۆڵە سەندنەوە:**

چوار مەرج پێویستە بۆ تۆڵەسەندنەوەی کوشتن کە ئەمانەن:

أ ـ دەبێ تۆڵە لێ سەندراوەکە باڵغ و ژیر بێت. چەندین جار بەڵگەی ئەم بڕگەیەمان باس کردووە.

ب ـ باوك ودایكی كوژراوەكە نەبێت هەروەها باپیرەو نەنكیش نەبێ، ئەگەر وابوو تۆڵەی لێناسەنرێ. (عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه قال سمعت رسول الله ﷺ يقول: لا يقاد الأب بابنه). [1] عومەری كوڕی خەتتاب ـ ڕەزایی خوای لێ بێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (باوك لەبەرامبەر كوڕەكەدا ناكوژرێتەوە).

ج ـ كوژراوەكە كوشتنی دورست نەبێ ـ چونكە موسڵمانە یا خاوەن پەیمانە سەرانە دەدات.

د ـ كوژراو بكوژ بەرامبەر بن ـ نابێ كوژراوەكە كەمتر بێت لە بكوژەكە لە بەرئەوە كافر یا كۆیلەیە بكوژەكەشی موسڵمانی ئازادە ناكوژرێنەوە.

(قال علي رضي الله عنه قال رسول الله ﷺ ولا يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ). [2] عەلی ـ ڕەزایی خوای لێ بێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (موسڵمان بە كافر ناكوژرێتەوە).

*** ئایا پیاو بەكوشتنی ئافرەت دەكوژرێتەوە؟**

زانایان ڕایان جیاوازە بەڵام ڕای بەهێزو هەڵبژاردە ئەوەیە كە دەكوژرێتەوە. ئیبن مونزیر یەك دەنگی زانایان دەگێڕێتەوە لەسەر كوشتنەوەی پیاو بە كوشتنی ئافرەت، تەنها ڕایەكی عەلی نەبێ كە حەسەن و عەتا لێ ی دەگێڕنەوە. [3] (قال النبي ﷺ : وَأَنَّ الرَّجُلَ يُقْتَلُ بِالْمَرْأَةِ). [4] پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (....پیاو بەكوشتنی ئافرەت دەكوژرێتەوە).

*** وە ئافرەتیش لە بەرامبەر پیاودا دەكوژرێتەوە:**

جیاوازی نیە لە نیوان زانایاندا كە ئافرەت ئەگەر پیاوێك بكوژێ دەكوژرێتەوە .

---

١) رواه الترمزي(١٤٢٢) و ابن ماجه(٢٦٦) وهو صحيح .

٢) رواه البخاري (٦٩٠٣).

٣) بروانه الاجماع ٦٥٣ والبخاري رواه معلقا في صحيحه ٢١٤/١٢

٤) رواه النسا ئي ٥٧/٨ (٤٨٥٣) وابن ماجه (٧٩٣)موارد و أنظر حديث (٦٨٩٤٥) في صحيح البخاري.

**پێنجەم: جۆرەکانی کوشتن:**

أ ـ کوشتنی قەستی: ئەوەیە کوشتنی کەسێك بکات بەشتێ کە بەزۆری بەمەبەستی کوشتن بەکاردێ .

ب ـ هاوشێوەی قەستی: ئەوە نییەتی لێدانی بێت بەشتێك مرۆڤ پێی نامرێ بەو جۆرە لێدانە.

ج ـ بەهەڵە: ئەوەیە مەبەستی لێدان نیە بەڵکو مەبەستی کەسێکی تربووە بەڵام بەر ئەم کەوتووە.

**شەشەم: کەس وکاری کوژراو دەتوانن واز لەتۆڵەسەندووەبێنن و خوێن وەرگرن:**

لەحوکمی تۆڵەسەندنەوەدا باسمان کرد.

**حەوتەم: ئەو ئەنجامانەی لە کوشتن پەیدا دەبێ:**

أـ لە کوشتنی هاوشێوەی قەستی و هەڵە دا بکوژ کەفارەتی لە سەرەو خوێنیش لەسەر کەس وکاری بکوژکەیە ، خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ النساء: ٩٢ واتە: بۆ ئیماندار ڕەوانیە کە ئیماندارێك بکوژێ مەگەر بە هەڵە. جاهەرکەس ئیمانداریکی بەهەڵە کوشت ئەوە ئازادکردنی کۆیلەیەکی ئیماندار و تەسلیم کردنی خوێنیش بەکەس وکاری کوژراوە لەسەرە مەگەر بیبەخشن، بەڵام ئەگەر کوژراوەکە لە قەومێك بوو دوژمنی ئێوەبوون. بەڵام ئەو کوژراوە ئیمانداربوو ئەوە ـ بکوژەکە ـ کۆیلەیەکی ئیماندار ئازادبکات . وەئەگەر ئیماندارە کوژراوەکە لەناو قەومێکدا بوو پەیمان لەنیوانتاندا هەبوو دەبێ خوێنێك بدرێ بە کەس و کاری و کویلەیەکی ئیمانداریش ئازاد بکات جا ئەگەر - بکوژەکە- ئەوەی نەبوو ئەوە دەبێ دوومانگ لەسەریەك بەرۆژوو بێت ـ ئەم بڕیارە لێ بووردنە لەلایەن خواوە وەخواش هەمیشە زاناو کاربەجێیە.

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ( عَقْلُ شِبْهِ الْعَمْدِ مُغَلَّظٌ مِثْلُ عَقْلِ الْعَمْدِ ولا يُقْتَلُ صَاحِبُهُ) [١] (خوێنی کوشتنی هاوشێوەی قەستی خوێنێکی ئەستورکراوە وەك خوێنی قەستی وایە بەڵام بکوژەکەی ناکوژرێتەوە).

**ب ـ کوشتنی قەستی :**

کەس وکاری کوژراوەکە سەرپشکن لە نیوان کوشتن و خوێن وەرگرتن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَى ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰۚ فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖۗ ذَٰلِكَ تَخۡفِيفٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَرَحۡمَةٞۗ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ البقرة: ١٧٨. واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە لە کوژراوەکاندا تۆڵە سەندنەوەتان لەسەر پێویست کراوە ـ بەیەکسانی ـ ئازاد بەئازاد و بەندە بە بەندە و مێینە بە مێینە جا هەرکەس لە بەشێکی خوێنەکە بە خشرا لەلایەن برایەکی ئاینیەوە، دەبێ ـ خزمەکانی تر ـ پەیڕەوی بکەن بەباشی بکوژیش خوێنەکە بدات بەچاکی ئەمە سوککردن وبەزەیی یە لە پەروەردگارتانەوە . ئەنجا پاش ئەمە هەرکەس دەست درێژی کرد ئەوە سزایی سەختی بۆ هەیە.

(عن أبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رسول اللَّهِ ﷺ قال: ... وَمَنْ قُتِلَ له قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ إِمَّا أن يُـودي وَإِمَّا أن يُقَادُ....). [٢] ئەبوهوڕیرە ـ ڕەزایی خوای لێ بێ ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (....ئەوەی کەسێکی کوژرا ئەوە یەکێ لەم دوو ڕێگایە: یان خوێن دەدرێ یان دەکوژرێتەوە....).

ئەم خوێن دانە بەکوشتنەکە واجب نەبووە بەڵکو ئەم خوێنە لەجیاتی کوشتنەوەیە، لەبەرئەوە دەتوانن لەسەر شتێکی تر جگە لەخوێن ڕێکەوون با لە خوێنەکەش زیاتربێت بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە: (عن عَمْرِو بن شُعَيْبٍ عن أبيه عن جَدِّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا دُفِعَ إلى أَوْلِيَاءِ الْمَقْتُولِ فَإِنْ شَاءُوا قَتَلُوا وَإِنْ شَاءُوا أَخَذُوا الدِّيَةَ وَهِيَ ثَلَاثُونَ حِقَّةً

---

١) رواه أحمد وأبوداود سندصالح

٢) رواه البخاري(١١٢,٦٨٨٠) ومسلم (١٣٥٥).

وَثَلَاثُونَ جَذَعَةً وَأَرْبَعُونَ خلفه وما صَالَحُوا عليه فَهُوَ لهم وَذَلِكَ لِتَشْدِيدِ الْعَقْلِ).[١] عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە و لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (هەرکەس بەقەستی کەسێك بکوژێ دەدرێتە دەست کەس وکاری کوژراوەکە ، ئەگەر وویستیان دەیکوژن وە ئەگەر وویستیان خوێن وەردەگرن کەبریتیە لە سی حیقە[٢] وسی جەزعە[٣] و چل خەلیفە[٤] ئەوە خوێنی کوشتنی قەستی یە، ئەوەش لەسەری ڕێکەون ئەو مافی خۆیانە، ئەوەش بۆ قورس و گرنگی خوێنە).

بەڵام بەخشینی بەخۆڕایی چاکتروگەورەترە خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿وَأَن تَعْفُوٓا۟ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ البقرة: ٢٣٧. واتە ئەگەر لێبوردنتان هەبێ ببەخشن ئەوە لە پارێزکاری یەوە نزیکترە . (عن أبي هُرَيْرَةَ عن رسول اللَّهِ ﷺ قال: وما زَادَ الله عَبْدًا بِعَفْوٍ إلا عِزًّا).[٥] ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (هەربەندەیەك لێبوردەبێت خوا زیاتر سەربەرزی دەکات).

**هەشتەم: تۆڵەی کوشتنی هەڵە:**

تۆڵەی کوشتنی هەڵە خوێن دان و کەفارەتە وەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾

---

١) رواه الترمزي(١٤٠٦) وابن ماجه(٢٦٢٦) وهو حسن.

٢) حیقە: ووشترێکە سێ ساڵی تەواوکردبێ و چوبێتە چوارساڵەوە.

٣) جەزعە: مەڕێکە ساڵێکی تەواو کردبێ و چوبێتە ساڵی دووەمەوەیا ووشترێکە لەساڵی پێنجەمدابێ.

٤) خەلیفە: ووشترێکە ئاووس بێت و بەچکەی لەسکدابێ .

٥) رواه مسلم (٢٥٨)

النساء: ٩٢. پێشتر مانامان کردووە.[١]

**نۆیەم: خوێن دانی کوشتنی هەڵە دەکەوێتە سەر کەس وکاری بکوژەکە :**

کەفارەتی کوشتنی هەڵە کە کۆیلە ئازادکردنە ئەگەر نەبوو دوومانگ بەڕۆژوو بوونە لەسەر بکوژەکەیە بەڵام خوێندانەکەی لەسەر کەس وکاریەتی لەسەری باوکیەوە کە بەعەصەبە ناودەبرێن .

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ قال قَضَى رسول اللَّهِ ﷺ في جَنِينِ امْرَأَةٍ من بَنِي لَحْيَانَ سَقَطَ مَيِّتًا بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أو أَمَةٍ ثُمَّ إِنَّ الْمَرْأَةَ التي قَضَى لها بِالْغُرَّةِ تُوُفِّيَتْ فَقَضَى رسول اللَّهِ ﷺ بِأَنَّ مِيرَاثَهَا لِبَنِيهَا وَزَوْجِهَا وَأَنَّ الْعَقْلَ على عَصَبَتِهَا).[٢] ئەبوهورەیرە ـ رەزای خوای لێ بێ ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی کورپەی ئافرەتێکی بەنی لەحیان کە بەمردوویی لەبارچوو ـ ئافرەتێکی تر شتێکی پیاکێشاو وای لێهات ـ خوێنەکەی بەبەندەیەك یا کەنیزەکێك دانا پاشان ئەو ئافرەتەی بڕیاری بۆدرا مرد، جا پێغەمبەر ﷺ بڕیاری دا کە میراتەکەی بۆ منداڵ و مێردەکەیەتی خوێنەکەش ـ کەلەسەری بوو ـ لەسەر کەس وکاری ئافرەتە مردووەکەیە.

**دەیەم: کوشتنەوە بەلێخۆش بوونی یەکێک لەکەس وکاری کوژراو نامێنێ:**

چونکە کوشتنەوە یا خوێن وەرگرتن مافی کەس وکاری کوژراوەکەیە و دەتوانن هەریەك لە و دووانە هەڵبژێرن وە پێشتر لە فەرموودەی ئەبوهورەیرە دا باسکرا،جائەگەر هەموویان لێی خۆش بن کوشتنەوە نامێنێ وەئەگەر یەکێکیان لێی خۆشبێت هەر ناکوژرێتەوە چونکە بەش ناکرێت و خوێن دەدرێت پێیان .

(عن عَمْرِو بن شُعَيْبٍ عن أبيه عن جَدِّهِ قال قَضَى رسول اللَّهِ ﷺ أَنْ يَعْقِلَ الْمَرْأَةَ عَصَبَتُهَا من كَانُوا ولا يَرِثُوا منها شيئا إلا ما فَضَلَ عن وَرَثَتِهَا وَإِنْ قُتِلَتْ فَعَقْلُهَا بين وَرَثَتِهَا فَهُمْ يَقْتُلُونَ قَاتِلَهَا).[٣] عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە و لەباپیریەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: (پێغەمبەری خوا

---

١) لەبڕگەی (٧) ی (أ)دا لاپەرە ٦٣٦

٢) رواه البخاري(٦٧٤٠) و مسلم(١٦٨١/٣٥).

٣) رواه أبوداود ( ٤٥٦٤) والنسائي (٤٨٠١)وابن ماجه(٢٦٤٧) وهوحديث حسن .

ﷺ بڕیاری دا کەس و کاری ئافرەت ـ ی بکوژ ـ خوێنی بۆ بدەن[1] ئەو کەسانەی هەرکەس بن هیچ میراتیش لەو ئافرەتە نابەن ـ ئەگەرمرد ـ جگە لەوەی لەمیراتگرانی زیادبێ ، بەڵام ئەگەر بکوژرێت خوێنەکەی لەنێوان میراتگرانیدا دابەش دەکرێت جا هەر ئەوانیش دەتوانن بکوژەکەی بکوژنەوە یان ـ خوێنی لێ سەنن ـ ).

**یانزەیەم: ئەگەر لەناو میراتگرانی کوژراوەکەدا منداڵ هەبوو ، چاوەڕوان دەکرێ تابالغ دەبێ** . سەیری بڕگەی پێشوو بکە، چونکە هەموو میراتگرانی خاوەن بڕیارن بۆ کوشتنەوەی یا خوێن لێ سەندنی.

**دوانزەیەم: تۆڵە سەندنەوە نابێ ئەگەر هۆیەکەی دەست درێژی بۆسەرکراوبوو :** -

(عن عِمْرَانَ بن حُصَيْنٍ أَنَّ رَجُلا عَضَّ يَدَ رَجُلٍ فَنَزَعَ ثَنِيَّتَهُ فَاخْتَصَمَا إلى النبي صلى اللّٰهُ عليه وسلم فقال يَعَضُّ أحدكم أَخَاهُ كما يَعَضُّ الْفَحْلُ لا دِيَةَ له).[2] عیمرانی کوڕی حوصەین ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ دەڵێ: پیاوێك گازی گرت لەدەستی پیاوێك جا کابراش بەتوندی دەستی لەدەمی گازگرەکەدەرهێنا جا هەردوو کەڵبەی پێشەوەی کەوتن، ئەنجا شکاتیان هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (یەکێکتان گاز دەگرێت لە براکەی هەر چۆنێك ئاژەڵی نێر گاز دەگرێ هیچ خوێنی نییە).

**سیانزەیەم: چەند کەس لە کوشتنی کەسێکدا بەشداربن :**

ئەگەر چەند کەسێك کەسێك بکوژن ئەوەهەموویان دەکوژرێنەوە، (عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضى الله عنهما أَنَّ غُلاَمًا قُتِلَ غِيلَةً فَقَالَ عُمَرُ لَوِ اشْتَرَكَ فِيهَا أَهْلُ صَنْعَاءَ لَقَتَلْتُهُمْ).[3] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ ڕەزای خوایان لێ بێ ـ دەڵێ: کوڕێکی گەنج بە فێڵێك کوژرا ـ لەلایەن چەند کەسێکەوە ـ جا عومەر وتی: ئەگەر خەڵکی صەنعا لەکوشتنی دا بەشداریان بکردایە هەر هەموویانم دەکوشت ـ لەتۆڵەی دا.

---

١)ئەوانە خزمی ئافرەتەکەن لەسەری باوکیەوە خوێنیان دەکەوێتەسەر بەڵام میراتی ئەو کەسەنابەن مەگەر لە میراتگرانی بێنێتەوە .

٢) رواه البخاري(٦٨٩٢) ومسلم(١٣٠٠/١٦٧٣) .

٣) رواه مالك فى الموطأ ٢/(٨٧) (١٣) والبخاري تعليقا ٢٢٧/١٢ (٦٨٩٦) باسناد صحيح الى عمر.

**چواردەیەم: ئەندامەکان و برینداری لەش تۆڵەیان هەیە :**

ئەگەر ئەندامێکی لەشی مرۆڤ وەك چاو گوێ و دەست و قاچ لەکارخرا یانەمائەوە تۆڵـەی هەیـە لەتاوانبارەکە، هەروەها شوێنێکی بریندارکرا ئەوە تۆڵەی بریندارکردنەوەیەتی وەك خـۆی ئەگـەر نـەدەکرا دەبـێ خـوێن بـدات . خـوای گـەورە دەفـەرمووێ:﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ﴾ المائدة: ٤٥. واتە: لەتەوراتدا پێوستمان کرد لەسەریان کەبێگومان کەسێك لـەبانی کەسێکدا دەکوژرێتەوە وە چاو لەباتی چاو وەلووت لەباتی لووت وە گوێچکە لەباتی گوێچکە وە ددان لە باتی دداندا و وەزامەکانیش تۆڵەیان زامدارکردنەوەی دەست درێژ کرانە .

(عن أَنَسٍ أَنَّ أُخْتَ الرُّبَيِّعِ أُمَّ حَارِثَةَ جَرَحَتْ إِنْسَانًا فَاخْتَصَمُوا إلى النبي ﷺ فقال رسول اللَّهِ ﷺ الْقِصَاصَ الْقِصَاصَ فقالت أُمُّ الرَّبِيعِ يا رَسُولَ اللَّهِ أَيُقْتَصُّ من فُلَانَةَ والله لَا يُقْتَصُّ منها فقال النبي ﷺ سُبْحَانَ اللَّهِ يا أُمَّ الرَّبِيعِ الْقِصَاصُ كِتَابُ اللَّهِ قالت لَا والله لَا يُقْتَصُّ منها أَبَدًا قال فما زَالَتْ حتى قَبِلُوا الدِّيَةَ فقال رسول اللَّهِ ﷺ إِنَّ من عِبَادِ اللَّهِ من لو أَقْسَمَ على اللَّهِ لَـأَبَرَّهُ).[1] ئەنـەس ـ رەزای خوای لێ بێ ـ دەڵێ: خوشکێکی ڕوبـەیع کـە ئوموحاریـسەیە، کەسـێکی بریـندارکرد جـا سکاڵایان هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (تۆڵـە سـەندنەوە تۆڵە سەندنەوە ) دایکی روبەیعیش دەڵێ: ئایا تۆڵە لە فلان ئافرەت دەکرێتەوە؟ سوێند بـە خـوا تۆڵەی لێ ناکرێتەوە پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (سبحان الله ئەی دایکی روبیع تۆڵە سەندنەوە فەرمانی خوایە) ئەویش دەڵێ: نەبەخوا نابێ هەرگیز تۆڵەی لێ بکەیتەوە ئەنەس دەڵێ: بەردەوام ئەو ژنە هەروای دەووت تا وەکو بە خـوێن وەرگـرتن رازی بـوون، پێغەمبـەریش ﷺ فـەرمووی: (لەناو بەندەکانی خوادا کەسی واهەیە ئەگەر سوێند بـەخوا بخـوات داواکـەی بـۆ بـەجێ دێنـێ و سوێندەکەی ناخات).

---

١) رواه البخاری ( ٤٥٠٠) و مسلم (٢٤ / ٦٧٥)

**پانزەیەم: مەرجەکانی تۆڵەسەندنەوەی ئەندامەکانی لەش :**

مەرجەکانی کوشتن پێشتر باسمان کردن هەموو ئەو مەرجانە لەتۆڵەکردنەوەی ئەندامانی لەش دا پێویستە ببن لەگەڵ ئەم مەرجانەی تردا کە ئەمانەن:

أ ـ ئەندامی ئەوکەسەی تۆڵەی لێ دەسەنرێ هەمان ئەندامی دەست بۆ سەر درێژکراوەکەبێت . دەستی ڕاست دەبڕدرێت ئەگەر دەستی ڕاستی کابرای بڕیوە یا پەنچە گەورە بە پەنچە گەورە.....

ب ـ نابێ یەکێك لەو دووئەندامە لەکارکەوتوویێت دەستێکی ساغ نابڕدرێت لەجیاتی دەستێکی لەکارکەوتوو با تاوانبارەکەش ڕازی بێت، بەڵام دەستی لەکارکەوتوو دەبڕدرێت لە جیاتی دەستی ساغ .

ج ـ ئەو ئەندامەی تۆڵەی بۆدەکرێتەوە دەبێ لە جومگەیەکدا یا شوێنێکی دیاری کراودا بڕابێت وەکو گوێچکە ئەگەر وانەبوو وە برینداری یا درز تێبوون یا بڕین لەشوێنێکدا بو کە جومگە نیە یا دیاری کراو نیە ئەوە تۆڵەسەندنەوە دروست نیە ، چونکە ناتوانرێت وەك یەك بن کە مەرجە لە تۆڵە سەندن دا هەبێ.

# خوێنی کوژرا و ئەندامەکان (الدیات)

**یەکەم: پێناسەکەی:** (دیة) لەزمانی عەرەبی دا بەخوێن دانی کوژراو دەوترێت .

وە لە شەرع دا: ئەو ماڵ و پارەیە کە پێویستە تاوانبار بیدات بەهۆی تاوانەکەیەوە کوشتن بێت یا کەمتر لە کوشتن دەدرێت بەو کەسەی تاوانی بەرامبەرکراوە یان بەخاوەن و خزمانی.لەووشتریا نرخەکەی دەدرێت .

**دووەم: جۆرەکانی خوێن:** خوێن لەڕووی تاوانەکەیەوە دەبێتە دووبەشەوە :

أـ خوێنی گیان: ئەو خوێنەیە لەبەرامبەر کوشتنی کەسێکدا بە ناڕەوا دەدرێت .

ب ـ خوێنی ئەندامەکان: ئەو خوێنەیە لەبەرامبەر بڕین و لەکارخستنی ئەندامێکدا دەدرێت .

* بەڵگەی خوێندان و خوێن وەرگرتن ئەم ئایەتەیە ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ النساء: ٩٢. پێشتر مانامان کردوە.[١]

**سێ یەم: جۆرەکان خوێن لە ڕووی بە ئەنقەست یا هەڵە کوژراوە :**

أ ـ خوێنی ئەستورکراو: کەخوێنی کوشتنی بەقەستی و یا بە هاوشێوەی قەستی .

ب ـ خوێنی سووك : کە خوێنی کوشتنی هەڵەیە .

---

١) سەیری لاپەڕە ( ٦٣٦ ) بکە

**چوارەم: ئەندازەی خوێنی موسڵمانێکی پیاو :**

خوێنی موسڵمانێکی پیاو سەد ووشترە یان دووسەد ڕەشەوڵاخ یان دوون هەزار مەڕوبزن یان هەزار مسقاڵ ئاڵتون یا دوانزەهەزار دیرهەمە .

(عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « مَنْ قُتِلَ خَطَأً فَدِيَتُهُ مِائَةٌ مِنَ الإِبِلِ ثَلاَثُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ وَثَلاَثُونَ بِنْتَ لَبُونٍ وَثَلاَثُونَ حِقَّةٌ وَعَشْرَةٌ بَنِى لَبُونٍ ذُكُورٍ ». قَالَ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يُقَوِّمُهَا عَلَى أَهْلِ الْقُرَى أَرْبَعَمِائَةَ دِينَارٍ أَوْ عِدْلَهَا مِنَ الْوَرِقِ وَيُقَوِّمُهَا عَلَى أَهْلِ الإِبِلِ إِذَا غَلَتْ رَفَعَ فِى قِيمَتِهَا وَإِذَا هَانَتْ نَقَصَ مِنْ قِيمَتِهَا عَلَى نَحْوِ الزَّمَانِ مَا كَانَ فَبَلَغَ قِيمَتُهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- مَا بَيْنَ الأَرْبَعِمِائَةِ دِينَارٍ إِلَى ثَمَانِمِائَةِ دِينَارٍ أَوْ عِدْلَهَا مِنَ الْوَرِقِ. قَالَ وَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّ مَنْ كَانَ عَقْلُهُ فِى الْبَقَرِ عَلَى أَهْلِ الْبَقَرِ مِائَتَىْ بَقَرَةٍ وَمَنْ كَانَ عَقْلُهُ فِى الشَّاةِ أَلْفَىْ شَاةٍ وَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّ الْعَقْلَ مِيرَاثٌ بَيْنَ وَرَثَةِ الْقَتِيلِ عَلَى فَرَائِضِهِمْ فَمَا فَضَلَ فَلِلْعَصَبَةِ وَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَنْ يَعْقِلَ عَلَى الْمَرْأَةِ عَصَبَتُهَا مَنْ كَانُوا وَلاَ يَرِثُونَ مِنْهُ شَيْئًا إِلاَّ مَا فَضَلَ عَنْ وَرَثَتِهَا وَإِنْ قُتِلَتْ فَعَقْلُهَا بَيْنَ وَرَثَتِهَا وَهُمْ يَقْتُلُونَ قَاتِلَهَا).[1] عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە لەباوکیەوە لە باپیریەوە عەبدوڵلای کوڕی عومەر- ڕەزای خوایان لێبێ - کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (هەرکەس بەهەڵە بکوژرێت ئەوە خوێنەکەی سەد ووشترە: سی ووشتریان مێینە یەك ساڵی پێ لە دوو ساڵ بن و سی یان مێینەی دووساڵی پێ لەسێ ساڵ بن و سی یان مێینەی سێ ساڵی پێ لە چوار ساڵ بن دە یان ووشتری سێ ساڵی پێ لە چوار ساڵی نێربن . وەعەبدوڵلا ووتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە چوارسەد دینار ـ مسقاڵ ئاڵتوون ـ بۆ خەڵکی شارەکانی داشکاندەوە یا بەرامبەرەکەی لەزیو وەبە پێ ی کاتەکانی نرخی ووشتری دیاری دەکرد، بۆ ئەوانەی خاوەن ووشترن ئەگەر گران ببوایە نرخەکی بەرزدەکردەوە وەئەگەر هەرزان ببوایە نرخەکەی کەم دەکردەوە بەگوێرەی کات نرخەکەی دەگۆڕا جا نرخی لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لەنیوان چوارسەد دینار تا هەشت سەد دیناردا بوو یان بەرامبەرەکەی لە زیوو، وەپێغەمبەر ﷺ بڕیاری دا بۆئەوەی ڕەشەووڵاخی هەیە کە

---

١) رواه أبوداود(٤٥٤) والنسائي (٤٨٠١) وابن ماجه(٢٦٣٠)وهوحسن.

دووسەد مانگا بدەن وە ئەوەش مەڕ و بزنی هەیە دوو هەزار مەڕ و بزن بدەن وە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا کەخوێن میراتە لەنیوان میراتگرانی کوژراوەکەدا بەگوێرەی بەشەکانیان ـ لەمیرات ـ هەر چیشی زیادبوو ئەوە بۆ عەصەبەیە . وەپێغەمبەری خوا ﷺ ئەو خوێنەی لەسەر ئافرەتە عەصەبەکانی بیدەن هەرکەس بن وەهیچ میراتی لێنابەن مەگەر ئەوەی لەمیراتگران زیاد بێت وە ئەگەر بکوژرێت ئەو خوێنەکەی لەنیوان میراتگرانی دا دابەش دەکرێت وە هەر ئەوانیش بکوژی ئافرەتەکە ـ دەکوژنەوە ـ ).

**پێنجەم: ئەندازەی خوێنی گاور و جولەکەی پەیمان لەئەستۆ :**

خوێنی خاوەن نامەکان لە گاور وجولەکە ئەگەر لە سایەی ئیسلامی دا دەژیان و سەرانەیان دەدا و پەیمان لە ئەستۆیاندا بوو، ئەوە خوێنی نیوەی خوێنی موسڵمانە، (عن عَمْرِو بن شُعَيْبٍ عن أبيه عن جَدِّهِ عن النبي ﷺ قال دِيَةُ الْمُعَاهِدِ نِصْفُ دِيَةِ الْحُرِّ).[1] عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( خوێنی خاوەن پەیمان ـ گاور وجولەکە ـ نیوەی خوێنی کەسێکی ئازادی ـ موسڵمانە ـ).

**شەشەم: خوێنی ئافرەت و ئەندامەکانی:**

خوێنی ئافرەت نیوەی خوێنی پیاوە ، ئەندامەکانیشی بە هەمان شێوەیە ئەگەر لە سێ یەکی خوێن زیاتر بوو .

(عن شريح قال أتاني عروة البارقي من عند عمر أن جراحات الرجال والنساء تستوي في السن والموضحة وما فوق ذلك فدية المرأة على النصف من دية الرجل).[2] شورەیح دەڵێ: عوروەی باریقی لەلایەن عومەرەوە ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ هات بۆ لام : کەبرینەکانی پیاوان و ئافرەتان یەکسانن ـ لە خوێندا ـ لە ددان و برینێکدا ئێسقان دەرخات بەڵام لە سەرو ئەوەوە ئەوە خوێنی ئافرەت نیوەی خوێنی پیاوە ). ئەمە ڕایی زۆربەی زانایانە .

بەڵام لەبەرامبەریشدا ڕایەکی تریش هەیە دەڵێ: تاسێ یەکی خوێن ئافرەت و پیاو یەکسانن لە سێ یەك بە سەرەوە خوێنی ئافرەت نیوەی خوێنی پیاوە. عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە

---

١) رواه ابوداود(٤٥٨٣) والترمزي (١٤١٣) والنسائي (٨/٤٥ وابن ماجه(٢٦٤٤) وهوحديث حسن.

٢) رواه ابن أبي شيبه والبيهقي ٨/٩٥ ـ٩٦ باسناد صحيح.

لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خوێنی ژن وەك خوێنی پیاو وایە تا دەگاتە سێ یەکی خوێنی پیاو).[1]

**حەوتەم: خوێنی کۆرپە:**

ئەگەر کۆرپەیەك بمرێ بەهۆی دەست درێژی بۆ سەردایکی بە قەستی یان بەهەڵە و دایکی نەمرد ئەوە بەشە خوێنێك واجب دەبێت، جا چ بەمردووی لە دایك ببێت یان هەر لەسکی دایکیدا بمرێت کوڕ بێت یا کچ .

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: اقْتَتَلَتِ امْرَأَتَانِ مِنْ هُذَيْلٍ فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى بِحَجَرٍ فَقَتَلَتْهَا وَمَا فِي بَطْنِهَا فَاخْتَصَمُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّ دِيَةَ جَنِينِهَا عَبْدٌ أَوْ أمة، وَقَضَى بِدِيَةِ الْمَرْأَةِ عَلَى عَاقِلَتِهَا وَوَرَّثَهَا وَلَدَهَا وَمَنْ مَعَهُمْ قَالَ حَمَلُ بْنُ النَّابِغَةِ الْهُذَلِيُّ : يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ أَغْرَمُ مَنْ لاَ شَرِبَ وَلاَ أَكَلَ وَلاَ نَطَقَ وَلاَ اسْتَهَلَّ فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلُّ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- : «إِنَّمَا هَذَا مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ ». مِنْ أَجْلِ سَجْعِهِ.)[2]. ئەبوهورەیرە - رەزایی خوای لێبێ - دەڵێ: دوو ژن لە هۆزی هوزەیل دەبێ بەشەڕیان یەکێکیان بەردێك دەگرێتە ئەوەی تریان دەیکوژێت لەگەڵ منداڵەکەی سکیدا، جا لای پێغەمبەر (ﷺ) شکات دەکەن، پێغەمبەریش (ﷺ) بڕیاری دا خوێنی کۆرپەکە بەشەخوێنێکە بە بەندەیەك یان کەنیزەیەك ، و بڕیاری دا خوێنی ژنەکەش لەسەرکەس وکاری ژنە بکوژەکەیە. میراتی ژنە ( کوژراوەکەی ) دا بە کوڕەکەی ئەوانەی لەگەڵیدا بوو جا حەمەلی کوڕی نابیغە ی هوزەلی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن خوێنی کەسێك ببژێرم کە نە ئاوی خواردۆتەوە و نەنانی خواردووە نەقسەی کردووە و نەهاواری کردووە جا وێنەی ئەو جۆرەکەسە خوێنی نیە بە فیڕۆدەڕوات . پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (ئەمە لەبرادەرانی کۆڵەنانی و فاڵچیەکانە) لەبەر ئەو بەیت و بالۆرەی کە ووتی).

بەڵام ئەگەر منداڵەکە بەزیندووی لەدایك بوو پاشان مرد ئەوە خوێنکی تەواو دەکەوێتە سەر لێ دەرەکە .

---

١) رواه النسائي(٨/٤٥) والدارقطني (٣/٩١).

٢) رواه البخاري (٥٧٥٨) ومسلم (١٦٨١) .

جا ئەگەر کوڕ بوو ئەوە سەد ووشتر خوێنەکەیەتی وەئەگەر کچ بوو پەنجا ووشتر خوێنەکەیەتی. چونکە ئێمە دڵنیابووین کە مردنەکە بەو لێدانە بووە کە لە دایکی دراوە جا وەك کوڕیە نەبێت وایە .

**هەشتەم: ئەندازەی خوێنی ئەندامەکان و برینی سەر و چاو:**

هەردوو چاو هەردوو لێو و هەردوو دەست و هەردوو قاچ و هەردوو هێلکەی گوون خوێنی هەریەك لەم جووتانە خوێنی مرۆڤێکی تەواوە ، یەك دانەیان نیوەی خوێنەکەیە. هەروەها لووت و زمان و کێر خوێنکی تەواون . وەبرینێك بگاتە پەردەی سەر مۆخ یا بگاتە ناوسکی سێ یەکی خوێنی دەست بۆسەردرێژکراوەکەیە و بە لەجێ چوونی ئێسقان لە دە یەك و نیوی خوێنە ١٠ / ١,٥

**نۆیەم: خوێنی برینەکانی سەرو دەم و چاو کە دە جۆرن :**

١ ـ الخارصة: ئەوەیە پێستەکە لابات و خوێنی لێ نەیەت .

٢ ـ الدمية : ئەوەیە خوێنی لێبێت .

٣ ـ الباضعة: ئەوەیە جگە لە گۆشتەکەش لەت بکات .

٤ ـ التلاحمة: ئەوەیە برینەکە زۆر بڕواتە ناو گۆشتەوە .

٥ ـ السمحاق: ئەوەیە لەنیوان برینەکەو ئێسکدا پەردەیەکی تەنك مابێت .

ئەم پێنجە پێیان دەوترێت (شجاج) نە تۆڵەسەندنەوەیان هەیە نە بەشێکی خوێن بەڵکو پارەیەکی بۆ دادەنرێت بەقەدەر زیانەکەی لێی کەوتووە لەلایەن قازیەوە .

٦ـ الموضحة: ئەو برینەیە بگاتە ئێسکەکان ئەوە پێنج ووشتری دەکەوێت.

٧ـ الهاشمية: ئەوەیە ئێسکەکەی وورد کردبێ و شکاندبێتی ، ئەمیش دە ووشتری دەکەوێت .

٨ـ المنقلة: ئەوەیە ئێسکەکە لەجێ ببات ، کە پانزە ووشتری دەکەوێت.

٩ـ المأمومة: ئەو برینەیە کە لە نیوان ئەو و مۆخی سەردا پەردەیەکی تەنك هەیە ئەمە سێ یەکی خوێنی دەکەوێت .

١٠ـ الدامغة: ئەو برینەیە بگاتە مۆخی سەر ئەمەش سێ یەکی خوێنی دەکەوێت .

**دەیەم: کەی خوێن ئەستور دەکرێت :**

خوێنی قەستی و هاوشێوەی قەستی ئەستور دەکرێتەوە وەزانایان یەك دەنگن کەئەستورکردنی خوێن تەنها لە ووشتردایە نەك ئاڵتوون و زێڕوزیوو وپارە .

**یانزەیەم: چۆن خوێن ئەستوردەکرێت:**

خوێن ئەستورکردن ـ قورس کردن ـ لە ووشتردا ئەوە سەد ووشترکە چلیان ئاوس بن.

(قَالَ رسول الله ﷺ:« أَلاَ إِنَّ دِيَةَ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ مَا كَانَ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا مِائَةٌ مِنَ الإِبِلِ مِنْهَا أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا أَوْلاَدُهَا »).[1] پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (ئاگادارین بێگومان خوێنی کوشتنی هەڵەی هاوشێوەی قەستی ئەوەیە بەقامچی و داردەست بێت، سەد ووشتر کە چلیان بەچکە لەسکیاندابێت).

---

١) رواه أبوداود (٤٥٤٧) وابن ماجه(٢٦٢٧) وهوحديث صحيح .

# سوێند خواردنی کوشتن (القسامة)

**یەکەم: پێناسەکەی:** (قسامة) لەزمانی عەرەبی دا: ناوە بۆ ئەو سوێندانەی کەس وکاری کوژراوەکە دەیخۆن یا ناوە بۆ سوێند خۆرەکان .

وە لەشەرعدا : پەنجا سوێندە کەس وکاری کوژراوەکە دەیخۆن کاتێك گومان دەکرێت کەسێك کوشتبێتی لەگەڵ بوونی نیشانە لەسەر نزیکی ئەو گومانە لەڕاستیەوە . یان پەنجاکەس لەگومان لێکراوەکان پەنجا سوێند دەخۆن ئەگەر هیچ نیشانەیەك نەبوو ئەو گومانەبەهێز بکات .

ئەم جۆرە سوێند خواردنە کاتێکە کەکەسێك بەکوژراوی بدۆزرێتەوە کەس نەزانێ کێ کوشتوویەتی جا ئەو کەسانەی گومان هەیە بکوژەکە لە ناویاندا بێت پەنجا کەسیان لێ سوێند دەدرێ ئەگەر نیشانەیەکی ئاشکرا هەبوو کەیەکێکیان یان هەموویان کوشتوویانە، جا ئەگەر لە گوندێکدا بوو هەموویان سوێند دەدرێن یا لە نێوان دوو گوندادا بوو ئەوەیان نزیکترە. لەکوژراوەکەوە سوێند دەدرێت .

ئەم سوێند خواردنە پێش ئیسلام هەبووە وەیەکەم کەسێك کاری پێ کردووە وەلیدی کوڕی موغیرە بووە پاشان کە ئیسلامیش هات بەچەند بنەما و مەرجێك هێڵایەوە کە دواتر باسیان دەکەین .

**دووەم: بەڵگەی ڕەوایی ودروستی سوێندخواردنی کوشتن:**

ئەم شێوە سوێندخواردنە لەسەر کوژراو پێچەوانەی ئەو یاسایە کە (الْبَيِّنَةُ على الْمُدَّعِي وَالْيَمِينُ على الْمُدَّعَى عليه).[1] پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (داواکار دەبێت شایەتی هەبێ و داوالێکراویش سوێندخواردنی لەسەرە).

(عن الأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ أَرْضٍ بِالْيَمَنِ فخُاصُمتةٌ إِلَى النبي صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ: هَلْ لَكَ بَيِّنَةٌ؟ فقُلْتُ: لاَ قَالَ: فَيَمِينُهُ. وفي روايـة: فَقَالَ

---

١) رواه الترمزى ( ١٣٥٦) والبيهقى (١٥٢/١٠) وهوحديث صحيح .

شَاهِدَاكَ أَوْ يَمِينُهُ).[١] ئەشعەسی کوڕی قەیس ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ دەڵێ: لەنیوان من و پیاوێکدا کێشەیەك هەبوو لەسەر زەویەك لەیەمەن جا منیش شکاتیم لای پێغەمبەر ﷺ کرد جا فەرمووی: (ئایا شایەتت هەیە) ووتم: نەخێر، فەرمووی: (جا سوێندی ئەو دەدرێت) لەڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: (تۆ دوو شایەت بێنە یان سوێند خواردنی ئەو).

**بەڵگەی قەسامە:** (قال أبو سَلَمَةَ بن عبد الرحمن وَسُلَيْمَانُ بن يَسَارٍ مولى مَيْمُونَةَ زَوْجِ النبي ﷺ عن رَجُلٍ من أَصْحَابِ رسول اللَّهِ ﷺ من الْأَنْصَارِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَقَرَّ الْقَسَامَةَ على ما كانت عليه في الْجَاهِلِيَّةِ)[٢] ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدو ڕەحمان و سەلمانی کوڕی یەسار دەگێڕنەوە لە پیاوێك کەلە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەڵێ: (پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندخواردنی کوشتن ـ القسامە ـ ی هێڵایەوە بەو شێوەی لە سەردەمی نەفامیدا هەبوو).

(عن بُشَيْرِ بن يَسَارٍ عن سَهْلِ بن أبي حَثْمَةَ قال يحيى وَحَسِبْتُ قال وَعَنْ رَافِعِ بن خَدِيجٍ أَنَّهُمَا قالا خَرَجَ عبد اللَّهِ بن سَهْلِ بن زَيْدٍ وَمُحَيِّصَةُ بن مَسْعُودِ بن زَيْدٍ حتى إذا كَانَا بِخَيْبَرَ تَفَرَّقَا في بَعْضِ ما هُنَالِكَ ثُمَّ إذا مُحَيِّصَةُ يَجِدُ عَبْدَ اللَّهِ بن سَهْلٍ قَتِيلًا فَدَفَنَهُ ثُمَّ أَقْبَلَ إلى رسول اللَّهِ ﷺ هو وَحُوَيِّصَةُ بن مَسْعُودٍ وَعَبْدُ الرحمن بن سَهْلٍ وكان أَصْغَرَ الْقَوْمِ فَذَهَبَ عبد الرحمن لِيَتَكَلَّمَ قبل صَاحِبَيْهِ فقال له رسول اللَّهِ ﷺ كَبِّرْ الْكُبْرَ في السِّنِّ فَصَمَتَ فَتَكَلَّمَ صَاحِبَاهُ وَتَكَلَّمَ مَعَهُمَا فَذَكَرُوا لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَقْتَلَ عبد اللَّهِ بن سَهْلٍ فقال لهم أَتَحْلِفُونَ خَمْسِينَ يَمِينًا فَتَسْتَحِقُّونَ صَاحِبَكُمْ أو قَاتِلَكُمْ قالوا وَكَيْفَ نَحْلِفُ ولم نَشْهَدْ قال فَتُبْرِئُكُمْ يَهُودُ بِخَمْسِينَ يَمِينًا قالوا وَكَيْفَ نَقْبَلُ أَيْمَانَ قَوْمٍ كُفَّارٍ فلما رَأَى ذلك رسول اللَّهِ ﷺ أَعْطَى عَقْلَهُ)[٣]. ئەبوشەیری کوڕی یەسار دەڵێ: سەهلی کوڕی ئەبی حەثمە و رافیعی کوڕی خەدیج هەردووکیان دەڵێن : عەبدوڵلای کوڕی سەهلی کوڕی زەید و موحەیصەی کوڕی مسعودی کوڕی زەید لە مەدینە ـ دەرچوون هەتا گەیشتنە خەیبەر لە هەندی شوێنی خەیبەردا لە یەکتر جیابوونەوە، پاشان حوەیصەی عەبدوڵلای کوڕی سەهل بەکوژراوی دەدۆزێتەوە و دەینێژێ ، پاشان موحەیصە لەگەڵ حوصەی کوڕی

١) رواه مسلم ( ١٣٨)

٢) رواه مسلم ( ١٦٧٠/٧) .

٣) رواه مسلم ١/ ١٦٦٩

مەسعود و عەبدوڕەحمانی کوڕی سەهل ـ کەلە هەموویان مندالْ تربوو ـ دێتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ جا عەبدوڕەحمان ویستی دەست بەقسەبکات لە پێش هەردوو هاوڕێکەیەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی:( با گەورەکەتان قسە بکات) جا ئەویش بێدەنگ بوو و دوو هاوڕێکەی قسەیان کرد ئەویش لەگەڵیاندا قسەی کرد و باسی کوشتنی عەبدوڵڵا یان کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرموی پێیان: (ئێوە پەنجا سوێند دەخۆن ئەنجا ڕاست دەکەن کە هاوڕێکەتان جوولەکەکان کوشتوویانە ؟) یان بکوژی هاوڕێکەتان پەنجا سوێند دەخۆن ووتیان: چۆن سوێند بخۆین هیچمان نەدیوە؟ فەرمووی (دەی جوولەکەکان بە پەنجا سوێندخۆر بێ تاوانی خۆیان دەسەلمێنن ) ووتیان چۆن سوێندی کەسانێکی بی باوەڕ وەردەگرین؟ جا کەپێغەمبەر ﷺ ئەوەی دی خۆی خوێنەکەی دا ).

**سێ یەم: مەرجەکانی سوێندی کوژراو :**

أـ کوژراوەکە لەشوێنەکەیدابێت، بەدڵنیایی نەزانرێت کێ کوشتوویەتی .

ب ـ کەس وکاری کوژراوەکە بڵێن کەسێك یا کۆمەڵێکی دیاری کراو کوشتوویانە بەڵام شایەتیان نیە ڕاستی قسەکەیان بسەلمێنێ .

ج ـ نیشانەیەکی واهەبێ کە قسەی کەس وکاری کوژراوە کە هەڵبگرێ ڕاست بێ وەك ئەوەی لەناو دووژمنەکانیدا کوژرا بێ و جگە لەوان کەسی تری تێدانیە یان گومان لێکراوەکە خوێن بەجل و بەرگەکەیەوە بێت یا چەقۆیەکی خوێناوی بەدەستەوەبێت یا کۆمەڵێك لە ماڵێکدا کۆببنەوە کە بڵاوەیان لێ کرد کوژراوێك لە ماڵەکەدا بێت یا یەك کەسی عادل شایەتی دا فلانەکەس کوشتوویەتی ئەمانە هەموو نیشانەی ئاشکران .

جا لەو کاتەدا کەس وکاری کوژراوەکە پەنجا سوێند دەخۆن کەفلانەکەس کوشتوویەتی یا فلانە کۆمەڵێك ناویان دەبەن . ئەگەر ئەو سوێندەیان خوارد دەبی بەرامبەرەکەی خوێنی کوژراوەکە بدەن.

بەڵام ئەگەر نیشانەی ناشکرانەبوو کە کەسێك بوو یان کۆمەڵێك کوشتوویانە لەو کاتەدا گومان لێکراوەکە پەنجا سوێند دەخوات ئەگەر کەسێك وە پەنجا کەسیان سوێند دەخۆن ئەگەر زۆربوون کە سوێندیان خوارد ئیتر هیچ پەیوەندیەکیان بەو کوژراوە وە نامێنێ لەسەریان لادەچێت.[1]

١) بۆ ئەو بڕگانە سەیری فەرموودەی (٣٨٤٥) بکە لە صحیحی بوخاری دا .

# کتێبی دادوەری ( القضاء )

**یەکەم: پێناسەکەی:**

(القضاء ) لەزمانی عەرەبیدا بەم مانەیە دێت: حوکم وبڕیار، کۆتایی هێنان وتەواو بوون ، پێدانەوەی قەرز ، دروست کردن . بەم مانایانە هەمووی لە قورئاندا هاتووە.[١]

وە لە شەرع دا: کۆتایی هێنانە بەکێشەی نێوان دووکەس یا زیاتر بەبڕیاری خوا و پێغەمبەرﷺ:

**دووەم: ڕەوابوونی دادوەری :**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾ المائدة: ٤٩ واتەنوەك فەرمانمان پێ کردی ئەی موحەممەد کەلەنێوانیاندا حوکم بکەیت بەو ئایینەی خوا دایبەزاندووە . وەخوای گەورە دەفەرموێ:﴿ يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ ﴾ ص: ٢٦ واتە: ئەی داود ئێمە تۆمان کردووە بەجێنیشینی (پێغەمبەرانی پێش خۆت) لەزەویدا دەی تۆش بەق دادووەری بکە لەنێوان خەڵکیدا .

(عن عَمْرِو بن الْعَاصِ أَنَّهُ سمع رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول إذا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ وإذا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ).[٢] عەمری کوڕی عاص - ڕەزای خوای لێ بێ - دەڵێ: گوێی پێغەمبەری خوابوو ﷺ دەیفەرموو: (ئەگەر دادوەر دادوەری نێوان خەڵکی کرد و کۆششی کردو پاشان ڕاستی پێکانەوە دووپاداشتی بۆ هەیە وەئەگەر دادوەری کردو کۆششی کردو هەڵەی کرد ئەوە پاداشتێکی بۆ هەیە).

---

١) بڕوانە سورەتی اسراء /٣٢ و سورەتی قصص / ١٥ و سورەتی الحجر / ٦٦ و سورەتی فصلت/ ١٢

٢) رواه البخاری (٧٣٥٢) ومسلم (١٧١٦).

**سێ یەم: حوکمی دادوەری:**

فەرزی کیفایەیە و پێویستە گەورەی موسڵمانان دادوەر دابنێ لە شارەکاندا بەپێی پێویست بۆ دادوەری کردن لەنێوان خەڵکدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ عەلی بەدادوەر نارد بۆ یەمەن هەروەها جێنیشینە ڕاستەکان خۆیان دادوەر بوون و دادوەریشیان بۆ شارو وڵاتەکان داناوە .

**چوارەم: حیکمەتی دانانی دادوەری:**

گومانی تێدانیە خەڵك لەژیاندا کێشەیان دەبێت و پێویستیان بەکەسێك هەیە لەنێوانیاندا بڕیار بدات کێشەکەیان کۆتایی پێ بهێنێ وە زۆرجار دەسەڵاتدار ستەم لەبێ دەسەڵات دەکات بۆیە بوونی دادوەر زۆر پێویستە دادپەروەری لەزەویدا بەرپا بکات وەنەهێڵێ کەس ستەم لە کەس بکات زۆرێك لە کێشەی کۆمەڵایەتی بەدادوەر چارەسەر دەکرێ وەك کێشەکانی ژن و مێردایەتی کێشەکانی و چارەسەر کردنی .

**پێنجەم: مەرجەکانی قازی و دادوەر:**

أ ـ باڵغ و ژیرو موسڵمان بێت .

ب ـ پیاوبێت دروست نیە ئافرەت دادوەر بێت خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ ﴾ النساء: ٣٤ واتە: پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر ئافرەتانەوە بەهۆی ئەوەوە خوای گەورە هەندێکیانی بەرزکردۆتەوە بەسەر هەندێکیاندا . وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ امْرَأَةً) ( هیچ گەلێ سەرکەوتوونابن گەورەو فەرمان ڕەوایان ئافرەت بێ ).[1]

لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەژیانی خۆیدا قازی زۆری داناوە لەناویاندا ئافرەتی دانەناوە هەروەها جێنیشینەکانیش بەهەمان شێوە .

ج ـ پابەندبێت بەئیسلامەوە (العدالة) چونکە دادوەر بڕیار بۆ خەڵك دەدات نابێ خۆی کەسێکی ناڕێك و گوناهبار بێت .

---

١) رواه البخاري (٧٠٩٩)

د ـ بیستنی تەواو بێت: نابی کەڕ بێت چونکە ئەو لەنێوان خەڵکدا گوێ لەقسەیان دەگرێ جا بڕیار دەدات ئەگەر نەبیستێ چۆن دەتوانێ بڕیاری دروست بدات .

هـ ـ بینین: دەبێت بینا بێت تا بە چاکی خاوەن کێشەکان بناسێت و فێڵی لێ نەکرێ .

و ـ قسە کردن: لاڵ بۆ دادوەر نابێ چونکە دادوەر پێویستی بە قسەکردن هەیەلەگەڵ سکالاچیەکانداوەلام دانەوەی قسە یان فەرمانکردن بۆ نوسینی بڕیارەکە لەلایەن نوسەری دادگاوە ...

ز ـ بتوانێ بەکاری دادوەری هەڵستێ : نابێ لاوازو ترسینۆك بێت ئەگەر وابێ دادوەری پێ ناکرێ.

ح ـ شارەزاو خوێندەواربێ: ئەوەندە خوێندەوار بێ گەیشتبێتە ڕادەی (اجتهاد) باشترە ئەگەرنا دەبێ زۆر خوێندەواربێ تا بەچاکی بتوانێ وەلامی هەموو پرسیارو کێشەیەك بداتەوە .

(عن ابن بُرَيْدَةَ عن أبيه عن النبي ﷺ قال الْقُضَاةُ ثَلَاثَةٌ وَاحِدٌ في الْجَنَّةِ وَاثْنَانِ في النَّارِ فَأَمَّا الذي في الْجَنَّةِ فَرَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ فَقَضَى بِهِ وَرَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ فَجَارَ في الْحُكْمِ فَهُوَ في النَّارِ وَرَجُلٌ قَضَى لِلنَّاسِ على جَهْلٍ فَهُوَ في النَّارِ).[1] بورەیدە ـ ڕەزای خوای لێبی ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (دادوەرەکان سیانن، یەکێکیان لە بەهەشت دایە و دوانیان لەدۆزەخدان جا ئەوەیان کەلە بەهەشت دایە ئەوە پیاوێکە حەق دەزانێ و بڕیاری پێدەدات، بەلام پیاوێك حەق دەزانێ بەلام لەبڕیارو دادوەریدا ستەم دەکات ئەوەیان لەئاگری دۆزەخ دایە وەپیاوێك بەنەزانی دادوەری بۆ خەڵك دەکات ئەوە ئەویش لە ئاگردایە).

**شەشەم: گەورەی دادوەری:**

(عَبْدَ اللَّهِ بن مَسْعُودٍ قال قال النبي ﷺ لَا حَسَدَ إلا في اثْنَتَيْنِ رَجُلٌ آتَاهُ الله مَالًا فَسُلِّطَ على هَلَكَتِهِ في الْحَقِّ وَرَجُلٌ آتَاهُ الله الْحِكْمَةَ فَهُوَ يَقْضِي بها وَيُعَلِّمُهَا).[2] عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ـ ڕەزای خوای لێبی ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (حەسوودی ڕەوانیە لە دووشت دا نەبێ: پیاوێك خوای گەورە سەروەت وسامانێکی پێبدات لە حەق و ڕاستیدا خەرجی بکات وە

---

١) رواه أبوداود(٣٥٧٣) والترميزي(١٣٢٢) وابن ماجه(٢٣١٥) وهوحديث صحيح

٢) رواه البخاري (٧٣١٦) و مسلم (٨١٦)

پیاوێك خوای گەورە داناییەکی پێبدات جا دادوەری پێبکات لەنێوان خەڵکیداو فێری خەڵکیش بکات ).

**حەوتەم: ترسناکی دادوەری کردن :**

(عن أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال من وَلِيَ الْقَضَاءَ فَقَدْ ذُبِحَ بِغَيْرِ سِكِّينٍ).[1] ئەبوهوڕەیرە - ڕەزای خوای لێبی - دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (هەرکەسێك بکرێتە دادوەر ئەوە بەبێ چەقۆ سەربڕاوە).

**هەشتەم: ئادابەکانی دادوەری:**

**أ - دادپەروەر بێت لەنێوان داواکار و داوالێکراودا،** (عن عَلِيٍّ رضي الله عنه قال-بَعَثَنِي رسول اللَّهِ ﷺ إلى الْيَمَنِ قَاضِيًا فقلت يا رَسُولَ اللَّهِ تُرْسِلُنِي وأنا حَدِيثُ السِّنِّ ولاعلم لِي بِالْقَضَاءِ فقال إِنَّ اللَّهَ سَيَهْدِي قَلْبَكَ وَيُثَبِّتُ لِسَانَكَ فإذا جَلَسَ بين يَدَيْكَ الْخَصْمَانِ فلا تَقْضِيَنَّ حتى تَسْمَعَ من الْآخَرِ كما سَمِعْتَ من الْأَوَّلِ فإنه أَحْرَى أَنْ يَتَبَيَّنَ لك الْقَضَاءُ قال فما زِلْتُ قَاضِيًا أو ما شَكَكْتُ في قَضَاءٍ بَعْدُ).[2] ئیمامی عەلی - ڕەزای خوای لێبی - دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەدادوەر ناردمی بۆ یەمەن منیش ووتم تۆ دەمنێری لەکاتێکدا من تەمەن کەم و شارەزاییم نیە لە دادوەری ؟ فەرمووی: (بێگومان خوا دڵت ڕێنموون دەکات و زمانت دامەزراو دەکات جا ئەگەر هەکات داواکارو داوالێکراو لەبەردەمت دا دانیشتن بڕیارمەدە هەتا گوێ لە دوومیشیان ئەگری وەك چۆن گوێت لەیەکەمیان گرت چونکە بێگومان ئەوە چاکتر بڕیاردانت بۆ ڕوون دەکاتەوە) عەلی دەڵێ: ئیتر هەر قازی بووم یا ووتی : هیچ کات لە دادوەریدا گومان و دوودڵیم تووش نەبووە).

**ب - بە ئاسانی خەڵك بگەنە لای :**

(عن أَبِي مَرْيَمَ الأَزْدِيَّ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « مَنْ وَلاَّهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ شَيْئًا مِنْ أَمْرِ الْمُسْلِمِينَ فَاحْتَجَبَ دُونَ حَاجَتِهِمْ وَخَلَّتِهِمْ وَفَقْرِهِمُ احْتَجَبَ اللَّهُ عَنْهُ دُونَ

---

١) رواه أبوداود (٣٥٧١) والترميزى (١٣٢٥) وابن ماجه(٢٣٠٨) وهوحديث صحيح .

٢) رواه أبوداود(٣٥٨٢) والترمزى (١٣٣١) وابن ماجه(٢٣٠٨) وهوحديث صحيح .

حَاجَتِهِ وَخَلَّتِهِ وَفَقْرِهِ).[١] ئەبو مەریەمی ئەزدی ـ رەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: لەپێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: (هەرکەسێ خوا شتێکی لەکاروباری موسڵمانان دایەدەستی رێگریێ کرد لەوەی پێویستی نەدارو هەژاریان بگاتەلای خواش رێگری دەکات لەپێویستی و نەداری و هەژاری بگاتە لای خوا).

**ج ـ دروست نیە بەرتیل ودیاری وەربگرێت:**

(عن عبد اللَّهِ بن عَمْرٍو قال لَعَنَ رسول اللَّهِ ﷺ الرَّاشِي وَالْمُرْتَشِي).[٢] عەبدوڵلای کوڕی عەمر ـ رەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا رێگری دەکات نەفرینی کرد لەبەرتیل دەرو لە بەرتیل وەرگر).

**د ـ لە کاتی تورەیدا نابێ بڕیار بدات:**

(قال أَبُو بَكْرَةَ رضي الله عنه سَمِعْتُ النَّبِيَّ - صلى الله عليه وسلم - يَقُولُ « لاَ يَقْضِيَنَّ حَكَمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهْوَ غَضْبَانُ »).[٣] ئەبو بکر ـ رەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: (هیچ کەس لەنێوان دوو کەس دا بڕیار نەدات لەکاتێکدا زۆر تورەیە).

**هـ ـ دروستە دادوەر کەسانی تر هاوکاری بن :**

(عَنْ أَنَسٍ أَنَّ قَيْسَ بْنَ سَعْدٍ كَانَ يَكُونُ بَيْنَ يَدَىِ النَّبِىِّ - صلى الله عليه وسلم - بِمَنْزِلَةِ صَاحِبِ الشُّرَطِ مِنَ الأَمِيرِ).[٤] ئەنەسی کوڕی مالیك ـ رەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: قەیسی کوڕی سەعد هەمیشە لەنزیکی پێغەمبەردا بوو ـ علیەسلام ـ وەك نزیکی پۆلیس لەگەورەکەیەوە).

**و ـ دروستە قازی ـ دادوەر ـ تکاو ئامۆژگاری بکات :**

(عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْنًا كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي عهد رسول الله ﷺ فِي الْمَسْجِدِ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِهِ فَنَادَى كعب بن مالك فقال: «يَا كَعْبُ».

---

١) رواه أبوداود (٢٩٤٨) والترمزي (١٣٣٣) وهوحديپ صحيح.

٢) رواه الترمزي (١٣٥٢) وابن ماجه(٧٧٥) وهوحديپ صحيح.

٣) رواه البخاري (٧١٥٨) ومسلم (١٧١٧/١٦).

٤) رواه البخاري (٧١٥٥)

قَالَ لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ . فأشار إليه بيده أن «ضَعْ الشطر مِنْ دَيْنِكَ». قَالَ كعب قَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ «قُمْ فَاقْضِهِ»).[1] کەعبی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ قەرزێکی بەلای ئەبوحەدرەدەوە بـوو لەمزگـەوت دا داوای کـرد بیداتـەوە، بوویە دەنگە دەنگیان و دەنگیان بەرزبوویەوە تاپێغەمبەر ﷺ لەماڵی خۆیانەوە گوێی لـێ بـوو جاهاتە دەرەوە بۆلایان وەپەردەی ژورەکەی لادا و کەعبی کوڕی مالیکی بـانگ کـرد فـەرمووی: (ئـەی کـەعب)ووتـی لەخزمتـدام ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەدەستی ئامـاژەی کـرد نیـوەی قەرزەکەت داشکێنە کەعبیش ووتی ئەوەدامـشکاند ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺپێغەمبـەریش فەرمووی: (تۆش ـ ئەبوحەدرەد ـ هەستە قەرزەکەی بدەرەوە).

**ز ـ بڕیاری دادوەر ڕاستی ناگۆڕێت:**

هەرکەس دادوەر بڕیاری شتێکی بـۆدا کـەمافی براکەیـەتی بـا نـەیبات چـونکە بڕیـاری دادوەر حەڵاڵ حەرام ناکات و حەرامیش حەڵاڵ ناکات .

(عن أُمَّ سَلَمَةَ رضي الله عنها زَوْجَ النبي ﷺ أخْبَرَتْهَا عن رسول اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ سمع خُصُومَةً بِبَاب حُجْرَتِهِ فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ فقال إنما أنا بَشَرٌ وَإِنَّهُ يَأْتِينِي الْخَصْمُ فَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ من بَعْضٍ فَأَحْسِبُ أَنَّهُ صَدَقَ فَأَقْضِيَ له بِذَلِكَ فَمَنْ قَضَيْتُ له بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَـةٌ مـن النَّـارِ فَلْيَأْخُذْهَا أو فَلْيَتْرُكْهَـا).[2] ئوموسـەلەمە ـ ڕەزای خـوای لێبـێ ـ کـە خێزانـی پێغەمبـەرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ گوێی لە دەمەقاڵێەك بوو لەبەردەرگای ژوورەکەیدا جا ڕۆیشتە دەرەوە بۆ لایان و فەرمووی: (بێگومان من مرۆڤێکم وەك ئێوە بەڕاستی داوا چیەکان دێنـە لام جا لەوانەیە هەندێکیان قسە زانتربن لە هەندێکتان منیش گومـان دەبـەم ئـەو کەسـەیان ڕاست دەکات و بڕیاری بۆ دەدەم جاهەرکەس بڕیارم بۆدا حەقی موسڵمانێك بۆ ئەوبێت ئـەوە بێگومـان پارچەیەکە لە ئاگری دۆزەخ دەی با هەڵیگرێ یا وازی لێ بهێنێ).

**نۆیەم: تاوانی ئەو کەسەی داواکاری شتێک بێت کەموڵکی ئەونیە:**

بەڵگەی ئەمە فەرموودەکەی ئوموسەلەمەیە کەپێش ئەم بڕگەیە باسمان کرد .

---

١) رواه البخاري (٤٥٧) ومسلم (١٥٥٨)

٢) رواة البخاري(٢٤٥٨) وميلم (١٥٥٨)

**دەیەم: تاوانی ئەوکەسەی بەدرۆ سوێند دەخوات بۆ ئەوەی ماڵی خەڵکی پێ بخوات:**

عن عبد اللَّهِ بن مسعود رضي الله عنه قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من حَلَفَ على يَمِينِ صَبْرٍ يَقْتَطِعُ بها مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَقِيَ اللَّهَ وهو عليه غَضْبَانُ) [1] عەبدوڵلای کوڕی مەسعود - ڕەزای خوای لێبێ - دەڵێ: پێغەمبەری خوا - علیەسلام - فەرموویەتی: (هەرکەس سوێندبخوات بەسوێندێکی درۆ ماڵی موسوڵمانێکی پێ بچڕێ بۆخۆی گوناهبارو درۆزن بێ لەوسوێندەدا کەبەخزمەت خوای گەورە دەگات - لەدواڕۆژدا - زۆر لێی توڕەیە ).

**یانزەیەم: ڕێگاکانی چەسپاندنی داواکاری :**

**أ - داوالێکراودەبێت سوێند بخوات:** (عن ابن عَبَّاسٍ أَنَّ النبي ﷺ قال لو يُعْطَى الناس بِدَعْوَاهُمْ لَادَّعَى نَاسٌ دِمَاءَ رِجَالٍ وَأَمْوَالَهُمْ وَلَكِنَّ الْيَمِينَ على الْمُدَّعَى عليه).[2] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس - ڕەزای خوای لێبێ - دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەگەر ئەوەی خەڵکی داوادەکەن - لەسەرخەڵکی تر- پێیان بدرێت، بێگومان خەڵکانێ داوای خوێن وسامانی کەسانێکیان دەکرد - بەناڕەوا - بەڵام داوالێکراو سوێند خواردنی لەسەرە). ئەگەر داواکار شایەتی نەبوو.

**ب - دان پێدانان:** ئەگەر تاوانبار دان بنێت بەتاوانەکەیدا دادوەر کار بەودان پێدانانە دەکات و بڕیاری لەسەر دەدات.

(عن أَبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه وَزَيْدَ بْنَ خَالِدٍ الجهني وفيه: وَاغْدُ يَا أُنَيْسُ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا ، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا» . فَغَدَا عَلَيْهَا فَاعْتَرَفَتْ فَرَجَمَهَا).[3] ئەبوهوڕەیرە و زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی - ڕەزای خوایان لێبی - دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەنەسە بچکۆل بڕۆ بۆلای ژنی ئەم پیاوە جا ئەگەردانی نا بەزیناکەیدا ئەوا بەردبارانی بکە تادەمرێ).

---

١) رواه الخاری (٢٦٧٠) ومسلم (١٣٨/٢٢٠).

٢) رواه البخاری (٤٢٧٧) ومسلم (١٧١١)

٣) رواه البخاری (٢٦٩٦،٢٦٩٥) ومسلم (١٦٩٨،١٦٩٧).

ج ـ دادوەر یا بەشایەتی دووپیاو یا بەشایەتی پیاوێك و دوو ئافرەت بڕیار دەدات :

خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێ:﴿ وَٱسْتَشْهِدُوا۟ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ ۖ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحْدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَىٰهُمَا ٱلْأُخْرَىٰ ﴾ البقـــرة:٢٨٢.

واتە: دووپیاوی موسڵمان لەخۆتان بگرن بەشایەت ـ لەقەرزدان و مامەڵەدا ـ جا ئەگـەر دووپیـاو نەبوو پیاوێك ودوو ئافرەت بن لەو کەسانەی کەلێیان رازین لە شایەتەکاندا نـەوەك ئافرەتێکیـان لەبیری نەمێنێ ئافرەتەکەی تریان بیریخاتەوە .

د ـ یا دادوەر بەشایەتی پیاوێك و سوێندی داواکەر بڕیار دەدات :

(عن ابن عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى بِيَمِينٍ وَشَاهِدٍ).[1] عـەبدوڵڵای کـوڕی عـەبباس ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەسوێنـــ ی دواکـەر ـ و شـایەتێك بڕیـاری داوە ).

**دوانزەیەم: شایەتی دان (الشهادة)**

**أ ـ پێناسەکەی** : لەزمانی عەرەبیدا بەمانەی ئامادەبوون و هەواڵی ڕاست دێت .

وەلەشەرعدا : هەواڵ دان دەربارەی شتێك بە ووشەیەکی تایبەتی .

**ب ـ بەڵگەی ڕەوابوونی شایەتی دان** : خـوای گـەورە دەفـەرمووێ:﴿ وَٱسْتَشْهِدُوا۟ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ ﴾ البقـرة: ٢٨٢. واتـە: دووکـەس بگـرن بەشـایەت لـەپیاوە موسـوڵمانەکانتان .

وەدەفەرمووێ:﴿ وَلَا تَكْتُمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَ ۚ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ ﴾ البقـرة: ٢٨٣.

واتە: وەشایەتی مەشارنەوە وەهەرکەس بیشارێتەوە ئەو بێگومان بەدڵ گونهبارە .

(عن الأَشْعَثَ بْنَ قَيْسٍ قال: كَانَتْ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ خُصُومَةٌ فِي بِئْرٍ فَاخْتَصَمْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّـــهِ ﷺ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « شَاهِدُكَ أَوْ يَمِينُهُ »).[2] ئەشعەســی کـوڕی قـەیس ـ ڕەزای خـوای لێبێ دەڵێ: لەنێوان من و پیاوێکـدا کێـشە هـەبوو لەسـەر بیرێـك جاسـکالآمان بـردە خزمـەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (دووشایەتی بۆ یان سوێندخواردنی ئەو)

---

١) رواه مسلم (١٧١٢/٣).

٢) رواه مسلم (١٣٨)

وەزانایان یەك دەنگن لەسەر رەوایی شایەتی دان و سوننەت بوونی وە کەس لەزانایان پێچەوانەی ئەمەنین .

**ج ـ حیکمەتی ڕەوایی شایەتی دان :** حیکمەتی ڕەوایی شایەتی دان پارێزگاریـە لـە مافـەکان و چەسپاندنیەتی ، ئەگەر شایەتیان نەبووایـە زۆرێـك لـە مافـەکان دەفـەوتان نـەدەتوانرا مافـەکان بچەسپێنرێت بۆیە دانانی شایەتی دان ئەو مەبەستانە هەموو دێنێتە دی .

**د ـ شایەتی فاسق و گوناهبـار وەرنـاگیرێ:** خـوای گـەورە دەفـەرمووێ:﴿ وَأَشْهِدُواْ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ ﴾ الطلاق: ٢ واتە: با دوو کەسی دادپـەروەر لـە خۆتـان شـایەتی بـدەن . شـایەت دەبـێ پابەندبێ بەئیسلامەوە خەتاکار و گوناهبار نەبێت جا بەزانین و زانیـاری قـازی خـۆی عـەدالـەتی شایەتەکان دەزانرێ یان دوو کەسی عـەدل بـە چـاك هـەڵی سـەنگێنن . عەدالـەتیش بریتیـە لـە خۆپاراستن لە گوناهی گەورە و بەردەوام نەبوون لەسەر گوناهی بچکۆلە و شـتێك نـەکات لەگـەڵ پیاوەتی دا نەگونجێ .

**سیانزەیەم: داواکاری و شایەتەکان ( الدعاوی والبینات )**

**أ ـ پێناسەکەی (الدعاوی):** کـۆی (دعـوی)یـە بەمانـەی داواکردنـە خـوای گـەورە دەفـەرمویّ: ﴿ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴾ یس: ٥٧. واتە: وە ـ لەبەهەشت دا ـ هەرچی داوابکەن بۆیان هەیە .

وەلە شەرع دا(دعوی): هەواڵ دانە بەپێویست بوونی مافێك لەسەر کەسێك لەبەردەم قازی دا.

**ب ـ پێناسەی ( البیانات):** لەزمانی عەرەبی دا کۆی (بینة) یە بەمانای بەڵگەیەکی ڕوونە .

**وەلە شەرع دا:** شـایەتە بۆیـە ئـەم ناوەیـان لێنـراوە چـونکە بـەوان مافەکەدەردەکـەوێت و ڕوون دەبێتەوە .

**ج ـ بەڵگەی ڕوابوونی داواکاری و شـایەتەکان :** خـوای گـەورە دەفـەرمووێ:﴿ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴾ النور: ٤٨ واتـە: وەکاتـێ بـانگ بکـرێن بـۆلای (شەریعەتی ـ خواو پێغەمبەر ﷺ بۆئەوەی حوکم بکات لەنێوانیاندا یەکسەر کۆمـەڵێکیان ڕوو وەردەگێرن). وەخـوای گـەورە دەفـەرمووێ:﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُدْعَوْنَ

﴿إِلَىٰ كِتَٰبِ ٱللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ﴾ آل عمران: ٢٣ واتە: ئایا سەرنجی ئەوان نادەیت کەبەشێك لەتەوراتیان پێ دراوە بانگ دەکرێن بۆلای کتێبی خوا ـ تەورات ـ بۆئەوەی بڕیار بدات لەنێوانیاندا پاشان دەستەیەکیان پشت هەڵدەکەن و لەحاڵێکدا ئەوان ڕوو وەردەگێڕن .

(عن ابن عَبَّاسٍ أَنَّ النبي ﷺ قال لو يُعْطَى الناس بِدَعْوَاهُمْ لَادَّعَى نَاسٌ دِمَاءَ رِجَالٍ وَأَمْوَالَهُمْ وَلَكِنَّ الْيَمِينَ على الْمُدَّعَى عليه).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ـ ڕەزای خوایان لێبی ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەگەر ئەوەی خەڵکی داوای دەکەن ـ لەسەر خەڵکی تر ـ پێیان بدرێت، بێگومان خەڵکانێ داوای خوێن و سامانی کەسانێکیان دەکرد ـ بەناڕەوە ـ بەڵام داوالێکراو سوێند خواردنی لەسەرە) ئەگەر داواکار شایەتی نەبوو .

(عن الأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ أَرْضٍ بِالْيَمَنِ فخُاصُمتةٌ إِلَى النبي صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ: هَلْ لَكَ بَيِّنَةٌ؟ فقُلْتُ: لاَ قَالَ: فَيَمِينُهُ. وفي روايةٍ: فَقَالَ شَاهِدَاكَ أَوْ يَمِينُهُ).[2] ئەشعەسی کوڕی قەیس ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: لەنێوان من و پیاوێکدا کێشە هەبوو لەسەر زەویەك لەیەمەن جامنیش سکاڵام بردە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( شایەتت هەیە ) ووتم نەخێر فەرمووی: (دەی سوێندی ئەو دەدرێ) لەڕیوایەتێکدا فەرمووی: (دووشایەتی تۆ یا سوێندخواردنی ئەو).

**د ـ شایەتی دانی ئەمانە دروست نیە: خیانەتکار و دووژمن و گومانلێکراو خزمەتکار**

(عن عَمْرِو بن شُعَيْبٍ عن أبيه عن جَدِّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَدَّ شَهَادَةَ الْخَائِنِ وَالْخَائِنَةِ وَذِي الْغِمْرِ على أَخِيهِ وَرَدَّ شَهَادَةَ الْقَانِعِ لِأَهْلِ الْبَيْتِ وَأَجَازَهَا لِغَيْرِهِمْ). عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ شایەتی خیانەت کاری پیاو نافرەت و ناحەزو دووژمن لەدژی براکەی وەرنەگرت هەروەها شایەتی خزمەتکار بۆ خاوەنماڵەکەی وەرنەگرت بەڵام بۆ خاوەن ماڵەکە نەبوو دروستە).[3]

---

١) رواه البخاري (٤٢٧٧) ومسلم (١٧١١)

٢) رواه مسلم (١٣٨)

٣) رواه ابوداود(٣٦٠٠) وهوحديپ صحيح

**هـ - شایەتی بوختانکەر وەرناگیرێ :** ئەوکەسەی بوختـانی زینـا بـۆ پیـاو و ئـافرەتی موسـڵمانی داوێن پاك بكات شایەتی وەرناگیرێ خوای گەورە دەفەروێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾ النـور: ٤.

واتە: ئەوکەسەی بوختانی زینادەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك پاشان چوار شـایەت نـاهێنن ئـەوە هەشتاداریان لێدەن و هەرگیز شایەتییان لێ وەرمەگرن وە ئەوان هەرخۆیان لەسنوور دەرچوانن.

**و - شـایەتی دان لەسـەر دانپیانـانی کردارێـك یـا گوفتارێـك :** ئەگـەر کەسـێك شـایەتی دا لەسـەر دانپیانانی کردەوەیەك یا ووتەیەك ، هیچ گومانێکیشی لێنەدەکرا ئەوە ئەو دان پێدانانە دروستە.

(عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً ، فَجَاءَتْنَا امْرَأَةٌ سَوْدَاءُ فَقَالَتْ أَرْضَعْتُكُمَا . فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ – صلى الله عليه وسلم – فَقُلْتُ تَزَوَّجْتُ فُلاَنَةَ بِنْتَ فُلاَنٍ فَجَاءَتْنَا امْرَأَةٌ سَوْدَاءُ فَقَالَتْ لِي إِنِّي قَدْ أَرْضَعْتُكُمَا . وَهْيَ كَاذِبَةٌ فَأَعْرَضَ ، فَأَتَيْتُهُ مِنْ قِبَلِ وَجْهِهِ ، قُلْتُ إِنَّهَا كَاذِبَةٌ . قَالَ « كَيْفَ بِهَا وَقَدْ زَعَمَتْ أَنَّهَا قَدْ أَرْضَعَتْكُمَا ، دَعْهَا عَنْكَ »)[1] عوقبـەی کـوڕی حـاریس - ڕەزای خوای لێبێ - دەڵێ: ئافرەتێکم مارەکرد ئەنجا ئافرەتێکی ڕەش پێست هات بۆلامان و ووتی: من شیرم داوە بەهەردووکتان ، منیش هاتم بۆخزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتم فلانە ئافرەتم مارەکردوە ئـەنجا ئـافرەتێکی ڕەش پێـست هـات بۆلامـان و ووتـی پـێم : بێگومـان مـن شـیرم داوە بەهەردووکتان، بێگومان ئـەو ئافرەتـە درۆزنـە پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: (چـۆن وای پێـدەڵێت لەکاتێکدا ئەو دەڵێ شیرم بەهەردووکتان داوە - ئەو خێزانتە - وازی لێبێنە).

**ز - شایەتی دانی درۆ:**

(عن أَنَسٍ رضي الله عنه قال سُئِلَ النبي ﷺ عن الْكَبَائِرِ قال الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ وَقَتْلُ النَّفْسِ وَشَهَادَةُ الزُّورِ).[2] ئەنەس - ڕەزای خـوای لێبـێ - دەڵـێ: پرسـیار لـە پێغەمبـەر کـرا ﷺ گوناهە گەورەکان چین؟ فەرمووی: (هاوبەشی دانان بۆ خوا و سەرپێچی دایك وبـاوك و کوشـتنی مرۆڤ - بەناڕەوا - و شایەتی دانی درۆ).

---

١) رواه البخاری (٥١٠٤).

٢) رواه البخاری (٢٥١٠) ومسلم (٨٨/١٤٤)

**م ـ شایەتی دان دوای سوێندخواردن :**

دوای ئەوەی سوێندخورا شایەتی وەرناگیرێ، چونکە ئەگەر سوێندخواردن لە داوالێکراو داواکرا ئەو بەلگەیەکی راست ودروستی حوکم وبڕیاری شەرعی یە جا دوا سوێند خواردنەکە بەلگەیەکی دژو پێچەوانەی ئەوە وەرناگیرێ .

**ک ـ ژمارەی شایەتەکان بەگوێرەی مافەکان:**

مافەکان دووبەشن : مافی خوای گەورە و مافی ئادەمیزادەکان

**یەکەم : مافی خوای گەورە :**

ئەم جۆرە لەماف شایەتی ئافرەت تێدا وەرناگیرێ ، تەنها شایەتی پیاو لەو بارەیەوە وەردەگیرێ، چونکە شایەتی ئافرەت پارێزراونابێت لەگومانی لەبیرچوون و هەلەکردن ، مافی خواش زۆر پارێزگاری کردنی دەوێ ، وە مافەکانی خواش لەم بارەیەوە سێ بەشە :

١ـ لەچوار شایەت کەمتری تێدا وەرناگیرێ کە زیناو داوێن پیسییە. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾ النور: ٤. واتە: ئەو کەسانەی بوختانی داوێن پیسی بۆ ئافرەتانی داوێن پاك دەکەن پاشان چوارشایەت ناهێنن ئەوە هەشتا داریان لێدەن .

خوای گەورە هەشتا دار لێدانی لەبەرامبەر شایەت نەهێناندا داناوە، ئەوە بەلگەیە لەسەرئەوەی زینا بەکەمتر لە چوار شایەت ناسەلمێ . هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ﴾ النساء: ١٥واتە: ئەو ژنانەتان کە داوێن پیسی دەکەن ئەوە چوار شایەت لەخۆتان ـ موسلمان بن ـ شایەتی بدەن لەسەریان وە دەفەرمووێ: ﴿ لَّوۡلَا جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَۚ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴾ النور: ١٣. واتە: دەبو چوارشایەتیان لەسەر نەهێنا جا ئەگەر شایەتەکانیان

نەهێنا ئەوە لای خوا هەرخۆیانن درۆزنان. ئەم ئایەتانە بەڵگەن کە شایەتەکانی زینا دەبێ چوار پیاوبن .

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال سَعْدُ بن عُبَادَةَ يا رَسُولَ اللَّهِ لو وَجَدْتُ مع أَهْلِي رَجُلًا لم أَمَسَّهُ حتى آتي بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ قال رسول اللَّهِ ﷺ نعم قال كَلَّا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إن كنت لَأُعَاجِلُهُ بِالسَّيْفِ قبل ذلك قال رسول اللَّهِ ﷺ اسْمَعُوا إلى ما يقول سَيِّدُكُمْ إنه لَغَيُورٌ وأنا أَغْيَرُ منه وَاللَّهُ أَغْيَرُ مني).[1] ئەبوهورەیرە ـ رەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادە ـ رەزای خوای لێبێ ـ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر پیاوێکم گرت بەسەر ژنەکەمەوە دەستی لێنەدەم تا چوار شایەت نەهێنم؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (بەڵێ) سەعد ووتی:ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەو زاتەی تۆی بەحەق ناردووە پێش ئەوەی بیخەمە خزمەتت بەشمشێر دەیکوژم ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خەڵکینە گوێ بگرن گەورەتان چی دەڵێ؟ بەڕاستی زۆر بەغیرەتە من لەو بەغیرەت ترم خوای گەورەش لەمن بەغیرەت ترە ).

پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئایەتی ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾ النور: ٤. هاتەخوارەوە ئەم فەرموودەیی فەرموو پاشان ئایەتەکان نەفرین کردن (لعان) وەك دەروو کردنەوەیەك بۆ مێردەکان ـ کەپیاوی ـ بێگانە لەگەڵ خێزانەکانیاندا دەبینن دابەزی .

٢ ـ دووشایەتی پیاوی تێدا وەردەگیرێ: ئەمەش بۆ جگە لەزینایە لەمافەکانی خودا وەك پاشگەزبوونەوە لەئیسلام ، جەردەیی و ڕێگری ، خەڵك کوشتن ، دزی ، عەرەق خواردنەوە .

بەڵگەی ئەم بەشەیان مانای گشتی ئەم ئایەتەیە ﴿ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡ ﴾ البقرە/٢٨٢ واتە: دوو شایەت بگرن لە پیاوەکانتان کە موسڵمانن . وە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ ﴾ الطلاق: ٢ واتە: دووشایەتی دادپەروەر و ڕێك لەخۆتان شایەتی بدەن .

---

١) رواه مسلم (١٤٩٨).

(فَقَالَ شَاهِدَاكَ أَوْ يَمِينُهُ). [١] وەپێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەنەشعەسی کوڕی قەیس (تۆ دووشایەت دێنی یان سوێند خواردنی ئەو).

٣ ـ شایەتی یەك پیاوی تێداوەردەگیرێ: کەبینینی مانگی ڕەمەزانە بۆ ڕۆژووگرتن بۆیە یەك پیاو دانراوە چونکە هەڵەکردن لەبەندایە تیکردن دا زیانی کەمترە لەهەڵەکردنی لەنەکردنیدا لەبەرئەوە بۆ بینینی مانگی شەوال ـ کەڕەمەزان تەواو دەبێ دەکرێتە جەژن ـ دەبێ دووشایەت بێت بەڵام بۆ ڕۆژووگرتنەکەی یەك پیاو بەسە .

(عن ابن عُمَرَ قال تَرَاءَى الناس الْهِلَالَ فَأَخْبَرْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنِّي رَأَيْتُهُ فَصَامَهُ وَأَمَرَ النَّاس بِصِيَامِهِ). [٢] عەبدوڵلای کوڕی عومەر ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: خەڵك بۆ مانگ دەگەڕان ببینن، منیش هەواڵم بەپێغەمبەردا ﷺ کەمانگم بینیوە جا پێغەمبەر ﷺ خۆی بەڕۆژوو بوو فەرمانیشی بەخەڵك دا بەڕۆژوو بن.

**دووەم : مافی ئادەمیزادەکان :**

**ئەم جۆرەشیان سێ بەشە کەئەمانەن :**

١ـ تەنها شایەتی دوو پیاوی تێدا وەردەگیرێ ، ئەو شتانەی کەمەبەست لێ ی ماڵ و سامان نیە ، وەلەو کارانەیە کەپیاو ئاگادارە بەسەریدا وەك تەڵاق و هێنانەوەی ژنی تەڵاق دراو موسڵمان بوون و هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام و وەقف کردن و وەصیەت کردن .

بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە ئیسلام شایەتی پیاوی داناوە لە مارەبڕین و تەڵاق دان و وەصیەت کردن و ئەوانی تریش قیاس کراوەنەتە سەر ئەمانە کەهاوشێوەی ئەوانەن دەقیان لەسەر هاتووە لە هەرمافێکدا کەمەبەست لێی ماڵ نیە .

خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ ﴾ المائدة: ١٠٦ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێ

١) رواه مسلم ( ١٣٨)

٢) رواه أبوداود (٢٣٤٢)

کەسێکتان لەسەرە مەرگدا بوو لە کاتی وەصیەت کردندا دووکەسی دادپەروەر لە خۆتان شایەتی بدە لە نێوانیاندا .

(عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لا نِكَاحَ إِلا بِوَلِيٍّ وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ). [١] پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (مارەبڕین دروست نیە بە وەلی و دووشایەتی دادپەروەر نەبێ).

٢ـ شایەتی دووپیاو یان پیاوێك و دووئافرەت یان شایەتێکی پیاو و سوێندی داواکەر:

ئەمەش لەهەر مافێکدایە مەبەست پێی ماڵ وسامان بێت جا چ کەل وپەل بێت یا قەرزبێت یا سوودوکەڵك بێت وە کرین وفرۆشتن و حەواڵەکردن وبەکرێ دان ورەهن کردن و سەلەم کردن .......هتد.

بەڵگەی ئەمەش خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱسْتَشْهِدُوا۟ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ ۖ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحْدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَىٰهُمَا ٱلْأُخْرَىٰ ۚ﴾ البقرة: ٢٨٢واتە: دوو پیاو بگرن بەشایەت ـ لەقەرزدان داـ لەپیاوە موسڵمانەکانی خۆتان جانەگەر دوو پیاو نەبوو ئەوە پیاوێك ودوو ئافرەت بگرن بەشایەت لەو شایەتانەی خۆتان لێیان ڕازین نەوەك یەکێك لە ئافرەتەکان لەبیری بچێت جا ئەوتریان بیری بخاتەوە .

(عن ابن عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى بِيَمِينٍ وَشَاهِدٍ). [٢] عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: (پێغەمبەری خوا ﷺ بەسوێندێکی داواکەر و شایەتێك بڕیاری دا).

(عن عَمْرِو بن دِينَارٍ عَنِ بن عَبَّاسٍ أَنَّ النبي ﷺ قَضَى بِالْيَمِينِ مع الشَّاهِدِ قال عَمْرٌو إنما ذَاكَ في الأَمْوَالِ). [٣] عەمری کوڕی دینار ـ کەئەم فەرمودەی لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گێڕاوەتەوە ـ دەڵێ: ئەم شایەتی دانە لەماڵ و ساماندانیە.

---

١) رواة الدارقطني٣/٢٢٥(٢٣) والبيهقي(٧/١٢٥) وهو صحيح بشواهده.

٢) رواه مسلم (١٧١٢)

٣) رواه الشافعي في الام ١٥٦/٦

٣ـ شایەتی دووپیاو یان پیاوێك و دوو ئافرەت یا چوار ئافرەتی تێدا وەردەگیرێ، ئەمەش لە هەر مافێکی ئادەمیزاد دایە کە بەزۆری پیاو ئاگاداری نیە وەك منداڵ بوون و شیرپێدان و ، کچێنی و ناتەواوی ئافرەتانە .

**ی ـ بێداری بۆ هەموو شایەتێك :**

شایەتی دان کارێکی گەورە و مەترسیدارە بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بێداری داوە بەهەموو شایەتێك لەوەی شایەتی بەدرۆبدات .

(عن بَكْرَةَ رضي الله عنه قال قال النبي ﷺ ألا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ ثَلَاثًا قالوا بَلَى يا رَسُولَ اللَّهِ قال الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ وَجَلَسَ وكان مُتَّكِئًا فقال ألا وَقَوْلُ الزُّورِ و شهادة الزور قال فما زَالَ يُكَرِّرُهَا حتى قُلْنَا لَيْتَهُ سَكَتَ)[1]. ئەبوبەکر ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (هەواڵتان بدەمێ بە گەورەترین گوناهەگەورەکان) سێ جار ئەمەی فەرموو ئێمەش ووتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (هاوبەشی دانان بۆ خوا و سەرپێچی کردنی دایك و باوك ، پاڵی دابووە جا ڕاست بوویەوە دانیشت و فەرمووی: (ئاگاداربن ووتەی درۆ و شایەتی دانی درۆش) جا ئەوەندە دووبارەی کردەوە هەتا ووتمان خۆزگە پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوایە).

**ك ـ سوێند خواردن ڕێگایەکە بۆ چەسپاندن:**

دروستە قازی یا دادوەر بڕیار بدات لەسەر سوێندی داوالێکراو. (عَنْ وَائِلِ بن حجر قَالَ جَاءَ رَجُلٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ وَرَجُلٌ مِنْ كِنْدَةَ إِلَى النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ الْحَضْرَمِىُّ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ هَذَا قَدْ غَلَبَنِى عَلَى أَرْضٍ لِى كَانَتْ لأَبِى. فَقَالَ الْكِنْدِىُّ هِىَ أَرْضِى فِى يَدِى أَزْرَعُهَا لَيْسَ لَهُ فِيهَا حَقٌّ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- لِلْحَضْرَمِىِّ « أَلَكَ بَيِّنَةٌ ». قَالَ لاَ. قَالَ « فَلَكَ يَمِينُهُ». قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الرَّجُلَ فَاجِرٌ لاَ يُبَالِى عَلَى مَا حَلَفَ عَلَيْهِ وَلَيْسَ يَتَوَرَّعُ مِنْ شَىْءٍ. فَقَالَ « لَيْسَ لَكَ مِنْهُ إِلاَّ ذَلِكَ » فَانْطَلَقَ لِيَحْلِفَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- لَمَّا أَدْبَرَ « أَمَا لَئِنْ حَلَفَ عَلَى مَالِهِ لِيَأْكُلَهُ ظُلْمًا لَيَلْقَيَنَّ اللَّهَ وَهُوَ عَنْهُ مُعْرِضٌ »).[2] وائلی کوڕی حیجر ـ ڕەزای

---

١) رواه البخاری (٢٦٥٤، ٦٢٧٣، ٦٩١٩) ومسلم (٨٧)

٢) رواه مسلم (١٣٥٣) والنسائی (٥/٢٤٠، ٢٥٠).

خوای لێبێ ـ دەڵێ: پیاوێك لە حەزرەمەوت و پیاوێك لە کیندە هاتن بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر ﷺئەوەیان خەڵکی حەزرەمەوت بوو ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئـەم پیـاوە زەویـەکی لـە من داگیرکردووە کەزەوی منە چونکە پێشتر زەوی باوکم بووە، پیاوە کیندیەکە ووتی: زەوی منە و بەدەستمەوەیە و دەیـچێنم مـافی کەسـی پێوەنیـە، پێغەمبـەریش ﷺ فـەرمووی: بـە پیـاوە حەزرمەوتیەکە : ( شایەتت هەیە ) ووتی نەخێر فەرمووی (دەبی ئەو پیاوە سوێندت بۆ بخوات ) ووتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پیاوێکی فاسق وفاجر گوێ بەسوێند خواردن نادات لە هـیچ ناسڵەمێتەوە ، فـەرموی: ( جگـە لـەوە هیـچی تـرت بۆنیـە لەسـەرئەو ) جا پیاوەکـە ڕۆیـشت بۆئەوەی سوێند بخوات، پێغەمبەری خواش لەکاتێکدا کابرا پشتی هەڵکردو ڕۆیشت فـەرمووی : ( ئەوسا بزانن ئەگەر سوێندبخوات لە سەر ماڵەکەی بۆ ئەوە بەستەم بیخوات لە ڕۆژی دوایـی دا کاتێ بە خوای گەورە دەگات ڕووی لێوەر دەگێڕێت).

# خەبات و تێکۆشان ( الجهاد )

**یەکەم: پێناسەکەی:** جیهاد لە زمانی عەرەبیدا: کۆشش کردن بە هەموو توانایەکەوە. ئەوپەڕی هەوڵ و ماندووبوونە .

وەلەشەرعدا: ئەوپەڕی کۆشش کردن لە جەنگ دژی کافران و جەردە و ڕێگران و دەرچووان لە فەرمانی پێشەوای دادپەروەر.

**دووەم: ڕەوابونی خەبات و تێکۆشان :**

جیهاد ڕەواو ڕێگا پێدراوە بە فەرمانی قورئان و سونەتی پێغەمبەر ﷺ وە یەك دەنگی زانایان ، ئەوەندە بەڵگەی لەسەر هاتووە کە فەرمانی پێدەکات وهانی ئیمانداران دەدات بۆ ئەنجامدانی دواتر ئەو ئایەت و فەرموودانە باس دەکەین کە ڕەوابونی جیهاد دەگەیەنن .

**جیهاد فەرزی کیفایەیە** ـ واتە ئەگەر هەندێك پێی هەڵسن ئەوانی تر گوناهبار نابن ئەگەر ئەرکەکەیان پێ ئەنجام بدرێت . بەڵام ئەگەر کەس پێی هەڵنەستێ ئەوە هەموویان گوناهبار دەبن ئەگەر توانایان هەبێ ـ بەڵام لەسێ جێگادا دەبێتە فەرزی عەین .

أـ ئەگەر دوو لەشکری کافر و موسڵمان ڕووبەڕوی یەکتر وەستان دەبێتە فەرزی عەین حەرامە گەڕانەوە .

ب ـ ئەگەر دووژمن شارێك یان وڵاتێکی داگیرکرد ، واجبە بەرەنگاری کردن و جەنگ کردن لە دژی .

ج ـ ئەگەر پێشەوای ئیمانداران داوای دەرچونی لە خەڵکی موسڵمان کرد بەگشتی یا لە کەسێك بەتایبەتی وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا

مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴾ التوبة: ٣٨ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەوەچیتانە کاتێ پێتان دەوترێت دەرچن - بۆ جیهاد - لەڕێی خوادا لە شوێنی خۆتانە ناجولێن خۆتان دوادەخەن .

(وقوله ﷺ: وإذا استُنْفِرتُم فَانْفِروا). [١] پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (کاتێ داواتان لێکرا دەربچن بۆ جیهاد ئێوەش دەربچن).

زانایان دەڵێن: جیهاد بەجیهاد دەروون و جیهاد شەیتان و جیهاد فاسقان دەبێژرێت جا جیهاد دەروون ونەفس بەفێربوونی فەرمان و بڕیارەکانی ئیسلامە پاشان کارپێکردنیان و فێرکردنی خەڵك، جیهادی شەیتا نیش بە بەرهەڵستی گومانەکانە کەدەیخاتە دڵی مرۆڤەکانەوە وەلابردنی ئارەزووەکانە کە جوانی دەکات بۆ مرۆڤەکان وەجیهادی کافرانیش بەدەست و زوبان و ماڵ و لاشە دەبێت ، هەروەها جیهاد فاسقانیش بە دەست و پاشان بە زوبان و بەدڵ دەبێت .

**سێ یەم: سروشتی جەنگ و جیهاد لە ئیسلام دا:**

هەندێ لە دوژمن وناحەزانی ئیسلامی وادەزانن ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەهێزو توندو تیژی بڵاو بۆتەوە وە بەزۆر خەڵکی موسڵمان کردووە . لەوەڵامی ئەمانەدا دەڵێین هەموو ئەم قسانە درۆ و ناڕاستن ، لە بێ ئاگایی ئیسلام و جەنگ و جیهادی ئەو دیینە پەیدابووە بێ ئاگان لە دەقەکانی قورئان و سونەت وەیان لە بەر دەمارگیری و دووژمنایەتی ئەو کەسانە بۆئایینی پیرۆزی ئیسلام سەری هەڵداوە کەدەیانەوێ بەناشرین و ناڕاست لەقەڵەمی بدەن ، یان ڕاستروایە بڵێین لە نەزانی و لە دوژمنایەتی پێکەوە ئەو قسانەی پێشوو سەرچاوەیان گرتووە، باسەرنجێك بدەین تابزانین ئیسلام لەو بارەیەوە چی دەڵێ:

قورئان دەفەرموێ: ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ ﴾ البقرة: ٢٥٦ واتە: زۆرلێکردن لە ئایینی ئیسلام دا نیە ، بێگومان ڕاستی و سەر لێشێوانی لەیەکتر جیا کراونەتەوە.

---

١) رواه مسلم (١٣٥٣) والنسائی (٥/٢٤٠، ٢٥٠)

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴾ يونس: ٩٩ واتە: ئەگەر پەروەدگارت بیویستایە هەرچی خەڵك لەسەر زەویدایە باوەڕیان دەهێنا تێکڕا دەی ئایا تۆ خەڵکی ناچاردەکەیت و زۆریان لێ دەکەیت تاببنە باوەڕدار .

وە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ الممتحنة: ٨. واتە: خوای گەورە ڕێگریتان لێ ناکات لەگەڵ ئەوانەی کەلەسەر ئایین جەنگیان لەگەڵ نەکردوون و لە ماڵ و وڵاتی خۆتان دەریان نەکردوون چاکەیان لەگەڵدا بکەن و دادگەرین لەگەڵیاندا چونکە بەڕاستی خوای گەورە دادگەرانی خۆش دەوێ . هەروەها قورئان دەفەرمووێ: ﴿ وَقَـٰتِلُوا۟ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾ البقرة: ١٩٠. واتە : لەپێناوی ئایینی خوادا بجەنگن لە دژی ئەوانەی لەگەڵتان دەجەنگن بەڵام دەست درێژی مەکەن.

وە لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ هەموو کردارەکانی لەجەنگدا و وەسێتەکانی بۆسەرکردەکانی لەجەنگدا ئەو ڕاستیە دەسەلمێنن کە جەنگ لە ئیسلام دا دوورە لە درۆو ئەو بوختانانەی دەدرێتە پاڵی :

(عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- إِذَا أَمَّرَ أَمِيرًا عَلَى جَيْشٍ أَوْ سَرِيَّةٍ أَوْصَاهُ فِي خَاصَّتِهِ بِتَقْوَى اللَّهِ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا ثُمَّ قَالَ « اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ فِى سَبِيلِ اللَّهِ قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ اغْزُوا وَ لاَ تَغُلُّوا وَلاَ تَغْدِرُوا وَلاَ تَمْثُلُوا وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيدًا...). [١] بورەیدە ڕەزای خوای لێبی ـ دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ ئەگەر کەسێکی بکردایە لێپرسراوی سرییەیەك یان لەشکرێك ئامۆژگاری خۆی ونەوانەی لەگەڵیدا دەکرد بەتەقواو لەخوا ترسان پاشان دەیفەرموو: ( لەڕێی خواو بەناوی خواوە غەزا بکەن ، لەگەڵەڵ ئەو کەسەدا بجەنگن کە بێ باوەڕە بەخوا ، غەزا بکەن و خیانەت غەدرمەکەن لووت و گوێ مەبڕن و منداڵ مەکوژن ...).

---

١) رواه مسلم (٣/١٧٣١).

(فَنَهَى رسول اللَّهِ ﷺ عن قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ). [1] پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردوە لەکوشتنی ژن و منداڵ).

(كان رسول اللَّهِ ﷺ إذا بَعَثَ جُيُوشَهُ قال اخْرُجُوا بِسْمِ اللَّهِ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ من كَفَرَ بِاللَّهِ لاَ تَغْدِرُوا وَلاَ تَغُلُّوا وَلاَ تُمَثِّلُوا وَلاَ تَقْتُلُوا الْوِلْدَانَ وَلاَ أَصْحَابَ الصَّوَامِعِ). [2] وەپێغەمبەر ﷺ کاتێ سوپای بناردایە دەیفەرموو: (بەناوی خواوە دەرچن، لەپێناوی خوا بجەنگن لەدژی ئەوانەی بێ باوەڕن بە خوا غەدر ودزی مەکەن ـ لەغەنیمەت ـ و لوت و گوێ مەبڕن و منداڵ و ئەوانەی گۆشەگیرن بۆ بەندایەتی مەکوژن).

(وقال: ولا تَقْتُلُوا شَيْخًا فَانِيًا). [3] وە فەرمووی: (پیاوی پیری بە ساڵاچوو مەکوژن).

(و أوصى أَبو بَكْرٍ الصِّدِّيقَ يَزِيدَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ حين بعثه أَمِيرَ على رُبْعٍ مِنْ أَرْبَاعِ الشام يقول له: إِنِّي مُوصِيكَ بِعَشْرِ خلال: لاَ تَقْتُلَنَّ امْرَأَةً وَلاَ صَبِيًّا وَلاَ كَبِيرًا هَرِمًا وَلاَ تَقْطَعَنَّ شَجَرًا مُثْمِرًا وَلاَ تُخَرِّبَنَّ عَامِرًا وَلاَ تَعْقِرَنَّ شَاةً وَلاَ بَعِيرًا إِلاَّ لِمَأْكُلَةٍ وَلاَ تَحْرِقَنَّ نَحْلاً وَلاَ تُغَرِّقَنَّهُ وَلاَ تَغْلُلْ وَلاَ تَجْبُنْ). [4] ئەبوبەکری صدیق ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ کاتێ یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان ـ ڕەزای خوای لێبێ- دەنێرێ بەسەرکردەی لەشکرێك لە شکرەکانی شام ئامۆژگاری دەکات دەڵێ: (من دە ئامۆژگاریت دەکەم ئافرەت و منداڵ و پیری بەساڵاچوو مەکوژن ، درەختی بەردار مەبڕن و ئاوەدانی وێران مەکەن ئاژەڵ و ووشتر سەرمەبڕن مەگەر بۆ خواردنی گۆشتەکەی، شاری هەنگ مەسوتێنەو پرژو بڵاویان مەکەودزی لە غەنیمەت مەکە و ترسنۆك مەبە).

وەهەرکەس سەرنجی ژیانی پێغەمبەر ﷺ بدات بۆی ڕوون دەبێتەوە کە کەسی بەزۆر موسڵمان نەکردوە، وەتەنها جەنگی لەگەڵ ئەوانەدا کردوە جەنگیان لەگەڵ کردوە. وەزۆربەی خەڵك کەڕاستی ئیسلامیان بۆ دەرکەوتووە بەویستی خۆیان ئیمانیان هێناوە و موسڵمان بوون.غەزاکانی پێغەمبەرﷺ کە دڵەکانی ڕووناك کردەوە وە ژێریەکانی ئازاد کرد لەکۆت و

---

١) رواه البخاري(٣٠١٤) ومسلم(١٧٤٤/٢٥).

٢) رواه أحمد ٦٥٨٤(٢١٠).

٣) رواه أبوداود(٢٦١٤) وأحمد(٦٥/١٤)(٢١٠).

٤)اخرجه مالك فى موتاه ٤٤٨/٢ (١٠)

زنجیری نەفامی ونـەزانی ، وەبانگـەوازی بەووتـەی جـوان و ئامۆژگـاریی یـە بـەپێزەکانی و ڕوون کردنەوەی ئاییـنی ئیسلام بەجوانترین شێوە و نەرم ونیانی و لەسەرخۆی بەرامبەر بـەو کەسـانەی بانگی دەکردن بۆ باوەڕهێنان ئەمانە هەموو ئەو قـسەو گومانانـە بەدرۆدەخەنـەوە کـەدوژمنانی ئیسلام دەیدەنە پاڵ ئاییـنی ئیسلام .

**بائێستا گوێ بگرین لە ئیبن ولقەیمی جوزی کەلەو بارەیەوە باسێکی زۆر بـەپێز بـاس دەکـات و دەڵێ:** باسێك لەقۆناغەکانی هەڵسوکەتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵەڵ کـافران و دوو ڕووان لـە بـوون بەپێغەمبەری یەوە تا وەفات کردنی و گەیشتن بەخزمەت پەروەردگاری .

یەکەم جار کەنیگای بۆهات لەپەروەردگاریەوە فەرمانی پێکرا بخوێنی بەناوی ئەو پەروەردگارەوە کەدروستی کردووە ئەمە سـەرەتای بـوون بەپێغەمبـەری ﷺ پاشـان ئایەتـەکانی ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ﴾ المدثر: ١ - ٢ بە (إقرأ) کردی بەپێغەمبـەر و (یـا أیهـا المـدثر) ڕەوانـەی کـرد پاشان فەرمانی پێکرد کەس وکارە نزیکەکانی بترسێنی و ئاگاداریـان بکـات پاشـان هۆزەکـەی ئاگادار کـرد و ترسـاندنی پاشـان عـەرەبـەکانی دەوروبـەریانی ئاگـادارکرد ئـەنجا هەمووعـەرەبی ئاگادارکرد پاشان هەموو خەڵکی ئاگادار کردو پەیامی خوای پێ گەیاندن ، ئـەنجا سـیانزە سـاڵ بانگەوازی دەکرد و خەڵکی ئاگادار دەکرد بـەبێ جـەنگ و فـەرمانی دەکـرد بەشـوێنکەوتەکانی ئارام بگرن و خۆراگرین و چاوپۆشی بکەن لـەو خراپانـەی بەرانبـەریان دەکرێـت. پاشـان ڕێگـەی پێدرا کۆچ بکات و مۆڵەتی جەنگکردنیشی پێدرا ، پاشان فەرمانی پێکرا جەنگ بکات لـەدژی ئەوانەی جەنگی لەگەڵ دەکەن و هەقی نەبێت بەسەرئەوانەی جـەنگی لەگـەڵ ناکـەن و کـەناریان گرتووە پاشان فەرمانی پێکرا بەجەنگ لەدژی بت بەرستان هەتا گەردن کەچی هەر بۆ خوابێت .

جا لەکۆتایدا کەجەنگ دەکرێت لەگەڵ کافرو بت پەرستاندا بـەواجبی ئـەوە دەبـێ پێـشتر بـانگ کرابن بۆ ئیسلام و بیانویـان بڕابێـت و جـەنگ و جیهـاد تـەنها بـۆ بەرهەڵـستی نیـە بـەڵکو بـۆ جێگیرکردنی حوکمی خوایە لە زەویدا دەبـێ جیهـاد بـەرپابێ تـا گـەردن کەچـی تـەنها بـۆ خـوا بکرێت وە تەنها شەریعەتی خوا بڕیاردەر بێت.

**چوارەم: گەورەیی و پلەی جیهاد :**

(عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– قَالَ «مَنْ رَضِىَ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ ». فَعَجِبَ لَهَا أَبُو سَعِيدٍ فَقَالَ أَعِدْهَا عَلَىَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَفَعَلَ ثُمَّ قَالَ « وَأُخْرَى يُرْفَعُ بِهَا الْعَبْدُ مِائَةَ دَرَجَةٍ فِى الْجَنَّةِ مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ ». قَالَ وَمَا هِىَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ « الْجِهَادُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ الْجِهَادُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ »).[1] ئەبوسەعدی خودی ـ ڕەزاخوای لێبێ ـ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ( هەرکەس ڕازی بێت خوا پەروەردگاری بێت و ئیسلام ئایینی بێت و موحەممەد ﷺ پێغەمبەری بێت ئەوە بەهەشت جێگایەتی ) ئەبو سەعید زۆر لای گەورە بوو بۆیە ووتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دووبارەی کەرەوە بۆم ئەویش بۆی دوبارە کردەوە پاشان فەرمووی (شتێکی تریش هەیە لەبەهەشتدا خوای گەورە بەهۆیەوە سەد پلە بەندە بەرزدەکاتەوە ، کەنیوان هەر پلەیەکی پلەیەکی تری بەئەندازەی نیوان ئاسمان و زەوی یە ) ئەبو سەعید ووتی ئەو شتە چیە؟ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (جیهاد و تێکۆشانە لەپێناو ئایینی خوادا).

**پێنجەم: هاندان لەسەر تێکۆشان و خەبات :**

خوای گەورە فەرمانی کردووە بە تێکۆشان بەگیان و ماڵ و پێویستی کردووە لەسەر بەندەکانی کەدەربچن لەپێناو سەرخستنی ئایینی خواداو حەرامی کردوە دوابکەون ، وەك دەفەرمووێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴾ التوبة: ٣٨. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەوە چیتانە کاتی پێتان بووترێ لەڕێ خوادا دەربچن بۆ جیهاد لەشوێنی خۆتان ناجوڵێن ـ دەنوسێن بەزەویدا ـ ئایا بەژیانی دونیا ڕازی بوون لەجیاتی دواڕۆژ جا خۆشی دونیا لەچاو ڕۆژی دواییدا زۆر کەمە و هیچ نیە .

---

١) رواه مسلم (١٨٨٤) والنسائى(١٩/٦).

وه خوای گـەوره دەفـەرمووی: ﴿ انفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ التوبـة: ٤١. واتـه: بـڕۆن و دەرچـن - بۆجیهاد - چ سووك بن - لەش ساغ و دەوڵەمەند - چ قورس بن - نەخۆش و هەژارین - وەلەپێناو خوادا بەماڵ و گیانتان تێکۆشن ئەوەتان بۆ خۆتان چاکترە ئەگەر ئێوەبزانن .

(عن أَنَسِ بن مَالِكٍ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال لَغَدْوَةٌ في سَبِيلِ اللَّهِ أو رَوْحَةٌ خَيْرٌ من الدُّنْيَا وما فيها). [1] ئەنەسی کوڕی مالیك - ڕەزای خوای لێبێ - دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویى: (تاقەبەیانیەك یا تاقە ئێوارەیەك جیهاد لەپێناو خوادا لە دونیاو ئەوەی تێدایە چاکترە).

(عن أبي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ فقال إِيمَانٌ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ قِيلَ ثُمَّ مَـاذَا قال الْجِهَادُ في سَبِيلِ اللَّهِ قِيلَ ثُمَّ مَاذَا قال حَجٌّ مَبْـرُورٌ) [2] ئـەبو هـورەیرە - ڕەزای خـوای لێبـێ - دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا کرا ﷺ کام کردەوەیـە گـەورەترە؟ فـەرمووی ( بـاوەڕبوون بـە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی) ووترا چی تر؟ فەرمووی: (تێکۆشان لە پێناو ئایینی خوادا) ووترا پاشان چی تر؟ فەرمووی: (حەجێکی ڕێك و پێك).

**شەشەم: ترساندن لە پشت لە جیهاد کردن :**

خـوای گــەوره دەفــەرمووێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الْآخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الْآخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْئًا ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ التوبــة: ٣٨ - ٣٩ واته: ئەی ئەوانەی بڕواتـان هێنـاوه ئەوەچـیتانه کاتـێ پێتـان دەوترێـت لـەڕێی خـوا دەربچن بۆ جیهاد لەشوێنی خۆتاندا ناجوڵێن - دەنوسێن بەزەویـدا - ئایـا بـه ژیـانی دونیـا ڕازی بوون لەجیاتی دوارۆژ جا خۆشی دونیا لەچاو ڕۆژی دوایدا زۆر کەمەو هیچ نیە، ئەگەر دەرنەچـن

---

١) رواه البخاري(٢٧٩٢) ومسلم (١١٢/١٨٨٠).

٢) رواه البخاري (٢٦) ومسلم (٨٣).

ئەو سزایەکی سەختتان دەدات و ئێوە لادەبات خەڵکانێکی تر دێنێ و هیچ زیانی پێناگەیەنێ وە خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە .

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال قال رسول اللَّهِ ﷺ من مَاتَ و لم يَغْزُ و لم يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ مَاتَ على شُعْبَةٍ من نِفَاقٍ). [1] ئەبوهورەیرە ـ ڕەزای خوای لێبی ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (هەرکەس بمرێت و غەزا نەکات و لە دڵیشیدا نەبێ جیهاد بکات لەسەر بەشێکی دوو ڕووی دەمرێ).

**حەوتەم: حوکمی جیهاد:**

جیهاد فەرزی کفایەیە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ البقرة: ٢١٦ واتە: جەنگتان لەسەر نوسراوە کەپێتان ناخۆشە لەوانە شتێکتان پێناخۆش بێت و ئەو بۆ ئێوەچاکتربێت یا لەوانیە شتێکتان پێ خۆش بێت کەخراپ بێت بۆتان خوا دەزانی ئێوە نازانن .

ئەم ئایەتە وادەگەیەنی جەنگ وجیهاد فەرزیێت لەسەر هەمووان بەڵام خوای گەورە لەشوێنێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً﴾ التوبة: ١٢٢ واتە: نابێ هەموو باوەڕداران دەربچن بۆ جیهاد، ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ دروستە هەموان دەرنەچن بۆ جیهاد بەڵکو تەنها هەندێکتان واجبە بڕۆن بۆ جیهاد کەواتە فەرزی کفایەیە نەك فەرزی عەین .

بەڵام ئەگەر پێشەوای موسڵمانان داوای دەرچوونی لە موسڵمانان کرد یان دووژمن دای بەسەر وڵاتێکی ئیسلامدا لەوکاتەدا جیهاد دەبێتە فەرزی عەین وەك دەفەرمووی: ﴿إِلَّا تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْئًا وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ التوبة: ٣٩ واتە: ئەگەر دەرنەچن ـ بۆجیهاد ـ ئەوە سزایەکە سەختتان

---

١) رواه مسلم(١٩١٠) وأبوداود(٢٥٠٢) والنسائي(٦/٨).

دەدات و ئێوە دەکوژرێت بەکەسانێکی تـرو هـیچ زیـانی پـێ ناگەیـەنێ وە خـوا بەسـەر هـەموو شتێکدا بە توانایە .

**هەشتەم: نیەت بوون لەجیهاد دا:**

عن أبي مُوسَى الأشعري قال( سُئِلَ رسول اللَّهِ ﷺ عن الرَّجُلِ يُقَاتِلُ شَجَاعَةً وَيُقَاتِـلُ حَمِيَّـةً وَيُقَاتِلُ رِيَاءً أَيُّ ذلك في سَبِيلِ اللَّهِ فقال رسول اللَّهِ ﷺ من قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَـا فَهُوَ في سَـبِيلِ اللَّـهِ).[1] ئـەبو مووسـای ئەشـعەری ـ رەزای خـوای لێبـێ ـ دەڵـێ: پرسـیارکرا لەپێغەمبەر ﷺ دەربارەی پیاوێك بۆ ئازایەتی جەنگ بکات یا بۆ دەمارگیری یا بۆ ڕووپامـایی وڕیاجەنگ بکات کام لەمانە لەپێناو خوادایە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (هەرکەس جـەنگ بکات بۆ ئەوەی ووشەی خوا بەرزبێت ئەوە لە پێناوی خوای گەورەدایە).

**نۆیەم: مەرجەکانی واجب بوونی جیهاد :**

ئەگەر جیهاد فەرزی کیفایەبێت پێویستە ئەم مەرجانەی خوارەوەی هەبن ئەنجا جیهاد واجب دەبێت :

**أ ـ موسڵمانی:** لەسەر کافر واجب نیە چونکە جیهاد پەرستشە و کافریش ئەگەر بیشیکات دروست نیە .

**ب ـ باڵغ وژیری :** جیهاد لەسەر منداڵ و شێت واجب نیە لەسوننەتدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ منداڵی دەناردەوە کەباڵغ نەبووبوون. (عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ عَرَضَنِي رَسُولُ اللَّهِ -صَـلى الله عليـه وسلم- يَوْمَ أُحُدٍ فِي الْقِتَالِ وَأَنَا ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً فَلَمْ يُجِزْنِي وَعَرَضَنِي يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً فَأَجَازَنِي).[2] عەبدوڵلای کوڕی عومەر ڕەزای خوای لێ بێ دەڵـێ : پێغەمبـەر ﷺ لەڕۆژی غەزای ئوحددا سەیری کردم کەتەمەنم چواردەساڵ بوو ڕێگـەی نـەدام بەشـداربم ،وە ڕۆژی غەزای خەندەقیش سەیری کردم کەتەمەنم پانزە ساڵ بوو ڕێگەی دام).

**ج ـ نێرینە بێت :** ئـافرەت جیهـادی لەسـەرنیە چـونکە جـەنگ قـورس وناڕەحەتـە و بـەئافرەت نـاکرێ، (عن عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رضي الله عنها قالت قلت يا رَسُولَ اللَّهِ ألا نَغْـزُو وَنُجَاهِـدُ

---

١) رواه البخاري(٣١٢٦، ٢٨١٠، ١٢٣)ومسلم(١٩٠٤)

٢) رواه البخاري(٢٥٢١) ومسلم(١٨٦٨).

مَعَكُمْ فقال لَكِنَّ أَحْسَنَ الْجِهَادِ وَأَجْمَلَهُ الْحَجُّ حَجٌّ مَبْـرُورٌ)[١] عایشه ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەش غەزاو تێکۆشان نەکەین لەگەڵتاندا؟ فەرمووی: (جوانترین و چاکترین جیهادو تێکۆشان بۆ ئێوە حەجی ڕێك وپێکە).

**د ـ توانابوون:** کەتوانای لاشەیی و ماڵی دەگرێتەوە، کەواتە شەل و کوێرو هەژارو نەدار جیهادیان لەسەرنیە.

خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴾ التوبة: ٩١ - ٩٢

واتە: لاوازو نەخۆش وئەوکەسانەی داراییان نیەخەرجیکەن هیچ گوناهێکیان لەسەرنیە ئەگەر دڵسۆزبن بۆ خواوپێغەمبەرەکەی هیچ ڕێگایەك نیە بۆـ تاوانبارکردنی ـ ئەو چاکەکارانە وە خوا لێخۆشبووی میهرەبانە. هەروەا ئەوانەش کە هاتنەلات ـ ئەی موحەممەد ﷺ بۆئەوەی سواری ولاخیان کردیت کردیت ولاخم دەست ناکەوێ سوارتان بکەم ـ بۆجیهاد- گەڕانەوە لەکاتێکدا چاویان فرمێسکی دەڕشت لەخەفەتی ئەوەی هیچیان نەبوو خەرجی بکەن بۆ جیهاد .

**هـ ـ ڕەزامەندی دایك وباوك :** ئەگەر کەسی دایك وباوکی ڕازی نەبن بڕوات بۆجیهاددروست نیەسەرپێچیان بکات ـ کاتێ جیهادفەرزی کیفایە بێت ـ چونکە مافی ئەوانی بەسەرەیەوە و پێویستیان لەپێشترە پێویسترە چونکە ئەوەی دەبێ لەگەڵیاندا بکرێت فەرزی عینە بەلام جیهادە کە فەرزی کفایەیە .

(عن عَبْدَ اللَّهِ بن عَمْرٍو رضي الله عنهما يقول جاء رَجُلٌ إلى النبي ﷺ فَاسْتَأْذَنَهُ في الْجِهَادِ فقال أَحَيٌّ وَالِدَاكَ قال نعم قال فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ)[٢] عەبدوڵلای کوڕی عەمر ـ ڕەزای خوایان لێبێ دەڵێ:

---

١) رواه البخاري (١٧٦٢) .

٢) رواه البخاري (٣٠٠٤) ومسلم (٢٥٤٩/٥)

پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ داوای مۆڵەتی جیهادی کرد لێی ئەویش فەرمووی: (دایك وباوکت زیندوون؟) ووتی: بەڵێ، فەرمووی: (لەخزمەت کردنی ئەواندا تێکۆشان بکە).

**دەیەم: قۆناغەکانی تێکۆشان:**

قۆناغەکانی جیهادو تێکۆشان سێ قۆناغە کەئەمانەن:

**أ ـ بانگ کردن بۆ موسڵمان بوون:** چونکە جەنگ کردن دژی کافران هۆکارە نەك مەبەست جائەگەر مەبەستەکە ڕازی بوونە بەحوکمی خواو گەردن کەچی بۆ یاساو شەریعەتەکەی کە هاتەدی بەبێ جەنگ ئەوە پێویست بەجەنگ ناکات ، یەکەم ڕێگاش بۆ بەدیهاتنی ئەو مەبەستەش بانگکردنی کافرانە بۆموسڵمان بوون بەڕوونکردەوەی پەیامی ئیسلام بۆیان و وەڵام دانەوەی گومانەکانیان جا ئەگەر ئەم هەنگاوە بەگوێ پێنەدان وسەرکەشی ورێگری وەڵام درایەوە و ڕێگایەك نەما بۆگەیاندنی ئاینی خوا بەڕای گشتی کافران لەوکاتەدا دەبێ موسڵمانان بڕۆنە قۆناغی دووەمەوە کەبەدوای قۆناغی یەکەمدا دێت ، بەبڕیاری گەورەو پێشەوای موسڵمانان بەمەرجێ توانی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە هەبێت لەگەڵ کافران دا. بەڵام پێش جەنگ داوای سەرانەیان لێ دەکرێ ئەگەر نەیاندا ئەنجا جەنگیان لەگەڵ دەکرێت.

**ب ـ داواکردنی سەرانە لێیان** : ووتمان قۆناغی دووەم جەنگ کردنە ئەگەر موسڵمان نەبوون . بەڵام ئەگەر توانرا جەنگ ڕوونەدات بەگەردن کەچی بۆ دەسەڵاتی ئیسلام و حوکمەتی ئیسلامی ئەویش بەسەرانەدان بە دەوڵەتی ئیسلامی لەبەرانبەر پارێزگاری کردن لەگیان و ماڵ و ناموسیان بەکۆمەڵە مەرجێك ئەوە لێیان قەبول دەکرێت و جەنگیان لەگەڵدا ناکرێت .

**ج ـ قۆناغی سێ یەم** : ئەگەر موسڵمان نەبوون و ڕازیش نەبوون بێنەژێر ڕکێفی دەوڵەتی ئیسلامی یەوە و سەرانە بدەن ، قۆناغی سێیەم دێت کە جەنگ وڕووبەڕووبونەوەیە لەگەڵیاندا ، وەك قورئان ئەم ڕاستی یە ڕوون دەکاتەوە دەفەرمووێ: ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴾ التوبة: ٢٩. واتە: بجەنگن لەگەڵ ئەوکەسانەی باوەڕیان بەخواو ڕۆژی دوایی نیە و ئەوەی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ

حەرامیان کردووە بەحەرامی دانانێن و مل کەچ ناکەن بۆ ئایینی ڕاست ـ کەئیسلامە ـ لەوانەی پەیامیان پێ بەخشراوە هەتا سەرانە دەدەن بەدەستی خۆیان و بەمل کەچی.

(عَنْ بْنِ بُرَيْدَةَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- إِذَا بَعَثَ أَمِيراً عَلَى سَرِيَّةٍ أَوْ جَيْشٍ أَوْصَاهُ فِي خَاصَّةِ نَفْسِهِ بِتَقْوَى اللَّهِ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْراً وَقَالَ « اغْزُوا بِسْمِ اللَّهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ فَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى إِحْدَى ثَلاَثِ خِصَالٍ - أَوْ خِلاَلٍ - فَأَيَّتُهُنَّ مَا أَجَابُوكَ إِلَيْهَا فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ فَإِنْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى التَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ وَأَعْلِمْهُمْ إِنْ هُمْ فَعَلُوا ذَلِكَ أَنَّ لَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ وَأَنَّ عَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ فَإِنْ أَبَوْا وَاخْتَارُوا دَارَهُمْ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمِينَ يَجْرِى عَلَيْهِمْ حُكْمُ اللَّهِ الَّذِى يَجْرِى عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَكُونُ لَهُمْ فِي الْفَىْءِ وَالْغَنِيمَةِ نَصِيبٌ إِلاَّ أَنْ يُجَاهِدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَادْعُهُمْ إِلَى إِعْطَاءِ الْجِزْيَةِ فَإِنْ أَجَابُوا فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ فَإِنْ أَبَوْا فَاسْتَعِنِ اللَّهَ ثُمَّ قَاتِلْهُمْ »).[1] بورەیدە ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر کەسێکی بکردایە سەرکردەی لەشکرێك یا پارچە لەشکرێك ئامۆژگاری و وەسیەتی خۆی و ئەوانەش لەگەڵیدا دەکرد بەتەقواو پارێزگاری و چاکە، پاشان دەیفەرموو: (بەناوی خواوە غەزابکەن لەپێناو خوادا بجەنگن لەگەڵ ئەوانەی بێباوەڕن بەخوا، غەزا بکەن و دزی لە غەنیمەت مەکەن و ناپاکی مەکەن و لووت وگوێ مەبڕن و منداڵ مەکوژن. جائەگەر گەیشتی بەدووژمنە کەت لە هاوبەشی پەیداکەران ئەوا بانگیان بکە بۆ سێ خاڵ، جائەگەر وەڵامیان دایتەوە ئەوەلێیان وەبگرەو وازیان لێ بێنەو جەنگیان لەگەڵ مەکە ـ یەکەم جار بانگیان بکە بۆ ئایینی ئیسلام جائەگەر دایتەوە ئەوە لێیان وەربگرە و جەنگیان لەگەڵدا مەکە پاشان بانگیان بکە کۆچ بکەن لە وولاتی خۆیانەوە بۆ وولاتی کۆچەران وەپێیان بڵێ ئەگەر ئەوەبکەن ئەوە چی بۆ کۆچەران هەیە بۆ ئەوانیش هەیە جا ئەگەر.کۆچیان نەکرد لە وولاتی خۆیان ئەوەپێیان بڵێ ئەوە ئەوان وەك موسڵمانە دەشتەکیەکانن ، ئەوەحوکمی خوایان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت کە بەسەرباوەڕدارانداا جێبەجێ دەکرێت وەبەشیان نابێ لەدەسکەوتێ بەجەنگ بێ یا بێ جەنگ ـ کەلەکافران دەگیرێ ـ مەگەر جیهاد بکەن لەگەڵ

---

١) رواه مسلم (١٧٣١/٣) والترمزی (١٦١٧) وأبوداود(٢٦١٢).

موسڵمانان دا وەئەگەر ڕازی نەبوون بەموسڵمان بوون ئەوە داوای سەرانەیان لێ بکە جائەگەر وەڵامیان دایتەوە ئەوەلێیان وەربگرە و وازیان لێ بێنە جا ئەگەر ڕازی نەبوون سەرانەبدەن ئەوە لە دژیان داوای یارمەتی لە خوابکەن لەگەڵیان بجەنگە).

**یانزەیەم: ئادابەکانی جیهاد و تێکۆشان :**

أ ـ دروستە سەرکردە نیەتی خۆی لە لەشکرەکەی بشارێتەوە:

گەورەو سەرکردەی موسڵمانان دروستە ئەگەر نیازی شوێنێکی هەبوو لەشکری ئیسلامی بۆببات لەسەرباز و لەشکرەکەی بشارێتەوە و پێیان نەڵێت .

(عن كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ رضي الله عنه قال: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – يُرِيدُ غَزْوَةً إِلاَّ وَرَّى بِغَيْرِهَا). [1] کەعبی کوڕی مالیك ـ ڕەزای خوایان لێبێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەر کات بیویستایە غەزایەك بکات مەبەستەکەی دەشاردەوە و وای نیشان دەدا کەمەبەستی شوێنێکی ترە ).

ب ـ دروستە ناردنی کەسانێك زانیاری دووژمن بێنێتەوە: ئەگەر پێشەوای موسڵمانان ویستی غەزابکات دروستە لەپێش لەشکرەکەیەوە کەسانێك بنێرێ زانیاری دەربارەی دووژمن کۆبکەنەوە بیهێنەوە بۆ پێشەواو سەرکردەکانیان ، (عن مُحَمَّدِ بن الْمُنْكَدِرِ عن جَابِرٍ رضي الله عنه قال قال النبي ﷺ من يَأْتِينِي بِخَبَرِ الْقَوْمِ يوم الْأَحْزَابِ قال الزُّبَيْرُ أنا ثُمَّ قال من ياتيني بِخَبَرِ الْقَوْمِ قال الزُّبَيْرُ أنا فقال النبي ﷺ إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّا وَحَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ) [2] موحەممەدی کوڕی مونکەدیر دەڵێ: لەجابری کوڕی عەبدوڵلام بیستووە دەیووت: لەڕۆژی جەنگی خەندەق دا پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی هەڵنا تا هەواڵی - بەنوقورەیزەی - بۆبزانن زوبێر ئامادەیی خۆی دەربڕی، جارێکی تر هەڵێنان زوبێر ئامادەیی دەربڕی جارێکی تر هەڵێنان هەر زوبەیریش ئامادەیی دەربڕی جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هەموو پێغەمبەرێك هەواڵی تایبەتی هەیە، زوبەیریش هەواڵی تایبەتی منە).

---

١) رواه البخاري (٤٤١٨) ومسلم (٢٧٦٩/٥٣)

٢) رواه البخاري (٤١١٣) ومسلم(٢٤١٥/٤٨)

ج - دروستە لەشکر ڕێکخرێت وئاڵاو پەرچەمی بۆ دانرێ:

(عن الْبَرَاءَ بن عَازِبٍ رضي الله عنهما يحدث قال جَعَلَ النبي ﷺ على الرَّجَّالَةِ يوم أُحُدٍ وَكَانُوا خَمْسِينَ رَجُلًا عَبْدَ اللَّهِ بن جُبَيْرٍ فقال إن رَأَيْتُمُونَا تَخْطَفُنَا الطَّيْرُ فلا تَبْرَحُوا مَكَانَكُمْ هذا حتى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ وَإِنْ رَأَيْتُمُونَا هَزَمْنَا الْقَوْمَ وَأَوْطَأْنَاهُمْ فلا تَبْرَحُوا حتى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ.....)[1] بەڕائی کوڕی عازیب - ڕەزای خوای لێبێ - دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری کردە لێپرسراوی پیادەکان لەڕۆژی جەنگی ئوحددا کەژمارەیان پەنجا پیاوەبوو وەفەرمووی: (ئەگەر ئێمەتان بینی قەل ودالّ گۆشتی لاشەمانی دەخوارد ئەم جێگای خۆتان بەجێمەهێڵن هەتا نەنێرم بۆ لاتان، وەئەگەر ئێمەتان بینی دووژمنمان تێشکاند پێمان نابەلاشەکانیاندا ئەوە جێگای خۆتان بەجێ مەهێڵن هەتا نەنێرم بۆ لاتان..).

(عن جَابِرٍ يَرْفَعُهُ إلى النبي ﷺ أَنَّهُ كان لِوَاؤُهُ يوم دخل مَكَّةَ أَبْيَضَ)[2] جابر - ڕەزای خوای لێبێ - دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەو ڕۆژەی ڕۆیشتە شاری مەککەوە ئاڵاکەی سپی بوو.

د- داوای یارمەتی لە کافران ناکرێت لە جیهاددا:

(عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّهَا قَالَتْ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قِبَلَ بَدْرٍ فَلَمَّا كَانَ بِحَرَّةِ الْوَبَرَةِ أَدْرَكَهُ رَجُلٌ قَدْ كَانَ يُذْكَرُ مِنْهُ جُرْأَةٌ وَنَجْدَةٌ فَفَرِحَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- حِينَ رَأَوْهُ فَلَمَّا أَدْرَكَهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- جِئْتُ لأَتَّبِعَكَ وَأُصِيبَ مَعَكَ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ». قَالَ لاَ قَالَ « فَارْجِعْ فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ ». قَالَتْ ثُمَّ مَضَى حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالشَّجَرَةِ أَدْرَكَهُ الرَّجُلُ فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَقَالَ لَهُ النَّبِىُّ -صلى الله عليه وسلم- كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ قَالَ « فَارْجِعْ فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ ». قَالَ ثُمَّ رَجَعَ فَأَدْرَكَهُ بِالْبَيْدَاءِ فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ « تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ». قَالَ نَعَمْ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « فَانْطَلِقْ »).[3] عائیشە - ڕەزای خوای لێبێ - خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ

---

١) رواه البخاري (٣٠٣٩)

٢) رواه أبوداود(٢٥٩٢) والترمذي(١٦٧٩) والنسائي ٥/ ٢٠٠(٢٨٦٦) وابن ماجه(٢٨١٧) وهو حسن.

٣) رواه مسلم ( ١٨١٧) وأبوداود( ٢٧٢) و الترمزي(١٥٥٨).

بەرەو بەدر ڕۆیشت تا گەیشتە (حره الوبره)[1] پیاوێك گەشت پێی واباسی ئەوە پیاوە دەكرا كەئازاو بەدەمەوەهاتووە، هەر كەهاوەڵانی پێغەمبەرﷺ بینیان دڵخۆش بوون، كاتێ گەیشتە لایان، بەپێغەمبەری خوای ﷺ ووت: هاتووم لەگەڵتاندابم و بجەنگم و شتێكم دەستبكەوێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (باوەڕ بەخواو پێغەمبەرەكەی دێنی) ووتی: نەخێر . فەرمووی: ( بگەڕێرەوە من یارمەتی بت پەرستم ناوێ ) عایشە ووتی: دوای ئەوە ڕۆیشت كاتی ئێمە لە (الشجرة) بووین پیاوەكە گەیشتەوە بەپێغەمبەر ﷺ هەمان قسەی یەكەم جاری لێ دووبارەكردەوە ، پێغەمبەریش ﷺ هەمان فەرموودەی جاری یەكەمی پێووتەوە ، پاشان فەرمووی: ( بگەڕێرەوە من یارمەتی بت پەرستم ناوێ) عایشە ووتی: پاشان گەڕایەوە و دواتر لە (بەیداء)[2] گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەریش هەمان فەرموودەی یەكەمین جاری لێ دووبارەكردەوە (باوەڕبەخواو پێغەمبەرەكەی دێنی؟) ووتی: بەڵێ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ( دەی وەرە لەگەڵماندا).

**هـ ـ حەرامە كوشتنی ئافرەت و منداڵ و پیر:**

(عن نَافِعٍ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ رضي الله عنه أخبره أَنَّ امْرَأَةً وُجِدَتْ فِي بَعْضِ مَغَازِي النبي ﷺ مَقْتُولَةً فَأَنْكَرَ رسول اللَّهِ ﷺ قَتْلَ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ)[3] عەبدوڵلای كوڕی عومەر ـ ڕەزای خوایان لێبێ ـ دەڵێ:لەهەندێ لە غەزاكانی پێغەمبەر ﷺئافرەتێك بینرا كوژرابوو جا پێغەمبەر ﷺ ڕێگری كردلەكوشتنی ئافرەت و منداڵان).

**و ـ لووت وگوێ بڕین و سوتاندن حەرامە:**

لە فەرموودەكەی بورەیدەدا[4] باسی حەرامی لووت وگوێ و بڕین و شێواندنمان كرد، وە دەربارەی سوتاندن بەئاگر بەم شێوە باسكراوە (عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ - رضى الله عنه - أَنَّهُ قَالَ بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - فِى بَعْثٍ فَقَالَ « إِنْ وَجَدْتُمْ فُلاَنًا وَفُلاَنًا فَأَحْرِقُوهُمَا بِالنَّارِ » ثُمَّ قَالَ

---

١) بەردەڵانێك كەناوی وە بەرە بوو چوار میل لە مەدینەوە دوورە.

٢) شوێنێكە لەدەرەوەی مەدینە.

٣) رواه البخاري(٣٠١٤) ومسلم(١٧٤٤/٢٤).

٤) لەخاڵی سێ یەمی قۆناغەكانی جیهاد دا باسكرا.

رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – حِينَ أَرَدْنَا الْخُرُوجَ « إِنِّى أَمَرْتُكُمْ أَنْ تُحْرِقُوا فُلاَنًا وَفُلاَنًا، وَإِنَّ النَّارَ لاَ يُعَذِّبُ بِهَا إِلاَّ اللَّهُ ، فَإِنْ وَجَدْتُمُوهُمَا فَاقْتُلُوهُمَا ».[1] ئەبوهورەیرە - ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هێزێکی سەربازیدا ناردنی و فەرمووی ئەگەر فلان وفلانتان دەست کەوت بیان سوتێنن، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ کاتی ویستمان لەشار دەرچین فەرمووی: ( من فەرمانم پێکردن فلان وفلان بسوتێنن ، بێگومان ئاگر کەس سزای خەڵکی پێنادا جگە لە خوای گەورە جا ئەگەر دەستان کەوتن هەردووکیان بکوژن ).

**ز ـ هەڵهاتن حەرامە لە جەنگدا :**

ئەگەر دووژمن لەدوو ئەندازەی ئیمانداران زیاتر نەبوو ئەو کەسەی ئامادەی جەنگەکەیە حەرامە هەڵبێت وراکات مەگەر بڕوات بۆلای کۆمەڵێکی تر لە موجاهیدین یان وەك نەخشەیەکی سەربازی بڕوات لەلایەکی ترەوە بگەڕێتەوە بۆ دووژمن . خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ الأنفال: ١٦ واتە: وەهەرکەس لەو ڕۆژەدا پشتیان تێبکات و هەڵبێت مەگەر بۆ هێرش کردن بگەڕێتەوە یان بڕوات بۆلای کۆمەڵێکی تر ـ یارمەتیان بدات ـ ئەوە بێگومان بەرڕق وخەشمی خواوە دەگەڕێتەوە و جێگای دۆزەخ دەبێت کەجێگایەکی زۆر خراپ و بەدە.

**ح ـ دروستە شەو هێرش بکرێتە سەر دووژمن :**

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ – رضى الله عنهم – قَالَ مَرَّ بِىَ النَّبِىُّ – صلى الله عليه وسلم – بِالأَبْوَاءِ – أَوْ بِوَدَّانَ – وَسُئِلَ عَنْ أَهْلِ الدَّارِ يُبَيَّتُونَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ، فَيُصَابُ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذَرَارِيِّهِمْ قَالَ « هُمْ مِنْهُمْ » . وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ « لاَ حِمَى إِلاَّ لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ – صلى الله عليه وسلم- »).[2] صەعبی کوڕی جەسامە ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ئەبواء یاودان دا بەلامدا تێپەڕی، پرسیاری لێکرا دەربارەی خەڵکانی بت پەرست شەو هێرش بکرێتە سەریان و

---

١) رواه البخاري (٣٠١٦).

٢) رواه البخاري (٣٠١٢) ومسلم (١٧٤٥/٢٦).

ژن ومنداڵیان كوژراو برینداربن فەرمووی: (ئەوانیش لە بت پەرستانن؟) و گوێم لێ بوو دەیفەرموو: (قەدەغەكردنی پوش و لەوەڕ دروست نیە بۆ خواو پێغەمبەرەكەی ﷺ نەبێ.

**گ ـ فێڵ كردن لەجەنگ دا دروستە:**

(عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رضى الله عنهما قَالَ قَالَ النَّبِىُّ – صلى الله عليه وسلم – « الْحَرْبُ خُدْعَةٌ »)[1] جابری كوڕی عەبدوڵلا ـ ڕەزای خوایان لێبێ ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (جەنگ فێڵ كردنە).

ئیمامی نەوەوی دەڵێ: زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی دروستە فێڵ لەكافران بكرێت لە جەنگدا بەهەر شێوەیەك بێت جگە لە فێڵێك پەیمان شكاندنی تێدا بێت.[2]

**ی ـ درۆكردن لە جەنگدا دروستە :**

(عَنْ جَابِرٍ عَنِ النَّبِىِّ ﷺ قَالَ « مَنْ لِكَعْبِ بْنِ الأَشْرَفِ » . فَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ أَتُحِبُّ أَنْ أَقْتُلَهُ قَالَ « نَعَمْ » . قَالَ فَأْذَنْ لِى فَأَقُولَ . قَالَ « قَدْ فَعَلْتُ »)[3] جابر ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (كێ دەڕوات بۆ كەعبی كوڕی ئەشرەف ) جا موحەممەدی كوڕی مەسلەمەووتی: حەزدەكەیت بیكوژم؟ فەرمووی: (بەڵێ) ووتی: دەی ڕێگام بدە شتانێك بڵێم ـ كەڕاست نیە ـ فەرمووی: ( ئەوە ڕێگام دایت ).

**دوانزەیەم: ئەو ئەنجامانەی كەلە جیهاد پەیدا دەبن :**

**یەكەم: دیل:** لەئەنجامەكانی دیارەكانی و جەنگ دیل كردنی كافرانەلەلایەن موسڵمانانەوە بۆ بڕیاردان لەسەر دیلەكان گەورە و پێشەوای موسڵمانان بڕیار بەدەستە دەربارەیان سەرپشكە لە نێوان كوشتن و ئازادكردن بەپارە و دیل بە دیل پێكردن خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ﴾[4] محمد: ٤. واتە ئەنجا ئەگەر لەجەنگدا گەیشتن بەبێباوەڕان ئەوە بدەن لەگەردنیان بیان

---

١) رواه البخاري(٣٠١٢) ومسلم (١٧٤٥/٢٦)

٢) صحيح مسلم شرح النووي١٢/٤٥.

٣) رواه البخاري (٣٠٣٢) ومسلم(١١٩/١٨٠)

کوژن هەتا کاتێ کوشتاری زۆریان لێدەکەن ئەنجا دیلەکانیان توند ببەستنەوە جادواتر یا بە منەت وچاکە بەرەڵایان کەن ـ یابە بریتی و پارە هەتا جەنگ چەکەکان ـ بەبێ باوەڕان دادەنێ ـ یا جەنگ کۆتایی دێت ـ بە نەمانی بێ باوەڕان ـ.

(عن إِيَاسِ بْنُ سَلَمَةَ عن أَبِيه أن سرية من المسلمين أتوا بأسرى فيهم امرأة من بني فزارة فَبَعَثَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى أَهْلِ مَكَّةَ فَفَدَى بِهَا نَاسًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ كَانُوا أُسِرُوا بِمَكَّةَ).[1] ئییاسی کوڕی سەلەمە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوەکە هێزێکی موسڵمانان چەند دیلێکیان هێنا کە ئافرەتێکیان تێدا بوو لەبەنی فەزازە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ خەڵکی مەککە لەگەڵ چەند دیلیەکی موسڵمانان کەلە مەککە دیل کرابوون گۆڕییەوە دیل بەدیلی پێ‌کردن).

(وجاء ﷺ أيضا أنه أخذ الفداء من أسرى بـــدر).[2] پێغەمبەر ﷺ لەبەرامبەر ئازادکردنی دیلەکانی بەدر بریتی لێوەرگرتن ئەنجا ئازادی کردن.

---

١) بڕوانە صحيحى مسلم فەرموودەی ژمارە(١٧٥٥)

٢) رواه مسلم ١٧٦٣.

## دووەم : دەسکەوتەکان ( الغنائم )

**یەکەم: دابەشکردنی غەنیمەت بەسەر لەشکرو بەشەکانی تردا:**

زانایان یەك دەنگن کەغەنیمە دەکرێت بەپێنج بەشەوە پێنج یەکی بۆئەوانەیە کەلەم ئایەتەدا باسکراون: ﴿ وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ ﴾ الأنفال: ٤١. واتە: وەبزانن هەرشتێکتان بە غەنیمەت گرت ئەوە پێنج یەکی بۆ خوا پێغەمبەری خوا و ﷺ خزمانی پێغەمبەر ﷺ و هەتیوان و هەژاران و ریبوارانی کەم دەستە ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بەخواو بەو پەیامەی دامان بەزاندوە بۆ بەندەی خۆمان لەڕۆژی جیاکردنەوەدا ئەو ڕۆژەی دووکۆمەڵەکە بەیەك گەیشتن ـ لە جەنگی بەدردا ـ.

**دووەم: وڵاغ سوار سێبەش دەبات و پیادە یەک بەش :**

(عَنِ ابْنِ عُمَرَ - رضى الله عنهما - قَالَ قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - يَوْمَ خَيْبَرَ لِلْفَرَسِ سَهْمَيْنِ ، وَلِلرَّاجِلِ سَهْمًا . قَالَ فَسَّرَهُ نَافِعٌ فَقَالَ إِذَا كَانَ مَعَ الرَّجُلِ فَرَسٌ فَلَهُ ثَلاَثَةُ أَسْهُمٍ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ فَرَسٌ فَلَهُ سَهْمٌ).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: لەڕۆژی جەنگی خەیبەردا پێغەمبەر ﷺ دوو بەشی دادەنا بۆ وڵاخ و بۆ پیادەش یەك بەش جانافیع بەوە ڕاڤەی کرد: ئەگەر پیاوێ وڵاخی پێبێت ئەوە سێبەشی دەکەوێت، بەڵام ئەگەر وڵاخی نەبوو ئەوەیەك بەشی هەیە).

**سێ یەم: بەشداربووانی جەنگ یەکسانن لەوەرگرتنی غەنیمەت دا :**

ئەوانەی بەشداری جەنگیان کردووە وەك یەك غەنیمەت دەبەن ئەو کەسە بەهێزبێت یان لاواز جەنگی کردبێ یان نەی کردبێ.

---

١) رواه البخاري (٤٢٢٨) و مسلم (١٧٦٢).

(عن مُصْعَبِ بن سَعْدٍ قال رَأَى سَعْدٌ رضي الله عنه أَنَّ له فَضْلًا على من دُونَهُ فقال النبي ﷺ هل تُنْصَرُونَ وَتُرْزَقُونَ إلا بِضُعَفَائِكُمْ) [١] موصعەبی کوڕی سەعد دەڵێ: سەعد ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ لای وابوو کەئەو فەزڵی هەیە بەسەر خەڵکی تردا کەوەك ئەونین ـ لە ئازایەتی دا ـ جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئایا ئێوە سەردەخرێن و ڕۆزی دەدرێن بەهۆی لاوازەکانتانەوە نەبێت ). واتەلەبەر لاوازەکانتان خوا سەرتان دەخات و ڕۆزیتان دەدات .

(وعن ابن عباس رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قسم غنائم بدر بالسوي بعد وقوع الخصام بين من قاتل ومن لم يقاتل). [٢] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ـ ڕەزای خوای لێبی ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەسکەوتەکانی بەدری بەیەکسانی دابەش کرد دوای ئەوەی دەمە قاڵێ دروست بوو لەنێوان ئەوانەی جەنگیان کردووە و ئەوانەی جەنگیان نەکردووە ).

**چوارەم: زیادەبەخشی بدرێتە هەندێک کەس دروستە :**

دروستە گەورەی موسڵمانان یان سەرکردە پێش دابەشکردنی غەنیمەت بەشێکی زیادەبدات بەهەندێ کەسی کەخۆی بە بەرژەوەندی دەزانێت لەبەر ئازایەتی لە جەنگ یان هەر هۆیەکی تر.

(عن عبد اللَّهِ بن عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قد كان يُنَفِّلُ بَعْضَ من يَبْعَثُ من السَّرَايَا لِأَنْفُسِهِمْ خَاصَّةً النَّفَلِ سِوَى قَسْمِ عَامَّةِ الْجَيْشِ وَالْخُمُسُ في ذلك وَاجِبٌ كُلُّهُ) [٣] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ ڕەزای خوای لێبی ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زیادەبەخشی دەدابەکەسانێك لەهێزەکاندا دەیناردن ـ پێش دابەش کردنی غەنیمەکە ـ بەتایبەتی بۆ خۆیان جگە لەبەشەکەیان کە بۆ هەموو لەشکرەکەبوو وە پێنج یەکی غەنیمەت لە هەموو غەنیمەتە دەردەکرا).

---

١) رواه البخاري (٢٧٣٩).

٢) رواه ابوداود(٢٧٣٧) والحاكم (١٣١/٢) وهو صحيح.

٣) رواه البخاري (٣١٣٥) ومسلم (١٧٥٠/٤٠)

**پێنجەم: کەورەی موسڵمانان بەشێکی هەیە لەگەڵ هەر بەشێک خۆی دەست نیشانی بکات:**

(عن عَائِشَةَ رضي الله عنها قالت: كانت صَفِيَّةُ من الـصَّفِيِّ).[1] عایشە ـ ڕەزای خـوای لێبـی ـ دەڵێ: صەفیە لەوە بوو کە پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی هەڵیبژارد.

**شەشەم: ئافرەت و منداڵ بەخشیشیان پێدەدرێت:**

سأل نَجْدَةُ إبن عباس عدة أسئلة فسأله في إحداها:( يَسْأَلُهُ عن الْعَبْدِ وَالْمَرْأَةِ يَحْضُرَانِ الْمَغْـنَمَ هل يُقْسَمُ لَهُمَا فقال إبن عباس: إِنَّهُ ليس لَهُمَا شَيْءٌ إلا أَنْ يُحْذَيَا)[2] عەبدوڵڵای کوری عـەبباس ـ ڕەزای خـوای لێبـی ـ کـە نەجـدەی کـوڕی عـامری حـەروری چـەند پرسـیارێکی لـێ کـرد لـە پرسیارێکیاندا دەڵێ: ئایا کۆیلەو ئافرەت ئامـادەی غـەنیمـەت دەبـن ئایـا بەشـیان پێدەدرێـت؟ عەبـدوڵڵاش لەوەڵامـدا ووتـی: ( هـیچ بەشـێکی دیاریـان نیـە مەگـەر تـەنها بەخشیـشیان پـێ بدرێت).

**حەوتەم:حەرامە سوود وەرکرتن لەغەنیمەت پێش دابەش کردنی جکە لەخواردن و ئالیکی وڵاخ:**

(عن رُوَيْفِعِ بن ثَابِتٍ الْأَنْصَارِيِّ أَنَّ النبي ﷺ قال من كان يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ فلا يَرْكَـبْ دَابَّةً من فَيْءِ الْمُسْلِمِينَ حتى إذا أَعْجَفَهَا رَدَّهَا فيه وَمَنْ كان يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ فلا يَلْبَسْ ثَوْبًا من فَيْءِ الْمُسْلِمِينَ حتى إذا أَخْلَقَهُ رَدَّهُ فيه)[3] ڕوەیفع کـوڕی سـابتی ئەنـصاری ڕەزای خـوای لێبی دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (هەرکـەس بـاوەڕی بـە خـواو ڕۆژی دوای هەیـە بـا سواری وڵاخی دەسـکەوتی موسـڵمانان نـەبێت هـەتا کـە لاوازی کـرد بیگێڕێتـەوە وە هەرکـەس باوەڕی بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با پۆشاکی دەسکەوتی موسڵمانان لەبەرنەکات تاکـە کـۆنی کرد بیگێڕێتەوە بۆناو غەنیمەتەکە).

---

١) رواه أبوداود (٢٩٩٤) وهو حديث حسن.

٢) رواه مسلم (١٨١٢/١٣٩)

٣) رواه أبوداود (٢٧٠٨) والداري (٢٣٠/٢) وأحمد (١٠٨/٤- ١٠٩) وهو حديث حسن.

(وعن ابن عمر رضي الله عنهما قال: كنا نصيب في مغازينا العسل والعنب فنأكله ولا نرفعه). [١]
عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ڕەزای خوای لێبیت دەڵێ: ئێمە لە غەزاكانماندا هەنگوین و ترێمان دەست دەكەوت دەمانخوارد نەمان دەگێڕایەوە بۆ ناو غەنیمەتەكان ـ دەسكەوتەكان ـ ).

**هەشتەم: حەرامە دزی كردن لەغەنیمەت:**

(عن أبي هُرَيْرَةَ قال خَرَجْنَا مع النبي ﷺ إلى خَيْبَرَ فَفَتَحَ الله عَلَيْنَا فلم نَغْنَمْ ذَهَبًا ولا وَرِقًا غَنِمْنَا الْمَتَاعَ وَالطَّعَامَ وَالثِّيَابَ ثُمَّ انْطَلَقْنَا إلى الْوَادِي وَمَعَ رسول اللَّهِ ﷺ عَبْدٌ له وَهَبَهُ له رَجُلٌ من جُذَامَ يُدْعَى رِفَاعَةَ بن زَيْدٍ من بَنِي الضُّبَيْبِ فلما نَزَلْنَا الْوَادِيَ قام عبد رسول اللَّهِ ﷺ يَحُلُّ رَحْلَهُ فَرُمِيَ بِسَهْمٍ فَكَانَ فيه حَتْفُهُ فَقُلْنَا هَنِيئًا له الشَّهَادَةُ يا رَسُولَ اللَّهِ قال رسول اللَّهِ ﷺ كَلَّا وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بيده إِنَّ الشَّمْلَةَ لَتَلْتَهِبُ عليه نَارًا أَخَذَهَا من الْغَنَائِمِ يوم خَيْبَرَ لم تُصِبْهَا الْمَقَاسِمُ قال فَفَزِعَ الناس فَجَاءَ رَجُلٌ بِشِرَاكٍ أو شِرَاكَيْنِ فقال يا رَسُولَ اللَّهِ أَصَبْتُ يوم خَيْبَرَ فقال رسول اللَّهِ ﷺ شِرَاكٌ من نَارٍ أو شِرَاكَانِ من نَارٍ). [٢] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبی دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕۆیشتین بۆ سەر جوولەكەكانی ـ خەیبەر ـ خوای گەورە لەسەردەستماندا ئازادی كرد ئاڵتون و زیومان بە غەنیمەت نەگرت بەڵكو كەل و پەل و خوراك و جل و بەرگمان بەغەنیمەت گرت، پاشان بەرەو دۆڵەكە ڕۆیشتین پێغەمبەریش ﷺكۆیلەیەكی خۆی لەگەڵدابوو كە پیاوێكی جوزامی كەناوی ریفاعەی كوڕی زەید بوو لەبەنی صوبەیب بەدیاری پێدابوو، جاكاتێ دابەزینەدۆڵەكە كۆیلەكەی پێغەمبەر ﷺهەڵسا زینی ولآخەكەی بكاتەوە تیرێكیان لێدا كەبووە هۆی مردنی ئێمش ووتمان شەهیدی پیرۆز بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەریش فەرمووی: (نەخێر سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەو شەمەڵ دزویەتی لە غەنیمەتەكانی ڕۆژی خەیبەر كەهێشتا دابەش نەكرابوو بۆتەئاگرو دەیسوتێنێ) ئەبوهورەیرە ـ ڕەزای خوای لێبی ـ دەڵێ: خەڵكی ترسان جاپیاوێك جەرمێكی نەعل یا دووانی هێنا، ووتی: منیش ڕۆژی غەزای خەیبەر ئەمەم دەسكەوتوە پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (چەرمێكە لەئاگر یا دووچەرم لەئاگرە).

---

١) رواه البخاري (٣١٤٥).

٢) رواه البخاري (٦٧٠) ومسلم (١١٥/١٨٣).

**نۆیەم: حوکمی کەل و پەلی کوژراو:**

هەرکەس کافرێ بکوژێ کەل وپەلی کوژراوەکە بۆ بکوژەکەیە ئەگەر شایەتی هەبوو کە ئەو کوشتویەتی.

(عن أبي قَتَادَةَ قال قال رسول اللّهِ ﷺ من قَتَلَ قَتِيلًا له عليه بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ).[1] ئەبوقەتادە ـ ڕەزای خوای لێبی ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( هەرکەسێك کەسێکی کافر بکوژێ شایەتی هەبێت لەسەری ئەوە چی پێیە بۆ بکوژەکەیە).

**دەیەم: دەسکەوت بەبێ جەنگ ( الفيء ) :**

**أـ پێناسەکەی :** ئەوەیە کەموسڵمان لەکافرانی دەگرن بەبێ جەنگ لە سەروەت وسامان چ زەوی و خاك بێت یا کەل و پەل و پارە وچەك . خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ الحشر: ٦ واتە: وەئەو دەسکەوتانە کە خوا گێڕایەوە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ لەماڵی بەنو نەزیر ئەوە ئێوە بۆ بەدەست هێنانی هیچ ئەسپ و ووشترێکتان تاونەداوە بەڵکو خوا پێغەمبەرانی زاڵ دەکات بەسەر هەرکەسێکدا کە بیەوێ وە خوا بەسەر هەمووشتێکدا بەدەسەڵاتە .

**ب ـ جیاوازی نێوان غەنیمەت و فيء :**

جیاوازیان ئەوە غەنیمەت ئەو ماڵەیە دەستی موسڵمانان دەکەوێت لەکافران بەهۆی جەنگەوە، بەڵام( فيء) ئەو ماڵ وسامانەی یە دەستی موسڵمانان دەکەوێت لە کافران بەبی جەنگ .

**د ـ حوکمی دەسکەوتی بەبێ جەنگ :**

پێنج یەکی دەدرێت بەوانەی کەئەم ئایەتە پیرۆزە دیاری کردوون: ﴿ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾ الحشر: ٧. واتە:

---

١) رواه البخاري (٣١٤٢) و مسلم (١٧٥١).

ئەوەی خوای گەورە دەستی پێغەمبەرەکەی خست لە ماڵی دێهاتیەکانی بەنونەزیر ئەوا بۆ خواو پێغەمبەر ﷺ و خزمانی پێغەمبەر ﷺ و هەتیوان و هەژاران و ڕێبوارانی کەم دەستە.

٤/٥ی لەبەرژەوەندی موسڵماناندا خەرج دەکرێت بەمەرجێ لەپێشی هەموویانەوە بەرزکردنەوەی ئاستی سەربازی سەربازانی لەشکری ئیسلامی بێت .

**پانزەیەم: سەرانە ( الجزية ):**

أ ـ **پێناسەکەی:** ئەو ماڵەیە کەخاوەن کتێبە ئاسمانیەکان ـ گاور و جوولەکە ـ و ئەوانەی هاوشێوەیانن دەیدەن بە دەوڵەتی ئیسلامی لەبەرامبەر پارێزگاری کردن لە گیان و ماڵیان و هێڵانەوەیان لەسەر ئایینەکەیان و ژیانیان لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامدا . بەکۆمەڵە مەرجێکی دیاری کراو .

**ب ـ بەڵگەی سەرانەدان :**

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَـٰغِرُونَ ﴾ التوبة: ٢٩. واتە: هەر سەرانە دەدەن بەدەستی خۆیان و بەڕیسوایی . مەبەستی نامە دارەکان لە گاور و جوولوکەکان.

**ج ـ سەرانە لە کێ وەردەگیرێ؟**

(عن نافع عن أسلم مولى عمر أن عمر كتب إلى عماله لا تضربوا الجزية على النساء والصبيان ولا تضربوها إلا على من جرت عليه المواسي).[1] نافیع لە ئەسلەمەوە بەندەی ئازاد کراوی عومەر دەگێڕێتەوەو دەڵێ: عومەر ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ نامەی نووسی بۆ لەشکرەکانی سەرانە لەسەر ئافرەت و منداڵ دامەنێن وەتەنها لەسەر کەسێ داینێن باڵغ بووبێ.

**د ـ ئەندازەی سەرانە:**

(قال مُعَاذِ بن جَبَلٍ بَعَثَنِي النبي ﷺ إلى الْيَمَنِ فَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنْ كل حَالِمٍ دِينَارًا أو عِدْلَهُ مَعَافِرَ).[2] موعاز ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ناردی بەرەو یەمەن

---

١) رواة البهقی فی السنن الكبرى ١٩٥/٩ وهو صحيح.

٢) رواة أبوداود (٣٠٣٨) والترمذي (٦٢٣) وابن ماجة (١٨٠٣) وهو صحيح.

فەرمانی پێکرد لە هەمووکەسێکی بالغ دینارێك ـ ئاڵتون ـ یا هاوتای ـ دینارێك ـ پۆشاك و قوماش وەربگرێت.

(وتجوز الزيادة لحديث أسلم: أن عمر بن الخطاب رضي الله عنه ضرب الجزية على أهل الذهب أربعة دنانير وعلى أهل الورق أربعين درهما ومع ذلك أرزاق المسلمين وضيافة ثلاثة أيام). [1]

دروستە لە دینارێك زیاتریش سەرانە وەربگیرێت، بە بەڵگەی فەرموودەکەی ئەسلەم کە دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ سەرانەی لەسەر خاوەن ئالتون چوار دیناری دانا وە لەسەر خاوەن زیوو چل درهەمی دانا لەگەڵ ڕۆزی دانی موسڵمانان و میوان داری کردنیان سێ ڕۆژ.

بەڵام گەورەی موسڵمانان ڕەچاوی دەوڵەمەندی هەژار دەکات، (قال ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ قُلْتُ لِمُجَاهِدٍ مَا شَأْنُ أَهْلِ الشَّأْمِ ، عَلَيْهِمْ أَرْبَعَةُ دَنَانِيرَ وَأَهْلُ الْيَمَنِ عَلَيْهِمْ دِينَارٌ قَالَ جُعِلَ ذَلِكَ مِنْ قِبَلِ الْيَسَارِ). [2] ئیبن ئەبی نوجەیح دەڵێ: بەموجاهیدم ووت: ئەوە بۆ خەڵکی شام چوار دیناریان لەسەر دانراوە و خەڵکی یەمەن یەك دینار؟ ووتی: ئەوە لەبەربوون دەوڵەمەندی دانراوە).

**دوانزەیەم: حوکمەکانی دیل و سیخور:**

**أ ـ دروستە کوشتنی سیخور:** (قال سَلَمَةَ بن الْأَكْوَعِ أتى النبي ﷺ عَيْنٌ من الْمُشْرِكِينَ وهو في سَفَرٍ فَجَلَسَ عِنْدَ أَصْحَابِهِ يَتَحَدَّثُ ثُمَّ انْفَتَلَ فقال النبي ﷺ اطْلُبُوهُ وَاقْتُلُوهُ فَقَتَلَهُ فَنَفَّلَهُ سَلَبَهُ). [3]

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: سیخورێکی بت پەرستەکان کاتێ پێغەمبەر ﷺ لەسەفەرێکدا بوو هات بۆلای و لەگەڵ هاوەڵەکانیدا دانیشت قسەی دەکرد پاشان لەپڕ دەرچوو ـ ڕای کرد ـ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (شوێنی کەون بیگرن و بیکوژن جا سەلەمە کوشتی پێغەمبەریش ﷺ هەرچی پێبوو دا بەسەلەمە ).

١) رواة البيهقي في السنن الكبرى ٩/١٩٥ وهو اثر صحيح.

٢) رواة البخاري (٦/٢٥٧) تعليقا وهو أثر صحيح.

٣) رواه البخاري (٢٥٤١) ومسلم (١/١٧٣٠).

**ب ـ کافری شەڕکەر موسڵمان بێت ماڵ وگیانی پارێزراوە:**

(عن ابن عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قال أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ الناس حتى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله وَأَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللَّهِ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ فإذا فَعَلُوا ذلك عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إلا بِحَقِّ الْإِسْلَامِ وَحِسَابُهُمْ على اللَّهِ). [1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم تا شایەتی دەدەن کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نیە جگە لە خوا وە موحەممەدیش ﷺ نێراوی خوایە و نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن وجانەگەر ئەمەیان کرد خوێن وماڵیان لەلایەن منەوە پارێزراوە بەهەقی ئیسلام نەبێ[2] لێپرسینەوەشیان لای خوایە دەربارەی دڵ و نیەتیان).

**ج ـ زەوی دەسکەوت بەبێ جەنگ:**

(عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال رسول اللَّهِ ﷺ أَيُّمَا قَرْيَةٍ أَتَيْتُمُوهَا وَأَقَمْتُمْ فيها فَسَهْمُكُمْ فيها وَأَيُّمَا قَرْيَةٍ عَصَتْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فإن خُمُسَهَا لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ ثُمَّ هِيَ لَكُمْ). [3] ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (هەر شار وگوندێك ـ بەبێ جەنگ ـ بڕۆنە ناویەوە تێدا نیشتە جێ ببن ئەوە بەشتان وەك بەشی موسڵمانی تروایە، وەهەر شار وگوندێکیش سەرپێچی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ـ ئەگەر ڕزگارتان کرد ـ ئەوە پێنج یەکی دەسکەوتەکانی بۆ خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێ پاشان ئەوەی کەمایەوە ـ چوار بەشەکەی تری ـ هی ئێوەیە ).

**سیانزەیەم: ئاگر بەست و پەنادان ( الهدنة و الاستمان)**

**أ ـ پێناسەکەی:** ئاگربەست: لە زمانی عەرەبیدا ( هدنة) واتە ڕێکەوتن و شەڕ ڕاگرتن.

وەلەشەرع دا: ڕێکەوتنە لەگەڵ دووژمنی جەنگی دا لەسەر ئاگربەست بۆ ماوەیەکی دیاری کراو.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ التوبة: ١

واتە: ئەمە بەریبوونە لەلایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ بۆ ئەو هاوبەش دانەرانەی

---

١) رواه البخاري (٢٥) ومسلم (٢٢).

٢) ئەگەر شتێك بکەن سزایەکی ماڵی یالاشەیی بکەوێتە سەریان.

٣) رواه مسلم (١٧٥٦/٤٧)

کەپەیمانیان لەگەڵ بەستوون ـ وەدەفەرموێ: ﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ﴾ الأنفال: ٦١واتە: وەئەگەر مەیلی ئاشتیان هەبوو تۆش ـ ئەی موحەمەد ﷺ ئاشتیان لەگەڵ بکە وەپشت بەخوابەستە.

(ومهادنة النبي ﷺ قريشا عام الحديبية).[1] وەپێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ قوریش دا ڕێکەوتنی ئاگربەستی کرد لە ساڵی حودەیبیەدا.

**ب ـ مانای پەنادان :**

ئەوەیە کەسێکی کافر کە لە جەنگدایە لەگەڵ موسڵماناندا داوای پەنادان و پارێزگاری لەکەسێك لەموسڵمانان بکات ئەو کەسەش پەنای بدات، ئەم پەنادانە بۆ هەموو کەسێکی موسڵمان دروستە پیاوبێت یان ئافرەت ، گەورەو کاربەدەست بێت یا کەسێکی ئاسایی بێت لەناو موسڵماناندا، کەپەنادرا گیانی پارێزراوە و دروست نیە کەس دەست درێژی بۆ بکات خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ﴾ التوبة: ٦ واتە: ئەگەر کەسێك لەبت پەرستان داوای پەنادانی لێ کردی پەنای بدە هەتا ووتەو ئایینی خوا ببیستێ پاشان بیگەیەنەرەوە شوێنی هێمن و پارێزراوی خۆی .

**ج ـ جیاوازی ئاگربەست و پەنادان :** لەپێناسە و مانای هەردووکیانەوە ئەم جیاوازیانە بەدیدەکرێت:

١ـ ئاگربەست ڕیکەوتنێکی بەکۆمەڵە لەلایەن موسڵمانانەوە گەورەی موسڵمانان نوێرایەتی دەکات یا جێگیرەکەی وەلەلایەن کافرانیشەوە گەورەو سەرکردەیان نوێنەرایەتیان دەکات یا جێگرەکەی . بەڵام پەنادان بۆ تاك و کۆمەڵێ کافران دەبێت و دروستە پەنادەر هەرکەسێك بێت لە موسڵمانان کاربەدەست بێت پیاو بێ یا ئافرەت .

٢ـ ئاگربەست یەکێکە لەڕێگەکان بۆ کۆتایی هێنان بەجەنگ لەنێوان موسڵمانان و دوژمنەکانیان کەواتە ناگونجێ ئاگربەست و جەنگ لەیەك کاتدا هەبن، بەڵام پەنادان دەگونجێ لەکاتی جەنگدا بێت بۆ نموونە سەربازێکی کافر داوای پەنا لە موسڵمانێك بکات کەدەبینێ

١) رواه البخاري (٣٩٤٥) و مسلم (١٧٨٣)

موسڵمانەکەش پەنای بدات ئەو پەنادانە دروستە گیانی پارێزراو دەبێت لەگەڵ ئەوەشدا جەنگ بەردەوامە لەنێوان موسڵمان و بێ باوەڕاندا.

**د ـ حوکمی هەریەك لەئاگربەست و پەنادان :**

١ـ ئاگربەست دوو حوکمی هەیە:

یەکەم: دووژمن داوای ئاگربەست بکات ، پێویستە لەسەرگەورەی موسڵمانان پێی ڕازی بێت لەگەڵ ووریا بووندا وەنابێ ماوەکەی لەچوار مانگ زیاتر بێت .

دووەم: موسڵمانان داوای ئاگربەست بکەن ، ئەمەش کاتێ دروستە بەرژەوەندی موسڵمانانی تێدا دیار بێت ئەگەر وانەبوو ئەوا دروست نیە. جائەگەر لەبەر لاوازی موسڵمانان بوو تا لەماوەی ئاگربەستە لاوازی موسڵمانان چارەسەربکرێت و ئاسایش بەرپابێت . ئەوە دروستە بۆماوەی دەساڵ ، بەڵگەش ڕێکەوتی حودەیبییەیە کە هۆکەی لاوازی موسڵمانان بوو وەماوەی دە ساڵ پێغەمبەر ﷺ ئاگربەستی کرد لەگەڵ کافرانی قوڕەیش دا . بەڵام ئەگەر لەبەر هۆیەکی تربوو ئەوە دروست نیە زیاتر لەچوار مانگ وەقورئان دەفەرمووێ: ﴿فَسِيحُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخۡزِي ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ التوبة: ٢واتە: کەوایە ـ بێباوەڕان ـ ماوەی چوار مانگ لەزەویدا بگەڕێن و چاك بزانن کەئێوە لەدەستی خوا دەرناچن و بێگومان خوا ڕیسواکەری بێباوەڕانە .

٢ ـ حوکمی پەنادان :

بەدەمەوە چونی پەنادان واجبە ئەگەر کەسێك داوای کرد، ئەگەر لەو پەنادانە بەرژەوەندی موسڵمانای تێدابوو یا بەرژەوەندی پەنادەرەکەی تێدابوو چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبۡلِغۡهُ مَأۡمَنَهُۥۚ﴾

التوبة: ٦ واتە:ئەگەر کەسێك لەهاوبەشی پەیداکەران داوای پەنای لێکردیت تۆش پەنای بدە هەتا ووتەی خوا ـ قورئان ـ ببیستێ پاشان بیگەیەنەرەوە جێگای هێمنی خۆی ئەمە لەبەرئەوەی ئەوانە کەسانێکی نەزانن . وەدروستە داوای پەنادان لەکاربەدەست جێگرەکەی یا هەرکەسێك لە

موسڵمانان بکرێت لەسەر هەمووان پێویستە پەنای بدە ئەگەر بەرژەوەندی ئیسلام یا پەنادەرەکەی تێدابوو .

(تَقُولُ أُمُّ هَانِئٍ بِنْتَ أبي طَالِبٍ ذَهَبْتُ إلى رسول اللَّهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ وَفَاطِمَةُ ابْنَتُهُ تَسْتُرُهُ قالت فَسَلَّمْتُ عليه فقال من هذه فقلت أنا أُمُّ هَانِئٍ بِنْتُ أبي طَالِبٍ فقال مَرْحَبًا بِأُمِّ هَانِئٍ فلما فَرَغَ من غُسْلِهِ قام فَصَلَّى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ مُلْتَحِفًا في ثَوْبٍ وَاحِدٍ فلما انْصَرَفَ قلت يا رَسُولَ اللَّهِ زَعَمَ بن أُمِّي أَنَّهُ قَاتِلٌ رَجُلًا قد أَجَرْتُهُ فُلَانَ بن هُبَيْرَةَ فقال رسول اللَّهِ ﷺ قد أَجَرْنَا من أَجَرْتِ يا أُمَّ هَانِئٍ قالت أُمُّ هَانِئٍ وَذَاكَ ضُحًى). [1] ئوموهانی ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: لە ساڵی ئازادکردنی شاری مەککە ڕۆیشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بینیم خۆدەشوات و فاتیمەی کچی پەردەیەکی بۆ کردووە، منیش سەلامم لێکرد فەرمووی: (ئەم ئافرەتە کێیە؟) وتم منم ئوموهانی کچی ئەبوتالیب فەرمووی: (مەرحەبات لێبێ ئوموهانی) جا لە خۆشۆردنەکەبویەوە هەستا هەشت ڕکات نوێژی کرد یەك پۆشاکی بەخۆیەوە پێچابوو کە لە نوێژەکەی بوویەوە وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی دایك برام دەڵێ: بەپیاوێك کەمن پەنامداوە دەیکوژم کە فلانی کوڕی هوبەیریە پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (ئەوەی تۆ پەنات داوە ئێمەش پەنامانداوە ئەی ئوموهانی) ئوموهانی دەڵێ: ئەوە ڕوداوە لە چێشتانگاودا بوو).

**هـ ـ مەرجەکانی ئاگربەست: دەبێت ئاگربەست ئەم مەرجانەی تێدابێت:**

١ـ گەورەی موسڵمانان یان جێگرەکەی ئەو ئاگربەستە بکات لەگەڵ کافراندا،ئەگەر کەسێکی تر بیکات دروست نیە.

٢ـ دەبێ ئەو ڕێکەوتنی ئاگربەستە بەرژەوەندێکی ئاشکرای موسڵمانای تێدابێت ، ئەگەر هیچ بەرژەوندێکی تێدا نەبوو دروست نیە .

٣ـ نابێ ماوەکە لە دەساڵ زیاتر بێت ئەگەر لاوازی موسڵمانان هۆکاربوو بۆ ئەو ئاگربەستە.بەڵام ئەگەر لەبەر لاوازی نەبوو بەڵکو لەبەرهۆیەکی تربوو ئەوە دروست نیە لە چوارمانگ زیاتر بێت.

١) رواه البخاري (٣٠٠٠) ومسلم (٣٣٦)

٤ـ نابێ بێباوەڕان مەرجێك لەسەر موسڵمانان دانێن بۆ بەرژەوەندی خۆیان کەمەرجێکی بەتاڵ و ناڕەوابێ بۆ نموونە: مافی ئەوەیان هەبێ دیلی موسڵمانان لای خۆیان بێت یان داوابکەن موسڵمانان دەست هەڵبگرن لە هەندێ ماڵ و سەروەتیان یا موسڵمانان دەست بەرداری بەشێك لەپەرستن و بەندایەتی بێن هەر کام لەم مەرجانەی تێدابێت ئەوە ئاگربەستەکە دروست نیە و سەرناگرێت .

**و ـ مەرجەکانی پەنادان :**

١ـ دەبێ پەنادانەکە لەسەر داوای کەسێکی کافربێت کە لە جەنگدابێت لەگەڵ موسڵماناندا جا کەسێك بێت یان کۆمەڵێك بن کەواتە بەبێ داواکردنی خۆی پەنای پێنادرێ ، وەك قورئان دەفەرمووێ: ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ ﴾ التوبة: ٦ واتە ئەگەر کەسێك لە هاوبەشی پەیداکەران داوای پەنای لێکردیت پەنای بدە.

٢ـ دەبێ پانەدەرەکە شیاوی پەنادان بێ واتە موسڵمان بێت، ئەگەر موسڵمان نەبوو پەنادانەکەی دروست نیە

٣ـ گەورەی موسڵمانان یا سەرکردەی سوپاکە ئاگاداربێت لەو پەنادانە و پێی ڕازی بێت . کەواتە ئەگەر نەیزانی یا زانی و ڕازی نەبوو بەپەنادانی بە هۆکارێك ئەوە پەنادانەکە دروست نیە بەڵام بەبێ هۆیەکی بەهێز بۆی نیە ڕازی نەبێت .

**چواردەیەم: ئەو دەرئەنجامانەی لەپەنادان دەکەونەوە:**

**أ ـ هەرکەس موسڵمانێك پەنای بدات گیانی پارێزراوە .**

عن أبي هُرَيْرَةَ عن النبي ﷺ قال: (وَذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ فَمَنْ أَخْفَرَ مُسْلِمًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ لَا يُقْبَلُ منه يوم الْقِيَامَةِ عَدْلٌ ولا صَرْفٌ).[1] ئەبوهورەیرە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (.... پەنای موسڵمانان یەکە بچوکترینیان خاوەن بڕیارە لەپەنادانندا جا هەر کەس پەنادانی موسڵمانێك بشکێنی ئەوە نەفرینی خواو فریشتەکان و هەموو خەڵکی لێبێت لە ڕۆژی دواییدا هیچ بریتی وپارەیەکی لێ وەرناگیرێ).

---

١) رواه مسلم (١٣٧١/٤٧٠)

دەبێ موسڵمانان هەموویان دەست درێژی نەکەنە سەر ئەو کافرەی پەنادراوە مەگەر بەبەڵگەوە بزانن سیخورە ئەو کات پەنادانەکەی هەڵدەوەشێتەوە.

**ب ـ دەرچوونی پەنادراو :** ئەگەر ماوەی پەنادانەکە تەواو بوو یان پێش تەواو بوونی خۆی ویستی بڕوات پێویستە گەورەی موسڵمانان بیگەیەنێتە جێگای هێمنی خۆی کەلە گیان وماڵی دڵنیا بێت پێشتر بەڵگەی ئەم قسەیەمان باسکرد ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ﴾ التوبة: ٦

**ج ـ ئەگەر کەسێکی بێباوەڕ پەنادرا ئەوە پەیمانێکی گەورەیە:**

کافر بەو پەنادانە دەبێت ئارامی و دڵنیایی پێ ببەخشرێت چونکەئەو پەنادانە مامەڵەیەکە لەگەڵیدا کراوە پەشیمان بوونەوەی بۆ نیە مەگەر پەنادراوەکە شتێك بکات پەنادانەکەی بەتاڵ بکاتەوە.

**پازدەیەم: حوکمی جەنگ کردن لەگەڵ دەرچووان لەفەرمانی گەورەی موسڵمانان: (حکم قتال البغاة)**

**١ـ پێناسەکەی:** لەزمانی عەرەبیدا (بغاة) کۆی (باغ) بەهەموو دەرچوو لەسنوورێك دەووترێت کەپێویستە پێوەی پابەند بێت وە (بغي) لە بنەڕەتدا بەستەم دەوترێت .

وەلەشەرع دا : بەکۆمەڵێك لە موسڵمانان دەوترێت کەلە فەرمان و گوێڕایەری پێشەوای موسڵمانان دەرچوون و گوێ بەفەرمانەکانی نەدەن یا مافێك دەکەوێتە سەریان نایدەن جا چ مافی خوابێت یان مافی خەڵکی بێت .

**٢ ـ حوکمی لەسنوور دەرچووان:**

ئەگەر گەورەی موسڵمانان هەستی کرد لەفەرمان دەرچوون یان یاخی بوون خەریکە سەرهەڵدەدات لەهەر کوێ و لەهەر کەسانێکەوە بێت بەزووی بنێرێت بۆلایان و پرسیاریان لێ بکات داوایان چیە؟و گلەییان لە چی هەیە لەکارو باری دەوڵەت جائەگەر شتێکیان ووت لەناڕێکی یا گلەییان باسکرد دەکرا چاك بکرێت یا لابرێت دەبێ بەگوێیان بکات لە داواکەیاندا بەڵام ئەگەر قسەو گلەییەکانیان بەرێ و جێنەبوون ئەو ئامۆژگاریان بکات بیانترسێنێ بەجەنگ کردن لەدژیان و فەرمانیان پێبکات بگەڕێنەوە ژێر فەرمان و گوێڕایەڵی ،ئەگەر بێ سوود بوو

ئاگاداریان بکات کە جەنگیان لەگەڵ دەکات جائەگەر هەر سووربوون لەسەر بڕیاری خۆیان دەبێ جەنگیان لەگەڵ بکات .

**٣ ـ مەرجەکانی جەنگ کردن لەدژیان :**

أ ـ هێزو دەسەڵاتیان هەبێ بەژمارە زۆری یا هێز یا قەڵا و شوێنی سەخت کەبتوانن بەرهەڵستی گەورەی موسڵمانان بکەن، بەجۆرێ پێویست بە ماڵ بەخت کردن و سەرباز بەکارهێنان بکات .

ب ـ لە فەرمان و گوێڕایەڵی گەورەی موسڵمانان دەربچن بەهۆی ئەو هێز و پشت و تواناوە، بەڵام ئەگەر لەژێردەسەڵاتی دابوون وەپێویستی بەجەنگ کردن نەبوو لەدژیان و دەیتوانی سزایان بدات بەهەر شێوەیەك خۆی بەگونجاوی بزانێت ئەوە یاخی بوو نین .

ج ـ دەبێ بەڵگەو بیانویەکی وایان بەدەستەوەبێت ئەو بێ فەرمانی گەورەی موسڵمانانیان پاساوبدات با بەهێزیش نەبێت ، بەڵام نابێ بەڵگەیەکی بێ بنەما بێت و هیچ پاساوێکی یاخی بوونەکەیان پێنەبێ. جائەگەر بەڵگەیان نەبوو بۆ کارەکەیان ئەو گوناهبارن و دروستە جەنگ کردن لەدژیان و هەندێ جار کارەکەیان دەگاتە ڕادەی کافربوون ئەگەر سەرپێچی گەورەی موسڵمانان بەحەڵاڵ بزانن و لەفەرمانی دەرچن بەبێ هیچ بەڵگەیەکی شەرعی .

د ـ دەبێ گەورەو لێپرسراوێکیان هەبێت بێتە مایەی هێزو دەسەڵات بۆیان ، باوەك پێشەواش دانەرابێت لەناویاندا کە گوێڕایەڵ بن بۆی ، چونکە هەرکۆمەڵێك بەرپرس و گەورەیان نەبێت هێزو توانایانْ نابێت.

دەبێ ئەوەش بزانین ئەوەی لەگوێڕایەری گەورەی موسڵمانان دەرچێ و پاساوێکە هەبێت نەکافر دەبێت نەفاسق ،نا واجبە لەسەرگەورەی موسڵمانان جەنگیان لەگەڵدابکات چونکە لەڕوانگەی شەرعەوە شتێکیان بەدەستەوەیە کەببێتە عوزرو بیانوو بەلای خۆیانەوە باله ڕاستیشدا وانەبێت.

**٤ ـ بەڵگەی جەنگ لەدژیان و حیکمەتەکەی:**

بەڵگەی جەنگ کردن لەدژیان ئەم ئایەتەیە کەدەفەرمووێ: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُواْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓاْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ الحجرات: ٩. واتە:

ئەگەر دووکۆمەڵ لەباوەڕداران دژبەیەکتر جەنگیان کرد ئەوە ئاشتەوای بکەن لەنێوانیاندا ئـەنجا ئەگەر کۆمەڵێکیان دەست درێژی کرد بۆسەر کۆمەڵەکەی تریان ئەوا ئێوە ـ موسڵمانان ـ لەدژی ئەو کۆمەڵیان بجەنگن کەدەست درێـژی دەکـات تـا دەگەڕێتـەوە بـۆ فـەرمانی خـوا ـ ملکەچـی فەرمانی خوادەبێت ـ ئینجا ئەگەر گەڕایەوە لەنێوانیاندا ئاشتەوای بکە بـە دادگەرانـە و ڕاسـت ودادپەروەربن ـ لەنێوانیاندا ـ بەڕاستی خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت .

زانایان دەڵێن ئەم ئایەتە باسی دەرچوون لەفەرمانی گەورەی موسڵمانانی تێدانیـە بـەڵام گـشتی ماناکەی ئەویش دەگرێتـەوە یـان قیـاس دەکرێتـە سـەری چـونکە ئەگـەر داوای جـەنگ بکرێـت لەموسڵمانان لەبەردەست درێژی کۆمـەڵێك موسڵمان لەدژی کۆمـەڵێکی تریـان داواکـردن لـەدژی دەست درێژی لەبەرانبەر گەورەی موسڵماناندا لەپێشترە و باشتر جەنگ دەخوازێ .

**٥ ـ حوکمەکانی جەنگ لە دژی یاخیان و دەرچووان لە فەرمانی گەورەی موسڵمانان :**

أ ـ دەبێت پێش جەنگ کردن لەگەڵیان ئامۆژگاری و ووتووێژ لە نێوان گەورەی موسڵمانان و ئەواندا بکرێت .

ب ـ دوا دەست کردن بەجەنگ دروست نیە شوێن هەڵهاتوەکانیان بکەون یا برینـدارەکان بکـوژن بەڵکو تەنها جەنگ لەگەڵ ئەوانەدا دەکرێت کەجەنگ دەکەن .

ج ـ دروست نیە دیلیان بکوژرێت .

د ـ ماڵ وسامانیان نابێتە غەنیمەت و دەسکەوت .

**شازدەیەم: حوکمەکانی پێشەوا :**

**یەکەم : گەورەی موسڵمانان :**

پلەیەکە لەئیسلامدا دوا پێغەمبەر ﷺ دێت بەجۆرێ گەورەی موسڵمانان جێنشینی پێغەمبەرە ﷺ لەڕاپەڕاندنی کاروباری موسڵماناندا لەگەڵ تێبینـی کردنـی جیاوازیەکـدا کەپێغەمبـەر ﷺ حوکمەکان کە ئومەتەکەی پێوە پابەنددەکات وەحـی یـە لـە خـواوە بـۆی دێـت، بـەڵام گـەورەی موسـڵمانان لـە دەقـەکانی قورئـان و سـوننەت و یـەك دەنگـی زانایـان و هەڵگۆسـتن لـە بەڵگـە گشتیەکان و بنەمانەگۆڕەکان حوکم وەردەگرێت .

**دووەم : گرنگی پلە گەورەی موسڵمانان (پێشەوا)**

ئەم پلەیە زۆر گرنگە بۆ بەدی هێنانی هەست بەبوونی خۆکردن موسڵمانان دەبێت گەورە و پێشەوایەکیان هەبێت لەبەر ئەم هۆیانە:

أ ـ خوای گەورە فەرمانی کردوە موسڵمانان یەك ڕیزبن و جیاوازو بەش بەش نەبن ئەمەش بەوەدەکرێت موسڵمانان گەورەو ڕابەرێکیان هەبێت یەك دەنگ بن لەسەری لەبڕیاری لانەدەن .

ب ـ بەشێکی زۆر حوکمەکانی ئیسلام لەڕووی جێبەجێکردنەوە پەیوەستن بەبوونی پێشەوا و گەورەی موسڵمانانەوە ، بەجۆرێ ڕاپەڕاندن و جێبەجێکردنیان بەڕوا دانانرێت لە ژێر چاودێری و فەرمانی ئەو نەبێ . وەدانانی قازی یەکان ، بڕیاری جەنگ و ئاگربەست و ڕیکەوتن ، دانانی والیەکان بۆ شارو ویلایەتەکان ، هەموونەمان و هاوشێوەی ئەمانە بەبێ پێشەوا ناکرێت .

ج ـ لەشەریعەتی ئیسلامدا کۆمەڵێك حوکم هەن پێیان دەوترێت حوکمەکانی پێشەوا (أحکام الامامة) یان حوکمەکانی سیاسەتی شەرعی ، کەئەو حوکمانەن کە خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ بە هێلاراوەیەتی هێشتویانەتەوە و شێوەیەکیان بۆ دیاری نەکردووە بەڵکو لێی گەڕاون بۆ بڕیارو فەرمانی پێشەوا لەهەر سەردەمێکدا بەگوێرەی بەرژەوەندی موسڵمانان بڕیاری لەسەربدات وەك ڕێکخستنی کاروباریماڵی و بەڕێوەبردنی سوپا و یاسای دیل ، جائەگەر کەسێك وەك پێشەوا نەبێت کەشیاو و گونجاو بێت بۆ ئەو پلەیە ئەم حوکمانە هەر بەهەڵواسراوی دەمێننەوە یەکلا ناکرێنەوە .

**سێ یەم: مەرجەکانی گەورەی موسڵمانان ( پێشەوا)**

ئەو کەسەی دەبێتە پێشەوای موسڵمانان پێویستە ئەم مەرجانەی تێدابێت :

١ـ موسڵمان بێت چونکە پێشەوایەتی ناموسڵمان دروست نیە ، وە نابێت ڕێکخستنی کارو باری موسڵمانان کەکاری پێشەوایە بدرێتە دەستی کە سێ کە موسڵمان نیە .

٢ـ پیاوبێت پێشەوایەتی ئافرەت دروست نیە، (قال النبي ﷺ: لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ امْرَأَةً). [١]
پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (هیچ گەلێك سەرکەوتو نابن گەورە و کاربەدەستیان ئافرەت بێ).

---

١) رواه البخاري (٤١٦٣)

٣ـ بالغ وژیر بێت ، مندال و شێت و نەزان دروست نیە ببنە گەورەو دەم ڕاستی موسڵمانان چونکە ئەوان خۆیان پێویستیان بەسەر پەرشتی هەیە .

٤ـ پابەند بێت بەئیسلامەوە( العدالة): نەگوناهی گەورەی کردبێت وەنە لەسەر وردە گوناهیش بەردەوام بێت چونکە کەسێك وابێت فاسقە، فاسقیش بەشایەت ناگیرێ ئەی چۆن بکرێتە گەورەی گشت موسڵمانان .

٥ـ زاناو شارەزابێت : بەجۆرێ ئەوەندە شارەزای لەشەریعەت هەبێت و ئاگاداری بەڵگەکان بێ و بتوانێ حوکمی شەرع دەربهێنێ بۆ هەرشتێك پێش بێت ، چونکە زۆربابەت هەیە لەئیسلامدا پاش پێغەمبەر ﷺ تەنها پێشەوای موسڵمانان دەتوانێ بڕیاری یەکلاکەرەوەی تێدا بدات دەی ئەگەر پێشەوا زانا وشارەزا نەبێت چۆن دەتوانێت ئەو کارەبکات .

٦ـ چاو و گوێ وئەندامەکانی تەواوبن : تەواوی ئەندامەکانی چاو و گوێ و زوبان زۆرگرنگە و پێویستە چونکە ناتەواو هەریەك لەو ئەندامانە ڕێگر دەبێت لەبەردەم ڕاپەڕاندنی کارەکانیدا بەچاکی بەڵکو ناتەواوی هەندێکیان بە تەواو کارەکەی پەك دەخات .

٧ـ وورپای و ئاگاداری گشتی: ئەو سیفەتانەی تێدابێت وای لێ بکات شیاوبێت بۆ بەڕێوەبردنی وولات و پارێزگاری گەل و نیشتیمان لەخراپەو دووژمنێك زیانی پێ بگەیەنێ ئەو وورپای وئاگایی یەش کەسانی پسپۆڕ دیاری دەکەن و هەڵیدەسەنگێنن کەجێگەی پرس و ڕاو مەشۆرەتن یا ڕابوودوویەکی زۆریان هەیە لەو بوارەدا

**چوارەم: شێوەکانی دانانی پێشەوا**

**١ــ لەجیێ خۆدانان:** ئەوەیە پێشەوا کەسێك دیاری بکات لەپاش خۆی ببێتە پێشەوای موسڵمانان ئەم شێوەیە شەرعی و دروستە ئەگەر دوومەرجی تێدابێت کە ئەمانەن:

أ ـ ئەو کەسەی دەست نیشان دەکرێت هەموو مەرجەکانی پێشەوای تێدابێت ـ کەپێشتر باسمان کرد ـ وە کەسێکی تر نەبێت لەو شیاو تر بۆ ئەو مەبەستە.

ب ـ ئەو کەسەی دانرا دەبێت بەراشکاوی ڕازیبوونی خۆی دەربڕێ لەو دانانەوە دەبێ ئەو ڕازیبوونەشی لەکاتی ژیانی ئەو پێشەوادابێت کە ئەو لەدوای خۆی داناوە بەپێشەوا، بەڵگەی ئەم لەجیێخۆدانانەش یەك دەنگی هاوەڵانە لەسەر ڕاستی و دروستی دانانی عومەری کوڕی

خەتتاب ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ بەجێنشین لەلایەن ئەبوبەکری سدیقەوە ـ ڕەزای خوای لێبێ، ئەمە لەکاتێکدایە پێشەوا یەك کەس دیاری بکات پاش خۆی ببێتە پێشەوا بەڵام ئەگەر چەند کەسێکە دیاری کرد کەبەشورا لەنێوان یەکێکیان هەڵبژێرن ئەو دوای مردنی پێشەوا واجبە. لەنێوان خۆیاندا یەکێکیان هەڵبژێرن بەمەرجێ ئەو مەرجانەی پێویستن بۆ پێشەوا تێیدا هەبن .
بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کاتێ عومەری کوڕی خەتتاب ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ پێش شەهید بوونی شەش کەسی لەهاوەڵان دیاری کرد لەپاش مردن لەنێوان خۆیاندا یەکێکیان هەڵبژێرن بەجێنیشین و ببێتە گەورەی موسڵمانان وە هەموو هەوەڵان ڕازی بوون پێی .

**٢ـ بەیعەت پێکردن :**

شێوەیەکی تر بۆدانانی پێشەواو گەورەی موسڵمانان بەیعەت پێکردنی کەسێکە لەلایەن موسڵمانانەوە ، وەمەرجی بەیعەت پێکردنیش ئەمانەن :

أ ـ شوراو پرس وڕاکردن: بەیعەت یەکەم ڕێگایە بۆدانانی پێشەوا، بەیعەتیش پەیمانە لەنێوان پێشەواو موسڵماناندا ئەمەش پاش شوراو پرس وڕاکردن بەنوێنەرانی خەڵك ( أهل الحل والعقد) بۆدیاری کردنی کەسێك کەمەرجەکانی پێشەوای تێدابێت دەکرێت خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾ الشورى: ٣٨واتە : موسڵمانان کاروباریان بەپرس وڕایەلەنیوان خۆیاندا.

(عَنْ عُبَادَةَ بن الصَّامِتِ قَالَ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي الْعُسْرِ وَالْيُسْرِ وَالْمَنْشَطِ وَالْمَكْرَهِ وَعَلَى أَثَرَةٍ عَلَيْنَا وَعَلَى أَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ وَعَلَى أَنْ نَقُولَ بِالْحَقِّ أَيْنَمَا كُنَّا لاَ نَخَافُ فِي اللَّهِ لَوْمَةَ لاَئِمٍ).[١] عویادەی کوڕی صامت ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ دەڵێ: بەیعەتمان دا بەپێغەمبەر ﷺ لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری لەقورسی وناسانیدا و لە پێخۆشبوون و پێناخۆشبووندا سەرەڕای باودانی کەسانی تر بەسەر ئێمەدا وەنابێ کێشەدروست بکەین لەگەڵ کاربەدەستاندا وەلەسەرئەوەی ڕاستی بڵێین لەهەر جێگایەکدابووین لەبەر خوا لەلۆمەی لۆمەکەران نەترسین).

١) رواه البخاري (٦٧٧٤) ومسلم (١٧٠٩) ومالك في الموطاء ٢/٤٤٥، ٤٤٦

ب ـ مەرجەکانی بەیعەت :

مەرجەکانی بەیعەت کردن بەوکەسەی دانراوە بەپێشەوا سیانن:

یەکەم: دەبێ لەهەموو شاروشوێنەکانەوە نوێرانی خەڵك (أهل الحل والعقد) بەیعەتی پێبکەن ، نوێنەرانیش بریتین لەزانایان گەورە ودەم ڕاستی خەڵك کەخەڵك بۆ چارەسەری کێشەکان هانایان بۆ دەبەن و کاروباری خەڵك ڕێك دەخەن ، مەرج نیە هەموو(أهل الحل والعقد) کۆبن لەهەموو شارو وڵاتەکەدا لەسەر بیعەت کردن پێی هەروەها ژمارەیەك دیاری کراو مەرج نیە بۆ بەیعەت کردن بەڵکو جەماوەری هەرشارێك و زۆربەیان بەسە بەیعەت بکەن پێی.

جانەگەر (أهل الحل و العقد) یا زۆربەیان بەیعەتیان کرد بەکەسێك مەرجەکانی پێشەوایەتی تێدابوو ئەوە ئەو کەسە دەبێتە پێشەوا و دەبێ هەمووخەڵك بەیعەتی پێبدەن ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ .

دووەم : دەبێ کەسانی (أهل الحل و العقد) کەبەیعەتی پێدەکەن دووخاڵیان تێدابێت:

١ـ گەیشتبنەڕادەی ئیجتهاد لە باسی پێشەواو حوکمەکانیدا .

٢ـ سیفەت و مەرجەکانی شایەتەتیان تێدابێت وەك پابەندی بەئیسلامەوە وەشتانی تر.

سێیەم : ئەو کەسەی دەست نیشانکراوە بەیعەتی پێبکرێت بە گوێیان بکات و ڕازی بێت بە ڕوونی دەربببڕێ بەقسە یا هەرشتێکی تر کە ڕازیبوون بگەیەنێت ،بەڵام ئەگەر نەیکردو ڕازی نەبوو نابێ ناچاری بکەن و زۆری لێبکەن بۆئەوەی بیکات چونکە ئەو کارە بەویست و ڕەزامەندی دەبێت.

٣ ـ بەهێزو دەسەڵات خۆکردن بەپێشەوا :

شێوەی سێ یەم بۆبوون بەپێشەوا ئەوەیە بەزۆر و دەسەڵات خۆی بکات بەگەورەی موسڵمانان ئەمەش بەدوو مەرج دەبێت:

أـ ئەوکەسەی خۆی دەکات بەگەورە و پێشەوا بەزۆر دەبێ مەرجەکانی گەورەو پێشەوای تێدابێت زیاتر لە خەڵکانی تر ئەو مەرجانەی تیابێت .

ب ـ خۆکردن بەپێشەوا یەکەم پاش مردنی پێشەوای پێش خۆی بێت یا دوای لابردنی بێت لەپێشەوایی بەبەڵگەیەکی شەرعی دروست . بەڵام ئەگەر لەکاتێکدا بێت پێشەوای پێشوو

لەژێراندابێت ئەگەر ئەوەی پێشووش بەهێزو دەسەڵات بووتە پێشەوا ئەوە کامیان زاڵتربوون ئەوایان دەبێتە پێشەوا ، بەڵام ئەگەر ئەوەی پێشوویان بەبەیعەت پێ کردن بووەتە پێشەوا یا پێشەوای پێش خۆی دیاری کردووە لەم دوو حاڵەتەدا پێشەوایەتی بەهێزو دەسەڵات خۆکردووە دانامەزرێت و نابێتە پێشەوا هەر چەند زاڵیش بێت بەسەر بەرانبەرکەیدا یاکاروباریشی هاتبێتە ڕاسا .

(قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « إِذَا بُويِعَ لِخَلِيفَتَيْنِ فَاقْتُلُوا الآخَرَ مِنْهُمَا »).[١] ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بەسەر ئەمەدا دەبڕدرێت کەدەفەرمووێت: (ئەگەر بەیعەت کرا بەدوو جێنیشین لەیەك کاتدا دووەمەکەیان بکوژن ).

**پێنجەم: هەندێك لەحوکمەکانی پێشەوایەتی :**

١ـ گوێڕایەڵی گەورەو پێشەوای موسڵمانان واجبە ، لەکاتێکدا نەبێ کەسەرپێچی خوای گەورە بێت خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ﴾ النساء: ٥٩ واتە: گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ گەورە و کاربەدەستەکانتان بکەن .

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عمر- رضى الله عنهما - عَنِ النَّبِىِّ ﷺ قَالَ « السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ ، فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ ، مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ »).[٢]
عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ ڕەزای خوای لێبی ـ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: .. مرۆڤی موسڵمان پێویستە لەسەر گوێڕایەڵ و فەرمان بەرداربێ لەوەی پێخۆشەو لەو شتدا پێناخۆشە ئەگەر فەرمانی گوناهو سەرپێچی پێنەکرێ جاهەرکاتێ فەرمانی گوناهو سەرپێچی پێ کرا ئەوە نەگوێڕایەڵ بێ نە ملکەچ بێ ).

---

١) رواه مسلم (١٨٥٣)

٢) رواة البخارى (٧١٤٤) ومسلم (١٨٣٩/٣٨).

٢ـ دروست نیە دەرچوون لەفەرمانی گەورەی موسڵمانان هەتا نوێژ بکات و کوفری ئاشکرای لێنەبینرێت.

(عن عَوْفَ بْنَ مَالِكٍ الأَشْجَعِيَّ يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « خِيَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُمْ وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ ». قَالُوا قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ نُنَابِذُهُمْ عِنْدَ ذَلِكَ قَالَ « لاَ مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ لاَ مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ أَلاَ مَنْ وَلِىَ عَلَيْهِ وَالٍ فَرَآهُ يَأْتِى شَيْئًا مِنْ مَعْصِيَةِ اللَّهِ فَلْيَكْرَهْ مَا يَأْتِى مِنْ مَعْصِيَةِ اللَّهِ وَلاَ يَنْزِعَنَّ يَدًا مِنْ طَاعَةٍ »).[1] عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: (چاکترینی گەورەو پێشەواکانتان ئەوانەن خۆشتان دەوێن و ئەوانیش ئێوەیان خۆش دەوێت و دوعای خێریان بۆ دەکەن و ئەوانیش دوعای خێر بۆ ئێوە دەکەن، وەخراپترینی گەورەو پێشەوا ئەوانەن ڕقتان لێیانەو ئەوانیش ڕقیان لەئێوەیە وەنەفرینیان دەکەن و نەفرینتان دەکەن) ووترا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەشمشێر نەجەنگین لەدژیان؟ فەرمووی (نەخێر مادامێ نوێژ بکەن لەناوتاندا، هەرکاتێ شتێکتان بینی لەکاربەدەستەکانتان پێتان ناخۆش بێ ئەوە ڕقتان لەکردەوەکەی بێت دەست مەکێشنەوە لە گوێڕایەڵی).

٣ـ واجبە ئارامگرتن لە نارێکی پێشەواو کاربەدەست:

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « مَنْ رَأَى مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَصْبِرْ فَإِنَّهُ مَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ شِبْرًا فَمَاتَ فَمِيتَةٌ جَاهِلِيَّةٌ»).[2] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: (هەرکەس شتێکی لەگەورەکەی بینی پێی ناخۆش بوو بادان بەخۆیدا بگرێت، چونکە بێگومان هەرکەس بستێ لەکۆمەڵی موسڵمانان جیابێتەوە و بمرێت ئەوەمردنێکی نەفامیانە).

(عن أَبَا حَازِمٍ قَالَ قَاعَدْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ خَمْسَ سِنِينَ ، فَسَمِعْتُهُ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: « كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأَنْبِيَاءُ ، كُلَّمَا هَلَكَ نَبِيٌّ خَلَفَهُ نَبِيٌّ ، وَإِنَّهُ لاَ نَبِيَّ بَعْدِى ،

---

١) رواه مسلم (١٨٥٥/٦٥)

٢) رواه البخاری (١٧٤٣) و مسلم (١٨٤٩/٥٥).

وَسَيَكُونُ خُلَفَاءُ فَيَكْثُرُونَ . قَالُوا فَمَا تَأْمُرُنَا قَالَ فُوا بِبَيْعَةِ الأَوَّلِ فَالأَوَّلِ ، أَعْطُوهُمْ حَقَّهُمْ ، فَإِنَّ اللَّهَ سَائِلُهُمْ عَمَّا اسْتَرْعَاهُمْ»).[١] ئەبو حازیم ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەڵێ: پێنج ساڵ لەخزمەت ئەبوهوریرە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دانیشتووم ، جاگوێم لێبوو لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕایەوە کە فەرموویەتی (جولەکەکانی بەنو ئیسرائیل پێغەمبەران کاروباریان بۆ بەڕێوەدەبردن هەر پێغەمبەرێك ـ علیهم الصلاه والسلام ـ دەمرد پێغەمبەرێك بەشوێنیدا دەهات وەبێگومان دوای من پێغەمبەر نایەت ، خەلیفە و جێنیشین زۆر پەیدادەبن) ووتیان: چ فەرمانێکمان پێدەکەیت؟ فەرمووی: (پابەندبن بەبەیعەتی جێنیشینی یەکەمەوە جا دوا ئەو بەیعەتی یەکەم ـ جێنیشین ـ مافی جێنشینەکان بەجێبێنن چونکە بەڕاستی خوای گەورە دەربارەی ژێردەستەکانیان پرسیاریان لێ دەکات).

٤ـ ئامۆژگاری گەورەو کاربەدەست واجبە:

(عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِىِّ أَنَّ النَّبِىَّ ﷺ قَالَ « الدِّينُ النَّصِيحَةُ » قُلْنَا لِمَنْ قَالَ « لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ ») تەمیمی داری ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( ئاین ئامۆژگاریە) ووتمان بۆکێ؟ فەرمووی (بۆخواو قورئان و پێغەمبەرەکەی و پێشەواو تێکڕای موسڵمانان).

٥ـ ئەرکی فەرمانڕەوا چی یە؟ بەرانبەر بەژێردەستەکانی ؟!

پێویستە لەسەگەورەو کاربەدەستی موسڵمانان پارێزگاری و بەرگری ستەمکارلێیان و پاراستنی سنووری وڵاتی ئیسلامی و بەڕێوەبردنی کاروباریان بەپێی شەریعەتی ئیسلام لە هەموو ڕوویەکەوە دابەشکردنی زەکات بەسەر خاوەنەکانیدا خۆخۆی نەکات و هەموو چاکەی بۆخۆی بوێ و زۆر ئاگای لەناخ و دڵ ودەروونی بێت ئاشکراو نهێنی وەك یەك بن .

(عَنِ الْحَسَنِ قَالَ عَادَ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ زِيَادٍ مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ الْمُزَنِىَّ فِى مَرَضِهِ الَّذِى مَاتَ فِيهِ. قَالَ مَعْقِلٌ إِنِّى مُحَدِّثُكَ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَوْ عَلِمْتُ أَنَّ لِى حَيَاةً مَا حَدَّثْتُكَ إِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ « مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللَّهُ رَعِيَّةً يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ وَهُوَ غَاشٌّ

١) رواه البخاری ( ٣٤٥٥) و مسلم (١٨٤٢/٤٤)

لِرَعِيَّتِهِ إِلاَّ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ »).[١] حەسن دەڵێ: عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد، مەعقیل کوڕی یەساری موزەنی ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ نەخۆش بوو سەردانی کردلەو نەخۆشیەدا کە مرد، مەعقیل ووتی: فەرموودەیەکت بۆباس دەکەم کەلەپێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە ئەگەر بمزانیایە دەژیم بوم باس نەدەکردی: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: (هیچ بەندەیەك نیە خوا کەسانێك بخاتە ژێردەستیەوە لە ڕۆژێکدا دەمرێت کە ناپاکی و غەشی لەژێردەستەکانی کردووە ئیللا خوا چوونە بەهەشتی لێ قەدەغە دەکات).

(عَنْ أَبِى الْمَلِيحِ أَنَّ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ زِيَادٍ عَادَ مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ فِى مَرَضِهِ فَقَالَ لَهُ مَعْقِلٌ إِنِّى مُحَدِّثُكَ بِحَدِيثٍ لَوْلاَ أَنِّى فِى الْمَوْتِ لَمْ أُحَدِّثْكَ بِهِ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « مَا مِنْ أَمِيرٍ يَلِى أَمْرَ الْمُسْلِمِينَ ثُمَّ لاَ يَجْهَدُ لَهُمْ وَيَنْصَحُ إِلاَّ لَمْ يَدْخُلْ مَعَهُمُ الْجَنَّةَ »).[٢] وەئەبو مولەیح دەڵێ: عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد سەردانی مەعقیلی کوڕی یەساری کرد لەنەخۆشیەکەیدا مەعقیل پێی ووت: من فەرموودەیەکت بۆدەگێڕمەوە لەبەرئەوە نەبوایە من لە سەرەمەرگدام بۆم نەدەگێڕایەوە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: (هیچ گەورەو کاربەدەستێك نیە کاروباری موسڵمانان بگرێتە دەست پاشان خۆی ماندوونەکات لەپێناویاندا و ئامۆژگاریان نەکات ئیللا لەگەڵیاندا ناچێتە بەهەشت).

واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

٢٠٠٩/٢/٥

هەڵەبجە گەڕەکی شێخ ئیسماعیل

سەعات ٤:٤٠ ئێوارە

---

١) رواه البخاري ( ٧١٥٠) و مسلم (١٤٢/٢٢٧).

٢) رواه مسلم (١٤٢/٢٢٩)

# پێڕستی بابەتەکان:

## کتێبی ڕۆژوو گرتن ........................ ٢٢٩



## کتێبی زەکات ........................ ٢٥٣

## کتێبی باری کەسێتی ........................ ٣٥١



## کتێبی مامەڵە کردن ........................ ٤٢١

## کتێبی پزیشکی ........................ ٥٦٥



## کتێبی پۆشاک و ڕازاوەیی........................ ٥٦٩



## کتێبی وەسیەت کردن ........................ ٥٧٥

## کتێبی دادوەری ........................ ٦٥١



## کتێبی خەبات و تێکۆشان ........................ ٦٦٩

## سەرچاوەكان

١- قورئانى پیرۆز
٢- صحيح البخاري
٣- صحيح مسلم
٤- سنن أبي داود
٥- سنن النسائى
٦- سنن ابن ماجه
٧- سنن الدارمي
٨- السنن الكبرى للبيهقي
٩- سنن الترمذي
١٠- مسند إمام احمد
١١- سنن الدار قطني
١٢- أبن حبان
١٣- المستدرك للحاكم
١٤- زاد العاد في هدي الخير العباد لأبن القيم الجوزية
١٥- نيل الأوطار للشوكاني
١٦- صحيح ابن خزيمة
١٧- صحيح الذهبي
١٨- المصنف لعبدالرزاق
١٩- المصنف لابن أبي شيبة
٢٠- بداية المجتهد و نهاية المقتصد لابن رشد القرطبى
٢١- شرح معاني الأثار للطحاوي
٢٢-المعجم الأوسط للطبراني
٢٣- النهاية في غريب الحديث و الأثر لأبن الثير الجزرى

